سەرجەمی بەرهەمی

# حوسێن حوزنی

کۆکردنەوە و لەچاپدانی:

دەزگای ئاراس

بەسەرپەرشتی:

د. کوردستانی موکریانی

هێنانە سەر ڕێنووسی نوێی کوردی:

مەحموود زامدار

پێداچوونەوەی:

عەبدوڵڵا زەنگەنە          فەخرەدین ئامێدیان

**بەرگی یەکەم**

ناوی کتێب: سەرجەمی بەرهەمی حوسێن حوزنی - بەرگی یەکەم
کۆکردنەوە و لەچاپدانی: دەزگای ئاراس
بەسەرپەرشتی: د. کوردستانی موکریانی
هێنانە سەر ڕێنووسی نوێی کوردی: مەحموود زامدار
پێداچوونەوەی: عەبدوڵڵا زەنگەنە + فەخرەدین ئامێدیان
بڵاوکراوەی ئاراس- ژمارە: ٥٥٧
دەرهێنانی هونەریی ناوەوە: ئاراس ئەکرەم
دەرهێنانی بەرگ: حەمید ئازموودە
پیت لێدان: نسار عەبدوڵڵا
هەڵەگری: شێرزاد فەقێ ئیسماعیل
سەرپەرشتیی چاپ: ئاوڕەحمانی حاجی مەحموود
چاپی یەکەم، هەولێر- ٢٠٠٧
لە کتێبخانەی گشتیی هەولێر ژمارە (٣٨٤)ی ساڵی ٢٠٠٧ی دراوەتێ

## دەستپێک

راپەڕینی ڕۆشنبیریی کوردی لە کوردستانی باشوور، دوای تەواوبوونی شەڕی یەکەمی دنیا ١٩١٨ دەستی پێ کرد. ژمارەیەک لە ڕۆشنبیرانی کوردی عوسمانی لە ئەستەمبووڵەوە گەڕانەوە و ئەزموونی پێشکەوتووی ئەو سەردەمەیان لەگەڵ خۆیاندا هێنایەوە بۆ کوردستان. حاجی تۆفیقی پیرەمێرد یەکێک بوو لەو ڕۆشنبیر و ڕۆژنامەنووسە لێهاتووانەی ئەو وەچەیە. جیاییی پیرەمێرد لەوانی تر ئەوەبوو، هەوڵی دا چاپخانە بۆ خۆی دابمەزرێنێ، دوای ئەمەش ڕۆژنامە دەربکات، چاپخانەکەشی وەک دەزگایەکی چاپ و بڵاوکردنەوەی سەردەمییانە هەڵبسووڕێنی.

هەر لەو سەردەمانەدا حوسێن حوزنی موکریانی، لە سابڵاخەوە ڕووی کردە کوردستانی باشوور و سەرەتا لە ڕەواندز، پاش چەند ساڵێک ئینجا لە هەولێر گیرسایەوە. حوزنی زۆر جێ گەڕابوو، لەوانە: شام و ئیستەمبۆڵ و ئەوروپا. وا دیارە دوای بیرکردنەوە، کوردستانی باشووری بەبوارێکی گونجاو بۆ کاری ڕۆشنبیری هەڵبژاردبوو، چاپخانەیەکیشی بۆ ئەنجامدانی پرۆژەکانی لەگەڵ خۆیدا هێنایە کوردستان.

لە ڕاپەڕینی ڕۆشنبیریی کوردی لە نێوان دوو شەڕی گەورەدا ١٩١٨ - ١٩٣٩، کەلێک لە ڕۆشنبیرانی کورد ڕۆڵیان بینی، بەڵام پیرەمێرد و حوزنی جیا بوون. ئەمانە لە ژێرخانەوە، لە دانانی چاپخانەوە دەستیان دایێ. هەردووکیشیان لە سەرەتاوە بێ ئەوەی پشت و پەنایەکیان هەبێ، ملیان لەبەر پرۆژەیەکی وا ستراتیجی نا.

حوسێن حوزنی لە کوردستانی ڕۆژهەڵاتەوە هاتبوو، فێربوون و فراژووبوونی ئەو عوسمانی نەبوو کە ئەو کاتە بزاوی ڕۆشنبیری لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست، جڵەوکێشەکەی برێتی بوو لە ڕۆشنبیرانی گەڕاوەی ئەستامبۆڵ و خاوەن ئەزموونەکانی کلکەی ڕۆژهەڵاتی ئەوروپا. بەڵام حوزنی نەک لەوان دوانەکەوتبوو، بگرە دەشێ بڵێین لە پێشیانەوەش بوو.

حوزنی، وەک: رۆژنامەوان، ئەدیب، هونەرمەند و مێژوونووس، لە هەموو بوارەکاندا خۆی نواند. لە هەمووشیاندا باڵا دەست بوو. مرۆڤێکی نیشتمانپەروەر و دەروون بڵند، بەتەنیابالی ڕووبەڕووی کێشەگەلی گەورە بووەوە و بەرگەشی گرت هەمووشی بەزاندن. ئەوەی ئەدەبیاتی حوزنی لە هەموو ئەوانی تر جیا دەکاتەوە ئەو کوردییە پەتێی و ڕەوانەیە کە پێ دەنووسی.

زمانی نووسینی کوردی، چ رۆژنامەوانی و چ ئەدەب و چ هەر بوارێکی تر لە ماوەی نێوانی دوو شەڕە گەورەکەدا هەر بەشێوەی کلاسیکی مایەوە. زمانێکی خنکاو لە وشە و زاراوەی عارەبی و تورکی و فارسی. بەڵام لە بیستەکانەوە، حوسێن حوزنی لە کۆواری زاری کرمانجی (ڕەواندز) و پاشان لە سییەکاندا لە کۆواری رووناکی (هەولێر) بەزمانێکی ڕوون و ڕەوان دەستی پێ کرد، بەهەمان شێوە لە نووسین و کتێبە مێژووییەکانیشدا. ئەم بەرهەمەی بەردەست شایەد و بەڵگەیەکی زیندووە بۆ ئەو ڕاستییە.

سەرەتای ساڵی ٢٠٠١، لەگەڵ بەڕێز د. کوردستان موکریانیدا پرۆژەیەکمان دانا بۆ سەرلەنوێ چاپکردنەوەی سەرجەم بەرهەمەکانی حوزنی لە چەند بەرگێکی ڕێکوپێکدا. پلانەکە ئەوەبوو، سەرەتا لە بەرهەمە چاپکراوەکانەوە دەست پێ بکەین، واتە ئەوانەی لە شێوەی کتێب و نامیلکەدا بڵاوبووبوونەوە. بەمەزەندەی خۆمان ئەمە دوو بەرگی لێ دەردەچوو. ئینجا بەرگی سێیەم بۆ وتار و یاداشت و نووسینەکانی تری. ئەگەر هەشبێ، نامە و بابەتە نادیار و ونبووەکانی لە بەرگێکی تردا.

بۆ سەرەتای کار، لەگەڵ خاتوون کوردستاندا بەڕێز مەحموود زامدارمان هەڵبژارد بۆ نووسینەوەی هەموو بەرهەمەکانی بەرگی یەکەم و دووەم بەشێوە ڕێنووسی ئێستا. زامدار خۆشحاڵانە هاتە دەست و کارەکەی گرتە ئەستۆ. هەرچەندە ئەنجامدانی ئەم کارە ماوەی نێزیکەی دوو ساڵی پێ چوو بەڵام خۆشبەختانە ئەنجام درا و تەواو بوو.

پاشان من بۆ خۆم بیرم لێ کردەوە، گوتم بۆ ئەو جۆرە کارانە، کاری فرە دەست خاوێنتر و جێ متمانەترە لە کاری تاکە دەست. ئەوەبوو، دوای راوێژ لەگەڵ خاتوون کوردستان، داوام لە بەڕێز عەبدوڵڵا زەنگەنە کرد. ئەویش ئامادەیی پێشان دا،

بەداخەوە لای ئەویش کارەکە دوو ساڵی تری بەسەربرد ئەگەر زیاتریش نەبێ.

هەرچۆن بێ، من لە جیاتی خۆم و خاتوون کوردستان سوپاس و پێزانین ئاراستەی ئەم دوو بەڕێزە حوزنی پەروەرە دەکەم، ئەوەی لە توانایاندا بوو کردیان. بەرهەمەکە کەلاڵە بوو و هاتە ناو دەست. بەلام بەر لەوەی بیدەین بەچاپخانە، حەزم کرد بۆ بەراورد و بەسەرداچوونەوە پێشانی کەسێکی تریشی بدەم، ئەویش کارمەندی دەزگای ئاراس (فەخرەدین ئامەدیان)ی سنەیی بوو. فەخرەی دەسڕەنگین سەرجەم ئەم بەرهەمە قەبەیەی ئەمسەر و ئەوسەر کرد و بنەبڕی کرد لە هەڵە و بۆ دواجاریش منی بێ خەم و دڵخۆش کرد.

راستە ئەم کارە زۆر دواکەوت بەلام کارێکی ئاسانیش نەبوو. رێنووسی کۆن و زمانی کۆن و هەڵەی چاپی فرە و زۆر کەموکورتیی تر. خۆشبەختانە زۆربەی زۆریان یەکلایی کرانەوە. جێی خۆیەتی، لێرەدا سوپاس و پێزانینی خۆم و دەزگای ئاراس ئاراستەی هەمووو لایەک بکەم: کوردستان خاتوون و بنەماڵەکەیان، زامدار و زەنگەنەوە و ئامێدیان.

ئەمەش شاکارێکی ترە لە دەزگای ئاراس دەردەچێت، خۆم و دەزگاکە بەخۆشحاڵ و سەربەرز دەبینم.

بەدران ئەحمەد حەبیب

# پێشەکی

کوردستان موکریانی

لەسەرەتای سەدەی بیستەمدا حوسێن حوزنی موکریانی بەپارە و پوولی خۆی دوو دیاردەی کولتووری هاوچەرخی بۆ یەکەمین جار هێنایە باشووری کوردستان:

١- ئامێری کامیرا[١] -کە بەهۆیەوە وێنەی سەدان پیاوانی رووناکبیر، سەرکردە، دەسەڵاتدار، نێودار و... کوردی پێ گیرا و لە هەمان کاتدا بەو ئامێرە دەیان کورد فێری هونەری وێنەگرتن بوون[٢].

٢- ئامێری چاپکردن: لەساڵی ١٩١٤دا حوزنی لە ئەڵمانیادا ئامێرێکی چاپی مارکی Diamondی کڕی و لە ساڵی ١٩١٥دا لە شاری حەلەب دایمەزراند. لە ساڵی ١٩٢٥دا بۆ ڕواندزی گواستەوە و لە ساڵی ١٩٤٨دوە و تا ئەمڕۆ لە هەولێری دێریندا چەسپێندراوە. ئەم چاپخانەیە لەگەڵ ئەوەی یەکەمین چاپخانەیە کە حوزنی لە کوردستاندا بۆ ڕاژەکردنی وشەی ڕەسەنی کوردی دایمەزراندووە، بە بەتەمەنترین چاپخانەی کوردیش دەژمێردرێت.

خێو و هەڵسووڕێنەرانی چاپخانەی کوردستان (حوزنی و گیو) دەیان بەرهەمی بیری خۆیان و نووسەر و بوێژانی کوردی دێرین و نوێ و هاوچەرخیان بەو چاپخانەیە چاپ کردووە؛ ئەوەندەی وەزارەتێک کاری ڕۆشنبیری کوردییان ڕاپەڕاندووە؛ بەئەندازەی ڕێکخراوێکی کوردی مێشکی کوردیان بەهەستی نەتەوایەتی زاخاوداوە هەروا بەهۆی پێوەندییان بەکوردناس و ڕۆژهەڵاتناسانەوە و بڵاوکردنەوەی چاپەمەنییەکانیان بەسەر ئەوان و بەسەر کۆمەڵانی نێودەوڵەتییانەوە کێشەی کوردیان بەدنیادا ناساندووە.

وەنەبێت کارکردن لە ڕۆژنامەگەریدا ئەوەندە سانا بووبێت، چ لە ڕووی پەیدا کردنی کەلوپەلی چاپەمەنی و چ لەڕووی ڕادەی هۆشیاری ئەو کۆمەڵەی کە ڕاژەیان دەکرد. دووری ڕواند لە شوێنی شارستانییەت و پێداویستی چاپخانە و زرنگی داماو، یارمەتی و هانیان داوە، کە تیپ و کلیشە لە داری کەوێت (کەوت) -کە دارێکی جەنگەڵی زۆر

ڕەکە- دروست بکات[٣]. لە پاڵ ئەوانەشدا میری بەغدا بەهیچ جۆرێک هاوکاری نەکردوون بەڵکو هەر ئاستەنگی هێناوەتە پێشیان بۆ ئەوەی دەست لە ڕاژەکردنی فەرهەنگی کوردی هەڵگرن[٤]. سەرباری ئەوەش هەموو میری عیراق دانی بەهەبوونی داماودا نەهێناوە و پێناسەیەکی پێ نەبەخشیوە و ماوەی ئەو ٢٣ ساڵەی ١٩٢٥- ١٩٤٧ لە عیراقدا ژیاوە هەر ڕۆژ لەگەڵ پۆلیسدا کێشەی زێدنامەی هەبووە و بەهەشتی باوکیشم لە ساڵی ١٩٤٧دا بەڵگەی «تجنس»ی پێ دراوە و بەسەر ئێمەی منداڵانیشدا بەزۆر کەوتۆتەوە.

ئەمە لە کاتێکدا کە ئینگلیز میری عیراقی دامەزراندووە. لە وڵاتی ئینگلیزستاندا هەر مرۆیەکی خڕکەی زەوی ڕووی تێ بکات و ماوەی پێنج ساڵێک تێیدا بمێنێتەوە، گەر هیچ تاوانێکی نەبێت و نەکردبێت، مافی هەبوونی جنسییەی بریتانی هەیە؛ بەڵام هەر هەمان ئینگلیز کە عیراقی بەتێکەڵییەکی نایەکسان و ناهاوچەشن دروست کرد و لەو کاتەی کە دەستووری عیراق داندرا خۆی دەسەڵاتدار بوو، لەو دەستوورەدا دان بەهەبوونی کوردی پارچەیەکی دی لە عیراقدا نەنراوە و ئەو دان نەنانەش بەڕادەیەک کاریگەر بووە، کوردی بێ هەستی نەتەوەییش باوەڕی پێهێناوە و هەر بۆیە زۆربەی ئەو کوردانەی کە لە عیراقدا دەسەڵاتدار بوون، نەک هەر یارمەتی حوزنییان نەداوە، بەڵکو هەمیشە دژی وەستاون و زۆر بەخراپ لە لایەن میری هەڵیانسەنگاندووە و تاوانی هەڵبەستراویان بۆ ساز کردووە. ئەم هەڵوێستە چەوتانە و خراپەکارییانە نەک لە کاروانی بەرەو پێشچوونی دوورنەخستۆتەوە، بەڵکو بوونەتە هاندەر بۆ ئەوەی خامە و چاپی زێتر لەگەڕ بێت، تا هۆشیاری نەتەوەیی و نیشتمان خوازی ڕەگی خۆی لای هەموو کوردێک داکوتێت و لە تاریکی ڕزگاریان بێت.

داماوی موکریانی زۆر هەوڵی داوە کە لە عیراق دەربچێت و ڕوو بکاتە دەوڵەتێکی ئەوروپایی کە تێیدا نەچەوسێتەوە، لەبەرئەوەی کوردە. بەڵام چەند لەمپەرێک هەبوون کە بۆی ڕاهی نەدەبوون:

١- میری عیراقی ڕێگەی دەرچوونی لێ بەستبوو، هەرکە چەند باڵیۆزخانەیەکی ئەوروپایی بەڵێنی بەخشینی پەنابەرییان دەدایێ، میری عیراق گفتی وەرگرتنی جنسیەیان پێ دەدا.

٢- حوزنی نووسەر بوو، ئاڵای هۆشیارکردنەوەی گەلی کوردی هەڵگرتبوو؛ بۆیە هەبوونی

لە نێویاندا ڕۆڵی زێتر دەبوو تا دوورکەوتنەوە لێیان.

٣- بەندیوارێکی بەتینی لەگەڵ بنەماڵەی بەدرخانییاندا هەبوو. وانەی ئەوەی لە ئەزموونی ڕۆژنامەنووسی ئەوان وەرگرتبوو کە بڵاوکردنەوەی نووسراو لەنێو وڵاتدا کاریگەرتر دەبێت تا لە دەرەوەی وڵات؛ چونکە ناردنەوە و گەیشتنی بەدەست خوێنەرانەوە ئاسانترە.

٤- حوزنی مرۆیەکی وا بار سووک نەبوو کە بتوانێت بەقاچاخ سنوور ببڕێت و خۆی بگەیەنێتە وڵاتانی ئەوروپا. بەڵکو چاپخانەکەی- کە چەکی هۆشیارکردنەوەی نەتەوەکەی بوو- لە لای لە خۆی خۆشەویستتر بوو. هەر بۆ کوێ چووبا لەگەڵ خۆی دەیبرد و پەڕاندنەوەی چاپخانە و دەستنووس و... بەنهێنی کارێکی وا سانا نییە. لەوکاتەدا کە حوزنی و گیوی برای لە بواری ڕۆشنبیریدا کاریان دەکرد، نەزانین، شوێنکەوتەیی، بێ پێناسەیی، نەداری و... سەرانسەری کوردستانی دابەشکراوی گرتبوودوە و مرۆڤی کورد لە تاریکستاندا دەژیا. خوێنەرەوەی کورد بەزمانی کوردی زۆر کەم بوون. زمانەکەش زۆر ڕەواجی نەبوو. بۆیە دەبا ئەم دوو برایە کاسبییێکی دیشیان کردبا بۆ ئەوەی خۆیانی پێ بژیەنن و کەلوپەل و کەرستەی چاپی پێ بکڕن کەچی دەسەڵاتداران ڕێگەی دابینکردنی پێداویستی ڕۆژانەشی لێ گرتبوون بۆ ئەوەی نەتوانن بیری خۆیان بڵاوبکەنەوە و ئەم میللەتە لە خەوی بێداری ڕاپەڕێنن. چاکترین بەڵگەی ئەم بارە نالەبارەیان و سەختی ژیانیان لەو نامەیەدا زۆر باش بەرجەستە کراوە کە لە ١٩٣٩/٩/١دا حوزنی بۆ ساڵح زەکی بەگی ساحێبقرانی ناردووە(٥).

ئەو تاوانە ڤراقە و پڕوپووچانەی بۆ حوزنی هەڵدەبەستران، بوونە هۆی دوورکەوتنەوەی لە کوردستان و نیشتەجێبوونی لە بەغدا، لە کاتێکدا کە دنیا دووچاری جەنگی دووەمی جیهانی بوو. لە بەغدا هەلومەرجێکی باش بۆ داماو هەڵکەوت بۆ ئەوەی لە بواری پسپۆری خۆیدا ڕاژەی پەیڤی کوردی بکات و خەریکی فراژی و گەشەپێکردنی ڕۆشنبیری کوردی بێت؛ ئەویش بەهەڵسووڕاندنی گۆڤاری «دەنگی گێتی تازە»(٦) بوو.

حوزنی لە کاتێکدا لە عیراق دەژیا کە عیراق لە لایەن ئینگلیزەوە بەڕێوە دەبرا. ئینگلیز و هەر ئەوروپاییەکی دی لە کارکردنیاندا لەگەڵ بەرامبەرەکانیاندا چ لەسەر ئاستی کەسی و چ لەسەر ئاستی دەوڵەتانیشدا بۆ هێنانە دی ئامانجی خۆیان سۆنگە و دەرفەت و هەلومەرجێکی وا دەڕەخسێنن کە بەردەو ئەو شوێن و پلەیەت ببەن کە ئەوان مەبەستیانە.

ئەمەش بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە ئەوروپایی هەنگاو بۆ هیچ کارێک ناهاوێن هەتا بە باشی لە هەموو لایەنێکی بەهاوکاری پسپۆڕانەوە لێی نەکۆڵنەوە.

بەڵێ حوزنی لە ڕواندز دوور خرایەوە و هەموو دەرگەکی گەڕانەوەی بۆ سەر چاپخانەکەی لێ داخرا. کۆڤاری دەنگی گێتی تازە -کە بەبۆنەی جەنگەوە لە لایەن باڵیۆزخانەی ئینگلتەرەوە لە بەغدا بڵاودەکرایەوە- پێویستی بەلێزانێکی ڕووناکبیری کورد بوو. داماویش دەستبەسەر بوو-هەموو سەرمایەی ژینی، ڕۆژنامەگەری و نووسین بوو؛ کەواتە کەسێکی باش و شیاو هێنرایە بەردەستی ئینگلیز بۆ ئەوەی ئەو کۆڤارەی هەڵبسووڕێنێت.

کارکردنی حوزنی لە کۆڤاری نێوبراودا بووە هۆی زێتر دەوڵەمەندبوونی ئەم کۆڤارە و بەتایبەتی ئەو بابەتانەی کە بواری ڕۆشنبیری کوردیان دەگرتەوە، بەڵام بۆ کەسی خۆی بەخراپە بەسەریدا شکایەوە؛ ئەویش بەتاوانبارکردنی بەوەی کە بووەتە جاسووسی ئینگلیز، ئەم پڕوپاگەندە نابەجێیە هەر لە لایەن هەمان کەسانەوە بۆی هەڵدەبەسترا کە پێشتریش بە واتە لەو کاتەدا کە حوزنی کۆڤاری سەربەخۆی خۆی (زاری کرمانجی ١٩٢٦- ١٩٣٢) لە ڕواندز پەخش و بڵاودەکردەوە، تاوانی گۆڕینی ئەلف و بێی عەرەبی و کردنی بەکوردی و... یان دەخستە ئەستۆ و بەتاوانیان لەقەڵەم دەدا.

حوزنی موکریانی کاتێک، کە لە کۆڤاری «دەنگی گێتی تازە»دا کاری دەکرد لە تەمەنێکدا بوو، پێویستی نەبوو کە خۆی بەهۆی ئەم کۆڤارەوە پێ بگەیەنێت. لە بارێکی ڕۆشنبیری ئەوەندە باڵا و لە بواری ڕۆژنامەگەری ئەوەندە شارەزا و لێهاتوو بوو، ئینگلیز پێویستی بەو بوو نەک ئەو بەوان. کەواتە کارکردنی داماوی هۆشمەند لەو کۆڤارەدا تەنێ بۆ ڕاژەی زمان، مێژوو، کەلەپوور و... کوردی بووە.

کۆڤاری دەنگی گێتی تازە لەژێر چاودێری تۆفیق وەهبی و بەهاوکاری شێخ حەسەن کوڕی شێخ مارف بەرزنجی بڵاو دەکرایەوە. جا بۆ دەبێت لەو کارەدا هەر دەهۆڵی جاسووسی بۆ حوزنی لێ بدەن، لە کاتێکدا کە تەنێ حوزنی ڕۆژنامەنووس بوو لەنێو ئەو نێوبراوانە. کارکردنی ئەو لەو کاتەدا و لەو گۆڤارەدا هەر وەک کارکردنی گۆران و ڕەفیق چالاک بووە لەو ڕادیۆیەدا کە ئینگلیز لە کاتی جەنگی دووەمدا لە حەیفا کردبوویەوە. دەبێت چ جیاوازییەک لە نێوان کارکردنی داماو لە دەنگی گێتی تازەدا و کارکردنی بەهەشتی ئەمین زەکی بەگ لە ساڵی ١٩١٥دا لە «مدیریەی شوعبەی ئیستخبارات»ی عوسمانیدا هەبووبێت. بۆ کارکردنی ئەمین زەکی بەگ بە کارێکی پیشەیی لە قەڵەم دەدەن

و کاری داماو به ناپاکی؟ بۆ باسی کارکردنی داماو لەو کۆڤارەدا دەکەن و باسی ئەو مامۆستایانەی زانکۆی بەغدا ناکەن کە لە خوێندنگەی ئەمنی قەومی بەعسیدا وانەیان دەگوتەوە؟ بۆ پەنجە بۆ ئەو نووسەرە کوردانە درێژ ناکەن کە هەموو وتارێکی سەدام حوسێن و بڵاوکراوەکانی حزبی بەعسیان بەدزی وەردەگێڕا سەر زمانی کوردی؟ بۆ باسی بەهەشتی تۆفیق وەهبی ناکەن کە بۆ ئینگلیز ئەو داواکارییەی مۆر کرد بەوەی حکوومەتێک لە کوردستاندا بۆ ئاسوورییان دامەزرێنن و کوردیش لە ژێر سایەی ئاسوورییاندا ئۆتۆنۆمییەک وەربگرێت؟ (د.رياض الحيدري. الاثوريون. القاهرة) گەر بەم تێڕوانینە بێت، دەبێت بەهاوکاریکردنی عیراقییان بۆ ئینگلیز و ئەمەریکا چی بڵێین؟ وەنەبێت من لەو بەراوردکردنانەی ژووروودا بمەوێت کەس بریندار بکەم و لە پلە و پایەی کەس کەم بکەمەوە، بەڵکو ئەوانە ڕاستییەکن و هەن.

من لێرەدا مەبەستم لەوەدایە چی دی کورد بەیەک لایەنی لە کەسان و ڕووداوانی دنیا ڕانەمێنێت؛ لە بیری ناوچەگەرێتی تەسک خۆی ئازاد بکات. چونکە ئێمەی کورد لە هەر کوێ بین و بەزۆری بەهەر چ وڵاتێکەوە پێبەستیان کردبین، خێوی یەک کێشەین کە ئەویش کێشەی نەتەوایەتییە. دۆزی ئاڵۆز و ناهەمواری کورد ئەوە دەخوازێت کە بەر لە هەموو شتێک کورد وەک کوردێک ڕێز لە یەکتر بنێن و پشتیوانی یەکتر بن؛ جا سەر بەهەر چ پارچەیەکی کوردستان بن؛ جا دواتر وەک عیراقی، تورکیایی، سوریایی و ئێرانی.

شەهید شاکر فەتاح[٧] لە بەرهەمێکی بەنرخی بیری خۆیدا مافی ئەوەی بەداماو داوە کە بەندیواری لەگەڵ بێگاناندا پەیدا بکات؛ چونکە زانایەک بووە هەستی بەلێپرسراوی خۆی کردووە بەرامبەر بەنەتەوەکەی و ڕووی لە هەموو کەسێک ناوە بۆ ئەوەی ئاوڕێک لە مافی ڕەوای کورد بدەنەوە. کەچی هێندێک کوردی نەزانی بەربەرۆشک و بێ ئیشوکار ئەوەیان بەگوناهێکی گەورە لە قەڵەم داوە.

هەبوونی حوزنی مامم و گیوی باوکم لە باشووری کوردستاندا بۆ نان پەیداکردن نەبووە؛ بەڵکو لەبەر کوردایەتی بووە. بۆ هێنانەدی ئامانجی نەتەوەیی بووە. ئەم دوو زانایە سامانێکی میللی بێ هاوتای سەردەمی خۆیان بوون. لەنێو خەڵکدا خۆشەویست بوون و ڕێزی تایبەتی خۆیان هەبوو چاکترین بەڵگەی ئەم پەیڤانەم هەڵوێستی هاوڵاتییانی کوردە بەگشتی لەو شارانەی کە مامم و باوکم تێیدا نیشتەجێ بوون کە بەتەواوی بەپێچەوانەی هەڵسوکەوتی هێندێک لە دەسەڵاتدارانی کوردی ئەوسا بوون. بەڵێ دانیشتوانی شارانی هەولێر و ڕەواندز هەردەم هاوکاریان بوون و پشتیان گرتوون، بۆ وێنە لەو کاتەدا کە فایەق

کاکەمین فەرمانی گرتن و دوورخستنەوەی بەهەشتی حوزنی دا، زۆربەی پیاوانی ڕواندز لە ١٩٤٠/٩/٢٩ و ١٨/؟/١٩٤٣دا چەند سکالایەک پێشکێشی میری دەکەن کە تێیدا باس لە بێ تاوانی و بێ گوناهی داماو دەکەن؛ لەوانە «عبدالوهاب محمد علی ئاغا زادە، عبدالکریم اسعد افندی، ابراهیم ئاغا زادە محمد علی و دەیانی دی»[8].

وەنەبێت ڕۆڵی حوزنی موکریانی لەنێو کۆمەڵگەی ئەوسادا تەنێ هەروەک ڕۆژنامەنووس، مێژوونووس و ڕووناکبیرێک هەبووبێت؛ بەڵکو لەپاڵ ئەوانەشدا خەڵکی فێری چۆنییەتی بەخێوکردنی کرمی ئاوریشم، و چۆنییەتی ڕازاندنەوەی باخچەی نێوماڵیان دەکرد و دەڵێن حوزنی یەکەمین کەس بووە کە گوڵی قەرەنفول و گوڵەباخ و نیلۆپەر و... هێناوەتە ڕواندز و باخی ماڵەکەی خۆی بەجۆرێک ڕازاندبووەوە ببوو بەنموونەی بەهەشت و زۆر لە دانیشتوانی ڕواندز ئارەزوویان دەکرد کاتێکی تێدا بەرنە سەر. لە هەمان کاتدا لەنێو ماڵەکەی خۆیدا ئاودەستێکی لە دار لە شێوەی کورسی دروست کردبوو تا میوانە ئەوروپاییەکان بەکاری بهێنن.

گەر سەرنج لەو کلێشەیەی بەرگی کۆڤاری «زاری کرمانجی» بدەیت، دەبینیت ئەو خانووبەرەیەی کە دەنێوبدا نەخشاندوویەتی هەر وەک خانووبەرەی ئەوروپاییان دەچێت. وە نەبێت مەبەستی ئەو لاساییکردنەوەی ئەوان بووبێت، بەڵکو ئارەزووی کردووە کە کوردیش وەک ئەوان بەئاسوودەیی و سەرفرازی و هاوچەرخانە بژیەت.

خێزانی حوزنی موکریانی نێوی فاتمەو لە بنەماڵەی ئەیوبیان بوو. لە حەڵەب ژینی خێزانی لەگەڵدا پێکهێنابوو. فاتمە خان منداڵی نەدەبوو. داماو نەیتوانیوە ئەو بیرە بپەژرێنێت کە ژنێکی دی بەسەر بێنێت؛ بەڵکو هەردەم گوتوویەتی: من ئەو ژنەم لە وڵاتی، کەسوکاری دابڕاندووە و ئێستەش لێرەدا هەوێیەکی بەسەر بێنم و ژیانی نامۆیی و ئاوارەیی لێ دژوارتر بکەم، ئەگەر لەبەر منداڵیش بێت، تا وەجاغم کوێر نەبێت، ئەوا کتێبەکانم زارۆی منن و منداڵ دەمرێت بەڵام بەرهەمی بیر لەنێو ناچێت و هەردەم بەزیندوویی دەمێنێتەوە.

بەرهەمەکانی بیری حوزنی پێویستییان بەچەندین نامەی دکتۆرا هەیە بۆ لێکۆڵینەوە؛ چ لە ڕووی هەستی نیشتمانخوازی، مێژوونووسی، خۆشنووسی، چیرۆکنووسی، وتارنووسی، زمانی نووسینی، زاراوە، هونەری ڕۆژنامەنووسی و... من لێرەدا ئەو چەند دێڕەی د. جەمال ڕەشید (١٩٩٠) دەنووسمەوە کە چۆنییەتی مێژوونووسین لای حوزنی هەڵدەسەنگێنێت:

«میللەتێک بیەوێت لە ئەمڕۆ و دوارۆژی خۆی بگات، دەبێت لە پێش هەموو شتێک لە ڕابوردووی خۆی بکۆڵێتەوە بۆ ئەوەی پێناسەیەکی تایبەتی لەنێو کۆمەڵانی جیهاندا هەبێت. لەم بوارەدا تەنیا زانستێک کە ئەمە دێنێتە دی، زانستی مێژووە. لەبەر ئەمە مامۆستا حوزنیی مێژووزان بایەخێکی تایبەتی دابوو بەنووسینی مێژووی کورد. نەک تەنیا وەکو بەرهەمێکی هەستی نەتەوایەتی دڵسۆزانەی تەنگ -کە کەسایەتی و بیری تەنیا کەسێک تێدا ڕۆڵ دەبینێت -بەڵکو ئەو بەرهەمە لەسەر بناغەیەکی زانستانە و گەڕان لە وڵاتاندا و پشت بەستن بەسەرچاوە و پێوەندی پەیداکردن لەگەڵ پسپۆڕان و ئامۆژگاریاندا بۆ ئاڵوگۆڕکردنی زانیاری هاتبووە کایەوە و ئەنجامی ئەم ماندووبوونە لە کتێبەکانی مامۆستا حوزنیدا بەدیاردەکەوێت».

لێرەدا پێویستە سوپاس و پێزانینی خۆم ئاراستەی دەزگەی ئاراس بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە بکەم؛ بەتایبەتی برای بەڕێز کاک بەدران ئەحمەد حەبیب. کە سەرلەنوێ چاپکردنەوەی سەرجەم بەرهەمەکانی بیری حوسێن حوزنی بەپێویست زانی. گەر حوسێن حوزنی کوڕێکی هەبا هەر ئەوەندەی کاک بەدران خەمخۆری بەرهەمەکانی دەبوو. هەروا زۆر سوپاسی برای دڵسۆز کاک مەحموود زامدار دەکەم، کە دڵسۆزانە و شارەزایانە بەرهەمەکانی بەڕێنووسی ئەمڕۆ نووسییەوە.

**بەسەرهاتی حوزنی لەبەر ڕۆشنایی ئەو دەستنووسانەی لە بارەی ژیانی ڕۆژانەی خۆی نووسیویەتی:**

(١٨٩٠)(؟) لە مەهاباد هاتۆتە دنیا. هەر لە منداڵییەوە خراوەتە بەرخوێندن و باوکیشی لەماڵەوە زەمبیل فرۆشی بەزمانی کوردی و سمایلنامەی بەزمانی فارسی پێ گوتووە.

(١٩٠٣) بۆ بەردەوامبوونی لە خوێندندا مەهابادی جێهێشتووە و بەرەو مەراغە و تەورێز ڕۆیشتووە.

(١٩٠٤) ماوەیەک لە یەریڤان ماوەتەوە؛ دواتر هەر لەوێدا بووەتە مامۆستای کوڕەکانی شەمسەدینۆف و حاجی یوسف بەگ و وانەی زمانی کوردییانی پێ گوتووەنەوە و بۆ ئەم مەبەستە چەند کتێبێکی منداڵانی لە زمانی فارسییەوە وەرگێڕاوەتە سەر زمانی کوردی[٩].

(١٩٠٧) ڕووی لە ڕووسیا کردووە و تێیدا خوێندوویەتی و بەمۆرچێتی بەتیپی فارسی

و لاتینی و خۆشنووسی خۆی بەخێو کردووە.

(١٩٠٨) چووەتە ئیستانبول و لەوێش خوێندوویەتی. شەرەفنامەی ئەمیر شەرەفخانی بدلیسی و مەم و زینی ئەحمەدی خانی وە بەرچاو کەوتووە. هەر لەو کاتەدا دەستی بەنووسین کردووە و چەند وتارێکی بۆ گۆڤاری خاوەر ناردووە و لە نێویاندا ئامانجی خۆی ئاشکرا کردووە. لەوێوە چووتە سوریا، لوبنان، فەلەستین، حیجاز، میسر، فرەنساو ئەڵمانیا.

(١٩١٤) لە ئەڵمانیا ئامێرێکی چاپی مارکەی دیامۆندی کڕیوە و لە ساڵی ١٩١٥دا لە حەڵەب دایمەزراندووە.

(١٩١٩) لەبەر بڵاوکراوەکانی فرەنسێکان بۆ یازدە مانگ زیندانیان کردووە.

(١٩٢٥) حوزنی لەگەڵ گیوی باوکم سورییەیان جێهێشتووە و ڕوویان لە عیراق کردووە. ماوەی شەش مانگ لە بەغدا ماونەتەوە. حوزنی لەگەڵ محەمەد ئەمین یەمەنی (ڕاستتر یومنی - عەبدوڵلا زەنگەنە) کارگەی هەڵکۆڵین و زەنگۆگرافی دامەزراندووە (بڕوانە: کوردستان موکریانی. ڕووناکی. ٢٠٠١. ل٣٠).

(١٩٢٦) لە ڕواندز جێگیر بووە و ئامێرەکەی چاپی لەو شارەدا بەنێوی زاری کرمانجی دامەزراندووە و گۆڤارێکیشی هەر بەناوی چاپخانەکەی بڵاوکردۆتەوە و لە ماوەی شەش ساڵدا یانی لە ساڵی ١٩٢٦ - ١٩٣٢ هەر تەنێ ٢٤ ژمارەی لێ چاپ کردووە.

(١٩٣١) یاسین هاشمی سەرۆک وەزیرانی عیراق و ڕەشید عالی وەزیری ناوخۆ حزبێکیان بەنێوی «حزب الاخاء» دامەزراند بوو. لایەنگرانی ئەم حزبە لە هەولێردا حوزنی دەخوازنە هەولێر. شێخ عەبدولقادر نەوەی شێخ ئەبوبەکر -کە ئەندامی ئەم حزبە بووە- داوای لە حوزنی کردووە ببێتە ئەندام، بەرامبەر بەمە یارمەتێکی باشی بدەن بۆ پێشخستنی چاپخانە و چاپەمەنێکانی. ماوەی سی ڕۆژ هەوڵی لەگەڵ دەدەن، حوزنی دانیان پێدانانێت بەهیچ جۆرێک ناپەژرێنێت ببێت بە ئەندام. بەڵام ئەوان تکای لێ دەکەن لە دژیان نەبێت و خەڵکیان لێ هان نەدات.

لە ڕواندزدا شێخ کاکەمین سەلان -کە دۆستێکی زۆر نێزیکی حوزنی بووە- کراوە بەسەرۆکی ئەم حزبە و ئەحمەد کەمال کوڕی عەبدولکەریم خەتی کرابوو بەسکرتێری حزب. هەڵبەت بەهەوڵ و کۆششی شێخ عەلائەدین کوڕی شێخ عومەری بیارە ئەم حزبە لە ڕواندز داندراوە و شێخ عەلائەدین مورشدی نەقشبەندییان بووە و یاسین هاشمیش خۆی

بەموریدی ئەو زانیوە.

ئەم حزبە لە ڕواندز خەڵکێکی زۆری لە سەپان، جووتیار، شوان، گاوان و... لە خۆی کۆکردبووەوە. ڕۆژێکیان ڕەیس ئەمین ڕواندزی -کە کوردێکی دڵسۆز، برایەکی ڕاست و دۆستێکی پاکی حوزنی بووە- چۆتە ڕواندز و ئەحمەد کەمال خەتی سکرتێری حزبی ئەخای لەگەڵ خۆی بردووەتە لای حوزنی و ئەمین ڕواندزی بەحوزنی گوتووە:

«هەستە ڕامەوەستە لەگەڵ ئەحمەد کەمال بچۆ بۆ تەکیەی شێخ کاکەمین داخلی حزب بە. ئەگەر ئێستە نەچی کۆمەڵەی حزب لە تەکیە کۆبوونەتەوە، دێنە سەرتان تالانت دەکەن و بەجارێک مەتبەعە و ماڵ و ئەشیات دەبەن و خۆشت دەکوژن، ئیدی وەختی ڕاوەستان و خۆڕاگرتن نییە و...» لە دوای گفتوگۆکردنێکی زۆر لەگەڵ ئەمین ڕواندزیدا ناچار لەگەڵ ئەحمەد کەمالدا دەچێتە تەکیە و لەوێدا خوتبەیەکی دینی و وەعزێکی پڕ واتا بۆ خەڵکەکە دەخوێنێتەوە؛ هەموویان بڵاوەی لێ دەکەن.

ئەم هەڵوێستەی حوزنی زۆر بەسەریدا شکاوەتەوە و باجێکی زۆری داوە و دواتر دووچاری دەیان کێشە بووە. لە ساڵانی ١٩٣٦، ١٩٣٨، ١٩٤١ زیندانی کراوە و تا ساڵی ١٩٤٦ هەر شەڕیان پێ فرۆشتووە و بەزۆری بردوویانەتە دادگە.

تەمووزی ١٩٣١ تەلەگرافێکی لە شەقڵاوەوە پێ دەگات کە خێرا بگاتە ئەوێ. ئەویش دەستبەجێ هەر ئەو ڕۆژە دەچێتە شەقڵاوە، لە ماڵی مودیر ناحیە، ئەحمەد شەشخان، بۆ ماوەی سێ ڕۆژ مێوانداری دەکرێت و کۆمەڵێک لە مێوانانی سلێمانیش لەوێ دەبن کە ئەمانە دەبن: وەزیری ئەشغاڵ و مواسەلات، ئەمین زەکی بەگ. ئەندازیار، یونس ئەفەندی. مودیری ناحیە، ئەحمەد نوری. ئەندازیار، ڕەمزی ئەفەندی؛ هەروا ئەحمەد خواجە.

ئەم بەڕێزانە لەگەڵ حوزنیدا کۆدەبنەوە بۆ ئەوەی حوزنی چاپخانەکەی بدات بەئەحمەد خواجە تا بیباتە شەقڵاوە و لەوێدا دایمەزرێنێت و بیخاتە کار.

حوزنی لە وەڵامدا گوتوویەتی: «بە .ەرجێ ئەمن مەتبەعەکەم دەدەم بەئەحمەد خواجە ئەفەندی و پێشکێشی دەکەم بەبێ مزو بەها کە بتوانێت هەفتەیەک وەکو من گوزەران بکات و سەنەدێکم پێ بدات بەکەفالەتی هەمووان نەیفرۆشێت و لەناوی نەبات. ئەگەر لێی بێزاربوو بەتەواوی بمداتەوە و نەیکاتە سەرمایەی کەیف و هەوەس.

ئەوە مەبەس نەبوو کە بیباتە شەقڵاوە، وەکاری بخات؛ مەبەسی ڕاستەقینەیان بردن و فرۆتن و لەناوبردنی بوو. هەرکە مەرجم خستە پێش، کۆمەڵە بڵاوبوون و نەکەوتنە ژێر

دانی سەنەد و کەفالەتەوە. دوو ڕۆژ مام. زۆر چاک تێگەیشتم مەبەسیان دڵنیایی ڕەزا بەگ و بەجێهێنانی ئارەزوویەتی».

(١٩٣٢) مەلیک فەیسەڵی یەکەم لە ١٩٣٢/٨/١٦دا گەشتێکی بۆ کوردستان دەست پێ کردووە و چووەتە ڕواندز. مەلیک فەیسەڵ ئارەزووی کردووە حوزنی ببینێت. تەحسین قەدری بەگی یاوەری نامەیەک بۆ حوزنی دەنووسێت و ئوتومبیلێکیشی بۆ دەنێرێت. ئەویش یەکسەر بەرەو جوندیان دەچێت؛ ئەو شوێنەی مەلیک فەیسەڵ لێی دابەزیبوو(١٠).

(١٩٣٢) ڕەزا بەگ ئیسماعیل بەگ(١١) قایمقامی ڕواندز، جەلال بابانی موتەسەرفی هەولێر بەڕادەیەک لێ هان داوە تا چاپکردنی گۆڤاری زاری کرمانجی لێ قەدەغە کردووە و مۆڵەتی بڵاوکردنەوەی لێ وەرگرتەوە.

(١٩٣٣) حوزنی هەوڵی داوە بەهاوکاری سەعدی جەلال ڕۆژنامەیەک بەناوی سۆران دەربخات؛ بەڵام مەحموود فەخری بەگ بانگی سەعدی دەکات، کە خۆی لەو کارە نەگەیەنێت و دەست لەو پرۆژەیە هەڵگرێت.

(١٩٣٣) لە مانگی حوزەیرانی هەمان ساڵدا مەحموود فەخری بەگ بەهاندانی ڕەزا بەگ ئیسماعیل بەگ، فەرمانی دەرکردنی حوزنی لە عیراق دەرهێناوە.

(١٩٣٣)حوزنی لە مانگی حوزەیران، تەمموز و کانوونی یەکەمی ئەم ساڵەدا سێ جاران چووەتە هەولێر، تا لە مەحموود بەگ -موتەسەرفی هەولێر- بگەیەنێت کە بێ تاوانە و تاکە گوناهی ئەو ئەوەیە کە کوردە و مێژووی کوردان دەنووسێت؛ بەڵام سوودی نابێت.

(١٩٣٣/١٢/٢١) حوزنی چووتە بەغدا لەگەڵ ناجی شەوکەت وەزیری ناوخۆ دانیشتووە. ئەویش هەر سووربووە لەسەر ئەوەی کە دەبێت عیراق بەجێ بهێڵێت و ڕوو بەڕوو بەحوزنی گوتووە: «چونکو تۆ کوردپەرستی دەکەیت و لەگەڵ تاریخ و نەشریاتی کوردی خەریکی، نایەڵم لە عیراق دانیشی. دەبێت دەست لە بیری کوردایەتی هەڵگری تاوەکو بژی» هەر بۆ ئەم مەبەستە دەچێتە لای مەجید بەگ یەعقوبی، کە ئەوسا موفەتیشی ئیداری بەغدا بووە و پێشتر موتەسەریفی هەولێر بووە، ئەویش هەوڵی بۆ دەدات، بەڵام سوودی نابێت.

(١٩٣٤) لە مانگی کانوونی دووەمدا بۆ چارەسەرکردنی کێشەی دەرکردنی لە عیراق مەلیک غازی دەبینێت، ئەویش پێی گوتووە: «تۆ لەگەڵ چاوڕاوی کوردایەتی خەریکی، کوردپەرستی دەکەیت، کتێب و گۆڤار و چاپخانەکەت بۆ هاندانی میللەتی کورد بڵاو

دەکەیتەوە، کورد لە عیراقدا تۆ فێرت کردوون و لاوەکانی کوردت خستۆتە سەر ڕەوشتی خۆت»[١٢].

(١٩٣٤) حوزنی بڕیار دەدات ڕوو لە ولاتێکی دی بکات، بۆ ئەوەی لەوێدا بەئاسوودەیی بژی. بۆ ئەم مەبەستەش دەچێتە بالیۆزخانەی تورکیا، فەرەنسا و ئەمەریکا[١٣].

(١٩٣٤/١/١٢) حوزنی دەچێتە لای مێجەر ئەدمۆندس ڕاوێژکاری وەزارەتی دەرەوەی عیراق، هەوڵ و تەقەلای خۆی چی بۆ مانەوە لە عیراق و چی بۆ سەرهەڵگرتن و ڕووکردنە ولاتێکی دی بۆ باس دەکات. ئەویش بەڵێنی ئەوەی دەداتێ کە بەیانی بینێرێتە لای سێر کنهان کۆرنەوالیس، ڕاوێژکاری وەزارەتی ناوخۆ، تاوەکو ئەو لەگەڵ ناجی شەوکەت گفتوگۆ بکات. حوزنی دەڵێت دوای ئەمە باسمان لە مێژوو، زمان و دیالێکتەکانی زمانی کوردی کرد و باسەکەمان هێندێک هۆنراوەی چەند شاعیرێکیشی گرتەوە، جا گەڕاوەتەوە ئوتێل ئەندەلوس[١٤].

(١٩٣٤/١/١٣) چووەتە وەزارەتی دەرەوە و ئەدمۆندس بەتەلەفۆن پێوەندی لەگەڵ ڕاوێژکاری وەزارەتی ناوخۆ کردووە. حوزنی دوای تەلەفۆنەکە چووەتە وەزارەتی ناوخۆ. سێر کۆرنەوالیس پێشوازی لێکردووە و پرسیاری لەو کێشەیە لێکردووە کە بۆیان ڕێکخستووە. ئەویش دەڵێت: «هەر سەرەتای ناخۆشییان، هەتا ئەو دەمەم بۆ گێڕایەوە کە هاتوومە لای و زۆر بەدڵگەرمییەوە تەئەسوفی بۆ خواردم و لەگەڵ وەزیری داخلیە موزاکەرەیەکی دوورودرێژیان لە بابەت منەوە کرد. منیش بەناجی شەوکەتم گوت: من لە خۆمدا جگە لەوە کە کوردێکم و تاریخ ناسێکی کوردم. هیچ گوناهێکی دیکە لە خۆمدا شک نابەم، ئەو گوناهە کە کوردم، بۆ من گوناه ناگوترێت؛ چونکو خوداوەندی پەروەردگار بە کوردی هێناومەتە دنیاوە؛ من تکا و خواهیشم لێ نەکردبوو بمکات بەکورد. کەوابوو کوردێتی من لەسەر من نییە و بمبەخشە کێ بەکوردی دروستی کردووم یەخەی ئەو بگرە و دەست لە من بەردە. لەسەر ئەوە دوامینی پێ درا و بەتەلەفۆن لەگەڵ مەحموود فەخری موتەسەریفی هەولێر مودیری شورتەی کەرکوک -عەلی کەمال بەگ- سلێمانی کرا».

(١٩٣٤/٢/١) حوزنی گەڕاوەتەوە کەرکوک.

(١٩٣٤/٢/٤) گەڕاوەتەوە هەولێر.

(١٩٣٤/٢/١٢) گەڕاوەتەوە ڕواندز[١٥].

(١٩٣٤/٦/٢٣) حوزنی چووەتە سلێمانی و دەڵێت: «... لە حوزەیرانەوە هەتا کانون لە سلێمانی خەریکی لابردنی توهمەت و بەڵا و دامەزراندنی مەتبەعە و بەلەدیە و دەرهێنانی ڕۆژنامەی ژیان ی کوردی بووم» (ڕووناکی ٢٠٠١).

(١٩٣٤/١١/١٥) سلێمانی بەجێ دەهێڵێت.

(زستانی ١٩٣٤) بەرپرسی پۆلیسی ڕواندز دەنێرێتە شوێن حوزنی. لەگەڵ ئەوەی زۆر نەخۆش دەبێت، بەزۆری هەر دەیبەنە پۆلیسخانە. لەوێدا فەرمانێکی وەزارەتی ناوخۆی پێشان دەدەن کە ئەمە ناوەڕۆکەکەیەتی:

بینا لەسەر تەحریری ڕەسمی ئەحمەد بەگ تۆفیق بەگ موتەسەریفی لیوای سلێمانی، حوسێن حوزنی کە لە سلێمانی خەریکی نەشری ڕۆژنامەی ژیان بوو، شیعر و غەزەلیاتی ئەحمەد بەگ کوڕی فەتاح بەگ ساحێبقران زادەی کۆکردۆتەوە و کردوویەتە دیوان و کتێب و لەگەڵ خۆی بردوویەتەوە ڕواندز کە نەشری بکات، لێی وەردەگرن و بۆ ئەم وەزارەتە (وەزارەتی داخلیە)ی دەنێرن؛ چونکو ئەو دیوانە موخالیفی قانوونی عراقیە و نابێت نەشر بکرێت. لەهەر جێگایەک بەدەست هەرکەسێکەوە بدیترێت موسادەرە دەکرێت.

(١٩٣٥) ئەحمەد بەگ تۆفیق بەگ ببوو بەموتەسەریفی هەولێر. لە سەردانێکیدا بۆ ڕواندز لەگەڵ موراد بەگی قایمقامی ڕواندز و زەینەلعابدین خاکی بڕیاریاندابوو کە ڕۆژنامەیەک دەربکەن، بەمەرجێک زەینەلعابدین ببێتە بەڕێوەبەری و بۆ ئەم مەبەستە لەگەڵ حوزنی دەدوێن. ئەحمەد بەگ تۆفیق بەگ، زەینەلعابدین و حوزنیش بەزۆری دەباتە هەولێر بۆ ڕاپەڕاندنی دەرهێنانی ڕۆژنامەیەکی نیو هەفتەیی بەنێوی سۆران؛ بەڵام دواتر ئەو پرۆژەیەش سەرناگرێت. (ڕووناکی ٢٠٠١).

حوزەیرانی (١٩٣٥) پرۆژەی دەرهێنانی کۆڤارێک کە حوزنی سەرنووسەر و شێت مستەفا پارێزەری بێت لە لایەن ئەحمەد بەگ تۆفیق بەگ موتەسەرفی هەولێر، پەسەند کرا؛ بەڵام ئەحمەد بەگ مەرجی ئەوەی خستە پێش حوزنی کە چاپخانەکەی لە ڕواندزەوە بگوازێتەوە هەولێر.

(١٩٣٥/٩/١٩) حوزنی لە موسڵ گفتوگۆ لەگەڵ عیسا مەحفووز دەکات، بۆ کڕینی ئامێرێکی چاپ بۆ شاری هەولێر.

(١٩٣٥/١٠/٦) حوزنی لەگەڵ پارێزەر شێت مستەفا- بەڕێوەبەری کۆڤاری ڕووناکی- دەچێتە موسڵ و ئامێرێکی گەورەی چاپ و هێندێک تیپ دەکرێت و چل دینار

پێشەکی دەداتێ؛ شەست دیناریش قەرزی لەسەر دەمێنێت.

(٨/ ١٠/ ١٩٣٥) حوزنی ئەو ئامێری چاپەی لە موسڵ کڕیبووی، بەلۆری دەیهێنێتە هەولێر و لە لایەکی مێوانداریێتی شارەوانی هەولێر دایمەزراندووە.

(١٢/ ١٠/ ١٩٣٥) ئەحمەد بەگ تۆفیق بەگ لە سەردانێکی بۆ تورکیا دەگەڕێتەوە کوردستان؛ کە دەبینێت حوزنی لە بریتی ئەوەی چاپخانەکەی ڕواندز بۆ هەولێر بگوازێتەوە، چاپخانەیەکی لەوی گەورەتری لە موسڵ کڕیوە و لە هەولێر دایمەزراندووە، لەبەرئەوەی حوزنی مەرجەکەی موتەسەرفی نەهێناوەتە دی -کە گواستنەوەی چاپخانەکەی ڕواندز بوو بۆ هەولێر- بیانوو بەحوزنی دەگرێت و بەهیچ جۆرێک یارمەتی نادات.

(١٩٣٥) حوزنی دەچێتە بەغدا بۆ کڕینی هێندێک کەلوپەلی چاپخانەکەی. حوزنی پێداویستێکانی چاپخانەکەی لە مەهدی حوسێن، خاوەنی چاپخانەی دەلیل و لە عزرا ئەلیاهو دەکڕێت و چل و چوار دینار قەرزدار دەبێت؛ عوسمان سەلیمی جوولەکە بووە بە کەفیلی.

(١٩٣٥) لە ڕۆژی گواستنەوەی چاپخانەکەی بۆ ئەو کۆشکەی کە لە ڕۆستەم چەلەبی بەکرێی گرتبوو، بەیانێک لە هەولێر بڵاو دەکرێتەوە تێیدا داوا لە کورد دەکات کە خۆی بێ دەنگ نەکات و نەخرۆشێت و... حوزنی بەیانەکە هەڵدەگرێت و دەچێتە لای ئەحمەد بەگ تۆفیق بەگ بۆ ئەوەی دڵنیای بکات کە ئەو ئەو بەیانەی نەنووسیوە و چاپی نەکردووە و...؛ هیچ سوودی نابێت. حوزنی تێدەگات کە ئەو داوە هەر بۆ ئەو داندراوە. لە ئەنجامدا حوزنی دووچاری دادگە دەبێت. (ڕووناکی ٢٠٠١).

(٧/ ١٠/ ١٩٣٩) داوای زێدنامەی عیراقی دەکات؛ هەروەک لە نووسراوێکدا دیارە کە ئاراستەی قایمقامی ڕواندزی کردووە. هۆی داواکردنیشی بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە پۆلیس زێدنامەی لێ داوا کردووە.

(٢٢/ ٩/ ١٩٤٠) ئامر ڕەتل، عەقید فایق کاکەمین، فەرمانی زیندانیکردنی حوزنی دەردێنێت، بەپێی برگەی ژمارە ٥٦ی ساڵی ١٩٤٠ بۆ پاراستنی ئەمن و ئاسایش و سەلامەتی دەوڵەت، بۆ ماوەی سێ ساڵ حوزنی لە ژێر چاودێری پۆلیس دادەنێت و قەدەغەی نیشتەجێبوونی لە شارانی کەرکوک، هەولێر و سلێمانی لێ دەکات.

(٢٣/ ٩/ ١٩٤٠) عەقید نوری محەمەد لە شوێنی فایق کاکەمین دەستبەکار دەبێت و فایق کاکەمین دەگوازرێتەوە شاری مونتەفیک. عەقید نوری حوزنی ئازاد دەکات.

(١٨/١٠/١٩٤٠) حوزنی نووسراوێک بۆ وەزارەتی ناوخۆی عیراقی دەنێرێت تا جارێکی دی چاوێک بەفەرمانی فایق کاکەمیندا بهێنن؛ بەڵام هیچ وەڵامێکی دەست ناکەوێت.

(١٦/٢/١٩٤١) نووسراوێک ئاراستەی سەرۆکی دادگەی بەغدا دەکات؛ هەڵبەت لەبارەی هەمان بابەت.

(١٨/٥/١٩٤١) لەشاری موسڵ لە لایەن قاسم مەقسوودەوە لە مەعەسکەر زیندانی دەکرێت.

(٢٦/٥/١٩٤١) قاسم مەقسوود تەحقیق لەگەڵ حوزنی دەکات و تاوانباری دەکات بەوەی کە بیری کوردایەتی بڵاو دەکاتەوە. لەم ڕووەوە پشت بەو فەرمانە دەبەستێت، فایق کاکەمین لە دژی حوزنی دەری کردبوو.

(١٠/٦/١٩٤١) حوزنی بەدیلکراوی دەنێردرێتە هەولێر و لەوێدا ئازاد دەکرێت.

(١٥/٦/١٩٤١) نووسراوێک ئاراستەی وەزیری ناوخۆ دەکات تا ڕزگاری بێت لەو تاوانەی فایق کاکەمین پێوەی لکاندووە(١٦).

(١٩٤١) حوزنی پەیمان لەگەڵ خۆی دەبەستێت کە ئەو تەمەنەی ماویەتی بەخۆشی ڕابوێرێت؛ هەر چنێکی ماندووبوونی تەن و گیانی تێدابێت خۆی تێنەگەیەنێت، بەڵکو لەگەڵ ئیشوکاری بازرگانی خەریک بێت.

ئەو خانووەی لە ساڵی ١٩٣٩ دا دەستی بەبیناکردنی کردبوو-کە لە لایەن فایق کاکەمینەوە تێکدرابوو- دەستی پێ کردەوە و تەواوی کرد و زستانەکەی بەئیشوکاری خانووەکە بەسەربرد.

(شوباتی ١٩٤٢) لە پردێ کۆنتراکتێک مۆردەکات بۆ چاککردنی ڕێگەوبان. لەبەرئەوەی خۆی هیچی لێ نەزانیوە، غەفوور ئاغای سلێمانی و نووری ئەورەحمانی کەرکوکی دەبن بەهاوکاری و هەریەکەیان دووسەد و دوازدە دیناریان پێ براوە و دوای ئەمە چەند کارێکی دی وای ئەنجام داوە.

(ئەیلولی ١٩٤٢) سەرپەرشتی فرۆکەخانەی دیانان دەکات.

(پایزی ١٩٤٢ باڵیۆزی بریتانی لە بەغدا، نیزیکەی سێ سەد و هەشتا تا ئاردی بۆ هەژارەکان ناردۆتە ڕواندز و هەروا سەد دیناری دابوو، بۆ بەرگ و پێڵاوی قوتابییە

هەژارەکانی ڕواندز، لە قایمقامییەتدا بۆ دابەشکردنی ئەو ئاردە لیژنەیەک لە: حوزنی، مەلا عەبدولکەریم خەیلانی و حاجی تایەر پێکهێنرا و ئاردیان بەسەر هەژاراندا دابەش کرد؛ کەچی لە قایمقامییەتدا بەشێکی باش لەو ئاردە گێڕدراوە؛ بۆیە لیژنە دەستی لەو کارە هەڵگرت. لە سەد دینارەکەش چاردە دینار خورا، بۆیە حوزنی ئیمزای بۆ نەکردوون[١٧].

(پایزی ١٩٤٢) کرنیل لاین ڕاوێژکاری ڕامیاری و مێجەر کینجی هاوکاری، سەرێک لە ڕواندز دەدەن. شەو لە ماڵی قایمقام عەلی سەروەت کۆدەبنەوە و حوزنیش لەوێ دەبێت و بەم جۆرە باسی گفتوگۆکانی ئەو شەوە دەگێڕێتەوە:

شەوێ باسی لە هەژاری و برسییەتی و ڕووتی و بێ ئیشی گوندەکانی ڕواندز کرد. زۆر دڵسۆزانە لە گوزەرانیان دوا کە بۆ خۆی چاوی پێکەوتبوون. وتی: ئەگەر بزانن دەست بدات، هەتا کەرکوک بێن لەسەر مەسروفی بریتانیا دەیانخەمە سەر ئیش. منیش پێم وت: میللەتی کورد ناتوانێت لە گەرمێن لە دەشتدا ئیش بکات ئەگەر ببوایە لەم خاکەدا ئەسپابێکی گوزەران و بووژانەوە بۆ ئەم پەرێشانانە ساز کرابایە زۆر باش بوو.

لەسەر ئەمە کرنیل لاین وەعدی دا، کە هەر لە ڕواندز ئیشێکی باش بدۆزێتەوە کە میللەت بەکۆمەڵە لێی سوودمەند بن، بەڵام بەتایبەتی بەمنی وت ئەم ئیشە تۆ دەیسووڕێنی، بەمەرجی ئەمە لە ڕەئیی عەلی سەروەت بەگ دەرنەچی؛ چونکو قایمقامی ئەم قەزایە ئەوە.

لە دوای ئەوە بەچەند ڕۆژێک عەلی سەروەت بەبێ ئەوەی لەگەڵ حوزنیدا ڕێک بکەوێت، سەنەدێکی چوار مادەیی نووسیوە بەناوی حوزنی و حاجی سەعیدی برای خۆی کە هەر کۆنتراتێکی لە ڕواندزدا بگیرێت، ئەم دووانە بەنیوەیی تێیدا هاوبەشن.

دواتر لە ژێر چاودێری میستەر تورنور و کرنیل گریتندا کۆنتراتی ڕێگاکانی ڕواندز دادەمەزرێت و عەلی سەروەت داوا لە حوزنی دەکات تا ئاغاکان بۆ بەشداریکردن لەو پرۆژەیەدا بانگ بکات دوای بانگکردنیان پرۆژەکە بەپێی چەند سەنەدێک بەم جۆرەی لە دەستنووسێکی حوزنیدا هاتووە، دابەش کرا[١٨].

ماوەی یەک مانگ بۆ ئەنجامدانی ئەم پرۆژەیە تەرخان کرابوو لەبەرئەوەی ئاغاکان هیچ شتێکیان لە چۆنییەتی بەڕێوەبردنی ئەو پرۆژەیەدا نەدەزانی، ناچار لە بەڕێوەبەرایەتی کاردا چاوەشێکیان بۆ ماوەیەکی کاتی خواست، تاوەکو ئەوان کارەکانیان ڕاپەڕێنن کە حوزنی لەسەر مەسروفی خۆی هێنانی بۆ سەر کار[١٩].

لەگەڵ ئەو هەموو کارەی، کە حوزنی ڕاپەڕاندووە، هاوکارەکانی لە برێتی ئەوەی یارمەتی بدەن، هەر کۆسپیان هێناوەتە سەر ڕێ. حوزنی لەو بارەیەوە نووسیویەتی... ڕەئیس تۆما و ئەحمەد بەگ جگە لە تێکدانی ئیش یارمەتییان نەدام نە بەپارە و نە بەخۆیان. ئیشەکەش زۆر گران کرا و دایانگرتم بەئەزیەت و ئازاردان[٢٠].

پرۆژە کۆتایی پێ هات؛ بەڵام کەرەستەیەکی زۆر لەنێو چوو کە هەمووی بەپارە و پوولی حوزنی کڕابوون و قەرەبووش نەکرایەوە.

عەلی کوڕی دەرویش عەبدوڵڵا کە بەرپرسی ژمێریاری حوزنی بوو، لەو کارەدا و لەو ماوەیەدا هەموو مەسرووف و خواردن و هەستان و دانیشتنی لەسەر حوزنی بوو؛ کەچی لە ژێرەوە لەگەڵ عەلی سەروەت و هاوەڵانی ڕێک کەوتبوو، چەند لاپەڕەیەکی لە حیساباتی کارەکەی حوزنی لەنێو بردبوو. حوزنی ئەو کارەی بەناپاکی لە قەڵەم دا؛ بۆیە بۆ ساغکردنەوەی حیساباتی لیژنەیەکی لە دیانە پێکهێنا[٢١].

کاتێک ئەو لیژنەیە بەو حیساباتەدا چۆتەوە، دیسان دوو لاپەڕەی دیبیان لێ دزیوە. لەگەڵ ئەوەشدا پارەی مەسرووفاتی پتر بووە لە پارەی وەرگیراو، دەبا دوو سەد و هەشتا دیناری بۆ بگەڕێننەوە؛ کەچی عەلی سەروەت و هاوکارانی وایان کرد کە کۆمەڵێک لەو کرێکارانەی کاریان لای حوزنی کردبوو سکاڵانامەیەک لە دژی حوزنی بنووسن و تێیدا بڵێن کە حوزنی پارەی تەواوەتی بەئێمە نەداوە؛ جا پسووڵەی شەکر وەرگرتنیان پێ دەبەخشرا و ئەو سکاڵانامانەش لە کاتی پێویستدا لە لایەن عەلی سەروەتەوە بەکار دەهێنرا.

عەلی سەروەت بەوە نەوەستا بوو، بەڵکو خەلیفە ڕەشید و مەجید بەگی برایانی بەگۆکی هان دابوو تا خۆیان و چەند کەسێکی دیش بچنە بەردەم مێجەر ئەستەنگ، ئەفسەری پێوەندێکانی بریتانی لە دیانان و نانی بەرووی لەبەردەم دابنێن و بڵێن: ئێمە ئەم نانە دەخۆین و حوزنی پارەی کرێکارێتی پێ نەبەخشیوین[٢٢].

عەلی سەروەت بەئەفسەری بریتانی لە پێشوو نێویراوی گوتبوو: حوزنی دوعای بۆ ڕۆمێلی سەرکردەی نازییانی کردووە تا لە جەنگ بیباتەوە.

حوزنی لەنێو بیرەوەرییەکانیدا بەم جۆرە ئەو کردەوە ناڕاستانەی عەلی سەروەتی لێکداوەتەوە:

«ئەو هەموو فەسادی و خراپەییەی عەلی سەروەت بۆ ئەمە بوو کە گێژم بکات و

ناحەقم دەرهێنێ، هەتا ڕووم نەبێ داوای ئەو حەقەم بکەم کە لە قۆنترات بەپەنهانی من خواردبووی و وەری گرتبوو. ئەگەر هاوارێکیش بکەم، ئەوە بلێت: ئەوە عەرز و حاڵی میللەتەکەیە کە ئەم پیاوە حەقی خەڵکی خواردووە و هەرچییەکی بلێت وا نییە».

عەلی سەروەت لەبەر ڕەفتاری لە ڕواندز دوور دەخرێتەوە و بۆ بەغدا دەنێردرێت و لە دوای چوار مانگ دەکرێت بەقایمقامی مەرکەزی قەزای سلێمانی و لەوێش واز لە حوزنی ناهێنێت و هانی غەفوور ئاغای کۆنە هاریکاری حوزنی داوە تا داوایەکی لە دژی حوزنی لە کەرکوک تۆمار بکات، گوایە نێوبراو ۱٥۰ (سەد و پەنجا) دیناری لە کۆنتراکتی پردێ لەسەر ماوە؛ بەبێ ئەوەی حوزنی بانگ بکرێتە دادگە سەر لە ئێوارەیەک دادوەری ڕواندز، ئەنوەر یەکتا خەڵکی سلێمانی، شاکر موجرم کاتبی دادگە و موختاری ڕواندز، ڕەووف، چەند پۆلیسێک و غەفوور ئاغا دەچنە ماڵەکەی حوزنی تا ماڵەکەی حیجز بکەن، ئەویش لە بەرامبەردا دەڵێت:

«ئێوە چۆن بەبێ دادگایی کردنی من ئەو کارە دەکەن؟» ئەوانیش فەرمانی دادگەی کەرکوکی پیشان دەدەن کە تێیدا دەڵێت: لەبەرئەوەی حوزنی عەجەمە، ئەمڕۆ سبەینێ هەڵدێت و دەچێتەوە عەجەمستان. هەتا نەتیجەی محاکەمەکە، مەبلەغی سێ سەد دینارم لەسەریە ئەموالی و چتی مەتبەعەکەی حجز بکرێت. (ئەمجارە بووینە عەجەم و فیرار دەکەین لە توهمەت و ئیفتیرای دیکە ڕزگار بووین).

ئەم دەستڕۆیشتووانە ماڵ و چاپخانەیان حیجز کرد و نەیانهێشت هیچ کەسێک لە ڕواندزدا ببێت بە کەفیلی و بەوەش نەوەستان، ڕاپۆرتێکیان لەسەر نووسی گوایە لە سلێمانی کۆمەڵەیەک بەناوی هیوا دامەزراوە؛ حوزنی و عەبدولڕەحمانی برای سەرۆکی ئەو کۆمەڵەیەن. لەسەر ئەمەش هەردوو برا زۆر ئازاردران.

ئەم کوردە کاربەدەستانە بەوەش نەوەستان لە نان بڕینی حوزنی زۆری لە لەعلی خان دەکەن کە ئەویش دەورێک لە نەبوونی و بێ دەرامەتکردنی حوزنیدا بگێڕێت:

«هەر لەو دەمەدا ئاغاژنە لەعلی خان، دایکی ئیسماعیل بەگ ڕواندزی، کە بۆ من لە دایکێکی بەمیهرەبان چاکتر و دڵسۆزتر بوو، ناچار کرا کە تەشەبوس بکات تەیارەخانەی دیانان لە ژێر قۆنترات و ئیجاری مندا بوو، لە ئینگلیزەکان بخوازێ و لە من وەرگیرێتەوە. هەر چەند سێ مانگ پتر وەعدەم مابوو، بۆ ئەوەش مودافەعەم پێ نەکرا و لە دەستم دەرچوو. بەم جۆرە لە هەموو لایەکەوە ئەسپابی خستن و ڕەخنەدارکردنم ڕێکخرا و

دۆستە حەقناسەکانیشم وەرگەڕان».

پایزی ١٩٤٣) حوزنی پارێزەر محەمەد تاهیر ئەتروشی، برای عەبدولحەمید ئەتروشی، قایمقامی ئەوسای ڕەواندزی کرد بوو بەپارێزەر و وەکیلی خۆی، بەڵام ئەویش هیچی بۆ ناکرێت، چونکە دادوەر ئەنوەر یەکتا واز لە حوزنی ناهێنێت و لەگەڵ حیجزکردنی هەموو کەلوپەلی نێو ماڵی بەتایبەتی چاپخانەکەی، بەبێ دادگاییکردنی هەوڵی زیندانی کردنی حوزنی دەدات و لە پاڵ ئەو کێشە هەڵبەستراوە لە پێشوودا باسم کردووە، چەندین گیروگرفتی نەپساوەی دی بۆ ساز دەکەن. هەر تەنێ بۆ ڕازیکردنی عەلی سەروەتی قایمقامی پێشووی ڕواندز، ناچار حوزنی خۆی دەگەیەنێتە بەغدا، تا ڕێگەی پێ بدەن بەیەکجاری بچێتە دەرەوەی عیراق و لەو بارەیەوە نووسیویەتی:

«... تکام لێ کردن مادامە لە فیتنە و کێشە و توهمەت ڕزگار نابم، چارەیەکم بۆ بدۆزنەوە خۆم و عایلەم بچینە دەرەوەی عیراق بەئاسوودەیی تەمەنی ماوی بەسەر ببەم؛ لەم زیلەت و هەرایە ڕزگار بکرێم، هەر کەسێک بەئیفتیرا داوایەکی هەبێت، بۆی ڕێک بخرێت و من حەقی مەشروعم نەپرسرێت و بەبێ ئەسپاب دووچار بەسووکی بکرێم. ژیانی وا نەبوونی چاکترە لە بوونی. بەمەرجی ئەوە ناوی کەس نەبەم، گەلێ پیاوانی گەورەم چاو پێ کەوتن و تکام لێ کردن ڕێگای ڕزگاریم بۆ بدۆزنەوە کە بچمە دەرەوەی عیراق بژیم بەڵام هێندەم دەگوت کە پیر بووم، هیچی دیکە توانای دەربەدەری و نەفی و حەبس و گرتنم پێوە نەماوە، دەمەوێت بەنانێکی وشک پەیداکردن لە گۆشەیەکی بێ قرە دانیشم، هەتا بەمەرگ لەم فەلاکەتە دەردەکەوم؛ چونکو پشتیوانی گەورە بۆ ڕزگاربوونم هەر مەرگە».

کاربەدەستان وای بەباش دەزانن کە ئەدمۆندس ببینێت و لەو بارەیەوە نووسیویەتی: «... کە چوومە لای میستەر ئەدمۆندس ئەمە جاری سێیەم بوو. زۆرم لا عەیب و عار بوو لە لاوێکی تازە پێگەیشووی وەکو ئەنوەر یەکتا بدوێم و بەمیستەر ئەدمۆندس بڵێم کە مەسەلە و سەربهوردم ئەمەیە. هەر هێندەم توانی بڵێم کە پیر بووم تاب و تەوانای فەقیری و دەربەدەری و حەبس و نەفی و هەرام نەماوە؛ ڕێگایەکەم نیشان بدەن و یارمەتیم بدەن بچمە خاکی هیندوستان یان بەلووجستان بەگۆشەگیری لەگەڵ کار و کاسبییەک خەریک بم نانێکی وشکی بێ کێشە پەیداکەم و لەم شۆڕشە گیان بەدەربەرم.

میستەر ئەدمۆندس وای بەچاک زانی بچم چاوم بەتۆفیق وەهبی بکەوێت. بۆچی؟ نازانم. لە کوێ؟ نازانم. ئێوارە لە ئۆتێل دانیشتبووم هاتنە دووم. چوومە خوارێ وەهبی

بەگ سواری کردم بردمیە«قصر الدجلة» هەتا سەعات ١٠ی شەو دانیشتم و گەڕامەوە ئوتێل. ئەو دیدەنە چی بوو، نەمزانی. سبەینێ چوومە لای میستەر ئەدمۆندس و پێم گوت، گوتی سبەینێ وەرەوە. سبەینێ چوومەوە وتی: دەمانەوێت مەجەلەیەکی کوردی دەرخەین وا نوویسراوە. هەتا پێکدێت هەستە بچۆ بۆ سلێمانی، قاقەزت بۆ دەنووسم یەکسەرە بچۆ بۆ لای شێخ مستەفا قەرەداغی، هەتا حیسابی نێوان تۆ و عەلی سەروەت بەبێ دەنگی ببڕێتەوە و ئەوجا بگەڕێوە بەغدا».

حوزنی دەچێتە سلێمانی و نامەکە دەگەیەنێتە شێخ مستەفا قەرەداغی. موتەسەریفی سلێمانی و ئەویش لیژنەیەک بۆ ئەم مەبەستە پێک دەهێنێت و لە مالّی میرزا تۆفیق قەزاز کۆدەبنەوە. حوزنی دەڵێت: «لە لجنەی میرزا تۆفیقدا بێجگە لە دڵ ئێشانم هیچی دیکەم نەبیست». بۆ بەیانی دەچێتەوە لای موتەسەریف و کۆمەڵێکی زلی لێ دەبێت، هەر وەکو حوزنی نووسیویەتی بڕیاری ئەوە دەدرێت: «من لەو ئاغایانەی ڕواندز کە ببوونە شەریکمان، هەر یەک چەندیان داوە بەعەلی سەروەت قاقەزێکم بدەنێ بەو دەستوورە حیساب لەگەڵ عەلی سەروەتدا دەبڕێنمەوە. بەوە ڕازی بووم قەرارم دا و گەڕامەوە ئوتێل»[٢٣].

عەلی سەروەت پەیوەندی بەشاکر موجرم کرد، بۆ ئەوەی لە ڕواندزدا هەوڵ بدات ئاغاکان هیچ کاغەزێک بەحوزنی نەدەن و بەو شێوەیە عەلی سەروەت غیرەتی لای شاکر موجرم پەیدا دەکرد و بەم جۆرە قسانە حوزنی ڕووناکبیری لای هەڵدەسەنگاند: ... زۆر عەیبە بێڵی کوردێکی عەجەم بەسەر ئێمەدا زاڵ بێت و قسەی ئەو بەسەر قسەی ئێمە بکەوێت و....

(١٨/ ١٠/ ١٩٤٣) ڕواندز بەجێ دەهێڵێت و دەچێتە هەولێر و دوو ڕۆژی تێدا دەمینێتەوە.

(٢١/ ١٠/ ١٩٤٣) هەولێر بەجێ دەهێڵێت و دەچێتە کەرکووک. شەو بەشەمەندەفەر بەرەو بەغدا بەڕێ دەکەوێت و لە ٢٢/ ١٠/ ١٩٤٣ دەگاتە بەغدا.

(٢٣/ ١٠/ ١٩٤٣) دەچێتە باڵوێزخانەی بەریتانیا، پێی ڕادەگەیەنن کە نووسینگەیەک بۆ کۆڤاری دەنگی گێتی تازە دادەنێن و دەبێت بۆ ڕۆژی دووشەممە ڕێکەوتی٢٧/ ١٠/ ١٩٤٣ دا ئامادە بێت.

(٢٧/ ١٠/ ٩٤٣) دەکەوێتە سەرکار و خەریکی نووسین و ڕێکخستنی کۆڤارەکە

دەبێت[٢٤] و لەو بارەوە نووسیویەتی و دەڵێت:

«... پێم خۆشبوو کە بەدڵێکی خاوێنەوە ئیش بکەم و پتر بەمە دڵخۆش و شادمان بووم کە گەورەیەکی زانا و تێگەیشتوویێکی کورد وەکو تۆفیق وەهبی بەگ چاودێری ئەم کۆوارە دەکا و وتاری تێدا دەنووسێت و پێکەوە بۆ بەرزبوونەوەی زمانی کوردی لەم کۆوارەدا هەوڵ دەدەین، بەتایبەتی لاوێکی نەوجەوانی وەکو شێخ حەسەن کوڕی شێخ مارف بەرزنجی کە بۆ تەرجەمە و نووسین یارمەتی دەداین و زۆری منەتدار کردم».

(١٩٤٤) حوزنی خانوویەکی لە بەغدا دەست دەکەوێت و لە ژیانی ئوتێل ڕزگاری دەبێت و گیوی باوکم نێو ماڵ و خێزانەکەی بۆ دەگەیەنێتە هەولێر و حوزنیش لە هەولێرەوە بەماڵ و خێزانەوە ڕوو لە بەغدا دەکات[٢٥].

(١٤ی ئەیلولی ١٩٤٧) گیوی موکریانی چووەتە بەغدا و بەسەرهاتی ئەو کوردە کوێستانیيانەی بۆ حوزنی گێڕاوەتەوە کە لە دوای تێکدانی کۆماری کوردستاندا لە ڕۆژهەڵاتی کوردستانەوە پەنایان بۆ کوردستانی عیراق هێناوە. ئەو پەنابەرانە لە گرتووخانەی شارانی هەولێر، موسڵ و کەرکووک زیندانی کراون و زۆر نامرۆڤانە لەگەڵیاندا هەڵسوکەوت کراوە.

(١٨ی ئەیلولی ١٩٤٧) حوزنی موژدەی ئازادکردنی ئەو پەنابەرانە بەگیوی برای دەدات کە بەیارمەتی جەمال بابان، جێگری سەرۆک وەزیرانی عیراق و تۆفیق وەهبی دەستی خستووە.

(٢٠ی ئەیلولی ١٩٤٧) حوزنی، گیوی برای تا وێستگەی شەمەندەفەر بەڕێ دەکات، بۆ ئەوەی لە کەرکووک لا بدات و موژدەی ئازادبوون بە پەنابەرەکانی زیندانی کراوی گرتووخانەی کەرکووک ڕابگەیەنێت[٢٦].

(٢١ی ئەیلولی ١٩٤٧) گیو دەگاتە کەرکوک و بەپەنهانی کەیفخۆشی مزگێنی ئازادبوون دەداتە پەنابەرەکانی کوێستانی و گیو دەڵێت: ... شایی شاییيان تێ کەوت.

هەر هەمان ڕۆژ گیو دەگەڕێتەوە هەولێر و هەمان موژدەی ئازادبوون بەپەنابەرەکانی کوێستانی زیندانی کراوی هەولێر دەبەخشێت. جا دەچێتە سەر کاری خۆی. یەکسەر تەلەگرافێکی دەدەنە دەست کە لە لایەن بەشیر موشیرەوە بۆی هاتبوو، تێیدا نووسرابوو: گورج بگەڕێیەوە بەغدا[٢٧].

(١٠/١٠/١٩٤٨) محمد جواد المفتي نامەیەک ئاراستەی گیو دەکات، بۆ ئەوەی قەرزەکانی حوزنی بداتەوە[٢٨].

## پەراویزی پێشەکی:

١- مامۆستا م. ڕ. هاوار لە بەرهەمە بەنرخەکەیدا بەم جۆرە لەو بابەتە دەدوێت: یەکەم وێنەگرێک لە کوردستاندا حوسێن حوزنی موکریانی بوو لەگەڵ کابرایەکی لوبنانی. لە دواییدا شێخ لەتیفی دانساز ئەو کامیرایەی حوسێن حوزنی و لوبنانێکەی کڕییەوە و شێخ لەتیفیش لە دواییدا فرۆشتییەوە بە یەحیا ئەفەندی.

م. ڕ. هاوار. شێخ مەحموودی قارەمان و دەوڵەتەکەی خوارووی کوردستان. بەرگی یەکەم. لەندەن- ١٩٩٠- ٦١ . وا دیارە مامۆستای نێوبراو ئەم زانیارییەی لە بەرگی یەکەمی بەرهەمە بەنرخەکەی کاک ئەکرەم ساڵحی ڕەش وەرگرتووە، کە بەنێوی «سلێمانی»یە و لە بەغدا لە ساڵی ١٩٨٧دا چاپ کراوە.

٢- گیوی موکریانی -کە لە ساڵانی سییەکاندا ڕووی لە سابڵاخ کردۆتەوە- ئامێری کامیرای لەگەڵ خۆی بردووە و ستۆدیۆیەکی وێنەگرتنی لەوێش دامەزراندووە.

٣- هامیلتون بەم جۆرەی ژێروو باسی ئەو پیشە و هونەرانەی حوزنی دەکات، کە لە پاڵ مێژوونووسیندا هەیبووە:

* Sayed Heusni is not merely an historian, he is also the local journalist and newspaper proprietor. There is abrass notice on his door which reads, Zari Kermanjji (The Cry of the Kurdish) which is the name of his paper...

His type is set by hand. From the oak of the mountains -side the cuts small blochs of wood.

He planes them smooth and true and upon them he etches the illustrations for his paper. He inks his plates, turns the primitive printing press, then sets and binds his sheets together to from the monthly magazine. Acopy goes to the high Commissioner and another to the league of Nations at Geneva. The Cry of Kurdish is called a "monthly" magazine, but often enough the little paper is suppressed on account of its Kurdish sentiments which are not always approved of by the Government at Baghdad. A. M. Hamilton, Road Through Kurdistan, 1937.

لە ١٣/٣/١٩٩٩دا، کە ڕۆژی پەردە لادان بوو لەسەر ڕیلیفی گیوی موکریانیدا، کاک فەلەکەدین کاکەیی- وەزیری ڕۆشنبیری- لە وتە بەنرخەکەی خۆیدا ئەم دوو برایەی بەگۆتنبورگی کورد دانا.

٤- بۆ وێنە بۆ دوورخستنەوەی حوزنی لە ڕێکخستنی ڕۆشنبیری کوردیدا ڕێگەی بڵاوکردنەوەی کۆڤاری «زاری کرمانجی»یان لێ گرت بەو ناوەی بابەتێکی ڕامیاری لە ژمارە ١٦ی کۆڤارەکەیدا بڵاوکردۆتەوە، کە ئەمەش دەقی ئەو فەرمانە میرییەیە کە بۆ بەهەشتی نێردراوە:

الحكومة العراقية

مديرية المطبوعات

رقم التلفون ــ ١٢٣ سراى

العدد : ١٠٧

التاريخ ٢٨ كانون الثاني ٩٢٩

صاحب جريدة زار كرمانجي

ان الامتياز الممنوح الكم بكتاب هذه المديرية المرقم ٤٢٦١ والمؤرخ في ٢٩/٣٠ مارت سنة ١٩٢٦ قد حضر عليكم البحث في الشئون السياسية واجاز لكم البحث في الشئون الادبية والفنية فقط وقد اطلعنا علي العدد ( ١٦ ) من مجلتكم فوجدنا فيه مقالا قد تضمن بحثا سياسيا الامر الذي يعد خروجا علي الخطة التي يجب ان تنهجها الجرائد والمجلات الادبية لذلك فاني انذركم بهذا ان تتعمدوا عن الخوض في الشئون السياسية وان تحصروا ابحاثكم في المسائل العلمية والادبية

توفيق

مدير المطبوعات

فەرمانی پووچکردنەوەی مۆڵەتی گۆڤاری زاری کرمانجی لە ١٩٤٩/٨/١٥دا بۆی دەردەچێت. حوزنی لە ١٩٤٧/٩/٢٠ دا کۆچی دوایی کردووە؛ یانی لەدوای نەمانیشی هەر لێی ناگەڕێن:

وزارة الداخلية
مديرية الدعاية العامة

الرقم ..........
التاريخ ..........

الى حضرة السيد ..........

صاحب امتياز جريدة ( زاركرمانجي ) المحترم

لقد قررت قيادة القوات العسكرية للادارة العرفية في العراق الغاء امتياز ... جريدتكم ( زاركرمانجي ) وذلك استنادا الى الصلاحية المخولة لها من قبل مجلس الوزراء بمقتضى المادة الرابعة عشرة من مرسوم الادارة العرفية رقم ١٨ لسنة ١٩٣٥ ، لذلك ينبغي الكف عن اصدار مطبوعكم حالا وألا فسوف تفرض عليكم العقوبات المنصوص عليها في المادة الخامسة عشرة من المرسوم المذكور والقوانين الاخرى .

وكيل مدير الدعاية العام

نسخة منه : الى وزارة الداخلية
" " " وزارة الدفاع (الشعبة الثالثة)
" " " قيادة القوات العسكرية للادارة العرفية في العراق بالاشارة الى كتابها المرقم ق ٠ ع/٠٠/١٣/٨٩٩٢ والمؤرخ في ٤٩/٨/١١
" " " مديرية الشرطة العامة
" " " متصرفية لواء ...... اربيل
" " " مديرية شرطة لواء .. اربيل
" " " المدعي العام
" " " المدير المسؤول السيد ..........
" " " مميزة المطبوعات العربية

بۆ زانیاری زیاتر بڕوانه د.کوردستان موکریانی. هۆی دەرنەچوونی زاری کرمانجی ڕۆژنامەی برایەتی. ژمارە ٢٧٥٣ پێنج شەممە ٧/١/١٩٩٩ هەولێر.

٥- دەکی نامەکەی بەهەشتی داماو بۆ بەهەشتی ساڵح زەکی بەگ:
شەرەفی حزووری سەعادەتی زەکی بەگی خۆشەویست(*).
ئیسترحام دەکەم ئەگەر زرووف مساعد بێت، ئەم نامەیە بخوێنەوە.
لە دوای عەرزی ئیحتیراماتی فایقەم، ئەمە سێ چوار جارە تەشریف دەفەرموونە ڕواندز، لەبەر ئەوە کە نەوەکو زرووف موساعد نەبێت، نەدەهاتمە زیارەت و ئەو جارەش کە هاتن، دیسان موراجەعەتی زرووفم کرد موناسیب نەبیندرا موشەرەف بم. ئەویش لە پاش شەو و نیوەڕۆیەک ئاگادار بووم. ویستم بەم دوو کەلیمە مەعروزاتەی -کە زرووف مەیدانی داوم- سکاڵایەکی دڵ و ڕاستەقینەیەکی سەربهوردم عەرز بکرێ، بەڵکم بۆ هاتوو ڕێگایەکی ژیانم دەستکەوێ.
ساحبی سەعادەت! وابزانم هەموو خاوەن وجدانێکی پاک و بەشەرەفی کورد لەمە ئاگادارە و شارەزای منن کە لە دنیادا هەر گوناهێکی، کە بەشەر لە خواوە وەیا هەر لە خۆیەوە بەگوناهی زانیوە خۆی لێ دوور خستۆتەوە و نەفرەتی لێ کراوە لە من دووربووە و جگە لە کوردی چ گوناهێکی دیکە لە من سادر نەبووە و نابێت. بەڵێ جگە لە پێغەمبەرەکان بەشەر بێ گوناه نابێ، بەڵام من لە هەموو گوناهان بەریم. خودا و خاوەند وجدانەکانیش شاهێدیم بۆ دەدەن.
بەڵام لە ڕۆژی من هاتوومەتە عیراق، هەر لە بەغداوە -کە ئێوە ئاگادارن- هەتا گەیشتوومەتە ڕواندز و هەتا ئەمرۆکە لە دنیادا گۆشە و قولینچک و کەلێنی ئیفترا و لە خودا نەترسی نەماوە کە لە من نسبەت نەدرابێت. والله وبالله جگە لە کورد بوونم، هەموو درۆ و گوناهێکە کە موفتەریبیەکان بۆ خۆیان تێدان؛ بەڵام چ بکەم؟ چۆن بکەم و بچمە چ خمخانەیەکەوە کە ڕەنگی سپی و خاوێنی خۆم شین و ڕەشکەم؟ ئیمان بە کێ بێنم کە ڕزگاربم؟ ئەمە پازدە ساڵە ئەم دەردە دەکێشم و بەدەرد و داغ و غەسسەوە دەژیم و شەو بەئاه و ناڵین سەر دەنێمەوە. دەبێ ئەم سکاڵایە لە کێ کەم؟ دەرمانی ئەم دەردە لە کێ بخوازم؟ پەنا ببەمە بەر کێ؟
سەعادەتی موتەسەریفی موحتەرەم، ئێوە ساڵێک لە بەغدا بەم دەردە گورفتار ببون(**) بە چ ئێش و ژان و سۆزشێکە چێشتووتانە و تێی گەیشتوون. ئەمنی بەدبەخت ئەوە پازدە ساڵە لەسەر یەک بەم دەردە گرفتارم و لە ئێوە بەسەد پایە پتر لە ژێر تەنگانی سەختی و فەلاکەتدا دەژیم. دەبێت چۆن بێت مابم؟ بزانن تا چ پایەیەک جەور دەکێشم.
ئەی خاوەنی وجدانی پاک! ساحبی سەعادەت! تۆ بە چی دڵشکاو بوو بیت، منیش وا. تۆ بە چی ئێشت پێگەیشتبێت، منیش وا. کەوابوو دەبێت لە حاڵی دڵشکاوان ئاگادار بیت؛ دەبێت شارەزای

---

(*) ساڵح زەکی ساحێبقران (١٨٨٦-١٩٤٤) لەو کاتەدا کە داماو ئەم نامەیەی بۆ نووسیوە، پارێزگار (موتەسەریف)ی هەولێر بووە و پێشتریش هی شاری سلێمانی (بڕوانە: د. کوردستان موکریانی، کەشکۆڵی گیو - ٩٨٥) - لاپەڕە ١٢٥ و ١٢٦.

(**) مەبەستی داماو ساڵی ١٩٢٦ـە کە ساڵح زەکی کۆڤاری «دیاری کوردستان»ی لە بەغدا دەردەکرد بەڕادەیەک دەستکورت بوو نەک هەر فەرش و ڕایەخ و کورسی و مێزی نەبووە، بەڵکو حەسیری تەواویشی نەبووە، کە بۆ سێ کەسانی ڕابخات (بڕوانە ژێدەری پێشوو).

نەبوونی و غەم و غەسە و ئەلەم و ئەزیەت کێشان بی. دەبێت ڕەحمت بەوانەدا بێت کە کەوتوون. تۆ سالێک لێت قەوما، چۆنت ڕابوارد لەبیرتە؟

ئەمن پازدە سالە دەیکێشم. ئەمە پازدە سالە ئامانجی هەموو بەلا و موسیبەت و دەردی سەری و ئەزیەت کێشانم. ئەمە پازدە سالە لە دەس جەور و ئیستیبداد و زولم وا پێبەست دەکرێم؛ بوومە هەدەفی ئیفتیرا و توهمەت و ئیفاداتی وا نە خودا و دەبێت من بەشەر و ئادەمیزاد نەبم، کە پازدە سالی ڕدبەق بەبێ پچڕانەوە، لە ژێر کوتەکی زولم و ئیفتیرا بتلۆخێمەوە و کەسێک بەزەیی بەمندا نەیەت.

هەر نسبەتێکی کە لە من دراوە کوا ئیسپاتی، جگە لە بێ وجدانی نەبێت؟ بۆچی لە نێوانی پازدە سالان هیچ مەئخەزێکی موفتەرییەکان ئیسپات نەبوو؟ لە هەموو لایەکەوە دەرگای ڕزق لە من بەستراوە. حورییەت و ئازادی شەخسیم مونسەلیبە. مەیدانی بزووتنەوەم پێستی خۆمە و تەنها سالی پێرار گوندێکم(*) بەئیجار گرت نەمتوانی تێیدا هەلسووڕێم؛ ئێستا پەنجا- شێست دینار لەژێر زەرەردام(**). نەتوانم حەمالی، چەقالی، زراعەت، کاسپی بکەم، دەبێت چی بکەم؟ ڕێگام نیشاندەن؛ چونکە ئێوە ئەمڕۆ حاکم و فەرمانڕەوای لیوای ئەربیل و وەکیلی مەلیکن. ئەگەر زرووف موساعەدەم بکات ئەوا ئیستیدعایەک، کە سورەتێکی تەقدیم کراوە بۆ ڕەیسی وزەرای عیراقی دەنێرم و ئەمە لە سەرەوەش سەربهوردێکی بەدبەختی خۆمە نووسیم. ئەگەر لەمانە ئەسەرێک و یان نەتیجەیەک پەیدا نەبێت، ناچارم لە دەست زرووف عەرز و حالێکی دووردرێژ تەقدیم بەبارەگای خوداوەندی پەروەردگار دەکەم کە بۆچی بەبێ زرووف تووشی ئەو هەموو موسیبەت و بەلا و شەرمەزاری و فەلاکەتەی کردووم و خستوومییەتە ژێر دار و فەلاقەکردنێکی وا کە زرووف موساعەدەم ناکات. مۆری موختارانیش هەلکەنم(***) و ناهێلێت بشبمە جووتیار و فەلاح و دارکێش و گاوانی گوندێکیش و دەست لە مەتبەعە و تەئلیفات و خوێندن و نووسین و زانین هەلگرم، لە دەست عەدالەت پەنا بۆ جەهل و [لە] دەست زرووف بۆ وەحشەت و نەزانین فێرکەم. ئاه سەد ئاه.

حوسێن حوزنی بەدبەخت - (١) ی ئەیلولی ١٩٣٩

---

(*) داماو لە پێناو چارەکردنی باری ئابووری خۆی گوندی چەمی سایەی سەر بەبرادۆست و گوندی مامە خەتیبانی سەر بەبالەکی لە گولزار خانمی خێزانی سەید تەها قایمقامی پێشووی ڕواندز بەکرێ گرتووە.

(**) هەروەکو لە دەستنووسی برادەرێکی ڕواندزی دیارە کە لەنێو ئەرشیفی مالەوەماندا چەند لاپەڕەیەکی پارێزراوە دەلێت: لەو کاتانەدا، کە داماو بەروبوومی کشتوکالەکەی دەهێنا نێو شاری ڕواندز بۆ ئەوەی بیفرۆشێت، گومرگی ڕواندز لێی وەردەگرت و دەیگوت تۆ شتی قاچاغت پێیە و نابێت بیبەیتە نێو شار. لەبەر ئەم ڕەفتارە چەوتەی فەرمانبەرانی گومرگ، داماو دووچاری قەرزێکی زۆر بوو.

(***) چەند جارێک داماو داوای ئەوەی کردووە، کە مۆلەتی مۆرهەلکەندنی بدەنێ؛ نە سالح زەکی و نە دەسەلاتدارانی دی نەیانداوەتێ، بەلام مۆلەتی مۆرهەلکەندنیان بەو کەسانە داوە کە داماو فێری مۆرهەلکەندنی کردوون.

٦- پ. د. مارف خەزنەدار بەم جۆرە باسی ئەو بەرهەمانەی حوزنی دەکات کە لە دەنگی گێتی تازەدا بڵاوی کردوونەتەوە: حوزنی کارگەرێکی بەکار بوو لەو کۆوارەدا. چیرۆک و وتاری ئەدەبی دەنووسی؛ تێکستی ئەدەبی میللی سەرزاری (فۆلکلۆر) لە شیعر و نووسینێکی عەرەبی و فارسی بۆ زمانی کوردی. ناوەرۆکی نووسینەکانی لە بابەت ژیانی رۆژهەلاتناس و پیاوە سیاسییەکانی سەردەمی جەنگی دووەمی گێتی و شاعیرانی کلاسیکی ئینگلیز و هی دیکە بوو.

نووسینی حوزنی لە دەنگی گێتی تازە، لە پلەیێکی بەرزی هونەریدا بوو. چونکە لە تەمەنێکدا بوو زانست و زانیارییێکی زۆری وەرگرتبوو بەهۆی کۆششی خۆی و و تاقیکردنەوەکانی لە مەیدانی مێژوو و رۆژنامەنووسیدا. (دکتۆر مارف خەزنەدار. مێژووی ئەدەبی کوردی. بەرگی پێنجەم. هەولێر ٢٠٠٥).

هەژاری موکریانی بەم جۆرە باسی گۆڤاری «دەنگی گێتی تازە» دەکات:

«... لە رووپەرێک و دوواندا خەبەری شەڕ و لە پتر حەفتا رووپەڕدا فۆلکلۆری کۆنی کوردی زیندوو کردۆتەوە. شیعری شاعیرە باشەکانی لە چاپ داوە. ئێستاش هەر کەس هەموو ژمارەکانی لابێ، زۆر بەختیارە و زۆر مەعلوماتی باشی لێ دەست دەکەوێ». (هەژار. چێشتی مجێور. پاریس ١٩٩٧. لاپەڕە ١٢٢).

٧- شەهید شاکر فەتاح بەم جۆرە داماو هەڵدەسەنگێنێت:

«... پێیان دەگوت: ناپاکە؛ بۆ کەڵکی ئینگلیزەکان ئەجوولێتەوە. پێیان دەگوت: خۆفرۆشە و بۆ کەڵکی ناپوختەی خۆی کەڵکی گشتی ئەخاتە ژێر پێیەوە. پێیان دەگوت: بەلێشاو پارە لە ئینگلیز وەرئەگرێ و نۆکەرێکە لە نۆکەرەکانی ئینگلیز. جارێکیان هەندێ لە مەلاکانی رەواندز بریاری خوانەناسی و کوشتنیان دا. جارێکیان مەرسەربرێکیان لێ هان دا تێرووپڕ جنێو و قسەی ناشیرینی پێ گوت. جارێکیان کردیان بەدز و توندیان کرد لە بەندیخانە و دایشیان بەدادگاە و دووریشیان خستەوە لە رەواندز».

ئینگلیزەکان لەو سەردەمەدا دەسەلاتیان زۆر بوو بەسەر عیراقدا. بەلێشاویش پارەیان ئەدا بەپیاوەکانی خۆیان. جا ئەگەر «حزنی» پیاوی ئەوان بووایە، بۆچ لەم هەموو ساڵانەدا بەهەژاری و دەستکورتی و نابووتییەوە دەژیا؟... یاخود چۆن فەرمانبەرانی عیراق ئەیانوێرا بەو جۆرە تەنگەتاو و ریسوا و سەرگەردانی بکەن؟ پیاوێک ئەگەر خەریکی کار و فرمانی ئینگلیز بێ، بۆچ خۆی بەنووسین و چاپکردن و بڵاوکردنەوەی نووسراوانەوە خەریک ئەکات کە تا ئێستاش هیچ نووسەرێک، بەو بابەتانەوە ژیان و گوزدرانی بۆ بەرێوە ناچێ؟

لە سەرێکی تریشەوە، ئەگەر «حزنی» بۆ کەڵکی تایبەتی خۆی بگەڕایەو بەتەنگ چاکەی خۆیەوە بووایە، ئەیتوانی زۆر بەئاسانی ببێتە فەرمانبەرێکی شایستەی خۆی کە بتوانێ بەمووچەیەکی شایستەوە خۆی و خێزانەکەی لەوپەڕی خۆشگوزدرانیدا بژی؛ چونکە ئەو سەردەمە خوێندەوار و تێگەیشتوو و جیهان دیدەی وەک ئەو کەم هەبوو. فەرمانڕەوای عیراق خوا خوای بوو یەکێکی وەک

ئەو ببێ بەفەرمانبەر تا کەڵکی لێ ببینی. ئەو لە ساڵی ١٩٢٦ دا گەیشتە ڕەواندز. گەلێک پیاوی گەورەی ئەناسی لەناو کورد و لەناو بێگانەدا کە دەیانتوانی بۆی تێبکۆشن و دایمەزرێنن لە دەزگایەکی نایابی میریدا. بەڵام «حزنی» خۆی لە فەرمانبەری نەگەیاند، چونکە ئاواتی هەرە نازداری ئەو ئەوە بوو کە لە ڕێگای نووسراودانان و نووسراو چاپکردن و نووسراو بڵاوکردنەوە، هەروا لە ڕێگای وتاردانەوە، لەناو کۆڕە نەتەوەییەکاندا، کورددوارییەکەی لە خەو ڕاپەڕێنێ و زیندووی بکاتەوە و بیریشی ڕۆشن بکاتەوە و ڕێگای سەربەستی و کامەرانی و سەربەرزیشی پیشان بدات. بەواتایەکی تر «حزنی» بۆ بیروباوەڕەکانی دەژیا، بۆ خۆی نەدەژیا. گوێی نەدەدایە پێویستییەکانی کامەرانی و خۆشگوزەرانی خۆی؛ گوێی دەدایە ئامانجە گشتییەکانی خۆی کە بریتی بوون لە ڕزگاربوونی کورد لە دەست هەژاری و نەخوێندەواری و نەخۆشی و ژێردەستی.

جا پیاوێکس ئەمانە ئاوات و ئامانجی بووبن و ئەمانە ڕێگای خەباتی بووبن، دەچێ دەبێ بەپیاوی ئینگلیز یاخود داگیرکەرانی نیشتمانەکەی خۆی؟

لە ڕاستیدا «حزنی» وەک هەموو ڕۆشنبیرێکی شۆڕشگێڕ، بەئاشکرا و بەنهێنی تێ دەکۆشا بۆ ئەوەی دۆست پەیدا بکات بۆ نەتەوەکەی خۆی، لە گەورە پیاوانی خۆیی و بێگانە. تا لە کاتی پێویستا بۆ کەڵک و چاکەی نیشتمانەکەی خۆی ئەو دۆستایەتییەیان بەکار بهێنێ. لەناو ئینگلیزەکانی ئەو سەردەمەیشدا هەندێ دۆستی پەیدا کردبوو، وەک «ئەدمۆندس» کە ئەوسا ڕاوێژکاری کاربەدەستی ناوەوە، (واتا موستەشاری وەزارەتی داخلیە) بوو. ئەمانە دەهاتنە ڕەواندز «حزنی»یان وەک پیاوێکی کوردی زانا و ڕۆشنبیر دەهاتە پێش چاو. دەهاتنە سەردانی چاپخانەکەی و باخچە جوانەکەی لە ڕواندزدا و دەبوون بەئاشنای لە شارەزاییەکەی لەوێژە و مێژوو و کۆمەلایەتیی کورددا کەڵکیان وەردەگرت. جا «داماو» کە فەرمانبەرەکانی عیراق تەنگەتاویان دەکرد، بەناچاری پەنای دەبردە بەر ئەو دۆستە ئینگلیزانەی تا ڕزگاری بکەن ئەوانیش لە سنووری دەست ڕۆیشتنی خۆیان و یاسادا یارمەتییان دەدا؛ چونکە خۆیشیان لە فەرماندارانی عیراق بوون.

«حزنی» لەناو ڕووسەکانیشدا گەلێک ڕۆژهەڵاتناسی گەورە گەورەی دەناسی و نامەکاریشی لەگەڵدا دەکردن؛ وەک «ف.مینۆرسکی» و «ب.نیکیتین». هەروەها ڕۆژهەڵاتناسێکی ئەڵمانیشی دەناسی ناوی «کارل هەدەنگ» بوو نامەکاری لەگەڵدا دەکرد. لەناو کوردەکانیشدا «جەلادەت بەدرخان، کامەران بەدرخان، فرج الله زکی کوردی، محمد امین زکی، تۆفیق وەهبی، ڕەفیق حلمی، مەلا گچکەی هەولێر، مەلا محمدی کۆیە، شێخ محمودی مەزن، شێخ ئەحمەدی بارزانی، مەلا مستەفای بارزانی، سەید تەهای شەمزینی، قازی محمدی سابڵاخ»، کە هەموویان پیاوی کەڵە کەڵە و ڕۆشنبیر بوون. داماویان خۆش دەویست و ڕێزیان لێ دەگرت و ئەگەر کارێکیشی بکەوتایە لایان، یارمەتییان دەدا.

بێجگە لەمەش من وام دێتە پێش چاو کە «داماو» تێکەڵی لەگەڵ زۆربەی بزووتنەوە نهێنییەکانی کورددا هەبوو؛ دوور نییە کە ئەندامیش بووبێ لەناو هەندێ لەو کۆمەڵە نهێنییانەدا.

جا پیاوێکی وەک ئەو ئەگەر پەیوەندی لەگەڵ گەورە پیاوان و دەسەڵاتدارانی کورد و بێگانەدا پەیدا نەکات، چۆن کار و فرمانە گشتییەکانی خۆی و کۆمەڵەکانی خۆی پێ جێبەجێ دەکرێ؟ جا لە پێش شەڕی یەکەمی جیهانی و پاش شەڕەکەیشدا هەتا ئەم چەند ساڵەی دواییە ڕۆشنبیرەکانمان لەو باوەڕەدا بوون کە لە تواناڎا هەیە کەڵک لە فەرمانڕەواییە بێگانەکان وەربگیرێ بۆ کاروبارە گشتییەکانی کورد و کوردستان. لەبەر ئەمە نەک هەر «حزنی»، زۆربەی ڕۆشنبیرەکانی تریش تێکەڵییان لەگەڵ ئینگلیزەکان و فەرەنسزەکان و ڕووسەکان و ئەمریکاییەکاندا دەکرد بۆ مەبەستی گشتی کوردەواری.

جا لەبەر ئەم هۆیانە هەموویان، من لەو باوەڕەدام کە داماو هەر تێکەڵییەکی لەگەڵ ئینگلیز یاخود بێگانەکاندا کردبێ، بەنیازی پاک بووە، نەک خراپ. واتا بۆ کەڵکی کوردەواری بووە، نەک بۆ کەڵکی تایبەتی خۆی. ژیانە پڕ ئەرک و ئازار و هاوارەکەی و بەرهەمە گەورە و گرنگەکانیشی بەڵگەن بۆ ئەوەی کە حزنی یەکێک بووە لە نیشتمانپەروەرە گەورەکانی کورد کە بلیمەتییەکەی خۆی و وێژەوانی و زانایییەکەی خۆی تا ما، بۆ کەڵکی کوردەواری و کوردستان تەرخان کرد». شاکر فەتاح ١٩٧٢.

٨- ئەو بەڵگەنامەیەی لە ژێرەوە بەوێنە دەیهێنمەوە، ئەو قسەیەی کاک دلێر علی ئاغا پشتڕاست دەکات کە لە ١٩٩٨/١٢/٢٨ دا لە ژووری بەهەشتی مەهدی خۆشناو ـ جێگری پارێزگاری هەولێر و سەرۆکی یەکێتی نووسەرانی کورد- پێی گوتم: خەڵکی ڕەواندز پشتگیرییان لە حوزنی کردووە، نەک دەسەڵاتداران.

دەقی ئەو نووسراوەی کە خەڵکی ڕواندز بۆ پشتگیریکردن لە بەهەشتی مامم نووسیویانە بەبێ دەسکاری دەیخەمە ڕوو:

٩- حوزنی لە وتارێکیدا کە لەژێر سەردێری «کورد لە ڕوسییەدا» بڵاوی کردۆتەوە، باسی ئەو بنەماڵەیە دەکات و نێوی ئەو جێگایانە دەبات کە کورد تێیدا نیشتەجێ بوون؛ هەروا باسی ئەشیرەت و سەرکردە و جۆری خوێندنیان دەکات. (گۆڤاری گەلاوێژ. ژمارە ٦٠ ساڵی ١٩٤٤).

١٠- حوزنی بەم جۆرە باسی ئەو چاوپێکەوتنە دەکات:

«... کە گەیشتمە سەر پردی جوندیان دوو پۆلیس لەوبەری پرد ڕاوەستابوون؛ ڕایانگرتم و دایانبەزاندم لە پیادە ڕێوە سەریان خستم. کە دیم تەحسین قەدری بەگ ڕاوەستابوو چاوەنواڕی منی دەکرد. چوومە پێش و ڕۆژباشم لێی کرد و پێشم کەوت. هێندێک ڕەوشتی نیشان دام کە گوایا من ناشارەزام و پیاوانی گەورەم نەدیوەو نەچوومەتە دیوانی سەرهات و ناودارانەوە و منیش هەر بەڵێم بۆ دەگوت و دەڕۆیشتم و تەماشای دەوروپشتی خانووبەرە و کۆمەڵەکانم دەکرد. چاوم پێکەوت کە ئەمین زەکی بەگی کوردی سلێمانی وەزیری ئیقتیساد و مواسەلات و ئەشغالی عیراق لە تەنیشتییەوە لە لای ڕۆژئاوای دیواری خانووبەرەکە ڕاوەستابوو؛ تەماشای منی دەکرد و بەقامکی ڕاستی ئیشارەتی بەمن دەدا کە زبانی خۆت بگرە و ئاگاداری گفتوگۆکردن بە دەستی بەزارەوە دەگرت و لەگەڵم خەریک بوو».

«... چوومە پێش و قسەکانی تەحسین قەدریم بەهێند نەگرت و بەئیشارەت و قامک گەزتنی ئەمین زەکی خۆم دانەچڵەکاند. بەدەستووری موسڵمانانە نزیک بەپێشگاهی مەلیک کە بوومەوە دەستی ڕاستم بڵند کرد و گوتم: السلام علیکم و کورسییێک لە نزیک داندرابوو، چووم دانیشتم. چاوەنواڕی فەرمانی جەلالەت مەئابیانم نەکرد، مەلیک نەرمە کەنینێکی گرت و کەمێک بەسەر چوو. جوابی سلاوەکەی دامەوە و گوتی: مرحبا و بێ دەنگ بوو. لە دوای دوو دەقیقە ئەحوال پرسی کردم و لە مەتبەعە و مەتبوعات و تەئلیفەکانی پرسیم و پێم گوت کە زۆر باشە و هێندە جلد مجەلەی زاری کرمانجی نەشر بووە و چەند کتێبێکی تاریخی کوردان و ئەدەبی و ئیجتیماعیشم لە چاپدراوە و ناوی کتێبەکان و فهرەستیانم پێگوت لە نێوانی من و ڕەزا بەگی پرسی کە چۆنین. گوتم: زۆر باشین و ڕەزا بەگ مادام قایمقامی مەلیکە، چاک و دادگەر و بەکردەو ڕەعیەتپەرەوەر و قانوونی و ڕاست و سادقی حکوومەتە، هیچ قسووری و عەیبی لێ نابینم».

گوتی: لەگەڵ تۆ و مەتبەعەکەت چۆنە؟ گوتم لەگەڵم بەمیهرەبانە و زۆر ئارەزووی پێشخستن و دارایی مەتبەعەکەم دەکات و کتێب و مەتبووعەکانم بەهۆی ئەوەوە نەبێت ناسووڕێت.

هەرچەند قسەکانم بەر ئاوەژووی کردەوەی ڕەزا بەگ بوو، بەڵام لەمەدا مەبەسی من ئەوە بوو پیاوێکی کورد نەشکێنم و لەسەر دەستووری خۆم -کە پاشەملە خراپی کەسم بەزبانمدا نەهاتووە- نەمویست لە حزووری مەلیکێکی گەورە، باسی خراپی هیچ کەسێک بکەم؛ بەتایبەتی ڕەزابەگ، کە کوردێک و لە بنەماڵەیەکی گەورەی سلێمانی بوو، چۆن بەزبانم دادێ بەخراپی لێی بدوێم.

لە پاش ئەوە هەڵی دایە کە تۆ لەگەڵ گەورە و سەرهات و عەشایری کورد تێکەڵاوی لەگەڵ شێخ ئەحمەدی بارزان و پژدەری و شێخ مەحموود زۆر ڕێک و دۆستن و هەواخوانی ئەوانی. هەمیشە بۆ

کوردایەتی تێدەکۆشی و هەموو کوردێک تۆیان خۆشدەوێت. ڕەزا بەگ هەمووی بەدوور و درێژی بۆی گێرامەوە.

گوتم: بەڵێ لەبەر ئەوە. کە بەپشتیوانی قانوونێکی بەمیللەتی نەجیبی کوردتان بەخشیوە و میللەتی کوردتان بە شەعبێکی موهیمی عیراق داناوە و تەشکیلاتی حکوومەتی عیراق لە دوو عونسری نەجیب و بەهێزی کورد و عەرەب دراوەتە ناسین و قانوونی لوغاتی مەحەلییە بۆ میللەتی کورد تەتبیق کراوە، مەجەلە و نەشریاتم بەزبانی کوردی بوون و منی بەهەموو کوردێک داوەتە ناسین و لەبەر ئەمە، کە یەکەمین کوردێکم کە تاریخی کوردانم بەزبانی کوردی نووسیوە و بەناوی جەلالەت مەئابتانەوە چاپ و بلاوم کردۆتەوە و حکوومەتی خۆشەویست ئیمتیازی داوم. دیارە کە گەورە و سەرهاتەکانی کورد دەبێ خۆشیان بوویم و مادام لوتف و مەرحەمەتی ئێوەم لەسەر بێت پتر خۆشەویست دەبم.

١١- ڕەزا بەگ ئیسماعیل بەگ زۆر هەوڵی داوە کە حوزنی ئەو چاپخانەیە بەرێتە سلێمانی، تاوەکو ئەو ناوبانگەی حوزنی لە سلێمانی دەنگ بداتەوە، نەک لە ڕواندز. مامم لەو باردیەوە نووسیویەتی و دەڵێت:«... بەزبان لە گەلێک مەجلیسدا بەئاشکرا پێی دەگوتم و بەئەسەفێکەوە دەینواند کە پێویستە تۆ بچیتە سلێمانی؛ لە ڕواندز چی هەیە؟ لەوێ مەتبەعە دامەزرێنە و لەگەڵ نەوجەوانەکانی ئەوێدا پێکوەرن».

حوزنی بەگوێی ڕەزا بەگی نەکردووە؛ بەڵام ئەم هەڵوێستەی زۆر خراپ بەسەریدا شکاوەتەوە. حوزنی دەڵێت: پووچکردنەوەی مەتبەعە و نەبوونی و لەناوچوونی من، لە کنی ببوو بەشەرتی ئیمان و باوەڕی.

**کوردێکی چارەڕەش یان کوردێکی بێ پشتیوان.**

حوزنی زۆر هاوچەرخانە بیری کردۆتەوە و هەوڵی داوە کە لەهەر شارێکی کوردستان چاپخانەیەکی تێدا دابمەزرێت لەبەرئەوەی ئەو وای بۆ چووبوو کە پێشکەوتنی هەر میللەتێک لە دوو بنەما خۆی دەنوێنێت؛ یەکەم چاپەمەنی؛ دووەم: قوتابخانە. (زاری کرمانجی ژمارە١. بەرگی ژمارە ٢ . ساڵی ١٩٢٦).

١٢- حوزنی لە وەڵامدا دەڵێت: ڕاوەستام و دەستم لەسەر تەختە مێزەکە دانا و گوتم: جەلالەت مەئاب مەلیکی گەورەو خۆشەویستمان! ئەم مێزە تەختەی یاری بوو؛ ئێمەی کورد لە لایەکەوە و ئێوەش لە لایەکی دیکەوە بۆ بردنەوە لەتەردەستیدا بووین، تێدەکۆشاین. ناڵێم نەمانزانی و تێنەگەیشتوو بووین و ئێوە لە ئێمە ئازاتر و تەردەستتربوون و بردتانەوە. بەڵام پشتیوانی ئێوە بەهێزبوو، پشتی لە ئێمە ئەستاند بوو، بەزۆر بەئێمەی دایە دۆڕاندن، پەرێشانی کردین. ئەو دۆڕاندن و پەرێشانییەیە منی ناچارکردووە. کە پەنا بۆ بارەگاهی بەرزی جەلالەت مەئابتان بێنم و لەپێش دەستتان ڕابوەستم.

١٣- حوزنی نووسیویەتی: چووەمە سەفارەتی تورکیا. سەفیر ناوی لوتفی بەگ بوو؛ قبوڵی کردم و زۆر میهرەبانانە نوازشی نواند. لەپاشان گوتی: هەرچەند تۆ تورکت ناخۆش دەوێن، دیسان ئێمە باوەشی

خۆشەویستیمان بۆت کردەوە. ئەو قسەیە وشیاری کردمەوەو لەدڵی خۆمدا گوتم ئەمانە لەگەڵ مندا دڵیان پاک نییە و تووشی ئازار و نەبوونیم دەکەن. بەزبان سوپاسی لوتفی لوتفیم کرد و دەرکەوتم.
کە لە سەفارەتی تورکیا دەرکەوتم، ئەندێشە و بیر و خەیاڵم هەڵی گرتم و لێکم داوە. هەستام چوومە سەفارەتی فەرەنسا؛ ئەگەر چی فرەنسێکانیشم خۆشنەویست، چونکو کە لە سوریا بووم لە ڕووی وەحشەت و زوڵمەوە ڕێی خەتی ئاسنینیان دا بەتورکەکان، سەرەتای ۱۹۲۵ تورک لە تخوبی سوریەوە بەڕێگای ئاسنی فرەنسەدا لەشکری ناردە سەر کوردەکانی شیمال. ئەگەر ئەو یارمەتی تورکی نەدابایە هێندە کوردی مەزڵووم بەدەست تورکی زاڵم نەدەکوژرا؛ هەتا خۆم بەزبان بەجەنەراڵ غورۆی عەمیدی سامی فرەنسەی سوریام گوت: کورد لە لاپەڕەی تاریخی خۆیدا ئەو سەربهوردە ڕەشە بەخوێنی خۆی دەنووسێتەوە.
سەفیری فەرەنسا تەبەعییەی قبووڵ کردم. ڕۆژی یەکشەممە بوو، گوتی سبەینێ وەردەوە عەریزەیەک بدە تەزکەرەی ئیقامەتت پێ دەدەین. لە لای سەفیری فرەنسا، کە دەرکەوتم، کردەوەی فرەنسەکانی سەریەی کە لە حەقی کورداندا کردبوویان وەبیرم هاتەوە؛ دڵگیربووم و لەنێو دەریای ئەندێشەدا بڵقم دەخوارد و دەچووم. هەر بەو دڵگیری و غەمەوە لە پردی مۆدی بەغدا پەڕیمەوە بەری کەرخ. بەبەر سەفارەتی ئەمریکادا چووم. گوتم پەنا بۆ سەفیری ئەمریکا ببەم، ئەمە لە هەمووان چاکترە. چوومە بەردەرگایەکە پرسیارم کرد، لەبەر ئەوە کە یەکشەممە بوو، سەفیر لە جێی خۆی نەمابوو. لەوێوە بەدڵپەرێشانی و شپرزەیی گەڕامەوە جێگای خۆم کە لە ئوتێل ئەندەلوس لە گەڕەکی مەیدان بوو. چوومە ژوورەکەمەوە لەسەر پشت درێژ بووم و کەوتمە بیرو ئەندێشە و خەیاڵی پارەسازییەوە، هاتف لە ناکاو پێی گوتم:
دەرگای بەرزو جێگای ئومێد کە هەبێت موستەشاری وەزارەتی داخلیە کۆرنەوالیسە. هەرچەندە لە نێوانی سێ مانگ و نیو، کە لە بەغدا بووم نەچووبوومە لای یەکێک نە لە کوردەکان و نە لە ئینگلیزەکان، هەموو پەناو تەشەبوس و پاڕانەوەم لەبەر کاربەدەستانی عەرەب بوو کە ئیشم کۆتاهی بێت و تووشی گرێ و گۆڵ نەبێت، ئەوانیش هیمەت و غیرەتیان ئەوەندە بوو کە ناچاری پەنابردنی سەفارەتی تورک و فرەنسە کرام. (بروانە دەستنووسی: کوردێکی چارەڕەش یان کوردێکی بێ پشتیوان).
١٤- لە بارەی ئەدمۆندس و خۆبەوە ئەمەی نووسیوە: لەوەپێش دەیناسیم؛ ناسینێکی عیلمی و تاریخی بوو. تەئلیفەکان و کتێبەکانی منی زۆر باش خوێندبووەوە و حەزی لە تاریخی کورد دەکرد و بۆ خۆشی یەکەمین تاریخناسی کورد و زبان و ڕەوشتزانی کوردناسە و لە بابەت کوردانەوە نووسین و تەئلیفاتی هەن و بەهۆی تاریخناسییەوە منی خۆشدەویست و باوەڕی پێ کردبووم کە کوردێکی پەتی و نووسەر و موئەڕیخ و موئەلیفێکی بێ گرژوگۆڵ و بێ قرێژ کوردم و بەدەست و قۆڵ و کردەوەی خۆم دڵگەرمم و پشت و پاڵم بەکەسەوە نەداوە و هیچ ئومێدگاه و دەستگیر و یاریدەدەرێکم نییە و لە خۆم بەولاوە، دەستم بەکەسێکەوە نەگرتووە و کەسێکیش کۆمەکیم ناکات و بەوەش دڵنیا بوو لە تەئلیفات و

مەتبوعاتی کوردی بەولاوە بەهیچی دیکە دڵخۆش نابم و ئیشم بەهیچی دیکەوە نییە و جگە لە تاریخی کورد نووسینەوە و مەتبەعە بە چی دیکە خۆ خەریک ناکەم و نەمکردووە.

١٥- ئەمەم هیچ لەبیر ناچێت و هەردەمێک وە بیرم بێنمەوە پێی دڵگیر دەبم کە چوومە ڕواندز، لە ڕێگا هەر لە هەولێرەوە بارانێکی توند و بەرێژنەم بەسەردا باری و ئوتومبیلەکەم ڕاست چوو لەبەر دەرگای ڕەزا بەگ ڕاوەستا. کە دابەزیم، ڕەزا بەگ لەدیوەخانەکەیەوە تەماشای دەکردم. نەچوومە لای، سڵاوێکم لێی نەکرد. ئەوەم لێ بوو بەداخ؛ چونکو کەوتبوو، تەقاعود کرابوو. منیش بەئارەزوو گەڕابوومەوە. بۆ دڵخوازی ئەو دەبوایە کە دابەزیم، بچمە لای و دڵخۆشی بدەمەوە. بەڵام لەبەر ئەوە کە هەموو لەشم تەڕبوو، سەرماش کەسیرەی کردبووم، ئەو نوکتەیەم لەبیرچوو و بەهەڵەدرام؛ بوو بەمایەی ئەوە کە ئیدی لە پاشانیش شەرمم کرد بچمە لای و چاوم پێی بکەوێت.

بەڵام لەوەپاش هەتا ئەمڕۆکەش، لەپێش چاوی حکوومەت کە ناحەز کرام و هەر مەئمورێک هاتە لیوای هەولێر بۆ سەرکەوتنی خۆی منی کردۆتە ئامانج و دووچار بەئەزیەت و ئازاری کردووم، بناخەی ئیفتیراو توهمەتەکانی ڕەزا بەگ، کە بەبێ زبان و قەڵەم پارازتن و بەبێ وردبوونەوەی لە وجدان و ئینساف و عەدالەت بەمنی کردووە و لە هەموو کۆمەڵەیەک و...دا بەخراپی لێم دواوە؛ بەدڵپیسی بەدناوی کردووم، بۆم بۆتە کراسێکی ڕەش و هەر کەسێک هاتووە، هەریەک بێ ئەندێشە و وردبینی خستوومیەتە زار و زبانانەوە و تووشی دڵگیری و زەرەر و زیانی کردووم و پیاوێکی بە وجدان مودافەعەشی کردبم، بێ سوود بووە و هەر گەورەیەکی مەئموورانی لیوا بۆ لابردنی ئەو لەکەیە لە ڕووی ئینساف و مرووەتەوە کە تەقەلاشی دابێت، بێ کەڵک ماوەتەوە.

١٦- نووسراوی حوزنی:

١٧- بەبۆنەی دابەشکردنی ئارد و پارە بەسەر قوتابیانی ڕواندزدا بەڕێوەبەری قوتابخانە و عەلی سەرودەت و حوزنی وێنەیەکیان لەگەڵ قوتابیان گرتووە و بۆ باڵیۆزی بریتانیایان ناردووە. حوزنی دەڵێت: ئەم دوو ئیشە نەختێک ساردی خستە نێوانی من و عەلی سەرودەت و من لە داخان نەخۆش کەوتم.

١٨- ڕێگای ڕەزان بۆ چۆم باڵۆک و بۆ بەرسرین درایە میر سادق میری ڕۆست. ئەو لەگەڵ حاجی سەعید بوونە شەریک، سەنەد پێکدرا.

ڕێگای چۆم باڵۆک و بیشە و ناو ڕۆین درایە قادر بەگی ڕۆست لەگەڵ مندا بووە شەریک و سەنەدمان دا بەیەکدی.

ڕێگای بابشتیان مەلا وەسۆ ئاغای باڵەکیان و عبدولسەتتار ڕواندزی وەریانگرت لەگەڵ حاجی سەعید سەنەدیان پێک دا.

ڕێگای دیانان و سەری بەردی درا بە من و ئەحمەد بەگ بەگۆک و ڕەئیس تۆمای ئاسووری و سەنەدمان دا یەکتر.

ڕێگای سەری بەردی و سیدەکان و بیرکمە - مەحموود خەلیفە سەمەد برادۆست وەری گرت و من و مەحموود بەگ سەنەدمان دا یەکتر.

ڕێگای ڕەزانۆک و چۆمە ڕیخن، ئەوڕەحمان حاجی نەورۆز و شاکر ئاغای ڕەواندزی وەریان گرت و لەگەڵ حاجی سەعید بوونە شەریک.

ڕێگای چۆمە ڕیخن و خانەقا و سەرنەوس، شێخ محەمەدی ئاغای باڵەک وەری گرت و لەگەڵ حاجی سەعید بوونە شەریک.

ڕێگای خەلیفان و ئالانە درا بەخدر ئاغای سەرچیا و من کرامە شەریکی خدر ئاغا.

ڕێگای خەلیفان و کۆرەک درایە نوری باویل ئاغای ڕواندزی و حاجی سەعید کرایە شەریکی.

ڕێگای بیاو درایە سالح ئاغای حەیدەری و شەلەموونی برای مەترانی ئاسووری، حاجی سەعید بوو بەشەریکیان.

ڕێگای هەوارە کۆن و ماویلیان و دەرگەڵە درایە حاجی محەمەد عەلی ئاغا و میر محەمەد ئەمین بەگ دەرگەڵە؛ بەڵام نە من و نە حاجی سەعیدیان نەکردینە شەریک.

١٩- حوزنی نووسیویەتی: مستەفا کوڕ، خەڵکی سلێمانی بۆ لای خدر ئاغای برد. شێخ حوسێن خەڵکی سلێمانی لە لای مەلا وسوو ئاغا و عبدولسەتار داندرا. ئاغا شوکر خەڵکی خانەقین، لە لای میر سدیق دامەزراندن. قالەڕەش خەڵکی خانەقین، ناردرایە لای مەحموود بەگ. خەلیفە ڕەئیسی برادۆست و مەحموود قەرە ودیس مان ناردە لای قادر بەگی ڕۆست و مەسرووفی ڕێگا و پێشەکی دراو و ئوتومبیلیان لە منەوە پێدراوە، ئەویش بە موافەقەتی عەلی سەرودەت کە لە نەتیجەی حسابدا پێم بدرێتەوە.

٢٠- حوزنی بەم جۆرە ڕوونی کردۆتەوە:

١- عەلی سەرودت بەهۆی مەلا وسو ئاغای هەودیانەوە کارکەرەکانی هان دەدان کە هەر ڕۆژە تا ڕۆژێک سەرکێشی بکەن و لە ئیش بگەڕێنەوە و ئەگەر ئیشیش بکەن سەعات ٩ و ١٠ بێنە سەر ئیش و ئێوارەش زوو دەست لەکار بەردەن و هەر ڕۆژەی بیانوویەک بگرن.
٢- هەموو کارکەرەکان -کە نزیک سێ سەد و پەنجا کەس بوون- سەدو پەنجا گوێدرێژ و ئێستر و بارگیر بەرد و زیخ و چەوی دەکێشاوە لە مەیدانێی تەنگ گری درابوون؛ بێجگە لە ڕەشایی و زۆری بزووتنەوە و ئیش نەدەدیترا.
٣- لەهەموو قۆنتراتەکانی دیکە بەردی بچووک وەردەگیرا. تەنها ئێمە دەبوایە هەموو بەردەکانمان گەورە بن. ناچار لە ڕێگای میل و نیوێک دوورەوە بەرد دەکێشراوە و....
٤- لەسەر ڕێگای هەر دەستە کارکەرێک هێندێکیاندا دانابوو، ڕۆژی چوار پێنج جار کارکەریان لە ئیش دەکرد؛ لە لاوە بۆ ئەولایان دەبرد و لە لاوە بۆ ئەم لایان دێنان و...
٥- یەک دوو میل ڕێگا بەپانایی ٢٢ فووت ڕیزەبەردی ئینج و نیوی بەپێنج ئینج بەرزی تێ کرا و سێ چالێی زلی دەوروپشتی گوندی دیانان یان پڕکردەوەو گەلێک جێگایانیان پێ ساچمە ڕێژ کردم پارە و فلوسێکیان بۆ حساب نەکردم.
٦- لەڕاست و چەپی ڕێگاوە جۆگەیان بەدرێژایی پێ بریم و ئەوەش نەخرایە ژمارە و حسابەوە. هەموو مەسرووفەکە لە کیسی من چوو.

٢١- حوزنی لیژنەیەکی لەم بەڕێزانەی کەناویان لە خوارەوە هاتووە، پێک هێنابوو:
- عەبدولحەکیم- بەڕێوەبەری قوتابخانەی دیانان.
- مستەفا ئەفەندی- مەئموری ئیستیهلاک.
- محەمەدی کوڕی قادری ڕواندزی- بازرگان.
- عەبدولکەریم- کاتبی ئەحمەد بەگ بەگۆک.
- عەلی کوڕی دەروێش عەبدوڵلای.

لەرۆژی یەکشەممە ڕێکەوتی ٢٠٠٥/٦/١٩ دا لە ڕواندز سەرێکم لە بەڕێز عەلی دەروێش عەبدوڵلا- ناسراو بەعەلی مەکتەبە- دا. لە نێو قسەکانیدا لەوە دوا کە ئەو موعتەمەدی حوزنی بووە و لەکاتی جێبەجێکردنی پرۆژەی کردنەوەی ڕێگاکانی نێوان ڕواندز و دەوروبەری ئەو هەموو حیساباتێکی بۆ حوزنی کردووە. کە باسی ئەو کێشەیەم لێ پرسی، وای پێشان دا کە لە بیری نەماوە؛ کەچی زۆر بابەتی دی هەر هی هەمان سەردەمی لەبیر مابوو.

٢٢- وادیارە حوزنی ئەو بەسەرهاتە ناهەموارانەی خۆی لە نووسراوێکدا بۆ گیوی برای نووسیوە، بۆیە گیو لە نێو دەستنووسێکیدا جۆری یارمەتیدانی خۆی و چۆنیەتی چارەسەرکردنی باس دەکات:
«کاکم، کە ئەو وەزعەی خۆی بۆ من نووسی بەتەواوی ئاورم تێبەربوو. ڕادیۆیەکم هەبوو بە٦٠ دینار و ماکینەیەکی چکۆلەی وێنەگەرێتیم بە١٢ دیناران فرۆشت و سەد دینارم پێکەوە ناو ٥٠ دیناریشم لە

برایمە سووری قەرز کرد و یەک جێ ١٥٠ دینارم بۆ نارد و ئەویش گەلێکی نێو ماڵی خۆی فرۆشت و سوار بوو و هەموو ئەوانەی کە کاریان بۆ کردبوو بەسەریاندا گەڕا و کۆی کردنەوە و پێی گوتن: ڕەنگە ئێوە هێندێکتان حیسابتان لەگەڵ ئێمە مابێ و نووسیار بەچەوتی نووسیبێتی، من باوەڕ بەئێوە دەکەم چەندیان ماوە و کێن پێم بڵێن تا بینووسم و چەند ڕۆژێکی دیکە پوولتان بۆ پەیدادەکەم و دەتاندەمێ. هێندێک پیاوانە و گەلێکیش بێ مرووەتانە بزووتنەوە و هەمووی نووسی ئەگەرچی هەمووی درۆ و ناڕاست و دروستکراو سوون، بەڵان بۆ ئەوەی کە نەڵێن داماو هەقی هەژارەکانی میللەتی خۆی خوارد و بۆ ئەوەش کە قسەی دوژمنان وەسەرنەکەوێ، هەمووی وەئەستۆی خۆی گرت گەڕاوە ڕواندز و لیژنەیەکی لە چوار کەسان دروست کرد، کە حاجیلەی عەزیز تیژاوی، یوسف زیای ئاسووری و ئەحمەد عەبدوڵای کاولۆکی و عەزیز شاکر و شاکر موجرمی سلێمانی بوون ڕەوانەی کردن و پێکەوە بەدێهاتەکاندا گەڕان و یەکەیەکە پارەکانیان تەسلیمی وان کرد و تاکەتاکە بەجودایی سەنەدیان لێ وەرگیرا» .دەستنووسی- بەسەرهاتی حوزنی موکریانی بەپێنووسی گیوی موکریانی).

٢٣- «چونکە نەخۆش بووم زۆر زوو خەوتم. سەئات دوازدە زەوالی لەشەو ڕابوردبوو، شورتەیەکی سێ خەتی هاتە ئوتێل لەخەوی ڕاپەڕاندم، وتی: وەرە لە مەرکەزی شورتە تۆیان گەرەکە. بەو نەخۆشییە هەستام چوومە مەرکەزی شورتە. هاوینە و نیودشەوە و دونیا چۆڵە. سێ سەعات لە مەرکەز ڕایانگرتم کەس نییە، لە پاشان سدیق ناو مەئمووری مەرکەز هات و کەمێک دڵخۆشی دامەوە و پۆلیسێکی لەگەڵ ناردمەوە بۆ ئوتێل ئەمە چی بوو؟ عەلی سەروەت، قایمقامی مەرکەزی قەزا ئەمری دابوو بمگرن و بمترسێنن. ئەمری بەجێ گەیەندرا، گۆیا مودیری شورتە جەمیل بەوەی زانیبوو توورە ببوو، بەریاندام».

- حوزنی دەگەڕێتەوە ڕواندز بۆ ئەوەی قاقەز لە ئاغاکان وەربگرێت. دادوەر ئەنوەر یەکتا بەفێڵ دەبیاتە دادگە لەوێدا بەری نادات، تا کەفیلێک پەیدانەکات و حوزنی لەو بارەیەوە نووسیویەتی:

«... مەجبووریان کردم عەبدلوەهاب ئاغای کوڕی حاجی محەمەد عەلی ئاغام کردە کەفیلی سەد دینار و سەنەدم پێدان، هەروەختێ منیان ویست حازر بم. ئەم کەفالەتە بۆچی؟ نازانم. حاکم دەزانێت، عەدالەت و وجدان دەزانێت».

٢٤- «... کێشە و موحاکەمەی غەفوور ئاغا هەردەما نا دەمێک دایدەچڵەکاندم و لەهەوەس و ئارەزووی نووسین و تێکۆشانی دەخستم و گێژ و هێڕ دەبووم. بەرامبەر بەپروپاغندەکانیان ئاسوودە نەدەبووم و لە لایەکی دیکەشەوە خۆم لە بەغدا و عایلەم لە ڕواندز و دەست نەکەوتنی خانوو لە بەغدا و لە ئوتێل مانەوەم، هێندەی دیکە مێشکی شڵەژاندبووم و مەسرووفی زیادە و بێ هوودە لە بەغدا و لەڕواندز، جیرە (مووچە- ک.م.) یەکی پێم دەدرایێ هەڵنەدێنا؛ ئەوەش پتر لە پێی خستبووم. کەوابوو ئەمەش منی دڵنیا و ئاسوودە نەکرد. ئازار و دڵ ئێشە سەری سووک نەکردم کە لەم کۆواردەدا بتوانم بەچاکی خزمەت بکەم و بشێم وەکو جاران فکرو بیرەوەری لە مێژوو و ئەدەبیاتی کوردی بکەمەوە و لەم کۆواردەدا بەدڵخواز و پەسند بنووسم و سەرباری ئەوەش لە پڕێکا قاقەزی

عەبدولڕەحمانی برام بۆ دەهات و هاواری دەکرد کە لە لایەن شورتەوە تەنگەتاو کراوە و توهمەت و ئیفتیرای پێدەکەن و پەکی کارو کاسپیان خستووە و نایەڵن بجوولێتەوە».

٢٥- گیوی باوکم لەو بارەیەوە نووسیویەتی:

«داخی گرانم برا هەژارەکەم تەنها سەد فلسی هەبوو دەستبەجێ هەموو چەشنە دانەویڵەیەکم بۆ پێکەوەنا و لەسەر کیسەی خۆم لە ڕەواندزەوە ٢٩ دینارم چواند تا ماڵ و منداڵیم گەیاندە بەغدا».

٢٦- «ئێوارەی شەممە ١٩٤٧/٩/٢٠ نۆکەری نارد ئۆتۆمبیلی هێنا. کاکم بەخاو و خێزانەوە لەگەڵم هاتنە سەر قەتار کارتی بۆ وەرگرتم و چتۆمەکەکانی لەنێو واگۆنێکدا دامەزراند و پێکەوە لە تەنیشت قەتار هاتوچۆ و قسەمان دەکرد. لەو هاتوچۆیەدا گەلێک کەس لە هاتوچۆکەران شەوباشییان لە کاکم دەکرد. چونکو خێزانی لەگەڵ بوو زۆرم حەزدەکرد کە کاکم بگەڕێتەوە ماڵێ چیدیکە سەری خۆی بەمنەوە نەیەشێنێ و چەند جاران تکام لێ کرد و گوتم: کاکە گیان! ئێوە بگەڕێنەوە ماڵێ با منیش بچم جێگای خۆم بگرم. دەیفەرموو: برام چ کارم نییە، بچمەوە ماڵیش هەر دادەنیشم، با نەختێک پێکەوە بگەڕێین. تا دوو سەعاتان هەردووکمان زۆر بەخۆشی بەڕازونیاز و تەگبیر و بەنیشاندانی سکاڵا و دەردی دڵ ڕامانبوارد. لە پڕرا کە لوکومۆتیف فیتەی لێدا و خەڵکی وەپەلەپەل کەوتن بچنە نێو واگۆنەکانەوە، دیسان کوێراییم دایەت، کوتم: کاکە گیان! ئێوە بگەڕێنەوە بامنیش جێگایەکەم نەگیرێتەوە. فەرموودەی هەرە دوایی داماو لەگەڵ برا قوڕ بەسەر و خاکەسار و چارەڕەش و ناهومێدەکەی تەنها ئەوەندە بوو: بەخوڵای گیو زۆر حەز دەکەیت کە لێت دووربمەوە؛ قەیدی ناکات. براکەم زۆر ئاگات لە دایەی بێت و قۆندەرەکانی ماچ دەکەم بەخوام ئەسپاردی. دەستی ڕاستیم ماچ کرد و ئەویش نێوچاوان و ملی ماچ کردم و لێی جوێ بوومەوە».

٢٧- گیو نووسیویەتی: «... کە گەیشتمەوە بەغدا، هەوار خاڵی نەبێت، چی دیکەم لێ نەدیت. دوای گەلێک لە خۆدان و قوڕ بەسەرکردن و هاواری برالەڕۆ بەدووی چلۆنی نەخۆشی و هۆی ئەو ڕووشە گەورەیە کەوتم. گوتیان کە شەوی شەمۆیە تۆی بەڕێ کرد و گەڕایەوە تەواو ساخ و بەکەیف بوو، لەسەر شێوەی جارانی نان و چاو ئاو و ماستاوی خواردەوە و ڕادیۆی لێدا و خەریکی یادگارەکانی خۆی بوو. لە دەمی خۆشیدا نوست و لە پاش چەند سەعاتێکی سگی دەست بەژان دەکات و دەڕشێتەوە و سگیشی زۆر دەچێت و هەر ئەو دەمەش زمانی دەبەسترێت. سبەینێ بەیانی دکتۆرێکی هیندی کە نێوی دوسدە بوو و هی ئینگلیزەکان بوو، دەیهێننە سەری، کێ و چۆن ئەو دکتۆرەی هێنا سەری؟ کەریم کوڕی میر عەبدوڵڵای سابلاخی کە نۆکەری بوو.

داخوا ئەو دکتۆرە هیندییە چی لە برا هەژار و بێ کەس و چارەڕەشەکەم کردووە؟ چ دەرمانێکی داوەتێ؟ چ دەرزییەکی لێداوە چی بەسەرهێناوە؟

دەڵێن چی لێ نەکرد، تەنها ڕەچێتەیەکی بۆ نووسیوە، ئەویشمان لە دەرمانگەی ئیسلامییە کڕیوە هێندەی هەوڵ و تەقەلام دا دەرمانگەی ناوبراو ڕەچێتەکەی نەدامەوە.

سێ جارانیش چوومە ماڵی دکتۆر دوسودە. جاری بەرایی و دووەم خۆی نیشان نەدام، لە جاری

سێیەمدا لەپەنجەرەوە خۆی نیشاندام و دەرگای نەوێرا بکاتەوە، لێم پرسی: برام چ نەخۆشییێکی بوو؟ گوتی: زەحیری کۆن (دزانتری) بوو؛ من ئاگام لەمێژە بەسەر نەخۆشی براتدا هەیە، جار جار لێی دەژیاوە و من دەرمانم دەکرد و چاک دەبووەوە، بەڵان ئەوجار داخەکەم ڕزگار نەبوو.

داماو لە ڕۆژی شەممە ١٩٤٧/٩/٢٠ دا لە بەغدا کرا بەقوربانی ئازادی و ڕەوانەی وڵاتی خامۆشان کرا. بەهۆی وەزیری مەعاریفەوە زۆرم هەوڵ دا کە تەرمی برا بێ کەس و خۆشی نەدیتوو و گۆڕ ئاوارەکەم بهێنمەوە کوردستان. حکوومەت نەیهێشت و گوتیان تا سەد ڕۆژی دیکە نابێ دەستی لێ بدرێت».

٢٨- وێنەی ئەو نامەیەی، کە محمد جواد المفتي بۆ گیوی ناردووە:

وێنەی ئەو نووسراوەی، کە گیو لە دوای دواماڵاواییکردنی حوزنی برایدا بۆ حوزنی سەرف کردووە:

ئەو مصارفانەی کە دوای وفاتی براکەم کردومە ! —

| | فلس | دینار |
|---|---|---|
| [illegible] | ٩١٩ | ١١٨ |
| [illegible] | ٩٥٠ | ٢٦ |
| تعمیرات [illegible] الی ٢ سالان | ٢١٤ | ١٢٥ |
| مصاریفی [illegible] الی ٢ سالان | ٢٥٠ | ٢٠ |
| | ٥٠٢ | ٣٢١ |
| مصاریفی [illegible] | ٢٦٥ | ٢٥ |
| | ٨٦٨ | ٣٥٦ |

سەرچاوەی پێشەکی:

A.M. Hamilton 1937 Road through Kurdistan

- حوزنی موکریانی. کوردێکی چارەڕەش یان کوردێکی بێ پشتیوان. (ساڵانی ١٩٣٥- ١٩٤١) گرتۆتەوە. دەستنووسە.
- حوزنی موکریانی. دەوری استبداد و ڕەوشتی وە خووی ئەو لە کوردستاندا. ساڵانی ١٩٤١-١٩٤ گرتۆتەوە. دەستنووسە.
- گیوی موکریانی ١٩٤٨ بەسەرهاتی حوزنی موکریانی. دەستنووسە.
- شاکر فەتاح ١٩٧٢ داماوی موکریانی _ سلێمانی.
- د.جمال ڕشید احمد. ڕێبازی ژیانی حوسێن حوزنی موکریانی لە سەرەتای سەدەی بیستەمدا. گۆڤاری ڕۆشنبیری نوێ. ژمارەی وەرزی هاوین ١٩٩٠.
- ڕەمزیە سابیر حوزنی موکریانی نووسەر و ڕۆژنامەنووس. نامەیەکە وەکو بەشێک لە پێویستییەکانی پلەی «ماجستێر» لە ئەدەبی کوردیدا پێشکەش بەکۆلیجی ئادابی زانکۆی سەلاحەدین کراو ١٩٩٣.
- هەژار. چێشتی مجێور. پاریس ١٩٩٧.
- د. مارف خەزنەدار. مێژووی ئەدەبی کوردی. بەرگی پێنجەم. هەولێر ٢٠٠٥.

# غونچەی بەهارستان

## تاریخی کوردان

جێی لێ دەرکەوتنی و ژیانی و تەواوی تەمەددونی گەلانی کوردان

تەئلیفی

**سەید حوسێن حوزنی حەسەنی**

جي ليه در كوتني وژياني . وتواوي تمدني . كلاني كرداز'

تاليفي

مطبعة العصر الجديد ع حلب سنة ١٩٢٥

بسم الله الرحمن الرحيم

قال عليه السلام: (اخوانكم خولكم جعلهم اللّه تحت أيديكم، فمن كان أخوه تحت يده فليطعمه مما يأكل ويلبسه مما يلبس ولاتكلفهم ما يغلبهم، فإن كلفتموهم فأعينوهم.)
صدق رسول اللّه

یەکێک لە شەرتی باوەڕیی یاریدەدانی برای ئاینی و برای وەتەنی و برای میللەتی و برای دایکی و باوکییە. دەفەرمووێت: براتان لە خەیاڵتان، لە بیرتان دەرمەخەن. میهرەبانی بکەن بەوانەی لە ژێردەستی ئێوەدان و یاریدەیان بدەن؛ هەروەکو ڕەحم دەکەن بەخۆتان و منداڵی خۆتان، بۆ جلو ئاسوودە دڵی و سەربەستی، وە ئاشکرا بێ؛ چونکە دەوڵەمەند هەرچەند توانا و دەست درێژ و بەماڵ و زۆردار بێ، ئەگەر توانای ئازادی نەبوو، لە ڕەنج و ئەزیەت و سەرێشەدا دەبێ. جا ئەگەر وابێ جلی ئاسوودە دڵی و سەربەستی و ئەفکاری ئازادی وتن، بێ ڕەنجییە، توانا و بەزۆری بازوویێکی ڕاستیمان دەوێ، بەدزی و ئاشکرا بۆ برای خۆی بەماڵ یا بەبیر و یا بەکار وە یاخود بۆ پێشکەوتنی تێ بکۆشێت، بەهەر جۆرێک بێ غەمخواری و کۆمەگی بکا بۆ برای خۆی.

«حب الوطن من الإيمان»، «لولا محبة الأوطان لخربت». لازمە لەسەر هەموو میللەتی کورد و واجیبە و شەرتی ئیمانیانە مەحەبەتی کوردستانیان هەبێ و خۆشیان بوێ و بزانێت (خاک و خۆڵ و ڕەگی میللەت و شار و دێهات و سنووری وەتەنی، تەئریخ، سیاسەتی، عیلمی، زانین و جەهالەتی و پێشکەوتنی، ئاوەدانی، کڕین و فرۆتنی جووت بەندە و چاندنی ئازادی و سەربەستی). تا بزانێت و بەتەواوی لێی دیار دەبێ، ئەودەمە دەزاندرێت خۆشی دەوێ؛ ئەویش خۆشویستنێکی بەڕاستی و لەسەر باوەڕی پێشوو باوەڕیان زۆر دەکا. چونکە ڕەشتی ئینسانانە؛ هەر شتێکی خۆشەویست بێ لە هەموو تۆز و خۆڵ و ڕەخنە و پیسی بەخێو دەکرێت و بەچاکی هەڵدەگیرێت و هەمیشە بۆ بڵندی و پێشکەوتنی دەکۆشرێت.

شەرتی باوەڕیی: هەموو ڕۆژێک جەند جاران دووبارە باوەڕی تازە بکاتەوە؛ تاکو ئیمانی و دینی نەکەوێتە تەهلوکەوە و ئیمان و ئاینی ڕوو لە شکستەیی نەکا، چۆن هەموو شتێ لەبیرچوو، لەبەرچاو دەکەوێت. ئەو لەبەرچاوکەوتنە دەبێتە ڕەخنەیەک، هێواش هێواش لێی دوور دەخاتەوە و ئاهستە ئاهستە و کەم کەم دڵی لێی سارد بێ، زۆر ناحەز و

بەدفەڕ دەبیندرێت. ئەو دەورەیە دەبێتە بەر فرێدان و بشکەوێتە بەرپێیان و بۆی دڵگیر نابێ. جا لەبەرئەوە خۆشویستنی وەتەن شەرتی ئیمانە.

## سەبەبی کتێب دانان

تەماشا دەکرێت و تەئریخ بۆ ئەوە گەواهەو شاهیدە، میللەتی کوردی نەجیب و ڕەشید و سەخی و زەکی، ئازاترینی ئەقوامی «ئاری»یە و لە ئیبتیدای کاریاندا وەتەنی ڕاستیان باوکی ئەقوامی ئاریی زەوی و ئەرازییان لانکی تەمەددون و پێشکەوتن و بڵندییە بۆ قەبائیلی دیکە. کورد ئەوەڵ کەسێکن قانوون و ئاین و قاعیدەیەکیان هێنابووە گۆڕێ. لەنێو تەواوی بەشەردا چاکترینی تەواوی ئەدیان و ئاینییان بۆ عەدل و بەدادترینی هەموو قانوونێکی ئینسان قەبووڵی کردبوو و نزیکترینی عەقڵ و ئینساف و تەبیعەت بوو کە خێڵ و گەل و قەبایلی دیکە بەکاریان بردبوو.

کورد ئەوەڵ کەسێکن تەواوی بەشەر بەتەوەحوش لە کوێستانان و سەحرایاندا دەژیان و بەتاڵان و کوشتاری یەک و لە حاڵ بەدوییاندا ڕایان دەبوارد، ئەوان بە جووت و چاندن و دانیشتن لە دێهاتدا بەسەریان دەبرد و ڕوو لە بڵندی و پێشکەوتن عادەتیان گرتبووە، قەبائیلی دیکە لێیان وەردەگرتن. لە زەمانی پێشوو بە چل قەڕن پیاوی زۆر گەورەیان لێ پەیدابوو و بەداد و عەدل [و] ڕەشید و جیهانگیری ئیشتیهاری کردووە. ئینسانی ئازا و بەزۆر بازوویان تێدا پەیدابووە. حوکمداران و کۆمە ئاباد و جەمشید و کەیانی و ساسانییان لە پێش ئیسلام پێگەیاندووە. کورد میللەتێکە، ئەزمینەی قەدیمە نیسبەتی موتەهەویران و پەهلەوانان و جەسووران لێ دەدەن. کورد پیاوی وەکو ڕۆستەمی داستان و دارا و بەهمەن و جاماسب و زەردەشتیان پێگەیاند تا قیامەت لە تایفی دەهر مەدحیان دەکا. کورد ئەوەیە لە خیلافەتی حەزرەتی عومەردا، پادشایان دادیان لە دەست دەکردن، کوردستان پیاوی وەکو توکلە و فەزلۆون و دەیسەم و سەلاحەدینی ئەیووبی و نادر و کەریم خانی زەند لە سەلاتینان هێنا وجوود.

کوردستان ئەوەندە پیاوانی پێگەیاند ئەگەر بێتو تەئریخی زەوتی بگا، سەد جیلد کتێب، بەڵکە هەزار جیلدی لێ تەئلیف دەکرێت. (مەعەزالیک بەدەسایسی دوشمن لە پەردەیەکی تەوەهوم و خەیاڵییدا خستوویانەتە نەزەرەوە و لە تەواریخی ئەغیاردا [بە]غەیری کوردیان دەنووسن. مولاحەزە دەکرێت، مونەوەران و جەوان و جحێڵ و عولەما و مەشایخ و بەگ و ئومەرا و شازادە [و] خانزادانی کوردستان ئەگەر بێتو سوئالێکی

تەئریخی یاخود ئاین وە یاخود ئیجتماعی، سیاسی، ئیقتسادی قەومێک لە ئەقوامی بەشەریان لێ بپرسی، بەتەواوی زانین جەواب دەدەنەوە و بەڵکە لەو عیلمەدا بەزبانی غەیریش تەئلیفی هەیە؛ لاکین ئەگەر کەمێک لە ئەحوالی تەئریخی میللەتی خۆی و زوبانی دایکی و باوکی، وەتەنێکی تێیدا پەروەردە [و] گەورە بووە لێی بپرسێت، یا دەبێژێت نازانم، و یاخود بەخامۆشی و بێدەنگی جەواب دەداتەوە. حەزرەتی عومەر (رض) فەرموویە: «لولا محبة الاوطان لخربت» لازمە لەسەر هەموو کەسێک و لە پێش هەموو کەسێکدا، حەوایجی ماڵ و منداڵی بەجێ بێنێت و لە زەروورەتیان دەرخا، لە پاشان سەدەقە بەهەمسایە بدات. ئەوە کاری عاقڵ نییە خانووی خۆی رووخابێ، ماڵی خەڵقی چاکاتەوە و منداڵ و ژنی خۆی برسی و ڕووت بێ و دراوی بۆ منداڵ و ژنی بێگانە خەرج کا، وەتەنی و میللەتی موحتاج بێ بە مەعاریف و تەئلیفات، بچێ خزمەتی عیلم و مەعاریف و زبان و دینی ئەغیار بکا. حەزرەتی فەخری عالەم (ص) فەرموویانە: «حب الوطن من الإيمان» هەرکەس مەحەبەتی وەتەنی نەبێ ئیمانی نییە، هەرکەس مەحەبەتی وەتەنی بو، سەعی بۆ ئاوەدانی و موعاوەنەت و زانین کرد، ئەوە بۆ وەتەن دەفعی زەرەر و جەلبی مەنفەعەتی کرد و بۆی کۆشا، ئیمانی بەسەد چەندان و باوەڕی بەئەوەندە زیاد دەبێ.

مولاحەزە دەکرێت لە ئەوەڵ دەرکەوتنی ئیسلامەوە تا ئەمڕۆ، عولەما و مونەوەرانی کوردستان بەبوغز و نیفاق و شیقاق و وێرانی کوردستان دەکۆشن. وەتەنیان لە زوبان و عادات و تەبایع و ژیان و ئاوەدانی و میللییەت و قەومییەتیان مەحرووم کردن و خستیانە ژێر لینگی ئەعداوە و لە ئەحواڵ و تەئریخی خۆیان و ئەجدادیان بێ خەبەرکردن، تەئلیفات و نووسین و خدمەتانیان بەزوبان و عاداتی غەیری خۆیان دەست پێ کرد. بوون و، ژیان و هەستی و ئازادییان کردووە فیدایی هێندێک ئەشیای ناچیزە و مەوهوم و خەیاڵی. وەتەن و میللەتیان لە دەست دەرخست. تەئریخی کوردستان هەر پارچەیەکی کەوتە دەست ئەغیارێکەوە. ئەو تەئریخانە ئەمڕۆکە بۆمان بۆتە چیرۆک و حیکایات و ئەفسانە لە زبانی چاک و بەددا. ئەگەر لەم عەسرەدا بێتو مونەوەرێکی کوردستان لە خەوی غەفڵەت هەڵستا و لە مەستی شەرابی تەوەهوم هوشیار بووەوە و عەقڵی کەوتەوە سەری، دەست دەبا تەئریخی میللەتی خۆی موتالەعە بکا. (بیلئیجار دەبێ لەنێو کتێبانی موختەلیفەی پەراکەندەدا سەحیفە بەسەحیفە بگەڕێت، هەر حەرفێکی لە کتێبێکدا و هەر کتێبی لە جێگایەکدا دەست بخات، بەموددەیکی زۆر، ڕشتەییێکی دەست کەوێ یا نە، ئەویش لە

تاقەتی هەموو کەسێکدا نییە لەهەر تەئریخێک نوسخەیەک پەیداکا؛ یاخود مومکینە ئەو تەئریخە لە هەموو وەختێکدا دەست نەکەوێ، پەیدا نەبێ وە یاخود هەموو کەسێک زوبانی غەیرە نەزانێت وە یاخود مەقسوودی پێ نایێتە جێ، بەمەجبووری دەست لەو خەیاڵە بەر دەدا و ئەو فیکر و هەوەسەی لەسەر دەردەکەوێت.

فەقیری خادیم کە ئەو وەزعییەتەم لێ ئاشکرا بوو، کوڵانی موحیبەتی وەتەن جۆشی دام. زەمانێکی زۆر کۆششم کرد بۆ جەمعکردنی موتەفەریقان، کۆمەیی نەقدی عومر و ماڵم بۆ خرکردنی بڵاوکرد. تەشەبوسی کتێبانی بێژماردەم بۆ کرد، زۆرترین شارانی مەملەکەتی کوردستانی بۆ گەڕام، تا بەڕاستی ئاگاداریم لە تەئریخی ئەحواڵیان پەیداکرد و بۆ ڕێکخستنی قسەیان دەمکۆشی و ئەمەی بەئەهمیەت بوو دەمنووسی. لەپاش مەرارەتێکی زۆر و زەرەرێکی بێ ژمار، بەهەموو هەوەسێکی توند هەرچییەکی ڕاست و بێ درۆ و غەش بووە خڕم دەکرد و ڕێم خستە قەڵەمەوە. بەڕاستی مەجبووری وەدەستهێنانی هێندێک ئەخبار [و] ئاساری قەدیمە بووم و زۆر ئەزیەت و زەرەرم لەسەر کێشا، تا تەواوی لزوومم دەستکەوت. هەر کتێبێکی دائیر بەمەقسەد بێ موتاڵەعەم دەکرد بۆ خاتری نووسینی تەئریخێکی بەڕاستی و دروست. وە هەر عەکسێکی مەخسووس بەکوردستان بێ وەرم دەگرت. بەتەواوی کەمەری خادیمیم بۆ بەست، بۆ هەموو خدمەتێکی حازر بووم، بەهیچ وەجھ خەیاڵم لەسەر لا نەچوو و هەر ئەحواڵێکی مەنعی دەکردم دڵ زیاتر سابیت قەدەمی دەکرد، نە موتەئەخیرێک سەبەبی تەئخیری پێ کرا و نە مانیعێک مومانەعەتی پێ درا، بەڵکە چاکتر حەمییەت و جەسارەتم پێ زیاد بوو، بۆ هەموو زەحمەتێکی حازر و ڕازی بووم، تاکو بەتەوفیقاتی ڕەببی موتەعال یەزدانی پاک و بەمەدەدکاریی حەزرەتی فەخرول ئەنبیای نیکوو سروشت و ستودە خیسال و گوزیدە ئیدراک و بەهیمەتی شێرانی عالی تەباران و سەرکردەی ئیمانداران، تەئریخێک هات «غونچەی بەهارستان» لە مێرگەزاری باغ مەنشەئ و گوڵبونی «تەئریخی کوردان»ە تازە غونچەیێکە، نەوشکۆفە لە بەهاری خوڕەمیدا دەست بەپشکووتن دەکا. لەسەر هەر لک و گەڵایێکی لە داغ و حەسرەتی بولبولان، بەلەبان باڵەبان لێ دەدا و لە ئیشتیاقی بەهەزار تەرانە، لە خۆشخوانی دایە عەندەلیبیان، لە نزیک سپییەتی فەجری ویساڵدا بۆ گەیشتنی کردنەوەی لێوی بەپێکەنین، بەناڵە و زار نەغمەی نەوای توتیان بێ، ئاوێنەی جەمالی لاڵ بەتەبەسومی ئەو غونچەیە شەکەر شکەنی دەکەن و دەم لە سوخەنوەری دەدەن. ئەم غونچەیە نەورەسە نازکە پڕ عەترە بۆ، ڕەنگی لە نەزەر ڕەقیباندا ئاتەشیە گەڵای تازە دەردەخا،

پشکووتنی بەخوشکی گەوهەری یەکانەیە تا ئەو گەوهەرەی نەکەوێتە بازاڕی یەکتاییەوە، ئەم غونچە عەتر بەخش نابێ و تا ئەو گەوهەرە جیلوەگەر نەبێ ئەم نۆبەرە تازە کچە پشتیوان پەیدا ناکا، هەرچەند مەحبووب و نازەنینە و شیرینە؛ لاکین بۆ بەخێوکردنی بەخێوکردن لازمە، تا بۆنی خۆش و مەهارەتی ئاشکرابێ، دووشیزە و موعەتەرێکی وایە لە کراسی شکۆفە بێدا خۆی شاردۆتەوە، کە پشکووت زۆر کەسان سەرمەست و زۆران دەخاتە سەر کەیفێکی وەهاوە، تا ڕۆژی ئەزەل لە مەشامیدا تەعەتوڕ رایحەفزا بی و پەنامان بەخودایە.

## تەئریخ زانین

عیلمی تەئریخ، فەننێکی زۆر شەریفە و وەقایعی زەمانی ڕابردووی نەوعی بەشەر و ئەحوالی ئومەمی سابیقە بەسوورەتێکی سەحیح و تەدقیقێکی تەواومان بۆ بەیان دەکا.

تەئریخ گەڕانی ئەنواعی بەشەری موختەلیفە، مەدەنییەت و تەرەقی کەرانیان بەتەدریج دەیگێڕێتەوە. بەڕاستی تەئریخ لە مەیدانی مەدەنییەتدا ئیسباتی وجوود و ئاساری میللەت لە وەحشەت و تەمەددونی حاڵی بەدوییەت و ئەحواڵی گوزەشتە و گەیشتن بەنەجات، وەقایع و ئینقلابات و ئیستیرداد و بەسەردانی عەدالەت و زوڵم. خولاسە تەواوی شئوونی ژیان و مردن دەکا. تەئریخ دەلیلی سەیری پادشایان و ئومەرا و دەوڵەتیان و سیاسەتیان و شەڕوشۆڕ و هیجرەت و ئیستیلای تەشکیلات و ئیدارەیان دەکا، وە ئیرشادمان دەکاتە سرشتێکی بۆ دین و دونیامان لازم بێ. تەئریخ فێری ئەخلاق و عادات و ئەدەبیات و علووم و موکتەشەفات [و] موختەرەعاتمان دەکا، هەر قەومێکی ئاسار و عەلاماتێکی لەپاش بەجێ نەمابێ، ئەو قەومە لە نەزەری عموومدا بەجاهیل و موتەوەحیش و نەزانێکی وای دادەنێن کە لە بەحسیاندا ئیستفادەیەک نابەخشێد.

**چلۆنی تەئریخ:** تەئریخ نە هەر مەقسەد لە حیکایەتکردن و سەرگوزەشتە و چیرۆک خوێندن بێ، لاکین دەفعی مەراقمان لە حەقی وەقایعی ڕابردوو کردبێ. تەئریخ تەئمینی ئیستیفادەمان بەمە دەکات، ئەجداد و باب و باپیرانمان، یاخود ئوستادمان و تایفە و میللەتمان لە زۆر زەمانانی پێشوودا ژیاون و عومریان بەسەر بردووە، لەگەڵ ئەقوامی قەدیم یا بە بەرابەری و یا لەگەڵ دوشمنان لە مەملەکەتان شەڕ و کوشتار بوونیان لەگەڵ دوشمنانی ئێستاماندا بەناسینمان دەدا.

لە پێشدا حکوومەتان چۆن بلندبوون و پێشکەوتن و پاشکەوتنیان چۆن بووە و بە چ

جۆرێک کەوتن. دەبێ بزانین ئەو ئەقوامانە بە چ هونەرێک گەورە بوون و لە سایەی چ پیسی و فەسادێکەوە مەحوو بوون. ئێمە ئەوانە هەموو فێر دەبین. ئەو میللەتەی هاتوچۆ بەری تەجرەبەی چاک و خراپەیەکی زۆریان، ئێمە لە سایەی تەئریخەوە دەزانین.

تەئریخ حسسیات و نەجیبیی ئینسان بلند دەکا. هیمەت و رەشادەت و ئازایی و سەخاوەتی پیاوان و کۆمەگی و پشتیوانی مەحەبەت و یەک دلی دەکا ئەو کەسەی تەئریخ بزانێت وەکو لە زەمانی پێشوودا تا ئێستا ژیابێ و بەچاوی خۆی هەمووی دەبینێ. ئەحوالی وەقایعانی پێشووی ئینسانان زۆر قەدیم دەزانێ، دەیناسێت. فایدە لەوە زیاتر بۆ ئینسان چ بێ چاترە؟

**چاکەی تەئریخ:** لە پاش فێربوونی تەئریخی ئینسانان لە زەمانی ڕابردوودا ژیانی بلند کەوتنیان و لەبەر چ بوونی زاندرا و ئەوانەی ئیدارەی مەملەکەتان و ئەقوامیان لە دەست دا بێ، لە هەموو کەس زیاتر ئیستفادە دەکا. لە تەئریخ زۆر وقووعاتێکی تەئریخی و سیاسەتێکی بەدەهشەت، لە شیر و چەک و سیلاح زیاتر بڕندە و کار پەزێرە، لەوە بەکار نیشاندانیی واقیعاتێکی زۆر گەورە دەبەخشێت، لە هەموو وەقتێک و زەمانێکدا ئەوەی کە قەڵەم دەیهێنێتە وجوود و دەیخاتە قاڵبی ئیجرائاتەوە و تەئسیر دەبەخشێت، هیچ گوللە و تۆپێک ئیجرای ئەوە ناکا. لە چەند عەسراندا زۆر حقووقی سیاسی زایع بووبێتیش، تەئریخ خستوویەتیە مەیدانەوە. ئەوە لە تەئریخ ئیستفادە دەکرێت بەتەنها مەدەنییەت و شۆوونی میللەتێک زانین نییە، دەبێ لە وەقایعی تەنهای ئەو قانوونەی کە ئەوانی پێ ئیدارە کراوە بزاندرێت و ئەسبابی تەعیینکردنی وەقایعی موختەلیفە و باعیسی دەرکەوتنی فەسادی ڕابردوو و ئێستا و حادیساتی پێشوومان لەگەڵ ئەم وەختە بەرابەری و قیاسی دەکا. لە کاغەزانی پێشووی تەئریخیدا ئیستفادە دەکرێت، هەروەکو بێژرا غایەی تەئریخ، ئینسان لەسەر ڕێگای تەرەقی و تەواوی بۆ مەنزڵی ئازادی و سەربەستی دەباتە پێشەوە.

## دابەشکردنی تەئریخ

لە ئەساسدا تەئریخ دوو قسمە: عوموومی؛ خسووسی. تەئریخی عموومی بەحس لە سیلسیلە وەقایعی تەواوی ئەو ئەقوامانە دەکات کە زۆر یا کەم لە مەیدانی مەدەنییەتدا ئەسەرێکی بەجێ هێشتبێ. تەئریخی ئەسڵیش ئەوە هەرچیکو خسووسییە، بەحس لە موحتەوەیاتی دەوڵەت و مەدەنییەتی سیاسی و ئەحواڵی قەومێک دەکا کە ئەویش

قسمێکە لە تەئریخی عمومی. غەیری ئەوانەی مەزکووریش «تەئریخی مەدەنییەت» تەئریخێکە بەحسی مەدەنییەت و ئیجتماعیەت و ئەحوالی موختەلیفە دەکا.

ئەگەر بەحسی سیاسی داخیلی و خاریجیی حکوومەتێک بکا «تەئریخی سیاسی» پێدەڵێن. هەر بەو نەوعە تەئریخی: فنوون، سەنایع، تەبیعیات [و] فەلسەفە، زیکر دەکرێن.

«کانیی تەئریخ» مەنابیعی تەئریخ سێن: ئاساری مەنقوولە، ئاساری قەدیمەو ئاساری مەزبووتەیە.

**موئەریخان تەئریخیان بە سێ ئەدوار داناوە.**

**ئەزمەنەیی تەئریخییە:** قروونی ئوولا، قروونی وستا، قروونی ئۆخرا. لە ئەزمەنەی مەجهوولەوە یەعنی لە خەلقەتی ئادەمەوە تا ئیمپراتۆرییەتی شەرق و غەربی ڕۆما (ساڵی ٣٩٥ پ. م) تەعبیر دەکرێت. قروونی وستا لە ساڵی ٣٩٥ەوە تا ئینقرازی ئیمپراتۆریەتی ڕۆما، یەعنی لە ساڵی ١٤٥٣ ب.م کە ئەستەنبووڵ کەوتە دەست دەوڵەتی عوسمانییەوە.

قروونی ئۆخرا لە فەتحی ئەستەنبووڵەوە تا ئەم عەسرەی ئێمە تێداین. ئەویش بەدوو قسم تەقسیم دەکرێت:

لە ساڵی ١٤٥٣ پ. م [تا] زهووری ئینقیلابی گەورەی فرەنسە لە ١٧٨٩. ئەوانە هەموو بەقورووونی وستا مەحسووبن؛ لەوە بەملاوە بەقورووونی ئوخرا حیساب دەکرێت.

**ئیعتمادی ئەم تەئریخە:** ئەم تەئریخە پشتیوانی بەدوو گەڕانە گەڕانی پێشوو و گەڕانی پاشوو. گەڕانی یەکەم لە دەرکەوتنی مەنشەئی کوردان تا پەیدابوونی ئیسلام (ساڵی ٦٢٢ پ. م). دەوری دووەم لە دەرکەوتنی ئیسلامەوە تا ئێستا.

## مەنشەئی کوردان

عولەمای تەئریخ لە حەقی مەنشەئی کورداندا نەزەریاتی موختەلیفەیان هەیە. لەو نەزەریاتە کە ئێمە لەم تەئریخەدا نەقڵی بکەین و ئەوەی لایق بێ بۆ گوتن لە عەسری ئێمەدا، نەقڵ لە بەعزێ ئاسار و ئینکشاف و بەعزێ کیتابی ئەوروپاییە، وە نەزەریاتی هێندێک موئەریخانی ئەجنەبی و ئاشووری و کلدانی و ئیقتباسی بەموئەریخانی یۆنانییە. لەو خسووسەوە ئەوەی ئەهەمییەتی هەبێ تەشەبوساتی بەعزێ مونەوەرانی کوردانی

ساحێب ڕۆح و بەحەمییەت وە تەئسیساتی هێندێک تەئریخانی کوردانە و ئەدەبیات و بەعزێ سەرگوزەشتە و چیرۆک و حیکایاتی تەئریخی کوردستانە بەزوبانی میللەت. ئەویش زیاتر کۆمەگی و پشتیوانی دەکا بۆ بوونی کوردستان لە مازییەکی زۆر دووردا و لە قسمی ژیانی میللەتدا بەئاشکاری وەدیکراوە، بەیانی دەکەن. ئەوانیش لە دائیرەیەکی مەحدوو دا هەموویان بەتەواوی ئینتیزام و ئینحیسار کراوە، هەموو حەرەکات و ئەخلاق و عادات و تەبایع و موحارەبات و هیجرەت و حکوومات و ئیدارەجاتیان لە سیلسیلەیەکی مەربووت و سەحیحدا دەست بەدەست هاتووە و دەم بەدەم و زبان بەزبان بێژراوە. ئینشائەڵڵا لە کتێبی گەوهەری یەکانە بەدوور و درێژی زنجیرەی گەورە و پادشایانیان یەک یەک دێنە گوتن. ئەوانەش لەسەر دوو تەقسیم دابەشراوە: بەشێکی ئەوانە عائیدە بەدەوری پێش ئیسلامییەوە؛ یەعنی لە ئیبتیدای دەرکەوتنی مەنشەئی کوردان تا زهووری ئیسلام. دەوری دووەمیان عائێدە بەئەسەرانێکی قبووڵی ئیسلامەتیان کردووە.

هەرچیکو قسمی ئەوەڵە - هەروەکو لەسەرەوە بێژراوە - ئیبتیدایەک یەک و هەریەکێ لە جێگای خۆیدا ئینشائەڵڵا بەتەواوی بەحس دەکرێت و هەر نەقلێکی بەسەنەدێکی چاک، بۆ خاتری دڵی خوێندەوار نەکەوێتە تەشۆیشەوە، بەیانی دەکەم.

ئەما قسمی دووەم لە حەقیقی ئەمردا، تەواوی قەومانی لە شەرق هەمانە، بەقبووڵکردنیان و ئیرتیباتیان لەگەڵ عەرەب و ئیسلام قبووڵکردنیان یا نەکردنیان بوون بەتەسەدوق و [فدامی] نەزەریات مین عیندی موئەریخانی عەرەب.

جوملە و تەواوی میللەتی ئیسلام، مەنشەئیان لە داخیلی ئیسلامدا لەنێو عائیلەی عەرەبدا گەڕانیان مەجبوورکردن، ئەویش تەزییقێکی وابوو کە هیچ ئیسلامێک نەماوە لە شەرقدا لەبەر عیلاقەدارییان بەئیسلام عەرەبان بەمەنشەء نەزانن، یا لە تەفریق وە یاخود تەزبیق وە یاخود جەهالەتی عولەمای مەیدانیدا «بوون و بوونی ئەسڵیان»؛ بەغەیرەز ئێرانییان نەکەوتنە ژێر تەئسیراتی عەرەبەوە و بەئیسمی شیعییەت و بەعزێ، بەعزێکیان گەریبانیان لە پەنجەی دەسایسی عەرەبان ڕەها کرد. کوردیش هەروەکو ئەقوامی دیکەی شەرق بەئیجباری ئەوەیان قبووڵ کرد بوو. جا لەبەرئەوەیە گەورە و کەیخودایانیان و مەشایخی تورووق و مەلایان، لە نەسلی عەرەب بوونیان ئیددیعا دەکەن. عەلەلخسووس هەروەکو لە بەندانی هاتووا بەتەفسیل دێتە بەحسەوە، مەنشەئی عەرەب ئەوەندە لەسەر ویجدانی کوردان قووەتی نەبووە کە ببێتە ئەساس بۆیان و ئەدواری ڕابردوویان مەعلووم

دەکا و ئیرشادی ئەمەمان دەکا کە کورد لە پێش عەرەباندا بەچەند هەزار ساڵان لە تەمەددونێکی تەواودا بوون. ئەو تەعەڕوزەی عەرەبیەتیش کە خستبێتە مەیدانەوە، موئەریخانی ئیسلامی وەکو «مەسعوودی» ساحیبی «مروج الذهب» و «ابو أسحق الفارسی» ساحیبی «برهان قاطع» و هێندێک مەلا و شێخانی کوردستان بۆ مەنفەعەتی زاتیەیان، نەوریجی ئەو فیکرەیان داوە و نسیبەتیان لە عەرەبداین بۆ تەسەڵوتی دینیە، تا لەنێو ئیسلاماندا ئیعتیمادیان پێ بکەن و زیاتر مەنفەعەتیان پێبڕێ. یەکێک حەزرەتی عومەر و یەکێک حەزرەتی ئەبوبەکر و یەکێک عوسمانی زینورەین و یەکێک عەباسی و یەکێک ئەمەوی و هەریەک لە عەسری خۆیاندا بۆ تەقەڕوب و مەکسەب دوور بەدوور خۆیان نزیک کردووە و میللەتیان بەرداوە لەنێو کوردستاندا بەئیسمی دینی و ئیستیلای ڕووحانی تەرکی ئەسڵیان کردووە. پێغەمبەر فەرموویەتی: «من أنكر أصله لا أصل له». هێندێک مەسائیلی ئێران بۆ ئەو ئیددیعایەمان بەشاهیدێکی عادیل حیساب دەکرێت. میسالی حکوومەتی ئێران لەبەر بەعزێ حەرەکەتی سیاسی حەزرەتی عومەر کە ئیستیلای بەسەردا کرد و ئینقرازی حکوومەتی کردن و کچی پادشایان وەکو ئەدنا عەبدێک لە بازاڕی مەدینە فرۆت و مەحەبەتیان لەگەڵ حەزرەتی عەلی لە خسووسی ئەوە کە حیمایەی مەسائیلی کورد و کچە کیسرایی کردبوو وە مودافەعەی بۆ کردن، لە شوکرانەی ئەو حەرەکە سیاسییانەوە حکوومەتی ئێران بەهەموو نەوعێک باوەش و باغەڵی بۆ ئەولادی حەزرەتی عەلی کردەوە و لەهەر تەرەفێکەوە سەربەستی کردن و ئیحترامی گرتن. زۆر کەسانی ئەسڵ ئێرانی یا کورد یاخود فارسی وە یاخود تەراکمەی ئازەربایجان، کە ئەو مەحەبەتەی لە حکوومەتەوە بۆ ئەولادی عەلی چاوپێکەوت لەم شارە بۆ ئەو شارە ئەوانیش هیجرەتیان دەکرد و بەدرۆ و بۆ خاتری خۆیان لە تەمەتوعی باج و خەراجی حکوومەت ڕەها بکەن و بکەونە ڕەحەتەیەوە و جێگایەکی چاک بخەنە دەست، نیسبەتیان لە ئەولادی عەلی دەدا و خۆیان دەکردە «سەید» حەتا لە عەسری ئێمەوە فەقیر بەچاوی خۆم ئەوانەم دیوە و لێم مەعلووم بووە. ئەمڕۆکە تەماشا دەکرێت ئەکسەریی ئێران «سەیدن» و خۆیان بەئەولادی عەلی حیساب دەکەن. لە ئیبتیدای ئیسلامییەوە تائێستا هەر بەوجۆرە تەئسیراتی عەرەب لە کوردستاندا کاری کردووە و مەنشەئیان لێ ون بووە. عەجەبا ئەو عائیلانە کە خۆیان بەعەرەب حیساب دەکەن، بەچاکی مولاحەزەی ئەحواڵیان ناکەن کە لەپێش ئیسلامەوە «کورد» نەبوون و ئەم عائیلانە کە هەموویان عەرەبن، کورد چی لێهات و چ ویجدانێکە ئەوانەی کردە کورد؟ مادام ڕوئەسا عەرەبن و ئەمیر و گەورە و شێخ و

مەلا هەموو عەرەبن، بۆچی میللەتی کورد بەسەر ئەواندا غەلەبەی کردوە لازم بوو ئەوان غەلەبە بەسەر کورداندا بکەن، چونکە عادەتە هەر قەومێکی گەورە و بەنفووز بەسەر قەومێکی زەعیفدا ئیستیلای کرد بەهەر نەوعێک بێ بابێ، دەبێ ئەو زەعیفە بکەوێتە ژێر تەئسیراتی زبان و عادات وە زوبانی قەومی بەقووەت؛ وەکو ئیستیلای عوسمانیان بەسەر ئیمپراتۆریەتی ڕۆمدا، تەماشا دەکرێت هەموو ئەقوامی ڕۆمێکی کەوتە ژێر پەنجەی عوسمانییانەوە، لە ڕۆمی ئەناتۆڵ بەتەواوی ژیان و عادات و زبانی عوسمانییان قبووڵ کردووە و ئیستیلای عەرەب بەسەر میسر و ئەندەلوسدا. خولاسە ئەوانە هەروەکو بێژرا وە لە بەعزێ جێگای دیکەشدا تەکەڕور دەکرێت، ئەوانە هەموو لە جەهل و تەعەسووب و تەمەع و مەنفەعەتی شەخسی بەعزێ مەلا و شێخان تەقەددومی کردووە. وەلێ ویجدانی کورد هەر کوردە؛ نەنیسبەتی لە عەرەب و نە لە تورک و غەیرە دەدرێت. کورد لە ئەوەڵ ئەمریاندا یەعنی لە چەند دە هەزار سالانەوە تائێستا هەر کوردن و خۆیان بەکورد دەزانن وە لە عادات و ژیانی قەومیەتیان دەرنەچوون.

## لیسان و عیرقییەتی کورد

ڕەگی میللەتی کورد لە شوعبەیەکی زۆر گەورەی ئەقوامی ئێرانین و میللەتی ئێران ئارین. ئیسمی ئاری لە تەرەف جوغرافیونی قەدیم بەقسمی شەرقی شاری «خوراسان»، «هەرات» وەکو سیستان بێژراوە.

هێندێک ئەوقات تەواوی ئەفغانستان و بەلووجستان تا حدودی هیند تەعمیم کراوە، لاکین لە قەدیمدا عیبارەتە لە هەرات. ئەنسابی ئومەم و ئەلسینە لە تەرەف عولەمای موتەئەخیرینەوە بەقەومێک تەسمیە دەکرێت زەمانی قەدیم لە بەلخ و هەراتدا ساکین بووین و لەوێوە بۆ ئێران و هیندوستان و ئەورووپا شوعبەی بلاوکردبێتەوە. مەملەکەتی قەدیمی ئاری لانکی نەوعی بەشەر بوو و ئەوەڵ مەزهەری مەدەنییەتی تەرەقی ئینسان حیساب دەکرێ. بینا لەسەر ئیقتیزای ئیقلیم و مەوزیع و مەوقیعی ئەهالی ئەو جێگایە لە تەواوی ئەنواعی نەوعی بەشەری دی کە تەناسوبی ئەعزایان چاکترە و مالیک بەزەکاوەتانێکی زیاترن، لە پێش هەموویاندا وشیاربوونەوە و ئاگاداربیان پێدا [کرد] ئەگەر ئەو عەهدە ئەکسەری بەشەر بە شوانی و دەراو و جووت دەژیان و لە حالی چادرنشینیدا بوون. ئەوەڵ کەسێک لە دێهاتدا دەستی [بە] تەئسیسی دانیشتن کرد و خووی بەخانوو دروستکردن کرد و قاعیدەیان بەزراعەت کرد میللەتی (کورد) بوون.

بۆ خاتری لە قەزا و قەدەر و شەڕ و جیدال و شتی تەهلوکە خۆ بدزنەوە، لە جێگاندا دانیشتن و ئیسکانیان کرد و زراعەت و شوانی و ڕاوکردنیان کردە قاعیدە. دەستیان بەئیلتیزامی ئیقامەت و نفووس زیادکردن کرد. بەمروری زەمان لەو جێگایانەدا زیاد بوون. وەتەنی ئەسلّییان پێ تەنگ هات و تێیدا نەدەگونجان و تەوسیعی زراعەتیان کرد و بۆ حەراسەتی ئەرازی قابیل بەزراعەت و پەیداکردنی زەویی و زیادکردنی جووت و دروونە، مەجبوور بوون بەئەترافدا بڵاوبنەوە. هەریەک لە نزیک خۆیەوە خشا و لە خوّلّی وەتەنیان جویّ بوونەوە. بۆ نەوعی گەلی کوردان دەم بەدەم و زەمان بەزەمان و قەبیلە بەقەبیلە و خێڵ بەخێڵ، گەلە گەلە هەڵستان و دەستیان بەهیجرەت کرد و ڕوویان کردە جێگایەکی دەست بدا بۆ جووتکردن پەیدا نەدەبوو یا نەیان دەدیییەوە و یاخود لەگەڵ عێل و خێڵی ئەو جێگایانەدا سازشیان نەدەکرد وە یاخود لەو جێگایانەدا نەدەگونجان. دەگەڕان تاکو موەفەق دەبوون و لەگەڵ عێل و عەشیرەتی دیکە شەڕیان دەکرد، ئەگەر بەسەریاندا زاڵ بوونایە، لەویّ دادەنیشتن؛ ئەو عێلەیان یا دەردەکرد وە یاخود بەخزمەتکردنیان ڕادەگرتن و دەیان خستە ژێر دەستووری کوردییەوە، ئەگەر دەرەقەتیان نەهاتبان، بەمەجبووری دەڕۆیین تا لەسەر عێلێک زاڵ دەبوون و دانیشتنیان قەرار دەدا. هەر بەوجۆرە بۆ پێشەوە لیّ دەخوڕان و پێش دەکەوتن.

لاکین ئەو گەلە عێلانە لە تەنها ساڵێک یاخود گەڕانێکدا بڵاونەبوونەوە؛ بەڵکە لە عەهد و زەمانێکی زۆر موختەلیفە، لێک دوورکەوتنەوە. بەوجۆرە لە بەینی هەر خێڵێکدا چەند گەڕان و قڕوون بەسەردا ڕابردووە.

و لە قەومی ئاری چەند قەومێک غەیری کورد و ئێرانیش لە ئاری دەرکەوتوون؛ وەکو «کلت» و «پاسخ» ولاتین «توتون». ئەسکیت «یۆنان». بە زۆری زەمـــان و لێک دوورکەوتنەوە، تەغییراتی زوبانیان تیّ کەوتووە.

لەم موختەسەرەدا بەحس لەو ئەقوامانە بەتەفسیل نایێتە کردن؛ چونکە شوعبەیان زۆرن و قسە درێژ دەبێتەوە و لە سەددی مەتڵەب لادەدرێت. لاکین لە کتێبی گەوهەردا بەتەواوی شەرحیان دەکریّ. لە قامووسی «الاعلام»ی شەمسەدین سامیدا زیاتر لە ٥٠ سەحیفەی وەکو ئەمەدا شەرحی دەکات. ئەمما هەرچێکو ئەقوامی ئارین، لە پێش هەموو قەومێکدا، دوو شوعبەی زۆر گەورەیان لیّ جویّ بووەوە: یەکێک بۆ ئێران دەرکەوت و دووەم بۆ هیندوستان بڵاوبوونەوە. لە بن نێوی قەومیەت و میللییەتدا، موفەسەل لە ئاتیدا قەوڵ بەقەوڵ دە..ژرێت.

## قەومییەت و میللییەت

قەومی ئێرانی لە وەتەنی خۆیاندا بڵاوبوونەوە. لە غەربی (خوبیەوە) بەتەواوی ئەرازی ئێرانی داپۆشی و پاڵیان پێکەوەدا. بەعزێک لە ئێران و مەجرای جەیحوون و دیجلە و فوراتدا بڵاوبوونەوە و ئەو ئەرازیانەیان پڕکرد. هێندێک لە شیمالی شەرقی عەرەبستان، قسمێ شیمالی غەربی ئێراندا و شیمالی بەحری خەزەر و غەربی کویستاندا دانیشتن. شەرقی مەعلووم نەکراوە؛ چونکە دایمە تا حدوودی هیندیان پڕکردووە. لەسەر حەدد و سنووری کوردستانی قەدیمدا مەعلوومی دەکەم. وە هەندێکیشیان لە کێوی زاخۆ و بەحری فارسدا و سەحرای کەبیر و بلوجستان و ئەرازی ئەفغانستاندا پڕبوون و لە هەر ئەترافێکیەوە دەستیان بەسەرکێشی کرد. ئەقوامێکی لەو جێگایانەدا بوون، بەزۆری بازوو دەریان کردن و بۆ خۆیان لێی دانیشتن و ئەرازیانیان زەوت کرد. تەواوی کوێستان و دەشتی غەربی و جنووبیان ئاوەدان کرد و دەستیان کردە جووت و چاندن.

لەسەر حەد بەحسی حدوودیان دەکرێت. ئەو قەومە عەزیمە لە تەرەف موئەریخانەوە هێندێکیان بە«لودوهی» و بە عیلام و میدیا و کاردۆخی یان نێوبردوون و لە پێش ئەو نێوانەدا بەئێرانی تەسمیە دەکرێن. لە حەقیقەتی ئەمردا هەروەکو لە کەلیمەی کورددا بەحس دەکرێت کوردن و لە زبانی کورداندا بەیان دەکرێت، چونکە موئەریخان میدیا بەئەقوامی ئاریان دادەنێن کە لە سیستانەوە دەرکەوتوون و لە خاکی ئێراندا ئیسکانیان کرد. ئەو قەومە لە زبانی ئەزمەنەی قەدیمەدا بەئەقوالی موختەلیفە بەحس کراون. ئەسڵی قەولی سەحیح ئەمەیە ئەوەڵ شوعبەی کە لە ئاری جوێ بووەوە لە سیستانەوە هیجرەتیان کرد و هاتنە ئێران، فورسی قەدیمە. کە ئەمڕۆ بەکورد تەسمیە دەکرێن. لەپاش جێ [گرتن] و پادشاهی لە عەهدی پێشوەوە تا دەرکەوتنی کەیقوباد -یەعنی تا ئەوەڵ کەیانیان- بەئاری مەشهوورن. چونکە تەواریخ و تەقلیدات و عاداتی پێشوویان بووە. ئەوە شاهیدە، ئیسمی ئاری تێدا شەرح دەکرێت. لە زهووری کەیانیاندا بە«میدیا» ناوبران و بۆ کوردان بوو بەعەلەم. عیلام، فارس، بلووج، ئەفغان، ئەرمەن ئەسڵیان کوردن و لە کورد دەرکەوتوون.

«پەهلەوی»: لە زەمانی ساسانییاندا بۆ تێگەیاندنی ڕەعیەتی، سریانی، هیندی، کەلیماتی سریانیان تێکەڵ بەکوردی کرد و هیندێک نەزم دراو لە دائیرەی حوکمداران ئیستیعمالی تەرویج درا هێندێک لە لەهجەی ئەسڵی کوردی دوورکەوتەوە.

زەند: زەندیش زوبانێکی دینییە کە کتێبی موقەدەسی پێ نووسرابوو.
ئەرمەنی: ئەسڵی ئوستی لە پەهلەوییەوە دەرکەوت. لە عەسری چوارەمدا (ب. م) بەهیمەتی مەسرووب نێوێکی ئەهلی مووش، حروفی لاتینیان قبووڵ کرد و هیندێک لە ئەلفازی ڕۆمیان ولاتینیان داخل بەئوستی کرد. هێواش هێواش لە کوردی دوورکەوتەوە.
کەلیمەی «ئاری» موشابیهـ و موناسیبی ئیسمی ئێرانی بوونی شاهیدی تەسمیە کردنە. لە زوبانی قەدیمی سانسکریتی پێشوودا، مەعنای کەلیمەی ئاری ئیسمی بۆ «ساحیب»، «ئەرازی» و هەم بەئەسڵ و «ئازادی» و «سەربەستی» بەیان کراوە و بەعزێک بەمەعنای «زەوی» و ئەرازییەوە موشتەقە.

## زمان و میللییەت

زۆر لە قەدیمدا زوبانی کوردی هەبووە وە لەگەڵ فارسیدا هیچ فەرق نەدەکرا؛ وە لە پێش زوبانی فارسیدا بۆ. چەند هەزارساڵ، بوونی ئیسپات کراوە: ئەویش موسابیهی تەواوی بەهلەوی دەکرد. حرووفاتێکی لە کوردیدا تەلەفوزی پێ بکرێت، زۆرن. بەعزێ موەریخان دەڵێن لەپێش هیجرەتیاندا نووسینیان بەزوبانی کوردیان هەبووە. ئەو نووسینە لە ئیبتیدائی ئەمریاندا تا ئەمڕۆشی دەفعەتە بەدولاتی بەسەردا هاتووە: ئەوەڵ جار لە زەمانی زەردەشت و لەتەرەف بەڵخەوە کتێبی زەندی ئەڤێستایی بەتەرکیباتێکی زۆر بەلیغی پێ نووسی. ئەو لوغەتەیان نێونا «زەندی» و لەنێو عولەمای دیندا بەکار دەبرا؛ بووبە زوبانێکی دینی وەکو زوبانی «نەحوی عەرەبی»؛ دووەم لە عەهدی ساسانیاندا هەندێک لە زوبان و حرووفاتی سەریانی و هەندێکلە حرووفاتی زەندی و کوردیان لەگەڵ کرد. «دەری» و «پەهلەو» یان نێونا. هەر وەکو لە پێشدا بێزار؛ سێیەم؛ لە پاش قبووڵ کردنی ئایینی ئیسلام، زۆر ئەلفاز و تەعبیراتی عەرەبییان لە کوردی دا بەتێکەڵ. لە نێو عولەمایاندا دەستی بە ئیستێعمال و تەرغیب و تەوزیج درا؛ هەرچەند مرووی زەمان، ئینقلابات و تەزییق و دەردەسەری زۆر بەسەر زوبانی کوردیدا هاتووە؛ دیسان کوردی ئەسڵی، زەندییە و زەندییش کوردی قەدیمە. هەرچەند عولەمای کوردستان لە پێشدا و لە پاش ئیسلامیەتیش پەهلەوی و عەرەبی و فارسی و زەندیشیان ئیستیعمال کرد بێ، بەزوبانی خۆیانیشیان ئەهەمیەت نەدا بێ و بەو زبانەی مەزکوور تەئلیفاتیشیان کرد بێ، ئەوەیش لەبەر سوڵتەی دینی و دەسایسی عولەماوە تەقەددومی کردووە، لە زەمانی قەدیمەوە تا پەیدابوونی ئیسلام و تا ئێستا، بەزوبانی قەدیمی کوردی ئەشعار بێژراوە. ئەو

ئەدەبیاتەش لەسەر حرووفی عەرەبی زۆر ئەدەبیات و کتێبی تەواریخیان پێ هێناوەتە وجوودەوە؛ چونکە نووسینی پێ ئاسانترە. لە فەرەنگستان قەواعیدی نەحو و سەرفی کوردیان بەلوغەتێکی فەسیح و تەواوی ئیهتیمام زەبت کراوە.

لەم عەسرەشدا لە گەلێک جێگایان قاموسی کوردی و تەئریخ و تەئلیفاتێکی زۆرکراوە و لە نەشر دایە، قەواعیدی لوغەت لە زۆر شاران لە تەرەف مونەوەرانی کوردان لە وەخرکردن دایە و ئەغلەبیش تەبع کراون.

لەلای موئەریخانی قەدیم و عولەمای ئەم عەسرە، شوعبەیەکی لە بەلخ و هەراتەوە دەرکەوت و لە ئێراندا ئیسکانی کرد. لە زوبانی ئەزمەنەی موختەلیفەدا بێژراوە دیسان زوبانی (ئاری) ئێرانییە. ئەمڕۆکە ئەوانە لەنێو ئوممەمی ئاریدا لەسەر وەجهی ئاتی مونقەسیمە:

| شوعبە | ئەلسینەی قەدیمە | ئەلسینەی جەدیدە |
| --- | --- | --- |
| ئێرانییان | زەند | فارسی |
| کوردان | فورسی قەدیم | کوردی |
| ئەفغانییان | – | پەختی (ئەفغانی) |
| ئەرمەنییان | پەهلەوی | ئوستی (ئەرمەنی) |

ئەو چوار میللەتە گەورە لە جەدوەلی سەرەوەدا زیکرکران، ئەقوامی ئێرانیان و دایکی ئەسڵیان ئێرانە و باوکیان کوردن. بەموقتەزای وەقت و ئینقیلاباتی زەمان لە ئەسڵی کوردی دووریان دەست پێ کرد. زەمان و مەکان، تەغییراتی زوبانیی تێخستن. فەقەت شکڵی چێهرە، عادات، ئەخلاق، تەبیعەت، حەرەکاتی، ئەلفاز، لوغەت، تەقالید، هەیئەت، سیما، حەیات و ژین، ئەدەبیات لێک جویّ نەبۆتەوە، لەژێر هەدەفێکی نیشانە قەومییەتێک؛ میللێیکدا دەژین.

## کەلیمەی کورد

دوقتۆر «سەیج» لەسەر ئوسووڵی تازە و تەشەبوساتی موئەریخانی قودەما، ئیسمی میللەت زۆر بەئەهمیەت عەتف دەکرێت و لەبەر نێوی مەنشەئو ئەسڵ هەرچلۆنێک ئیسم و کەلیمەی «کورد» تەدقیق کرابێ لە حەقیقەتدا. موتالەعاتێکی زۆر دوور و درێژ هەیە. لە سەحیفەی ئەوەڵی تەئریخی یۆناندا موئەریخ «ئوستراپۆل» زۆر بەحسی کوردستان دەکا و دەڵێت: میللەتی «قالوکید» لە شیمالی کوردستاندا مەوجوود بوون و ئەوانیش خۆیان

به«غوردی» تەسمیە دەکرد، ٤٠١ ساڵ لە پێش حەزرەتی عیسادا کە تا ئێستا دەکاتە ٢٣٢٥ ساڵ. موحەرڕێری یۆنانی مەشهوور(دا) «ئەکسەنۆفۆن» لە سەفەری ١٠ هەزار لەشکریدا کە چووە شەڕی کوردستانەوە بۆ کەمبیزی دووەم دەبێژی لە سەفەرنامەیەدا میللەتی «غوردی» لە هەموو ڕێگاماندا هەبوون. دەنووسێت لە پاش شکاندن و پەرێشانی گەڕابوونەوە. ئەو (١٠) هەزارە لەشکری (قرد) بوون.

دەڵێت لە ڕێگاماندا تا چووینە کوێستانی «زاغرۆس - زاخۆ» و لە شەرقی زاخۆدا ئەو میللەتەی «قردۆخ» هجوومیان کردە سەر ئێمە و بەبەرد و قۆچەقانی دەستیان کرد بەشەڕ و کوشتارمان، ئەو شکستەمان لە میللەتی «غوردۆن» بوو. لە پاش گەڕاندنەوە و لەسەر ڕێگاماندا ڕاستی ئەو میللەتە دەهاتین. هەرچێکو ئەکسەنەفۆنە دەڵێت میللەتی کورد موستەقیل بوون و بۆ حوکمڕانییان مەیدانێکی زۆر زل و شارانێکی ئێجکار بێ ژماریان قەید دەکا و دایمە پێکەوە یەک دڵ و یەک زوبان و موتەفیقیان لەگەڵ یەک ڕاستیان نەقڵ دەکا.

ئەو جێگایە کە پێیدا گەڕابوونەوە، «شەمسەدین سامی» دەڵێت ئەمڕۆکە بەدیاربەکر و مەعمورەتولعەزیز مەشهوورە و دەناسرێت. هەرچێکو «قردوخ»، «غوردۆن»، «کردۆن»، «غوردی»، «قوردی»، «کورد»ییە، لە زبانی یۆنانیدا دەرکەوتن و تەبدیل و گۆرانی مەعلوومە؛ لەباتی «ک» بە «غ» و لە بری «ی» بە«خ» نویسینیان غەڵەتە و «کوردی» بوونی هیچ شوبهەی تێدا نییە.

هەر بەوجۆرە و هەزار سێسەدو بیست و پێنج ساڵ لە پێش ئەو جێگایانەی کوردی تێدا بووە و دانیشتوون. وەشکی تێدا نییە نەینەوا و بابل و عیراق وادی فورات و دیجلە و ئەو جێگایانەدا کورد ساکین بوون، بەکوللە و تەواوی کوردستان بووە، لە ئازربایجان و عێراقی عەجەم و عەرەب و سەیحوون و جەیحوون. کورد لە حاڵی حازریش و زەمانی قەدیمدا لە حاڵێکی موستەقیلیدا مەوجوودیەتیان نواندووە و بەبێ ئیدارەی حکوومەتی غەیر ژیاون و بەسەریان بردووە و لە ژیانێکی زۆر چاکدا ڕابواردنیان موحەقەقە.

لە ساڵنامەی ئاسووریاندا مەزکوورە میللەتی «غوردی» دایمە لەسەر کێشی و هەیەجاندا بوون و نەکەونە ژێر حوکمی ئێمەوە و لە ژێر حوکمی کەسدا ناژین. دوقتۆر «سەیج» و ساحیبی «قاموس الاعلام» شەمسەدین سامی بەگ و بەعزێ موئەریخانی دیکەش، لەسەر ئەمە موتەفیق و یەک قەولن و دەبێژن لەنێو میللەتی شەرقدا کەلیمەی کورد بەمەعنای

ئازا، قەهرەمان، بهادر، ڕەشید، پەهلەوان، زەبر دەست، بەقووەت [و] غەییور هاتووە. کەسێکی بەو سیفەتانە مەوسووف بێ، نیسبەتی لە «کورد» دەدەن.

لەفزی کورد عەینی مەعنا دەبەخشێد. شاهنامە لە حەقی بەعزە کەسانێ بەکاری دەبا و زۆر بەگەرمی لە ئەغلەب جێگایاندا مەدحی گەورەی سوپاه و پێغەمەر و پادشایانی ڕەشید لە مەیدانی شەڕدا پێ دەکا. ئیسمی کورد بینا لەسەر جەسارەتی تەبیعی کوردانی قەدیم و لە ئیبتیدای ئەمریاندا بەو مەعنایە نیسبەت دراوە و لە پاشان بۆتە عیلم. موئەریخانی پترسبورغ حەللی کەلیمەی کوردیان بەسوورەتی ئاتی بەحس کردووە: کەلیمەی کورد بۆ قەومێکە موستەقیل بن و کەسێکی لەژێر ڕای خۆیدا بەئازادی و سەربەستی بژی. لە بەعزێ تەئریخانی ئێراندا تەئیید و تەقویەی ئەو قەولە دەکەن. لە قیوداتی ئێراندا نەزەریاتی کەلیمەی «کرت» یەعنی موستەقیل یا پادشایەکی حامی یا قەومێکی سەربەست و موستەقیل بەهەردوو نەوع بەتەحقیق گەیشتووە. کەلیمەی کورد و کرت موشابەهەی تەواویان هەیە و زۆر لێک نزیکن، چونکە لە حەقیقەتی ئەمردا حەرفی «ت» و «د» یەک دەنگن و یەک سەدایەکیان هەیە.

بەعزێ لە عولەمایان گوتوویانە لەو خاکەدا حکوومەتێک تەشکیل کرابوو بەنێوی پادشا یاخود گەورەیان کە ئەویش ئیسمی «لۆردۆهی» دەرکەوتووە و وەرگیراوە.

لە تەڕەف عولەمای ئەخیر و موئەریخانی تازە، بۆ کەلیمەی کورد ئەو نەزەریاتەی مەزکوور قبووڵ کراوە. بەو سوورەتە نێو بەتەواوی تەناسوب پەیدا دەکا. دوقتۆر «سەیج» کەلیمەی کورد لە «لۆردۆهی» موشتەق دەکا. ئەو نەزەریاتانەی عولەمای پێشوو و پاشوو موئەریخانی ڕابردوو و هاتوو، ئیسپات بوونی کەلیمەی کورد و میللەتی کورد و زوبان و کوردستان و حکوومەت و ئیستیقلالی کوردستان و ئیدارە و حوکمڕانیان بەهەموو جۆرێک دەکەن. «ملتەبرون» لە کتێبی جوغرافیەی عموومیدا -کە «فاعە بەگ» تەرجەمەی کردووە- دەبێژێت ئەوانەی لە کوێستانی زاغرۆس و نیغاتیس دا ساکینن و بە«میدیا» مەشهوورن میللەتی «کەرتی»ن. وا مەعلوومە ئەو نەیکە کە«زینفۆن» بە«کوردۆخ»یان ناو دەبات «بلۆتوخۆس» بە«غەردونی» تەسمیەیان دەکا. ئەمین مەرقەلین بە«کوردۆنی» و لە بەعزێ ئەدەبیات و تەواریخی ئێراندا بە«گورد» و بەعزێ عولەمای موتەئەخیرین بە«کرد» یا «أکراد» ناویان دەبەن. بەعزێ بەگافی فارسی و ڕا و دال و بەعزێ بەکافی عەرەبی بەحسیان دەکەن. لە «طبقات الأمم»ی جرجی زێداندا زیکر دەکرێت: ئەما ئەکراد

ئوممەتێکی قەدیمن و لە تەئریخی قوداماياندا بە«کوردۆخ» تەسمیە کراون.

بینا لەسەر تەقالیدی عولەما و تەقاروبی ئەلفاز و کەلیمات، ئیختیلاف حاسڵ نابێ؛ بەڵکە لە زوبان و لوغەتی یۆنانیاندا بەغەڵەت تەلەفوزیان پێکردووە و ئیلا: ئەو کەلیماتانە فەرقێکیان تێدا مولاحەزە ناکرێت. ئەو تێکەڵی و غەلەتە لە موئەریخانی یۆنانیەوە دەرکەوتووە و لە حەقیقەتدا بیسمی زۆر پادشایانی کوردان و ئاسوور و کلدانی و نەینەوایان تەغییر و تەبدیل کراوە. ئەمڕۆکە تەواوی عولەمای تەئریخ بۆ تەسلیح و ڕێککردنی ئەو نێوانە سەعی دەکەن و زەحمەتیان کێشاوە و بەچەندان ئەزیەت و مەرارەت تەئلیفاتیان لەو خسووسە کردووە و تا ئێستاش تەسلیح نەکراوە و بەتەواوی و لە گەلێک جێگایاندا موهمەل و لە شکدا ماوە بۆ تەسحیحی موەفەق نەبوون. لەبەر چی؟ لەبەر ئەلفازی غەڵەتی یۆنانیانە.

## ئەدەبیاتی خۆشخوانی

میللەتی کورد لە شیعردا ئیستعدادێکی فیتریان هەبوو. لەنێو عەشایر و قەبایلی کوردستاندا ئوسووڵی شیعر لە مەدح و هەجوودا، مەرسیە لە حاڵێکی دڵسۆزیدا و کەیفخۆشی و زەوقدا تەسەور دەکرا. بەعزێک بۆ شەڕ و هجوومی پەهلەوان، دلاوەران و بەعزێک لە مردندا لەسەر جەنازان بەڕەسمی نەوحە و گۆرانی لە مەجلیسی مەیداناندا، خۆشخوان و ساحیب تەبعان، نەزم ماجەرایان کردووە. ئەو کەلیمانەیان لەسەر قاعیدەیێکی چاکیان خستۆتە وەزنەوە و هەروەکو بۆ موزەفەریەتی پەهلەوانان پێیان هەڵگوتوون.

کورد لەنێو قەبایل و عەشیرەتاندا لە ڕەبت و دانانی قسە و کەلام و دەنگ خۆشیان کۆشاون. خۆشخوان لە مەجلیسی گەوران و دیوانان و سەرا و خانووی حوکمڕاندا بەئیحترام و لە پێش و زۆر لە ڕوودا بوون و ئیعتبارێکی تەواویان دەکردن. ئەگەر یەکێک لەنێو عەشیرەتێکدا هەوایەکی بەنەزمێکی چاک و خۆش ڕێک خستبایە، عێل و عەشیرەتی دیکە بۆ موازەنە دانی کەلام، دەهاتنە تەبریک و ئافەرینی و هەدیە و وسوقات و دیارییان بۆ دەێنان.

هەر عێلێک و تایفە و قەبیلەیێک خۆشخوانی لەنێودا بوایە ئەو قەوم سەربلند دەبوو، ئەوەندە مەدح و تەعریفی گەورە و مەزنیان دەکرد، ڕەئیسی ئەو قەومە و قەبیلەیە لەنێو باقی قەبایلدا ئیشتهاری بەچاکە دەکرد و دەبووە سەبەبی تەرەقی و شان و شەرەفی بڵندی

ئەو ڕەئیسە و ئەو قەبیلەیە. هەروەکو لەم عەسرە و لە زەمانی ئێمەدا ساحیب ڕۆژنامە و جەراید و موئەلیفانی ساحیب فەن و مونەوەر بەفیکر و تەدبیر لە نێو هەموو دەوڵەتانی موتەمەددیندا، موعتەبەر و لە ڕوودان و سەعی دەکەن بۆ بڵندی میللەت. سەحافییەنی ئەمڕۆ تەواوی وەزیفەی خۆشخوانی پێشوان دەبینن. ئەو خۆشخوانانەش بۆ بڵندی ئەو عەشیرەتە تەسەوراتیان دەخستە فیکرەوە و بەزبان دەریان دەخست. هەموو کەسێک لەهەجو و جنێوی خۆشخوانان دەپارێزران بەپێ هەڵگوتن فەخر دەکرا؛ ئەو مەدحە دەبووە سەبەبی شوهرەتی ئەو پیاوە. ئەغلەب لە عەسری ئەخیردا تەشەبوساتی تەئریخی کوردان لە زوبانی بەعزێ خۆشخوانان دەگەڕاوە. چونکە ئەو خۆشخوانە بەزوبانی حاڵی ئەو ئەمیرە وە یاخود ئەو پادشایە، وە یاخود ئەو قەبیلەی مەنسووب بەوە. بەتەواوی جەرەیانی ئەحواڵی کوردستان لە زوبانی ئەواندا گوزەری کردووە؛ بەچاک وە یاخود بەپیس دەست بەدەست وەردەگێڕا، هەروەکو دوور و درێژ لە «چیرۆک و سەرگوزشتە»دا زیکر دەکرێت.

شوعەرای عەرەب لە پێش ئیسلامیەتدا ئیقتباسیان لە کوردستان دەکرد بۆ فیکری نەزمی شیعر. لە حدوودی بابیلەوە ڕوویان دەکردە کوردستان بۆ چوونی تەکمیلی شیعر و تەبلیغی مەرامیان دەکرد لە نەزمی کەلامدا. ئەگەر یەکێک لە شاعیرانی عەرەب ئەو سەفەرەی بۆ کوردستان نەکردبایە، لەنێو قەبایلی عەرەب ئەوەندە ئیعتباریان بەشیعر و نەزمی نەدەکراو ئەمڕۆکەش لێمان مەعلووم دەبی لە پەردەی خوێندنی عەرەباندا بەعەینی نێوی کوردیان لەسەر داناوە وەکو ئەمە «ڕاک»، «بەیات» و «دووگا»، «سێگا» ئەو نێوانە شاهیدە بۆ قەول و قسەی بێژرا لە سەرەوە.

## دەنگە دەنگی گەلی میللەت

هێندێک نووسینی ئاسووریا و کلدانی لەسەر بەرد و سواڵەتان نەقش کرابوون و لە تەردف بەعزێ عولەمای عەسرییەوە، هێندێک لە ئەحوالی کوردستانیان لەو نەقشانەدا بەئوسوولی ئاتی دەرج کردووە و هێناویانەتە سەر قیاسێکی تەواوەوە، بەیەکدەستی حکوومەتی کورد و ئاشوور، چەند قەبیلەیەکیان کورد لە جیهەتی مەرکەزی ئەسڵیانەوەیان هێنا جیبالی کوردستانی ئەمڕۆی حازری. ئەو کێوانە میللەتێکی توورانی (لوردۆهی) نێوێک ئیستیلای بەسەردا کردبوو. بەداکەوتن دەستیان بەتەشکیلات کردبوو. لە حدوود وخاریجی سنووریان فەساد و نارەحەتیان دەکرد و لە حەرەکاتێکی بێ تەمەددونی و تەوەحوشدا بەسەریان دەبرد. هەروەکو لە کەلیمەی «کورد»دا بێژرا. بۆ دەفعی ئەو فتنەیە

لەگەڵ حکوومەتی ئەکباتان (کوردستانی کویرا) بەئیتیفاقی ئەوە کە ئەو حکوومەتە مەحووکەن و حکوومەتێکی ئیداری کوردستانێکی سوغرا تەشکیل کەن، چەند قەبیلەیەک لە تەرەفی کوردستانەوە ناردرا و هجوومیان کردە سەر لۆردۆهیان و شکاندیان. لە جێگای ئەوە حکوومەتێکی کوردیان دانا و تەشکیلاتی ئیداری ئەو حکوومەتە کوردەیان کرد، ئەو جیبالانەش عیبارەتن لە کێوی «هەکاری، شنۆ، بتلیس، دیاربەکر، مەعمورەتلعەزیز، ئەترافی گۆلی ئۆروومییە».

بەعزێ ئاسار و تەواریخ بۆ ئێمە ئەو قەناعەتە حاسڵ دەکا کە لە دەوری ڕابردوو و زەمانی پێشوودا «کورد و کوردستان» ئیستقلالییەتێکی چاک و چەند عەسرێک حکوومەت و ئیدارانیان تەشکیل کردووە. ویجدانی مەعشەری کورد غایەت بڵند و ئازادە و بەڕوو گەورە بووە؛ هەروەکو «دوقتۆر سەیج» دەرجی کردووە و بەتەحقیقی شاهنامە لە بەحسی کەیکاوس و کەیخوسرەو و زاب کەیقوبادو تەئییدی ئەوە دەکا کە ڕۆستەم چووە ئەلبورز بهێنێتەوە بۆ هەمەدان، کە هات هەموو کورد لەسەری وەخڕبوون و حکوومەتیان بۆ تەشکیل کرد. گیووی کوڕی گودەرز چووە کێوانی لوڕستان و هێنایەوە کوردستان. لەشکریان بۆ برا و کورد لەگەڵ تورکان شەڕیان کرد لە کەناری دەریای ورمێ و گەورەی تورکانی کوشت و تەوسیعی کوردستانیان کرد. بینا لەسەر قەوڵی هیرۆدۆت وا مەعلووم دەبێ ئەو تورکانە بەسەرکێشی ڕایان ٠ەبوارد، لە کوێستانی کوردستاندا بەمعاوەنەتی ئاشووریان، کورد ئینقرازیان پێدان و لە جێگای ئەواندا حکوومەتی «لۆردۆهی»یان تەشکیل کرد. ئەو ئاسارانە بەتەواوی بۆ بوونی حکوومەتی کوردی قەدیم شاهیدن و ئیسپاتی تەرەقییان دەکەن. بەعزێ عولەمای فەرەنگ دەنگە دەنگی کوردییەت و بوونی کورد سەبەبی هیجرەتیان لە وەتەنی ئەسڵیان، ئێران، بۆ ئەرازی ئاشووری و ئاسیای سوغرا، بە بەعزێ نەزەریاتی تەئریخی هاتوویە حەلکردن و ئاشکرایان کردووە «ئەمەی کورد لوغەتیان ئاری و وەتەنیان ئێرانە» نەعەرەب و نەتورکن، کورد، فارس و فارس، کوردن. بەتەواوی موشابێهی سەنسکریتی هیندییە.

هەرچێکو دیۆکیسی زوحاک بەمەعنا گرتنی بیوراسب بهودیب ماری گەزەندە، «ئەستیاجیس» جیسی زوحاک یەعنی بەلایەکی سۆزندە «لە ئەلفازی عەوامدا زوحاک ماری». بەهەر تەقدیر و لەسەر قەوڵی ئەسەح زوحاک لە ئۆرشلیمەوە ئیستیلای کردە سەر کوردستان و بینای مارپەرستی دانا لە کوردستاندا. دوومارى گەورەی بەمەعبوود دانا

بوو، زۆر کەسی کوردانی سەر بڕی و بۆ ستەم و جەور دەستی درێژکرد و زوڵمی لە تاقەتدا نەما. زاتێکی وەکو «کاوە» بێ کە وەزیری زوحاک بوو، لە ژێرەوە قووەتی پەیداکرد. ڕۆژی ئەوەڵی بەهار -کە بە«نورۆژ» مەشهوورە- بەکۆمە لە سەرای حوکمداریدا وەخرِبوون و زوحاکیان گرت و خستیانە زیندانەوە و «فراوەرتیش» فەرەیدوون ناوێکیان لە شازادانی کوردان لەسەر تەخت دانا و (ئاڵا - بەیداغ)ەکەی کە کاوە هەڵی دابوو «درەوشی کاویانی»یان نێو نا و کردیانە شتێکی بەموبارەک و پیرۆزیان دەژمارد و بەتەواوی گەوهەری بەردی بەقیمەتیان جوان کردبوو. ئەو ئاڵایە تا زەمانی حەزرەتی عومەر (رض) هەر حوکمدارێک تەنگییەکی لێ ڕووبدابایە ئەو عەلەمەیان دەردەخست و چەند هەزار قوربانییان بۆ سەر دەبڕی، بۆ موزەفەریەت دەریان دێنا و لە زینەتیدا زۆر موبالەغەیان تێدا کردبوو. لە زەمانی عومەردا ئەو ئاڵایە بەئەسارەت و دیل چووە مەدینەی مونەوەرە و پارچە پارچە کرا و ئەو موجەوهەراتەیان لێکردەوە و ئاڵایان سووتاند.

لە خسووس کاوەوە ئێرانیی زۆر خورافاتی تێدا دەکەن و لە موبالەغەدا کردوویانەتە ئەفسانە. ئەوانیش هەموو بێ ئەسڵن، لاکین کاوە پیاوێکی میللەتپەروەر و ڕوو بەهیمەت و حەمییەت و بەتەعەسوب بوو بۆ خەلاسی وەتەن لە دەست دوشمنی زاڵم و بێگانە و ئیستیقلالی کوردستان. دەرکەوت ئەو حەرەکەی هێنا وجوود و خرووجێکی دەنگەدەنگی میللەتیی بوو و بەس، ئێمەش دەبێ تا قیامەت شوکری ئەو زاتە ، ئەمسالی ئەو بکەین، ئەو ڕۆژەی ئەوەڵ بەهاریان کردە جەژنی نورۆژ، یەعنی بۆ کوردستان ڕۆژێکی تازەیە و لە سی ویەکی ئوغستۆس کە ئاخر ڕۆژی هاوین بووە زوحاکیان کوشت و فراورتیشیان کردە پادشا و ئەو ڕۆژەیان نێو نا «میهریجان» (مەحەبەت ڕۆژی ئیستیقلال)، یەعنی دەرکەوتنی کاوە و لەشکری لە دەماوەندەوە. خولاسە ئەو دوو ڕۆژەیان بەجەژنی میللی قبووڵ کرد و تا ئێستاش لەنێو کوردستان و ئێراندا بەڕۆژێکی پیرۆز قبووڵ کرا و لە هەموو تەئریخێکی کورد و ئێراندا کوشتنی زوحاک و ڕۆژی ئیستیقلالیان لە لا مەسعوود و موبارەکە. لەو خسووسەوە نەزەری موئەریخانی جەلب کردووە بۆ موناسەباتی کورد و ئێران.

«سێر ماڵقۆلیم»ی ئینگلیزی موحەریری تەئریخی ئێران دەڵێت: زوحاک لە ئیستیبداد و ستەمێکی زۆر عادییەوە حەرەکەی دەکرد. لەبەر ئەو ستەمە کورد لە ئێراندا بڵاوبوونەوە لە کێواندا وەخرِبوون. هێواش هێواش جەمعیەتیان بەقوەت بوو، لە پڕێکدا لینگیان دار سەر

زوحاک و کوشتییان و ئێرانیشیان دەست خستەوە و حکوومەتێکی فەوقولعادەیان تەشکیل کرد. لەسەر ئیددیعای مالقۆلیم ئەو حەرەکەیە بوو بەسەبەبی تەرەقی و تەمەددونو تەشکیلانی کوردستان.

عولەمای دیکە مەسئەلەی زوحاک بەزۆر ئەهمیەت دادەنێن و لە موباحەسە [ترکوزی] دەکەنە سەر شکلێکی زۆر گەورە، لەسەر ئەوە کورد لە ئەوتانی خۆیان هیجرەتیان کرد و لە زولم و ستەمی زوحاک کەوتنە کێو و کوێستانانەوە. هەروەکو بێژر، زوحاک ئەسلی ئێرانی نەبوو. موئەریخان عەرەبیەتی و لە ئەهالی سووریا و فەلەستینی بوونی قبوول دەکەن و بەوە قەناعەتیان حاسل کردووە.

عولەمای موتەئەخیران زوحاک بەحوکمداران وە یاخود بەحوکمدارێکی ئاشووری قەبوول کردنیان مونبەحیسە. خولاسە ئەغلەبی قەبایلی کوردستان لەو عەسرەدا هیجرەتیان کردبوو، لە شیمالی ئێراندا ئیسکانیان دەست پێکرد. بۆ خۆیان دائیرەیەکیان بینا نابوو. لە شیمالی ئاشووریاندا حکوومەتێکی گەورەی کوردان بوونی بەحس دەکەن کە دایمە ئاشووری لە دەستیان عاجزبوو. «هامەر» موئەریخی ئەلەمانی دەڵێت بۆ نەسلی کورد و سەبەبی هیجرەتیان و حەقیقەتی ئەحواڵیان فەقەرەیەکی تەئریخییەکانە هەیە ئەو فەقەرەیەش بەم جۆرە حەل دەکرێ: ئاورپەرستی و ڕۆژپەرستی لە ئێراندا تەرویج درابوو. کورد لەبەرئەوە کە لەسەر ئاینی زەردەشتی بوون، لەگەڵ قەومی ڕۆژپەرستان دایمە لە شەڕ و کێشەدا بوون، لەسەر ئیختیلافی دینی. ئەو دوو دینە بوو بەسەبەبی هیجرەتیان بۆ مەجرای فورات و دیجلە و ئەترافی ئەناتۆلی، هەروەکو عەسری حازری لە مەسئەلەی شیعە و سونییەتدا، لاکین بەحاڵێکی موستەقیلل لە کوێستاناندا ئیدارەیان دەکرد. «هارمی پۆرت» لە تەئریخی عموومیدا دەڵێ: سەبەبی هاتنی کوردان بۆ ئەو ئەرازییانە، کەیکاوس بوو. لە دەوری سەڵتەنەتیدا دێنە بێژین. کەیکاوس مەعنای (چاوجوان)ە.

## داستانی میللەت

شتێکی زیاتر دەستی موئەڕیخان بگرێت و تەئییدی قەولیان بکا و بۆ بوونی کورد و کوردستان لە پێشوویەکی زۆر دوور و درێژدا، لە قیسمی ژیانی میللییەتدا بەتەفسیل نیشاندانی و بەڕاستی گەڕاندنەوەیە، ئەویش چیرۆک و سەرگوزشتەیەکی وایە هەموویان لە دایرەیەکی مەحدوودا بەتەواوی دەورە گرتن ڕاگیراوە و بەخێوکراوە.

لەنێو ئەو داستان و سەرگوزشتە و چیرۆکانەدا، حکوومەتێکی زۆر گەورە و بەغرورێکی

بەزەفەر و ژینێکی بەئازادی و سەربەستی و ئیستیقلالێکی خسووسی و فیکرێکی چاکترین و تەمەددونێکی مونەوەر و حقووقی ئەخلاقی، بەدایعی خسووسیاتی ئەو مەوقیعانە عاید بەژیانی میللەتێکی زۆر گەورەوەی کوردان. ئەوانیش ماجەرایەکی وان. کورد لە دەوری ڕابردووی پێشوودا لەگەڵ میللەتی شەرق شەڕیان کردووە و بەسەریاندا زاڵ بوون؛ خاکیان لێ گرتوون. بەڕەسمی خۆشخوانیی لە مەجلیساندا خوێندوویانەتەوە. لەپاش واقیعات شایەران بەزبان و بەدەنگی خۆش زەوت دەکرا و لە هەموو جێگا و ئەنجوومەناندا ئەو شەڕە بەنەزم بۆ ئەهلی خەلقی ئەوێ دەبێژرا؛ هەروەکو ئەمڕۆکەش هەر واقیعەیەک بێ، شایەران نەزمی دەکەن.

لە زەمانی حەزرەتی عومەردا (رض) کتێبی تەئریخی کوردستان «ڤینداد» نێو و کتێبی ئاینی موقەدەس (زەند ئاوێستا)یان لەهەر چوار کەناری کوردستانەوە وەخڕکرد و خستیانە دیجلەوە و ئەسەری تەئریخیان و ئاینییان مەحوو کراوە و تەعەسووبی ئیسلامیەتیش غەلەبەی بەسەر میللیەتدا هێنا بوو. دەسیسەی عەرەبیش ڕەگوریشەی دەرخستن. عولەمای کوردستانیش نەیان کرد خۆیان تەسلیم بەئاینی موتەهەڕی موحەمەدی کەن، عادات و ئەرکانی شەریعەتی غەڕا بکەنە بینایەکی تەواو و گوێ نەدەنە ئەفسانە و خورافات و دەسایسی دوشمن، کوردییەتیان بەئیسلامیەتەوە ئیفتیخار پێ بدابایە. کورد ئەمڕۆکە دەبوونە چاکتری قەومانی موختەلیفەی ئیسلام. وەکو ئەمڕۆکە لە جەهلدا نەدەمان. ئەوانە هەموو بەحەرەکاتی نەزانی کەوتە ژێر زوڵمەتەوە و نەبوونەوە و لەبەر بێ فیکریان لە هاتوو و ڕابردوودا و نەتیجەی کاریان و نەزانینیانەوە بەسەریان هات. جا یا هەڵخەڵەتان بەقسەی وشک و یاخود ئیغفال دران.

ئەگەر وانەبوایە کورد هەڵستان و دانیشتنیان و ژیان و قاعیدە و تەسەوراتیان بەدەرەجەیەکی تەواو لە عەسرانی پێشوودا قەناعەتی کوردەوارییان لە شەوکەت و دەوڵەت و حکوومەتیاندا حاسڵ دەبی و لەوانە وەها مەعلووم دەبێ کە لە ئەزمەنەی ڕابردووی پێشوودا بۆ کوردان، مەبدەئێکی تەئریخی زۆر بڵند و شەوکەتێکی گەورەی سەروویان هەبووە و ساحیب ئیدارە و ئینتیزامێک و ئەمر و فەرماو بەدەست و قودرەت و ماڵێکی شاهنشاهێکی عەزیم بوون لە زەمانێکی زۆر پێشوودا حوکمداران و ئیدارە و تەشکیلاتی وەکو حوکمدارانی «کووش»یان هەبوو کە ئەغلەبی موئەریخان لە کوردانیان جوێ کردوونەوە، عەلەلخسووس کووش و میللەتی کووش کە پایتەختیان «کەرکووش»

(کەرکووک) بوو، تایفەی کوردن و تەقالید و عادات و ڕەوشتیان بۆ ئەوە شاهیدە. ئەمما هەروەکو لە ئەغلەبی جێگایاندا بیژرا، عولەما و مونەووەرانی کوردان لەبەر ئیرتیباتی دینی و بێ موبالاتیان بەتەئریخی میللەتیان، کەم کەم ئەحوالی کوردستان کەوتە نەزانینەوە و زەوتیان نەکرد. موئەریخانی ئەجنەبی کە وایانزانی، زاتەن لە خودایان دەخواست کورد جاهیل بمێنێتەوە. بەزوویی ئەو عولەمایانە نیسبەتی گەورەی کوردیان لە خۆیان دەدان بۆ ئیسپاتی شان و شەوکەتی خۆیان؛ هەروەکو لە پاش ئیسلام -کە ئێستە ئێمە بەچاکی لێمان ئاشکرایە- سەلاحەدینی ئەیووبی کوڕی شادییە و لە ئەولادانی ئومەرای کوردستانی ئازەربایجانە. موئەریخانی عەرەب نیسبەتی لە مەڕوانی ئەلحیماری «ئەمەوی» و عەلەلخسووس مەروان لە هەموو موئەریخێک مەعلوومە چی لێ هات و ئەولادی بەنی ئومەییە چییان بەسەرهات؛ چونکە عولەمای کوردستان تەئریخی ئەحوالی خۆیان بەخێو نەکردووە، بەقەولی دوشمن ئێغفال کران؛ تەئریخیان لێ گوم بوو، ئێمە لە جلدی یەکەمی «گەوهەری یەگانە»دا بەتەواوی بەحسیان دەکەین.

**«کیانیان»** لە ئیبتیدای ئومریانەوە تا دواییان مەعلوومە و جێگای لێ دەرکەوتنیان کە هەمەدان و کوێستانی هەورامان و کرمانشایە بۆ ئەوە شاهیدە. چوونی ڕۆستەم بۆ ئەلبورز و هێنانی کەیقوبادو. ئەم دوو بەیتە گەواهیدەرێکی بەدادە کە کیانی «کورد» بوون، موراجەعەی شاهنامە بکرێت دەزاندرێت بەیتی:

یکی جام و باده بەرستم سپرد
بدو کفت کی نام برداری کرد

**ڕۆستەم دەڵێ:**

تەواوی گەورە و ڕیش سپییانی کوردستان لە هەمەدان وەخڕبوون و ئەرازی کوردستانیان لە دوشمنێکی وەکو ئاشووریان پێ قوتارکرد و منیان نارده خدمەت جەنابتان و ڕایان ئەسپاردم. بەیت:

بگوید کە کردان ترا خواستند
سر تخت ایران بیاراستند

بەعزێ موئەریخانی تورک و عەرەب بۆ ونکردنی ڕاستی نیسبەتی کیانیان لە تەرکێش بەخەتا چوونیان تەئریخ شاهیدە؛ چونکە لەپاش کەیقوباد و فەرهاد و کەیقوبادی دووەم دانیشتە سەر تەخت لە ١٢٧٨پ. هـ لە ١٢٥٦دا لە واقیعەی «ڕاغاو»دا بەدەست

ئاشوورانەوە دەکوژرێت؛ کەیکاوس دەبێتە پادشا. لە عەهدی کەیکاوسدا (٦٣٤ ق.م) تایفەیەک لە تورکی سیبەریا کە بەئەسکیت مەشهوورن و شەڕ و هجوومیان لە هەموو عولەمایەک مەعلوومە کە بە چە تەوەحوشێک دەستیان بەکوشتار و تالان کرد؛ بەبێ چەک دەستیان بەژن و منداڵ کوشتن کرد. تەواوی ئاسیایان خستە بەرپێوە، ئەوە مەعلوومە کە کەیانی کورد بوون. تورک لەو عەسرە موتەوەحیش بوون و شەڕ و کوشتاریان دەلیلە کە ئەو زەمانەش وەکو ئێستا عادەتیان بەزوڵم و بەربەری بوو، تا کەیکاوس لە ٦٣٢ ق.م دا بەتەدبیر کوشتنی ئەو تەبەقەیە بێ شوبهە و شەک کوردن و حوکمداری کوردانی و ئەسلیان لە کوێستانی شارەزوور دەرکەوتووە. قەبرستانیان لە بێستوون بوونی کە ناوەکی کوردستان بووە، ئەوە دوور و درێژ ئاگادارێمان دەداتێ. چونکە ناتوانین بڵێین ئەو جێگایانە تورکی تێدابووە وە یاخود ئەو زەمانە تورک ئەوەندە بەتەمەددون بووە، تەشکیلاتی سەڵتەنەت بکا. ئەگەر هاتبێت و لە کێوانی سێبیریا دەریشکەوتبن لە برسان و بێ زادی هاتوون و بە رەوشتێکی موتەوەحیشانە هێندێک تالان و کوشتاریان کردووە و گەڕاونەوە.

لەپاش کەیکاوس «ئیستایک» بۆتە پادشاه. لەپاش ئەو کەیخوسرەوی کوڕی مەندانەی کوڕی کەیکاوسی دوو بەکەیکاوسی دووەم کوڕی فەرهادە. مەندانەی کچی ئیستایک بوو و دایە کەیکاوس. حیکایەتی ئەو زاتە دوورە و بەتەواوی لە جلدی یەکەمی «گەوهەر»دا بەحس دەکرێت. (موراجەعە بفەرموون: کەیخوسرەو - کۆرۆش) ئیمپراتۆری شاهەنشاهییەکی گەورەی تەئسیس کرد و لەشەڕ و کوشتاری گورجستاندا دەکوژرێت. کەیکاوسی دووەم (کەمبیز) دەبێتە پادشا. ئەویش لەپاش سەفەری میسر لەبەر دەرکەوتنی کۆمانیس نێوێک گەڕاوە بۆ کوردستان. لە بادیەی شامدا لە ئەسپ دەکەوێت و دەمرێت. دارا (کشتاسپ) لەسەر تەخت دادەنیشێ. ئەو زاتە لە ئینتیهای هیندەوە تا ئاخری زەنگستان و تا دوایی ڕۆم دەخاتە ژێر دەستییەوە، هەر بەوجۆرە ئەو حکوومەتە دەوام دەکا تا زەمانی «دارای سێیەم کۆدومان» لە ساڵی ٣٣٠ ق.م دا بەشەڕ کردنی لەگەڵ ئەسکەندەری مەکدونیایەوە ئینقرازیان پێدرا و کوردستان پارچەپارچە کرا. ئەمما حوکمداری کوردان لە حاڵێکی نیو ئیداریدا ماوە. ئەشکانیان بەسەرداهاتن دیسان چەند پارچە حکوومەتی چکۆلەی کوردستان ئیدارە دەکرا تا دەرکەوتنی ئەردەشێری بابەکی ئەردەوانی کوڕی تیردادی ئەشکانی. ئەوە بوو بەسەبەبی ژیانەوەی کوردستان و دەستی بەشاهنشاهییێکی لە ئەوەڵ چاترکرد و ئەحواڵیان بۆ کورد بوونیان کە هیچ شوبهە نەبێ و دەرکەوتنی لە شارەزوور و جیلوانە. وە «ابن الاثیر» لە جلدی یەکەمیدا موفەسەل بەحسی

دەکا. کاغەزی ئەردەوان لێمان مەعلوم دەکا کە خیتابەن دەڵێت: ئەی کوردی کوڕی کورد، ئەوەش شاهیدە کە عائیلەی ساسانییان کوردن؛ لاکین هەروەکو بێژرا عولەمای کوردستان هەموو ئەحواڵی میللەتیان کردە فیدای غەفڵەت و هەڵخەڵەتاندنیان بەدوشمن. خولاسە ئەو عائیلەیە تا زەمانی حەزرەتی عومەر حوکمداریان کرد و دەستی زۆرییان بەسەر شەرق و غەربدا داگرتبوو. لە زەمانی حەزرەتی عومەردا بە«یەزدی کورد» ئینقرازی کرد. ئەحواڵیان دوور و درێژ لە جلدی یەکەمی «گەوهەر»دا و نێوی حوکمداران و عەکسیان بەیان دەکرێت. کە تەماشا دەکرێت لەپاش دەرکەوتنی ئیسلام ئەو زاتانەی بێژرا و لە دەستی دوژمندا بەغەیری کورد حیساب کراون. چونکە تەئریخی کوردان لە خیلافەتی حەزرەتی عومەردا وەخرکران و خرانە دیجلەوە و ئیرتیباتی دینی بوو بەسەبەبی کەمکردنی تەئریخی کوردستان. مەسەلەن زاتێکی وەکو نادر شای هەوشاری کە لە ساڵی ۱۰۹۹ لە هەوشار هاتۆتە دونیاوەو هەوشاریش جێگەیەکە لە قیتعەی موکریان و لە ۱۱٤۰ تا ۱۱٦۳ هەر حوکمداری کردووە لە ئێران و هیندستان و لە تەرەف ئەوروپاوە بەناپلیۆنی شەرق ئیشتهاری کردووە موئەریخانی تورک بەخەڵقی بوخارای دادەنێن. چاکە ئەوەبوو بەئەهلی بوخارا، لاکین ئیسمی هەوشار چ لێدەکەن؟ ئەوە چۆن ئینکار دەکرێت هەرچەندە ئەوانیش ئینکاری بکەن، لاکین تەئریخ ئیسپاتی دەکا و بۆمان بەیان دەکا کە ئەو زاتانە بێ شوبهە کوردن هەروەکو لە زبان و عاداتی میللەتدا بەخێوکراوە و تەئریخیش حیفزی کردوون.

کەریم خانی زەند پیاوێک بوو لە عەشیرەتی زەند و پایە لە ساڵی ۱۱٦۳ەوە تا ۱۲۱۰ پادشایەتی کرد، ئەویش بەدەست ئاغا محەمەدی قاجاڕی کە یەکێک بوو لە ئومەرایانی، ئینقراز دەکا، وەکو باپیرە گەورەی ئەم پادشای ئێران بووە کە ئێستا ئەحمەد شایە.

ئەحواڵیان بەتەواوی لە گەوهەری یەگانەدا دەبێژرێت. خولاسە حیکایەت و سەرگوزشتەگەلی میللەت بەتەواوی دەست بەدەست و زبان گرتەوە و لە دائیرەیەکی زۆر چاکدا هاتووە و زەوتیان کردووە کە ئەو زاتانە کورد و پادشا و حوکمدارانی کوردستان بوون و بەعزێک ئیستیلاشیان بەسەر غەیردا کردووە. لاکین لە تەرەف عولەماوە کەوتۆتە ژێر پەردەی جەهلەوە، لەبەر ئیشتغالیان بەعیلمی عەرەبی و تەعەسووبی وشک، نەیان پەرژاوەتە سەر تەئلیفاتی تەئریخ بەکوردی و دەڵێن «انا لله وانا الیه راجعون».

## ئیلم و زانینی کوردان

کورد ئەوەندە ئیعتیباریان بەکتێبی عیلم و سەنایع نەدابوو، لە ئوسووڵی شەڕ و زۆرانێ و تیرەندازیدا زیاتر سەعیان دەکرد، وەکوبازی و سواری و گۆ وچەوگان و تیر و شیر و مەتاڵبازی و پێشکەوتن بەسواری و مەیدانداری و ڕاوکردن، لە مەداریسانداا ئەغلەبی تەحسیلاتی خسووسیان ئەو نەوعە زانینە بووە، ئەمما لە هەیئەتی ئیجتماعیدا زۆر بەهیمەت بوون و دایمە بەمەشوەرەت و یەک دڵی و تەدبیر، کار و حەرەکەیان دەکرد و بێ ئاگاداری یەک دەستیان بۆ هیچ کارێک نەدەبرد، هەر کارێکی موهیم ڕوویدابا پێکەوە وەخڕ دەبوون بۆ ئەو مەسئەلەیە فیکریان دەکرد و لێک غافل نەبوون.

**ئەقسامی شوعبەی کورد:**

«هیرۆدۆت» دەبێژێت: چوار قسمیان بۆ شەڕ و موحارەبە و سێ قسمیان بۆ جووت و چاندن بەدە قسمیان دادەنێ، زاهیر سێ قسمیش ساحێب موڵک و جووت بەندە بوون و لەسەر وەجهی ئاتی نە گەورە بوون و نە ساحێب ڕوتبە و ڕەئیس بوون، لەگەڵ ئەوەش لەسەر ئوممەتی غەیرە و بێگانە مەرزەبانی سپەپیدەیان دەکرد. قسمی ئەعزەمی کوردانی مەزکوور گەورەی لەشکر و سوپاه، لە ژێر ئەمری خۆیاندا بوون.

**عاداتی کوردان:** لە ئەوەڵی ئەمردا عیفەتی نەفسیان پەیدا کردبوو. تەعدیلی لیباس و مەعیشەتیان کردبووە عادەت، لە لەزەت و هەوا و هەوەس و شەهوات و نەفسانی و مەستی و نەزاکەت وتەن پەروەرییان دەست هەڵگر تەبوو، حەتا لە دواییانەوە لە نان و تەعام و خواردندا بەتەواوی ئیقتسادیان کردبوو، لاکین وەقتێک لە هەموو شەعبانی ئاسیا دەوڵەمەندتر بوون و بەسەریاندا قووەتیان زیاتر بوو، تەماشایان کرد بەشەوکەتتر و زیاتر زەبر دەست بوون و چاترین دنیایان بۆ هاتووە و تەواوی عالەمیان کەوتۆتە ژێر دەست و حوکمەوە. تەغییری عادات و تەبایعی مەمدوحەیان بەفەسادی کرد و دەستیان بەتەلەزوزات و مەستی کرد و هەموو ئەخلاقی مەرزبەیان بەردا.

دەڵێن: لە جەژنی «میهریجان»دا ئەوەندەیان شەراب دەخواردەوە تا عەقڵیان لەسەر دەردەچوو. ئەگەر تەدبیرێکیان لە ئەمرێکی موهیمدا لە واقیع بوایە، چەند ڕۆژێک لە پێشدا مەسڵەحەتیان دەکرد؛ یەعنی لە پێش جەژندا. چونکە زیمامی ڕشتەیان لە دەستدا نەدەما. هێندێک لە موئەریخان دەفەرموون لە مەجلیسی تەدبیریشدا شەرابیان دەخواردەوە. لە پاشان شئوونی ڕەعیەت بەتەواوی گەییبە بلووغ. لەهەر جێگایەک ساحێب

ڕوتبەیەکی حکوومەت یاخود ساحێب مەنسەبێک یا مەرزەبان وە یاخود سپەهبودێکی سپایان بدیبایە تەلعین و نەفیریان دەکردن و بەتف لەنێوچاویان دەکوتان. وەکو زابتانی ئێستای کوردان.

هێندێک لەو ساحێب مەرتەبە و مەنسەبانە قبوولّیان دەکرد و خۆیان بەموستەحەقی لۆمە دەکرد و ئەو ئیستبداد و زولّمەیان لە سستی و بێ ئیعتباری و نەکۆشینی خۆیان دەزانی.

حوکمدار لەسەر هەموویانی واجب کردبوو، ڕەعیەت و ساحێب ڕوتبە سەجدەیان بۆ حوکمدار دەبرد و بەعزێک لە هۆشمەندان ئەو ئیستبدادەیان قبوول نەکردبوو. هەروەکو ئەمڕۆ کە عەجەم لە سەلامدا رکووع دەبەنە بەر گەورە و نیوە سوجدەیەکیان بۆ دەبەن. ئەو ئیستبدادە تا ئەمڕۆش لە کوردستاندا ماوە. ڕەعیەت بۆ ئاغا و میران و مورید بۆ شێخیان بەتەواوی ڕەسمی تەعزیمیان لە حزووردا نیمچە سەجدەییێکە. ئەوانیش وایان خستۆتە ئیعتقادی ئەو فەقیرانەوە، ئەگەر وانەکەن کافر دەبن یاخود زۆر بێ ئەدەبی دەکەن.

## ژن هێنان

کورد بۆ ژن هێنان زۆر حەریس بوون؛ ژنی زۆریان دەهێنا، زۆریان جاریە و کەنیزەکیان بەقەدەری ئیمکان هێناوە. «ژن» موتیعی ئەمری پیاو بوون، بەهیچ وەجه موخالەفەی پیاویان نەدەکرد و دەرکەوتنیان لە ماڵ مەمنووع بووە. ئەگەر دەریش کەوتبان لە ژێر بەخێوکردندا و بەرچاوی بەداپۆشراوی و چارشێو و ڕووبەندیانەوە دەگەڕان، ئەگەر بچووبانە ماڵی کەسوکاریان یا برای گەورە یا مێردی ئەو ژنە لەگەڵیان دەچوون و دەیان هێناوە. وە ئەگەر بۆ جێگایەکی وەکو باخچە و بێستان و تەماشاگا بچووبایە دیسان هەر بەبەخێوکراوی دەچوون و دەهاتنەوە و کەسێک نەیدەدی. ئەغلەب ژنیان لە لیباسی پیاوانیشدا ئیشتراکی شەڕیان کردووە و زۆر حوکمداریان لێ پەیدابووە. بۆ میهمانداری و کارکردن لە ماڵاندا، ئەغلەب وەزیفەی پیاویان دەبینی و زۆر ژنی مەشهوور و شەڕکەر و ساحێب قوەت و ڕەشیدیان لە عەسری ئەوەڵ و دواییشدا لێ دەرکەوتووە، کە ئەحواڵی ئەوان لە بەندی سەڵتەنەت و ئەمارەتی مەشهووراندا بەتەفسیل دەبێژرێت ئەگەر خودا حەزبکا.

**تەربیەی منداڵیان**: لە بەخێوکردنی ئەولاد و منداڵ و ژندا زۆریان ئەهەمیەت پێدابوو و لەسەر ڕەوشتێکیان تەربیە دەدا. منداڵ تا (پێنج)ساڵەیی ئەدەبی ژنیان دەدانێ، لە

مـاڵدا کـارکـردن و ژیانی فـێـر دەکـرا. لە پێنج تـەجـاوزی بکردبا و ژیانی مـاڵداری بزانیـبا ئەوجارە دەیان خستە بەر موعەلیم. لە قوتابخانەدا عەقڵ و تێگەیشتن و چاکە و پیاوەتی و تەهزیبی ئەخـلاق و لەعب و بـازی و شکار و سـواری و تیـر و مـەتەڵبـازی فـێـردەکـرا. هەروەکـو بێـژرا لە عـیلم و زانیـندا منداڵێک بەپەنج سـاڵی دەگـەیشتن، سـوپاهی بوون. بەجـۆرێک ئەدەب و تەربیـە دەدران شـایانـی مـەدح و تەعـریف بوون. هەر لە چکۆلەییـیـەوە سیـدق و ڕاستگۆییـیـان فـێـر دەکرد و موراعـاتـی پیاوی ڕاسـتـییـان نیـشـان دەدا و درۆ و دەلەسـەیان زۆر لە لا عـەیب بوو و بەگـوناهێکی گـەورەیان دەزانـی. گـەورە و ئومـەرایان ئیـفـتـخـاریان بەمـە دەکـرد کـە نەدەفـرۆشن و نەدەکـڕن بەمـەنفـەعـەتی مـوڵکیـان دەژیان، هەرچییەکی لێیان زیاد دەبوو، دەیاندا بەفەقـیر و مسکێنان، هەروەکـو ئەمڕۆژ ئەو عـادەتە لە نێوانیاندا لانەچووە. حەتا مونەوەر و ئومەرای کوردستان هەرچەندە ساحێب ئیقتداریش بووبن، لەبەرئەوە کـە نەکـەونە ژێر منەتەوە و بەسـەربەسـتـی بژیـن، لە دەوائیـری هیـچ حکوومـەتێکدا مـەئمـووریان قـبـووڵ نەکـردووە. شـەرەفـخـانی بتلیسی لە تەئریخـەکـەیدا دەبێژێ: لە هیچ وەختێکدا پشـتیـان بۆ دوو نان خوار نەکردووە. سەبەبی ژیانیان لە کێوان و قـەڵایانی سـەختـدا ئەوەیە کە نەکەونە ژێر تـەحـەکوم و منەتی ئەغـیـارەوە. دیسـان دەڵێ: پادشـا یانێ کە لە ئەرازییـان نزیکبوون حەزیان کردووە بیـانکەنە سپـەهبـد و مـەرزەبان لە ئۆردوویاندا لەبەر «ڕاسـتـیـیـان و ڕەشیـدی و بەمروەتیـیان». ئەو میـللەتە پاکە ئەگـەر لەگەڵ هەر کەسێک شـەڕیان کردبێ شیریان زەهربووە، ئەو کەسانە بەنەدامەت گەیشـتوون و ئەگەر ڕووی ڕاستیان لەهەر میللەتێک کردبێ ئەو میللەتە بەمەقسوود و مەرامی گەیشتووە.

## خوو و تەبیعەت

کوردان تا زەمانی کەیکاوس لە تەبیعەتێکی غایەت سادە و بەسیـتدا دەژیان. کورد خۆیان لە ئەقـوامی سایرە بەقـوەتتـر دەزانی، لە پاشـان لەگەڵ میللەتی موختـەلیـفە ئیـختـیلاتیـان نوواند؛ چاک و پیسیان جوێ کردەوە. ئەخلاقی فـاسیـدە و حەسـەنەیان لەو میللەتانەدا دەدیی و دەیان خسـتـە میزانی عەقڵـەوە. عـادات و مـەدەنییـەت و قـەواعـیدیان دەبژارد، هەرچی کە چابوو قبووڵیان دەکرد. ئوسووڵی ئیدارە لە کوردستاندا تەرەقییەکی زۆر چاکی هەبوو، لاکین تەواوی فـیکر نەهاتبووە کـارەوە حەتا لەوازم و ژیانی دەردوەیان بەئەهەمیەت نەزانی بوو؛ مـەسـەلەن تـا ئینقـرازی حکوومـەتیـان، وەزیفـەی تەبابەتیـان لە دەست یۆناندا بوو. غـەیرەز «جاماسب حەکیم» پیـاوێکیـان نەهێنا بووە وجوود. دیسـان بۆ کـەشتیـوانی و نەکاری و هێندێک لە مەعلووماتی فەنییەدا ئەجنەبییان بەخێو دەکرد. لە «میـسـر» و

«ڕۆم»ەوەیان پیاو دێنا بۆ ئەو جۆرە کارانەیان بەکار دەبرد. ئەیالەتی کەلدانیان ولاتێک بوو لە کوردستان دەچوون ئیقتباسی لازمیان لە دوشمن دەکرد. لەبەر ئەو جۆرە حەرەکاتانە و بێ تەدبیر و وەتەنپەروەری و بێ ئیهتمامی هەمیشە حکوومەتیان لە شۆڕش و هەڵلاهەڵلا دابوو.

کوردستان زۆر ئەهەمییەتی بەسیحرباز دەدا. سیحرباز لە ئیدارەی حکوومەتدا نفووزی تەواوی هەبوو، لە مەراسیم و تەوەجوهاتی خسووسیدا، ئەوان ئیفایی ئەمریان دەکرد. زەبتی تەقویم و دەقایقی حکوومەتیان گرتبووە دەست. ئەوانە هەر شتێکی موناسەباتی عیلمی تێدا لزوم بدیترابایە، ئیستخدامیان دەکرد و بۆ تەرەقی و بڵندی دەکۆشان. چاترینی هەموو ئەشیای جیهان کەوتبووە دەست کوردان. «کوردەواری» لە هەموو خسووسێکەوە حوڕ و سەربەست دەژیان، هەروەکو حسیاتی میللیان نەبوو و بۆ ژیانی بەشەریەتیش غایە و ئامالێکی بەتەواوی تەشکیلی تەمەددون بکا و یاخود بۆ دواییان. دەسایسێک دانانیان لێی ئومێد نەکراوە. لە وەقتی دەست درێژیاندا ئەساسێکی بۆ ئەولادیان سەمەرە بەخش بێ، تەشەبوساتیان نەبووە و نەکەوتۆتە فیکریانەوە، نەیانزانی لەپاش ڕووناکی تاریکی و لە دوای خوڕسەندی کەدەرە. کورد خواردن و کارنەکردن و لەبەرکردنیان کردە عادەت، ئاسوودەییان لەلا موبارەکێکی گەورە بوو. جووت و دروێنە و کێڵانیان لە عوهدە گرتبوو، مایل بەتەرەقی و تەشکیلاتی حکوومەت نەبوون، لە دەوائیریان و سوپاهیاندا ئەجنەبی ئیستخدام دەکران و ڕەعیەت لەبەر شیددەتی حوکمداریان قەوانین و نیزاماتی حکوومەتیان بەتەواوی لەبیر کردبوو. کورد بۆ سەروەت و تیجارەت موتەرەقی بوون، زوڵم و جەورێکی لە خاریجەوە کرابا، کورد لەوانە ئەمنیەتیان حاسڵ کردبوو و وەحشەتی ئیستبدادیان لەنێو دانەبوو، هەرچەندە لە خزمەتی میللەتی خۆیاندا بۆ موستەقبەل قسوریشیان کردبێ و بینایەکی ئەستووری چاکیان بۆ کوردستان دانەنابێ، ئەمما بەتەنها بۆ تەئسیساتی نیزاماتی مەدەنییەت خزمەتێکی زۆر چاکیان هەبوو، لەنێو ئەزهەنەی پێشوودا و مونەوەرانی ئەقوامی موتەمەددینانی قەدیمدا تەنهایی و یەکتایی پەیدا کردبوو، لە سایەی مەزهەب و ئاینی زەردەشت و فەزڵ و کەماڵ و ئەحکام و دەستووری ئەو زاتە، موسڵێحەوە کورد بەمووددەی چەند عەسرێکە سەڵتەنەت وەهەموو قەبایل و تایفەی ئاسیای هێنابووە دەست. لە شەڕقدا بەیەک دڵی دەوڵەتێکی زۆر گەورە و چاکیان خستبووە وجوود. سەلامەتپەروەری و حوڕیەت و شەجاعەت و سەربەستی و دادخواهییان لەنێو ئەقوامی ئاسیادا ئاشکار کردبوو.

## دینی کوردان

دینی کورد: قەدیم زۆر لە پێشوودا بەئیسمی «مەهئاباد» شەخسێک ئیددیعای پێغەمبەری کرد و تەمەددونێکی دینی و مەزهەبی لەنێو کوردستاندا بینا کرد. لە نەزەریاتی عولەمایاندا ئەو زاتە «ونەوە» و «نەبیرە»ی، ئەویش لە پێش پێشدادییاندا تەشکیلی حوکمدارییان کردبوو.

غەیری ئەویش زۆر کەس ئیددیعای ناردراویان کردبوو. بەئیددیعا بەماڵی کورد و ئێران، وەکو باقی ئەقوامی ئاری عیبادەتی ئەجرامی سەماویان کردووە. عەلەلخسووس «ڕۆژ» و «مانگ» و «ئەستێرە» پەرستنیان بووە (مە) پەرستن. لەزاتی مەزکوورەوە تەئسیس کرا، ئەسڵی مەعنای «مە» گەورە ئیسمێ بوو، ئەوەڵ بانێتی شاهیدە، لەپاش ئەو زاتە مانگ بە«مەم» تەسمیە کراوە. «ڕۆژپەرستن» لەپێش ئەودا زهووری کرد، چونکە «جەم» بەمەعنا ئەرکانی دین «شید» پەرسندە. مەعبوود ئەرکان ئەمی «خورشید» ئەو زاتە خورشید پەرستنی خستە مەیدان و مەی و جامی ئیجاد کرد و کردیە ڕوکن بۆ ئاین و «نەورۆز»ی کردە جەژنی دینی. زاهیرەن ئەو وەختە بۆ هەموو ئەستێرەیەک هێلکەیەکیان دروست کرد بوو لە هەموو چیاییێکدا دایان نابوو. لە ئەغلەب ماڵ و سەرایاندا مەوجوود بوون. لەبەرئەوە لە عیلمی فەلەکدا زۆر مەهارەتیان حاسڵ کردبوو، تەرەقییان لە مونەجیمیدا گەیی بووە دەرەجەی نیهایەت. لە مەسەلەی حەزرەتی ئیبراهیم (ع)دا لێمان مەعلووم دەبێ خودای تەعالا حەزرەتی ئیبراهمی لەسەر ئوسووڵی ئایینی کوردان فێرکرد بوو، بەڵکە بۆ ئیلزامیان ئەوەڵ حەقناسینی لە ئەستێرە و مانگ و ڕۆژەوە نیشانی دان، ئەویش بەنەسسی قورئانی مەسبووتە و شکی تێدا نییە و ئیزهاری ئەمە دەکا کە «کورد» ئەستێرە و مانگ و ڕۆژپەرستییان دەکرد و بوتیان بۆ ئەو ئەجرامانە دروست کردبوو بۆ بەتەقالید. حەزرەتی ئیبراهیم کە لە پاش ئەوە دەبێژرێت ئەوە خودامە، ئەستێرە ئاوابوو مانگ دەرکەوت، دەڵێت ئەمەیە خودا. کە مانگیش ئاوا دەبێ ڕۆژ دەردەکەوێت دەڵێ: ئەمەیە خودام چونکە لە هەمووان گەورەترە. کە ئەویش ئاوابوو فەرموی «انی وجهت وجهی» ئەی قەوم! من لە شیرک دوورکەوتمەوە و ئەوە ڕووی خۆم کردە خودایەکی کە ئەرز و ئاسمانی ئافەریدە کردووە.

دووەم کە بوتەکان دەشکێنێ ئیسپاتە و کە بەباوکی دەڵێت تۆ ئەسنامت بەخودا قبووڵ کرد، تەماشا دەکەم تۆش و قەومەکەت لە زەلالەتێکی ئاشکاردان، ئیسپاتی بوتپەرستی

کوردانه. له وهختێکی که دهفهرموون: من نهمشکان له ههمووان گهورهتر شکاندنی، ئیسپاته بۆ ئهوه بوتانی موتهعهدیدیان ههبووه. ڕیوایهتی قازی بهیزاوی له عهبدوڵلای ئیبنی عومهرهوه: ئهو کهسهی ئیشاردتی بهسووتاندن کرد گوتی: بیسووتێنن و نهسرهتی خوداکانتان بدهن، پیاوێک بوو کورد و نێوی «هیزن» بوو، مهعلووم دهبێ و شاهیدێکی لهوه چاتر نییه که قورئان ئیسپاتی ئهوه دهکا. حهزرهتی ئیبراهیم کورد و نهمروود وازهرایی کورد بوون. تهفسیر بهحسی دهکا و زۆر له عولهما و موئهریخان موباحهسهی رابردوو ئیسپات دهکهن. ساحیبی «برهان قاطع» دهڵێت: حهزرهتی ئیبراهیم ئیسمی ئهسڵی «زهردهشت»ه. ئیبراهیم لهفزێکی سریانییه یهعنی: ئهبرههم (أب رحيم). لهپاش هیجرهتیان له دهست بیوراسپ ههروهکو له دهنگه دهنگی میللیهتدا بهدرێژی بێژرا سریانیان نێویان نا «باوکی بهمیهرهبان». خولاسه حهزرهتی ئیراهیم دینی سابیئهی له کوردستاندا نهشرکرد. له ئهوهڵیشدا خودایان ناسی بوو، لاکین له هاتوودا ئهحواڵیان دهبێژین. ئهغڵهبی موئهریخان لهسهر ئهوهن حهزرهتی ئیبراهیم له عههدی بیوراسپدا هاتۆته وجوود. ههرچێکو بیوراسپ موئهسیسی ئاینی «مارپهرستی» بوو. له زهمانی ئهودا «مار و گهنم»یان دهپهرست. له بهعزێ ئاساردا کهشف کراوه «مهطران یوسف دبس» له تهئریخی سووریادا و له جلدی ئهوهڵ ئهو بهحسه بهتهفسیل دهگێڕێتهوه. ئیسمی بیوراسپ بۆ ئهوه شاهده؛ یهعنی ماری گهزهنده. (چونکه له دهنگهدهنگدا بهحس کرا لازم بهشهرح نییه، موراجهعهت کهن).

کورد له پێش دهرکهوتنیان له وهتهنی ئهسڵی، ئهو ئاشووبی دیانهته و تهفریقهی مهزاهیب و ئیعتقادیان تێکهوتبوو؛ چونکه له جێگای خۆیاندا کتێبی زهند ئاوێستایان کهوتبووه ناو، لهپاش بهسهردادانی زوحاک له زوڵم و تهعهددا، ئهوه دهستیان بههیجرهت کرد. حهزرهتی ئیبراهیم له وهتهنیاندا تهڵقینی دیانهتی خۆی کردبوون، له پاشان هاتنه جیبال و کێوانی ههورامان و شارهزوور و ئورفه و دیاربهکر و مهعموورهلعهزیز.

بینا لهسهر ئهقوالی موئهریخان له ئێراندا «زهردهشت» دانهری قانوون یا پێغهمبهرێکی ناردراو دهژمێررێت. دهڵێن له عههدی جهمشیددا ههبووه و له سهر ڕووی دنیابوو. زهردهشت له ئازهربایجاندا له شاری «ورمێ» له دایک بووه و لهگهڵ هورمز یهزدان یهکدییان چاوپێکهوت و مولاقاتیان کرد. له هورمز کتێبی موقهددهسی «زهند ئاویستا»ی که وهرگرت، زهردهشت له ورمێ ههڵات و هێندێک ئهشخاسی لهگهڵ چوو، بهسهر ئاوی چۆمی «ئاراز» (ئهرقس) و بهحری خهزهردا رابهورتن. گهلێک پیاوان وهدوویان کهوتبوون

و حەملەیان دەبڕین. مولاحەزەی وەزعییەتیان کردبوون و بەسەر ئاواندا دەرباز دەبوو و دەچوو. زەردەشت زۆر ساڵان بەتەنها لە کێوانی چۆڵدا بەحاڵی موستەغریقدا بەسەری بردبوو. لە ئاقیبەتی ئەمردا لە کێوی ئەترافی ورمێ کە [مرکورنو چیا کورنو چیا] بێ هاتەخوارێ، ڕووی لە بەڵخ کرد و کتێبی زەند ئاوێستای تەقدیم بەخەڵق کرد و ئەمر و نەواهی فێرکردن و دەستی بەتەبلیغاتی دینی دەکا. گوشتاسپی حوکمداری بەلخ تەڵەبی موعجیزاتی لێ دەکا و ئیسپاتی پێغەمبەری لێخواست. دەچێ لەنێو لۆکەدا پارچە ئاوری بۆ دەبات، نەلۆکە و نەدەستی کەسی دەسووتاند. گوشتاسپ موعجیزەی دیکەی لێ داواکرد. زەردەشت هەندێکی کتێبەکەی بۆ خوێندەوە، گوشتاسپ ئیمانی پێ هێنا و عولەمای بەڵخ رجایان کرد پادشا ئەزیەتی نەدا گوشتاسپ بەهەموو رەزایەک ئاینی قبووڵ کرد و «زەند ئاوێستا»ی لەسەر پێستی ١٢ هەزار گامێش بەزێڕ نووسییەوە و بەنەقشونیگار جوان کرا. زەردەشت بۆ موەفەقیەتی نفووزێکی تەواوی پەیداکرد و هەموو کەس باوەڕی پێ کردو لەلای هەمووان ئاینی قبووڵ کرا. ئەو موەفەقیەتە بوو بەسەبەبی پەیدابوونی دوشمنان و قووەی ناتیقەی موعارەزەی کرد، زانین و مەعلوومات هەم دوشمن و هەم دڵی عالەمی تەسخیرکرد.

(ئەمەی ئاتی سەحیفەیەکە لە کتێبی زەند ئاوێستا)

زهووری ئەو دینە بووە سەبەبی موحارەباتی دینی و جیدال. ئەو دینە بوو بەغەلەبەی گوشتاسپ لەسەر تەواوی جیهان بەقووەت شەڕی خستە نێوەڕاستی هیند و ئاسیاوە.

لە هێندێک ئاساردا نەقڵ کراوە، سەحیفەی سەرەوە کە دینی کوردان وەکو دینی زەردەشت بووە مەهتەر و چەهتەری ئەدیانێک بوو، بەشەر قبوولی کردبوو و نزیکتری عەقڵ و عەدالەت و ئینساف بوو. ئوسوولی ئەو دینە قبوولکردنی مادە بکەن، یەعنی قبوولی شتێکی مادی کە خودا لەو مادەیەدا مەوجوود بوو. خودا زاتێکە لەو دایە. لەبەرئەوەی لەنێو موئەریخاندا و لە ئیستیلاحی عولەمایاندا بەکوردی قەدیم «مەدیا» دەبێژرێت؛ چونکە بۆ خودا شتێکی مادییان قبووڵ کرد، ئەو دینەش لە پێش هیجرەتیاندا داندرا بوو، بینایان نابوو. زەردەشت ئەو دینەی ئیسلاح کرد و کتێبی زەند ئاویستای بۆ ئیسلاحاتی ئەو دینە قەرار دابوو. لە کتێبی ئەو زاتە عەزیمە و موسلیحە گەورە و ئوستادە فەزیلەدا دەبێژرێت: هەرچێکو «مەعبوود» واجبە و دەبێ موجەڕڕەد بێ لە مادە و لەسەر مادان تەسەلوتی هەبێ، ئەو مەعبوودە نەوعی بەشەری بەڕوحێکی سالح ئافەرید و هەموو شتێک تەمەتوع لەو دەکا. ئەو مەعبودەشیان بە«هورمز» (یەزدان) ناوبرد. هەموو سیفاتێکی چاکی بۆ ئیسپات کرد، لەشکر و سوپاهی لە ئەڕواحی سالحی ئەوەوە بۆ قەراردا وەکو مەلائیکە بن و خدمەتی دەکەن. «قاعیدەی کتێبی زەردەشت» دەبێ ئینسان لە بەرابەری ڕۆحی سالحدا لە دائیرەی قانوونی عەدالەتدا، بەبێ زەرەریی بژیت. بەهەموو ئیسلاحێکەوە تا ڕۆژی مردن بەسەری ببا. «موکافەئات» لە مقابیلی عەمەلی خێر و شەڕدا، بەم نەوعە تەسەوری پێدەدا: هەرکەس لەنێو خۆڵدا گەنم هەڵگرێت لەو دنیا و زەویدا غونچەی ئەو گوڵ و مێوە پێبگەبەنێت، ئەو کەسە لە دنیادا نەشری خێر و فەزیلەت دەکا، هەروەکو سەد قوربانی سەر ببڕێت. ئەو کەسە شەرەف و حەیسیەتی ئاینی «هورمز» تەواوی زیاد دەکا. لە پاش مردنیش ئەحواڵی روح بەم سوورەتە حەڵ دەکا «مەلائیکە» فریشتەی «ڕاشنۆ» ئیسمێک ئەفعال و ئەعمالی چاکە و حەسەنە و پیسی ئینسان بەبێ خەتا و سەهوو بەتەرازووی عەدالەت دەکێشێت، ئەویش بەشاهیدی ئەعمالی وەختی ژیان و ئەفعالی حەیاتی و چاوپێکەوتنی ئەو ڕوحە موحاکەمە دەکرێت. تەواوی ئەحواڵی دێتە حیسابەوە، ئەویش یا تەبریئە دەکرێت یاخود مەحکووم دەبێ. روحێکی لە مەحکەمە دەرکەوێت دەیبەنە مەدخەلی ڕێگایەکی بۆ سەر پردی «سنوا» ڕاکێشراوە بۆ بەهەشت. ئەگەر ناپاک بێ لە پرد ڕانابرێت و دەکەوێتە ئاورەوە، ئەگەر پاک بێ بەموعاوەنەتی فریشتەی «سەرئوشا» نێو، بەبێ زەحمەتی لە پردی «سنوا» دەپەڕێتەوە و دەچێتە

بەهەشتەوە. ئەو زەمانە بەحزووری مەعبوود (هورمز) دەگا. هەرچێکو «حەشر»ە تا مەوقیعێکە مردوو ئیشغاڵی دەکەن و لێیان دەپرسن: کتێبی زەند ئاوێستا مەبنی بوو لەسەر ئەمر و نەواهی و وەعد و وەعید و ئەحواڵی مازی و موستەقبەلی تێدا نووسرابوو. ئەم دینە لە زەمان سواری ئێوەدا لغاو ناکرێت، ئەگەر عالەمی بنوێش کا لاکین ئەمانەشتان لە خۆتان بێ لە سواری وشتری سووری چاوڕەش چونکە ئاینی ئێوە مەحوو دەکا. زەردەشت سەر دەفعە ژنی هێنابوو، ئەولاد و ئەحفاد و زێتن زۆر بوگەلێکی؟ هێنابووە وجوود. لەپاش ٧٧ ساڵان ساڵی هجوومی تورک بۆ سەر کورد و ئیستبدادی بەڵخ دەکەن لە دەست تورکدا کوژرا. هێندێک دەڵێن: تا قەرنی هەشتەمی ق. م مابوو و لە زەمانی جەمشیددا مەوجوود بووە (العلم عنداللە) یەعنی زەردەشت بەتەعەهودی گوشتاسپ لەسەر ئەو عەقیدە باقی مابوون.

## پەیدابوونی ئاورپەرستی

لە ساڵی ٥٣٤ قەبلی عیسا عەلەیهیسلامدا «غۆماتیس» نێوێک زهووری کرد بەسمەردیسی برای کەیکاوسی دووەم (کەمبیز) خۆی تەسمیە کرد و ئیستیلای کردە سەر کوردستان و بەئیددیعای برایەتی کەیکاوس، ئەرزی کوردانی زەوت کرد و کەوتە نێو تەواوی حکوومەتەوە و تەداخولی بەحەرەمسەرای پادشایی کرد و هەموو ژنی کەمبیزی مارەکرد و خستیە دەستەوە ئاینی ئاورپەرستی ئیعلان کرد، لە ئازەربایجاندا بینای ئاتەشگەدەیێکی زۆر گەورەیان کردبوو، هەموو مەعبەدی زەردەشتیی وێران کرد و لە جێگایاندا ئاتەشگەدەیێکی بینانا و ئوسووڵی دیانەتی لێ گۆڕین. قاعیدەیەکی بۆ ئەو دینە مەجبووریە مەجووسیانەیان دانا کە «ئەهریمەن» مەعبوودی شەڕ و «هورمز» مەعبوودی خێرە. ئەو ڕۆحە شەڕیرە موقابیلی ڕوحی ساڵح دەکا و بەقووەت دێت و هەموو ئەحواڵی ساڵح بەفەساد دەدا. بۆ ڕۆحی ساڵحیش قووەتێک هەیە دەچێت ئەو ڕوحە شەڕیرە بکوژێت، تاقەت نایەنێت. بۆ شەڕیریش لەشکر هەیە لەگەڵ ڕوحی ساڵح شەڕ دەکەن. ڕوحی ساڵح لەو شەڕەدا زەرەر دێنێت؛ ئەگەر چی قووەتی ڕوحی ساڵح زۆرتریشە، لەگەڵ ئەوەش دەرەقەتی ناکرێت. لە پاش مردن، ڕوحی ساڵح پێشوازی ساڵحان دەکا. مەرحەبایی لێ دەکەن و دەیانبەنە شاری ئازادییەوە. هەرچێکو شەڕیرن فرێیان دەدەنە نێو چاڵاوی شەڕەوە و لە شاری شەڕاندا خواردنیان ژەهرە و ئاوی سوێر و تاڵە

«موغ، کاهێن»: فەسادی ئاینی زەردەشت لە موغ و کاهینانەوە هاتە پێشەوە. موغان

لەپاش زەردەشت ئاورپەرستی و ئەستێرە و ئەجرامی سەماوی پەرستیان تێکەڵ بەئەحکامی ئاین و مەزهەب و دیانەتی زەردەشتیی کرد. خورافات و ئەفسانەیەکی زۆریان لە ئەصڵی ئاین وەردا. ئەویش لە ئیبتیدای ئەمردا عولەما لەنێو کوردستاندا دەستیان بەتەداخولی ئاین و ئیجتیهاد لە ئوسووڵی دینیاندا کردبوو. بەدەسایسی «جوولەکان» ئەو فیتنەیی ئەفکارە لە کار دابوو و بۆیان دەکۆشان و کەوتبوونە نێو مێشکی موغانەوە. بۆ فەسادی ئاینی زەردەشت، موغ و عولەما تەسەلوتی مەعنەوییان لە کوردستان پەیداکرد و چووبوونە عەقڵی عالەمەوە. لەنێو ڕوحی کوردستاندا دەستی ئیستیلایان درێژ کردبوو. لە تەرەف میللەتەوە ئیحترامات و تەعزیمێکی لە حەدد بەدەریان بۆ دەکردن. مەحبووب و عەزیز و مەسموعولکەلام بوون. لەسەر حوکمداران، بەتەواوی ئەمر فەرما بوون و موبەشیریان دەکرد بۆ حوکمدار بەعەفوو. حوکمدار ئینکاری نەدەتوانی بکا پادشا جەسارەتی موخالیفەی ئەو موغانەی نەبوو. ئەو ئەشخاسانە دەستیان بەفەلسەفەی دینی کرد، پیسترینی عاداتی ئەو عولەمایانە ئەمەیە کە لەهەموو شتێک بیجاتر بوو، بۆ خودای مەستی، موسەکەراتیان دەبرد بەقوربانی. لە پاشان موغ شەرابی دەخواردەوە تا ویجدان و ڕەوشت و عەقڵی لە دەست دەردەچوو. خەڵقیشیان فێری ئەو عەقیدە فاسیدانە کرد و سوجدەیان بۆ ئاوڕش پێ دەبردن. خولاسە ئیعتیقادی کوردستانی قەدیم لەپێشوودا لە هەموو ئیعتیقادێکی ئۆمەمی سائێری شەرق چاتر بوو؛ چونکە بێ وەحی ئاسمانی تەشەبوسات وەحدانییەت خودایان کردبوو لە سێنەی ۵۲۱ق. م «دارای گەورە» هوجوومی کردە سەر «سمردیس» و کوشتی. ئەو عەقیدە فاسیدەی لە کوردستاندا پاک کردەوە. ئەمما بەدزی لە نیو هەندێکدا ئەسەری مابوو؛ دەیان شاردەوە. باقی بە تەواوی دینی زەردەشتیان قەبووڵ کردو دەستیان بە بینای دینی پێشووکرد. «دارا» هەموو موغ و کاهینانی «سمردیسی» کوشتن. عولەمای زەردەشتی خستە [سەر]و ئیعتیبارێکی تەواوی پێدان. «مەزدەک» تازەمانی «ئەنوشیروان» دینی زەردەشتی لەوجوددا بوو؛ لاکین ئاوریان بەخۆشەویست قبووڵ کردبوو وبە گەورەیان دەزانی نەبە مەعبوود بیناسن؛ یاخوود تەڵەبی خێر و یا شەرێکی لێبکەن.ئەمما زۆریان بەعەزیز و مەحبووب کەوتبووە بەرچاو؛ ئەویش لە تەئسیراتی سمردیس مابۆوە.

لە زمانی نەوشیروانی عادلدا «مەزدەک» نێوێک بانی و موسێسی دینی مەجووسی پەیدا بوو. دیسان کە عەقیدەی فاسیدەی سمردیس تازەکردەوە و خستیە مەیدانەوە.

«ئوسوولی ئیعتیقادی مەزدەک»: هەر چیکو شەیتانە، ڕۆحێکی شەریرە وتەواوی

َتوشش و مەقسەدی ئیفسادی ڕۆحی ساڵحە. هەر [چی] فیکری هەیە بۆ ئەو هەدەفە بەکاری دەبا، بە پەرستنی ڕۆژ و مانگ و فەرەجی ژن و ئاور و مردوو ئەمری پێدابوون. سوجدەیان دەبردەبەر «ئاور» و «نوور» و «هەوا» و «با»یان دەپەرست. بەئاوریان دەگوت: جەسەدێکی پاکە. ئەگەر لەلای قوربانی ئاوریان بگرتبایە نەیان دەکوژاندەوە و ئیعتقادیان بەهاتنەخوارەوە لە ئاسمانەوە دەکرد. ئەو ئیعتقادەیان بەنزولی دانابوو، تا زهووری ئیسلام دەوامی کرد؛ لاکین هێندێک لە کوردانی ئەترافی بەحری ورمێ لە عەسری چوارەمی پاش عیسا، بەواسیتەی یەکێک لە عولەمای کوردستان، «ئاس» نێوێکەوە دینی مەسیحییان قبووڵ کردبوو. لە زەمانی خوسرەوی پەروێزدا -کە لە دەست بەهرامی چۆپین هەڵاتبوو- هێندێک لە کوردان لەگەڵی چووبوون. بەدزییەوە دینی عیسایان قبووڵ کردبوو. تا دەرکەوتنی ئیسلام لەژێر ئەو ئیعتقادانەدا دەژیان.

## کورد و ئیسلامییەت

کوردستان بەئەکسەرییەت ئیسلامەتییان قبووڵ کردووە، بەشرووتاتێکی تەواو شوعبەیەکیان هەیە کە قبووڵیان نەکردبێت زۆر کەمن.

ئەوانەی ئیسلامەتییان قبووڵ نەکرد بێت، هێندێکن موشابیهی مەجووسی ئێرانیان هەیە. لە حەیاتێکی ئیبتیدادا دەژین. ئەوانیش ناکەینە نموونە بۆ کوردی ئەسڵی؛ چونکە ئەوانیش لەژێر ویجدانی ئیجتماعیەی کوردی ئیسلامدا بەمەجبووری ئیستخدام دەکرێن، هەروەکو مەجووسانی ئێرانی حازری بەم حاڵە نابنە نموونە بۆ کوردی قەدیم و قبووڵ ناکرێن. لەنێو کوردستاندا بەتەواوی و لەسەر شکڵی ئەسڵی ئیسلامەتییان قبووڵ کردووە و بۆ موحافەزەی ئەو دینە مەوجوودیەتیان مەحوو کردووە. حەتا وەپاشکەوتنیان لە حەزارەتی عەسری و عەدەمی تەرەقیان لە بەعزێ فنوونی تازەدا، تەعەسووبی ئیسلامییەتە. دەڵێن هەروەکو بەبەعزێ ئومووری خورافاتی ئەجنەبییەوە ئیشتیغال دەکەین، سەعی لە دیانەتکردن چاترە. چونکە دەبیندرێت و نەزەری دیقەت جەلب دەکات، زاتێکی وەکو سەلاحەدین ئیمپراتۆریەتێکی ئیسلامەتی لە کوردان هێنا مەیدانەوە. ئەو تەشکیلاتەی لەسەر ئوسولی دینی دانابوو. ئەگەر بۆ مەحافەزەی ئیسلامییەت نەبووایە، وەکو ئەمڕۆ تەشکیلی «کەمالیە» کە کرا ئەوەڵ بەرنامەجیان حکوومەتی تورکیای لادین بوو. ئەمما ئەیووبی حکوومەتی ئیسلامییەتی لا میلیەتیان ئیعلان کرد و بۆ کەلیمەی تەوحید سەعییان دەکرد. ئەوە دەلیلێکی زۆر گەورەیە بۆ دینداری کوردان.

عولەمای کوردستان میللیەت و کوردایەتییان ئینقراز پێدا. ئەگەر بەو دەرەجە لە دیندا حەریس نەبوونایە ئەمڕۆکە نەدەبوونە تەعنەزەنی بەعزێ موئەڕیخانی موستەبیدی تورک و بەتەوەحوشیان دانەدەنان؛ عەلەلخسووس لەم عەسری ئەخیرەدا زاتێکی وەکو مەولانا خالیدی شارەزووری لە کورداندا بەدەرەجەیەک لە ئوسوولی ئیسلامییەتدا ئیشتهاری کرد لەنێو چاک و خراپدا بەتەواوی ماهیری ڕەهبەری جەوهەری دیانەتی ئیسلامی دەکردن؛ لەپێشدا میللەتی کوردستان لە قەڕنی ئەوەڵ و ئاخیری هیجریدا ئەوەندە تەئلیفاتیان کە بوو بێت، بۆ تەعەسووبی دینی لەسەر لوغەتی قورئانی تەئلیفاتیان کردووە؛ هەروەکو لە کتێبی «گەوهەری یەگانە» لە نەهزەی عیلمیەدا دەبێژرێت. دایمە ساعی بوون بۆ تەقلیدی عەرەب، لە عاداتی میللیدا زۆر موتەئەخیر بوون، ئەگەر عاداتی میللیەت و ئیسلامەتییان پێکەوە موحافەزە بکردبایە و کوردایەتیان بۆ عەرەبییەت تەرک نەکردبایە، ئەمڕۆ کورد لە هەموو شوعبەیەکی کورەی ئەرز، مونەوەرتر و جەسوور و بەحەمیەت و نامووس و شەرەفتر دەبوون. عولەما و مەشایخ و ئومەرای کوردستان بەکەلیمەی دینەوە هەڵواسرابوون. ئیسمی کابووسی خەلافەتیان لەبەر چاوان گەورە کردبوو. نەیانتوانی حەرەکەیەکی میللییەت بکەن، عەلەلخسووس لەژێر پەردەی خیلافەتیدا هەم دیانەتیان چوو و هەم مەوجوودیەتی کوردستانیان لە دەست دەرکەوت. بەمەحزی قەول ئیغفال کران و لە سەرسامی و غەفڵەتی ئەو کابووسە هشیار نەبوونەوە. قووەی دیانەت تا ٩٢٢ هیجری بەتەواوی ئینتشاری کردبوو. سەلیمی ئەو وەڵ بەدەسایسی سیاسی لەگەڵ ئیدریسی بتلیسی بێ دین، تەشویقی کوردانیان کرد بۆ شەڕی شا ئیسماعیلی سەفەوی. ئیسمی شیعی لەنێو پەردەی ئیسلامەتیدا بەئاتەشێکی سۆزندەیان نیشان دا. بۆ ئێستیلای کوردستان فیتنەی قزڵباشیان کردە ئالەت. ئیدریس بێ ئەندێشە عەلەمی ئینقرازی کوردستانی بۆ سەلیم بەشانەوە گرت. لەفزی ئیسلامییەتی کردە تەپڵ و هەموو ئەرازی کوردستان گەڕا و کوردستان بەشیری بێ تەدبیری قەتڵوعام کرا. تەنافیداوی تەزویریان لە گەردن کرا، بەدەستی خۆیان بوونە سەبەبی ئینقرازی کوردستان و تەفریقە و شوعەباتی دینی و مەزاهبیان تێ کەوت. سەلیم کارێکی کرد هەمووی لەبەر یەک بڵاوکردەوە و هەزار مەزهەبی لێ پەیداکردن. «بناء علی ذلك» بۆ مەنفەعەتی سەلیم، ئیسمی ئیسلامییەت و تەداخولی دەسایسی شیعییەت و سونییەت کەوتە مەیدانەوە. ئەم شوعبە گەورەیە کە بەڕاستی برایەکی دایکی و باوکی و یەک عیرق و یەک میللەتیان بەبوغز و کینە کردە دوشمن و لێکیان دوورخستنەوە. بێ تەئەننی دەمیان تێکنا، کوشتار کرا و خوێنی

میللەتی مەزڵوومی کورد هاتە ڕشتن. سەلیم بۆ عومرێکی موەقەت ئیلقای ئەو فیتنەی کرد. خولاسە لەنێو کوردستاندا شوعبەی موتەعەدیدە پەیدابوو. لە هەمووان بەقووەت و شەوکەتتر «سونی» و «شیعە»یە.

ئەو دوو شوعبە عەزیمانە لە ئەرازی ویلایەتی سەدا -کە بەجزیرەی کوردستان مەشهوورە- وە ئێران و قەفقاسیا عەشایری موتەعەدید هەیە؛ لاکین سونی زیاترن **«تەریقەت»**. هەرچێکو سونین، بەعزێکیان بەسەر هێندێک تەریقەتاندا تەقسیم کراون وەکو: نەقشبەندی و قادری و ڕەفاعی و سەهرەوەردی. بیلخاسە نەقشبەندی لە ئیجابی سەلابەت و دینیدا زیاتر تەعمیمی کردووە و لە ئەغلەبی دێهات و شاراندا تەکیە و خانەقایان لە کەمالی ئینتیزامدا هەیە. ئەمما لەنێو عەشایری کورددا هێندێک یەزیدیەت و قزلباشیەت و ماز [دەتیزم] لە نەزەریاتدا ئیستیناد کراوە و بەعزێ تەریقەتیان مەوجوودە. کورد میللیەتی ویجدانی ئیسلامیەتی عەینەن هەروەکو خودا ئەمری کردبێ، ئیجرای دەکەن؛ بەڵکە لە تەعەسوویدا زیاتر لە فەرایز و سونەن ئەدای شەعائیر دەکەن و زیادە لە قودرەت کەمەری ئیخلاسیان بۆ ئیسلامیەت گرێ داوە و ناتوانن کەسێک لە غەیری ئەو میللەتە بۆ دەرەجەی دینی و ئیسلامیەتی موحافەزە بکەن؛ عەلەلخسووس زەربەیی بێ دینی و تەزبقی تورکانیان لەسەرە. باهەمەی ئەوە هەرکەس لە گۆشەخانەیەکدا بۆ موحافەزەی ئیسلامیەتی دەکۆشن. لە ئێراندا چەند شارێکی وەکو ساوجبلاغ و شنۆ و سەقز و بانە و سارمقەلعە و سەنەندۆج و ئەورامان و هەوشار و کرمانشا و ورمێ و خۆی و سەلماس و ماکۆ ئەو جۆرە جێگایەیان هەیە. لەگەڵ ئەمەش تورک پێیان دەڵێن: لەژێر دەستی قزلباش دایە.

دێهات نییە مەدرەسەی دینی و تەکیە و خانەقای تەڵەبەی عیلم و عولەمای چاکی نەبێ و بەهەموو نەوعێک لە تەرەقی دیندا زیاتر لە کوردستانی تورکیا بوون. مونەوەر، عالیم، زەکی، مودەڕیس ئەویش لەبەر بوغز و کینەی حکوومەتەوە بوو، لە هەموو قەتەعاتی کوردستانی عوسمانیدا، مەدرەسەیەک یاخود تەکیە و مزگەوت و قوتابخانە بۆ فێرکردنی میللەت پەیدا نەبوو. بۆ تەعمیرات و ئاوەدانیی کوردستان نەکۆشان. هەر ساڵێک میقداری زیادیان بۆ دروستکردنی ڕێگا و ئاوەدانی، لە کوردی غافڵ وەخرەدەکراو. ئوجرەتی توروق و تەمەتوع و تەنویرات و عەرەبان دوو چەندان وەردەگیرا. ئەو دراوە هەموو دەچووە ئەستەمبووڵ و ئەدرنە، سەرفی جندەیی و شەراب و کەیف دەکرا.

ڕۆژێک بۆ تەرەقی و سەنایع و پێشکەوتن و ئاوەدانی و ژیان و زانینی کوردەواری

لەپاش زەردەشت ئاورپەرستی و ئەستێرە و ئەجرامی سەماوی پەرستیان تێکەڵ بەئەحکامی ئاین و مەزهەب و دیانەتی زەردەشتیی کرد. خورافات و ئەفسانەیەکی زۆریان لە ئەصڵی ئاین وەردا. ئەویش لە ئیبتیدای ئەمردا عولەما لەنێو کوردستاندا دەستیان بەتەداخولی ئاین و ئیجتیهاد لە ئوسووڵی دینیاندا کردبوو. بەدەسایسی «جوولەکان» ئەو فیتنەیی ئەفکارە لە کار دابوو و بۆیان دەکۆشان و کەوتبوونە نێو مێشکی موغانەوە. بۆ فەسادی ئاینی زەردەشت، موغ و عولەما تەسەلوتی مەعنەوییان لە کوردستان پەیداکرد و چووبوونە عەقڵی عالەمەوە. لەنێو ڕوحی کوردستاندا دەستی ئیستیلایان درێژ کردبوو. لە تەرەف میللەتەوە ئیحترامات و تەعزیمێکی لە حەدد بەدەریان بۆ دەکردن. مەحبووب و عەزیز و مەسموعولکەلام بوون. لەسەر حوکمداران، بەتەواوی ئەمر فەرما بوون و موبەشیریان دەکرد بۆ حوکمدار بەعەفوو. حوکمدار ئینکاری نەدەتوانی بکا پادشا جەسارەتی موخالیفەی ئەو موغانەی نەبوو. ئەو ئەشخاسانە دەستیان بەفەلسەفەی دینی کرد، پیسترینی عاداتی ئەو عولەمایانە ئەمەیە کە لەهەموو شتێک بیجاتر بوو، بۆ خودای مەستی، موسەکەراتیان دەبرد بەقوربانی. لە پاشان موغ شەرابی دەخواردەوە تا ویجدان و ڕەوشت و عەقڵی لە دەست دەردەچوو. خەڵقیشیان فێری ئەو عەقیدە فاسیدانە کرد و سوجدەیان بۆ ئاورش پێ دەبردن. خولاسە ئیعتیقادی کوردستانی قەدیم لەپێشوودا لە هەموو ئیعتیقادێکی ئۆمەمی سائێری شەرق چاتر بوو؛ چونکە بێ وەحی ئاسمانی تەشەبوسات وەحدانییەت خودایان کردبوو لە سێنەی ٥٢١ق. م «دارای گەورە» هوجوومی کردە سەر «سمردیس» و کوشتی. ئەو عەقیدە فاسیدەی لە کوردستاندا پاک کردەوە. ئەمما بەدزی لە نیو هەندێکدا ئەسەری مابوو؛ دەیان شاردەوە. باقی بە تەواوی دینی زەردەشتیان قەبووڵ کردو دەستیان بە بینای دینی پێشووکرد. «دارا» هەموو موغ و کاهینانی «سمردیسی» کوشتن. عولەمای زەردەشتی خستە [سەر]و ئیعتیبارێکی تەواوی پێدان. «مەزدەک» تازەمانی «ئەنوشیروان» دینی زەردەشتی لەوجوددا بوو؛ لاکین ئاوریان بەخۆشەویست قبووڵ کردبوو وبە گەورەیان دەزانی نەبە مەعبوود بیناسن؛ یاخوود تەڵەبی خێر و یا شەرێکی لێبکەن.ئەمما زۆریان بەعەزیز و مەحبووب کەوتبووە بەرچاو؛ ئەویش لە تەئسیراتی سمردیس مابۆوە.

لە زمانی نەوشیروانی عادلدا «مەزدەک» نێوێک بانی و موسێسی دینی مەجووسی پەیدا بوو. دیسان کە عەقیدەی فاسیدەی سمردیس تازەکردەوە و خستیە مەیدانەوە.

«ئوسوولی ئیعتیقادی مەزدەک»: هەر چیکو شەیتانە، ڕۆحێکی شەریرە وتەواوی

ئوشش و مەقسەدی ئیفسادی ڕۆحی سالحە. هەر [چی] فیکری هەیە بۆ ئەو هەدەفە بەکاری دەبا، بە پەرستنی ڕۆژ و مانگ و فەرەجی ژن و ئاور و مردوو ئەمری پێدابوون. سوجدەیان دەبردەبەر «ئاور» و «نوور» و «هەوا» و «با»یان دەپەرست. بەئاوریان دەگوت: جەسەدێکی پاکە. ئەگەر لەلای قوربانی ئاوریان بگرتبایە نەیان دەکوژاندەوە و ئیعتقادیان بەهاتنەخوارەوە لە ئاسمانەوە دەکرد. ئەو ئیعتقادەیان بەنزولی دانابوو، تا زهووری ئیسلام دەوامی کرد؛ لاکین هێندێک لە کوردانی ئەترافی بەحری ورمێ لە عەسری چوارەمی پاش عیسا، بەواسیتەی یەکێک لە عولەمای کوردستان، «ئاس» نێوێکەوە دینی مەسیحییان قبووڵ کردبوو. لە زەمانی خوسرەوی پەروێزدا -کە لە دەست بەهرامی چۆپین هەڵاتبوو- هێندێک لە کوردان لەگەڵی چووبوون. بەدزییەوە دینی عیسایان قبووڵ کردبوو. تا دەرکەوتنی ئیسلام لەژێر ئەو ئیعتقادانەدا دەژیان.

## کورد و ئیسلامییەت

کوردستان بەئەکسەرییەت ئیسلامەتییان قبووڵ کردووە، بەشرووتاتێکی تەواو شوعبەیەکیان هەیە کە قبووڵیان نەکردبێت زۆر کەمن.

ئەوانەی ئیسلامەتییان قبووڵ نەکرد بێت، هێندێکن موشابیهی مەجووسی ئێرانیان هەیە. لە حەیاتێکی ئیبتیدادا دەژین. ئەوانیش ناکەینە نموونە بۆ کوردی ئەسڵی؛ چونکە ئەوانیش لەژێر ویجدانی ئیجتماعیەی کوردی ئیسلامدا بەمەجبووری ئیستخدام دەکرێن، هەروەکو مەجووسانی ئێرانی حازری بەم حاڵە نابنە نموونە بۆ کوردی قەدیم و قبووڵ ناکرێن. لەنێو کوردستاندا بەتەواوی و لەسەر شکڵی ئەسڵی ئیسلامەتییان قبووڵ کردووە و بۆ موحافەزەی ئەو دینە مەوجوودیەتیان مەحوو کردووە. حەتا وەپاشکەوتنیان لە حەزارەتی عەسری و عەدەمی تەرەقییان لە بەعزێ فنوونی تازەدا، تەعەسووبی ئیسلامییەتە. دەڵێن هەروەکو بەبەعزێ ئوموور خورافاتی ئەجنەبییەوە ئیشتیغال دەکەین، سەعی لە دیانەتکردن چاترە. چونکە دەبیندرێت و نەزەری دیقەت جەلب دەکات، زاتێکی وەکو سەلاحەدین ئیمپراتۆریەتێکی ئیسلامەتی لە کوردان هێنا مەیدانەوە. ئەو تەشکیلاتەی لەسەر ئوسوولی دینی دانابوو. ئەگەر بۆ مەحافەزەی ئیسلامییەت نەبووایە، وەکو ئەمڕۆ تەشکیلی «کەمالیە» کە کرا ئەوەڵ بەرنامەجیان حکوومەتی تورکیای لادین بوو. ئەمما ئەیووبی حکوومەتی ئیسلامییەتی لا میلییەتیان ئیعلان کرد و بۆ کەلیمەی تەوحید سەعییان دەکرد. ئەوە دەلیلێکی زۆر گەورەیە بۆ دینداری کوردان.

عولەمای کوردستان میللیەت و کوردایەتییان ئینقراز پێدا. ئەگەر بەو دەرەجە لە دیندا حەریس نەبووایە ئەمڕۆکە نەدەبوونە تەعنەزەنی بەعزێ موئەریخانی موستەبیدی تورک و بەتەوەحوشیان دانەدەنان؛ عەلەلخسووس لەم عەسری ئەخیرەدا زاتێکی وەکو مەولانا خالیدی شارەزووری لە کورداندا بەدەرەجەیەک لە ئوسوولی ئیسلامییەتدا ئیشتهاری کرد لەنێو چاک و خراپدا بەتەواوی ماهیری ڕەهبەری جەوهەری دیانەتی ئیسلامی دەکردن؛ لەپێشدا میللەتی کوردستان لە قەرنی ئەوەڵ و ئاخیری هیجریدا ئەوەندە تەئلیفاتیان کە بوو بێت، بۆ تەعەسووبی دینی لەسەر لوغەتی قورئانی تەئلیفاتیان کردووە؛ هەروەکو لە کتێبی «گەوهەری یەگانە» لە نەهزەی عیلمیەدا دەبێژرێت. دایمە ساعی بوون بۆ تەقلیدی عەرەب، لە عاداتی میللیدا زۆر موتەئەخیر بوون، ئەگەر عاداتی میللیەت و ئیسلامەتییان پێکەوە موحافەزە بکردبایە و کوردایەتیان بۆ عەرەبییەت تەرک نەکردبایە، ئەمڕۆ کورد لە هەموو شوعبەیەکی کورەی ئەرز، مونەوەرتر و جەسوور و بەحەمیەت و نامووس و شەرەفتر دەبوون. عولەما و مەشایخ و ئومەرای کوردستان بەکەلیمەی دینەوە هەڵواسرابوون. ئیسمی کابووسی خەلافەتیان لەبەر چاوان گەورە کردبوو. نەیانتوانی حەرەکەیەکی میللییەت بکەن، عەلەلخسووس لەژێر پەردەی خیلافەتیدا هەم دیانەتیان چوو و هەم مەوجوودیەتی کوردستانیان لە دەست دەرکەوت. بەمەحزی قەول ئیغفال کران و لە سەرسامی و غەفڵەتی ئەو کابووسە هشیار نەبوونەوە. قووەی دیانەت تا ٩٢٢ هیجری بەتەواوی ئینتشاری کردبوو. سەلیمی ئەو وەڵ بەدەساسیی سیاسی لەگەڵ ئیدریسی بتلیسی بێ دین، تەشویقی کوردانیان کرد بۆ شەڕی شا ئیسماعیلی سەفەوی. ئیسمی شیعی لەنێو پەردەی ئیسلامەتیدا بەئاتەشێکی سۆزندەیان نیشان دا. بۆ ئیستیلای کوردستان فیتنەی قزڵباشیان کردە ئالەت. ئیدریس بێ ئەندێشە عەلەمی ئینقرازی کوردستانی بۆ سەلیم بەشانەوە گرت. لەفزی ئیسلامییەتی کردە تەپڵ و هەموو ئەرازی کوردستان گەڕا و کوردستان بەشیری بێ تەدبیری قەتڵوعام کرا. تەنافیداوی تەزویریان لە گەردن کرا، بەدەستی خۆیان بوونە سەبەبی ئینقرازی کوردستان و تەفریقە و شوعەباتی دینی و مەزاهبیان تێ کەوت. سەلیم کارێکی کرد هەمووی لەبەر یەک بڵاوکردەوە و هەزار مەزهەبی لێ پەیداکردن. «بناء علی ذلك» بۆ مەنفەعەتی سەلیم، ئیسمی ئیسلامییەت و تەداخولی دەسایسی شیعییەت و سونییەت کەوتە مەیدانەوە. ئەم شوعبە گەورەیە کە بەڕاستی برایەکی دایکی و باوکی و یەک عیرق و یەک میللەتیان بەبوغز و کینە کردە دوشمن و لێکیان دوورخستنەوە. بێ تەئەننی دەمیان تێکنا، کوشتار کرا و خوێنی

میللەتی مەزڵوومی کورد هاتە ڕشتن. سەلیم بۆ عومرێکی موەقەت ئیلقای ئەو فیتنەی کرد. خولاسە لەنێو کوردستاندا شوعبەی موتەعەدیدە پەیدابوو. لە هەمووان بەقووەت و شەوکەتتر «سونی» و «شیعە»یە.

ئەو دوو شوعبە عەزیمانە لە ئەرازی ویلایەتی سەدا -کە بەجزیرەی کوردستان مەشهوورە- وە ئێران و قەفقاسیا عەشایری موتەعەدید هەیە؛ لاکین سونی زیاترن **«تەریقەت»**. هەرچێکو سونین، بەعزێکیان بەسەر هێندێک تەریقەتاندا تەقسیم کراون وەکو: نەقشبەندی و قادری و ڕەفاعی و سەهرەوەردی. بیلخاسە نەقشبەندی لە ئیجابی سەلابەت و دینیدا زیاتر تەعمیمی کردووە و لە ئەغلەبی دێهات و شاراندا تەکیە و خانەقایان لە کەمالی ئینتیزامدا هەیە. ئەمما لەنێو عەشایری کورددا هێندێک یەزیدیەت و قزڵباشیەت و ماز [دەتیزم] لە نەزەریاتدا ئیستیناد کراوە و بەعزێ تەریقەتیان مەوجوودە. کورد میللیەتی ویجدانی ئیسلامیەتی عەینەن هەروەکو خودا ئەمری کردبێ، ئیجرای دەکەن؛ بەڵکە لە تەعەسووبدا زیاتر لە فەرایز و سونەن ئەدای شەعائیر دەکەن و زیادە لە قودرەت کەمەری ئیخلاسیان بۆ ئیسلامیەت گرێ داوە و ناتوانن کەسێک لە غەیری ئەو میللەتە بۆ دەرەجەی دینی و ئیسلامیەتی موحافەزە بکەن؛ عەلەلخسووس زەربەیی بێ دینی و تەزبقی تورکانیان لەسەرە. باهەمەی ئەوە هەرکەس لە گۆشەخانەیەکدا بۆ موحافەزەی ئیسلامیەتی دەکۆشن. لە ئێراندا چەند شارێکی وەکو ساوجبلاغ و شنۆ و سەقز و بانە و سارمقەلعە و سەنەندۆج و ئەورامان و هەوشار و کرمانشا و ورمێ و خۆی و سەلماس و ماکۆ ئەو جۆرە جێگایەیان هەیە. لەگەڵ ئەمەش تورک پێیان دەڵێن: لەژێر دەستی قزڵباش دایە.

دێهات نییە مەدرەسەی دینی و تەکیە و خانەقای تەڵەبەی عیلم و عولەمای چاکی نەبێ و بەهەموو نەوعێک لە تەرەقی دیندا زیاتر لە کوردستانی تورکیا بوون. مونەوەر، عالیم، زەکی، مودەڕیس ئەویش لەبەر بوغز و کینەی حکوومەتەوە بوو، لە هەموو قەتەعاتی کوردستانی عوسمانیدا، مەدرەسەیەک یاخود تەکیە و مزگەوت و قوتابخانە بۆ فێرکردنی میللەت پەیدا نەبوو. بۆ تەعمیرات و ئاوەدانیی کوردستان نەکۆشان. هەر ساڵێک میقداری زیادیان بۆ دروستکردنی ڕێگا و ئاوەدانی، لە کوردی غافڵ وەخرەدەکراو. ئوجرەتی توروق و تەمەتوع و تەنویرات و عەرەبان دوو چەندان وەردەگیرا. ئەو دراوە هەموو دەچووە ئەستەمبووڵ و ئەدرنە، سەرفی جندەیی و شەراب و کەیف دەکرا.

ڕۆژێک بۆ تەرەقی و سەنایع و پێشکەوتن و ئاوەدانی و ژیان و زانینی کوردەواری

موتەفەکیر نەبوون و نەیانخستە بیرەوە. ئەو منداڵانەی بێکار و کەسب بخەنە سەر کارێک و ڕەواجی تیجارەت و فەلاحەتیان بدەن، تەشویقی شەریکەت و قۆمپانیا و هەڵستان بدرێن نەبوو. شەو و ڕۆژ لە فیکری ئەمەدا بوون چ بهانەیەکیان پێ بگرن و بە چ دەسایسێک و حیلە و حەواڵە ڕووتیان کەنەوە و تاڵانیان بکەن. ئەگەر یەکێکی بەبیریشیان لێ پەیدا بوایە، هەزار داویان بۆ دادەناوە و تووشی بەڵایەکیان دەکرد.

بێ موبالەغە تورک بەغەیرەز فەساد و تاڵانگەری و بەد ئەخلاقی و تەوەحوش و جەهل و بێ ئیدراکیان فێری کوردان نەکرد. بۆ ئیستعبادی ئەو قەومە قەدیمە و نەجیبە، هەزار حیلەی وەکو شیعە و سوننە و بەدین و بێدینیان خستە پێشەوە. نیفاق و شیقاق و دوور لە تەمەددونیان نیشاندان. توخمی جەهل و نیفاق و تەوەحوشیان بۆ چاندن. بەئیسمی دیانەت و ئیسلامییەوە چەند کەسێکی مەنفەعەت پەروەر و خودپەرستی وەکو هێندێک مونافیقانی کوردانیان بڵندکرد و کلکێکی دیانەتیان پێداکردن و بەواسیتەی ئەو ڕیجالە پوولپەرستانەوە ئەم میللەتە فەقیر و بەلەنگازەیان لە هەموو حقووقێک مەحرووم کرد.

لەلایێکەوە هێندێک بانگی شیعیەتی و هێندێک سونییەتی، عەجەم بۆ مەنافیع و تەرەقی میللەت و ڕەهایی لە تورکان و دوورکەوتن لە تەئسیراتی تورکان، شیعەییان تەمەسوک کرد. تورکیش بۆ ئیستعباد و سوخرە و شەڕ لە مابەینی ئێران و ئەناتۆلدا بانگی سونییەتی و حوببی دیانەتی بەگوێیان دادان. کوردیش بۆ مەدەنییەتی عەرەب و تەقلیدی ئەخلاق و ئیسلامیەت هەڵخەڵەتابوون و لە خەوی غەفڵەت و بێ خەبەریدا لە بن تەئسیراتی چوار قووەتی جازیبەدا موتەحەییر مابوون.

تەقلیدات و دەسایس لەهەر چوارلاوە لەنێوانیاندا فاعیلێکی موختار بوو. لەبەر کوشتاری یەکتر بەدەسایسی کازیبە نەپرژانە سەر ئەوە، فرسەتیان دەستکەوێ و چاویان بکەنەوە و بزانن چ دەکەن؛ بەغەیرەز ئەمە کە دەم تێکنێن و یەکتری بکوژن چارەیەک نەمابوو. بوون بەقوربانیی تورک و عەجەم. عەداوەتی سیاسیەکی بەپەردەی ئیسلامیدا بۆ شەڕ و بوغز و نیفاقی مەزاهیبیان تێکەوت و ئاوری فیتنەی تورک بەکبریتی دینی هەڵایسا. هەردوولا بەنێوی شیعە و سوونی مەحووبوون. تورک و عەجەم بەکوشتنی ئەم قەومە نەجیبە تەقویەی میللەتیان کرد و بەخوێنی ئەوان ئیسپات بوون.

«سێر ماڵقۆڵم» بەم سورەتە ئیزاحەی دەکا: هەرچێکو کورد لە مەیدانی شەڕ و کوشتاری خوێناوی شیعە و سونیدا دەژین، بە شیری دەسایس عومرێکی بەفەلاکەت ڕادەبوێرن. لە جەرەیانی موختەلیفەدا بەر لینگی ئەم و ئەو پێکوتی دوشمن بەسەرگەردانی و پەژموردەیی

لەملا و لەولا لە کۆچ و باردان. بەتەواوی عومرێکی بەغەفڵەت ڕابردن و دەبنە فیدای دوشمنان.

هەر لە ئەوەڵی ئیسلامییەوە تا ئەمڕۆ -کە ساڵی ١٣٤٣ی هیجرییە- عەینی حاڵ مەوجوودە و بەهیچ وەجهێک لە دوشمن تەنبیهگیر نەبوون. هەر لە زەمانی ئێمەدا کە دیومانە لە ساڵی شێخەوە تا هاتنی فەریق بۆ «بسویە» لە لاجان (١٣٢٤)دا و لە حەربی عموومی و عروس (حلمی ئەرکان) کە ئەمەندە کورد کوژراوە، ئەوە پیاوی وەکو «حوسێن خانی سەرداری بۆکان» و «حەمەخانی بانە» و «سەیفەدین خانی سەقز» و کوشتنی پیاوێکی وەتەنپەروەر و حەمیەت و میللەتخوازیێکی وەکو «میرزا فەتاح» و بەئەسیر چوونی ئەوەندە یەخسیرانە، لە هەموو ئەقتاری کوردستانەوە و کوشتاری ئەهالی وان و مووش و سیرت و بتلیس و حادیسەی «ئیسماعیل خانی سمکۆ» و «سەید تاها» و کوژتاری «مارشیمۆن»ی ئەرمەنی و حادیسەی شێخ مەحموودی بەرزنجەیی لە سلێمانی و ئەو حەرەکاتی ئەخیرەی ساڵی ئێستا کە ٥٠ هەزار کورد لە داری سیاسەت درا و ٢٠٠ ئەکمەلی مەشایخ و عولەمای موتەبەحیری دینی و لە ٥٠ موتەجاویز ئومەرای ساحیب زۆر و شەوکەت بوون بەفیدایی و لە بن داری زوڵم و ئەزیەتدا مردن و زیادە لە سێ ملوێن نفووس ئەمڕۆکە بەنیوەگیانی دەژی؛ هەموو شاهیدی ئیدارەی سابیق و لاحیقی تورکانەو ئەوانە هەمووومان لێ مەعلووم دەکا و ئەمڕۆ کردەوەیەکە کورد لە بن سەتتاری دیندا بەهیلاک چوون، غەیری ئەمە کە موخدەع بەئیسلامی بن و فیدای دین و عەرەب بوونیان، گوناهێکی سادریان نییە کەوا لە جەهلدا بمێننەوە.

ئەم فەزایع و کوشتارەی لە دیاربەکر و ئەلعەزیز و ئورفە کرا، دین پێی کردن. (حەوادیسی ئەوانە لە «گەوهەری یەگانە»دا بەتەفسیل بەحس دەکرێ)

ڕەزاڵەت و فەزایحێکی تورک بەکوردیان کردووە بەسوورەتێکی تورک بۆ خۆیان لە جەرایدیاندا نەشریان کردن و عەکسیان کێشاون، ئێمە بەیانی دەکەین.

ئەو ژیانە و دەردی سەرێکی کورد دەیکێشن، تەعەسووبی دینییە و ئەو تەعەسووبەیان بەم جۆرە گرتووە: هەرکەس ئیددیعای دیانەت بکا لە لایان و جلی دینی پێوە بێ، ئەگەر لە دڵدا کافریش بێ، وا دەزانن پیاوی خودایە و لازمە بەهەموو نەوعێک کەمەری خزمەتی بۆ گرێدەن. ئیدی ئەوەیان نییە کە دەرەوە و ژووری، بەرابەر یەک بکەن و بزانن بەڕاستی لایقە بەمە ئەو خزمەتە بکرێ قووەی ئەو موحاکەمە و تەدقیقاتە و ئیدراکیشیان بەمە لێ سەلب کردوون کە لەسەر هەموو ئیسلامێک لازمە تەجەللوسی لەسەر برای دینی خۆی نەکا

و هەرچێکو گوتی، ڕاستە و بەدرۆزنی مەزانە.

ئەو (لەغاوە) دەمێ گرێدان. تورک و عەجەم لەم دەم گرێدانە. ئیستفادە دەکەن. پیاوێکی ڕەزیل و بێ دین و مەنافیعی شەخسیەت پەرستێک پەیدا دەکەن، هەر بەو جۆرە دەست بەدەست ئەو فیتنە و دەسیسەیە لە کاردا بوو و زەمان بەزەمان کابووس سواریان بووە و تەسەلوتی لەسەر پەیدا کردوون تا گەیاندوونیە ئەمڕۆکە.

دایمە کورد لە ژێر تەئسیری دوو کابروسی بەقووەتدا ژیاون: یەکێکی دینی و یەکێکی حکوومەت. هەرچێکو دینییە بەواسیتەی هێندێک مەنافیع و پوولپەرستان ڕێگا و در و دوولانیان لێ پەیدا کردووە و لە ئەبوابی موتەعەدیدەدا بۆیان چوون و لە خەوی غەفلەتێکی حکوومەت ئیغفالی کردبوون، زیادە خۆبەندیان کردن بەئەفسوون و تەلەسمان چاوی دیتن و پێ ڕۆیین و دەست بەکاریان گرێدان و مەجالی بزووتنیان نەدانێ. دایمە لە نوورەوە بۆ زوڵمەتیان لێخوڕین و تەوقی ئیستعبادی ڕۆم و عەجەم و غەیرەیان کردە گەردنیان.

دەتوانم بەڕاستی بڵێم ئەو کەسانەی دینخواە لە ڕاستەوە ئالەتێکی بەکاربوون بۆ حکوومەت دەکۆشان. ئەگەر ئەو زاتە فازیلانەی عیبادی «پوول و مەسلەک» نەبوونایە، کورد وا نەدەکەوتە ژێر زوڵمەت و جەهل و زوڵمی حکوومەتی لە خودا نەترسانەوە. ئەوەی بەسەر کورد هاتووە، ئەو زاتە زێر پەرستانە سەبەبن. «دقتۆر فریج» -کە بەحسی دیانەتی کوردان دەکا- دەڵێ لە عەسری ئیسلامیدا کورد دەنگەدەنگی میللەت و عەشایری ئیسلامییەتیان لە ژینێکی زۆر بەقووەتدا گرتەوە. ئەو حەیاتەش ئولفەتی لەگەڵ دین زیاتر هەبووە. لەپاش ئەویش دائیرەی ژیانیان مەحدوود بوو، هەستان و دانیشتن و گەڕانیان تابیع بەقیووداتی موراقەبەی گەورە و مەزنانی کوردان بووە.

لاکین لە دائیرەی میللەتدا بەکەماڵی سەربەستی دەرۆن مەیلیان بەشکڵێک بووبێ، بزووتن و ئارەزوویان بەهەر چتێکەوە ببێ سوئالی دەکەن و ئارەزوویان نەبێ ڕەددی دەکەن. لەنێو سنووری زەوی و خاکیاندا لەژێر حوکم و ئیدارەی گەورە و خودانێکدا دەژین. لەژێر قانوون و زاکوونێکی زۆر چاک و ئاشکارا بەمەشوەرەتی یەکدی بەسەریان بردووە.

هێندێک لە موئەڕیخان دەڵێن: کورد لەبەر تەزبیقی عەرەبان، ئیسلامیەتیان قبووڵ کردووە؛ چونکە کورد لە پێش ئیسلامیدا لە کوێستانان گەشتوگوزاریان دەکرد و ئەرازی هاوین و زستانیان هەبوو. عەرەب وەتەنگی هێنان و (بیلئجبار) قبووڵیان کرد و ئەو تەزییقە بوو بەسەبەبی ئیسلامییەتییان.

زاتەن ڕاستە تەنگی عەرەب نە بەتەنیا بۆ کوردان بوو، بۆ هەموو میللەتی شەرق ئەو تەزبیقە کرا؛ ئەمما غەیری کورد بەیەکجاری بۆ تەقالیدی عەرەب، خۆیان و میللەت و وەتەنیان مەحوو نەکردووە؛ بەتەنێ دینیان قبووڵ کرد. لاکین کورد هەم دین و هەم تەقلید و هەم خورافات و ئەفسانەی جاهیلانی عەرەبیان بەتەواوی قبووڵ کرد و لەو ئەفسانەو خرافاتانەدا ئیشتیهادیان کرد تەوسیعیان پنشان دا. بەڵکە بەبێ ترس دەڵێم عولەما و مەشایخی کوردان فەنانی ئەفسانە و درۆی خرافی نەزانانی عەرەبن و لەسەر ئوسولی ئەسڵی ئەو درۆ و ئەفسانانە کتێب و حاشیە و تەئلیفات کراوە. لاکین هەر وەکو بەحس کرا تا زەمانی دەرکەوتنی ئیسلام، کورد بەموستەقیل لە بن ئاڵای پادشای خۆیاندا دەژیان، فتوحاتی ئیسلامی یەکێک بەحسیان دەکەن پیاوێکی وەکو «هورمزان» پادشای لوڕستان و ئەسفندیار پادشای شەهرەزوور و بەهرام کوڕی فەرخ زاد پادشای ئاوربایگان، ئەوانە و چەند کەسێک هەن کە بەکۆمەکی یێک «یەزدی کوردیان» کردە شاهنشاه. خولاسە بەیێک جیهەتی و ڕاستی و ئیتیفاق و یەک دڵی بەسەریان دەبرد. سوخرەکێشی هیچ کەسێک نەبوون چونکە دین، پادشا، قیبلە، وەتەن، میللەت، زبان، ژیان، عادات، ئەخلاقی یەک بوو؛ تیێکەڵ نەبوو لە پاش قبولکردنی ئیسلامی مەزاهێب دین، ئایین، تورق، شەعب، جینس، وەتەن، ئەخلاق، زبان، ژیان تیێکەڵ بوو لێکدرا تەسەلوتی هەزار توخم و زبانیان بەسەردا هات. دەسایس عەرەب، ترک، دین لە لایێکەوە لێکی جوێ کردنەوە و بڵاو بوون. عولەمای کوردستان یێک یێک بەدەسایسی حکومەتانی موختەلیفە لە عەسری پێشوودا و ترکی لە پاشان دینیان کردە ئالەت. هەر وەکو ئەمڕۆ کە لە عیراق لە نێو بەعزێ ڕوئەسای دینی کورداندا نموونەی پێشووان نیشان دەدەن و تەسدیقی هەموو ئیدیعایێکم دەکن. ئەحواڵیان لە ئاتیدا لە فەسڵی عەشائر و قەبیلەی کوردان لە بن عنوانی «قەومییەت و میللەت عەشیرەتی کوردان»دا هەریەک لە عەشیرەتی خۆیدا و مەزهەب و ئایین و تەریقەت و خەریتە و زوبان و جوغرافیا و ئەرازییان و عەدەدی نفوس و ماهیەت و چلۆنییان ئیدارە و ژیانیان و ئەحواڵی سیاسی ڕوئەسای مەشایخ و کورەی ئەو عەشیرەتانە دێتە بەحسەوە. بەئیزنی خودا لە بەحسی دیانەتی کوردان خلاس بووین دێینە سەر عەشیرەت و تاریخی ئەحواڵیان لە جلدی دووەمدا.

«سەر فەسڵ» سەرحەد و سنووری کوردستان پێش و پاش و خەواس تەبیعییەیی هەرچیک و کوردستانی ئێستایە حدوود و سنووری لەسەر تەشکیل عەشائیری تەعین کردنی.

## پاڕانەوە

کتێبی غونچەی بەهارستان دوو جلدە ئەمەی تەبع کرا جلدی ئەوەلە، جلدی دووەم تەبعکردنی کەوتە پاشەوە. جلدی دووەم کتێبەکە زۆر چاکە؛ عەشیرەت و قەبیلە و شاران و دێهات بەتەواوی دەگرێتەوە. عەدەدی نفوس، مەوقع جوغرافیا، چۆم کێو، تیجارەت، ژیان عادەت، جل، ئیدارە، ئاغا و ڕەئیس و تاریخ هیجرەت و ئیسکان و ئەساسیان و سەبەبی نێویان و لە ئەرازی مومتەلەکات دانیشتوان بەدەلایلێکی چاک بەحس دەکا و بەچەند صورەت و عەکسان موزەییەنە. بەتەشویق و تەرغیبی هەندێک لە ئومەرا و مەزن و کوڕانی عەشائیری کوردان بەدڵخۆشی دانییەوە شەرت و قەراریان کەوتمە سەر هەوەس و ئەمنییەتیشیان دامێ مادی و مەعنەوی بۆ تەبعیان و ئینتشاریان کۆمەکیم بکەن. لە پاش ئەوە کە کەوتمە تەبعکردنیان و چەند مەلزەمەیەکم تەواو کرد، ئەو زاتانە هەر کەس لە جێی خۆی کشاوە؛ کۆمەکی پارەیێکیان نەکرد. منیش بێ تاقەت و بێ دەست و پێ مامەوە بەهەر غیرەت و زەحمەت بوو لە بن تەئسیرات چەند مانعاندا ئەزیەتم کشاند جلدی ئەوەلم تەبع کرد. ئێستاش تەبع و نەشری کەوتۆتە ژێر حەمییەت و مروەت و بەئەنساف منەوەرانی میللەتپەرور کۆمەکێکمان بکەن ئەو جلدی ماوە تەبع بکرێت.

## ئەثەر و تەئلیفات و مەئالیف

١- «گەوهەری یەکانە تاریخ کوردانە» عیبارەتە لە چوار جلد: «جلدی ئەوەل لە ئیبتیدای سەڵتەنەت و سیاسی ئیدارە حکومەت مەدەنییەت، سەنایع، خەت، نووسین، موحارەبە و ئیستیلا و تەرەقی و ئینقیراز وەضعفیەت و تەواوی ئەحواڵیان لەسەر قەول سەحیح بەحس دەکا و میقداری دوو سەد سورەتی ئەشخاس و ئاسار و ئەبنیەی شارانی کوردستانی قەدیمی تێدایە و دووسەد و پەنجا سەحیفەی وەکو ئەم سەحیفەیە لە ئیبتیدای ئیسلامییەوە تا ئەمڕۆ بەسێیەم جلد تەواو دەبێ.

**جلدی دووەم و جلدی سێیەم و جلدی چوارەم:**

تاریخ، ئەحوال، ژیان، دیانەت، ئەخلاق، عادەت، سەڵتەنەت، ئەمارات، حوکمداران، عەشیرەت، قبائیل، تائفە، مەزاهب، تەرایق ئیستیلا، شەڕوشۆڕ، تەشکیلات و ئینقیراز و تەواوی سەرگوزشتەیان و ماجەرایان، تاریخ و تەرجومە ئەحوال پیاوان دینی عولەما، شوعەرا و فەیلەسوفان، مشایخ، صۆفیە، موصەنیفان، موئەڕیخان و ئومەرا و ئاغاوات،

حوکام و مەزنان ئەوانە میللەت پەروەر و مەشهوران کە لە کوردستاندا پێگەیشتوون و ئیشتیهاریان کردووە سەر حەد و سنوور و ئەرازی تەبیعی و مەعادن و تیجارەت و زراعەتی کوردستان لە ئەوەل زهووری ئیسلامەوە تا ئەمڕۆکە ئەو سێیەم جلدەش عیبارەتە لە دوو هەزار سەحیفە زیاتر دیسان بەسێ سەد و کسور سورەت و خەریتە موزییەنە. عەکسی ئەکسەری ئەشخاص و شاران و مەنازیرو ئاساری قەدیمە ئەوەندەی پەیدام کردبێ تێم خستووە.

٢- تاریخ کوردستانی ئاذربایجان لە ئەوەلەوە تا ئەمڕۆی، عیبارەتە لە سەد صەحیفە مزینە بەئەغلەب سورەت خەریتە و مەنازیرو زۆر چاکە بۆ کردن و ئەعیانی ئەو جێگایە.

٣- تاریخ حکومەتی سێ میران «موکریان و بابان و سۆران» جلدی یەک عیبارەتە لە ١٢٠ سەحیفە لەسەر ئوسولێکە غایەت زەریف و چاکە کتێبێکی زۆر لەتیفە و بەفائیدەیە.

٤- «ڕەهنمای حەکاکان» کتێبێکە «علمی عەمەلی» کۆلان و تەواوی مەعادن بەواسیتەی ئەدەوات کیمیاوی زۆر بەئاسانی بۆ ساحێب هەوەسان ڕەهبەرێکی چاک و مورشیدێکی بەفەزلە. عکاسی بەعزێ مەواد بەدەستی خۆت دروست دەکەی بێ ئەوەی ئیحتیاجت بەفەرنگستان دەبێ.

٥- «صەنعەت و فنون» کەهرەبا، غلوانی، ددانسازی، زێڕنگری، ئاوێنەسازی، مینا لەسەر تەواوی معادن سابون ڕەنگی، هەموو مەنسووجاتێک و زۆر شتی لازمی تێدایە بۆ هەموو میللەتی کورد لازم دەبوو هەموو سنفێک ئیستیفادەی لێی دەکەن بەشەست ڕەسم موزەییەنە.

٦- تاریخ ئیسماعیل خان «سمکۆ شکاک» هەفتا صەحیفەیە و چەند عەکسیشی تێدایە.

ئەگەر هیمەت و حەمییەت بزرکی کورە ڕوئەسای کوردستانم لەسەر دەبێ تەبعیان دەکەم با تەواوی کوردستان بەزبان و لوغەت خۆیان بیخوێنن و ئیستیفادەی تاریخ و سەنعەت لەسەر ئوسولێکی کوردەواری لێی بکەن. بۆ بەندە فەخرێکە و شوکرانەییێکە کە مۆفەق بووم بەقەدەر خۆم خدمەتی میللەتم بکەم و بۆ ئەو ذاتانەش خێرێک و ئیحسانێکە لەگەڵ میللەت و وەتەن و ئەولادی خۆیان دەکەن. خودا تۆفیق بدا.

# خۆشی و ترشی

لەنێو دڵ و دەردییێکی بێ کەسیدا هاوار و بانگێکی بەڕاستییە لە

حاڵێکی ئەفسانەییدا

دانەری

**سەید حوسێن حوزنی حوسێنی**

مزی دامەزرانی بۆ دانەری ڕادەگیرێت

نەشریاتی: ٥

ڕۆژی دووشەممە یازدەی محەڕەم ساڵی ١٣٤٦ = ١٩٢٦

لە مەزردەکەی زاری کرمانجیدا دامەزرا

## پێشدەستی

بەمندالّی بچووک بووم شلک و ساوا
گەلێ ناز و نیازم بوو لە ناوا
هەمیشە کار و پیشەم هەر لە مالّ بوو
ئەنیس و غەمرەوێنم دایک و خالّ بوو
لە بۆ دلّخۆشیی و ئاسوودەگی دلّ
گەلێکی خۆشدەویستم دایکی کامڵ
بەگیان و دلّ، ئەوەندەی مایلم بوو
لە لانکا یا لە کۆلاّ مەنزلّم بوو
خودا رازی بێ لێی، رازی لەویش بووم
لە دەرد و ئێشی دونیا بێبەری بووم
ئەوەندە ئەو ژنە خۆشی دەویستم
لە سەر تەخت و دوو سێ دۆشەگ دەنوستم
بەسەد گوونە چتی چاک بۆم دەخەملّی
سەر و مێشکم وەکی بووکان دەگەملّی
بەدەنگی لایە لایە وەردەکەوتم
بەچەپلّە و پێکەنینیان سەردەکەوتم
ئەسەف بۆ ئەو دەمانەی شاد و خورڕەم
مخابن بۆ زەمانی خۆش و هەمدەم
حەیف بۆ ئەو زەمانەی رۆحپەروەر
کە دایکم هەمدەمم بوو باوک سەروەر
وەکو مندالّی ساوا هەر دەگریام
لەنێو مالاّن بەرۆژ و شەو دەگریام

بەوێنەی رۆحی شـیـرین بووم لە کنیـان
نەوەک دەنگم بهـاتبـایێ بمردبان
دەمێک گۆزە دەمێک کاشیم دەکرد لەت
دەمـێک جلکم دڕی گـاه چادر و پەت
دەمێک بۆ دار و شـووشەم بەرد دەهاویت
دەمێک جوێنم دەدا دەمخوارد و دەمڕێت
دەمـێک دایکم بەتووک پێم هەڵدەکالا
دەمێکی شیری خۆی پێم کرد حەلالا
گەلێک جار دەستی بێعاریم درێژ بوو
لەنێـو ژوورا شـەروشـۆڕم بەرێژ بوو
لە ترش و شـیـرنی هەرچیم بدیبـا
بەگریە و زۆری خـۆم دەمبـرد هەچی با
لـە مـن دایم دەیـانـدی چـەنـد بـەهـا
نەبوو هیچ چارەیێ غـەیرەز فـسـانە
دەمێک بازی و گەمە و خۆشی و تەرانە
گەهێک زاری و گـریـن قـیـژە و سـەرانە
لە پەیمان و لە شـیـرەت بێ ترس بووم
نە بۆ پۆشین و خـواردن باری کەس بووم
نەبوو پێی خـۆشـبێ ئێشـێکم بگاتێ
کـە دەیدی نالەمـە و ترشـیم دەگـاتێ
لـە مـن زیـاتـر بـەدەرد و داخ ئـەنـاڵـی
لە بۆم هەردەم بەئاه و غـەم دەباڵی
نەراحـەت بوو کـە ئازاری بدیبـام
نەتایێ بوو کـە پێم دڕکی بدیبـام
لە هەر ئێـشم تو زانای ئێـزەدی پاک
لە سـەر بەندە تو بەخـشندەی بەبێ باک

ئەگـــەر تۆ مـــیـــهـــرەبانی خـــۆت نەدابا
دەچـــوو بـــوون و ژیـــانم پـــاکـــی بـــەر بـــا
دڵـێـکـی هـۆگـــــــری تـۆ دات بـەدایـک
گـــرێی خـــۆشـــویســـتنت لێـــدا بەباریـک
لـە ژووری هـەر دڵـێـکـا پـەردەیـی نـوور
بەلوتفی تۆ تروسکا وەک چیـــای توور
چ چاکی فـــــەرمــــووە ئەو پیـــری زانا
بەهەشت بێ جـــێگەیی ئەو هەردەمــــانا
لە ئەو ڕۆژەی کـــە ئەمنت ئافـــەرید کـــرد
بەغـــەیرەز بێ شـــعـووری کـوانێ چیم کـــرد
خـــودایا تۆ بەزاتی خـــۆشـــەویســـتت
بەپیـــاوانی بژاردەی حـــەقـپـــەرســـتت
لە کـــــرداری بەدم چاوان بپـــــۆشـــــە
لە ڕۆژی تەنگەتایی مـــەمـــخـــرۆشـــە
ببـەخشـە تۆ حـوسێن حـوزنی مـوکـریان
بدە پێی باغ و باغـچە و مـوڵک و سـامـان
غـــەرەز ڕۆژانی پێـــشین کـــارم ئەو بوو
تەمـــــەنـنایی، دڵی زامـــــدارم ئەو بوو
کـە لێم دڵـگیـر دەبوو ئەو دایکە چاکـەم
نەبوو ڕێگای خـــلافـــاندن لە مـــاکـــەم
بەچیـــڕۆک و فـــــســــانە و لایە لایە
دەیانلاوانـدمـــەوە ئەو کـــیـــژ و دایە
ئەوەندەی خـــۆشنەوازی و قـــســە چاکی
لە پەند و شـــیـــرەت و چەند گـــۆنە پاکی
دەیانگوت هیچ بەدڵ لێم خـــۆشنەهاتن
بەغـــەیرەز بزن و مـــەڕ چیـــڕۆک نەکـاتن

له بزنۆکــه و مــه‌ڕۆکــه و ســه‌ربهــووردیان
گه‌له‌ک دڵخۆش ده‌بووم ده‌مبیست ڕه‌وشتیان
لـه‌وێدا ژیـنـی خــــه‌ڵـک و دوژمـن و یـار
به‌چاوی خــۆم ده‌دی ئه‌حــبـاب و ئه‌غــیــار
ڕه‌گــــه‌زیـان یه‌ک نه‌بێ چۆنه ژیانیــــان
کـه دوژمـن چۆن ده‌بێـتـه دۆســتی جـانیـان
له‌به‌ر ئه‌و ســه‌رگــوزشـــتــه ژیری بار بووم
به‌حـیـکمـه‌ت تێـیگه‌یاندم فـێری کـار بووم

# بزنۆکە و مەڕۆکە

گوتی پێم: دایکی زاناو عەزیزم
ببی لێم ڕۆڵەیی شەنگ و تەمیزم
لەمە پێش چەند لەمێژ بوو بزنە سوورێک
سپی بن چەنگ و جوان و ڕەنگو کوورێک
دوو شاخی پێوە بوون تیژ وێنەی خەنجەر
وەکو کەوتبێتە دەست پیاوی دلاوەر
ردێنێکی سپی و دوو بست درێژی
لە بن کۆڵمە و چەنەی گەرچو دەهێژی
دەموچاوێکی جوان ڕیش و سمێڵی
بەڕوو وەک عابیدێکی توندوتۆڵی
لەگەڵ تۆمە، بزانە تێگەیشتوو
لەنێو خەڵکا بەفەزلی وەک ئەرەستوو
نموونەی عیلم و فەزڵت ڕیشی پانە
لە بۆ جەلبی دڵانە، داو و دانە
نیشانەی کار و عیرفانت ڕدێنە
دڵی زانا لە داخت پڕ لە خوێنە
بڵندی و سەرفرازی گەر بەڕیشە
بزن گەورەترینی کار و ئیشە
ئەگەر فەزڵ و ئەدەب ڕیشی درێژە
بزن یەکتایی دەهرە هەر ببێژە
بەڕیش بێت پیاوەتی و عەقڵ و جەماڵت
حەقیقەت خۆڵ بەسەربی وەک کەماڵت

قـــــەی کـــورت گـــوێبـــدێره زۆر درێژی
بەکـــــار نـایەت هەتا ســــوبحی بڕێژی
وەره تۆ گــــەوهەری یەکــــدانەیی پاک
بەنایابی وەدەرخـــە دەچیـــە بن خـــاک
بڕێژە دەر لە دەریا فـــــیکری بیکرت
دوڕ و لەعل و گەواهیر قەند و شەکرت
لەنێـو دوکـانی عــەتارانی خـۆشبـوو
دەیانسوو مشک و عەنبەر شۆخی گوڵڕوو
کــە ئەو بزنە زەمــانێک شــادمــان بوو
لەنێـو مـێرگ و چەمـەندا بێ خـودان بوو
بەخـــۆشی و ســـەربڵندی چاک دەچرِیا
دەگـــــەڕیا بۆ لـەوەڕ هەردەم دەگـــــریا
هەبووی چوار کـاریلە ئەو بزنە فــەرزەند
بەبوونی وان هەمـیشـە شـاد و خورسەند
یەکێک شـەنگوڵ ئەوی دی ناوی مـەنگوڵ
ئەوانە ناوی کـوردین: سـەوسـەن و گـوڵ
سـێـیـەم تیـتڵ ئەویشـدی بیـبـڵی ناو
لەبەر خــۆشی ئەوان شــاد و فــەرەحناو
وەیە ئەولاد و ئەمــوال ئیـمـتـیـحـانن
دەمـــێک ســـوودن دەمێ دیکەش زیانن
نەوا بێ مـاڵ لە دەسـتـدا جـاویدان بێ
نە فــــەرزەندەت لە چاکی پایە بەنبی
نە دایک بۆ ئەبەد بۆ کـــوڕ دەمـــێنێ
نە کـــوڕ بۆ دایکانە غـــەمـــڕەوێنێ
چتـێکی بۆت بەکـار بێ ئەی خیـرەدمەند
لە بۆ تیـرە و ڕەگەز کـۆشین لەگەڵ پەند

بەدەست و باسک و قۆڵ و ماڵ و سەروەت
بکۆشی بۆ ژیانی عیزز و شەوکەت
لە بۆ بەرزی هەشار بەو ڕیزگاری
زبان و خوویی میللەت پیشە وکاری
بەڕاستی سەعیی کەی تا ڕۆژی مەحشەر
دەمێنێ نامرێ ناوت لە دەفتەر
ئەگەر واژی ئەو عومرت بەسەر برد
دەچێ هەرچی کە بووت ڕەنجت خەتەر برد
لە وەختی مردنا ئەی پیاوی خورسەند
چییان لێدێ بلێ ئەو ماڵ و فەرزەند
لە موڵک و دەوڵەتت بێجگە لە کفنت
نەما پۆشین و جلکت کوانێ کردنت؟
لەنێو گۆڕا بەغەیرەز تۆزە خۆڵێک
وەدەستت ناکەوێ چبکەی بەپوولێک
بەدڵ ئاهان دەکێشی داد و فریاد
دەکەی باسی کڕین و کردەوەت یاد
دەڵێ فەرزەندی دڵبەندم لە کوێی تۆ؟
برا و خوێش و خزمانم لە کوێی تۆ؟
نە منداڵێکە تا جوانیت بداتن
نە خزم و یارە تا کامت بداتن
بەبێ ناو ونیشان بێ دەنگ و بێ ناس
لەکلیی خوت ئەچێ و ئەمرێ لەسەرناس
بەڵان بۆ میللەتت کۆشای کە مردی
هەتا ڕۆژێ هەتا ماوی نەمردی
خودایا کۆمەگیم کە تا نەمردووم
وەدی بێنم چت و کارێ نەکردووم

هەتا بۆ میللەتی خۆم خزمەتی کەم
بەگیان و دڵ لە ڕێیان سەرفڕێ کەم
ئەگەر مردم دەچێ ناوونیشانم
بەغەیرەز تۆ نییە شەکوە و بەیانم
بەهاوارم وەرە ئەی ڕەستگارم
بدە دڵخوازی ئەو قەومەی هەژارم
خولاسە بزنەکەی فەرخوندە ئاسار
دەچوو تا خۆی گەیاندە بن گەلێک دار
مەڕێک هات بوو بەدۆست و هەم ئەنیسی
هەموو کارێکی وی بۆ خستە کیسی
هەتا سەرما نزیک بوو هەر شەو و ڕۆژ
لەنێو ئەو مێرگەدا بوون بێ گرە و تۆژ
بزن ڕووی کردە مەڕ پێی گوت بەیاری
وەرە خانوویێکی چاکەین تا نەباری
سبەی سەرمایە، باران و کرێوە
نەشێین خۆمان بەخێوکەین هەر لە جێوە
لە بۆ هەر جۆرە کارێکمان بەکارە
بلا دەست پێبکەین بێ پوول و پارە
بەتوندی مەڕ گوتی ئەی شێتی بێهۆش
لە سایەی جلک و بەرگی خۆمی داپۆش
چ ئیحتیاجیم هەیە دەستکەم بەقوڕدا
بکێشم ئەزیەتی دونیا بەسەردا
کە بزنی عاقڵ و دووربینی کارزان
بهیستی، پێکەنی لەو عەقڵی نازان
بەری خۆی دا بەجێیەک بزنی زیرەک
بینای نا خانوومان و دار و دیرەک

بەدەستووری ئەکابیر ژوور و هەیوان
بەخشتی سووری دانا کۆشک و سەیوان
ئەگەر هەر هێندەی بزنێک بزانین
دەکۆشاین بۆ ژیانی پاک و خاوێن
تەماشای پاش و پێشی کاروبارمان
بکەین تاکو نەمردووین شەو لە سەرمان
بزووت سەرما کە زستان هاتە پێشا
مەڕی ئەحمەق لە سەرمان جەرگی ئێشا
گوتی: ئەی یاری دێرینەم بەقوربان
جێگەی شان و سەرمکە بمدە ئامان
لە سەرما عەقڵ و هۆشم لێ بڕاوە
لە سەرما هێزی جارانم نەماوە
بزن پێی دا بەلان جێگای سەری کرد
بەشەو گورگێکی گەییێ دووگەکەی برد
سبەی هەڵسا بزن دی مەڕ خوراوە
بەغەیرەز پێست و ڕیخۆڵەی نەماوە
هێنای ڕیخۆڵەکەی کردە گوریس زوو
بەپێستی دەرگەکەی ڕێخست بەدەرچوو
گوتی: ئەی ڕۆڵەکانی شۆخوشەنگم
دەری خۆتان گرێدەن ناو و نەنگم
دەچم بۆ گیا دەرک بۆ کەس نەواکەن
لە دوژمن پڕ حەزەر بن نەک بەباکەن
بەسووکی پێی دەگوت: ئەی شەنگوڵی من
مەبە غافڵ لە مەکری دۆست و دوژمن
کە ویستم بچمە کێوێ گیانی دایە
لە گورگان خۆ بپارێزن لەلایە

لەسەر خۆتان گرێدەن دەرک و بانان
مەبن هێمن لە فێڵی گورگی نادان
لە دەرەوە گورگ دایم کینە جۆبە
هەمیشە مەتڵەبی ئەو گۆشتی تۆیە
لە من بێ ترس ئەگەر بێ، زوو بەزوویی
دەتانخوات بێ قسە و بێ ڕەزمجوویی
کە من وامزانی پێی شێت بووم و بێهۆش
لە ئایینی خێرەد دەرچووم ژەهرنۆش
ئەگەر بۆمان وەدی بێ دوژمنی بەد
دڵی وەک بەرد و بێ شەرم و ڕەحمسەرد
بەزوڵم و جەور دڵی گرت لێمەدا مشت
نە گیان و ماڵ و دڵ، دیلی دەبا گشت
لەنێو جەرگەی دەروونمان دایە دوژمن
تەواوی کیشوەری کوردی بگرتن
نە دەتوانی دەری خۆت لێ گرێدەی
نە مومکینە ئەویش بێ دەنگ دەرخەی
بەپیاوێکی دلێری ڕۆستەم ئاسا
هەیە بۆ کۆمەگیت دەست باتە داسا
نە جاماسپ هەیە دەردت بزانێ
نە کاووست هەیە دوژمن بەزانێ
نەکاوەیکت هەیە ڕاکا درەفشی
بوێراسپ ڕفێنی تاجبەخشی
گەلێک چاکی دەفەرموو عاقڵ و مەند
بوزرگە مێهر حەکیمی شیرەت و پەند
لە هەرلا دوژمنان لێت بوون کەمینگیر
بلندبە زوو وەدەستخە خەنجەر و شیر

خـــووايا چارەیی بێـــچـــارەیی تۆ
پەنـایی بێ کـــــەس و ئاوارەیـی تـۆ
مـــەڕی بێ شـــوان و بەرخی بێ خـــودانم
بـز و کـــــاریلەیی بێ گـــوێ و زبـانم
لە دەســـتی گـورگ و دڕندە و ســتـەمکار
بمانپـــــارێزە ڕۆژ و شـــەو ببـــە یار
عـــەزیزم بزنەکـە چوو گـەییـیـە دەشـتێ
بەچڕیان دەڕۆیـی دەیکردە گـــــشـــــتی
کــە دەرچوو دایکی گـورگی پڕ فـڕوفـێـڵ
بەســـــالۆسی دەهات هەروەکـــو دێـڵ
بەمـــاتە مـــاتە هات گـەییـیـــە بن دەر
تەمـــاشـای کـرد بەچاکی گـورگی بەدفـەڕ
کــــە هاتوودی کـــەوا دەرکـــەی ژەنیـــوە
لە ترســـان دەرک و بانی توند خـەنیـوە
بەنێـــرەنـگ و فـــســـوون و حـــیلەبازی
زبانی خـــۆش و شـــیـــرن کـــرد بەگـــازی
کـە ئەی شـەنگوڵ و مـەنگوڵ گـیـانی دایە
لە گـــوانا شـــیـــر زارم گـــیـــای تیـــایە
وەرن دەرگـــــا وەکـــــەن ڕۆڵە لـە دایـە
گـــەلێک مـــاندووم لە بۆت هێـــزم نەمـــایە
هەتا تیـــر شـــیـــرۆکـــەم کـــاری عـــەزیزم
تـەوانـای پـشـتن و بـۆ چۆک و هـێــــــزم
دەڵێ شـــەنگوڵ کـە دایکی ئێـمـــە شـینە
تـو زەردی دوژمنی ئێـــمـــەی بەکـــینە
دەچێـتــە مـالّی خـمگەر شین دەکـا خـۆی
بەچوســتی دێتـەوە ئەو گـورگی بەدخـووی

دەڵێ شەنگۆڵ کە دایکی ئێمە ڕەش بوو
ڕدێنیشی هەبوو دوو چاوی گەش بوو
بەلەز چوو خۆی لە قوڕ خست و گەڕاوە
دووبارە گورگی زاڵم هات بەتاوە
گوتی شەنگوڵ: ئەی زاڵم کە دایکم
سپی بوو وەک کولووی لۆکە بەخواکەم
بەتاو باز دەدا چوو گەیییە کوورێک
لەنێو قسلا دەگەوزی بوو سپی و ڕێک
گەڕاوە هاتە پشت دەرگا بەتوندی
گوتی دەرکێ وەکەن زووبن بەڕەندی
ددانم پڕ لە گیا ، گوان پڕ لە شیرە
دەم و گیانم لە بۆتان چاک و خێرە
جوابی داوە شەنگوڵ جەرگی پڕ خەم
نیشان دە دەست بزانم چنگە یا سم
لەوە ترسم هەیە بێگانە بی تۆ
بەدەنگت لێم خۆیانە دوژمنی تۆ
کە وەی بیست گورگی پڕ حیلە سەری برد
کەلێنی دەرکی لابرد دەستی تێ برد
گوتی: هانی تەماشاکەن بنۆڕن
لە دەست و پەنجە ئێستاکە دەنۆڕن
کە شەنگوڵ دەستی دی کردی گرینە
لە چاو فرمێسکی ڕیت ئەو دڵبرینە
گوتی پێی پێت وایە تۆ کە گورگی
لە بۆ تیرە و ڕەگەزمان دەرد و مەرگی
لە ڕووت دیارە کە بێڕەحمی و ستەمکار
لە ملتا خوێنی ناحەق سەدهەزار بار

ئەگەر دایکم بەشاخی تیژی وەک شیر
لە جەرگت دا دەزانی گورگی یا شێر
کەسوکارم بەڕاستی گەر وەخر بن
بەیەکدەستی لە بۆتان ڕێک بەدەربن
سەرۆکان و بزن و نێری لەگەڵ کوڕ
نە شێر و گورگ و ڕێوی، نە پڵنگ دوڕ
نە هرچ و نە بەرازان خۆ لە پێشیان
دەتوانن ڕاگرن دەمرن لە ئێشیان
بەڵام ئێستاکە هەرکەس چوونە کێوی
لە ماڵدا مانەوە چوار کەس هەتیوی
کە گورگی حیلەباز مەئیووس دەماوە
لە شەنگوڵی دەپرسی و دای سلاوە
بلێ شکڵی چەچەی دایکت چلۆنە
کەوا گازندەیی لێم، پێت درۆنە
گوتی پێی دایکی من پەنجە حەنایە
بەڕەحمە نەک وەکو تۆ بێ وەفایە
لە بۆمان زۆر بەدڵخۆشی دەکۆشی
لە پیسی و عەیب و عارمان چاو دەپۆشی
گەلێک دەستپاک و خاوێن هێندە مستی
خەتا و جەور و ستەم نایەت لە دەستی
دەچێت ڕەنگین دەکاتن دەست و پاشی
گەڕاوە دڵ بەکینەی چاو هەراشی
لە پشت دەرگایەوە دەستی درێژ کرد
بەناڵە و ئاهەوە دنیای قرێژ کرد
دەمێک دەستی بردە نێو کەلێنان
دەمێک زۆری دەدا چوارچێو بەکینان

له ڕێسمەی دەرکی توند کرد چەنگ و نینۆک
گـــرێژنەی دوو دەری ڕاکـــر بەزۆر ســـووک
بەســـەد نێـــرنگ و ئەفـــســـوون و بەهانە
بەپشت لێی دا وەبوو دەرگـــا و کـــولانە
لە ســـــەر بەدبین و زاڵم دەروە کـــــردن
لەگـەڵ نەفـسی تەمـیـز زوڵمـێکە مـردن
کـــە ڕێی دوژمن لە ســـەر مـــاڵت کـــراوە
ژیانت مـــەرگـــە خـــزمت ســـەربڕاوە
لە دەست بێگانەدا هەر کـەس کـەمـاڵی
وەکـــو کـــۆرپە لە دەست گـــورگـــا دەناڵی
ستـــەمگەر گـورگی بێ دینیـان کـە نۆڕی
لە گـیـانی خۆشەویستـیـان دەست دەشۆری
دەڵێـن کـــاریلە حـــەیوانە و نەزانیت
نە دوژمـن نـاســـە، نـە چاکـــە دەزانێت
ئەگـــــەر پیـــاوێکی زانا وەک ئەوان با
دەبوو زوو تێگەیشـــتـــبـــا چی خـــراپا
بـەڵام نـــە دۆســـت نــە دوژمــن دەنــاسـن
لەبەر کیـبـر و حـەسـەد بێـهـۆش و کـاسن
لەگـــەڵ دوژمن ڕەفـــیـــقن دوژمنی دۆست
لە خـــۆ ناگـەن دەیانگـوورون لەنێـــو پوست
بەڕاســـتی گـــورگ کـــەوتە نێـــو هەژاران
پەلامـــــارێکی بردە بەرخی جـــــاران
لەگـــولوێنە خـــزا زوو کـــاکـــە شـــەنگوڵ
لە تەندوورا وەشـێـرا گـیـانی مـەنگوڵ
بەچەنگو دەم دڕی تیـــــتـڵ خـــــوراچوو
پەلی کـــرد بیـبـڵ و خـــواردی و بەدەرچوو

وەرن ئەی قـەومی مـەزلووم هوشـیـار بن
لە گـورگی ناگـەهان پەرهیـز و کـار بن
کـە بێکەس بـوو دەیانخـۆن گـورگ فـەرزەند
لە دەسـتـو دەردەچێ روحی جگەربەند
لە بۆت دێ دوژمنی پڕ مـەکـر و حـیلە
دەگـاتە نێـو ژن و منداڵ چوسـیلە
وەکـو گـورگـێک بەچنگ و کـەڵبـە و دەم
دەخنکێنێ لە بۆت گـا و بزن و یەکـسم
نەدەسـتـێکە لەگـەڵ ئەو بێ و بەشـەڕ بێ
نە پێی چووین هەیە هەڵبێ و بەدەربێ
بەفـیـتنە و حـیلەبازی یەک لە دووی یەک
دەگـیـرێن و دەچن هەریەک بەدەست یەک
لە سـەحـرا چون گـەڕاوە بزنی هوشـیـار
کـەوا ژوور خـاڵیـیـە نە کـوڕ نە دیار
نە شـەنگووڵ و نە مـەنگووڵی دیارە
نەقـاپە و کـەوچکە نەخـوانچـە پارە
بەدەنگی بەرز بانگی کـرد و گـریا
لە خـۆی دا شین و دادی کـرد بەهوریا
لە گـوڵبین دەرکـەوت شـەنگوڵ بەنووزە
لەنێـو تەندووریدا مـەنگوڵ کـرووزا
وتی ئەی دایکی دڵسـۆتی جگەرغـەم
مـەپرسـە چن بەسـەرهات بێ تۆ یەکـدەم
لە دەست گورگی لەعـینی بەد سـەرئەنجام
بـەنـاخـی ئـەرزیـا چـێ نـاوی بـەدنـام
ئەوەندە ئەزیەت و جـەوری منی دا
بەکـاک و خـوشکەکـانم سـەد ئەوەندا

بەچەند حیلە و درۆ و ڕەنگ هاتە پێشێ
لەکن ئەو مەکری شەیتان بوو بەپووشێ
هەتا دەرکی وەکرد ئەو گورگی کافر
نەما ڕۆژی ژیان و تەن هەموو مر
بەپەنجەی زوڵمی ئەو چوو کاکە تیتڵ
بەخوێنی کردە ڕەنگین دادە بیبڵ
لە ترسا چوومە نێو گوڵبینی تەندوور
هەتا گیان بێ لە ئافات و بەلا دوور
نەمردم سەد خراتر بووم لە مردن
کە کاکە و دادەیی منیان دەبردن
کە بیستی ئەو بەلایە بزنی عاقڵ
بەهاوار کردی گابۆر داخ لە سەر دڵ
کە داخم بۆ تۆ تیتڵ پارە جەرگم
لە بۆ بیبڵ نەماوم یاخوا مەرگم
بەهەردەم غەمڕەوێنی من بەقوربان
بەشەو غەمخوار و یاری من بەقوربان
ڕەفیقی دڵگوشاکانم بمردبام
نەوەک وام بیستبا یانە بەبەرد بام
لە کوێن ئەی تیتڵ و بیبڵ لە دایێ
ئەنیسی ڕۆژگاری باب و دایێ
بەشەو هەمدەنگ، ڕۆژ ئارامی گیانم
ژیان و کۆرپەڵەی من شیر لە گوانم
وەرە ئەی تیتڵی دایکت لە کوێی تۆ
چکۆلە و قشپلانەی من لە کوێی تۆ
لە کوێی ئەی زینەتی دامێنی دایکت
لە کوێی ئەی غونچەیی بێستانی دایکت

وەرە ئەی شۆخوشەنگی مامزی من
وەرە ئەی چاو هەڵۆی ڕەوکەوی من
کچم بیبڵ کوڕی شا لایقت بوو
کوڕم تیتڵ کچی شا عاشقت بوو
چ غەدداریکە ئەو زوڵمەی لە من کرد
ستەم کێشتی نەمامی وا قەڵەم کرد
ئەگەر گەردوونی ئەجزات کوت بەکوت کەم
ئەگەر شێری فەلەک بێ گۆشتی لەت کەم
ئەوەی گوت دەرکەوت چوو بانی ڕێوی
گوتی: ئەو کێیە سەربانم دەپێوی
دەڵێ ئەوە من منم منمن منۆکە
دوو چاوم پێوەیە زۆر بزبزۆکە
دوو شاخم پێوەیە تیژ وەک ڕمۆکە
دوو گوێی گەورەم هەیە پان وەک بڕۆکە
بزانم کێیە خواردی تیتڵی من
دەبێ زوو بێتە مەیدانی شەڕی من
ئەڵێت نەمخواردووە من تیتڵی تۆ
نەدیمە پێشێ بۆ جەنگ و شەڕی تۆ
لەوێ ڕۆیشت، بۆ بانی گورگ چوو
تەپە و سمکوڵی دەست پێکرد و هات چوو
لە خوارێ گورگ بانگی کرد بەهاوار
بەبێ ترس و خەوف خونخواری غەددار
گوتی: کێیە لە سەربانم دەچێ و دێ
تەپا تەپ بۆ چییە بێ عەقڵی بێ جێ
بزن وەک هەور قیژەی کرد و ڕاسا
گوتی: ئەی گورگی پیسی حەق نەناسا

له بۆ چی خـــۆت وەشــــارد و چوویە لانە
وەرە دەر بـۆم مــــــەهێنـە هیـچ بـەهانـە
لە بۆ خــواردت تۆ تیــتـڵ و بیــبــڵـی من
لــە بــۆ بــردت جــگـەر پـارە و دڵــی مــن
بڵێ بێــچــوولەکــانی من لە کــوێنە
بڵێ منداڵی شـــیـــرخـــۆرم لە کـــوێنە
وەرە تـا داخـی خـــــــــۆمـت پـێ بـڕێـژم
زگت بـدڕم لە خـــوێنت هەڵـبکێــــشم
بە تۆڵـەی تـیــــتـــــڵم چاوت دەرێنم
لە باتی بیـــبــڵم پێـــســـتت گــورێنم
کــە بیــســتـی لێـدوا ئەو گــورگی بەدخـوو
لەنێـــو مـــاڵی دڵێــــدا کـــردی هوهوو
کـــە ئەی نـازان تو چەندە هەرزەبێـــژی
لەبەر بێ عـەقـڵی مـەستی و گـێـژ و وێژی
دەرێـژی ئـاخـــــــوداخت دوور بـەدووری
لەوان لاف و گـــەزافـــان هیـچ نەبووری
ئەویــســتـا پێت نیـشـاندەم حـاڵی تیـتڵ
ئەتۆش داوێمـــە نێـــو چالاوی بیـــبڵ
ئەوەی گوت گورگ لە ماڵی خۆی بەدەرچوو
خـەتای کـرد چونکە ڕێگای بۆ خـەتەر بوو
بزن شــیـــری لە مل کـــرد و مـــەتاڵی
لە بۆ شەڕ شـاخی خۆی تیـژ کرد و مـاڵی
لە بۆ شـەڕ چوونە مـەیدان هەردوو دوژمن
وەکـو شـێـر لێکخـوڕین ببـڕی تەن و من
دوو لا وەک پیل گـەڕانە نەعـرەکـێـشـان
بەوێنەی هەوری نیـــســـانێ خـرۆشـــان

لە بۆ یەک کـوشـتنی دڵیـان دەجـۆشـا
زرێ و خــەفــتـــان و پۆڵایان دەپۆشـــا
بەنەعـرە و قـیــژە مـەیدان پڕ لە دەنـگ بوو
دراوسێ و خـزم و خـۆیشـانیـان وەخـڕ بوو
دەڵێن ئەو کـێشـەیەی هەنگۆ لە مـەیدان
تەواو نـابێ وەرن بـۆ کـن ســـەرۆکـــان
بەعــورف و عــادەتی تیــرە و ڕەگــەزتان
وە دەسـتـخـەن تۆڵەیی کـارێ لە سـەرتان
چ حـوکـمی دا بەهەنگۆ حـاکـمی شـەرع
وەرن هەردوو تەرەف گوێ بدێرنە سەر شەرع
بـەدادە ڕێـکـوپـێـکـی هـەر ژیـانـێ
نـەپرســـینـە دەرۆخـێ دوودەمـــانـێ
ئەگـــەر پرسین و یاری و یەکـــدڵی بوو
نە گـورگ نە شـێـر و ڕێوی تەریبـــوو
قـــەراری ئەهلی ئاوایی بەجـــارێک
درا ســـوبحـــەی بڕۆینە تەک بەکـــارێک
بزن گـــەڕیاوە مـــاڵ و شـــیـــری دۆشی
لە بـۆ یـاری هـەوێـنی کـــــرد و پۆشی
گـورگ ترسـا لە قـازیی چاو بەسـورمـە
کـە چاوی پێکەوێ بیکاتە سـیـرمـە
دەزانـی پیـــاوی عـــاقـڵ بز هەژێرن
لە زوڵم و ناحـەقی هەر گـورگـە ژێیـرن
دەلەرزێ گـــورگی خـــاین لەو قـــسـانە
نـەمــــا ڕێـگـای هـەڵاتـن نـە بـەهـانـە
دەڵێن هەمـبـــانەیەکی پڕ لە با کـــرد
دوو دانە نۆکی خسـتێ و دەرکی بەند کـرد

چووە کن قــــازی ســـــۆزی بەربەیانـی
گـــوتـی: قـــوربان ژ بۆ تەم تووتـن ئانـی
ئەمــە تـووتنێکی چاکــە و بۆنـی خـۆشــە
کــە بیکێــشی دەڵێی عــەتر و بنەوشــە
لە شـــاوور و شنۆ نێـــریم لە یەکـــدان
گـولاوم لێ ڕشـاند و کـردمــە هەمـبـان
کـــە قـــازیی کـــردیەوە دەرکی هەمـــەبانە
لـــەپـڕ دەرچـــوو لــە چـاوی دا دوو دانــە
بەجـــارێک هەردوو چاوی کــوێر دەبێتن
ڕقـی گــــــورگـی لـە دڵـدا زۆر دەبـێتن
بزن هەڵســا هەڵی گـرت دێزەلێک مـاست
بەدیاری بردی بۆ قـازی و تکای خـواست
دەڵێت قـازیی: کـە گـورگـی مـایە فـیتنە
بەنۆک دوو چاوی کـوێر کـردم چ گـوتنە
دەڵێن هەندێک لە مـاسـتی دا لە چاوی
هــەلات ڕوون بـۆوە دەیـدی زۆر تــەواوی
ئەوێستـە حیلە شـەرعێک ساز دەکەم من
نەمــێنێ ڕێی قـــــە بۆ گــورگی دوژمن
بەحـوکم و ئاییـنی حـەفـتـا و دوو تیـرە
دەدەم فـتـوا کـە کـوشتنی گـورگ خـێـرە
ئەمــە ڕۆژێکە وەخــتـی ئینتــیـقـامــە
دەبێ ئەمـــڕۆکــە ژینی کــەی تەمـــامــە
بەهەر حــیلە و فــڕوفــێـلـێکە ئەی بز
لە بۆ مـردنی قـسـوور ناکـەی تە هەرگـیـز
لە ئاسن جـــووتە شــــاخـــێکی نەبزدا
سـەری تیـژ کـرد و چەندی مـاڵومـشت دا

دوو شاخی کول لبادی بۆ گورگ کرد
وتی بۆ کوشتنی گورگم شەرع کرد
بەتالووکە ن ِبسی قازبی قاقەز
لە بۆ جەلبی گورگ هێنانی بوو فەرز
کە هات ئەو گورگی زاڵم خاینی دین
لە پۆتراکیان بەست شاخی لبادین
هەموو منداڵ و گەورەی شار وەخڕ بوون
سەرۆک و ڕیش سپی هەند خۆش و گەڕبوون
گورگ دوو چاوی زەق کردن لە بزنی
بەتوندی تێی خوڕی تۆ چی نە بزنی
لە بیرتان چوو بەشەو لوورەم لە شاخان
هەموو شەو ژان و برکم بوو لە داخان
هەمیشە پارووی من بوو، پاک و پیسوو
برێسن چەندە، هەر خاوە گوریسوو
کە بۆم هەڵکەوتبایە بوو دەهاتم
یەکێکم لێ دەخواردن، هەڵدەهاتم
لە میری خۆ بکە شەرم و حەیایان
مەبە مایەی شەڕوشۆڕ و هەرایان
لە گەورە تا چکۆلە هەر خوراون
لە دەست تیرەی گورک مردوون و نەماون
ئەوێستە حاڵی پێشووت پێ نیشاندەم
بەگازێک خۆم و خۆتت پێ نشاندەم
لەپێشدا سەد هەزار فێڵم دەدیوە
بەشەو تاکو دەگەیە جنسی ئێوە
هەنووکە ڕۆژی ڕوونە و ئەمری قانوون
لە پێش چاوان نەتت کەم سپڵەیی دوون

وتی بزنی زرنگی دڵ بریندار
ئەمە مەیدانی جەنگە شێتی غەددار
لە بۆت مەعلووم دەکەم چۆن بێ ژیانت
نە ڕەحمت پێدەکەم نادەم ئەمانت
دزی ڕێگر شەقی پڕ مەکر و حیلە
هەمیشە زوڵم و خوێنخواریت وەسیلە
نە ڕۆژی جەورە ئەمڕۆ، نەفڕوفێڵ
بەشاخێک پێت دەڵێم گوڵی وەیا دێڵ
گەلێک لاف و گەزافیان کرد لە یەکتر
بەسەر یەکدا گورین دوو پیاوی شەڕکەر
بەناکاو لێی دا بز دوو شاخی سەر دڕ
دەڵێی بردت لە کوپێکدا لە ئاو پڕ
بەشاخ ورگی دڕی هەم لەتلەتی کرد
لەنێو جەرگ و هەناوی کوتکوتی کرد
لەنێو ڕیخۆڵە دەرکەوتن دوو فەرزەند
کە تیتڵ و بیبڵن ئەولادی دڵبەند
ئەگەر زوڵم و جەفا هەر کەس کە کردی
بەبێ شەرم و حەیاو ئەندێشە کردی
بەچاوانی دەبینیتن جەزایان
دەبێ ڕۆژێک بەپاداش گا هەموویان
خراپە هیچ مەکە تا بەد نەبینی
مەچێنە تۆی بەدی تا دڕک نەبینی
ئەگەر هەرکەس دڵێکی پڕ جەفا کرد
لە ئاخردا دەزانێ چەند خەتا کرد
لەگەڵ جنست مەکە زوڵم و جەفا قەت
ئەگەر لێت دەن لە ڕێگادا بەبێ لەت

ئەگـەر كـارێكی ناچیـزەت لە خـۆ دی
لەبەر بێ عـیلـمـیـیـە تێبگە نەفـەوتی
كـە زانیت عـیلم و عـیـرفـانت تەواوە
مـەدە رێگا بەزوڵـمـێكی كـە مـاوە
كـەگـورگـێک لێت بخـوا منداڵ لە ماڵی
تە تە دبیـر بیكوژە یا هەر بناڵیس
كـە تەدبیـرت هەبوو زاڵم چەوا كـا
دەگـەوزێ وەک ئەسـیـرانت لە خـاكـا

***

ئەوەم رێكخـست كـە تا منداڵ بخـوێنن
بزانن ژیـن چیـیـە لێی رانەمـێنن
بز و ئەو گـورگـە بۆم بوونە بەهانە
نموونەی ژینی كـوردانە فـەسـانە
كـە تا منداڵی كـورد هەر شـێخ و گـەورە
بزانـن تێـبگـەن هەرچەندی جـەورە
ئەوەندەی مـیر و مـەزن و كـاربەدەست بێت
خـراپی و چاكـەیی مـیللەت لەوان دێت
لە كـاری گـەورە چاوی خـۆ دەپۆشن
لە هیچ وپووچی وەک مـەنجـەڵ دەجـۆشن
عـەدوومـان گـورگـە مـیللەت بزن و كـارین
لە ژێر چەنگاڵی جـەهلا زارخـوارین
لە خـۆمـان رِوودەدا ئێـمـەین وەسـیلە
دەلیلی گـورگ و مـەكـر و فـێڵ و حـیلە
وەكـو بزنێک نەشێن حەقمان بخـوازین
لە مـەیدانی خـودیدا شـیـر و بازین
ئەگـەر گـورگـێک بخـوا پەنجـا هەزار كـیژ
هەمـوو بێدەنگ دەبن هەروەک ژنی پیـژ

کە ئێوە دەنگ نەکەن خۆ ڕانەستێنن
دەبێ بمرن هەمووتان خۆ پسێنن
ڕەئیس و عێل و مەئموووران و خاوەند
لە بزن و گورگ بگرن عیبرەت و پەند
بەبێدەنگی و پەرێشانی کە خەوتن
نە عیلم و مەعریفەت نە پێشکەوتن
لەگەڵ یەک کیبر و بوغز و یەک نەکێشان
بزۆتی ئاورن بۆ زام و ئێشان
هەموو دنیا دەبێتە گورگی خونخوار
وەکو دووگی مەڕن نەک بزنی شاخدار

***

تەواو بوو بەیاری خوا

ڕواندز لە مزرەکەی زاری کرمانجی دامەزرا - ١٣٤٦

کتێبانێکی کە لە گەڕەکی مزرەکەی زاری کرمانجی لە ڕواندزدا دامەزراون و دەفرۆشرێن:

| | قران |
|---|---|
| * پێشەوای ئاین | ٤ |
| * عەقیدەی ئیمان | ١ |
| * ئەحمەدی | ٢ |
| * کەڵەباب | ١ |
| * غونچەی بەهارستان | ٤ |
| * خۆشی و ترشی | ٢ |
| * دەوری سەڵتەنەت و مێژووی سوڵتان شوجاعباز | ٢ |

***

کتێبانێکی کە لە ژێر دامەزراندندان:

* مێژووی بنەماڵەی سەلاحەدینی ئەیووبی.
* مێژووی ڕواندز و میرانی سۆران.

# ئاورێکی پاشەوە

**(بەندی دووەم)**

حکوومەتی بەرزەکانی

کردەوەی خێوی زاری کرمانجی

**سەید حوسێن حوزنی موکریانی**

١٠ی تەمووزی ١٩٢٩ / ٦ی موحەڕەمی ١٣٤٨
ڕواندز لە مەزرکەی زاری کرمانجی دامەزرا
(نەشریاتی زاری کرمانجی ١١)

( بەندی دوەم )

* حکومتی بەرزەکانی *

* کردەوەی خیوی زارکرمانجی *

مکریانی

— »«»« —

١٠ تموز ١٩٢٩ ٦ محرم ١٣٤٨

« رواندز لە مەزرکەی زارکرمانجی دامەزرا »

( نشریات زارکرمانجی ١١ )

## مێژووی شارەزوور لە قروونی وستادا

## وە

## سەربهوردی حەلوان و دینەوەر

دینەوەر: لە بیست فرسەخ زیاتر دووری هەمەدان هەڵکەوتووە. لە دەوری مەدەنیی ئیسلامدا شارێکی گەورە و خۆش و ئاوا بووە، هەروەکو لە سەربهوردی عولەمایاندا دێتە گوتن، گەلێک پیاوانی گەورەی تێدا پەیدا بووە. ئەو شارە ئەمڕۆکە وێرانەیە. شەمسەدین سامی لە یاقووتی حەمەوی دەگێڕێتەوە کە ئەو شارە سێ چەندانی هەمەدان گەورە بووە.

حەلوان: یەکێک لە شارانی گەورە و بەناوبانگی کوردان بووە لە شارەزووردا سەدو نەوەد کیلۆمەترە و لە ڕۆژهەڵاتی بەغدا واقیع بووە. شارێکی گەورەتر لە بەسرە و کوفە و سامەڕا و بەغدا(؟) بوو. کاولەکانی لەسەر ڕێگای بەغدا کە بۆ کرمانشا دەچێ لە کەنار یەکێک لە چۆمەکانی «دیالە» هەڵکەوتووە. گەلێک کانی گۆگردی هەیە. هەنجیری گەورە و چاک و هەناری بێ وێنە و باشی هەیە.

لە گەلی و دۆڵێکی ڕێگای پێدا دەچێتە نێو شارەوە. دوو دار خورمای بەناوبانگی هەبوو کە هەموو شوعەرایانی ئەو دەمانە پێیان هەڵگوتووە. ئەو شارە لە پێش ئیسلامەتیدا بەگەلێک زەمانان هەبووە.

لە چاخی حەزرەتی عومەردا، هاشیمی کوڕی عەتەبە کە زاوای سەعدی وەقاس بوو، بەسوڵح لە ساڵی ١٩ یان ١٧دا گرتی؛ ئەویش زۆر چاخان حاکمی بوو. گەلێک عولەما و زانا لە حەلوان دەرچوون لە جێگای خۆیدا باس دەکرێن.

یەکێک لە عولەمایانی ئینگلیز «راو لنیسق» ناو، لە وێرانە و کاولەی حەلواندا چەند جێگاییێکی کۆڵی بوو؛ ئاسارێکی زۆری کوردان و ئیسلامانی لێ دەرخستبوو. لە گرتنی ئەو شارە هەتا چاخی دەرکەوتنی حکوومەتی بەرزەکانی، لە تەرەف والی کوفەوە بەئیدارەییێکی تایبەتی ڕاگیرا بوو.

## بەندی دووەم

## مێژووی (تەئریخ) حوکمدارانی دینەوەر و شارەزوور

## (٣٣٠-٤٦٠ھ)

یەکێک لە میران و گەورەییێکی کوردی شارەزوور ناوی ئەمیر حوسێن بوو. لەنێو کوردستانی شارەزووردا فەرمانڕەوایی دەست پێکرد و لە هەموو لایەکەوە کوردی دەوروپشتی لە خۆی کۆکردنەوە. لە ساڵی ٣٣٠ھ دا تەپڵی سەربەخۆیی لێدا. هێندێک جاران لە دینەوەر و گەلێک چەلان لە شارەزووردا حوکمداریی دەکرد. لە هەموو خاکێکدا میر حوسێن بەرزەکانی ناوبانگی [دەر] کرد و بەسەخاوەت و بەخشیش و بەئازایی و زرنگی خۆی نواند و ڕۆژ بەڕۆژ هێزی پەیدا کرد و سوپا و چەکی فرە بوو. زەوی و خاکی ئەلێک کەوتە دەست و پۆل پۆل کوردەواری پەنایان بۆ دەبرد و دەبوونە ژێر فەرمانی.

ئەلموقتەفی بیللا ئیبراهیم خەلیفەی عەباسییان کەوتە ئەندێشە و بیرەوە، لەشکرێکی قورسی ڕێکخست و لە ژێر فەرماندەی ناسرودەولەی وەزیری خۆیدا ناردیە سەر ئەمیر حوسێن بەرزەکانی. لە یێکەمین شەڕدا لەشکری خەلیفە شکا و زۆر بەشپرزەیی و پەرێشانی کەمێکی ڕزگار بوو و گەڕاوە بەغدا و گەلێک ئەسباب و تالان کەوتە دەست ئەمیر حوسێن. ئەمیر حوسێن بەو سەرکەوتنە بەهێزتر بوو، پیاوەکانی زرنگتریان دەستخست و چاویان لە شەڕ دەکراوە [و] ترسیان نەما. ئەمیر حوسێن لەشکری ناردە سەر چەند قەڵایانی شارەزوور و کردنیە لەشکرگا و لە پاش ئەو شەڕە ئەمیر حوسێن زل بوو؛ لەشکری ڕێکخست و بناغەی حوکمداریی قایم کرد. جار بەجارێ لە دەوروپشتەوە جێگای فرە دەکرد و لەشکری زۆر دەکرد و قەڵا و کونگرانی توند و سەخت دەکرد، هەتا بەجارێک خاکی هەموو شارەزوور و دینەوەری بەدەوروپشتەوە خستە ژێر پەنجەیەوە و فەرماندەی لەسەر هەموو شار و قەڵایانی دانا؛ سەر ڕەقانی نەرم کرد. کەسێکی لەو خاکەدا بەرابەری بکربا نەمان.

لە ساڵی ٣٣٨ھ دا موعیزودەولەی بووەیە لەشکرێکی گرانی هەڵگرت و چووە سەر

ئەمیر حوسێن؛ هەردوو لا بۆ کوشتار ڕووبەڕووی یەک بوون. لە پاش گەلێک کوشتار و یەکتر قڕکردن، موعیزوددەولە بەناچاری مامڵەتی خواست، بەنابەدڵی و پەرێشانی گەڕاوە. بەڵام هەتاساڵی ٣٤٠ ئەمیر حوسێن لەگەڵ شەڕ و شۆڕ و کوشتار خەریک بوو؛ ئاسوودە نەبوو. لەو ساڵەدا حەسنەوی کوڕی خۆی کردە سەرکردەی سوپا و ناردیە سەر سنووری دینەوەر، لە پاشی چەند جێگاییێکی دیکە وەدەستهێنان بەشاد و دڵخۆشییەوە گەڕاوە دینەوەر. هەمیشە لە بڵند بوون و گەورەیی دەکۆشان و تخووبی زەوی و خاکی بەردەستیان لە دوژمن دەپارازت. هەتا ساڵی ٣٤٨ھ ئەمیر حوسێن بەرزەکانی بەئامرزشی یەزدان شاد بوو؛ حەسنەوی کوڕی بوو بەحوکمداری شارەزوور و دینەوەر.

## حوکمداری حەسنەوی کوڕی ئەمیر حوسێن

کە ئەمیر حوسێن بەرزەکانی لە ساڵی ٣٤٨دا مرد، حەسنەوی لە دینەوەر بوو. بەلەز هەموو لەشکر و سوپاهی لەسەر خۆی کۆکردەوە و لە جێگای بابیدا بوو بەحوکمدار و هەموو خاکی لە ژێر دەستیدا بوو. گەڕا قەڵا و جێگایانی دامەزراند و گەڕاوە دینەوەر.

موعیزوددەولەی بووەیە کەلێنی دەستکەوت و لەشکرێکی شەڕکەری لەژێر فەرماندەی نەیال گوشدا لە عارەبانی حەمدانی تەعلەبی لە مووسڵەوە نارده سەر شارەزوور. حەسنەوی لە ڕۆژاوای هەولێر پێشوازی کردن و گەیشتنە ئەوان و هەردوو لا سازی شەڕ بوون و بەگژیەکدا چوون. لەشکری نەیال شکا و بەپەرێشانی گەڕاوە مووسڵ. لەو شەڕەدا گەلێک تاڵان کەوتە دەست حکوومەتی کوردان. موعیزوددەولە کە لەوە ئاگادار بوو، قوشەنێکی ڕێکخست و لە بەغداوە ناردیە سەر دینەوەر و گەلێک دێهات و ئاواییانی تاڵان کرد و سووتاندنی و زۆری ئەزیەتی کوردان دا. حەسنەوی لەولاوە بۆ پێش پێگرتنیان لەشکری ناردە دینەوەر؛ بەڵام بەخت یار بوو. لەولاوە ڕوکنودەولەی بووەیە کۆمەگی لە موعیزوددەولە خواستبوو کە بچێتە سەر کوردەکانی «گورگان». چونکە ڕوکنودەولەیان شەپەرزە کرد بوو. موعیزوددەولە لەبەر ئەوە ناچار ما بینای مامڵەتی لەگەڵ حەسنەوی دامەزراند و بەشەرتی ئەمە کە لە خوتبەدا ناوی موعیزوددەولە بخوێندرێتەوە.

حەسنەوی کەلێنی دەست کەوت و لە مامڵەتکردن جیر بوو، لە پاش گەلێک هەڕەشە و چاوڕاو، موعیزوددەولە چەند گەورە و سەردارانی بۆ تکا و پاڕانەوە ناردە لای حەسنەوی و ٥٠ هەزار دینار و دراوی مامڵەتانە بۆ حەسنەوی نارد. لەسەر ئەوە حکوومەتی کورد و بووەیەکان بوونە سوێندخۆری یەکتر و گرێی دۆستایەتییان گرێدا.

لە ساڵی ٣٥٦دا حەسنەوی لەگەڵ عیزودەولەی کوڕی موعیزودەولە نێوانیان تێکچوو، شەڕێکی قورسیان کرد و عیزودەولە شکا و جێگا و جەلالی حەسنەوی زیادی کرد و ماڵ و دەولەت زۆر بوو. لە هەر چوار کەنارەوە خاکی فرە کرد. گەورەیی خۆی بەهەمووان نواند؛ زەبەردەستی و ئازایی کوردانی نیشان بەدۆست و دوژمن دا. نەیارانی چاوترسێن کرد.

لە ساڵی ٣٥٧ دا بەختیاری دەیلەمی بۆ ڕێککەوتن لەگەڵ کوردستانی شارەزووردا چووە نزیک تخووبی کوردستان و لە حەسنەوی گێڕاوە کە حەز دەکەم پێکەوە ڕێککەوین. پیاوانی زانا کەوتنە نێوان و لەسەر چەند ماددەیەک ڕێککەوتن. بەختیار چەند دیارییەکی نرخ گرانی پێشکەش بەحەسنەوی کرد؛ بوون بەدۆست. لەودەمەدا تەعلەبی حەمدانی لە تەرەف مووسڵەوە تەمای سەرکێشیی هەبوو؛ هێندێک ڕەوەندی عارەبانی لەسەر خۆی گرد کردبوونەوە کە بچێتە سەر مووسڵ. عیزەدین بەختیار لەو بابەتەوە داوای یارمەتی لە حەسنەوی کرد. ئەویش بەشەرتی کە سنووری هەتا سەر «زاب» فرە بکا و زێی بادینانی نێوان مووسڵ و هەولێر تخووب بێ. لەسەر ئەوە پێکهاتن.

حەسنەوی بەلەشکری کوردەوە چووە سەر مووسڵ. تەعلەب کە وای زانی ڕوو بەبەغدا هەڵات. نایب بەختیار کە لە بەغدا بوو بەوەکالەت دانیشتبوو، بەلەشکرەوە بۆ تەعلەب دەرکەوت و بەیەکەم هەڵمەت تەعلەبی شکاند. لەولاشەوە حەسنەوی و بەختیار کەوتنە دووی تەعلەب و هەڵیانبڕی و هەتا لە شاری «ڕەقە»یان پەستاوت. هەرچەندە عەشیرەت و ڕەوەندی عارەبیان کەوتە سەر ڕێگا پەرێشانیان کردن، لەولاوە بەتاڵانێکی بێ ژمار گەڕانەوە مووسڵ و حدوودی کوردستان لە ڕۆژئاواوە بوو بە زێی بادینان.

حەسنەوی بەفەتح و زەفەرەوە گەڕاوە هەولێر و کاروباری حکوومەت و مەملەکەتداریی ئەو جێگایانەی ڕێکخست و دەورەیەکی بەشارەزووردا و گەڕاوە دینەوەر.

ڕوکنودەولەی بوویە لە موعاهەدەی بەختیار و حەسنەوی کە کرا بوو، دڵگیر بوو؛ لەشکرێکی کۆکردەوە و لە ساڵی ٣٥٩دا لە ژێر فەرماندە و سەرداری عەمیدوەزیردا ناردیە سەر حەسنەوی تاکو بەهەر جۆرێک بێ، خاکی شارەزوور و دینەوەری لە ژێر پەنجەی حەسنەوی دەرخا و بنچینەی حوکمداریی بەرزەکانی فڕێدا.

حەسنەوی کە ئەوەی بیست دانیشوەرانی کۆکردنەوە و چلۆنایەتی دوامایی ئەو کارەی لێ خواستن کە چۆن بکەن کار نەکەوێتە شەڕ و کوشتار. هەموو گەورە و بیرتیژەکانی دەست و پێوەندی حەسنەوی لەسەر ئەمە قەراریان دا کە شیر و خەنجەر وەشاندن بۆ ئەمڕۆکەی

حکوومەت بەچاک نایێتە بەرچاوان و وا چاکە بەنوازش و دڵداری ڕوکنودەولە لە فیکری شۆڕش وەپاش بخەن. بۆ ئەوە دوو پیاوی زرنگیان هەڵبژارد و ناردیانە کن ڕوکنودەولە و بەناوی تەدبیر ئاگری فیتنەیان کوژاندەوە و ڕوکنودەولەیان لەوە گێڕاوە پاشێ.

حەسنەوی حوکمدارێکی بەئیدارە و خێرخواهـ و میللەت پەروەر و زرنگ و بیر تیژ بوو. خاکێکی بەدەوڵەت و حەشەم کە لە ژێر حوکمیدا بوو ئەمانە بوون: «ئاهواز، خوزستان، نەهاوەند، ئەسعەد ئاباد، دینەوەر، شارەزوور». حەسنەوی بەدراو و سەرمایە و ئەسپاب و لەشکرێکی بێ ژمار و ڕێککەوتوو لەسەر ئەو زەوی و شارانە حوکمفەرما بوو. بەتەدبیر و مەشوەرەت بەخوێندن و هەڕەشە و بەخشش و داین و بەئازایی و زرنگی خۆی، ڕەعیەتپەروەری دەکرد و مەیدانی دەستدرێژی لە دوژمنان بڕیبووەوە و هەموو دراوسێکانی بەچاکە ڕادەگرت و نەیدەهێشت دوژمنی بۆ پەیدا بێ و حکوومەتێکی ئازادی (مستقل) دامەزراند و خوتبەی لەسەر مینبەران بەناوی خۆی دەخوێندەوە و سکە و پارەش سەر بەخۆی هی خۆی بوو کەسێکی نەدەناسی.

لە ساڵی ٣٦٧دا بەختیاری بووەیە لە دەست عەزودولدەولەی ئامۆزای لە بەغدا دەرکەوت و هەڵات و پەنای بۆ حەسنەوی برد. ئەویش هەرچەند بۆ بەرەی کاری خۆی ڕێگای دا، بەڵام یارمەتی نەکرد. نەیال گوش لەگەڵ حەسنەوی ڕێککەوت کە: لەشکرێکی بداتێ لەگەڵ عەزودولدەولە بەشەڕ بێن. ئەگەر سەرکەوتن چەند پارچەیەک زەوی لە خاکی هەمەدان بخەنە سەر حکوومەتی بەرزەکانی. بەو مەرجە حەسنەوی سوپاهێکی بەراو کرد و لەژێر سەرداریی «ئەبو نەجم بەدر»ی کوڕیدا ڕێکی خست و بەختیاریشی لەگەڵ خست و چوونە سەر عەزودولدەولە. لەولاوە عەزودولدەولە هات و پێشی پێ گرتن و شەڕ دەست پێکرا، «بەدر» زۆر خراپ شکا و بەشپرزەیی گەڕاوە. بەختیار کەوتە دەست عەزودولدەولە و بەئەزیەت کوژرا. نەیال گوش بەهەزار مەرارەت و دەردەسەری ڕزگاری بوو و گیانی لە مردن ڕەها کرد و خۆی لەو گێژاوە دەرهاوێژت و هەڵات. لەو شەڕەدا زۆر کوژران و چەند سەردارێک نەبوون بوون. بەدر و چەند سەرکردەیەک بەپەرێشانی دەرباز بوون و ڕوو بەشارەزوور هەڵاتنە پاشەوە.

بەڵام ئەو شەڕ و کوشتارە سوودی کوردانی تێدا بوو؛ چونکو بەو شەڕە شۆڕش کەوتە عێراقەوە و عەزودولدەولە چوارچاو کرا و نەدەپەرژا ڕوو لە کام لا کا. حەسنەوی لەو فرسەتەدا ئیستفادەی ئەمەی کرد کە خۆی بەچاکی کۆکردەوە و هەموو دەوروپشتی

سەرحەدانی خۆی بەلەشکر قایم کرد و ڕۆژ بەڕۆژ لەشکری زیادی دەکرد و بۆ هەلّمەتێکی دیکە خۆی ساز دەکرد. زیاتر لە خۆی ئاگادار بوو و هۆشێکی هاتەوە بەری.

عەزودولدەولە بەسەرکردەیی «ئەبولوەفا» لەشکرێکی قورسی لە مووسلّەوە ناردە سەر شارەزوور و بەپەرێشانی و بلاّوەیی گەڕاوە مووسلّ و گەلێک زەرەر و زیانی لێ کەوت. شارەزوور بوو بەنشیمەنی لەشکر و قوشەنی زلی کوردان و هەمیشە سوپاهێکی زەبەر دەستی ئازای لە گەلێک قەلاّ و شارانیدا دادەنیشت. حەسنەوی بەسەربەستی و ئازادی هەتا سالّی ٣٦٩ حوکم فەرمایێکی موستەقیللی کرد. حەسنەوی لە ٣ی ڕەبیعی یەکی سالّی ٣٦٩ھ دا مرد.

## حوکمداریی ئەبو نەجم ناسرودەولە بەدر ٣٦٩ - ٤٠٥ھ

بەدر کە حەسنەوی بابی مرد، بەئیتفاقی سەردار گەورەی مەملەکەت و سوپاه، لە جێگای بابیدا بەحوکمداری کوردی بەرزەکانی قەرار گیر بوو؛ دەستی بەڕێکخستنی لەشکر و پێکهێنانی مەملەکەتداریی کرد و ژێردەستانی شاد و سەرکردانی دلّخۆشی داوە و بەلوتف و میهرەبانی لەنێو دلّی میللەتدا جێگیر بوو. دوو مانگ لە پاش دامەزراندنی ئومووری مەملەکەت، لەشکرێکی ناردە سەر چەند قەلاّیێکی ڕۆژئاوای هەولێر و چەند جێگایانی لە دەیلەمییان گرت.

لە سالّی ٣٧٦دا شەرەفودەولەی دەیلەمی لینگی دا سەر «ئاهواز» کە لەوێوە بچێتە سەر بەغدا. هەتا بەدر تەدارەکی دی و خۆی ساز کرد، شەرەفودەولە ڕوو بە بەسرە تێپەڕی. بەدر لەسەر ئەوە لەگەلّ خەلیفەی بەغدا کە تایعولّلای عەباسی بوو موخابەرەی کرد. خەلیفە لە ژێرەوە ئیتفاقێکی پەنهانی چاکی لەگەلّ بەدر کرد کە دەیلەمییەکان ئاگادار نەبن.

بەدر بەقووەتێکەوە چووە سەر ئاهواز و خوزستان و دووبارە خستنیەوە ژێر فەرمانی. لە سالّی ٣٨٨دا بەدر بەدەورویشتی خاکی خۆیدا سوورێکی دا و چەند زەوییەکی واسیعی خستە دەست، لە ژێرەوەش زۆر بەتوند و چالاکی لە ڕێکوپێکی و چاکە کاری حکوومەت خەریک بوو.

لە سالّی ٣٨٩دا عەمیدودەولە لەتەرەف دەیلەمییەکانەوە ناردرا سەر خوزستان. ناسرودەولە لە بەهائودەولەی بووەیە نوبسی و خەلیفەش کەوتە نێوانی و بەبێ شەڕ خوزستانی گەڕاندەوە ژێر فەرمانییەوە.

لە ساڵی ٤٠٥ دا ناسرودەولە چووە سەر حوسێنی کوڕی مەنسوور لە قەڵای «کۆسجەد»دا دەورەی دا. [چاخی] زستان و بەسەرما و تەڕ و تووشی بوو. ڕێگای گەڕانەوەی نەما و نەشیا قەڵاش بگرێ و بەناچاری پەرێشان بوو و هەڵات و گەلێک ماڵ و ئەملاکی کەوتە دەست میللەتی جوزەقان و بەبڵاوەیی گەڕاوە. ناسرودەولە هەر لەو ساڵەدا مرد.

## هیلالی کوڕی بەدر ناسرولدەولە

هیلال کە ناسرودەولەی بابی مرد، بەبێ کێشە بوو بەحوکمداری دینەوەر و شارەزوور. هەروەکو گوتمان لە زەمانی باوکیا مەملەکەتەکەی کەوتبووە ژێر دەسایەوە. هیلال بەتەدبیر و هێز و توندی خۆی خاوێنی کردەوە.

لە ساڵی ٤٠٢ دا لەشکرێکی قورسی کۆکردەوە و تەمای فرەکردنی مەملەکەتی هەبوو. فەخرودەولەی وەزیر لە بەغداوە لەشکرێکی گرانی هەڵگرت و چووە سەر هیلال. لە پاش کەمشەرێک هیلال لە دەست فەخرودەولە بەدیل گیرا و لە شارەزووردا حەپسیان کرد و تاهیری کوڕیان کردە حوکمدار. بەگرتنی هیلال ئەهالی شارەزوور بڵاوەیان تێکەوت.

کوڕێکی هیلال بەماڵ و منداڵەوە هەڵات و چووە نێزیک شاری دەیلەمان و مەوجودیەتێکی تەشکیل کرد. ئەو جێگایە بەناحیەی برادۆست ناوبراو میرانی برادۆست و سۆما لە نەژادی ئەو کوڕەن.

کە هیلال لە دەست دوژمن بوو، شەمسودەولەی کوڕی فەخرودەولەی خێوی هەمەدان تەمای گرتنی شارەزووری کرد و کەوتە سەر هەوەسی ئەوە کە بەتەواوی بیخاتە ژێر پەنجەی خۆیەوە. لەولاشەوە جەلالودەولەی وەزیری بەغدا کە ئەوەی بیست، بەگورجی هیلالی لە حەپسخانە ڕزگار کرد و لەشکرێکی قورسی بۆ ڕێکخست و ناردیە سەر شەمسودەولە کە تۆڵەی لێ بکاتەوە. پاش خۆ گرت کردنەوە، هیلال لەشکری هەڵگرت و چووە سەر شەمسودەولە؛ لە هەردوو لاوە کوشتار دەست پێکرا. لە مەیدانی شەڕدا هیلال کوژرا و لەشکری شەمسودەولە گەلێک خراپە و زوڵمی لە کوردان کرد و گەلێکی کوشتن.

## تاهیری کوڕی هیلال

هەروەکو گوترا کە هیلال لە شارەزوور بەند کرا، تاهیر بوو بەجێگانشینی باوکی؛ بەمەئمووری حوکمداریی مەشغووڵ بوو. چاخێکی هیلال بەردرا، تاهیر حوکمدار بوو کەلە

لە مانگی زیلحیجەی ٤٠٦دا بابی کوژرا، تاهیر پەنای بردە لای جەلالودەولە. بەیارمەتی جەلالودەولە قووەتێکی کۆکردەوە و گەڕاوە سەر مەملەکەتی خۆی.

لێرەدا ئەو بنەماڵەیە بوونە دوو پارچە. محەمەد ئەبو فەتحی کوڕی عەیازی کوڕی حوسێن کە بەسەرداری قشوون ڕایدەبوارد، بەڵام چونکو ئەویش کوڕە بابێکی ئەوان بوو، بەهەواداریی حکوومەتی شارەزوور لە کەلێن دەگەڕا. بەڵام ئەو ڕۆژەی [بە] کەلێنی زانی، لەگەڵ جەلالودەولە قاقەز نویسی کرد کە مەملەکەتی شارەزوور بخاتە دەست خۆی. لەو دەمانەدا تاهیر لەگەڵ بەهائودەولە بەشەڕ هات و بەدیل گیرا و کەوتە حەپسەوە.

بەهائودەولە کە بیستی محەمەد ئەبو فەتح لەگەڵ جەلالودەولە ڕێک کەوت، بەئەمری شەمسودەولە تاهیر بەردرا و لەشکرێکی چاکی بۆ ساز کرا و ئیستقلالی کوردستانی شارەزووری بۆ تەسدیق کرد و ناردیە سەر مەملەکەتی خۆی. محەمەد ئەبو فەتح لەولاوە - کە لەسەر عەشیرەتی کوردی شادسنجانیکان گەورەیی دەکرد -لەشکری شاد سنجانیکانی کۆکردەوە و لە ژێر فەرماندەی فارس ئەبو شۆکی کوڕیدا ناردیە سەر تاهیر. هەردوو لا بەشەڕ هاتن.

لەو شەڕەدا فارس شکا و تاهیر شار و مەملەکەتەکانی کە لە دەست چوو بوون، گرتنیەوە دووبارە ئەبو شۆک هێزی پەیدا کرد و چووە سەر تاهیر؛ دیسان خۆی پێ ڕانەگیرا و بەکەمشەرێک شکا. ئەبو شۆک خزم و زاواکانی لە خۆی کۆکردنەوە و جاری سێیەم لینگی دا سەر تاهیر، لە شەڕ کردندا تاهیر بەدەست ئەبو شۆک بەکوشت چوو.

## بەدری کوڕی تاهیر

بەدری کوڕی تاهیر کە بابی کوژرا، هەڵات و چووە تەرەفی قرمیسین (کرمانشا) و گەلێک کوردی لەسەر خۆی کۆکردنەوە. لەو لاشەوە ئیبراهیم نەیال یارمەتی دا و گەڕاوە بەزۆر دینەوەر و دەوروپشتی خستەوە دەست و گەلێک جێگایانی تریشی گرتن. ئەحوالی ئەو لە باسی ئەبو شۆکدا دێتە گۆتن.

## محەمەد ئەبو فەتح

محەمەد ئەبو فەتحی کوڕی عەیازی کوڕی حوسێن لە ساڵی ٣٨١ھ تاکو ٤٠١ھ بەئەمری ناسرودەولە لە شارەزوور و قرمش و قرمیسین بەسەردار سوپاهی ڕایدەبوارد. فارسی کوڕە گەورەی ئەبو فەتح لە حەلوان و ئەتراف سوپا سالار بوو. دەمێکی حکوومەت برازاکانی لە

ئیجرائات و بەرزیدا بوون. ئەبو فەتح لەگەڵ دڵخۆشیدانەوەی ئەهالی فارس لە خۆنواندن و خۆچاک نیشاندان و میللەت مەمنوونکردن دەکۆشا. بەو جۆرە باب و کوڕ هەموو کەسیان خستبووە دەست و لە ژێرەوە بنچینەیەکی زۆر ساغیان دامەزراند بوو، ئەبو فەتح ڕەوشتێکی چاک و ڕێگاییێکی ڕاستی و ڕزگاری نیشان بەبرا و کوڕەکانی دابوو. هەتا ساڵی ٤٠١ھ لە کۆشش و کردەوەی هێز پەیداکردن و کەڵێن وەدەستهێنان بوون.

## فارس حوسامودەولە ئەبو شۆک

فارس کە بابی مرد لەسەر ڕەوشتێ کە بۆی دانابوو، دەستی کردە فەرماندەیی لەگەڵ تاهیری کوڕی هیلال کە پادشای حەسنەوی بوو؛ بناغەی نەیاری دانا و دەستدرێژی بۆ ماڵ و موڵکی تاهیر کرد.

وەکو گوترا تاهیر لە دەست بەهائودەولەی دەیلەمیدا بوو؛ شەمسودەولە بەری دا و کردیە پادشای شارەزوور و دینەوەر. ئەبو شۆک چوو حەلوانی کردە پایتەختی خۆی و لەگەڵ مەملەکەت ڕێکخستن و سوپاداری خەریک بوو. تاهیر لەو لاوە لەشکرێکی زۆری بەراو کرد و چووە سەری ئەبو شۆک و لە بەرابەریدا خۆی پێ ڕانەگیرا و شکا و ڕووی لە هەڵاتن کرد؛ بەڵام تاهیر نەکەوتە سەری و گەڕاوە شارەزوور.

ئەبو شۆک دووبارە چووە حەلوان و لەشکرکێشی کرد و هاتەوە سەر تاهیر و هەڵمەتی بردێ و دیسان خۆی پێ ڕانەگیرا و بەشپرزەییەوە شکا. تاهیر ئەمجارە دەستی لێ بەرنەدا و کەوتە سەری، تاهیر هەتا گەلێک جێگایانی لێ گرت و خستنیەوە ژێردەستی.

دوو ساڵ لەو شەڕە بەسەر چوو. ئەبو شۆک بەناچاری مامڵەتی کرد و دۆستایەتی هێنا پێشەوە و زاوایەتییەکی خستە نێوانی و بەموسالەحە ڕێککەوتن و دۆستایەتییەکی خۆشیان پەیدا کرد. هەرچەند لەپێشدا ئامۆزایەتی هەبوو، بەڵام ئەمجارە کە بەزاوایەتی چاکتر بناغەی دامەزراندەوە.

ئەبو شۆک لەو خزمایەتییە کەلێنی دەستخست و بەپەنهانی دەستی بەخۆ ڕێکخستن کرد و هەموو پێویستییەکی ساز کرد و لە ناکاو لینگی دا سەر خاکی شارەزوور و گەلێک زەوی و خاکی لێ گرت و لە مەیدانی شەڕدا تاهیر کەوتە دەست ئەبو شۆک و مۆڵەتی نەدا و کوشتی. دینەوەر و شارەزوور لەو دەمەوە کەوتە ژێر فەرمانی ئەبو شۆک و بوو بەتێکەڵبووی خاکی حەلوان.

لە ساڵی ٤١٤ھ دا عەلائودەولەی کوڕی کاکەویە بەلەشکرەوە چووە سەر هەمەدان و لەگەڵ شەمسودەولەی کوڕی بوویە بەشەڕ هات و بەسەریدا دەست درێژی کرد و زاڵ بوو و گەلێکی خاک و زەوی لێ گرت و لەوێوە چووە سەر دینەوەر و دەوروپشتی گرت. ئەهالی شار کۆمەگی لەشکری ئەبو شۆکیان کرد و شەڕ دەست پێکرا و مووودەتی ٨ ڕۆژ لەسەر قەڵای دینەوەر کوشتار کرا. ڕۆژی نۆیەم عەلائەدین بەکوشتار خۆی خزاندە دینەوەرەوە و دەستی بەتالان و سووتاندنی شار کرد و گەلێکی جەور لە میللەتی کوردی دینەوەر کرد.

بەزۆر شاری دینەوەری لە ژێر پەنجەی ئەبو شۆک دەرخست. لەشکری ئەبو شۆک بەشکاوی ڕوو بەحەلوان کشانەوە. ئەبو شۆک کە ئەوەی بیست لەوە زیاتر شەڕ نەکردنی بەچاکتر زانی لە قالبێکی سیاسیدا قاقەزێکی لە موشەڕەفودەولەی وەزیر نووسی و ناردیە بەغدا کە بێتە مایەی دەرکردنی عەلائودەولە بەبێ شەڕ. موشەڕەفودەولە کە قاقەزی ئەبو شۆکی وەرگرت دەستبەجێ ناردیە لای عەلائودەولە کە دینەوەر بەردا و بەبێ شۆڕش و شەڕ بگەڕێنەوە دواوە. موشەڕەفودەولە کە وای زانی، لە دینەوەر دەرکەت و چووە هەمەدان.

ئەبو شۆک دووبارە دینەوەری خستەوە دەست و دەستی بەڕێکوپێکی شار و قەڵا کردەوە و ئەهالییەکی کە بڵاوەیان تێ کەوتبوو، کەم کەمە کۆی کردنەوە و بەبێ ئەزیەت حوکمداریی کرد.

لە ساڵی ٤٢٠ھ دا قەبیلەی «غەز»ی -کە تورکمانانی دەربەدەر بوون- لینگیان دا سەر شار و زەوی «ڕاجیس» (تاران) و گرتیان و تالانیان کردن و ڕوو بەهەمەدان ڕۆیشتن و ئەوێشیان گرت و ئوستراباد و دینەوەر کەوتنە ژێر تەنگانەی غەزییەکانەوە. لە هەموو لایێکەوە بزۆزی و شۆڕش و سەرکێشی کرا.

ئەبو شۆک لە ژێر فەرماندەی ئەبو فەتحی کوڕی خۆیدا، لەشکرێکی ئازا و شەڕکەری ڕێکخست و ناردیە پێش غەزیەکان. ئەبو فەتح چونکە لاوێکی خۆشڕووی بیر تیژ بوو، لەم شەڕەدا زانین و ڕووخۆشی و ڕەوشت چاکی لە کوشتار و توندی پێ چاکتر بوو؛ لە پێشدا زۆر بەنەرمی و لاواندنەوە خۆی بەغەزیەکان دا بەناسین و لەشکرەکەشی بەفێڵ دابەش کرد؛ هەتا لە ناکاو دەورەی لێ گرتن و دەستی بەکوشتاریان کرد. بەکەمچاخێک گەلێکی کوشتن و دیلێکی زۆری لێ گرتن و هێندێکی کەمیش بەهەڵاتن ڕزگار بوون.

ئەبو فەتح کە لەو شەڕەدا سەرکەوت و دینەوەری خستەوە دەست، گەڕاوە خزمەت بابی. خەلیفەی عەباسییەکان کە بیستیان غەزیەکان لە دەست ئەبو فەتحدا پەرێشان بوون،

خەلاتێکی ڕازاوەی گرانبەها و شیرێکی گەوهەربەندی لەگەڵ لەقەبی حوسامودەولە بۆ ئەبو شۆک نارد. ئەبو شۆک سکە و خوتبەی بەناوی خەلیفەوە دایە لێدان و خوێندنەوە و ڕۆژ بەڕۆژ ڕووی لە بەرزی و پێشکەوتن بوو؛ بەموڵک و میللەتداری خەریک بوو. گەلێکی خزمەت بۆ کوردستان هەبوو، تیجارەت و چاندن و کڕیاری زۆر لە فرەیی بوو. ئەمنیەت و ئاسایشی لە خەرج و باج و گرانباری ئاسوودە بوون، حوسامودەولە لە ساڵی ٤٣٠هـ دا لەشکرێکی قورسی دا بەئەبو فەتح و ناردیە سەر قرمیش و دەوروپشتی و بەزۆری باسکی، قرمیش و چیا و کێوان و ئەو جێگایانەی گرت و خستیە سەر دینەوەر و بەشادی و خۆشی گەڕاوە خزمەت باوکی.

حوسامودەولە ئەبو فەتحی کوڕی کردە نایبی خۆی و ناردیە سەر دینەوەر و دەوروپشتی و چووە دینەوەر و قەڵا و جێگایانی سەختی توند قایم کردن، هەتا لە دوژمن و سەرکێشانی بپارێزێت و ڕۆژ بەڕۆژیش ئەمنیەت و ئاسایشێکی چاکی خستبووە نێو میللەتەوە. لە هەر کەس دوو دڵ بایە و بۆنی خراپییەکی لێ کردبایە دەچووە سەری و پاکی دەکردنەوە و وردە دوژمنەکانیشی بەخۆشی و توندی دەهێنا ژێر فەرمانەوە.

موهەلهەلی برای حوسامودەولە بەتایبەتی لە قەڵای «بکورا» دادەنیشت. ئەبو فەتح چووە کنی و بەخۆشی بەمامی گوت کە قەڵا تەسلیم بکا. موهەلهەل نەیدا و توندی نواند و کار لە دۆستایەتییەوە بوو بەدوژمنایەتی و لە خزمایەتی بوو بەکوشتار و خوێنڕێژیی. هەردوو لا بۆ شەڕ کردن لەشکریان لە بەرابەر یەکتر ڕاگرت. مام و برازا بەگژ یەکدا چوون. لە پاش گەلێک کوشتار و خوێنڕێژتن، برازا بەدەست مام گرفتار بوو. لەشکرەکەی ئەبو فەتح بەبلاوەیی و پەرێشانی گەڕانەوە و هێندێکیش کوژران و کەمێکیش بەدیل گیران.

لەشکرە شکاوەکە چوونە کن حوسامودەولە و سەربهوردەکەیان بۆ گێڕاوە. حوسامودەولە کە بیستی موهەلهەلی برای ئەوەی کرد، لە هەموو لایەکەوە لەشکری دەنگ دا و سوپاهێکی قورسی کۆکردەوە و چووە سەر موهەلهەل. لەولاوە موهەلهەل لەگەڵ عەلائودەولەی کاکەوی موخابەرەی کرد و کۆمەگی لێ خواست. عەلائودەولە لەوە خۆشحاڵ بوو، چونکو لە کەلێن دەگەڕا. بەقوەتێکی چاکەوە هەڵمەتی بردە سەر حوسامودەولە و بەشەڕ کردن دەوروپشتی قرمیسین و دینەوەری گرت و لە دوای گەلێک جەنگ و جوان لە ساڵی ٤٣٢دا ئەو خاکەی لە حوسامودەولە گرت و هێنایە ژێر فەرمانی خۆیەوە.

حوسامودەولە کەم کەمە هێزی پەیدا کردەوە و بەرگ و چەکی کوردی ئەو جێگایانەی

کۆکردنەوە تاکو نەکەونە دەست دوژمنەوە؛ لەولاشەوە سەرخابی برای دەستی بەسەرکێشی کرد و گەلێک جێگا و زەوی لە حوسامودەولە گرت. لە هەموو لاییێکەوە برا و برازا و خزم لە حوسامودەولە ڕوویان وەرگێڕا و دەستیان کرد بەتالآن و گرتنی جێگایان.

حوسامودەولە لەگەڵ جەلالودەولەی وەزیری بەغدا ڕێک بوون و کۆمەگی یارمەتی لێ خواست. جەلالودەولە بەکەم سوپاهێک کۆمەگی کرد. کە ئەو لەشکرە گەیشتە حەلوان، موهەلهەل ناردیە لای عەلائودەولە کە یارمەتی بدا. جەلالودەولە لە موهەلهەلی گێڕاوە لە دینەوەر با لە دەست عەلائودەولە بمێنێ و زەوی و خاکێکی کە دەمێنێ لەگەڵ براکانی بەش کا و چیدیکە نەبێتە مایەی شەڕ و کوشتار.

موهەلهەل بەقسەی جەلالودەولە قاقەزێکی لە حوسامودەولەی برای نووسی کە مامڵەت کەن. لەولاشەوە خەلیفە و جەلالودەولە کەوتنە نێوانیان و نێوبژیان کردن و پێکیان هێنان و لە نێواندا دوژمنایەتییان لابرد و دووبارە بنچینەی ئاشنایەتی و برایەتییان دامەزراندەوە و مودەتێک بەو جۆرە ڕابرا.

چونکە ئەبو فەتح لە قەڵای بێزارشا بەند کرا بوو، حوسامودەولە لە پاش چەندێک خۆی کۆکردەوە و ڕووی کردە شارەزوور و دەورەی قەڵای بێزارشای دا و وەتەنگی هێنا و هەموو ڕێگایانی هاتوچۆی گرێدا و لە چوار کەناری قەڵاوە مەنجەنیقی دامەزراند و قەڵای بەردە باران کرد.

ئەبو قاسمی کوڕی عەیاز، خێوی قەڵای بێزارشا لەگەڵ حوسامودەولە کەوتە موخابەرەوە و لە پاش گەلێک موخابەرە هەردوولا بەمەیان بڕیەوە کە ئەبو قاسم، ئەبو فەتح بەردا و بیداتەوە دەست بابی کە حوسامودەولەیە. ئەبو قاسم بەو فێڵە حوسامودەولەی لەسەرخۆ لابرد و حوسامودەولە باوەڕی پێ کرد، بەبێ ئەمە کە ئەبو فەتح وەرگەڕێتەوە ڕوو بەناحیەی «سند» جڵەوی وەرسووڕاند و چوو.

ئەبو قاسم کە حوسامودەولەی فریودا و لای برد، قاقەزێکی لە موهەلهەل نویسی و چلۆنەتی خۆی و حوسامودەولەی لێ گێڕاوە، موهەلهەل بۆی نویسییەوە کە بەهێندی نەگرێت و جوابی نەداتەوە و ئەبو فەتحیش بەرنەدات.

حوسامودەولە لە پاش گرتنی سند چووە سەر «سەلمەغان» و ئەویشی خستە ژێر حوکمەوە و جڵەوی ڕوو بەخاکی موهەلهەل وەرگەڕاند و تەواوی خاکی ئەوی گرتن و خستنیە ژێر پەنجەی خۆیەوە و دانیشوەر و زانا و ڕیش سپیانی میللەتی کورد کەوتنە نێوانی هەردوو

برایان و پێکیان هێنان و مامڵەتیان پێ کردن. حوسامودەولە لە پاش ئەو مامڵەتە گەڕاوە حەلوان.

ئیبراهیم نەیال لە کرمان بوو، بەئەمری «ئەرتوغروڵ» بەگی سەلجووقی لەشکری کۆکردەوە و چووە سەر هەمەدان و بەبێ شەڕ گرتی.

گەرشاسپی کوڕی عەلائودەولە لەگەڵ جوزەقان چوونە لای ئیبراهیم نەیال و ئیتاعەیان کرد. لەو دەمەدا حوسامودەولە لە دینەوەر بوو؛ چووبووە قرمیسین. بەهاندانی گەرشاسپ ئیبراهیم کەوتە سەر گرتنی دینەوەر و لەشکری دەنگ دا و ڕوو بەدینەوەر چوو و لە پاش کەم شەڕێک گرتی.

حوسامودەولە کە ئەوەی زانییەوە لە قرمیسینەوە گەڕاوە حەلوان. ئیبراهیم چوو قرمیسینیشی گرت و خستیە ژێر ئەمری خۆیەوە. ئیبراهیم کە قرمیسین و دینەوەری گرت قووەتی زیاد بوو، ئەوجا ڕووی کردە حەلوان.

حوسامودەولە لە حەلواندا شەڕ کردن و بەرابەریی ئیبراهیمی بەچاک نەزانی و حەزی لە فەوتانی میللەت نەکرد و حەلوانی بەردا و ڕوو بەقەڵای «سیروان» چوو؛ لەوێدا خۆی خستە کەلێنەوە. ئیبراهیم دەستی جەور و ئەزیەتی بەسەر میللەتی کورد درێژ کرد، کە چووە حەلوان هەمووی تالان کردن و لەوێشەوە ڕوو بە«زەمیرە» چوو و ئەوێشی گرت و هەموو ئەو خاکە پاکەی تالان و وێران کرد.

حوسامودەولە لەگەڵ موهەلهەل کەوتە موخابەرەوە کە بەهەر جۆرێک بێ ڕێککەوتن مایەی ڕزگاری و ئاسوودەگی هەردوو لایانە؛ چونکو دوژمن دەست بەرنادا. بەناشوکری نەبێ لەو دەمەدا ئەبو فەتحی کوڕی حوسامودەولە بەمەرگی خۆی لە بەندیخانەدا مرد. موهەلهەل بەئەمە کە حوسامودەولە دڵی پاک بێتەوە و دڵنەوازیشی بدا، بەسوێند خواردن، پاکانەی بۆ کرد و لەبەری پاڕاوە لە گوناهی خۆش بێ و دڵی ڕەنجیدە نەکات، گرتی ئەبو غەنایمی کوڕی خۆی نارده لای؛ ئەگەر باوەڕ نەکات ئەبو فەتح بەمەرگی خۆی مردووە، ئەو کوڕە لە باتی ئەبو فەتح بکوژێتەوە.

حوسامودەولە ئەوەی زانی و عوزری لێ قەبووڵ کرد و ئەبو غەنایمی دڵخۆشی داوە و بەخشیشی. لەسەر ئەوە هەردوو لا پێکهاتنەوە و گرێی برایەتییان گرێ داوە. لە پاش ئەو مامڵەتە، موهەلهەل بەهەموو لەشکر و ژێر دەستیەوە کەوتە بن فەرمانی حوسامودەولە و هەر دوو برا بەدڵپاکی بوون بەیەک و لەشکریان کۆکردەوە بۆ لابردنی دوژمن ڕێککەوتن و

بۆ بەرابەری ئیبراهیم نەیال خۆیان ساز کرد.

لەودەمەدا «سەرخاب»ی برایان چووە سەر سەعدی کوڕی حوسامودەولە کە لەسەر «بەندنچین» حاکم بوو. بەشەڕکردن دەورەی بەندنچین و ئەترافی دا. سەعد بەبێ کێشە قەڵای دا بەمامی. سەرخاب بەگرتنی ئەو جێگایانە شکەستەییێکی تەواوی دا بەبراکانی. لەسەر ئەوە حوسامودەولە تەمای شەڕی نەکردەوە و لەگەڵ برای بەشەڕ نەهات. سەرخاب بەحوکمداریی ئەو جێگایانە بەسەری برد.

## حوکمداری موهەلهەل

لەساڵی ٤٣٧ھ دا حوسامودەولە لە قەڵای سسیروان مرد و لەوێشا ناژتیان. موهەلهەل لە پاش مردنی برای لە جێگای ئەو بەحوکمداریی دانیشت. کوردەکانی شارەزوور بەبێ کێشە سەریان خستە ژێر فەرمانییەوە. چەند کەسێکی شەڕخواز سەعدی کوڕی حوسامودەولەیان خەڵەتاند و خستیانە سەر هەواداریی حکوومەت و سەرکێشی لە مامی. لە بنەوە بۆ ئەمە کە مەملەکەتەکەی بابی بخاتەوە دەست بزاوتیان.

سەعد لەسەر ئەوە بەدزیەوە قاقەزی لە نەیال نوبسی و خۆی خستە ژێر بەختییەوە. کە موهەلهەل بوو بەحوکمدار و لەگەڵ ڕێکوپێکی و مەملەکەتداری خەریک بوو، ئیبراهیم نەیال گرتی شاری قرمیسینی دا بەبەدری کوڕی تاهیری پادشای بەرزەکانی حەسنەوی و کردیە پادشای ئەو خاکە (هەروەک لە پێشدا باسی کرا).

موهەلهەل لە ساڵی ٤٣٨ھ دا خۆی کۆکردەوە و بەلەشکرێکی قورسەوە چووە سەر بەدر و قرمیسینی دەوردا. بەدر هەڵات و قرمیسین بەبێ شەڕ کەوتەوە دەست موهەلهەل. لەشکر و قوەتێکی نەیال لە نزیک قرمیسین هەبوون؛ چوونە سەر موهەلهەل و بەکەم شەڕێک بڵاوەیان تێکەوت و دیل و تالانێکی زۆر کەوتە دەست موهەلهەل و بەشادمانی گەڕانەوە قرمیسین.

موهەلهەل کە سپاهی نەیالی شکاند، گەڕاوە پایتەخت و ژنی حوسامودەولە کە دایکی سەعد بوو هێنایە ژێر مارەیی خۆبەوە تاکو ڕێگا بەدەسایسی دوژمن نەیەتە ڕوو.

موهەلهەل لەگەڵ کوردی شادنجان بەدرەفتاری دەکرد و زۆری ڕوو نەدەدانێ، ئەوانیش چونکو هەمیشە خۆیان لە پێش هەموو کەسدا دیتبوو، بەو بێ میهرەبانییەی موهەلهەل دڵگیر بوون و زۆری پێ مات بوون و لە بەهانەیەک دەگەڕان.

لەولاشەوە سەعد ببوو بەهاودەنگی نەیال و هەواداری حوکمداریی بوو. ئیبراهیم نەیال لە عەشیرەتی تورکمانی غەز لەشکرێکی بۆ سەعد ساز کرد و ناردیە سەر حەلوان. سەعد بەو لەشکرە چووە سەر حەلوان و لە پاش شەڕ و کوشتار، موهەلهەلی لە حەلوان دەرپەڕاندەوە خۆی لە حەلوان خزاند. لە پاش ئەمنیەت و ئاسایشی شار لەسەر مینبەر خوتبەی بەناوی نەیال خوێندەوە، ئینجا لە پاش ڕێکخستنی حەلوان بەئەسپاییەوە ڕوو بەدەشت خشا و دەستی بەدێهات گرتن کرد.

موهەلهەل لەولاوە لەشکرێکی شەڕکەری هەڵگرت و چووە سەر حەلوان و بەزۆر هێنایەوە ژێر حوکمی خۆیەوە و گەلێکی لە غەزەکان کوشت و تالانێکی زیادی دەستخست و خوتبەی بەناوی خۆیەوە دایە خوێندنەوە و هەوادارانی سەعد و نەیالی گرتن و بەندی کردن.

سەعد لە پاش ئەوە چووە سەر مەملەکەتی سەرخاب -کە مامی خۆی بوو- دەستی بێعاری و ڕووتکردنی درێژ کرد و بوو بەمایەی فیتنەیەکی خراپ. خاکی موهەلهەل و سەرخاب کەوتە ژێر بڵێسەی ئاگری سەعدەوە و گەلێک جاران حەلوانی لە موهەلهەل دەگرت و دووبارە موهەلهەل دەیگێڕاوە ژێر فەرمانییەوە؛ بەو جۆرە چاخێکی دەوری دەوام کرد.

دوژمنێکی کە بۆ میللەتی کورد لە کەلێندا بوو ڕۆژێکی وای ئارەزوو بوو، لە هاندانی سەعد پاش نەدەکەوت. سەعدی خەڵەتاویش وەکو گۆیەک لە دەست دوژمناندا لە سووڕاندا بوو، هەتا لە دوای ئەزیەتێکی زۆر سەعد کەوتە دەست سەرخابەوە و گرتی و خستیە نێو بەندیخانەوە.

ئەبو عەسکەری کوڕی سەعد کە تەماشای کرد بابی لە دەست مامەکانیدا کەوتە بەند و گیرەوە، لە هەموو لایەکەوە دەستی بەسەرکێشی کرد و شۆڕشی خستە نێو خاکی مامەکانی و کوردانی ماهەکی لەبەر دەستدرێژی وەتەنگ هاتبوون و کەوتبوونە ژیانێکی واوە کە ماڵ و منداڵیان بێزار بن. بەناچاری لە ژێرەوە قاقەزیان لە ئەبو عەسکەر نویسی و بەمامڵەت پێکەوە ڕێککەوتن و کوردی ماهەکی بوونە پشت و هێز بۆ عەسکەر.

سەرخاب لەوە ئاگادار نەبوو، لە هەراسان بوونی ئەو میللەتە نەگەیشتبوو، لەناکاو ماهەکییەکان سەرخابیان گرت و دایانە دەست ئەبو عەسکەر و بۆ خۆشیان کەوتنە لایەک. ئەبو عەسکەر زۆر بێ وەفایی و خراپەی لەگەڵ مامی کرد و سەرخابی بەدیاری بۆ نەیال

نارد. نەیالیش دەزیەجێ هەردوو چاوی سەرخابی کوێلی و خستیە زیندانەوە.

لەولاوە ئەبو عەسکەر سەعدی بابی ڕزگار کرد و بەلەشکرەوە چوونە سەر حەلوان و گرتیان و کردیانە پایتەخت. ئەبو عەسکەر لە پاش گرتنی حەلوان چووە کن نەیال و تکای بۆ سەرخاب کرد و لە زیندانی دەرخست و بەئیحترامەوە بردیە لای خۆی.

غەزەکان کە تەماشای بزووتنی مام و برازا و حوکمدارانی بەرزەکانیان کرد کە دەمیان تێک ناوە و پشێوی و شەڕی خۆبەخۆیە و کەس ئاگای لە کەس نییە، خۆیان کۆکردەوە و بەگەلە هەڵمەتیان بردە سەر حەلوان و دێهاتانی و خراپە نەما نەیکەن؛ گەلێکیان ماڵ و چت دەستخست و ئاوایی ئەو لایانەیان هەموو وێران کرد. بەتاڵان کردن ڕوو بەبەغدا کشان و بەکوشتار و تاڵانکردن و ئاوایی سووتاندن، دەوروپشتی بەغدایان وەتەنگ هێنا. لە بەغداوە لەشکرێکی قورسیان نارده سەریان و گەلێکیان لە غەزەکان کوشت و پەرشوبڵاویان کردن.

لە ساڵی ٤٤٣ھ دا موهەلهەل هەستا چووە بەغدا و لەگەڵ ئەرتوغروڵ بەگی سەلجووقیدا پێکهاتن کە خاکانی شارەزوور، سیروان، داقووقا، ساماغان و دەوروپشتیانی حوکمداریەکی سەربەخۆ و ئازاد بێ و قەڵای ماهەکی بۆ سەرخاب و قەڵای ڕادنندەبێن بۆ سەعد بن. بەو مەرجە موهەلهەل لەگەڵ ئەرتوغروڵ پەیمانی گرێ داوە و بەدری کوڕی خۆشی بەگرەو لە لای دانا کە لەوەپاش شۆڕش نەکەوێتە نێوانیان. کە ئەوانە کران و هەردوو لا موعاهەدە نامەیان بۆ یەکتر مۆر کرد، موهەلهەل گەڕاوە سەر خاک و زەوی خۆی و لەگەڵ حوکمداریی خۆی خەریک بوو.

لەو موعاهەدەیە زۆر بەسەر نەچوو کە سەعد لەگەڵ موهەلهەل نێوانی تێکدا و دەستی بەسەرکێشی کرد و کەم کەمە هێزی پەیدا کرد و لەشکری کۆکردەوە. موهەلهەل لەولاوە خۆی دەپارازت. سەعد بۆ بەرابەریی موهەلهەل لەشکرێ بردە سەر حەلوان. موهەلهەل بۆ پێش پێگرتن سوپاهی دەرخست. لە پاش شەڕ و شۆڕ و کوشتار، موهەلهەل لە دەست سەعدەوە گرفتار بوو، خاکی کەوتە دەست سەعدەوە و مەسەلە گەورە بوو. بەناچاری ئەرتوغروڵ کەوتە نێوانی و قاقەزی لە سەعد نوسی کە موهەلهەل بەر بدا و دەست لە سەرکێشی هەڵگری. سەعد لە جوابیدا گوتیەوە کە من میراتی خۆم گرتۆتەوە؛ کە موهەلهەل بەردەم دیسان شۆڕش پەیدا دەبێتەوە و شەڕ و کوشتار بنی نایێ و مەملەکەتەکە دەکەوێتە ناڕەحەتیەوە. ئەرتوغروڵ دیسان بۆی نوسیەوە کە موهەلهەل بەردات و بەدری

کوڕی کە بەگرەو لەکن ئەو بوو بیداتە سەعد و بەگرەو ڕایگرێ تاکو شۆڕش بەرپا نەکرێ.

سەعد گوتەی ئەرتوغرولّی بەهێند نەگرت و لەگەلّ خۆ کۆکردنەوە و هێز پەیدا کردن خەریک بوو و بەپەنهانی پەیامێکی ناردە لای مەلیک ڕەحیم و بنچینەی یەکەتی و دۆستایەتی لەگەلّ دامەزراند و لەولاوە پشتیوانێکی پەیدا کرد.

## حوکمداری بەدری کوڕی موهەلهەل

ئەرتوغرولّ لەوە ئاگادار بوو کە سەعد لەگەلّ مەلیک ڕەحیم ڕێک کەوتووە. گرتی سوپاهێکی شەڕکەری بۆ بەدری کوڕی موهەلهەل دروست کرد و ناردیە سەر سەعد. لە نێوانی سەعد و بەدردا شەڕ واقیع بوو، کەمێک کوشتار کرا، هیچ کامێکیان بەسەر یەکدا زالّ نەبوون. بەدر کەم کەمە ڕووی لە هێز پەیدا کردن کرد، چەک و بەرگ و لەشکرێکی چاکی ڕێکخست و بەرە بەرە چاوی کردەوە و برە برە زەوی و خاکی سەعدی هێنایە ژێر دەستەوە و هێواش هێواش بەدر بەهێز بوو. سەعد ڕووی لە شکان کرد.

لە سالّی ٤٤٦ھ دا بەدر بەجارێک گەورە بوو. سەعد هیچی لە دەستدا نەما، وەکو تەماشای ئەو بزووتنەوە و گەڕانەی بەدر و ژێرکەوتنەی سەعد دەکەین، وامان لێ دیار دەبێ کە حکومەتی بەرزەکانی لەو دەمەدا بوو بەحکوومەتێکی ئیداری و لەژێر گەڕان و چاودێری سەلجوقیەکاندا خۆی ڕاگرتبوو. وەکو حکوومەتە گچکەکانی دیکەی ڕۆژهەلّات کە هەریەک سەربەخۆ لە ژێر فەرمانی سەلجووقیێکدا ناوی حکوومەتێکی ئازادیان لێنابوو؛ بۆ ئەوەش دەلیل و نموونەی ئەوە بوو کە سەلجووقیەکان بەهەموو جۆرێک یارمەتی بەرزەکانیان دەدا و پێکیان نەدەخستن.

لێرەدا ژیان و سەربەهوردی موهەلهەلمان دەست نەکەوت کە بزانین لە پاش کەوتنە دەست سەعد، چی بەسەر هات. مێژوونوبسەکان بەهیچ کلۆجێک لێی نەدواون.

بەدری کوڕی موهەلهەل دەمێکی زۆر بەحوکمداری شارەزوور و دینەوەر و حەلوان ڕایبوارد. لە چاخی بەدردا شەڕ و کوشتارێ کە دەکرا بەدەسایسی سەلجووقیەکانی دەکرد.

## حوکمداری سەرخابی دووەم کوڕی بەدر کوڕی موهەلهەل

مردنی بەدر لە ئێمە ئاشکەرا نەبوو، بەلّام هێندە دەزانرێ کە سەرخاب لە پاش بەدری بابی بوو بەحوکمداری بەرزەکانی لە شارەزوور و دینەوەر. ئەویش لە کتێبی مێژووواندا بە«ئەبوشۆک» ناو دەبرێ.

سەرخابی دووەم بەیاریدەدانی ئورتوغرولّ بەگی سەلجووقی بوو بەحوکمداری شارەزوور، کینگەوەر، خەفتیزەکان، داقووقا و لە تەرەف خەلیفەی عەباسییەکانەوە بە«ابو الفوارس» لەقەب کرا.

سەرخاب گەلێک چاخان لەسەر ئەو خاکە حوکمداریی کرد، لە پاشان لەگەلّ سولّتان بەرکیارقی کوڕی مەلەکشا بناغەی یەکەتی دامەزراند و بەخۆشی وە بێ کێشە بەسەری برد.

سەرخاب پیاوێکی لەسەرخۆ و خووچاک و ڕەوشت پاک بوو. لە سایەی پیاوەتی و زرنگی خۆیەوە، مالّ و حەشەم و شان و شەوکەت و هێزێکی تەواوی دەست خست، لە مولّک و مالّ و دراو و ئەسپ و چەک و سەروەتدا حوکمدارێکی بێ هاوالّی چاخی خۆی بوو. مێژوونوبسەکان دەلّێن کە سەرخاب ئەوەندە دەولّەمەند و خاوەند مالّ و دراو بوو، لە بنەمالّەی ئەو حوکمدارانەدا وێنەی ئەویان تێدا نەبووە.

لە سالّی ٤٩٥ﻫ دا قەرەئیلی ناوێکی تورکمان -کە بەسەلغور دەناسرێ- بەچەند کەسێکەوە چوونە خاکی سەرخابەوە. ئەویش چەند پیاوێکی ناردە پێش کە نەهێلّن بکەوێتە نێو خاکی کوردستانی شارەزوورەوە. تورکمانەکانیش بۆ بەرابەریی ساز بوون. هەردوو لا بەشەڕ هاتن، کوردەکان گەلێکیان تورکمان کوشتن و گەلێکیان ڕزگار بوون و هەلاّتن و خۆیان گەیاندە قەرەئیلی و سەربهوردیان بۆ گێڕاوە.

قەرەئیلی گەلێک توند بوو و ڕقی هەلّسا و ناردی لەشکرێکی زۆری لە تورکمانان کۆکردەوە و ڕوو بەسەرخاب چوو، لەولاشەوە سەرخاب سوپاهی کوردانی ساز کرد. قەرەئیلی پێشەنگی نارد، هەردوولا بەگژ یەکدا چوون و شیری کوشتاریان تێکنا. کورد و تورکمان دەستیان بەیەکتر کوشتن کرد، لەو شەڕەدا کوردەکان سەرکەوتن و گەلێکیان تورکمان کوشتن و هێندێک بەدیل گیران و ئەوەی ماوە هەلاّتن.

جاری سێیەم قەرەئیلی لەوە زیاتر قووەت و هێزی پەیدا کرد و گەڕاوە سەر کوردان، دیسان کوشتارێکی زۆر کرا، تورکمان بەسەر کوردا زالّ بوون و نزیک بە ١٠٠٠ کەس کورد لە مەیدانی جەنگ و جەدالدا بەدەست دوژمن بەکوشتن چوون. لە دوای ٤ ڕۆژ شەڕ کردن سەرخاب ڕێگەی هەلاّتنی خستە پێش و ڕوو بەچیایان کشا و چوو. لەو لەشکرە قورسەی کە هەیبوو ٢٠ پیاوی لەگەلّ دەرچوو.

قەلاّی خەفتیزەکان -کە لە یەکە قەلاّیانی توندی سەرخاب بوو- هەمیشە بۆ ڕۆژێکی

وای ڕاگرتبوو کە دووچار بەتەنگاویەک بێ خۆی تێدا بگرێتەوە و هەموو دەمێک پڕ لە چەک و ئالەت بوو. چەند پیاوێکی شەڕکەری لەژێر فەرماندەی گەورەیەکدا لەوێ دانا بوو.

ئەو فەرماندەیە کە بیستیەوە سەرخاب شکاوە، قەڵا و دەورووپشتی خستە ژێر حوکمی خۆیەوە و لە سەرخاب ڕوو گەردان بوو دراو، دانەوێڵە، چەک، گەنجینە، سوپا و ئەسپابێکی زۆر لەو قەڵایەدا بوون، هەموویانی بۆ خۆی زەوت کرد.

سوڵتان بەرکیارق کە لەوە ئاگادار بوو، چەند کەسێکی نارده سەر قەڵا و ١٠٠ هەزار زێڕی سووریان بەزۆر لێ ئەستاندن. تورکمانەکان لەولاوە بەتاڵان و کوشتاری کوردەکانی خاکی سەرخاب دەکۆشان. پارچە خاکی شارەزوور و داقووقا نەبێ لە دەست سەرخابدا ما، ئەوانی دیکە هەموو کەوتنە ژێر زوڵم و جەوری تورکمانەوە.

هەر لەو ساڵەدا کە ساڵی ٤٩٥ھ بوو، یەکێک لە دوو نۆکەرانی سەرخاب کە لە قەڵای خەفتیزەکاندا سەرکێشیان کرد و بوونە مایەی فیتنەی شەڕوشۆڕ و هاواڵێکی خۆی کوشت و لە سەرخابی گێڕاوە ئەگەر لە گوناهی ببوورێ و لە مردنی ئەمین کا، قەڵای خەفتیزەکان دەداتە دەست سەرخاب.

سەرخاب بەسوێند ئەمینی کرد و لە کوشتن و ئەزیەت ئاسوودەی کرد، دووبارە قەڵای خستەوە ژێر حوکمەوە.

لە ساڵی ٤٩٩ھ دا بەڵەکی کوڕی بارامی کوڕی ئارتق چووە سەر قەڵای «جانیجار» کە یەکێک بوو لە قەڵایانی سەرخاب. بەڵەک هەر چوار کەناری ئەو قەڵایەی وەتەنگ هێنا و بەشەڕکردن چووە ناوی و گرتی و لەژێر فەرمانی سەرخابی دەرخست. سەرخاب سێ جاران بەلەشکرەوە چووە سەری و گەلێکی شەڕ لەگەڵ کرد؛ بەنائومێدی دەگەڕاوە. لە دواییدا هێندێک لە دراوسێکان کەوتنە نێوانیان و ناوبژێن کردن و بەبێ کێشە قەڵاکەی جانیجاریان دووبارە پێداوە.

سەرخاب گەلێک پیاوی چاک و ئازا و ڕەشید بوو، بەڵام هەموو دەمێک بەخۆشیی ڕایدەبوارد. لە ساڵی ٥٠٠ھ دا بەمەرگی خۆی مرد. ئەبوو مەنسووری کوڕی بەدر بوو بەحوکمداری شارەزوور و ئەترافی.

## حوکمداری ئەبو مەنسوور کوڕی بەدر

کە سەرخابی کوڕی بەدر مرد، ئەبوو مەنسووری برای لەسەر تەختی حوکمداری دانیشت؛

بەکاروباری ڕەعیەت و ئاوایی بەسەری دەبرد. گەلێکی خزمەت بۆ شارەزوور هەبوو، لە چاندن و زەراعەت و مەملەکەتداری خەریک بوو. موددەتی بیست ساڵ بەخۆشی و ئازادی حوکمدارییەکی «مستقل» سەربەخۆی کرد و زۆر بەئاسوودەگی ڕایبوارد.

شەمسەدین سامی لە جلدی یەکەمی «قاموس الاعلام»یدا دەڵێت: کە ئەولادی سەرخاب لەپاش ئەبوو مەنسوور ١٣٠ ساڵ لە شارەزووردا حوکمداریان کردووە؛ ئەمما ئێمە لەوە زیاتر سەربهوردی ئەو بنەماڵەمان دەست نەکەوتووە و لە هیچ کتێبێکا ڕاست نەهاتوون کە بزانین لەپاش سەرخاب کە ئەبوو مەنسوور بوو بەحوکمدار، لەپاش ئەبوو مەنسوور کێ بوو بەجێنشینی. لەبەرئەوە کە ئێستا لەوە زیاتر ئاگام لێ نییە، بەوەندە قسە تەواو دەکەم وە دەست بە بەندی سێیەم دەکەم کە حوکمدارانی ئەردەڵان لە شارەزوور و دینەوەردا حوکمداری بوون.

بەندی دووەم تەواو بوو

لێوەرگر - مأخذ

١- شەرەفنامە - شەرەفخانی بەدلیسی - فارسی - بەرگی یەکەم
٢- مرآت العبر - سەعید پاشای دیاربەکری - تورکی - بەرگی دووەم
٣- کوردلر - دوقتور سەیج - تورکی - بەرگی یەکەم
٤ - قاموس الاعلام - شمس الدين سامی - تورکی- شەش بەرگ
٥- الفتوحات الاسلامية - شیخ احمد دحلان - عارەبی - بەرگی یەکەم
٦- دائرة المعارف - بستاني - عارەبی - بەرگی یەکەم

**بەرگی دووەم**

# ئاورێکی پاشەوە

**جزمی چوارەم**

پادشایەتی چەند بنەماڵەییێکی کورد لە کوردستاندا

کردەوەی خێوی و سەرنووسەر و بەڕێوەبەری - کوواری زاری کرمانجی



**حوسێن حوزنی حوسەینی موکریانی**

مزی دامەزراندنی و فرۆشتنی بەخێوی بەخێو دەکرێ

یەکی ئەیلولی ١٩٣٠م ٨ی ڕەبیعی دووەمی ١٣٤٩ھ

ڕواندز لە مەزرەکەی زاری کرمانجی دامەزرا

هەر نوسخەیەکی بە سێ قران (دوازدە ئانە)یە

نەشریاتی زاری کرمانجی (١٣)

بەرگی دووەم

# آوڕیکی پاشەوە

جزئی چوارەم

پادشایەتی چند بنەماڵەیکی کورد لە کوردستاندا

کردەوەی خیوی و سەرنوسەری ... زار کرمانجی

حسین حزنی

(موکریانی)

—(*)—

مژدەی دامەزراندنی وفروشتنی بە خیوی بە خیو دەکری

یکی ایلول ۱۹۳۰ م ۸ رەبیع دووەم ۱۳۴۹ ه

رواندز لە مەزرەکەی زارکرمانجی دامەزرا

هەر نسخەیکی بە سیە قران (دوازدە آنە) یە

نشریات زار کرمانجی (۱۳)

# پێشەنگ

## جزیرە - جزیرەی عومەر

## هەڵکەوتنی جوغرافیا و بیناکردنی جزیرە

جزیرە: لە شیمالی شەرقی ویلایەتی دیاربەکرەوە ۲۰۰ کیلۆمەترە لە شەرق جنووبی شاری دیاربەکر دوورە. لە لای ڕاستی چۆمی دەژلە، ۱۵۰ کیلۆمەترە. لە شیمالی غەرب لە بەرەوژووری مووسڵ ۲٤۰ کیلۆمەترە. لە شەرقی جنووبی ماردین هەڵکەوتووە. شارێکە لەنێو قەڵاییێک دایە. شەرقی شیمالی جزیرە، وڵاتی وانە و شەرقی جنووبیشی وڵاتی مووسڵە.

خاکی جزیرە و دێهات و قەڵاکەی هەموو کوردن، هێندێک دانیشتوو و هێندێک ڕەوەندن. خاک و زەویەکەی خاوێن و چاکە بۆ چاندن؛ شایستەی کردن و کێڵگە و چاندنە، دانەوێڵەی هەموو جۆرەی تێدا پەیدا دەبێ. باغ و باخچە و لۆکە و تووتنی بەناوبانگە، مێوە و خواردەمەنی زۆر پوختەی هەیە. دەستکردەی ئەهالی لە لۆکە جاو و لەبەر کری جوان و ڕانکوچۆغە لە بوز و بەڕە و جاجمی باشی تێدا دروست دەکەن. خوری و مەرەزی بەرگنی زۆرە. لە مس و زیڕ و زیو قاپ و کەوچکی بەناوبانگی لێ دروست دەکرێ. حەیواناتی چوار پێ و مەڕوماڵی زۆرە. ڕۆن و پەنیر و چەرم و پێستی گەلێک دەبێ. دێهات و ئاوەدانییێکی زۆر لە دەوروپشتی جزیرە هەبوو: ئێستاکەش وێرانە قەڵای خراپ بوو و کاولەکانی گەلێک ماون. لە جزیرە گەلێک پیاوانی گەورە و ناودار هاتوونەتە ڕوو بەنێو دنیادا دەنگی عیلم و فەنیان داوەتەوە.

قەڵای جزیرە لەنێو چۆمی دەژلەدا لەسەر شکڵی هیلال هەڵکەوتووە، عەبدولعەزیزی کوڕی عومەر بەرگەعید ساڵی (۲۰۰ھ) بینای کردووە، لە کەناری ڕاستی چۆمی دەژلە دایمەزراند، لە هەر چوار کەناریەوە شوورەیەکی سەخت و بلندی بەدەورەدا کێشاوە و بەکونگرە قایمی کرد و هەموو دەورەشی کردە خەندەقێکی قووڵ و پڕ ئاو، جزیرە لە ڕۆژی بیناکردنییەوە هەتا ساڵانی (۳۷۲ھ) لەسە دەوروپشتی مووسڵ ئیدارە دەکرا، لەو ساڵەدا جزیرە کەوتە دەست مەلیک شوجاعبازی کوردی، خێوی دیاربەکر و ئەردیش. لە پاش ئینقرازی حکوومەتی دۆشتیک، جزیرە کەوتە دەست وەزیر ئیبن جەهیر، لە پاش ئەوان کەوتە ژێر حوکمی شەمسودین جگەرمژ کە ئێمە لەم کتێبەدا مەبەستمانە.

## بەندی یەکەم

### شەمسودەولە جگەرمز - (٤٧٨ - ٥٠٢ھ)

جگەرمز پیاوێکی وریا و زرنگ و زانا و ئازا و ڕەشید بوو. کوردی بنەماڵەی «وەهبان» خەڵکی جزیرەی عومەر بوو. لە پاش خوێندن و فێربوونی علووم لە لای حوکمدارانی دۆستێک بشنوی دا کرا بەکۆدە. لە پاشان کەوتە سپاهی بشنۆیەکانەوە و لە ئیدارە و حوکمڕانی حوکمدارانی کوردی بشنۆیی دڵگیر و ڕەنجیدە بوو. کە کوڕی جەهیر لەگەڵ حکوومەتی دۆستێک کەوتە شەڕ و موڵک گرتن، جگەرمز بوو بەهەواداری کوڕی جەهیر و ڕەگەڵیان کەوت. هەرچەند ببوو بەسەرکردەی ئەمیر سلێمانی دۆستێک، بەڵام بەقووەتەوە خۆی بەدەستەوە دا. کوڕی جەهیر کرایە ئەمیری سوپاهێک و دەستی قەدروقیمەتی پێوەنا. جگەرمز ڕۆژ بەڕۆژ لە خۆنواندن و ئازایی و ڕەشیدی نیشاندان خەریک بوو. دەم بەدەم ڕووی لە بەرزبوون و سەرکەوتن بوو. بۆ ئەوەش چ پێویستییێک هەبوایە، کەم کەمە سازی دەکرد و چتی کۆ دەکردەوە و دڵی میللەت و لەشکر و ئومەراکانی دەخستە دەست خۆی. لە کەلێندا بوو خۆی گەورە بکا.

جگەرمز بەسەخا و بەخشش و بەزبانخۆشی و شەهامەت، هەموو نزیکەکانی بەخۆیەوە گرێدا بوو، هەتا وای کرد بەکەمچاغێک جزیرەی عومەری خستە ژێر حوکمییەوە. ساڵی ٤٧٨ بەوەکالەتی کوڕی جەهیر، چووە سەر جزیرە و گرتی و بوو بەخاوەندی جزیرە.

ساڵی ٤٧٨ فەخرودەولەی کوڕی جەهیر، سوپاهێکی ناردە سەر جزیرەی عومەر کە لە دەست حوکمدارانی دۆستێکدا بوون.

بنەماڵەی وەهبان -کە لە ماڵە گەورە و کەیخودای جزیرە بوو- ڕوو بەکوڕی جەهیر گرژبوون، بەڵام چونکە لە دەست حوکمدارانی دۆستێک ڕەنجیدە بوون، شەوێ بۆ هێنانی سوپاهی کوڕی جەهیر بۆ نێو شار دەرگاییێکی گچکە لە دیواری قەڵادا بوو کە بەپایە لە دەرەوە بۆی سەردەکەوتن، ئەو دەرگایەیان کردەوە و یەکەیەکە سوپاهەکەیان بردە ژووری.

سەرکردەی سوپاهی جگەرمز بوو؛ حکوومەتی لە جزیرەدا دامەزراند و دەوڵەتی دۆستێک لە جزیرەدا دوایی هات. هەر جارێکی لە دەرەوە بۆ سەر جزیرە هەڵمەتێک بدرایە بنەماڵەی

وەهبان بۆ پێش پێگرتنی ڕادەوەستان. جگەرمژ بەوە بوو بەئامیرێکی کوڕی جەهیر لەسەر جزیرە.

موحەڕەمی ساڵی ٤٨٩ مەنسووری کوڕی نیزامودین کوڕی ناسرودەولە کە حوکمداری دیاربەکر و ئەردیش [بوو] لەگەڵ کوڕی جەهیر شەڕی کرد و شکا و هەڵات و چووە جزیرەی عومەر. جگەرمژ گرتی و لەماڵە جوولەکەیەک بەندی کرد هەتا مرد. بەوە حکوومەتی دۆستێک دوایی هات و قووەت و هێزی جگەرمژ زیادبوو، ئیدی کەمێک لە عایلەی دۆستێک و لە کوردی بشنۆیی نەما بەرامبەر بەجگەرمژ خۆڕاگرێت.

موئەریخەکان دەڵێن: ئینقرازی حکوومەتی بشنۆیی بە لەچەڕی مەنسوور هات، چونکو لە لەچەریدا بێ هەواڵ و لە تەماعدا دڵی هەموو کەسێکی لە خۆی کردبوو. بۆ حوکمدار پێویستە لە هەموو کەس زیاتر بەخششی هەبێ و بەسەر ڕەعیەت و سوپاهـ و دەستوپێوەندیدا خەلات و جیرەی زۆربێ؛ تاکو بەچاکی بتوانێ حوکمڕانی بکا. مەنسوور لەوانە بەری بوو.

ساڵی ٤٨٩ عەلی کوڕی موسلیم حاکمی مووسڵ، لە دەست «کەربوغا» وەتەنگ هات و هاواری لە جگەرمژ کرد یاریدەی بدات و بەسوپاهەوە بچێتە ڕزگارکردنی. جگەرمژ بەوە کەلێنی دەستخست و سوپاهێکی قورسی لە کوردانی جزیرە و بەختی و بشنۆیی و فنیک هەڵگرت و ڕوو بەمووسڵ لە چیایان چووە خوارێ. لەولاوە «توتناش» کە سەرکردەی سوپاهی کەربوغا بوو، لەشکرێکی بێ ژماری بەرەو پیری جگەرمژ لە لەشکرگا دەرخست و لە نیوەی ڕێگادا هەردوو سوپا جڵەوگیری یەک بوون و بۆکوشتار ڕیزەیان بەست. شەڕ و کوشتار دەست پێکرا. لە پاش چەند ڕۆژ کوشتار؛ جگەرمژ شایانی بەرابەریی نەبوو، وەتەنگ هات و دووچار بەئەزیەت و لێقەومانێکی قورس بوو. چونکو دوژمن گەلێک بەهێز و قورس بوو، بەناچاری لەناکاو شەوێ ڕوو بەجزیرە لەشکری سوارکرد و ڕۆیشت. توتناش دەستبەرداری نەبوو؛ کەوتە سەری.

جگەرمژ کە تەماشای کرد دوژمن زۆری هێنا و دووچار بەنەبوون دەبێ، بەگورجی هەیئەتێکی عولەما و کەیخودایانی بۆ مامڵەت ناردە لای توتناش؛ بەمە کە بکەوێتە ژێر ئیدارەی «کەربوغا» وە پێکهاتن. جگەرمژ دیاری و خەلات و گەلێک چتی بۆ کەربوغا نارد و ڕێککەوتن. جگەرمژ لەژێر ئیدارەی کەربوغاوە بووەوە بەحوکمداری جزیرە.

جگەرمژ ٣ ساڵان لەژێر ئیدارەی کەربوغادا خۆی ڕاگرت، بەڵام بەپەنهانی لە دەستوبردی

هێز پەیداکردن و ڕزگاریدا بوو؛ هەتا بەجارێک خۆی قورس کرد و سوپاه و پێویست و میللەتی بەتەواوی خستە دەست.

ساڵی ٤٩٢ کەربوغا بەسوپاهەوە ڕوو بەئەنتاکیە ڕۆیشت. جگەرمژ سەری بڵندکرد و لەژێر ئەمری کەربوغا ڕزگار بوو.

ساڵی ٤٩٢ جگەرمژ بەچوونی کەربوغا بۆ ئەنتاکیە کەلێنی دەستخست و لەگەڵ فرەکردنی خاک و زەوی، دڵداری ڕەعیەت و ئەهالی و قەلا و ئاواکردنی جێگایان خەریک بوو. لەشکری زۆرکردن و خستنیە ژێر ئینتیزامەوە. ئالای سەربەخۆیی بڵندکردەوە. بۆ گرتنی مووسڵ کەوتە تەدارەک و پێویست سازکردنەوە. لەولاوە خەلیفەی عەباسیەکان لەقەبی شەمسودەولەیان لەگەڵ شیرێکی بەگەوهەر ڕازاوەیان بۆ نارد و ئیمارەتی جزیرەیان بۆ قەرار دا. ساڵی ٤٩٣ جگەرمژ چەند قەلا و جێگایانی سەختی لە خاکی هەکاری و زۆزاندا دروست کرد و هەمووی بەسوپاه و ئالاتەوە پڕکردن و هەریەک دژوارێکی لەسەردانان.

ساڵی ٤٩٤ جگەرمژ بۆ وەدەستهێنانی مووسڵ سوپاهێکی ڕێککەوتووی سازکرد و ڕووی لە مووسڵ کرد.

ئەهالی مووسڵ لە ترسی جگەرمژ هاواریان بردەبەر مووسای تورکمانی کە خاوەندی حەسنکێفا بوو، لە تەرەف کەربوغاوە بەتایبەتی دانیشتبوو، قەراریان دا مووسڵی بخەنە دەست. لەولاوە سەنقەرجە وەکیلی کەربوغا کە وای زانی مووسا بۆ یاریدەدانی لە دەست جگەرمژ، دەچێتە مووسڵ، گرتی بەسوپاه و ئەهالی مووسڵەوە چووە پێشوازی کردنی. کە نزیک بوونەوە، هەر یەک لە ئەسپی خۆی دابەزی و بۆ مردنی گەورەیان گریان.

سەنقەرجە بەمووسای گوت: «دڵخوازی من ئەمەیە هەرچییەکی ماڵ و مەنسەب و مەملەکەت و سەرمایە و ئەسپابی گەورەی ئێمە هەبوو کەوتە دەست ئێوەوە و ئێوە فەرمانڕەوان». مووسا پێی گوت: «جگە لە سوڵتان کێ خاوەندی چت و ماڵە و سوڵتان حەز لەهەر کەس بکا دەیدا بەو». لەسەر ئەوە دەمەچەندیان کرد. سەنقەرجە دەستی هاوێتە شیری و لە لایەکی مووسای دا و بریندداری کرد. مووسا خۆی بەزەوی دادا. کوڕی ئەمیر مەنسووری کوردی، خودانی دیاربەکر و ئەردیش لەگەڵ مووسا بوو. خەنجەری کێشا و لینگی دایە سەر سەنقەرجە و لەسەری دا و ئیشی تەواوکرد. مووسا سواربوو چووە نێو مووسڵەوە و دڵخۆشی ئەهالی داوە و پیاوەکانی سەنقەرجەی خەلات کردن و فەرمانڕەوایی خۆی لە مووسڵدا ئاژۆت و مووسڵ بوو بەماڵی مووسا.

جگەرمز کە لەوە ئاگادار بوو، بەو هێز و تەوانەیەوە ڕووی لە نوسەیبێن کرد و بەموددەتێکی زۆرکەم گرتی و پیاوێکی خۆی لەسەردانا و ئومووری حوکمداریی تێدا ڕێک دەخست.

مووسا لەولاوە بەسوپاهەوە ڕووی لە جزیرە کرد، جگەرمز چووە پێشی. لە پاش کەم شەڕێک مووسا بەپەنهانی هەڵات و خۆی لە مووسڵ خزاند. دەروازەی شار و قەڵا و بورجەکانی توند کرد. جگەرمز سوپاه و لەشکرەکەی مووسای خستە دەست خۆیەوە و بەو قووەتەوە چووە سەر مووسڵ و دەورەی دا و بەموددەتێکی دوورودرێژ لە وەتەنگهێنانی مووسا دابوو. مووسا هاواری لە ئەمیر سەقمان خێوی دیاربەکر کرد، جگەرمز ڕێگای هاتوچوونی لە شار گرت و مووسا و ئەهالی وەتەنگ هێنا. لە هەموو لاوە پەلاماردان و هەڵمەت گەرمەی تێ کەوت. کوردەکان هەریەک لە لایێکەوە لینگیان دا سەر دەروازە و کونگرەکانی شار. ئەهالی مووسڵ و مووسا لەوە وەرەزبوون، مووسا ناچار ما ڕێگای ڕزگاربوونی دەست نەکەوت.

ئەمیر سەقمان بەمە کە مووسا دەست لە حەسنکێفا هەڵگرێت و ١٠ هەزار دینار دراویش بدا، ئەمیر سەقمان وەعدەی یارمەتی دایێ؛ مووسا بەناچاری لەگەڵی ڕێککەوت. ئەمیر سەقمان بەلەشکرەوە بۆ یاریدانی مووسا لە دیاربەکر دەرکەوت و لە ڕێگاشیدا هێزی فرە کرد، هەتا نزیک مووسڵ بوو. جگەرمز دەستی لە مووسڵ بەردا و گەڕاوە جزیرە.

شەمسولدەولە جگەرمز کە لە مووسڵ دەستی هەڵگرت، لەناو دیوان و دێهات خۆی پەنهان کرد و چاوەنۆڕی کەلێن بوو. مووسا کە زانییەوە جگەرمز دەستی هەڵگرت و ئەمیر سەقمان هات، دەستوپێوەندی خۆی هەڵگرت بۆ پێشوازیکردن لە شار دەرکەوت و گەیشتە دێیەک کە پێیان دەگوت: «کەواسا». چەند نۆکەرێکی ڕووگەردان بوون؛ بۆ کوشتنی لە کەلێندا بوون. مووسا کە دابەزی تا ماندوویيان بحەسێتەوە، ئەو دەستە نۆکەرانەی کە لە مووسا دڵگیر ببوون، لەوە چاتر کەلێنیان دەست نەکەوت، بەکۆمەڵە دەسرێژێکی تیرانیان کردە سەر. مووسا و چەند نۆکەرێک کوژران، باقی نۆکەر و دەستوپێوەندەکانی بەشکاوی ڕوو بەمووسڵ گەڕانەوە و مووسایان لەسەر تەپەیەک ناشت. لەولاوە ئەمیر سەقمان کە لەوە ئاگادار بوو، جڵەوی سووڕاند و ڕوو بەحەسنکێفا گەڕاوە پاش و بەکەم شەڕێک حەسنکێفای گرت و خستیە ژێر فەرمانی خۆیەوە.

شەمسوولّە جگەرمژ کە لە کوشتنی مووسا ئاگاداربوو، لەولاوە پیاوەکانی مووسا و لەشکرەکەی بەدلّخۆشی هێنانەوە ژێر حوکمەوە. بەوهێزە ڕوو بەمووسلّ ڕۆیشت و قاقەزی لە هەوادارەکانی مووسا نویسی کە هەراسان نەبن و خۆ بەدەستەوە بدەن. هەموو لە کەنارانەوە لەسەر جگەرمژ کۆبوونەوە. ئەهالی مووسلّ کە ئەوەیان زانییەوە، کەیخودا و ڕیش سپی و کاربەدەستان بۆ ئیتاعەکردنی جگەرمژ لە مووسلّ دەرکەوتن و چوونە پێشوازی کردنی، بەشاد و خوڕڕەمی جگەرمژیان بردە نێو شارەوە، بەلوتف و پیاوەتی ئەهالی دلّشاد کرد و نوازشی نیشان دان. لە پاشان دەستی بەڕێکخستنی ئوموری و شار و دامەزراندنی میللەت و ئینتیزامی سوپادا. کە ئوموری حکوومەتی دامەزراند و پێویستی پێکهێنا و پیاوێکی لەسەر دانا ئەوانەی مووسایان کوژتبوو گرتنی و لە تۆلّەی مووسادا بەداریداکردن و خنکاندنی و گەڕاوە و چووە جزیرە.

سالّی ٤٩٦ یاقووتی کوڕی حەسەن کوڕی ئەمیر ئارتق برازای ئەمیر سەقمان کە لەسەر ماردین بوو، ئازایی و پیاوەتی جگەرمژی پەسند کرد و دلّخۆشی حەمییەت و زرنگی بوو. لەبەرئەوە قاقەزێکی لە جگەرمژ نویسی، لەڕووی گەورەیی و پیاوەتیەوە سەرپەرشتی بکات و لەژێربالّیدا ئاگاداری بێت و دەستی میهرەبانی بەسەردا بکێشێ. جگەرمژ ڕوو بەنسێبین ڕۆیشت و لێی گێڕاوە کە یاقووت بچێتە لای لە نسێبین یەکتر ببینن.

یاقووتی لە شەهامەت و گەورەیی جگەرمژ ئەمین بوو؛ هەستا ڕوو بەنسێبین ڕۆیشت، لە نیوەی ڕێگادا یاقووتی لە دەست دوژمناندا بەکوژتن چوو. سەرکردەی یاقووتی کە ناوی عەلی بوو، سوپاه و مالّ و ئەسپاب و قەلاّ و مەملەکەت و شارانی یاقووت لەگەلّ ماردین تەسلیم بەجگەرمژ کرد و هەمووی خستە ژێر فەرمانییەوە. عەلی بێژراوی کردەوە بەسەرکردە و نایبی خۆی لەسەر ماردین و ڕوو بەجزیرە ڕۆیشت. سوپاهێکی ڕێکخست و گەڕاوە مووسلّ لە مووسلّدا چەندێک دانیشت.

هەر لەو سالّەدا جگەرمژ سوپاهێکی هەلّگرت و چووە سەر خاپوور. بەهەر جۆرێک بوو خاپووری خستە دەست. قەلاّ و دێهات و دەوروپشتی خاپووری هەموو گرت و هاوێتیە ژێر فەرمانی خۆیەوە. تەواوی عەشایرانی کوردی ئەولایانەی بەچاکە و پیاوەتی وا لێ کرد کە هەموو بەجارێک حوکمداریی ئەویان قەبوولّ کرد.

جگەرمژ کە لە کوردەکان ئەمین بوو و مەرجیان دا، ئەوجا لەشکری ڕووەو دەشتی «تات» (عارەب) وەرگێڕا. عەشایری تاتی ئەوبەری فوڕاتی بەخاهی و نەخاهی و بەزۆر و شەڕ کردە ڕەعیەت و خستیە ژێر فەرمانییەوە و بەشادی ڕوو بەمووسلّ گەڕاوە. لەو

عەشایرانە سوپاهێکی ڕێککەوتووی ڕێکخست و ڕوو بەجزیرە گەڕاوە.

ساڵی ٤٩٧ جگەرمژ سوپاهێکی قورس و شەڕکەری لە خاپوور و ماردین کۆکردەوە و بۆ شەڕی چەلیپا چوونە سەر فەرەنگ و ڕوو بەئۆرفە سوپاهێکی ئاژۆت و لەسەر چۆمی «بەلخ» لەشکری کورد و فەرەنگ لە یەک هەڵەنگۆتن و بۆ شەڕ بەرابەر یەک ڕاوەستان. شەڕ و کوشتار دەست پێکرا، لەشکری کوردان نەشیان خۆ ڕاگرن، ڕوویان لە هەڵاتن کرد و شکان. فەرەنگ دوو فەرسەخ ڕێگا هاتنە سەر کوردان و هەڵیان برین. شەمسودەولە جگەرمژ هەرچەند غیرەتی دا و هاواری کرد، چارە نەبوو، لە دواییدا قووەتێکی تەواویان لە مووسڵەوە گەیشتێ و هێزێکیان پەیدا کردەوە. چونکو فەرەنگ زۆربوون، قووەتی مەعنەوی کوردانی بەیەکە هەڵمەت شکاند. جگەرمژ کەوتە سەریان و ڕووی لە لەشکر و سەرکردەکان کرد و دڵخۆشی دانەوە و قسەی پەندئامێزی پێ گوتن و بەشانوباهوی هەڵگوتن. لەشکرەکەی کەوتنەوە غیرەت و ڕوو بەدوژمن وەرچەرخانەوە و لینگیان داوە سەر فەرەنگ و شێرانە هەڵمەتیان بردە سەریان و بەکەم شەڕێک فەرەنگیان شکاند و بڵاویان کردن. هەرچییێکی کوژرا و مرد، ئەوی ماوە بەدیل گیرا. کوردەکان ماڵ و ئەسبابێکی زۆریان بەتاڵان دەست کەوت.

لەنێو هەڵاتووەکاندا فەرمانڕەوا و خێوی ئۆرفە «قەمس بەردویل» بوو بەدیل گیرا و بردیانە چادری سەرکردەیێکی لەشکری جگەرمژ. لەودەمەدا لەنێوانی لەشکریەکاندا لەسەر تاڵان کێشە پەیدابوو. چەند پیاوێکی جگەرمژ چوونە نێو چادری ئەو سەرکردەیەوە کە قەمس بکوژن. جگەرمژ لەولاوە زوو زانییەوە، فریاکەوت و نەیهێشت قەمس بکوژرێت.

جگەرمژ قەمسی بردە لای خۆی و لەشکرەکەی کۆکردەوە و بەتاڵان و خەڵات بەخشین نوازشی کردن و قەمسی هەڵگرت و بەلەشکرەوە چووە سەر ئورفە، ١٥ ڕۆژ بەتوندی دەورەی ئورفەی دا. هەرچەند وەتەنگی هێنا و شەڕی کرد نەیتوانی ئورفە بگرێت، بەناچاری قەمسی هەڵگرت و گەڕاوە مووسڵ. ناردی قەمسی حەپس کرد.

لەو شەڕەدا ١٦٠ کورد بەدیل کەوتە دەست فەرەنگ و ١٥ هەزار کەس لە فەرەنگ بەدەست کورد بەکوشت چوون. قەمس هەتا ساڵی ٥٠٢ھ لە قەڵای جعیردا لە بەندیدا بوو.

هەر لەو ساڵەدا جگەرمژ بەسوپاهێکی چاکەوە چووە سەر حەڕران. لە پاش کەم ئەزیەتێک گرتی و ئومووری حوکمداریی خۆی تێدا ڕێکخست و خاوەندەکەی پێشووی بەوەکالەتیی لەسەر داناوە و گەڕاوە مووسڵ.

ساڵی ٤٩٨ سوڵتان محەمەد لە تەورێزەوە چووە مەراغە و لەوێشەوە ڕوو بەهەولێر سوپاهی هەڵگرت کە بچێتە سەر جگەرمژ و شارەکانی لە دەست دەرخا. کە جگەرمژ ئەوەی زانییەوە شوورەی دەورەی مووسڵی دروست کرد و بەبورج و باروو و بەکونگرە توندی کرد. ناردی هەرچەند ئەهالی لە دێهاتی دەرەوە بوون بردنیە نێو شارەوە. بەسەرکردەی لەشکری ئەمر دا هەرکەسێ لە هاتن پاشکەوێت بیکوژن و ماڵی تاڵان کەن.

جگەرمژ لە خۆکۆکردنەوە و سوپا ڕێکخستن و شار و دیواری قەڵا قایمکردن خەریک بوو، سوڵتان محەمەد نزیک بەمووسڵ بوو. سوڵتان قاقەزێکی لە جگەرمژ نویسی بۆ مامڵەتکردن لەگەڵ برای و قەرار بدا مووسڵ و مەملەکەتی جزیرە لەژێر فەرمانی ئەودابن قاقەزی سوڵتان بەرکیارق کە لەو زبانیەوە نویسیبوو، ئەویشی بۆ نارد و تێیدا گوترابوو کە «ئیتاعەی سوڵتان محەمەد بکرێ». سوڵتان محەمەد دیسان بۆی نوویسی ئەگەر ئیتاعەی بکا مەملەکەتی لە دەست جگەرمژ دا دێڵێتەوە و قەرار دەدا بیداتەوە، بەمەرجی ئەوە خوتبە لە مووسڵ و جزیرە و خاکی جگەرمژ هەرچی هەیە بەناوی سوڵتان محەمەد بخوێندرێتەوە.

جگەرمژ جوابی داوە کە: «ئێمە لەگەڵ سوڵتان بەرکیارق قرارمان داوە هەر خاکێکی بیگرم لە دەست ئەودابێ وە تەسلیم بەکەسی نەکات».

سوڵتان محەمەدی لە چوونە نێو مووسڵ جواب دا. سوڵتان کە زانییەوە بەڕاستی نەیهێشت بچێتە نێو مووسڵەوە، بۆ شەڕکردن لەشکری لێخوڕیە پێشەوە. دیوار بڕ و ئاورهاوێژ و بەرد فڕێدەرەکانی خستە بەردەمی لەشکرەوە و بەتوندی چوونە سەر مووسڵ.

ئەهالی لەبەر خۆشی جگەرمژ و حەزلێکردنیان دامێنی پیاوەتی و ئازاییان بەلادا کرد و بۆ سوڵتان محەمەد لە قەڵا دەرکەوتن. شەڕێکی زۆر خوێنڕێژانە و ئازایانەیان کرد. لەبەر پیاوچاکی و ڕەوشت خۆشی و خوو چاکی خۆیان بەکوژت دا. گەلێک لە ئەهالی کوژران، جگەرمژ ئەمری دا لە شوورەی حەسارەوە دەرگا چکۆلەکانیان کردەوە کە ئەهالی بۆ شەڕکردن لە شار دەرکەون. بەوجۆرە کوژتارێکی زۆریان لە لەشکری سوڵتان کوژت.

سوڵتان لەسەر ئەوە ئەمری دا دیوار بڕەکان چوونەژێر شوورەی قەڵاوە و دەستیان بەبڕینی شوورەکرد. لە نیوەی شەودا ئەهالی لەوە ئاگاداربوون؛ دەزبەجێ بەدەستی بەهێزەوە کەوتنەسەر دروستکردنەوەی شوورە. بەچەند سەعاتێک چاکیان کردەوە و دەستە بەدەستە بۆ شەڕکردن و گەڕاندنەوەی لەشکری سوڵتان لە شار دەرکەوتن و زۆر بەچاکی چاردە

قەلای خۆیان بەخێو کرد. لە دەورەگرتندا دڵتەنگ نەبوون.

«ابن الاثیر» لە تەئریخی «کامل»دا دەڵێت: «لەنێو مووسڵدا دانەویڵە هەرزان و زۆربوو. دەورە لێگرتووەکان تەنگای خواردنیان نەکێشا. سی مکووک گەنم بەدینارێک و پەنجا مکووک جۆ بەدینارێک بوو؛ کەسیش نەیدەکڕی».

سوپاهی جگەرمژ هێندێکی لە تەلیەعفەر کۆبوونەوە. بۆ ڕوو وەرگەڕانی سوپای دوژمن و ئاو لێ بڕینیان دەکۆشان، موددەتێکی دووردرێژ شەڕ و کوشتار دەوامی کرد، هەتا دەی جەمادی یەکی ئەو ساڵە هەر شەڕ و کوشتار بوو. دەنگی مردنی سوڵتان بەرکیارۆق بەگوێی جگەرمژدا کەوت. هەموو ئەهالی شاری کۆکردەوە و مەشوەرەتی پێ کردن و باسی لە مردنی سوڵتان بەرکیارۆق کرد، وە لە دوای ئەو چی بکرێ و چۆن بژین پرسیاری لێ کردن. ئەهالی بەیەک دڵ و یەک گیانیی گوتیان: ماڵ و منداڵ و گیانمان لە بەردەستی تۆ دایە؛ لەو ڕێگایەدا مردن بەسەربەرزی دەخوازین، هەرچۆنێکی تۆ ئارەزوو بکەی سەرودەر و گەورەی و مەشوەرەت بەسەرکردە و سەرداری لەشکرەکانیش بکرێ چاکترە. لەبەرئەوە ئۆمەراکانی سوپاهی کۆکردنەوە و مەشوەرەتی بەوانیش کرد. ئومەراکان گوتیان هەتا سوڵتان زیندووبوو، وەعدەیەکی بەومان دابوو بەسەرمان برد. ئەمڕۆکەش مادامە سوڵتان مرد، ئەمە بەسوڵتان هەڵبژاردن چاکترە؛ چونکو بەبێ سوڵتان حوکمداریی ئەمڕۆکە دژوار و سەختە. جا ئەگەر وابوو سوڵتان محەمەد بەسوڵتان قبووڵ کردن چاکترە.

جگەرمژ بەئیزن و مەشوەرەتی ئەهالی و لەشکریان، قاقەزێکی لە سوڵتان محەمەد نویسی و ئیتاعەت کردنی قبووڵ کرد. وەزیر سەعدولملەلیکی خواستە لای خۆی. لەسەر ئەو قاقەزە، سوڵتان گرتی و سەعدولملەلیکی نارده لای جگەرمژ. لەولاوە بەئیحترامەوە پێشوازی وەزیریان کرد و بردیانە دیوانێ. لە پاش گفتوگۆیەکی تەواو، وەزیر بەجگەرمژی گوت: دەبێ بچیە لای سوڵتان و قسەی لەگەڵ بکەی. ئەو هەرچێکی لێ بخوازی بەقسەت دەکا و واژی دڵخوازیت نابزوێتەوە. لەسەر ئەوە قەرار درا.

جگەرمژ و وەزیر دەستیان بەدەستی یەکتر گرت و لە دیوان دەرکەوتن. ئەهالی مووسڵ کە چاویان بەوە کەوت، گابۆریان دەست پێکرد و گریان و شین و واوەیلا و هاواریان بڵند بوو؛ خۆڵ و قوڕیان بەسەر خۆیاندا کرد و بانگیان دەکردە یەکتر بەگەورەڕۆ بۆ یەکتریان دەگێڕایەوە. جگەرمژ جوابی کەسی نەداوە و لەگەڵ وەزیر چوونە لای سوڵتان. وەزیر سەربهوردی ئەهالی بۆ سوڵتان گێڕاوە. سوڵتان گەلێک لوتفی لەگەڵ جگەرمژ کرد و

دڵخۆشی داوە و نوازشی کرد و پێی گوت: میللەتەکەت چاوەنۆڕیت دەکەن و نیگەرانن، هەستە بچۆوە نێویان و دڵیان بەتۆوەیە.

جگەرمژ چەند پیاوێکی ماقووڵی سوڵتانی لەگەڵ خۆی هەڵگرت و گەڕاوە مووسڵ. ئەهالی کە چاویان پێ کەوتەوە بەشادی گەڕاوە، شادمانی و کەیفێکی بێ ژماریان کرد. سوڵتان ناردی پرسیاری کرد سبەینێ داخیل بەشار بێ، شار برازێننەوە و چراخان بکەن. جگەرمژ نەیهێشت، بەڵام وەعدەی میوانداری لە دەرێی شاری پێ دا.

سبەینێ ئەهالی و مەئموورین بەکەیف و شادمانی لە دەرێی شار زینەتیان کرد، دیاری و ئەسپابێکی زۆر گرانبەهایان بۆ سوڵتان و وەزیر برد، وە دڵخۆشیان کردن. ئەو ڕۆژە شادمانی بوو؛ بۆ سبەینێ سوڵتان بۆ سەرەخۆشی بەرکیاروقی برای دانیشت. هەموو چوونە سەرەخۆشی و لە پاشا سوکواری و سەرخۆشی لێکردن، حوکمداری جزیرە و مووسڵی بۆ جگەرمژ تەسدیق کرد و ڕوو بە بەغدا لەشکری ئاژۆت.

جگەرمژ لە پاش ڕۆیشتنی سوڵتان بەرێکخستن و دامەزراندنەوەی میللەت و ڕەعیەت خەریک بوو؛ سوپاهێکی کۆکردەوە و ڕۆیشت، گەیشتەوە سوڵتان؛ لەگەڵی ڕۆیشت و چوونە بەغدا. لە ئاخری جەمادی دووەمدا دەنگ گەیشتە جگەرمژ کە قلیچ ئەرسەلانی کوڕی سلێمانی کوڕی قتلمش چووە دیاربەکر، تەمای چوونە سەر جزیرەی هەیە. جگەرمژ ئیزنی لە سوڵتان وەرگرت و بەسوپاهەوە ڕوو بەمووسڵ گەڕاوە دواوە.

ساڵیچوار سەدو نەوەدو نۆ مەلیک ڕەزوان کوڕی تەتەش بۆ شەڕی فەرەنگ لەشکری هەڵگرت، لە [گەڵ] ئومەرایانی ئێلغازی کوڕی ئارتق کە شەحنەی بەغدابوو و سپەهبود سوپا و ئەڵبی کوڕی ئەرسەلان تاش خێوی ژەنگار -کە زاوای جگەرمژ بوو- لە نیوەی ڕێگادا ئێلغازی بەمەلیک ڕەزوانی گوت ئێمە دەچینە غەزا، ماڵ و ئەسپاب و لەشکرمان دەوێ واچاکە بچینە سەر خاکی جگەرمژ و دەورویشتی و بیانگرین، هەم ماڵ و هەم سوپاهێکی قورس دەست دەخەین. ئەوجا دەچینە شەڕی ئەهلی چەلیپا و لەوەشدا ماڵێکی زۆر دەست دەخەین.

مەلیک ڕەزوان بەوە خەڵەتا، لە مانگی ڕەمەزاندا بەدە هەزار سوارەوە چوونە سەر نسێبین، بەڵام لە تەرەف جگەرمژەوە دوو ئەمیر لە ئەهلی خۆی لەسەر نسێبین داندرابوو. قەڵا و شاریان قایم کرد و بەسوپاهێکی ڕێککەوتووەوە بۆ شەڕکردنی مەلیک ڕەزوان خۆیان سازکرد. لەنێوی شوورەی شار و قەڵادا بەتیر و ئاور فڕێدەر و بەردهاوێژ دەستیان

بەشەڕکردن کرد. ئەلبی کوڕی ئەرسەلان داش زاوای جگەرمژ بەپەیکانێک بریندار بوو. زامێکی گەورەی وەرگرت و بەناچاری گەڕاوە و ڕوو بەژەنگار چوو.

جگەرمژ لەولاوە کە خەبەری زانییەوە مەلیک ڕەزوان چووەتە سەر نسێبین، لەو دەمەدا لە حانەی نزیک تەنزەبوو، نەخۆشێکی کە هەیبوو دەرمانی دەکرد؛ دەزبەجێ سوار بوو چووە مووسڵ و ڕەعیەت و ئەهالی دەوروپشت لە سەری کۆبوونەوە و لەبەر دەروازەی شار چادری هەڵدا و بۆ چوونە شەڕی ڕەزوان خۆی ساز کرد. لە فێڵ و خەڵەتاندنی ڕەزوان کەوتە بیرەوە؛ گرتی قاقەزێکی لە ئومەرا و سەرکردەکانی ڕەزوان نوبسی و دڵخۆشی دانەوەی کردن و بەوەعدە ئارەزووی قبووڵ کردن. هێندە خەریک بوو هەتا بەچاکی نیەتی ئەوانی وەرگێڕایە لای خۆی. هەروا گرتی قاقەزی لە پیاو و نۆکەرەکانی خۆی نوبسیە نسێبین کە دڵی مەلیک ڕەزوان مەشکێنن و ئیتاعەی بکەن و بۆ دانان و خزمەتی دەرکەونە دەرێی شار ئیحترامی لازمی بگرن. وە قاقەزێکیشی لە مەلیک ڕەزوان نوویسی لەوێدا گوتی: سوڵتان محەمەد ڕووی لە خاکی ئەو کرد و چەندەی دەورە دا و ئەزیەتی کێشا نەشیا بیگرێت، لە دواییدا بەناچاری مامڵەتی کرد و دەستی هەڵگرت و چوو، لە زەرەر و ئەزیەت زیاتر چی دیکەی نەکەوتە دەست. دیسان لەو قاقەزەدا گوتی ئەگەر ئەو ئێلغازیەی کە هەموو کەس دەیناسێت چ موفسید و فیتنە ئەنگێزێکە بیگرێت و لە بەندی کا، بەهەموو ماڵ و لەشکر و پێویستەوە لە خزمەتکردندا حازر و ئامادەیە هەرچێکی لە دراو و ئالەت و لەشکر و دانەوێڵەی بوێت، دەیداتێ.

بەوە ڕەزوان نیەتی گۆڕی، لە ئێلغازی کەوتە دوودڵییەوە، ڕۆژ بەڕۆژ دڵی لە پیسبوون بوو؛ هەتا ڕۆژێکی بەئێلغازی گوت ئەم مەملەکەتانە گرتنیان سەختەو دژوارە، وە دەترسێ فەرەنگ بچێتە سەر حەڵەب بیگرێت. واچاکە و من ئەمە بەخێرتر دەزانم لەگەڵ جگەرمژ مامڵەت بکەین، دۆستایەتیمان لەتەکدا بکا؛ چونکو دەتوانێت بەلەشکر و ماڵ بۆ شەڕی فەرەنگ یاریدەمان بدات. وە بەسەرمایە و دراو دەستمان بگرێ. وە ئەوەش دەبێتە مایەی کۆبوونەوەی بڵاوەی ئیسلام و سەرکەوتن.

ئێلغازی جوابی داوە بەڵێ تۆ لەپێشدا بەدڵخوازیی خۆت هاتی و لەسەر حوکمی خۆت بووی، بەڵام ئەمرۆکە لەژێر ئەمری من دای. بەبێ گرتنی ئەم مەملەکەتە ناتوانی بڕۆیە جێگاییێکی دیکە؛ وات کرد زۆرچاکە؛ دەنا من لەگەڵ تۆ شەڕ دەکەم.

ئێلغازی چونکو تورکمانی زۆری لەسەر کۆبووەوە، گەلێک بەهەوا و سەربڵند و ملڕەق

بوو. هەرچێکو ڕەزوان بوو، لە ڕۆژی قاقەزی جگەرمژەوە لەگەڵ چەند دلاوەرێکی لەشکری قسەی کردبوو لە گرتنی ئێلغازیدا یاریدەی بدەن. لەودەمەدا واچاوی لێ داگرتن لەپڕ ڕاستەوەبوون ئێلغازیان گرت و زنجیر و پالەهەنیان کرد.

تورکمان کە لەوە گەیشتن سەرپێچیان کرد و لە ڕەزوان جوێ بوونەوە و پەنایان بردە بەر شوورەی قەڵا. لەولاوە بەهەر جۆرێک بوو ئێلغازیان بۆ قەڵا سەر دەخست. ئەهالی قەڵاش لە نسێبین بەلەشکرەوە دەرکەوتن و یاریدەیان دان. کە تورکمان چاویان بەوە کەوت، بەجارێک ڕقیان هەستا چییان لە ئەسباب و ماڵ دەست کەوت تالانیان کرد و ڕەزوانیان هەڵگرت و ڕوو بەحەلەب گەڕانەوە.

جگەرمژ لەولاوە لەشکری کۆکردەوە؛ بۆ شەڕی ڕەزوان و ئێلغازی لە مووسڵ کەوتەڕێ و گەیشتە تەلەعفەر. مزگینیان دایێ کە ڕەزوان بڵاوەی تێ کەوت و بەدڵشکاوی گەڕانەوە. جگەرمژ لەسەر ئەو مزگێنیە ڕوو بەژەنگار چوو. لەودەمەدا ناردراوی ڕەزوانی گەیشتێ و داوای دەستە شەڕکەرێک و نەژدەی لێ کردبوو. باسی چی بەسەرهێنانی ئێلغازیشی بۆ نوویسی بوو. جگەرمژ بەپێچەوانی و تەوسەوە بەڵێی بۆ گوت و ناردراوی بەڕێ کردەوە و لە وەعدەییێکی بە ڕەزوانی دابوو بەجێی نەهێنا، بۆ ڕق خواردنەوەی لە ئەلبی کوڕی ئەرسەلان تاش کە ئەمنییەتی پێ کرد و مەملەکەتێکی دابووە دەست، ئەویش چووبوو ببوو بەپشتیوان و یاریدەری دوژمن و ڕێگا نیشاندەریان.

لەو دەمەشدا ئەلب لە ناخۆشییێکی سەختدا بوو، لە دەست برینێکی لە پەیکانی شەڕەکانی نسێبین خواردبوو وە زۆر لە دەست برینەکەش بەئێش بوو. کە جگەرمژ لە ژەنگار دابەزی، ئەلبی بەپیاوەکانی خۆی گوت بەدەست هەڵی گرن و بیبەنە بەردەمی جگەرمژ. پیاوەکان هەڵیانگرت و بردیانە لای. دەستی بەپاڕانەوە و لاوانەوە کرد و بەجگەرمژی گوت ئەمن بەگوناهێکی زۆرەوە خۆم خستە بەردەست، ئەتۆش هەرچۆنێکی پێت خۆشە و دڵت پێ شاد دەبێ پێم بکە. ئەوەی گوت و هەڵیانگرت و بردیانەوە نێو شاری، کە گەیشتە جێ ئەلبی مرد.

کە ئەلبی مرد ئەهالی ژەنگار لە جگەرمژ ڕووگەردان و سەرکێش بوون و شار و قەڵایان قایمکرد و ڕوو بەجگەرمژ دەستیان بەشەڕکرد. جگەرمژ بەناچاری بۆ وەدەسخستنی شار کۆشا. شەڕ دەست پێکرا. جگەرمژ هەر چوار دەورەی شاری وەتەنگ هێنا. ڕەمەزان و مانگی شەوال شەڕ و کوژتار لە نێوانیاندا پایەداری کرد. جگەرمژ هەرچەند کۆشا چارەی

نەکرد. لە دواییدا «تەمیرک»ی برای ئەرسەلان تاش مامی ئەلبی بۆ ئیتاعەت کردنی جگەرمژ، لە شار دەرکەوت و سەری بۆ دانەواند و جگەرمژ لە گوناهەکانی بهورد و ژەنگاری پێ بەخشی و ئوموری ژەنگاری بۆ ڕێکخست و بەکەیفەوە گەڕاوە چووە مووسڵ.

ساڵی پێنج سەد لەبەرئەوە کە جگەرمژ هێندێک وەعدەی دابوو بەسوڵتان محەمەد و بەجێی نەهێنابوو، سوڵتان ئەوەی لەسەر دڵ ببووە گرێ. لەولاشەوە یەکێک لە ئومەراکانی سوڵتان کە بەجیاووڵی سێ گا ناوبانگی کردبوو، پیاوێکی نارەحەت بوو؛ سوڵتان لە شەڕی دەترسا، وە بۆ لەسەرخۆ لابردنی لە مانگی موحەڕەمدا ئەمری پێکرد بچێتە سەر خاکی جگەرمژ و بیگرێ و بەقووەتەوە بچێتە سەر فەرەنگ و یاریدەی موسڵمانان بدات. بەو فێڵە سوڵتان بەڵای جیاووڵی لەسەرخۆی هاوێژت.

جیاووڵی لەپێشدا بەسەر مەملەکەتی لورستاندا حوکمداریی دەکرد. زەمانێک مابووە کە ئەمری سوڵتانی وەرگرت. جیاووڵی لە ڕێگای بەغداوە ڕوو بەمووسڵ ڕۆیشت. لە مانگی ڕەبیعی یەکدا گەیشتە «بوازیج»؛ گرتی و چوار ڕۆژ ئەمری تالانکردنی دا. ئەهالیەکەی ئەمین کردەوە و سوێندی بۆ خواردن بەخێویانکا. لەوێوە ڕوو بەهەولێر ڕۆیشت.

بەڵام جگەرش کە لەولاوە چوونی جیاووڵی بیستەوە، قاقەزی بەهەموو لایەکدا بڵاوکردەوە و داوای یارمەتی کرد و هەرچەندە سوپاهی هەبوو لە مووسڵدا کۆی کردنەوە. لەوەدەمەدا قاقەزێکی لە تەرەف ئەبیهەیجای کوڕی مووسەکی کوردی هەزەبانی خێوی هەولێرەوە بۆ هات کە جیاووڵی بوازیجی گرت و تالانی کرد و ڕوو بەهەولێر لە بزووتندایە. ئەگەر بەلەز لەشکری نەهێنێ و کۆنەبنەوە و بەکۆمەڵە نەچنە پێشی، ئەبیهەیجا ناچارە ئیتاعەی جیاووڵی بکات.

جگەرمژ لەوە ترسا کە ئەبیهەیجا دەبێتە پشتیوانی جیاووڵی. وای بەچاک زانی زوو لە زێ بپەڕێتەوە و فریای بکەوێ.

جگەرمژ بەلەشکری مووسڵەوە لە ڕۆژهەڵاتی دەژلە کە پەڕییەوە ڕانەوەستا لەشکری دەورەی فریاکەوێت. ئەبیهەیجاش لەولاوە لەشکرێکی باشی لەگەڵ کوڕەکانی خۆی ناردە لای، لە گوندی «باکلها» کە نزیک هەولێرە، کۆبوونەوە.

جیاووڵی لەولاوە هاتە بەرابەریان ڕاوەستا، لە نێوەڕاستەوە خۆی بەنیوەڕاستی سوپاهی جگەرمژدا دا. هەرچێکی لەپێشی بوو، خۆیان ڕانەگرت و هەڵاتن. کوژتار دەست پێکرا.

لەو شەڕەدا گەلێک پیاوی ناوداری کورد بەدەست تورکان بەکوژت چوون.

شەڕ پازدە ڕۆژ دەوامی کرد. هەرچەندە جگەرمژ بەئیفلیجی گورفتار بوو نەدەشیا بچێتە مەیدانی کوژتارەوە، بەتەختی ڕەوان هەڵیان دەگرت. لە نەتیجەدا لەشکری جگەرمژ شکا، کەس نەدەپەرژا سەر کەس.

ئەحمەدی کوڕی مەلیک قاورت بەگی کوڕی داود، لەگەڵ چەند کەسێک لەبەر تەختی جگەرمژدا شەڕیان دەکرد. بەشەو تەختی جگەرمژیان هەڵگرت کە بیرفێنن. ئەحمەد بریندار کرا و هەلات. جگەرمژ ماوە و کەوتە دەست دوژمن، بەدیل گیرا؛ لەشکرەکەش بەپەرێشانی ڕوویان لە هەلاتن کرد و ڕوو بەمووسڵ کشانەوە. لەشکرێکی جگەرمژ خواستبوونی دوو ڕۆژ پاش بەدیل گرتنی جگەرمژ، گەیشتنە مووسڵ، کە تەماشایان کرد لەشکر بەپەرێشانی ڕوو بەمووسڵ هەڵدێن. لەو شەڕەدا کوڕەکانی ئەبیهەیجا دیسان بەدیل گیران.

وەختێ جگەرمژیان بردە لای جیاوولی دەزبەجێ بەئیحترامەوە بۆ بەخێوکردنی ئەمری دا.

کە جگەرمژ گیرا جیاوولی لەشکری ڕوو بەمووسڵ ئاژۆت. ئەهالی مووسڵ و سوپاهێکی لە شاردا بوو، لە جیاوولییان گێڕاوە ئێمە هەتا پیاوێکی زیندوومان مابێ شەڕتان لەگەڵ دەکەین و خۆ ئەزیەت مەدەن و شار بەدەستەوە نادەین.

جیاوولی کە وای زانییەوە تێگەیشت کە گرتنی مووسڵ زۆر دژوارە؛ چونکو جگەرمژ وای قایم کرد بوو، چوار دەوری بەشوورە و کونگرەی بلندی وا -کە گرتنی بۆ کەس دەست نەدا- توندی کردبوو. لەسەر دیوارانی مەتەرێز و سوپەری بۆ شەڕکەر دروست کردبوو. هەر چوار دەورەی شوورەی بەخەندەقی قووڵی پڕ لە ئاو دەورە دابوو. لەبەر ئەوانە جیاوولی دەستی لە مووسڵ بەردا و ڕوو بەئەترافی کشاوە. بەهەر جۆرێک بوو لەشکری دیکەی کۆ کرد و گەڕاوە سەر مووسڵ.

جگەرمژیان سواری ئێسترێک کرد و بردیانە ژێر دیواری شوورەی قەڵاوە. جگەرمژ بانگی لە ئەهالی و سەرکردەکان کرد دەرگا بکەنەوە و وەرن ڕزگارم کەن؛ کەسێک خۆی تێ نەگەیاند و جوابی نەداوە. چەند ڕۆژێک بەو جۆرە جگەرمژیان دەبرد و دەیانگێڕاوە، چارەی نەبوو. شەوێکی لە ترسی دزینەوە جگەرمژیان لە بەندکرد؛ کە سبەینێ هەستان جگەرمژ لە بەندێدا مردبوو.

جگەرمژ لە پاش شێست ساڵ ژیان و خزمەتێکی زۆرکردن و بەرز و بلندکردنی

شانوشەوکەتی مەملەکەت و وەتەن و میللەتی، دوایی عومری لە دەست تورکمانی دوژمنیدا لە بەند و زنجیر تەواوی کرد.

لەولاوە ئەهالی مووسڵ و سەرداری عەشیرەت و سەرکردەی لەشکری جگەرمژ کە بەجارێک لە ژیانی جگەرمژ نائومێد بوون. سەرداری قەڵا و دژداری مەملووکی جگەرمژ «غەزغەلی» ناوبوو، لەودەمەدا سەری بۆ کوڕی ئاغای دانەواند. جگەرمژ چەندە ماڵ و ئەسپابێکی کۆکردبوونەوە و چەندە ئەسپ و ماڵێکی هەبوو، بەسەر لەشکریانیدا بڵاوکردەوە و گرتی قاقەزی لە سەیفوددەولە سەدەقە و قلیچ ئەرسەلان و بەرسقی شەحنەی بەغدا نوویسی کە یاریدەی بدەن و جیاووڵی نەهێڵن دەزدرێژی بکاتە سەر خاکی کوڕی جگەرمژ. هەمووڵا لەسەر ئەوە قەراریان دا یاریدەی بدەن، بەڵام سەیفوددەولە سەدەقە گوتی لازمە ئیتاعەی ئەمری سوڵتان بکرێ.

جیاووڵی لەولاوە دیسان دەورەی مووسڵی داوە؛ لە هەموو لایێکەوە وەتەنگی هێنا. لە ئەعیانی مووسڵ لە بنەماڵەی کەسیرات کە بەدەوڵەت و نفووس ناوبانگیان کردبوو، پیاوێکیان بەناو «ئەبو تالیب» بوو لە لای جگەرمژ سەرکەوتبوو جێگای بەرزی دەستکەوتبوو، هەموو ئومووریکی جگەرمژی خستبووە ژێر دەستی خۆیەوە؛ لەو شەڕەدا لە گەڵی بوو. کە جگەرمژ بەدیل گیرا «ئەبو تالیب» هەڵات و چووە هەولێر و پەنای بردە لای ئەبیهەیجا خاوەندی هەولێر. کوڕی ئەبیهەیجاش لەگەڵ جگەرمژدا لە وەختی شەڕدا بەدەست جیاووڵی ئەسیر کرابوون. جیاووڵی قاقەزێکی لە ئەبیهەیجا نوویسی کوڕی کەسیراتی بۆ بنێرێت، لەبری ئەو کوڕەکانی بەردەدات. ئەبیهەیجا «ئەبو تالیب»ی نارد و کوڕەکانی خۆی لە ئەسارەت ڕزگار کرد. کە ئەبو تالیب لە لای جیاووڵی ڕاگیرا مەرجی لەگەڵ کرد بەشەرتی بەردانی، مووسڵ بگرێت و بیخاتە ژێر حوکمی جیاووڵییەوە و هەموو خاکی جگەرمژی بەبێ ئەزیەت بخاتە دەست و ماڵ و ئەسپابێکی بێ ژماری بۆ پەیداکا. لەسەر ئەوە ئەبو تالیبی بەردا و زۆرچاک ئیحترامی گرت و جێگاییکی بەرزی لە ئومووری پێی دا.

بەڵام قازیی مووسڵ ئەبو قاسمی کوڕی وەدعان، لەگەڵ ئەبو تالیب دوژمن بوو، قاقەزێکی لە جیاووڵی نوویسی ئەگەر کوڕی کەسیرات بکوژرێت و سەری بۆ بنێرێت، بەبێ شەڕ و کوژتار مووسڵی تەسلیم بکات. جیاووڵی بەوە خەڵەتا و سەری کوڕی کەسیراتی بڕی و بۆ قازیی نارد. لەسەر ئەوە تەشویشاتێکی زۆر کەوتە نێو مووسڵەوە، لە لایێکەوە ماڵی ئەبو تالیب تاڵان کرا و لە لایێکەوە خانووی سووتاندرا. لەسەر ئەوە چەند

تورکمانێکی دوژمنی ئەبو تالیب بوون، دەستی خراپەیان بۆماڵی درێژکرد، گیران و کوژران.

جیاوولّی کە لەوە ئاگادار بوو دیسان کەوتەوە چارەی گرتن و وەدەست هێنانی مووسڵ؛ بەڵام وەکو گوترا بەشەڕکردن و زۆر، نەدەشیا مووسڵ بگرێت. دیسان دەستی بەدەوردان و وەتەنگهێنانی مووسڵ کرد و شەڕی بیناناوە.

جیاوولّی لەبەرئەوە گرتنی مووسڵی زۆر بەسەخت دەزانی، بەناچاری کشاوە، هەتا کەلێن دەست دەخات.

لەولاوە ئەهالی مووسڵ و سەرکردەی لەشکر و کوردەکانی جزیرە و ئەتراف لە مووسڵدا کۆبوونەوە و بەکۆمەڵە گرتیان «ئەزنگین»ی کوڕی جگەرمژ کە عومری یازدە ساڵانە بوو کردیانە حوکمدار و خوتبەیان بەناوی خوێندەوە. سەردار و ئەعیان و گەورەی مەملەکەت بۆ یاریدەدانی کەمەری خزمەتیان بەست.

ئەزنگین هەرچەند منداڵ بوو بەڵام لە عەقڵ و تێگەیشتندا تەواوبوو، بەڕەوشت خۆشی، لەشکر و سەرکردەکانی کردە هەواداری خۆی. بەوەعدە و دڵخۆشی دانەوە ئەهالی ڕاگرت، لەگەڵ ڕێکوپێکی خەریک بوو. سەردارەکانی لەشکر بەخەڵات و سوپاهی بەبەخشش و عولەما و کەی خوداکانیشی بەجیرە و بەرات شاد و خورسەند کردن. دیواری قەڵای دەورەی شاری تازە کردەوە و خەرەندی دەورەی پاک و قووڵ کردەوە. لە هەموو جێگا پێویستانی پاسەوانی دانا. دەستی بەئاواکردن و ئیحترام گرتنی پەرستش خانان کرد، بەڕەوشتی چاکانە میللەتی منەتدار کرد.

لەپێشدا باسمان کرد کە قاقەزیان لە قلیج ئەرسەلان ئەمیر سەدەقە و بەرسەقی نوویسی، هەرچێکو بەرسەقی شەحنەی بەغدا بوو بەتەماییێکی دیکە لەشکری هەڵگرت و چووە مووسڵ؛ لە تەرەف ڕۆژهەڵاتیەوە دابەزی. کەسێک نەچووە لای و بەخێرهاتنیان نەکرد و خۆشیان تێنەگەیاند. شەوێک ماوە و بەنائومێدی گەڕاوە، بەڵام مەلیک قلیج ئەرسەلانی سەلجووقی خاوەندی ڕۆم بەلەشکریەوە هات و گەیشتە نسێبین. جیاوولّی ڕوو بەژەنگار ڕۆیشت و لەوێ ئەمیر ئێلغازی کوڕی ئارتق و کۆمەڵەیێکی زل لە سوپاهی جگەرمژ لەگەڵی کەوتن. بەوە جیاوولّی هێزی زیادکرد و لەشکری خۆی لە چوار هەزار کەس دا. لەولاشەوە قاقەزێکی لە مەلیک ڕەزوانەوە بۆ چوو کە چاکە بۆ شەڕی فەڕەنگ بچێتە ڕەحبە.

لەولاوە کوڕی جگەرمژ و ئومەرای جەیش و ئەهالی مووسڵ ناردیانە لای قلیج ئەرسەلان کە لە نسێبین بوو، سوێندیان دا بۆ خۆیان و سوێندیشیان بۆ خوارد کە ئیتاعەتی بکەن، لەسەر ئەوە لەگەڵی گەڕانەوە مووسڵ. کوڕی جگەرمژ و ئەهالی بۆ پێشوازی دەرکەوتن. بیست و پێنجی ڕەجەبی ئەو ساڵە داخیلی شار بوو. ئەهالی و گەورەکانی خەڵات کرد و کوڕی جگەرمژی لەسەر تەخت دانا و خوتبەی بەناوی خۆی و ئەزنگین خوێندەوە، چاکەیەکی زۆری لەگەڵ لەشکریان کرد، قەڵای لە غەزغەلی مەملووکی جگەرمژ وەرگرت و دژدارێکی دیکەی لەسەر دانا، ڕەسمی زوڵمی لەسەر ئەهالی لابرد و عەدالەتی دامەزراند. قازیی ئەبا محەمەدی کوڕی قاسمی شارەزووری کردە قازییەلقوزات.

قلیچ ئەرسەلان لە پاش ڕێکخستنی ئومووری حکوومەت لە مانگی ڕەمەزاندا مووسڵی بەردا و ڕوو بەمەملەکەتی ڕۆم کشاوە.

وەکو بێژرا جیاووڵی کە ڕوو بەڕەحبە چوو، قووەتی پەیداکرد و لەشکر و سوپای زیادبوو، بۆ شەڕکردنی قلیچ ئەرسەلان چووە سەر ڕێگای.

لەولاوە کە ئومەراکانی قلیچ ئەرسەلان قووەتی جیاووڵیان زانییەوە، هیچ لە ئەرسەلان جوێ نەبوونەوە، لە خاپوور لەشکری جیاووڵی و قلیچ ئەرسەلان بەگژ یەکدا چوون. قلیچ ئەرسەلان بەنەفسی خۆی بەتیر و شیر شەڕی دەکرد و جیاووڵی بریندار کرد. جیاووڵی لەولاوە ڕوو بەمووسڵ گەڕاوە. ئەهالی و کوردی دەورپشتی یاریدەیان دا کە نزیک مووسڵ بوو، ئەهالی دەرگای شاریان بۆ کردەوە. لەولاشەوە کوڕی جگەرمژ ماڵ و خەزینەی لەگەڵ غەزغەلی نۆکەریان هەڵگرت و لە شار دەرکەوتن و ڕوو بەجزیرە ڕۆیشتن.

جیاووڵی کە داخیلی مووسڵ بوو گرتی پیاوەکانی جگەرمژ کە ببوون بەهەواداری قلیچ ئەرسەلان، بەئەزیەت و زیللەتی دووچارکردن و بڵاوەی تێ خستن.

ئەزنگین کە لە مووسڵ دەرکەوت لەشکرێکی زۆری لەسەرخۆ کۆکردەوە و ماڵ و عایلەی هەڵگرت و چووە وەتەنی خۆیان کە جزیرە بوو تێیدا دانیشتن و لەگەڵ ئیش و پێکهاتنی ئومووری مەملەکەتداری خەریک بوو، بەڵام چونکو لەپێشدا جگەرمژ جزیرەی دابوو بەکوڕی گەورەی کە ناوی حەبەش بوو، ئەزنگین دیسان ئومووری بەبراکەی تەسلیم کردەوە.

جیاووڵی کە مووسڵی گرت و چووە سەر جزیرە، حەبەش و غەزغەلی بۆ بەرابەریکردنی لەشکریان دەنگ دا. موددەتێکی زۆر بەشەڕکردن بەرابەرییان کرد، لە پاشان بەکەوتنە نێوانی ناوبژیکەران مامڵەت کرا و شەش هەزار دینار پارەیان دا جیاووڵی لەشکرەکەی ڕوو بەمووسڵ گێڕاوە.

سالّی پێنچ سەدو دوو مەودوودی کوڕی شەتگین لە لایەنی سولّتان محەمەدی سەلجووقی کرا بەوالی مووسلّ و ناردرا بەسەر خاکی جیاوولّی. لەولاوە جیاوولّی بەهێندی نەگرت و خۆی تێ نەگەیاند و مووسلّی بەدەستەوە نەدا. مەودوود بۆ یارمەتی ناردیە لای حەبەشی کوڕی جگەرمژ کە کۆمەگی بکات و سوپاهێکی بۆ کۆبکاتەوە.

لەولاوە کە حەبەش تەماشای بزووتنی ڕەعیەت و فەسادی جیاوولّی و هێز و دەستدرێژی سولّتان محەمەد و مەودوودی کرد، لەو گێژاوە خۆ ڕزگارکردنی بەچاک زانی لە حوکمداری. قاقەزێکی لە مەودوود نوویسی هەستێت بچێتە جزیرە و هەرچەند لەشکر و سوپاهێکی هەیبێ دەیداتێ. لەسەر ئەوە ڕوو بەجزیرە چوو. حەبەش نەقدینە و ئەسپابێکی کە هەیبوو هەڵیگرت و موڵک و خاکی کرپارێکی کە لەژێر دەستیدا بوو بۆ خۆی هەڵبژارد و پێویستی حوکمداری و لەشکر و سوپاهی مەملەکەتی بەمەرجی ئەمە کە مەودوود گەورەیی ماڵ و شەرەفی بنەماڵەی جگەر مژی بەخێوکا حەبش بۆ مەودوود دەستی لە حوکمداریی بەردا لە ماڵی خۆیدا بەچاندن و دەوڵەتپارێزی خۆی لە ئومووری مەملەکەتداری گۆشەگیر بوو.

حکوومەتی جزیرە لەو ساڵەوە کەوتە دەست مەودوود و حوکمداریی کوڕانی جگەرمژ و ئەولادانی دوایی هات.

## بەندی دووەم

### حوکمدارانی ئاتابەگان لە کوردستاندا

### ٥٠٨ - ٦١٩

سولتان محەمەد سەلجووقی لە ساڵی ٥٠١ دا مەودوودی کوڕی شەتگینی کردە والی مووسڵ، هەتا ساڵی ٥٠٨ مەودوود لە سروج و ڕەها و ئەو دەوروپشتانە لەگەڵ ئەهلی سەلیب شەڕی دەکرد. چووە دیمەشق ڕۆژی جومعە لە مزگەوت نوێژی دەکرد، گیان فیداکانی «باتینی» (باطنی) بەخەنجەر مەودوودیان لەنێو مزگەوتدا کوشت.

کە ئەو سەربهووردە بەسولتان محەمەد ڕاگەیشت، ئەتابەگ ئەمیر «ئاقسەنقەر بەرسەقی» کە لە کوردی لوڕی گەورە، خەڵکی شاری ڕەستاق، لە بنەماڵەی ئەتابەگانی لوڕستان بوو، بەوالییەتی مووسڵ تەعیین کرد. لە ساڵی ٥٠٨ هەتا ٦١٩ ئەو خاکانە لە دەست ئەو ئەمیرە کوردە و ئەولادیدا بوو.

کە ئەمیر ئاقسەنقەر بوو بەوالی مووسڵ، ئەمیری سنجار «ئەمیر نەمیرک» و ئەمیرەکانی دیکەی دەوروپشت پێکەوە چوونە سەر جزیرەی عومەر. موڵک و زەوی حکوومەت ئەوێیان دا بەئاقسەنقەر. لەوێوە ڕوو بەماردین چوون. ئەیازی کوڕی ئەمیر ئێلغازی بەلەشکرەوە تێکەڵ بەسوپاهی ئاقسەنقەر بوون. هەموو ئەو لەشکرە گەیشتە پازدە هەزار سوار. ساڵی ٥٠٨ گەیشتە ئۆرفە.

فەرەنگێکی لە ئورفەدا بوون، دەرگای کوشتاریان کردەوە و حەوت نەفەر ئیسلامیان لە ئاقسەنقەر بەدیل گرت و بەدیواری قەڵای ئورفەدا بەداریان داکردن.

لەسەر ئەوە ئیسلام دڵیان جۆشا و بەگەرمی شەڕ کرا، هەر گەورەیێکی فەرەنگ بکەوتبایە دەست موسڵمانان دەیانکوشت، شارانی ئورفە و سروج و سامساد و ئەترافانی -کە لە دەست فەرەنگدا بوون- وێران کران.

ئاقسەنقەر لەوێوە ڕوو بەحەلەب ڕۆیشت. بەگەیشتنی، حەلەبیشی لە دەست سلێمانی نەوەی ئەمیر ئارتق دەرخست. لە پاش ئەو ئەنتاکیە و شارانی دیکە کەوتە دەست ئەمیر

ئاقسەنقەر و گەڕاوە مووسڵ. لە پاش گەلێک خزمەت و ئاواکردنی مەملەکەت لە ساڵی ٥٢٠ لە مزگەوت نوێژی جومعەی دەکرد، فیدایییێکی «باتینی» (باطنی) بەخەنجەر کوشتی. لە پاش ئاقسەنقەر ساڵێک ئەمیر عیزەدینی کوڕی بەوالیەتی مووسڵ دانیشت. لە ساڵی ٥٢١دا مرد. عیمادەدینی زەنگی کوڕی ئاقسەنقەر بوو بەجێنشینی برای و دەستی بەحوکمداری کرد.

عیمادەدین زەنگی لە دەورەی بابیدا ببوو بەوالی بەسرە و واسیت. کە ئاقسەنقەر مرد، ببوو بەشەحنەی بەغدا. کە عیزەدینی برای مرد، ویلایەتی مووسڵ و دەوروپشتی خستە گەردنەوە و سەربەخۆیی و ئیستقلالی ئەتابەگان لەو دەمەدا دەس پێکرا.

عیمادەدین لە ساڵی ٥٢١ی مانگی ڕەمەزاندا گەیشتە مووسڵ و ئیدارەی حکوومەتی خستە ژێر پەنجەوە؛ دەستی بەڕێکخستن کرد. نەسیرەدین بوو بەدژدار (قەلعەچی). سەلاحەدین محەمەد بوو بەئەمیر حاجیب، بەهائەدین کرا بەقازیلقوزات، کاروباری حکوومەت لە مووسڵدا دامەزرا. ئەوجا ڕووی لە دەوروپشت کرد.

عیمادەدین زەنگی لە ساڵی ٥٢١دا چووە سەر جزیرەی عومەر بەدەورەدانێکی دوور گرتی و خستیە ژێر فەرمانی خۆیەوە). بەڵام لە پێش گرتنیدا ئەهالی بەموخابەرە گفتوگۆیان لەگەڵ کرد، بەمەرجێ بێزەرەری شاریان بەبێ ئەزیەت بەدەستەوە دا. عیمادەدین مەئموورێکی خۆی لەسەر جزیرە دانا.

لە ساڵی ٥٢٢ عیمادەدین نسێبین، ژەنگار، خاپوور، حەڕان (سروج) و دەوروپشتی ئەو جێگایانەی گرتن.

لە ساڵی «٥٢٨» عیمادەدین لەشکرێکی قورسی کۆکردەوە سەر قەڵایانی ئاکرێ، شووش و هیدیکە کە لەژێر فەرمانی کوڕەکانی «حەمیدی» دابوون، گرتنی. لەوێوە چووە سەر خاکی هەکاری و قەڵایانی گەهیچە، نۆشگوڵاب، فەرح، کەوسەر، زەعفەران، کەواشی و دەوروپشتی ئەو قەڵایانەی لەگەڵ قەڵاکان خستە دەست و چووە سەر قەڵایانی میهرانی و سروە، ئەوانیشی گرت. هەموو خاکی «زۆزان»ی هاویتە ژێر فەرمانەوە.

لە ساڵی ٥٣٤ دا عیمادەدین چووە سەر شارەزوور، قەپچەقی کوڕی ئەلب ئەرسەلانی وەتەنگ هێنا و بەهەر جۆرێک بوو شارەزووری خستە ژێر فەرمانەوە. سەیفەدینی غازی کوڕی خۆی کردە حوکمداری شارەزوور.

لە ساڵی ٥٣٤ دا عیمادەدین چووە سەر قەڵای «ئەشبا» کە یەکە قەڵای قایم و توندی

کوردەکانی هەکاری بوو؛ بەزۆری شەڕ گرتی و قەڵاکەی وێران کرد و دووبارە قەڵایەکی دیکەی دامەزراندەوە و ناوی خۆی خستە سەری؛ پێیان گوت «عیمادیە» کە ئەمڕۆکە ئامێدی پێ دەڵێن، لەسەر تەپەیەکی بڵند هەڵکەوتووە (واقعە).

## حوسامودەولەی کوڕی (خێوی قەڵای فنیک)

ساڵی ٥٤٠ عیمادەدین قەڵای جەعبەری دەورەدا و لەشکرێکی قورسی لەژێر فەرماندەی حەسان بەعلەبەکیدا ناردە سەر حوسامودەولە. حەسان ناوێکی بەعلەبەکی لەگەڵ حوسامودەولە نەیاربوو، گرتی قاقەزێکی لە حوسامودەولەی ئەمیری کوردان نوویسی کە: «کێ تۆ لە دەست من ڕزگار دەکا» و بۆی نارد. حوسامودەولە کە ئەو قاقەزەی خوێندەوە، لێی نووسییەوە: «ئەوکەسەی تۆی لە دەست بەڵەکی کوڕی بارام ڕزگارکرد، هەر ئەو منیش لە دەست عیمادەدین ڕزگار دەکا». دەزبەجێ قاقەزەکەی بۆ ناردەوە.

سەربهوردی ڕزگاربوونی حەسان لە دەست (بەڵەک) ئەمە بوو: لە ساڵی پێنج سەدو هەژدەی هیجریدا بەڵەکی کوڕی بارام بەتوندی حەسانی لە قەڵای بەعلەبەک دەورەدا، وەتەنگی هێنا. لە هەموو لایەکەوە حەسان کەوتە تەنگایەکی زۆرەوە. لە چاغی کوشتار و شەڕدا، تیرێکی ناکاو لەبەڵەک کەوت و کوژرا، لەشکرەکەی بەڵەک بڵاوەی تێ کەوت. حەسان لەو تەنگییە ڕزگار بوو.

حەسان کە ئەو قاقەزەی لە حوسامودەولە وەرگرتەوە، گەڕاوە دواوە و چووە لای عیمادەدین، بەڵام سەربهوردی قاقەزی خۆی و حوسامودەولەی بۆ نەگێڕاوە، هەر هێندە پێی گوت کە ئەمڕۆکە قەڵای «جەعبەر» گرتن لە فنیک چاکترە. لەسەر ئەوە لەگەڵ دەورەدانی قەڵای جەعبەر خەریک بوون.

لە ڕۆژی پێنچەمی ڕەبیعی دووەمی ئەو ساڵەدا، عیمادەدین لە دەست نۆکەرێکی خۆیدا بەکوژت چوو. لەشکری عیمادەدین بڵاوەی تێ کەوت. حوسامودەولە لە فیتنە و بەڵای عیمادەدین ڕزگار بوو. «مرآة العبر» هەر هێندە باسی حوسامودەولە دەکا.

کە عیمادەدین مرد بردیانە شاری «ڕەقە» ناژتیان. نورەدین کە عیمادەدینی بابی مرد لەسەر ئومووری بابی لەشکری هەڵگرت و چووە سەر حەلەب و بەخۆشی و ناخۆشی حەلەبی گرت.

کوڕی دووەمی عیمادەدین کە سەیفەدینی غازی بوو، بەحوکمداری شارەزوور خەریک بوو. کە بابی مرد گەڕاوە مووسڵ، لە جێگای بابی بوو بەحوکمدار. سەیفەدینی غازی لە

ڕۆژێ چووە سەرتەخت بابی، هەتا مرد لەگەڵ فەرەنگان بەجیهاد و غەزا بەسەری برد. گەلێک ناوبانگی کرد و زۆر موەفەق بوو. لە ساڵی «٥٤٤»دا مرد.

کە سەیفەدین مرد وەزیر جەمالەدین و ئەمیری جەیشی زەینەدین هەموو لەشکریان کردە هاودەنگ قوتبەدین. مەودوودو کوڕی عیمادەدینیان کردە حوکمدار.

قوتبەدین پیاوێکی دادخوا و بەدین و خۆش باوەڕ و خێرخوا و بەشەفەقەت بوو، لە نزیک جزیرەی عومەر لەسەر چۆمی «دجلە» پردی «کارگیر»ی دروست کرد کە ئەمڕۆکە وێرانە؛ بەڵام نیشانەی پایەکانی ماوە. لە ساڵی ٥٩٩دا مرد. جەنازەکەیان لەسەر وەسیەتی خۆی بردیانە مەدینەی مونەوەرە لە نزیک مەرقەدی نەبەوی بەپازدە گەز ناژتیان.

کە قوتبەدین مرد، سەیفەدینی کوڕی بوو بەجێ نوشینی. لە زەمانی ئەودا نورەدین مەحموودی مامی بۆ گرتنی مووسڵ و کوردستان لەشکری کێشا؛ بەماملەت ڕێکیان خستن. لە پاش ئەوە جزیرەی عومەری دا بەسنجەرشای کوڕی. لە ساڵی ٥٦٧ سەیفەدین مرد.

کە سەیفەدین مرد، عیزەدین مەسعوودی کوڕی قوتبەدین مەودوود بوود جێنشینی برای. لە ساڵی ٥٧٨ دا سوڵتان سەلاحەدینی ئەیووبی دەورەی مووسڵی دا. بەواسیتەی دایکی عیزەدین مەسعوود گەڕاوە و وزەرایانی سوڵتانیان لابرد، تکای قبووڵ کردن. لەولاوە وزەرا و برا و کوڕەکانی سوڵتان سەرزەنشتی سوڵتانیان کرد؛ دووبارە سوڵتان سەلاحەدین مووسڵی دەورەداوە. لەوەدەمەدا مردنی شاهڕوخ پادشای ئەخلاتیان بەسوڵتان ڕاگەیاند، سوڵتان چوو ئەخلاتی خستەوە ژێر فەرمانی خۆیەوە و گەڕاوە سەر مووسڵ. سێ بارە خستیەوە تەنگایی. موخابەرەی هەردوولا کەوتە کار. لە نەتیجەی موخایەرەدا لەسەر ئەمە قەرارگیربوو کە سکە و خوتبە بەناوی سوڵتان بێت و چەند پارچەیەک لە شارەزوور بۆ سوڵتان سەلاحەدین بەجێ بهێڵدرێ. بەو مەرجانە نێوانی سوڵتان سەلاحەدین و عیزەدین مەسعوود بەماملەت پێکهاتن. لەوەدەمەدا شارەزوور کەوتە ژێر حوکمداریی سوڵتان سەلاحەدینەوە.

بەمردنی سوڵتان سەلاحەدین، عیزەدین مەسعوود لەگەڵ عیمادەدینی برای کە لەسەر سنجار بوو ڕێککەوتن و چوونە سەر حەڕڕان و پەلاماری مەمالیکی سوڵتان سەلاحەدینیان دا. بەڵام نەخۆش کەوت و لەشکرەکەی دا بەعیمادەدینی برای و بۆخۆی گەڕاوە مووسڵ؛ لە شەعبانی ئەو ساڵی ٥٨٩دا مرد.

که عیزەدین مەسعوود مرد، نورەدین ئەرسەلان شاه لەجێگای بابی جێ نوشین بوو. له سالّی ٥٩٤نوورەدین ئەرسەلان شاه چووه سەر نسێبین که قوتبەدینی ئامۆزای گرت، قوتبەدین پەنای برده لای مەلیک عادیلی ئەیووبی، داوای یارمەتی لێ کرد. مەلیک عادیل لەشکری دایێ و ناردیه سەر نسێبین، نورەدین بەناچاری گەڕاوه مووسڵ.

سالّی ٦٠٠ حاکمی سنجار، قوتبەدین، خوتبەی بەناوی مەلیک عادیل خوێندەوه. ئەرسەلان شاه لەوه دلّگیر بوو، چووه سەر نسێبین و گرتی. لەسەر ئەوه قوتبەدین له مەلیک ئەشرەفی کوڕی مەلیک عادیل کۆمەگی خواست. بەیارمەتیی مەلیکی ئەوحەد حاکمی میافارقەین لینگیان دا سەر ئەرسەلان شاه و له گوندی «بووشره» شەڕ دەست پێکرا. ئەرسەلان شاه ڕوو بەمووسڵ گەڕاوه و هەلاّت و نسێبین کەوتەوه دەست قوتبەدین.

له سالّی ٦٠٧دا ئەرسەلان شاه مرد. عیزەدین مەسعوودی کوڕی بوو به حاکم و لەسەر تەخت دانیشت. که عیزەدین بوو بەحوکمدار به«مەلیک تاهیر» ناونرا. مەلیک تاهیر هەموو ئومووری حوکمداریی خۆی نا چنگ بەدرەدین لوولوو که کوڕێکی ئازا و ڕەشید و موتەهەوێر بوو. له مێژبوو خزمەتی بنەماڵەی ئاتابەگیان دەکرد. لەسەر ئەوه که له کوردەکانی لوولوو بوو، بەبەدرەدین لوولوو ناوبانگی کرد. بەدرەدین لوولوو هەموو ئوموورێکی خستە ژێر دەستی خۆیەوه. عیمادەدینی برای خۆی نارده سەر قەلاّی ئاکرێ و شووش؛ خستیه دەست. بەدرەدین ڕۆژ بەڕۆژ خۆی کۆ دەکردەوه.

له بیست و حەوتی ڕەبیعی یەک، له سالّی ٦١٥ه دا مەلیک تاهیر مرد. دوو کوڕی له پاش بەجێما؛ گەورەتریان ئەرسەلان شای نێو بوو، ده سالاّنه بوو. لەوەختی ساغیدا ئەو کوڕەی خۆی کردبووه وەلیعەهد. بەدرەدین ئەرسەلان شای کرده حوکمدار، بەلاّم کار و ئومووری له خۆی گرێ دا. له سالّی ٦١٦ ئەرسەلان شا مرد.

ناسرەدین ناو برای گچکەی که سی سالاّنه بوو کرا بەحوکمدار؛ بەدرەدین حکوومەتیی دەگێڕا. له سالّی ٦١٩دا ناسرەدین مرد. بەزۆر و بەخواهیشت بوو بەحوکمدار و بنەماڵەی ئاتابەگیان له کوردستاندا ڕووی له نەبوون کرد.

## حوکمداری بنەماڵەی لوولوو (٦١٩ - ٦٩٩)

که ناسرەدین بەکۆمەگی بەدرەدین بوو بەحوکمدار، موزەفەرەدین گوگبوری خاوەندی هەولێر وه عیمادەدین خاوەندی ئاکرێ بەهیوای حوکمداریی ئەو جێگایانه بوون و. هەریەک لەو دووانه له نزیک خۆیەوه ڕوو بەمووسڵ لەشکریان ناردبوو. بەدرەدین لوولوو بۆ ڕاگرتن له

مەلیک ئەشرەفی کوڕی مەلیک عادیلی ئەیوبی گیراوە و خۆی خستە ژێر چاوەدێری مەلیک ئەشرەفەوە و ئێخەی لە دەست ئەوانە ڕەها کرد. لە ساڵی ٦١٦دا ناسرەدین مابوو کە خۆی خستە ژێر دەستی مەلیک ئەشرەفەوە.

لە ساڵی ٦١٩ نورەدین لەشکرێکی ناردە سەر قەڵایانی ئاکرێ و شووش، لە دەست عیمادەدینی کوڕی نورەدین ئەرسەلان شای دەرهێنا خستیە ژێر فەرمانی خۆیەوە. عیمادەدین چووە ئامێدی.

لە ساڵی ٦٢١ موزەفەرەدین خاوەندی هەولێر بۆ گرتنی مووسڵ، لەشکرێکی قورسی کشاند. شاری دەورە دا. لەبەرئەمە کە مووسڵ کەوتبووە ژێر چاوەدێریی مەلیک ئەشرەفەوە، موزەفەرەدین دەورەدانی مووسڵی بەردا و گەڕاوە هەولێر.

لە ساڵی ٦٢٢ کە لەپێشدا شار و قەڵای ئامێدی لەژێر حوکمی عیمادەدین کوڕی ئەرسەلان شادا بوو، بەدرەدین لوولوو لەشکری بردە سەری، لە دەستی دەرخست و پیاوێکی خۆی لەسەر دانا. لە پاش چوار مانگ ئەهالی ئامێدی کۆمەڵیان بەست، هەموو مەئموورەکانی لوولوویان دەرکرد و بناغەی سەرکێشییان دامەزراند. لوولوو دیسان بەلەشکرێکی قورسەوە چووە سەریان، ئاکرێی گرت و خستیەوە ژێر حوکمەوە.

لە ساڵی ٦٢٩دا تاتارەکان ڕوو بەدیاربەکر چوون. گەلێکیان ئەزیەت دابە ئەهالی دا و تاڵان و کوژتاری زۆریان کرد و ڕوو بەمووسڵ خشان.

موزەفەرەدین خاوەندی هەولێر و لوولووی خێوی مووسڵ پێکەوە ڕێککەوتن بۆ بەرابەریی تاتارەکان چوونە پێشەوە. بەکوشتار ڕوو بەئاوربایەگانیان کشاندنەوە.

لە ساڵی ٦٣٧ بەدرەدین لوولوو لەشکرێکی هەڵگرت و چووە سەر مەلیک جەواد یونس کوڕی مەلیک مەودوود کوڕی مەلیک عادیل. لە پاش شەڕێکی چاک سنجاری لێ گرت و خستیە ژێر حوکمی خۆیەوە.

لە ساڵی ٦٤٤دا لەشکرێکی قورسی هەڵگرت و چووە سەر نسێبین و لەگەڵ خوارەزمییەکان شەڕی کرد. بەزۆر نسێبینی لە دەست دەرخستن.

لە ساڵی ٦٤٨دا بەدرەدین لەگەڵ مەلیک ناسرەدین بەشەڕ هات و شکا. نسێبین کەوتە دەست مەلیک ناسرەدینەوە و لوولوو گەڕاوە مووسڵ.

لە ساڵی ٦٥٦ کە هەلاکۆ بەغدای گرت و ڕوو بەجزیرە چوو. لوولوو ئیتاعەی هەلاکۆی کرد و حکوومەتی لە دەستدا ماوە.

له ساڵی ٦٥٧ بەدرەدین لوولوو مرد. حکوومەت کەوتە دەست مەلیک ساڵحی کوڕیەوە. هەلاکۆ موددەتێک حکوومەتی لە دەست مەلیک ساڵحدا هێشتەوە.

له ساڵی ٦٦٣ دیاربەکر و مووسڵ بەناوی «ئیقلیمی دیاربەکر» کرا بەئیمارەتێک وە شاری مووسڵ کرا بەپایتەخت ئەمیر تورانی کرا بەئەمیری ئەو ئیقلیمە. لە پاش ئەو ساڵە حکوومەتی لوولوو خرا سەر مەمالیکی هەلاکۆ.

## حکوومەتی ئاتابەگان لە جزیرە و بۆتان و ژەنگار

هەروەکو لە پێشدا بێژرا، سەیفەدین غازی کوڕی مەودوود لە ساغی خۆیدا جزیرە و بۆتانی دا بەسەرنجەر شای کوڕی؛ لە بۆ ئەو بوونی وەسیەت کرد.

لەساڵی ٥٧٦دا سەیفەدین غازی کە مرد سەنجەرشا جزیرە و دێهاتی دەوروبەری خستە ژێر حوکمەوە زەوتی کردن.

له ساڵی ٥٨٦ سوڵتان سەلاحەدینی ئەیووبی ڕوو بەجزیرە چوو کە بیگرێت. سەنجەرشا خۆی خستە ژێر چاوەدێری سوڵتانەوە و بۆ کوشتاری خاچپەرستان بەلەشکرێکی زۆر و دانەوێڵە کۆمەگی سوڵتانی کرد.

سەنجەرشا ماڵی بەجەور و ئەزیەتدان ڕاگرتبوو. لە دواییدا ماڵ و منداڵ و لەشکر و سەرکردانی لێ بێزار ببوون. لە کوڕانی مەحموود و مەودوودی ناردە خاکی زۆزان، لە قەڵای فەرەحدا بەندی کردن، وە غازیی کوڕەکەی دیکەشی لە خانوویێکی تەنگ و تاریکدا زنجیر کرد بوو، لە خواردنیش وەتەنگی هێنابوو. غازی لەو خانووەدا خۆی ڕزگار کرد و کۆمەگی لە نورەدین کردبوو.

غازی چونکو زۆر ناچار و وەتەنگ هاتبوو، شەوێکی چووە بووە ماڵی بابی، لە گۆشەیەکدا خۆی پەنهان دابوو کەلێنی دەست کەوێت؛ سەنجەرشای خنکاندبوو، دژدار و ئەهالی، کردەی غازییان زۆر بەخراپ دانا. ناردیان مەحموودی کوڕی سەنجەرشایان هێنا و کردیانە حوکمدار و غازییان لە ساڵی ٦٠٥ کوژت.

مەحموود بەموعیزەدین ناونرا و دەستی بەکاروباری حکوومەت ڕێکخستن کرد. کارەکەر و کەنیزێکی بۆ خنکاندنی سەنجەرشا کۆمەگی غازییان کردبوو، لە دەژلەدا خنکاندنی، لە پاش موعیزەدین جزیرە کەوتەوە سەر مووسڵ.

سنجار (شاری سنجار (ژەنگار) و دەوروپشتی لە ڕۆژی گرتنی مووسڵەوە، بەمووسڵەوە

گرێدرابوو. سەیفەدین غازی حوکمداری مووسڵ کە-بابی مردبوو- بوو بە حوکمدار. نورەدین مەحموودی حاکمی حەلەب زۆری لێ کرد ژەنگار و دەوروپشتی دابە عیمادەدینی کوڕی قوتبەدین مەودوود کە برای سەیفەدین غازی بوو. لە ساڵی ٥٦٦ھ ژەنگار کەوتەوە دەست عیمادەدینەوە.

عیمادەدین هەتا ساڵی ٥٩٤ بەئاسوودەگی حوکمداریی ژەنگاری کرد و لەو ساڵەدا مرد. قوتبەدینی کوڕی لە جێگایدا دانیشت بەحوکمداری.

ساڵی ٥٩٦ نورەدین ئەرسەلان شای حاکمی مووسڵ، تەلەعفەری لە قوتبەدین گرت و بەمامڵەت دووبارە دایەوە بەقوتبەدین.

ساڵی ٦٠٥ نورەدین ئەرسەلان شا لەگەڵ مەلیک عادیل خزمایەتییێکی زاوایی کەوتە نێوانیان. مەلیک عادیل خاکی ژەنگار و نسێبین و خاپووری لە قوتبەدین ئەستاند و دایە نورەدین.

مانگی سەفەری ساڵی ٦١٦ قوتبەدین مرد. عیمادەدین شاهنشای کوڕی جێگیر بوو. لە پاش چەند مانگێک عیمادەدین چووە سەر تەلەعفەر و بەبزووتنی عومەری برای پەلاماری جەماعەتێکیان دا. عیمادەدین لەو شەڕەدا کوژرا. عومەر گەڕاوە ژەنگاری گرت و کردیە ژێر دەستی خۆی؛ بەڵام زۆری نەکێشا.

ساڵی ٦١٧ مەلیک ئەشرەف سەنجاری گرت و دایە بەدرەدین لوولووی حاکمی مووسڵ. ئەوەوە ئەتابەگان لە ژەنگاریش دەرچوون.

جزمی چوارەم دوایی هات، بەیارمەتی خودا دەست بە هی پێنجەم دەکەین.

لێ وەرگر - مأخذ

١- التأريخ الكامل (أبن الأثير) - عارەبی.

٢- مرآت العبر (سەعید پاشای دیاربەکری) - تورکی.

٣- الروضتین في أخبار الدولتین - عارەبی.

٤- ناسخ التواریخ - فارسی.

**بەرگی دووەم**

# ئاوڕێکی پاشەوە

**جزمی یەکەم**

ئومەرا و حوکمدارانی بەناوبانگی کوردستانی شارەزوور

لە ساڵی ٦٥ھ - ساڵی ٦٥٦ھ

کردەوەی خێوی زاری کرمانجی

**سەید حوسێن حوزنی موکریانی**

٣ی تشرینی یەک ١٩٣١

ڕەواندز لە مەزرەکەی زاری کرمانجی دامەزرا

پەرتکراوی - نەشریاتی زاری کرمانجی - ١٥

## بەندی سێیەم

## ئومەرا و ناودارانی کورد کە لە دەوری ئیسلامەتیدا، یەکەیەکە لە شارەزوور و دینەوەردا ناوبانگیان کردووە

### فارس جزیری

فارس لە کوردانی جزیرە بوو. بەسوارچاکی و سیلاح شۆڕی و زەبەردەستی و پاڵەوانی و مەشهووری و ڕەشیدی و ئازایی ناوبانگی بەهەموو کوردستاندا بڵاوبۆوە. فارس لە جزیرە لە دایک بوو. بەخوێندن و زۆرخانە و زۆرانی گرتن و شیر و مەتاڵبازی خەریک بوو. خەلیفە هارون ڕەشیدی عەباسی ئازایی ئەو کوردە ڕەشیدەی بیستەوە، بەهەر جۆرێک بوو دڵخۆشییان داوە و بردیانە بەغدا.

لەلای خەلیفە گەلێک کەوتە ڕوو و کردیانە مامۆستای فێرکردنی شەڕ و زۆرانیگرتن و مەتاڵ وەشاندن.

فارس ڕۆژ بەڕۆژ پێشکەوت و هەتا گەیشتە دەرەجەیێکی وا کە لەبەرەو ژووری ئەو، کەسێک نەما و هەموو بوونە ژێردەستی ئەو و بوو بە وەستا.

ڕۆژێکی لەشەڕی ڕۆمییاندا پاڵەوانێکی ڕۆمی لە مەیدانی جەنگوجوودا موبارزێکی خواست. هارونوڕەشید ڕووی لە فارس کرد کە بۆی بچێتە مەیدانی کوشتارەوە.

ئەو پاڵەوانە ڕۆمییە لەنێو میللەتی خۆیدا یێکەتی دەستکەوتبوو، ناوبانگی کەوتبووە هەموو ڕۆژهەڵاتەوە. هارونوڕەشید لە زەبەردەستی ئەو زۆر دەترسا و لە چەند شەڕ و کوشتارێکا چاوی هارونوڕەشیدی ترساندبوو. کە چاوی بەو پاڵەوانە ڕۆمییە کەوت، خەلیفە لەرزینی دەست پێکرد. فارس لەوە ئاگادار بوو، کەمێک خۆی گرت، خەلیفە ئەمری کرد تاکو ئەسپێکی توند و مەتاڵێکی قایم و شیرێکی تیژ و ڕمبێکی ئەستوور و سەر بەپەیکان و زرێ و کڵاوبەزرێ و چوار ئاوێنە بۆ باسک بەند و خەنجەرێکی جەوهەرداری گەوهەربەندی بۆ بێننە مەیدان.

فارس گوتی: یا ئەمیرولموئمینین! ئومێدم بەئەسپ هەیە؛ بەرمبێکی لە دەستمدا بێ بەهێزتر دەبم؛ بەڵام شیرو مەتاڵیش قبوڵ دەکەم، ئەوانی ترم پێ ناوێت.

فارس چەک و ئالەتی شەڕ و کوشتاری لە خۆی گرێ دا و تەمای سواربوونی کرد. خەلیفە لێی چووە پێشەوە، بەدوعا خوێندن دەستی بەپشتیدا هێنا و قۆڵی فارسی گرت و سواری کرد و دەستی ڕوو بەعاسمان بڵندکرد، بەدەنگێکی بڵند دوعای خێری بۆ فارس و تووکی لە ڕۆمی کرد. خەلیفە بیست سواری ئازا و جەنگاوەری خستە پشت فارسەوە.

فارس کە سواربوو کەوتە ڕێگا، دۆڵ و شیوێکی لە پشتیدا بوو. کە سەرکەوتن پاڵەوانە ڕۆمییەکە بژاردنی بیست کەس بوون؛ ئەویش تەنها موباریزێکی خواستبوو. ڕۆمییەکە دەنگی کردن کە ئەمن پیاوێکم داوا کرد، ئێستاش ٢٠ پاڵەوان پێشیان پێ گرتم. دەیسا قەیدی ناکا، نایەڵم پیاوێکتان لێ ڕزگار بێ.

فارس هاواری لێ کرد مەترسە بێجگە لە تەنها پیاوێک بۆت نایەتە مەیدانەوە. فارس ئەوەی گوت وە لە هاواڵەکانی جوێ بووە. ڕکێفی لە ئەسپ دا و ڕوو بە ڕۆمییەکە چووە پێشەوە. کە تەماشای کرد چەند ڕۆمییەکی دیکەش لە قەڵا کەوتوونەتە پارێزەوە لە بۆسەیان. دیسان لەوەش باکی نەبوو، ڕۆیشت هەتا گەیشتە نزیک پاڵەوانی ڕۆمی. ئەو پاڵەوانە بانگی کردە فارس گوتی: کە چتێکت لێ دەپرسم ڕاستم پێ بڵێ. فارس گوتی: بڵێ. ڕۆمی گوتی: توخوا فارسی کورد نی؟ فارس گوتی: با ئەمنم. پێی گوت: لەگەڵم شەڕ دەکەی؟ پێی گوت: چۆن دەبێ شەڕ نەکەم؟ ڕۆمییەکە پرسیاری کرد کە شەڕمان کرد بەسەرمدا غالیب بووی، چیم لێ دەکەی؟ فارس گوتی ویژدانی خۆمت نیشان دەدەم. لە پاش گەلێک پرسیار و گفتوگۆ هەردوو خۆیان سازکرد و بەگژ یەکداچوون. موددەیەک بە شیر و مەتاڵبازی خەریک بوون. کە تەماشایان کرد هەردوو ماندوو بوون و هیچ کامێکیان سەرنەکەوتن. بۆ یەکتر دابەزین و دەستیان کرد بەزۆرانی گرتن. ئەو ڕۆژە هەتاکو ئێوارە یەکتریان هێنا و برد، لێکتر کاریگەر نەبوون. ئەوجا دەستیان بردە ڕمب، یەکتریان بەنووکە ڕمب داگرت و لەژێر زرێوە پەیکانە ڕمبیان تێک دەوەژاند، بەدڵخواز نەگەیشتن، ئەوجا دەستیان دایە شیری ئاودار، سەر و گوێی یەکتریان دا بەر شیران، لەوێش ماندوو بوون. ئەوجا سواری ئەسپ بوون و کەمەندیان هاوێتە یەکتر و یەکتریان کێشا، هێندە لەسەر ئەسپ یەکتریان هێنا و برد ئەسپی هەردووکیان تۆپین. فارس کە لە ئەسپ کەوتە خوارێ، بەتەڕدەستی ڕاستەوە بوو دەستی دا شیر و لینگی دا سەر ڕۆمییەکە

و بەهەموو هێزی خۆی شیرێکی داهێنایێ و وای زانی بەو شیرە کاری ڕۆمی تەواوبوو. بەڵام ڕۆمی لە ژێر بەرگیەوە زرێی لەبەردابوو؛ شیرەکە کاری لێ نەکرد و بەگورجی بڵندبوو فارسی دا بەر دەمە شیران.

فارس لەو تەڕدەستر بوو، بەمەتاڵ پێشی بەشیری ڕۆمی دەگرت. موددەتێکی زۆر بەو جۆرە لەگەڵ یەک کۆشان، هەتا لە دەستی ماندووبوون، لەولاوە هاواڵەکانیان ئەسپیان بۆ هێنان؛ هەریەک سواری ئەسپێک بوون.

فارس لە پاڵەوانیی زۆرانی گرتندا فڕوفێڵی دەزانیێ و لە شەڕ وکوشتاردا زرنگ و وریا و لە بەرابەریی نەیاریدا ڕەوشتی باش بوو. فارس کە سواربوو، جڵەوی ئەسپی سووڕاند و ڕووی ئەسپی وەرگێڕا و بەر بەخەلیفە ڕووی لە هەڵاتن کرد.

ڕەشید زۆر ترسا و وای زانی کە فارس پشتی دا و بەڕاستی لە دەست دوژمن هەڵات و نەیتوانی خۆ ڕابگرێ.

ڕۆمییەکە کە ئەوەی دی نەیار پشتی دا و هەڵات، زیاتر دڵ قەوی بوو، جڵەوی ئەسپی بەردا و کەوتە دوای فارس، هەر بەو جۆرە ڕۆیشتن هەتا چوونە نزیک خەلیفە، لەناکاو فارس. جڵەوی ئەسپی وەرگێڕا و بەتەڕدەستی پەلاماری ڕۆمی دا و لەسەر زینی بڵندکرد و ڕفاندی و بردیە بەردەمی ڕەشید. بەوە گەلێک شاد و خوڕەم بوو؛ چونکو لە دەست ئەو ڕۆمییەدا ئەزیەتی کێشابوو و ببووە بەڵا لە سەریان. خەلیفە ئەمری دا فارسیان زێڕ وەشان کرد، خەڵات و دیارییەکی زۆریان دایێ.

فارس لەو دەمەدا گوتی: ئەوانە بەکاری من نایێن، حەز دەکەم خەلیفە ئەمر بکا بەسەربەستی و ئازادی بگەڕێمەوە وڵاتی خۆم. بەستامی لە دائیرەتولمەعاریفیدا هەر هێندەی مەسعوودی خێوی «مروج الذهب» گێڕاوەتەوە؛ بەڵام لەوە زیاتر مێژووی مردن و ژیانی فارسمان دەست نەکەوت کە ئێمەش لێی بدوێین.

## ئەفشینی کوڕی دیوداد کوڕی یووسف ئەبی ساج

محەمەد لە ساڵی ۲۰۱هـ دا لە شارەزوور لە دایک بووە. لە ئومەرازادەکانی کوردی ئەو زەوییەیە. بەمنداڵی لەگەڵ خوێندنی عیلم و مەعاریف و هونەرمەندیی خەریک بووە.

ساڵی ژیانی نزیک بەچاردە بوو هەوای سەربەخۆیی و سەرداری کەوتە مێشکیەوە، داخوازیی فەرمانڕەوایی لە کەللەدا جووڵاوە دەستی لە خوێندن هەڵگرت و ڕۆژ بەڕۆژ خۆی نزیک بەعەباسییەکان کرد و دەم بەدەم ئەستێرەی بەختی درەوشا و هونەر و ئازایی خۆی

نواند. کەم کەمە بەرەو ژوور ڕۆیشت و بەرز بوو، هەتا بوو بەحوکمداری شارەزوور، هەکاری، جزیرە. ئەرمەنستانی خستە دەست. لەگەڵ ئەحمەدی کوڕی تۆلۆن سوڵتانی میسر ڕێککەوتو بوون بەسوێندخۆری یەکتر.

محەمەد هەتا ئەحمەد مابوو وەکو برایان ئیدارەیان دەکرد، کە ئەحمەد مرد «ابو لجیش خمارویە» کوڕی ئەحمەد بوو بەحوکمدار لە جێگای بابی دانیشت. ئەفشین محەمەد لەشکرێکی قورسی لە کوردستان کۆکردەوە، بەو لەشکرە گرانەوە بۆ گرتنی میسر ڕوو بەسووریا خشا. بەئیدارە وە سیاسەت هێواش و کەم کەمە شارانی ڕەقە و حەلەب و ئەنتاکیە و حەما و حومس و دەوروپشتیانی گرتن، وە خستنیە ژێر ئیدارە وە گەڕانی خۆیەوە. لە هەمووانا مەئموور و سەرکردەی لەشکری خۆی تێدا دانان. ڕۆژ بەڕۆژ هێزی پەیداکرد و ڕوو بەدیمەشق و شام بزووت؛ لەسەر ڕێگادا قووەتی زیادکرد.

خومارویە کە ئەوەی بیست بۆ بەرابەریی ئەفشین محەمەد بەلەشکرێکی گرانەوە لە میسر دەرکەوت و بەری خۆی دا سووریا کە ڕێگای بەدیوداد بگرێت.

هەتا خومارویە گەیشتێ، دێوداد دیمەشق و دەوروپشتی گرت و خۆی تێدا دامەزراند و لەشکرێکی قورسی بۆ پێش خومارویە لە دیمەشق دەرخستە دەرەوە. لە نزیک دیمەشق هەردوو لەشکر بەرابەر بەیەک بوون و بۆ کوژتار ڕیزەیان گرت و شەڕ و لێکدان چەند ڕۆژێک دەوامی کرد. خومارویە خۆی پێ ڕانەگیرا و بەشکاوی ڕووی لە هەڵاتن کرد.

دێوداد لەو شەڕەدا گەلێک یەخسیر و تاڵان و چەکی دەستخست و بەپیرۆزیی گەڕاوە دیمەشق. پیاوانی بۆ کوردستان بەڕێ کرد کە لەشکری بۆ کۆکەنەوە تاکو ڕوو بەفەلەستین و میسر بجووڵێتەوە. لە ساڵی ٢٧٦دا ئیسحاق کوڕی کەنداج بەسوپاهێکی زۆری کوردانەوە لە مووسڵ بزووت و بۆ کۆمەگیکردن چووە لای دیوداد. لەولاشەوە دیوداد خۆی سازکردبوو کە ئیسحاقیش بەهاواریەوە چوو، بەو سوپاهە گەورەوە لە دیمەشق دەرکەوتن و چوونە «شیزەر» خومارویە دووبارە لەولاوە سوپاهی بەلاو کرد و گەڕاوە سەر دیوداد، کە نزیک بەسووریا بوو بەحیلە و فێڵ خۆی گەیاندە دیمەشق و گرتی و هەموو مەئموور و پیاوەکانی دێودادی دەرکردن.

لە پاش خۆ دامەزراندنی، بەو هێزەوە ڕوو بەشیزەر بۆ بەرابەری دێوداد دەرکەوت. لە شیزەر بەرابەر بەیەک بەبێ شەڕ موددەتێک دانیشتن. دێوداد ناردبوویە شارەزوور کە لەشکری بۆ بچێت و چاوەنواڕی پشتیوان و یارمەتی بوو، چەندێک ئەو چاوەنواڕیەی

کێشا و بەبێ شەڕ هەردوو لا ڕاوەستابوون.

خومارویە خۆی پێ ڕانەگیرا و هەڵمەتی دایە دێوداد و شەڕ هەڵایسا. لە دوایی دوو شەو و دوو ڕۆژ کوشتار، خومارویە بەناچاری ڕووی لە هەڵاتن کرد و شکا. ئەو شکانە گەلێک پیس بوو و بەپەرێشانی لە شیزەر دەرکەوت. لەوەدا دیوداد گەلێک چتی گرانبەهای دەست کەوت.

لەو ئەسنایەدا، ئەحمەد ئەبی عەباسی کوڕی موەفەق کە بە«ئەلموعتەزید» لەقەب کرابوو لە بەغداوە بەلەشکرێکی زۆرەوە بەهاواری دیوداد گەیشتە شیزەر. کە دیوداد ئەوەی زانی گەلێک پێی ناخۆش بوو، بەڵام بەسەر خۆیان نەهێنا و بەعیز و شەرەفەوە پێشوازی خەلیفەی تازەیان کرد. بەڵام ئەلموعتەزید خۆی ڕانەگرت و لەگەڵ دێوداد کەوتنە سەر خومارویە و بەدیل گرتن و تالان و کوشتار خومارویەیان شەپرزە کرد. خومارویە بەهەزار کێشە خۆی خستە دیمەشقەوە و لەوێش خۆیان پێ ڕانەگیرا و هەڵاتن.

موعتەزید لەگەڵ دێوداد لە مانگی شەعبانی ساڵی ٢٧١ چوونە سەر دیمەشق بەشەڕکردن گرتیان. لەشکری خومارویە ڕوو بەڕەملە خشان و لەوێوە قاقەزێکیان بۆ خومارویە نوویسی و ئەحواڵی خۆیانیان تێگەیاندن، لەولاوە خومارویە بەلەشکرەوە لە میسر دەرکەوت و ڕێگای ڕەملەی گرتە پێش.

موعتەزید کە ئەوەی زانییەوە خومارویە بەسوپاهێکی گرانەوە بۆ ڕەملە ڕۆیشت، بۆ بەرابەری کردن سوپاهی دەنگ دا و لە دیمەشق چووە دەرێ کە پێش بەخومارویە بگرێ.

دێوداد لەو بزووتنە ناشایستەی موعتەزید گەلێک ڕەنجیدە بوو کە بزووتنێکی وا خوێنڕێژانەی کرد و خۆی لەوان هەڵسوو و لە موەفەقیەتی دێودادی ئیستفادە کرد و ناوی خۆی خستە نێوانی و پرسێکی بەدێوداد نەکرد؛ لەسەر ئەو بزووتنەوەیە ناردی کوڕی کنداجی بردە کن خۆی و جووڵانەوەی موعتەزیدی هێنایە پێش. ئەویش زۆر دڵگیربوو، پێکەوە لەسەر ئەمە ڕێککەوتن.

کە لە دیمەشق دەرکەوتن، هەردووکیان ڕوو بەقنسرین ڕۆیشتن. دیوداد قنسرینی کردە لەشکرگا و کوڕی کنداجیش گەڕاوە مووسڵ.

موعتەزید لەولاوە ڕوو بەخومارویە خشا و لە چوونی دیوداد ئاگادار نەبوو، بەبێ شەڕ گەڕاوە و بۆ میسر ڕۆیشتەوە.

دیوداد لەڕقی موعتەزید وەڵامی بۆ خومارویە نارد کە پێکەوە مامڵەت بکەن، هەردوو

لا پێکەوە لەسەرئەمە ڕێککەوتن، کە دیوداد کوڕێکی خۆی بنێرێتە میسر و لەسەر مینبەران خوتبە بەناوی دیوداد و سولتانی میسر بخوێندرێتەوە و سککەش بەناوی هەردووکان لێ بدرێ. دیوداد لە داخا ئەوەی ویست و ناردیە کوردستان و خوتبەیان بەناوی هەردوو لا خوێندنەوە و کوڕێکی خۆشی ناردە میسر. کە ئەو مامڵەتە قەرارگیر بوو، خومارویە پێش پێگرتنی موعتەزیدی بۆ خۆ گرت و دیودادیش بۆ سەر عێراق چوونی هەڵبژارد. لەسەر ئەوە هەردوو لا لەخۆ خڕکردنەوە خەریک بوون.

کوڕی کنداج کە لەنێوانی دیوداد و خومارویە گەیشت، ئەویش بوو بەهەواداری خەلیفە و لەشکری قورسی لە عێراق کۆکردەوە. لەولاشەوە دێوداد ڕوو بەعێراق بزووت، لە فورات پەڕیەوە. کوڕی کنداج لەولاوە چووە پێش، هەردوو لا بەگژ یەکدا چوون. شەڕێک کرا کوڕی کنداج شکستی خوارد و ڕوو بەماردین هەڵات. دیوداد کەوتەسەری و لە دووی نەبوەوە هەتا لە قەڵای ماردینی پەستاوت. کوڕی کنداج قەڵای لەسەرخۆ گرێ دا و دیوداد دەورەی گرت. لە پاش چوار ڕۆژ دەوردەدان کوڕی کنداج بەشەو دەرپەڕی و ڕوو بەمووسڵ هەڵات.

سبەینێ کە زاندرا هەڵاتووە، دێوداد کەوتە دوای هەتا لە مووسڵی خزاند. کوڕی کنداج لەوێشی خۆنەگرت و هەڵات. دیوداد چوو مووسڵی گرت و مەئموورێکی خۆی لەسەردانا و بۆ خۆشی ڕوو بەدیاربەکر ڕۆیشت. هەموو وڵاتی مووسڵ و جزیرەی خستە حوکمی خۆیەوە و خوتبەی بەناوی خۆی و خومارویە دایە خوێندنەوە.

لە ساڵی ٢٧٧دا لە ژێر فەرماندەی کوڕی خۆیدا لەشکری دەرخستە دەرەوە و دەستیان بە«کودەیی» (تەحسیلات) کرد. عەشیرەتی یەعقووبی سەرکێشییان کرد. لە پاش گەلێک شەڕ و کوشتار ئەو عەشیرەتەیان دەرکرد و مایەی فیتنەکانی بەجەزا گەیاندن.

هەر لەو ساڵەدا کوڕی کنداج چووە میسر و لەگەڵ خومارویە ڕێک کەوت. دیوداد کە ئەوەی زانییەوە ناوی خومارویە لە خوتبەدا لابرد و بەتەنها ناوی خۆی هێشتەوە. دیوداد لە پاش ئەوەی دەستی بەئومووری ڕێکخستنی وڵات و دەستخستنی دڵی ئەهالی کرد،لەشکرێکی زۆر چاکی ساز کرد و چووە دیمەشق و ئەوێشی ڕێکخست. لە ترسی فیتنەی خومارویە و کنداج، دەستی بەبەخشش و خەڵات بەسەر ئەهالیدا کردەوە. خومارویە لە میسرەوە لەشکری کێشا و چووە سەر دیمەشق و لە دەرەوەی شار هەردوو لا بەرابەر یەک وەستان.

دیوداد لە ئەهالی شام زۆر ئەمین نەبوو، خەزێنە و چەکی زیادەی نارده حومس. بەدزیەوە ئەهالی دیمەشق خومارویەیان لەوە ئاگادار کرد. ئەویش بەپەنهانی زۆر بەلەز، دەستە سەربازێکی نارده پێشەوە، لەپێش گەیشتنی خەزێنەدا لەشکری خومارویە لە کەنار حومس پێشی بەخەزێنە گرت و هەمووی بەتالان خستە دەست.

دێوداد کە تەماشای کرد ئەهالی سووریا و بەتایبەتی دیمەشقیەکان خیانەتی لەگەڵ دەکەن، دیمەشقی بەردا و ڕوو بەحەما و حەلەب کشاوە.

خومارویە کەوتە دوای و لێی نەبووەوە هەتا گەیاندیە ڕەقە. دێوداد لەوێشی خۆپێڕانەگیرا و ڕۆیشتە مووسڵ. خومارویە کەوتە سەری. دیوداد ڕوو بەحەدیسە ناو شارێک ڕۆیشت کە لەسەری زێی بادینان لەنێوانی مووسڵ هەولێردا هەڵکەوتبوو، خاوەندی حەدیسە -کە هارون بجێلی بوو- کۆمەگی کرد. خومارویە بە دوو هەزار کەسەوە و کوڕی کنداج بە هەزار پیادەوە چوونە تگریت و تەمای کەشتی دروستکردنیان کرد کە لە «دەژلە» ڕوو بەشارەزوور بپەڕنەوە.

دیوداد نەچووە پێشیان، بەڵام لەشکرێکی چاکی بەیارمەتی هارۆنی خێوی حەدیسە هەڵگرت و چووە مووسڵ و لە دەرەوەی شار لەشکرەکەی قایم کرد . لەولاوە خومارویە چووە سەری و دە شەو و دە ڕۆژ شەڕی خوێنرێژییان تێکنا و کوشتارێکی قورسیان لێک کرد. لە دواییدا کوڕی کنداج نەیتوانی خۆ ڕاگری و ڕوو بەڕقە هەڵاتە پاشەوە. دیوداد کەوتە دوویان و گەلێک یەخسیر و تالانی دەست کەوت. گرتی قاقەزێکی لە موەفەقی عەباسی نووسی کە کۆمەگی بکا تاکو بچێتە سەر خومارویە و لە فورات بپەڕێتەوە. خەلیفە جوابی داوە چاوەنواڕی بکا هەتا یارمەتی بۆ دەنێرێ.

کوڕی کنداج لەو موددەتەیدا کەلێنی گرت و چوو لەشکرێکی زۆری لە سووریا کۆکردەوە و گەڕاوە ڕەقە.

دیوداد لەسەر فورات لە بەرابەری ڕەقە چادری هەڵدا و بۆ قووەت چاوەنۆڕ بوو. بەڵام بەچاو و ڕا و ڕۆژ بەڕۆژ دڵخۆشی لەشکرەکەی خومارویە دەداوە و دەیهێنانە لای خۆیەوە. ڕۆژ نەبوو دەستەسوارە و پیادەیەکی لەشکر لە فورات نەپەڕێتەوە لای دیوداد.

کوڕی کنداج کە ئەوەی زانی بەناچاری ڕۆیشت و پەنای بۆ خەلیفە برد و چووە بەغدا. خەلیفە موەفەق کەوتە نێوانیان و بەمامڵەت هەردوو لای پێکهێنان.

دیوداد لە ڕەقەوە لەشکرەکەی ناردەوە شارەزوور و بۆ خۆشی چووە بەغدا. خەلیفە

لەبەری خاکی جزیرە، هەموو وڵاتی ئاوربایەگانی دا بەدیوداد و جزیرەش درا بەکوڕی کنداج و خومارویە. لەساڵی ٢٧٦ دا دیوداد بوو بەحوکمداری شارەزوور و ئاوربایەگان. دێرسمی کوڕی ئیبراهیم کوردی بوو بەسەرکردە کە لە ئاخیردا بوو بەحوکمداری ئاوربایەگان. دیوداد دێرسمی بەوالییەتی ناردە سەر ئاوربایەگان. وە «مونیس» کرا بەسەرداری قرمیسین. دیوداد بەئیستراحەتێکی تەواو هەتا ساڵی ٢٨٨ بەخۆشی حوکمداریی شارەزوور و ئاوربایەگانی کرد و بەبێ کێشە و ئەزیەت ڕایبوارد.

دیوداد لە ساڵی ٢٨٨ دا لە شاری «بەرزەدە» لە خاکی ئاوربایەگان بەئامورزەشی یەزدان شادبوو.

## ئەسحابی کوڕی دیوداد ئەفشین محەمەد

لە ساڵی ٢٨٨ھ دا کە دێوداد مرد، ئەسحاب کە یەکە سەرداری بوو، لەسەر تەختی حوکمداریی شارەزوور و ئاوربایەگان و دینەوەر لە جێگای باوکیا دانیشت.

هەروەکو لەپێشدا بێژرا لە چاخی حوکمداریی بابیدا خاکی کوردستانی شارەزوور و قرمیسین و ئاوربایەگان کەوتبوونە ژێر پەنجەی سەرکردەکانەوە سێ پاڵەوانی کورد بەسەر حکوومەتی ئەو جێگایانەدا ڕادەگەیشتن.

کوڕی دێوداد هەر بەناو بوو بەحوکمدار، هێندە بەهێزنەبوو نەشیدەتوانی ئەو سەردارانە دەرخا و دەستیان لە ئیش بکێشێتەوە، بەڵام بەئوسووڵێکی حەکیمانە ڕایدەگرتن و حوکمداریی خۆی پێ دانەناسین. ئەوانیش دیسان لەبەر ڕۆژێکی کەلێن دەستکەوتن بۆ هەموو ئەمرێکی ئامادەبوون و لە ژێر بەیداغیدا دەکۆشان.

لە ساڵی ٣٠٤ دا مونیس کە یەکێک بوو لە سەرداران، بەدەسیسەی موقتەدیر خەلیفەی عەباسییان دەستی بەسەرکێشی کرد. ئاوربایەگانی لە ژێر حوکمی ئەسحاب دەرخست و کردیە ئەمارەتێکی ژێر حوکمی خۆی.

لە ساڵی ٣٠١دا «سەبووک ڕەیی» ناو کە سەرکردەیەک بوو ڕووی لە ئەسحاب وەرگێڕا و قووەتێکی زۆری خستە ژێر دەستەوە و قرمیسین و دەوروپشتی گرت. ئەسحاب بەمامڵەت لەگەڵ سەبووک ڕەیی ڕێککەوت کە دەستی لە قرمیسین بەردا، سەبووک ڕەیی بچێتە سەر ئاوربایەگان لە دەست مونیس ڕزگارکا و بۆ خۆی ببێتە حوکمدار.

سەبووک ڕەیی بەوە ڕازی بوو، بەقووەتی هەردووکیان لەشکریان کۆکردەوە. گەلێک کۆشان بەڵام لەوساڵەدا ئاوربایەگان کەوتە دەست ئەمیر دەیسامی کوڕی ئەمیر ئیبراهیمی

کوردی. چونکو ئێمە لەم کتێبە پیرۆزەدا باس لە حوکمدار و ئومەرایانی شارەزوور و دینەوەر دەکەین، لەمە زیاتر باس لەو ئومەرایانە ناکەین کە حەز دەکەن لە ئەحواڵی دەیسام بگەن و تەئریخی ئاوربایەگان بزانن، تەماشای کتێبی (پێشکەوتن)ی ئێمە بکەن لە ساڵی (١٣٤٦)دا چاپ کراوە.

## موساویر کوڕی حەمید هەزبانی

موساویری کوڕی هەزبانی ساڵی ٢٠٥ لە شاری هەولێر لە دایک بووە و بەئازایی و زرنگی و تێگەیشتوویی ناوبانگی کرد. گەلێک لەگەڵ خوێندن و زانین خەریک بوو؛ لە دوای ئەوە بوو بەمەئموور.

مێژوونویسەکانی تات لەبەرئەمە کە لە خەلیفە عەباسییەکان ڕووگەردان بوو و لە بەدڕەوشتی ئەوان دەستی بەسەرکێشی کرد، ئەو پاڵەوانە کوردە بەموساویری ناودەبەن؛ چونکو پیاوێکی بەغیرەت و بەشەرەف بوو، گەلێک بزووتنی خراپی لە عەباسییەکان دەدی و غیرەتی هەڵی نەدەگرت، جا لەو دەمانەدا پیاوێکی غیرەت کێش کە چاوی عەیب دیتنی هەبووایە وە جەور و ئەزیەتی بیانییەکانی نیشان بەکوردەکان بدابایە، بەخاریجی - یەعنی بەبێ دینی- ناویان دەبرد؛ هەتا میللەت حەزیان لێ نەکردبایە و لە دەستیان خستبایە.

نموونەی ئەو حاڵە ئەمرۆکەش لەنێو کوردستانا هەر ماوە، وەکو کۆشەری مونەوەر و لاوەکانی کورد و مەلا نەخوێندەوارەکانی کورد کە لە حەق لاوەکانا چاوڕاو دەکەن، لە چاخی عەباسییەکانیشا میللەتپەروەرەکانی کورد بۆ ڕزگاری وەتەن و ئازادی میللەت دەکۆشان. بەپیتی خاریجی ئەو کوردپەروەرانەیان ڕەخنەدار دەکرد.

موساویر بەسەبات و ڕاستی و ئازایی دڵی هەموو ئەهالی کێشابوو؛ هەمووکەس خۆشیان دەویست هەرچتێکی بەواژی کوردەواری بهاتبایەتە بەرچاوان، بۆ لابردنی دەکۆشا. لەو ڕێگایەدا زۆر ماندوو بوو، تووشی گەلێک سەرئێشە بوو، بەناچاری گۆشەگیری هەڵبژارد و چووە جێگایەک کە بە«بوازیج» ناو دەبرا. دوور لە دەسایسی عەباسییەکان دانیشت.

لە ساڵی ٢٥٢دا حوسێن ناو، مەئموورێکی شورتەی عەباسییەکان لە شاری (حەدیسە) -کە ئەمرۆ بەشاری مەخموور ناو دەبری- ناردێ موساویری خواست بۆ «کودەیی» (تەحسیلداری) بەزۆر ناردیە دێهات کە بەهانەیەکی پێ بگرێ.

موساویر کوڕێکی (حەوسەرا) ناوی هەبوو، لە شۆخی و جوانیا بێ وێنەبوو؛ حوسێن بەبهانەیەک حەوسەری گرت و لە بەندی کرد.

سەعید پاشای دیاربەکری لە کتێبی دووەمی «مرآة العبر»یدا دەڵێت کە حوسێن شەوێکی حەوسەری لە بەندیخانە دەرخست و بردیە دیوانی مەیخواردنەوە و بەزمەوە کە مەستی بکا و بەئەتک دەست بۆ ناموسی درێژکا. هەرچەندی کرد مومکین نەبوو، دووبارە خستیانەوە زیندانێکی تەنگ و تاریک و زنجیر و پالەهەنیان کرد. حەوسەر کە گەڕاوە نێو زیندانی بەهەر جۆرێک بوو قاقەزێکی لە بابی نوبسی ئەگەر فریای نەکەوێ: «بە ڕۆژ بەند و زنجیرکراوم و بەشەو بووکی مەجلیسارام».

کە ئەو قاقەزە گەیشتە دەست موساویر، ئاوری کەوتە گیانەوە و هۆشی لەسەر نەما. ئەو قاقەزەی هەڵگرت و دێ بەدێ گەڕا و قاقەزەکەی بەکوردەکان نیشان دەدا و پێی دەگوتن: «کە بزانن مەئموورێکی تات هاتۆتە نێو ئێمە دەست بۆ شەرەف و ناموسی کوردان درێژ دەکا. ئەوە چ غیرەت و ناموسێکە بۆ ئێوە ئەوە هەڵگرن، پیاوێکی وا بتوانێت دەست درێژییێکی وای لێ ڕوو بدات و ئێوەش بێ دەنگ بن؛ ئەمڕۆکە لەمن بێ سبەینێ لە ئێوە».

لەسەر ئەوە کوردێکی زۆر بوون بەکۆمەگی دەردی موساویر؛ ئازا و ڕەشیدێکی زۆری لەسەر کۆبۆوە. موساویر لەشکرێکی قورسی هەڵگرت و چووە سەر شاری حەدیسە؛ بەبێ شەڕ چووە نێو شارەوە.

حوسێن کە ئەوەی زانی لەنێو ماڵاندا خۆی وەشارد. موساویر حەوسەرەی کوڕی لە بەند دەرخست و دەستی بەدامەزراندنی ئوموری شارکرد. لە هەر چوار کەنارەوە کوردی لەسەر کۆبووەوە و لە دوایی ڕێکوپێکی حکوومەت سوپاهێکی باشی ساز کرد و ڕوو بەمووسڵ لە حەدیسە دەرکەوت.

عەقەبەی کوڕی محەمەد لەودەمەدا بەئەمری خەلیفە والی مووسڵ بوو. خۆی کۆکردەوە کە پێش بەموساویر بگرێت لە دەستی نەهات؛ چونکو عەقەبە لەشکری کە لەژێر فەرمانیدا بوو کۆی کردەوە، لە مووسڵ دەرکەوت. بەرابەر بەموساویر ڕیزبوو. بەیەکە هەڵمەت عەقەبە شکا؛ گەلێک ماڵ و ئەسپابی بۆ موساویر بەجێهێشت. موساویر چەندەی تالان دەست کەوت، بەسەر لەشکری خۆیدا بەخشییەوە. هەر بەو چوونە، دەورەی مووسڵیدا. لەولاوە ئەهالی لەگەڵ موساویر یەک بوون و نەیانهێشت فیتنە پەیدا بێت، بەزوویی دەروازەی

شاریان کردەوە و موساویریان بردە نێو شارەوە. هەموو ئەهالی چوونە بەخێرهاتنی موساویر، بەوە هێزێکی چاکی دەست کەوت و لەشکری فرەکرد و لەگەڵ ڕێکخستنی شار و ئەترافی خەریک بوو.

خەلیفە لەشکرێکی قورسی ڕێک کرد و ناردیە سەر مووسڵ. موساویر لە مووسڵ دەرکەوت و چوو لە تگریت پێشی پێ گرت، بەکەم پەلامارێک لەشکری خەلیفەی شکاند و لە دوای کوشتارێکی زۆر بەشادمانییەوە گەڕاوە مووسڵ و جاری سەربەخۆیی لێدا.

ساڵی ٢٥٣ خەلیفە لەژێر فەرماندەی «بەندار» سوپاهی ناردە سەر موساویر کە بیگرێت. موساویر بۆی دەرکەوت لە پاش شەڕ و کوژتار، بەندار بەهەر فێڵێک بوو پەنچا کەسێکی بۆ ڕزگار بوو؛ لە مەیدانی خوێناوی خۆی هاوێژت و هەڵات.

موساویر کە وردبۆوە لە مووسڵ دانیشتن ئاسوودەگی دەس نادات و ناحیەی «مەرجە»شی بەسلێمان ئەزدی فرۆشراوە و ئەهالی و عەشیرەتی «عەنیزە» لە سلێمان ڕووگەردان و عەشیرەتی «شەیبان» ببوون بەئالەتی شەڕوشۆڕ، ئەمنیەتی بەئەهالی مووسڵ دا. ناردی بەناچاری مووسڵی دا بەنۆکەرێکی خۆی و لەشکری کوردەکانی هەڵگرت و چووە شاری «حەدیسە» و کردیە پایتەخت.

هەر لەو ساڵەدا خەلیفەی عەباسیان، ئەیووبی کوڕی ئەحمەدی تەعلەبی کردە والی مووسڵ و ناردی. ئەیووب گرتی و حەسەنی کوڕی خۆی کردە وەکیل لەگەڵ حەمدانی کوڕی حەمدوون و عەشایری عارەبی دیکە ڕێککەوتن و لەشکرێکی قورسیان بردە سەر موساویر و لە وادی ڕیاد بەرابەر بەیەکتر بوون و شەڕ گەرم بوو. لەشکری حەسەن لە دەست کورداندا نابوود بوو. نۆکەرێکی حەسەن -کە خەڵکی هەولێر بوو- حەسەنی لە مەیدان دەرپەڕاند و بردیە هەولێر و لە «هەرە» (حرە) پەنهانی کرد و هەموو ئەسپابیان کەوتە دەست کوردەکان.

ساڵی ٢٥٥ موساویر بەلەشکرەوە هەڵمەتی بردە سەر مووسڵ. سلێمان ناوێ کە کشار (ئەمیرو لبەلەد) نەیتوانی پێشی پێ بگرێت؛ بەپەنهانی لە شار دەرکەوت و هەڵات. موساویر بەبێ شەڕ چووە نێو شارەوە و چوونە مزگەوت.

موساویر لەسەر مینبەر خوتبەیەکی بۆ یێکەتی و دەست پێکگرتن خوێندەوە و دڵخۆشی و نوازشی ئەهالی کرد. لە پاش چەند ڕۆژێک دامەزراندنەوەی ئوموور گەڕاوە حەدیسە.

موساویر پیاوێکی ناودار و بەغیرەت و حەمیەت بوو. هەتا ساڵی ٢٦٥ زۆر چاک

ئیدارەی حوکمداریی ڕاگرت و میللەتی کورد هەموو منەتداری بوون.

ساڵی ٢٦٥ خەلیفە موعتەمید لەژێر فەرماندەی موفلیح ناودا سوپاهێکی زۆر قورسی نارده سەر موساویر؛ هەتا نزیک حەدیسە چوون. کە موساویر تەماشای کرد دوژمن بەقووەتە، هێزی خۆی هەڵگرت و چووە چیای «ئامەوزینێ» کە نزیک حەدیسەیە. موفلیح دامێنی زینێی کردە لەشکربەز.

موساویر لە نیوەشەودا بەسەری دادان و گەلێک کوژتاری لێ کردن و گەڕانەوە نێو چیا.

موفلیح کە زانییەوە لەگەڵ موساویر شەڕکردن ناکرێ، ڕوو بەمووسڵ لەشکرەکەی گێڕاوە.

موساویر لە ڕێگا تەنگەکاندا پیاوی شەڕکەری دانا و چاوەنۆڕی کەلێن بوو، کە لەشکری موفلیح گەیشتە پێشی، لە هەموو لایەکەوە پێیان دادا و کوژتاریان لێ کرا. زۆر کەمیان بەساغی گەیشتنەوە مووسڵ؛ گەلێک دیل و ماڵ کەوتە دەست کوردان. موساویر بەشادمانییەوە گەڕاوە حەدیسە، ئەهالی و سوپاهی بەتالان گرتن شادبوون و بەکەیفەوە چوونە نێو شارەوە.

موفلیح دووبارە لەشکری بردە سەر موساویر بەشکاوی و شپرزەیی گەڕاوە مووسڵ و بەتەنها ڕوو بەسامەڕا هەڵات.

موساویر لە پاش ئەو شەڕە چووە سەر ئەڵوەند مووسای کوڕی بەغا پێشی پێ گرت، لە پاش شەڕ و کوژتار مووسا بەشکاوی خۆی هاوێژتە بەغدا. موساویر بەزۆر ئەڵوەندی گرت و پیاوێکی خۆی لەسەر دانا و گەڕاوە حەدیسە. ساڵی ٢٦٦ لە مانگی ڕەمەزاندا موساویر مرد و جێگای چۆڵ بوو.

## هارون کوڕی عەبدبجێلی شارەزووری

هارون پیاوێکی سەرکردەی سوپاهی موساویر خەڵکی بجیل ناو گوندێک بوو. کە ئەمڕۆکەش ئەو گوندە لەنێو عەشیرەتی کوردی سوورچیدا ماوە و مەرکەزی شێخانی سورچییە. هارون لە کتێبی تاتەکاندا بەهارونی خاریجی ناو دەبەن؛ چونکە لەگەڵ خەلیفەکانی عەباسی شەڕی کردووە، پێیان گوتووە خاریجی.

کە موساویر مرد هێزی سوپاهەکەی کەوتە دەست هارونی بجیلی. لە پاش ڕێکخستنەوەی ئوموور ڕوو بەمووسڵ لەشکری کێشا و مووسڵ و ئەترافی خستە دەست و گەڕاوە حەدیسە.

لەولاوە «محەمەدی کوڕی خەرزاد» کە ئەویش شەڕکەر و سەرکردەیەکی موساویر بوو، چووە شارەزوور و لەشکرێکی کۆکردەوە و گەڕاوە سەر هاڕون و بەگژیدا چوون و هیچیان سەرنەکەوتن. کوڕی خەرزاد گەڕاوە شارەزوور و دەستی بەلەشکر کۆکردنەوە کرد. بەئومێدی جێگیری موساویر لەشکری بردە سەر مووسڵ و لە «واسیت» لەشکری دابەزاند.

هاڕون لە مووسڵەوە دەچووە «مەعلتایا» کە زانییەوە محەمەد لە واسیت ڕووبەڕووی ڕۆیشت و لە گوندی «شەمراخ» بەلانگازی یەکتربوون. لە نەتیجەدا هاڕون شکا و دووسەد کەسێک پیادە کوژرا. هاڕون بەشکاوی لە دەژلە پەڕیەوە و عەشایر یارمەتیان دا و ڕوو بەحەدیسە گەڕاوە و دەستی بەئیمارەت کرد.

هاڕون چونکە فێڵ و دەسیسەی دەزانی، شۆڕشی خستە نێو سوپاهی محەمەدەوە. بەرەبەرە محەمەد لە هێز کەوت، جگە لە عەشیرەتی شمردەلی لە دەستدا نەما.

ساڵی ٢٧٧ دیوداد لە دەست خومارویە هەڵات و لە شامەوە پەنای بۆ هاڕون برد، هاڕون بەماڵ و سوپا و چەکەوە یاریدەی دا و کوڕی کنداجی بۆ شکاند. هاڕون بەبێ شەڕ هەموو شارەزووری خستە دەست خۆیەوە؛ ئەترافی مووسڵ هەموو لە دەست هاڕون دابوو. والی خەلیفە لە مووسڵ حوکمی دەرنەدەکەوت.

ساڵی ٢٨٣ خەلیفە موعتەزیدی عەباسی بەلەشکرێکی قورسەوە چووە سەر هاڕون، لە دوای شەڕ و کوژتارێکی بێژمار، هاڕون بەدیل کەوتە دەست خەلیفە و بردیانە بەغدا و لە چوار میخەیان دا و خنکاندیان.

## ئەمیر جەعفەری کوڕی فەهر

ئەمیر جەعفەر، میرە گەورەیەکی کوردبوو لە مووسڵ. هەموو والییەکان بێ دڵخوازیی ئەو ئەمیرە کوردە لە مووسڵا نەدەشیان فەرمانڕەوابن. ئەو ئەمیرە هەموو دەمێک لە نێوبژی و مامڵەتی نێوانی دەکۆشا. پیاوێکی دوورە شەڕ بوو؛ خێر و بەرەکەتی میللەت و نیشتمانی دەخوازت.

ساڵی ٢١٤ عەبدوڵڵای کوڕی سەید کوڕی ئانیسە لە تەرەف خەلیفەوە کرا بەوالی مووسڵ. لەبەر بەدخویی و توندوتیژی دڵی ئەهالی ڕەنجیدە کردبوو. ئەمیر جەعفەریش بەئەهالیەوە وەتەنگ هاتبوو.

عەبدوڵڵا گەلێک جەوری کوردانی دەدا، چەندجار ئەمیر جەعفەر، عەبدوڵڵای هوشیار کردەوە کە دەست لە زوڵم و جەور بەردات سوودمەند نەبوو.

ئەمیر جەعفەر ڕۆژێکی ناردی هەموو کوردی دەوروپشت و شاری کۆکردنەوە و هێزێکی قورسی پێکەوەنا و لە میرەکانی کوردستانی گێڕاوە یاریدەی بدەن. ئەمیر جەعفەر دەوروپشتی مووسڵی خستە دەست خۆی و هەموو مەئموورەکانی عەبدوڵلای دەرکردن، تەنها شار لە دەست عەبدوڵڵا ماوە. ئەمیر جەعفەر ڕۆژ بەڕۆژ هێزی پەیداکرد و ئەترافانی خستە دەست خۆی و لە قووەت زیادکردن خەریکبوو و نۆ ساڵ دەوامی کرد.

ساڵی ۲۲۳ عەبدوڵڵا داوای یارمەتی لە خەلیفە کرد؛ ئەویش سوپاهێکی ڕێکوپێکی بۆ نارد، لە کەنار شار لەگەڵ کوردان بەشەڕ هات. لە پاش چەند ڕۆژ کوژتار، عەبدوڵڵا کوژرا و زۆر کەم لە سوپاهی ڕزگار بوو و هەڵاتنەوە مووسڵ. ئەمیر جەعفەر دەستی لێ بەرنەدان و دەورەی مووسڵی دا و ڕێگای لە هاتوچووان بڕی، ئەهالی بەناچاری شاریان بەموسالەمەت تەسلیم کرد.

ئەمیر جەعفەر شەش ساڵ بەچاکە و خۆشی مووسڵی لەژێر دەستدا بوو، میللەت هەمووی منەتداری بوون و بەداد و ڕەعیەتپەروەری ڕایدەبوارد.

ساڵی ۲۲۹ خەلیفە سوپاهێکی لە ژێر فەرماندەی «ئەمیر ئیتاخیدا» ناردە سەر مووسڵ. ئەمیر جەعفەر بۆی لەشار دەرکەوت، لە چوار سەعات بەرەوژووری مووسڵ پێشی پێگرت، لە دوای شەڕ و خوێنڕێژی ئەمیر جەعفەر لە مەیداندا بەکوژراوی دۆزراوە. شکستە کەوتە کوردان و ئیتاخی بێ جەور چووە مووسڵ و تەمای چوونە سەر کوردانی هەبوو، بەڵام کوردەکانی دەوروپشت پێشیان پێ گرت.

## ئەمیر تۆروون

کتێبی «مرآة العبر» بەرگی دووەم، لاپەڕەی ۱۲۵ دەڵێت: تۆروون یەکێک بوو لە ئومەرایانی کورد و خاوەند هێز و پشتیوان بوو. موقتەفیەڵڵا ئیبراهیم خەلیفەی عەباسی ئەو ئەمیرە کوردەی کردە ئەمیرولئومەرا. ساڵی (۳۳۰) ئەمیر تۆروون بەسوپاهێکی زۆرەوە چووە بەغدا و بوو بە ئەمیرولئومەرا. هەتا ساڵی ۳۳۲ هەموو کاروباری خەلیفەی خستە ژێر پەنجەی خۆیەوە.

خەلیفە لەوە کەوتە ترسەوە؛ بەپەنهانی لە ناسرودەولەی والی مووسڵی گێڕاوە، بەهەر جۆرێک بێت فریای کەوێت و ڕزگاری کات.

ناسرودەولە لەشکری هەڵگرت و لەژێر فەرمانەدەی عەبدوڵڵای ئامۆزای و سەیفودەولە ناردیە تکریت. خەلیفەش لەولاوە ژن و منداڵ و دەست و پێوەندی خۆی دزیەوە و ڕوو

بەتگریت لە بەغدا دەرکەوتن. ناسرودەولە بەئیحترامەوە قبولّی کردن. ئەمیر تۆروون کە لەوە ئاگادار بوو، ڕقی هەستا و لەشکری بردە سەر مووسڵ، ناسرودەوڵە و سەیفودەولە بەلەشکرەوە چوون و لە تگریت ڕێگایان پێگرت. لە پاش شەڕ و خوێنڕێژی، تۆروون سەرکەوت و دوژمنی ڕوو بەمووسڵ ڕفاند.

ناسرودەلە ناچار خەلیفەی هەڵگرت و لە مووسڵەوە ڕوو بەنسێبین هەڵاتن. خەلیفە لەوێشەوە چووە شاری ڕەقە و لەوێوە قاقەزی بۆ تۆروون نوبسی و بناغەی مامڵەتی دامەزراند؛ بەهەر جۆرێک بوو ڕێککەوتن.

خەلیفە لە ڕێگای هیت و سندیەوە ڕوو بەبەغدا گەڕاوە. ئەمیر تۆروون بۆ پێشوازی لە بەغدا دەرکەوت. کە گەیشت بەتوندی گرتی و هەردوو چاوی کوڵی و عایلەکەی خەلیفەشی بەشادمانی گەڕاندەوە بەغدا.

ئەمیر تۆروون کە گەیشتەوە بەغدا، موستەکفی بیللا عەبدوڵلای کوڕی موکتەفی کردە خەلیفە و ساڵی ٣٣٣ مانگی سەفەر لەسەر تەختی خەلافەتی دانا.

ئەمیر تۆروون، هەتا مانگی زیلحیجەی ئەو ساڵە ژیا و لە دواییدا بەئامرزشی خودا شادبوو. لەوە زیاتر سەربهوردی ئەو ئەمیرە کوردەمان وەچنگ نەکەوت.

## ئەمیر سالار

ئەمیر سالار لە کوردی ئەڵوەندە، بەزانین و نوبسین و بە شیر و مەتاڵبازی و سوارچاکی ناوبانگی کردبوو. ساڵی ٥٢٦ عومری بیست ساڵەیی بوو، کەوتە لای سوڵتان مەسعوود. لەبەر زرنگی و زەبەر دەستی خۆی، ڕۆژ بەڕۆژ سەرکەوت و ڕووی لە بەرزبوون کرد. لە گەلێک جێگایانی شەڕدا ناوبانگی کرد.

لە ساڵی ٥٣٢دا سوڵتان مەسعوودی سەلجووقی لەگەڵ داود شەڕی کرد. ئەمیر سالار زۆر هونەر و ئازایی نیشان دا لەسەر ئەوە کرا بەوالی هەمەدان.

ساڵی ٥٤٠ عەلی کوڕی دبیس چووبووە سەر حیللە و بەزۆر گرتبووی. ئەو حاڵە لە سوڵتان شکایەت کرا کە عەلی دەستدرێژی دەکات. سوڵتان بەداخوازی ئەهالی سالاری ناردە حیللە. ساڵی ٥٤٢ بەئەمری سوڵتان مەسعوود، ئەمیر سالار لە هەمەدانەوە چووە بەغدا. شاری حیللە و دەوروپشتی بە«برە» (مقطوع) درایێ. ئەمیر سالار بەلەشکرێکی باشی کوردەوە چووە سەر حیللە، لە پاش شەڕ و کوژتار بەزۆر حیللەی لە عەلی ئەستاند و چووە نێو شارەوە.

عەلی بەشکاوی پەنای بۆ ئەمیر بەقشک برد، بەکۆمەگی تەرنتاوی خێوی واسیتەوە عەشایری تاتی چۆڵ لینگیان دا سەر حیللە. بەشەڕ و کوژتار سالاریان دەرپەڕاند. سالار لە ساڵی ٥٤٤دا ڕوو بە بەغدا گەڕاوە.

ساڵی ٥٤٥ سوڵتان مەسعوود لەشکری بۆ سالار کۆکردەوە، سالار دووبارە هەستا چووە سەر حیللە و بەشەڕ عەلی دەستگیر کرد و کوژتی و بنەماڵەی مەزیدی کوێرکردەوە.

ساڵی ٥٤٦ سوڵتان مەسعوود مرد. خەلیفە موقتەفی لیئەمریللا سەلجووقییەکانی لە عێراق دەرکرد و هەموو بڵاوبوونەوە. مەسعوود ناوێک کە شەحنەی بەغدابوو، هەڵات و چووە حیللە و پەنای بۆ سالار برد و بەحورمەتەوە سالار ڕایگرت و بوو بەهەمکارەی.

ساڵی ٥٤٦ سالار بەمەسعوود فریوی خوارد کە کەلێن کەوتە دەست مەسعوود، لە چۆمێدا سالاری خستە نێو ئاوەوە و خنکاندی.

## ئەمیر شادی

**بنەماڵەی هەزبان کە بەئەییووبی ناوبانگیان کردووە.**

شادی کوڕی مەڕوان لە عەشیرەتی کوردی ڕەوەند و ئەمیری قەڵای دووین بوو. قەڵای دووین لە نێوانی ڕواندز و هەولێردا لە نزیک دێرە هەڵکەوتووە و ئەمڕۆکە کاولەکەی ماوە و دێیەکی بچووکە لەسەر قەزای ڕواندزە. میرانی هەزبانی لەشاری دووین بەحوکمداریان ڕادەبوارد. مەڕوان کە مرد شادی حوکمداری دووین و هێندێک لە خاکی سۆرانی دەکرد. ئەمیر حەسەنی کوڕی مووشک بوو بەحاکمی قەڵای هەولێر، تا ساڵی ٤٣٦ ئەو دوو میرە کوردە ناودارانە بەڕێکی ڕایانبوارد.

لەو ساڵەدا قەرواش ناو تاتێک لە تەرەف خەلیفەوە کرا بەوالی مووسڵ و لەگەڵ نەسرودەولەی کوردی حەمیدیی دۆشتیک حاکمی جزیرە ناخۆشییان کەوتە نێوانێ.

ئەمیر عیسکانی حەمیدیی حوکمداری ئاکرێ لەگەڵ دەولەتی دۆشتیک ڕێککەوت و هەموویان چوونە سەر مووسڵ. قەرواش لە ئەمیر حەسەن داوای یارمەتی کرد، ئەویش بەکۆمەگی ئەمیر شادی چوونە پێش ئەمیر عیسکانی و لە پاش گەلێک شەڕ بەشکانی قەرواش لێکبوونەوە. ئەو ئومەرایانەی کورد هەتا ساڵی ٤٤٦ بەدۆستایەتی ڕایانبوارد.

لەو ساڵەدا فیتنەی سەلجووقییەکان کەوتە نێو ئاسیاوە، ئومەرا و حوکمدارەکانی کوردستان وەکو حوکمدارەکانی دیکە کەوتنە ژێر فەرمانی ئۆرتۆغرولەوە؛ مەلیک شادیش هەروا. بەهرۆزی ئیغریقی کە لە یەکە نۆکەرانی شادی بوو، کەوتەلای سەلجووقییەکان. لە

دەوری مەلیک شاهی سەلجووقی گەورەبوو. شادی بەراوەژوو ڕۆژ بەڕۆژ بچووک بوو و لە دەست سەلجووقیەکان لە دەستکەوت. قاقەزی لە بەهرۆزی نوبسی و بەهرۆز بردیە مووسڵ لەگەڵ مەلیکشا بەناسینی دا. لە دواییدا ئەمیر شادی لە دووین باری کرد و چووە مووسڵ و گەلێک کاروباری چاکبوو. کە مەلیکشا مرد، سوڵتان مەسعوود گەلێک ئیحترامی ئەمیر شادی دەگرت، کە بەهرۆز کرا بەشەحنەی بەغدا، ئەمیر شادی کردە حاکمی تگریت. لەلای ئەهالی تگریت و سوڵتان زۆر موحتەرەم بوو. سوڵتان تگریتی بەبڕە دا بەئەمیر شادی. هەتا مرد بەحوکمداری تگریت ڕاببوارد. لە تگریت کە مرد ناژرا و گومبەزێکی لەسەر دروستکرا، ئێستاش ئەو گومبەزە ماوە.

## ئەمیر ئەیووب نەجمەدین کوڕی شادی

لە پاش ئەمیر شادی، ئەمیر ئەیووب نەجمەدین -کە کوڕە گەورەی بوو- بوو بەحوکمداری تگریت، هەتا ساڵی ٥٣٢ﻫ شێرکۆی برای نەجمەدین سەرکردەییێکی بەهرۆزی کوژت. لەسەر ئەوە بەهرۆز بۆ لە تگریت دەرکەوتنیان ئەمری دا. ئەو شەوەی باریان کرد و لە تگریت دەرکەوتن، سەلاحەدین یووسفی کوڕی ئەیووبی کوڕی شادی کوڕی مەڕوان لە تگریت لە دایک بوو.

نەجمەدین چونکە لە چاغی خۆیدا چاکەیەکی قورسی لەگەڵ عیمادەدین زەنگی کردبوو، بەو ئومێدە ماڵ و منداڵی هەڵگرت و ڕوو بەسووریا پەنای بۆ کوڕانی زەنگی برد. کوڕانی زەنگیی شێرکۆیان کردە سوپەهداری حەلەب و شاری بەعلەبەگیشیان دا بەنەجمەدین. لە دوای کەم چاغێک نەجمەدین بوو بەوەزیری سوڵتان مەحموود نورەدینی کوڕی زەنگی و شێرکۆش بوو بەوەزیری عازیدی خەلیفەی فاتیمیە لە میسر. سەلاحەدین لە دوای مردنی مامی بوو بەوەزیر. لە پاشان سەلاحەدین بوو بەسوڵتانی میسر و یەمەن و حیجاز و سووریا و شارەزوور و جزیرە و وان و بتلیس و دیاربەکر و لە هەموو دونیاشدا ناوبانگی کرد. بۆ ئاگاداری ئەو بنەماڵەیە تەماشای کتێبی «ئێمەی ئەفسەری شاهان» بکەن.

## ئەمیر ئەحمەد کوڕی ئەمیر عەلی سەیفەدین کوڕی ئەحمەد

کوڕی ئەبیهەیجای کوڕی ئەمیر عەبدوڵڵای کوڕی ئەمیر خەلیلی مەرزەبانییە. ئەمیر ئەحمەد لەقەبی عیمادەدین و ناوبانگی «ئەبوو مەشتووب»ە. هێندێک لە مێژوونوبسان گوتوویانە مەشتووب ناوبانگی باپیرە گەورەیەتی و هێندێک دەڵێن مەرزەبان کوردی هەکارییە.

ئەمیر ئەحمەد ساڵی ٥٧٥ لە خاکی مزووری هاتۆتە دونیا و خوێندن و سەرکەوتن و بەرزبوونی لەوێوە بووە و چووە مووسڵ و بەشیر وەشێنی و ڕمبازی و سوارچاکی و پاڵەوانی ناوبانگی کرد.

لە مووسڵەوە چووە جزیرە و لە «پەرا» (خزمەت)ی سوڵتانەکانی ئەیووبیدا بەحورمەت و جێگابەرزبی ڕاگیرا و بوو بەئەمیری لەشکری جزیرە، لە بەرادا هێندە پێشکەوت، ئەیووبییەکان لە یەکێکی خۆیان دەژمارد. وای لێهات بوو بەڕوکنێکی دەوڵەتی ئەیووبیە.

ئەمیر عەلی باوکیشی لە پەرای سوڵتان سەلاحەدینی ئەیووبیدا هێندە پێشکەوت هەتا مردن هەر بەحاکمیەتی شارە گەورەکانی ڕابوارد. شاری نابولسی بەبرە درایێ و شەش ساڵی لەسەر بوو و مرد. کە ئەمیر عەلی مرد سێیەکی نابلۆس لە تەرەف سەلاحەدینەوە درا بەبەیتولمال؛ ئەوی دیکەش درا بەئەمیر ئەحمەد عیمادەدین. ئەمیر ئەبیلهەیجای باپیریشی لە تەرەف سوڵتانەوە کرا بەئەمیری جزیرە؛ لە پاشان لە قەڵای ئامێدی و چەند قەڵایەکی دیکەی بەبڕی درایێ.

ئەمیر ئەحمەد هەر بەدەست درێژی و خۆشەویستی ژیا. لە شەڕی دمیاتدا مەلیک کامیلی سوڵتانی میسر لێی دڵگیربوو. ئەمیر ئەحمەد بەناچاری لە وڵاتی میسر دەرکەوت و چۆوە جزیرە . لە مانگی ڕەبیعی دووەمدا گەیشتە تەلەعفەر. ئەمیر لۆئلۆئی خێوی مووسڵ ناردی دڵخۆشی داوە کە بیکاتە ئەمیرێکی خۆی. لە دوای گەلێک موخابەرە لەگەڵی ڕێککەوت و بردیە مووسڵ و موددەتێکی کەم ماوە. ساڵی ٦١٧ لۆئلۆء گرتی و بەزنجیرکراوی بۆ مەلیک ئەشرەف موزەفەرەدینی کوڕی مەلیکی عادیلی ئەیووبی ناردە حەڕان و سرووج. مەلیک ئەشرەف بەزنجیر و پاڵەهەنگ موددەتێکی زۆر لە بەندی کرد. ئەمیر ئەحمەد ئەم دوو هەڵبەستراوەی بۆ نارد:

يا من بدوام سعده دار الفلك
ما انت من المملوك بل انت ملك
مملوكك ابن المشطوب في السجن هلك
أطلقه فأن الامر للّه ولك

ئەگەرچی ئەمیر ئەحمەد بەو شیعرانە لە مەلیک ئەشرەف پاڕاوە، بەڵام کاریگەر نەبوو. هەروەها لە زنجیر و بەند جەور درا، هەتا ساڵی ٦١٩ مانگی ڕەبیعی دووەم بەو حاڵە لە بەندیدا مرد.

مەلیک ئەشرەف لە دەروازەی شاری سەرینچاوە (رأس العین) گومبەزێکی گەورە و ڕازاوەی بۆ دروست کرد و لە سرووجەوە جەنازەکەی بەئیحترام و چاکەوە بردە ئەوێ و ناژتی و گەلێک مەوقووفەشی بۆ پەراکانی ئەو زاتە بڕیەوە کە پەرای گومبەزی بکەن. لەوەدمەدا کە ئەمیر ئەحمەد لە بەندی دابوو، دەستەبراکانی ئەم دوو شیعرەیان بۆ نوویسیبوو:

یا أحمد مازلت عماداً للدین
یا أشجع من أمسك رمحاً بیمین
لاتأس إذا حصلت في سجنهم
ها یوسف قد أقام في السجن سنین

ساڵی ٥٨٨ شەوی پێنجشەممەی ١٩ی جەمادی دووەم، سوڵتان سەلاحەدین لەگەڵ ئومەرایان دانیشتبوون و باسی شەڕی فەڕەنگیان ئەکرد؛ زۆر نائومێد ببوون. سوڵتان زیاتر بێ ئومێد بوو. ڕووی لە ئومەراکان کرد و وتی: «ڕەوشتی پێغەمبەر وابوو کە لە شەڕدا وەتەنگ هاتبا و چارەی نەمابا لەگەڵ سەحابە بۆ بەرابەریی کافر موبایەعەی مردنیان لەگەڵ یەک دەکرد، ئێستا ئێمە نائومێد بووین و بەو سونەتە دەست پێکەوە بگرین و موبایەعەی مردن بکەین». هەموو بێ دەنگ بوون. دیسان سوڵتان هەڵیدایەوە: «ئێوەش لەشکری ئیسلامن و نامووس و شەرەفی ئیسلامیەت لە زیمەتی ئێوە دایە؛ ئەمڕۆ جگە لە ئێوە کەسێکی تر بەرابەر بەدوژمن ڕانەوەستاوە. ئەگەر خۆنەبزێون، دوژمن خاکی ئیسلام وەکو تۆمار دەپێچێتەوە. ئێوەن پێشتان بەدوژمن گرتووە و بۆ دین و ماڵی بەیتولمالی موسڵمانانتان خواردووە، بەو ئومێدە هەموو موسڵمانێک چاوی لە ئێوەیە و ژیان و خۆشی و دەردیان لەگەڵ ئێوەیە و بەهەنگۆ دەخوڕن».

سەیفەدین مەشتووبی بابی عیمادەدین هەستا سەرخۆی و ڕوو بەسوڵتان وتی: «هەی پشتوپەنای هەموومان، تۆ گەورەی و ئێمە بەندە کراوین، بەندە و نۆکەرین، هەنگۆ سەروەر و پەروەردگارن ئێمە بەنان و نمەکی تۆ پێگەیشتووین. ئەتۆ ئێمەت گەورە کردووە، ئێمەت بڵند کردووە، ئێمەت ناودار کردووە، ئێمەت ماڵدار کردووە، ئێمەت گەیاندۆتە ڕۆژێکی وا کە لە پێشتان ڕاوەستاوین و بووینە پیاو، بووینە خاوەند سووپاه و بووینە ئەمیر، هەرچییەکی هەمانە هی تۆیە، لە گەردن و گیان زیاترمان لە دەستدا نییە، ئەویش لەژێر شیر و فەرمانی هەنگۆ دایە. سوێندبێ بەخودای گەورە، هەتا لەژێر ڕکێفی تۆدا نەمرین و بەسەرفرازی دوژمن نەشکێنین ناگەڕێینەوە». کە سەیفودینی غیرەتمەند ئەمەی گوت،

ئومەراکانی دیکە هەموو بلّندبوون و ئەو سوێندەیان خوارد و بۆ ئەو پەرایە بەدلّێکی خاوێن و بێ غەش کەمەری ڕاستییان گرێ دا.

## ئەبولهەیجا سمین

ئەبولهەیجا لە کوردی شارەزوورە؛ لە کوردستان گەورە بووە و لە عیلم و فەن و سوارچاکی و تیر و شیر و مەتالّبازیا سەرکەوت و چووە سووریا و لە پەرای سولّتان سەلاحەدیندا بوو بەئەمیرێکی خۆشەویست. لە هەموو شەڕ و کوژتارێکدا پێشمەرگەی سوپاهی سولّتان بوو. بەزرنگی و ئازایی ناوبانگی کرد. لەبەر وریایی و تێگەیشتنی لە کاری موهیمی سولّتاندا ئەبولهەیجا سەرپشکی ڕاوبیر بوو. بەکەم چاغێک بوو بەئەمیرولئومەرای سوپاهی کوردان. سالّی ٥٨٧ی ڕۆژی ئەینی ٢٣ی شەوال لە شەڕی عەککە، سولّتان وەتەنگ هات و بێ دراو مابوو. ئەبولهەیجا بەناوی یارمەتی پەنچا هەزار زێڕی سوور - کە هەریەک بەکێشان مسقالێک- بوو تەقدیمی بەسولّتان کرد و بۆ خۆشی لەگەلّ هەموو سوپاهی شارەزوور و کوردی حەمیدی و هەکاریا کەوتە پێش جلّەوی سولّتانەوە، لەگەلّ فرەنگ شەڕی کرد و پەرای نواند.

سالّی ٥٨٨ فرەنگ لە قودس سولّتانیان وەتەنگ هێنا. ئەمیر ئەبولهەیجا بەسوپاهی کوردەوە فریای کەوت و دوژمنی دڕاند و خۆی گەیاندە سولّتان و چووە نێو قەلاّوە و فرەنگی لە قەلاّ دوورخستەوە و گەلێکی هونەر نواند و سولّتانی لە تەنگایی ڕزگار کرد.

ئەگەر کەسێک مێژووی سولّتان سەلاحەدین تەماشا بکا تێدەگا کە گەلێک شاران لە دەست فرەنگ ڕزگار کراون بەدەست ئەبولهەیجا بووە.

سالّی ٥٩١ عەزیزی میسر لەگەلّ مەلیک ئەفزەلی برای پادشای شام، ناخۆشییان لێ پەیدابوو. ئەبولهەیجا لەودەمەدا ئەمیرولئومەرا بوو لە سوپاهی میسردا. ئەفزەل بەمەلیک عادیلی مامی ڕاگەیاند یاریدەی بدات. مەلیک عادیل قاقەزی لە ئەبولهەیجا نوویسی لە مەلیکی میسر ڕووگەردان بێت و ببێتە هەواداری مەلیک ئەفزەل.

ئەبولهەیجا ڕوئەسای کوردەکانی مەهرانی و ئەسەدی کردنە هاودەنگ. ڕۆژی دووشەممەی چواری شەوال بەکۆمەلّە گردبوونەوە. هەرچەندە سوپاهی عەزیز کە لە میسر دابوو هەموو کوردو لە ژێر فەرمانی ئەبولهەیجا دابوون و لە دەست عەزیز هیچ نەما.

لەولاوە مەلیک عادیل و فازیل لەو بزووتنەوەی ئەبولهەیجا منەتدار بوون. ڕۆژی دووشەممە بەلەشکرەوە ڕوو بەمیسر خشان. عەزیز بەسوپاهی کە مابووی لە ڕەملە پێشی

پێ گرتن و بەشەڕ هاتن. ئەبولهەیجا لە پێش گەیشتنی عادیل بۆ قودس و ئەو جێگایانەی گرت و نایبانی خۆی لەسەر دانان و ڕوو بەمیسر هەڵمەتی برد و میسری وەتەنگ هێنا.

عەزیز ناچاربوو قاقەزی لە قازیی شارەزوور نوویسی کە بەنێوبژی بکەوێتە نێوانیان. بەواسیتەی قازییەوە هەردوو لا پێکهاتن و عەزیز چووە کن مەلیک ئەفزەل و لەگەڵ ئەبولهەیجا بەچاکی ڕێککەوتن.

ئەبولهەیجا و مەلیک ئەفزەل گەڕانەوە قودس، ئەبولهەیجا بوو بەوالی قودس و مەلیک ئەفزەلیش گەڕاوە دیمەشق. هەتا دەوری سەڵتەنەتی مەلیک عادیل قودس بەبڕەیی لە دەست ئەبولهەیجا دابوو.

ساڵی ٥٩٣ بۆ یارمەتی ناسرودینەڵلای عەباسی ئەبولهەیجا بەلەشکرێکی قورسەوە چووە بەغدا. لەوێوە سوپاهێکی زۆری لە کوردانی شارەزوور و هەکاری هەڵگرت و بۆ شکاندنی سەلجووقییەکان چووە هەمەدان و هەمووی بڵاوکردنەوە و بەشادی و خۆشی لە جێگاییێکی کە «دەکووک - دەقووق - تاوق» لە نیوەی ڕێگادا بەئامورزشی یەزدان شادبوو.

ئەبولهەیجا ئەمیرێکی گەورە و هیمەت بڵند و ئازا و زرنگ و کاردیدە بوو. لە هەموو شەڕێکدا سەردەکەوت. بۆ پادشاکانی کوردی ئەیووبی هێز و پشتوپەنایەکی مەحکەم بوو. لە گەلێک جێگایانی تەنگ و سەخت و ناخۆشیدا فریایان دەکەوت. پاڵەوانێکی کورد و فەریاد ڕەسی ئیسلامیەت بوو.

## دوو ئەمیری کورد لە (٦٥٦ھ)دا

لەو ساڵەدا هۆلاکۆ چووە سەر بەغدا، خەلیفەی عەباسی لەشکرێکی لەژێر فەرماندەی دوو ئەمیری کورددا ناردە پێش هۆلاکۆ. ئەبوفەرەجی گریگۆریۆس لە ئەسەرەکەیدا دەڵێت: «ئەو دوو ئەمیرە کوردانە ناوی یەکێکیان: «کوڕی کۆرار» و دووەم «داویتدار» بوو کە زانیانەوە خەلیفە لە دەست دوژمن تەنگاوە، لەشکرێکی قورسیان هەڵگرت و لە سرووجەوە چوونە بەغدا. خەلیفە بەوە گەلێک مەنەتدار و دڵگوشاد بوو. هەرچەندە لە دەستی هات سوپاهێکی بۆ فەراهەم هێنا.

ئەو دوو ئەمیرە کوردانە بەسوپاهی کوردەوە لە بەغدا دەرکەوتن و چوونە پێش هۆلاکۆ. لەشکری کورد و تەتەر شیری کوژتاریان تێکنا و لە پاش خوێن ڕشتنێکی زۆر و لاشە خستنێکی بێژمار، کوردەکان سەرکەوتن و تەتەرەکان شکان. کوردەکان بەتاڵان و دیل

گرتنێکی زۆرەوە بەکەیف و شادمانی بەربە بەغدا گەڕانەوە.

ئەمیر کوڕی کۆرار بەداویتداری گوت کە یەکسەر هەتا بەغدا ڕانەوەستێ. داویتدار بۆ ئەمەی هێزەکەیان بڵاونەبێتەوە و ئەگەر تەتەر تەمای سەر بەغدا بکا لە کەلێنا پەلاماریان بدەنێ و نەیانهێڵن بگەنە بەغدا، لەسەر ئەو تەگبیر لەشکری کوڕی کۆرار لە کەناری چۆمی دەژلە لە نشێوێکا لەشکربەزی کرد. لەناکاو تەتەرەکان لە جێگایەکی دوورەوە بەرهەڵستیان بۆ ئاوی دەژلە کرد و کێشایانە سەر سوپاهی کوردەکان.

شەوێ لەناکاو ئاوی بێ ئامان دەورەی کوردی خەوتووی دا. هەتا کوردەکان هوشیاربوونەوە، هەموو زێی تیروکەوان و مشتی کالانی خەنجەر و شیرەکانیان تەڕببوو؛ کوردەکان زۆر شپرزەبوون. تەتەر بە شیر و ڕمەوە هەڵمەتیان بردنەسەرێ. کورد لە لایێکا دوژمنی وەکو تەتەر، لە لایێکی دیبیەوە سێلاوی ئاو پەرێشانی کردن. ئەمیر کوڕی کۆرار بەدەست تەتەرەوە بەکوژت چوو. سوپاهی بێ سەردار بە شیری دوژمن و سێلاوی ئاو نەبوو کران؛ زۆرکەمی ڕزگاربوو، ئەویش بەپەرێشانی خزاوە بەغدا.

خەلیفە کە لە کوژتنی ئەو ئەمیرە ناودارە و لە پەرێشانی ئەو لەشکرە جەنگاوەرە ئاگادارکرا؛ ترس و دەهشەتی لێ نیشت. بەدیاری و پێشکەش ناردن تەمای پێش بەفیتنەگرتنی هۆلاکۆی کرد. ئەمیر داویتدار لەگەڵ خەلیفە بەدەست تەتەران بەکوژت چوون.

تەواو بوو جزمی یەکەم، دەست بەجزمی دووەم ئەکەین کە
باس لە حوکمدارانی هەزەبانی ئەکات.


وەرگر - مأخذ
- کتێبی - مرآة العبر - تورکی
- کتێبی - أبو الفرج گریگۆریۆس - ئاسووری
- کتێبی - دار المعارفي شمس الدين سامي - تورکی
- کتێبی - حياة صلاح الدين - أحمد بيلي - عارەبی
- کتێبی - الروضتين في أخبار الدولتين - عارەبی
- کتێبی - تاريخ الكامل - أبن الأثير - عارەبی

# مێژووی ناودارانی کورد

**هی عەسری سێزدەمینی هیجری**

لە ساڵی ١٢٠٠ هەتا ١٣٠٠ھ

کردەوەی خێوی زاری کرمانجی

**حوسێن حوزنی موکریانی**

(١) تشرینی دوو ١٩٣١

ڕواندز لە مەزرگەی زاری کرمانجی دامەزرا

پەرت (نەشریات)ی زاری کرمانجی (١٦)

مێژوی

# ناوۆدارانی کورد

مي

عصری سێزدەمینی هجری

لە سالی ۱۲۰۰ هە تا ۱۳۰۰ ه

— ❁ —

کردەوەي خێوی زار کرمانجی

حسین حزنی موکریانی

— ❁ —

۱ تشرین دو ۱۹۳۱

ڕواندز لە مەزرگای زار کرمانجی دامەزرا

بەرت (نشریات) ی زار کرمانجی ۱٦

## پێشەکی

چونکە گەلێ جار گوێدێر دەبووم و دەبهیست کە زاناکانی کورد لە ناودارانی کورد دەدوان و سەربهوردی گەورەکانیان دەگێڕاوە؛ بەڵام ناودارانی کوردی خاکی ئێران لە عەسری سێزدەمینی هیجرییان لە بیر چووبووەوە و نەیان دەهێناوە بەرچاویان. ئەگەرچی لەو عەسرەدا پیاوانی دلێر و وشیار و ئازا و وەتەنپەروەرمان زۆربوو، وە لە رێگای نیشتمان و رەگەز و تیرەمانا، بەماڵ و گیان تەقەلایان دابوو، وە خانومان و بنەماڵەییێکی بێ ژماریان لەو رێگەیەدا پووچ کردبووەوە و نزیک سەد ساڵ لە بەرابەر نەیاراندا گیان فشاریان کردبوو. جا لەبەرئەوە کە ناوی ئەو میللەتپەروەر و نیشتمان خوازانە بخەینەوە بیر، سەربهوردی ٢٨ دلێر و پاڵەوانانی کوردی عەسری سێزدەمینی هیجریمان لەم پەرتووک (کتێب)دا پێشکەش بەتێگەیشتوو و زانا و هونەرمەندە غەییورەکانی کورد کرد.

ئومێد ئەکەم بەدڵێکی خاوێنەوە پەسندی بفەرموون و چاو لە عەیب و عار و نارێکیی بپۆشن.

خێوی زاری کرمانجی

حوسێن حوزنی موکریانی

## ١- خان ئەبداڵ خان

خان ئەبداڵ خان کوردە و لە عەشیرەتی جیهانبەیگی (جیهان بەگلو)ی وڵاتی خوڕاسانە، پایتەختی «ساری» بوو. باب و باپیریشی حوکمداری ئەو خاکە بوون.

خان ئەبداڵ خان پیاوێکی بەشەهامەت و ئازا و خاوەند شان و سوپاھ و لەشکر بوو. کەریم خانی زەند، شاهنشای ئێران زۆری خۆش دەویست و جێگای بەرزی پێ دابوو و بەحوکمدارێکی ناسی بوو.

تەقی سخانی زەند لە تەرەف کەریم خانەوە کرا بەسەرداری ڕەی (تاران) و فەیرووزکۆە. لەگەڵ خان ئەبدال خانا، تێکی دا و پەیمان و شرووتی کەریم خانی لەتەکا بەخێو نەکرد و بەهانەی پێ گرت.

خان ئەبداڵ خان هەرچەندەی کۆشا، کە پەیمان شکێنی نەکا، تەقی خان تەنگەی پێ هەڵچنی و هەراسانی کرد. ناچار خان ئەبداڵ خان ڕشتەی یێکەتی پساند و خۆی لە حکوومەتی زەند پچڕییەوە.

ساڵی هەزار و سەد و نەوەد و سێ، کەریم خان لە شیراز بەئامورزشی یەزدان شادبوو. ئاغا محەمەدی کوڕی حەسەن خانی قاجاڕ لە شیرازەوە بۆ تاران هەڵات. هاواری لە خان ئەبداڵ خان کرد کە ڕزگاری کات.

خان ئەبداڵ خان بەشەش سەد ماڵە کوردی جیهانبەگییەوە یارمەتی کرد. خستیە سەر ئارەزوو و هەواداری حوکمڕانی و شەڕ لەگەڵ کوردەکانی زەنددا.

لەشکرێکی قورسی بۆ ئاقا محەمەد ڕێکخست و بەگژ تەقی خانیی داکرد و تەقی خانیی گرت وە «ڕەی» خستە دەست.

مورتەزا قولیخانی قاجاڕ -کە برای ئاقا محەمەد بوو- لەشکرێکی لە ئوستراباد سازدا و چووە سەر ئاقا محەمەد و لە «سەوادکۆ» پێشی پێگرت.

خان ئەبداڵ خان سوپاهی کوردانی ئامادە کرد و چوو پێشی بەسوپاهی مورتەزا قولی گرت وە مەتەرێزی دوژمنی گرت و شەڕ و کوژتار دەست پێکرا.

لە دوای گەلێک کوژتار، مورتەزا قولیخان شکا و مستەفاخانی برای کەوتەبەر سمی ئەسپی خان ئەبداڵ خان وە ئەمانی خواست و بوورا.

کوردەکان گەلێکیان کوژتار کرد و تالانێکی زۆر و دیلێکی بێژماریان لە قاجاڕان گرت. خان ئەبداڵ خان بەشادی و کەیفەوە گەڕاوە شاری ساری و لەشکر و ئەسپابسازی دەست پێکرد.

ساڵی هەزار و نەوەد و پێنج براکانی ئاقا محەمەد لە هەموو لایێکەوە دەستیان بەسەرکێشی کرد. هەموو قەبایلی تورکمان چوونە سەر شاری «بارفرۆش»، لە سەرای خۆیدا دەورەی ئاقا محەمەدیان دا. ئاقا محەمەد هاواری لە خان ئەبداڵ خان کرد کە فریای کەوێ. خان ئەبداڵ خان لە «ساری»یەوە بەقاجارِ و تورکمان کوژتن کەوتە رێگا، وە خۆی گەیاندە بارفرۆش. بەڵام لە پێش گەیشتنیدا رەزا قولیخانیی قاجارِ ئاوری لە سەرای ئاقا محەمەد بەردا. تەئریخی قاجارِ، جلدی یێکەم، لاپەڕەی ٢١ دەڵێت: «ئەو هەموو سەباتەی ئاقا محەمەد، بۆ چاوەڕێ خان ئەبداڵ خان بوو؛ بەڵام فایدەی چی؟ کە خان ئەبداڵ خانی گەیشتێ، سەرا ئاوری گرتبوو و سووتابوو. ئاقا محەمەد لەنێو ئاوردا دەژیا و چاوەڕێ بوو».

لە پڕێکا خان ئەبداڵ گەیشت و قاجارِی شکاند و دوژمنی دەربەدەر کردوە ئاقا محەمەدی لەنێو ئاوری سۆزندە و لە دەست دوژمنی رزگارکرد. ئۆمەرا و خانزادەکانی قاجارِی بەکۆت و زنجیر حەپس کردن.

کە لەشکری قاجارِ شکا، رەزا قولیخان و جەعفەر قولیخان و مستەفا قولیخان -کە خەوانینی قاجارِبوون -بەیێکەتی، لەشکرێکی شەڕکەریان لە تورکمان ئامادەکرد و چوونە سەر «ساری».

خان ئەبداڵ خان بەحەوسەد پیاوی ئازای کوردانەوە، چوو پێشی پێگرتن و دەستیان بەشەڕ و کوژتار کرد. شکستەیێکی پیس کەوتە نێو کوردانەوە و تەنها خان ئەبداڵ خان، بەهەزار ئەزیەت تەنها خۆی رزگارکرد و لە مەیدانی خوێناوی بۆی دەرچوو وە خۆی گەیاندەوە ساری.

خان ئەبداڵ خان لەشکرێکی دیکەی کۆکردەوە، بۆ سبەینێ زوو بەسەر قاجارِەکانی دادا، گەلێکی کوژتار لێ کردن و دوژمنی شکاند و گەڕاوە نێو شار.

جاری سێیەم قاجارِیەکان زۆریان هێنا و دەورەی شاری «ساری»یان دا. خان ئەبداڵ خان بۆیان دەرکەوت، لە پاش گەلێک کوژتار بەتەنها خۆی رزگار بوو. بەپەلە خۆی کوتایە نێو شار. ناچاربوو لە ماڵی خمگەرێکدا خۆی شاردەوە، کە شەو بەسەر دابێت و بۆلایێک خۆی رزگارکات.

قاجارِەکان بەکوژتار رژانە نێو شاری سارییەوە، محەمەد قولیخانیی لاریجانی رەهبەری کردن خان ئەبدال خانیان گرت، لە سەرای خۆیدا بەزنجیر و پاڵەهەنگ حەپسیان کرد.

مورتەزا قولیخان شاری ساری خستە دەست خۆی و حکوومەتی تیا دامەزراند. بەوجۆرە

پایتەختی ئەمارەتێکی کورد بوو بەقوربان وە بنەماڵەیێکی گەورەی کورد پووچکراوە.
ساڵی هەزار و نەوەو شەش خان ئەبداڵ خان تەمای بوو خۆی لە حەپس ڕزگارکات، کە لە دەری شار ڕێزبان کرد بۆ حەپسخانە دەستیان کرد بەکەنکەنەیی. مورتەزا قولی لەوە ئاگادارکرا، مورتەزا قولی سەری خان ئەبداڵ خانیان بڕی و بەدیاری بۆ ئاقا محەمەدیان نارد.
خان ئەبداڵ خان بۆ دامەزراندنی حکوومەتی قاجار، خۆی و بنەماڵەی چەند سەد ساڵەی کردە فیدا. (جلدی یێکەمی قاجاریە، لاپەڕەی ١٩ - ٢١).

## ٢- سادقخانی شقاق (شکاک)

لە ئاوربایەگان و لە شاری سەراب حوکمدارێکی کورد و پیاوێکی زەبربەدەست بوو. لە دەوری ئەفشارەکانەوە لەسەر ئەو خاکە بەحوکمداری ڕایان ئەبوارد. حکوومەتی زەند عەهد و پەیمانیانی لەتەکیانا هەبوو.
ساڵی ١٢٠٥ سەرکێشی قاجارەکان بۆ گرتنی ئەو حکوومەتە کوردە، لەشکری کێشا و چووە سەر پایتەختی ئەمارەتی سادقخان کە سەراب بوو.
سادقخان بەلەشکری کوردی شکاکو موقەدەمەوە چووە پێش و ڕێگای بەقاجارەکان گرت. لە پاش گەلێک شەڕ و کوژتار، تابی بەرابەری نەبوو، پایتەختی بەردا و ڕوو بەقەرەباغ هەڵات و پەنای بردە لای ئیبراهیم خەلیلخانی کوردی جوانشێر کە حوکمداری قەرەباغ بوو.
ئاقا محەمەدی قاجار کە سادقخانی دەرپەڕاند، چووە سەر «سەراب» و هەموو ئەهالیەکەی کوژت و قەڵاکەی وێران کرد؛ ئاواییەکانی سووتاند و ماڵ و ئەسپابی تاڵان کرد و ڕوو بەئەردەبیل گەڕاوە.
ساڵی هەزار و دوو سەدو شەست (جلد ئەوەلی قاجار - لاپەرە ٣٢) سادقخان کە تەماشای کرد قاجارەکان ڕۆژ بەڕۆژ دەست درێژ دەبن و دەربەدەربی ئەویش فایدە نابەخشێ. ئیبراهیم خەلیلخانیش هەر هێندە ئەتوانێ مولکی خۆی بەخێوکا و ناتوانێ لەشکری بداتێ؛ ناچاربوو دە نەفەر لە براکانی خۆی ناردە لای ئاقا محەمەد و داوای مامڵەتی لێی کرد. ئاقا محەمەد لەگەڵی ڕێککەوت. سادقخان گەڕاوە جێگای خۆی و دەستی بەئاواکردنەوە کرد و چووە لای ئاقا محەمەد و بەسەرکردەی سوپاهی قاجار تەعیین کرا و نزیک چوار ساڵ بەوجۆرە ڕایبوارد.

ساڵی (١٢١٠) سادقخان بەپەنهانی خەریکی کۆمەڵە دامەزراندن بوو. سەفەری خوراسانی کەوتە پێش؛ بەسوپاهێکی قورسەوە چووە سەر خوراسان و گرتی و ئومووری تێدا دامەزراند و گەڕاوە و دەستیان بەسوپاه کۆکردنەوە کرد. کە بچنە سەر قەڵای پەنائاوا.

سادقخان لە کۆمەڵە دامەزراندن پاش نەکەوت؛ زۆر کەسی کردە هاودەنگی خۆی. دوو نەفەری دانابوو کە کەلێن دەستخەن و ئاقا محەمەد بکوژن (جلّد ئەوەل، قاجار، لاپەڕە ٤٥).

ساڵی ١٢١٢ دوو نەفەر لە کوردەکان لە نزیک قەڵای پەنائاوای تاڵش بەشەو چوونە نێو چادری ئاقا محەمەدەوە و بەخەنجەر کوژتیان و تاجی گەوهەربەند و شیری ڕازاوە و دەریای نوور و گەلێک چتی گرانبەهایان هەڵگرت و چوونەوە لای سادقخان.

سادقخان کە زانی تۆڵەی گەلێک کورد لە ئاقا محەمەد کراوە، ئەو مەسەلەی بەفاڵێکی خێرگرتەوە. بۆ خۆی هەر بەو شەوە نۆکەر و دەستوپێوەندەکانی هەڵگرت و ڕوو بەعێراق ڕۆیشتن.

سبەینێ کە سوپاه لە کوژتنی ئاقا محەمەد ئاگاداربوون، دەستە بەدەستە خۆیان گەیاندە سادقخان و لێی کۆبوونەوە. سادقخان ڕۆژ بەڕۆژ هێزی گرت و سوپاهی زیادکرد، هەروەها بەهێز پەیداکردن ڕۆیی هەتا لە چۆمی ئاراز پەڕیەوە.

سادقخان تا ڕۆیی، شکاکەکانی لەسەر خۆی جەماند. تەورێزی گرت و برایەکی بەئەیالەت لەسەر دانا. جەعفەرخانی براکەی دیکەشی کردە حاکمی قەرەجەداغ.

سادقخان هەموو ئاورابایەگانی خستە دەست و ئومووری تێدا ڕێکخست. بەسوپاهێکی قورسەوە ڕوو بەتاران ئاژۆتی.

چونکە لە پێشدا ژن و منداڵی سادقخان لە تەرەف ئاقا محەمەدەوە لە قەزوێن داندرا بوون، گرتنی قەزوینی لەپێشدا بەپێویستر زانی، بەو لەشکرەوە بۆ سەر قەزوینی ئاژۆت.

سادقخان قاقەزێکی لە براکانی نویسی کە بچنە سەر کەلای خۆی و بیگرن. ئەوانیش بە ٥ هەزار پیاوی شەڕکەرەوە دەورەی کەلای خۆییان دا.

سادقخان لەهەر چوار کەنارەوە قەزوینی دەورەدا و شاری خستە تەنگانییەوە. سادقخان لێرەدا مەسئەلەی لێ بەراوەژوو بوو کە سوپاهی نارد ئاوەدانی و دێهاتی دەوروپشتی شاری تالان کرد. ئەوە دڵی ئەهالی قەزوینی لە سادقخان ڕەنجاند و ناچاری کردن

بەرابەری بکەن و شار بەدەستەوە نەدەن. سادقخان گەلێک خەریکی گرتنی قەزوین بوو. ئەهالی هەرچەندە تەمای ئەوەیان بوو سادقخان بەپادشا قبووڵ بکەن، بەڵام لە ترسی تاڵان و کوژتن خۆیان ڕاگرت و شەڕ و کوژتاریان دەکرد.

لەودەمەدا فەتح عەلیخانی قاجاڕ نامزەدی حوکمڕانی ئێران بوو، ئەهالی تاران بەپادشایان قبووڵ کردبوو. شۆڕشی حوکمڕانی ئێران لە هەموو کەللەیەک دابوو (جلد ئەوەڵ تەئریخ قاجاڕ لاپەڕە ٤٨).

محەمەد وەلیخانی قاجاڕ لە مەشهەدەوە بۆ یارمەتی فەتالی شا چووبووە تاران. فەتالی شا ئەمری پێدا سوپاهێکی قورس هەڵگری و بچێتە سەر سادقخان و قەزوین لە تەنگانی ڕزگارکات.

قەزوین بەڕاستی وەتەنگ هێنرابوو، ئەهالی لە مشوەرەتی تەسلیم بووندا بوون و قاسید لەنێوانی هەردوو لا لە هاتووچوون دابوو. لەناکاو محەمەد وەلیخان بەلەشکرێکی زلەوە گەیشتە نزیک قەزوین. سادقخان دەستی لە قەزوین بەرنەدا، بەڵام بەدەستەیەک لەشکرەوە چووە پێش محەمەد وەلیخان.

کورد و قاجاڕ شەڕیان دەست پێکرد، خوێن ڕژا و کوژتار زۆربوو. لە پاش چەند ڕۆژ شەڕ و جیدال، سادقخان دەستی لە دەورەدانی قەزوین بەردا و ڕوو بەسەراب گەڕایەوە.

ئەو دوو پیاوانەی کە ئاقا محەمەد قاجاڕییان کوژتبوو، کەوتنە دەست محەمەد وەلیخان لەنێو مەیدانی شەڕدا گیران. محەمەد وەلیخان بەئەنواعی ئەزیەت و ڕەزالەت هەردووکی کوژتن.

لەولاوە براکانی سادقخان بۆ گرتنی کەلای خۆی لە تەورێزەوە دەرکەوتن. جەعفەر قولیخان برا بچووکی حوسێن دۆنبۆلی کە حوکمڕانی کوردی دۆنبۆلی بوون بە ٢٠٠ پیاوی شەڕکەرەوە چوو لە مەرەند پێشی بەشکاکەکان گرت و شەڕ و کوژتارێکی زۆریان کەوتە نێوانێ. لە نەتیجەدا براکانی سادقخان شکان و ڕوو بەتەورێز گەڕانەوە.

کە دەنگی شکانی سادقخان لە دەست محەمەد وەلیخان دەرچوو، لە تەورێزەوە چوونە سەراب. فەتالی خانی قاجاڕ کە ناوزەدی شاهی بوو، لە تارانەوە چووە زەنگان. قاقەزێکی لەسادقخان نوسی و داوای مامڵەتی لێ کرد و پەیمانیشی دا کە حکوومەتی سەرابی بۆ تەسدیق کا و گەلێک پەیمان و نەوازشی بۆ تێدا نوسی و دای بەئیبراهیم خان عەزدەولدینی قاجاڕ.

عەزدولدین کە گەیشتە سەراب قاقەزەکەی دا بەسادقخان و بەزوبانیش گەلێک دڵخۆشی داوە.
سادقخان کە تەماشەی دەم وسەعاتی زەمانەی کرد، لەگەڵ فەتالی شا ڕێککەوتنی لە ناخۆشی بەچاکتر زانی و هەوای حوکمداری ئێران و دامەزراندنی حکوومەتێکی کوردی لەسەر دەرخستنی پێ مەسڵەحەت بوو؛ چونکە قاجارەکان بەپشتیوانییێکی تێوەچوو بوون، دڵگەرم و ئومێدەوار بوون و کوردەکانیش لەلاییێکی یارمەتی ئەکران، سست و پاشکەوتوو بوون. لەبەرئەوە تالیع و بەختی بەبەر گەیشتوو، ئەستێرەی قاجاری بەترووسکاوی ئەویست و پەنجەبازی کردن لە تەکیانا پەشیمانی لە دوابوو. سادقخان کە لە خۆی و فەتالی شا و لە پشتیوانی کوردان و قاجار ڕوون بووەوە، بناغەی دۆستیی دامەزراندنی هەڵبژارد و ئەمانەتەکانی کە لە لای بوو، بۆ فەتالی شای ناردەوە و قاقەزێکی بۆ نویسی و بەڕێی کرد.
کە عەزەدولدین گەیشتە کن فەتالی شا نویسراو و ئەمانەتەکانی لە سادقخانەوە داین، فەتالی شا زۆر منەتدار و شوکرانە بژێری سادقخان بوو. فەرمانی حوکمڕانی سەراب و سەردەر و گەرمەڕۆی بۆ نویسی، لەگەڵ خەلات و نیشان بۆی نارد؛ سادقخان بەحوکمڕانی ڕایدەبوارد.
ساڵی ١٢١٣ جەعفەر قولیخانی کوردی دۆنبوڵی، حوکمی ئەیالەتی خۆی و تەورێزی لە فەتالی شا وەرگرت و لە تارانەوە ڕوو بەتەورێز دەرکەوت.
سادقخان کە ئەوەی بیستەوە، کەوتە ئەندێشە و ترسەوە؛ چونکە کورد دەبوایە کورد بکوژێت بۆ تورکمان. لەو ئەندێشەیەدا بوو هەستا ڕووی کردە شێروان. جەعفەر قولیخان کە گەیشتە تەورێز، لە ئەحواڵی سادقخان ئاگادار بوو، گرتی قاقەزێکی دووروودرێژی بۆ سادقخان نویسی و بەسوێند و پەیمان شەرتی لەگەڵ کرد.
سادقخان بەجەعفەر قولیخانی باوەڕکرد و گەڕاوە سەراب. لە نێوانی هەردوو حوکمڕانی کورداندا، پەیمانی پەنهانی گرێ درا کە بەهەردووکان تێ بکۆشن بۆ یێکەتی و کۆکردنەوەی دڵی کوردەکان و بەهەموو جۆرێک بۆ ئیتفاقێکی عموومی بکۆشن. لەسەر ئەوە بۆ یەکتر سوێندیان خوارد و قەراریان دا کە ئەو ئیتفاقە سەری گرت، بەجارێک بۆ پووچکردنەوەی قاجار دەست پێبک بگرن و بڵندبنە سەر خۆیان.
حوسێن قولیخانی کوردی هەوشار، ئەو موعاهەدە و ئیتیفاقە سڕییەی کردە دەستەگوڵێکی خۆی و هەستا چووە تاران و بەفەتالی شای ڕاگەیاند. فەتالی شا بۆ

تێکدانی ئەو یێکەتی کوردانە، کردیە ئەیالەتی ورمێ و لەشکری هەوشاری لەگەڵ خست. حوسێن قولیخان ڕوو بە ورمێ لە تاران دەرکەوت (جلد ئەوەل تەئریخ قاجارِ لاپەڕە ٥٠ - ٥١).

سادقخان کە لەوە ئاگادار بوو، دووبارە کەوتە ئەندێشەوە. وە لەگەڵ حوسێن قولیخانی هەوشاری موخابەرەی کرد و لەگەڵی ڕێککەوت و چووە لای بۆ گرتنی ورمێ. ئیتیفاقی لەگەڵ کرد و چووە سەر ورمێ و گرتی و ئوموری تێدا دامەزراند.

فەتالی شا لە پاشان چووە ورمێ و سادقخانی نەوازش کرد و لەگەڵ خۆی بردیە تاران. لە پاش چەندێک سادقخان لەشکرێکی لە فەتالی شا وەرگرت و چووە سەر خوراسان. مەمشخانی کورد لە شاری چناران ئامادەی شەڕ ببوو. سادقخان بەپەنهانی جوابی لێی نارد کە مەمشخان خۆی بەدەستەوە نەدات؛ چونکە بگیرێ دەکوژرێ (جلد ئەوەل تەئریخ قاجارِ لاپەڕە ٥٨).

سادقخان ڕێگای بۆ مەمشخان چۆڵ کرد کە هەلێت. مەمشخان لەلایێکەوە ڕوو بەمەشهەد بۆی دەرچوو. سادقخان چوو دەورەی «چناران»ی دا و گرتی. لەو دەمەدا قاقەزی فەتالی شا گەیشتە سادقخان کە دەست لە چناران بەردات.

سادقخان بەپەنهانی خۆی کۆکردەوە و هێزی پەیدا کرد. فەتالی شا گەیشتە جێگاییێکی کە پێی دەلێن: «ئاققەلا» سادقخان ڕووی لە قاجاران وەرچەرخاند و پشتی تێ کردن. قاقەزێکی لە فەتالی شا نوسی: زۆر پێویستە کە بەلەز ئەللایارخانی قلیجە حاکمی سەبزەواری بۆ بنێرێت.

فەتالی شا لەوە کەوتە فیکرەوە؛ بەلام هەرچۆنێک بوو ئەللایارخان، خودا لەگەلی لە فەتالی شا خواست و ڕۆیشت. فەتالی شا گوتی: ئەی وزەرا ئەمە پشتێکە ئەللایارخان لەمەی کرد، جارێکی تر ڕووی نابینینەوە (جلد ئەوەڵ، تەئریخ قاجارِ، لاپەڕ ٥٥).

ئەللایارخان کە لە تاران دەرچوو، گەیشتە قەلای ئاققەلعە، دەرگای لەسەرخۆی گرێدا و ئالای سەربەخۆیی هەلدا. فەتالی شا ئەودەمەی زۆر تەنگ بوو، نەپەرژا سەر ئەمە بۆچوونە سەری سوپاە ساز بکا.

سادقخان بەلەشکر و سوپاهێکی لە دەستیابوو گەڕاوە و چووە سەر خاکی خۆی و دەستی بەحوکمڕانی و ئوموری سەربەخۆیی پێکهێنان کردەوە؛ پێویست و ئەسپابی فەراهەم کرد.

سادقخان هەتا ساڵی ۱۲۱۵ لەگەڵ سەربەخۆیی خەریک بوو، لەو ساڵەدا نایبوسەڵتەنە شازادە عەباس میرزای قاجارِ، لە هەموو گۆشەی ئێرانەوە سوپاهی پێکەوە ناو چووە سەر سادقخان.

سادقخان بۆ بەرابەرکردنی عەباس میرزا، لەشکری دەنگ دا. موددەتی سێ مانگ لە نێوانی هەردووکان شەڕ و کوژتار کرا و لە مەیدانی شەڕا سادقخان کەوتە دەست عەباس میرزا و کوژرا.

عەباس میرزا کە سادقخانی کوژت، حکوومەتی سەراب و گەرمەڕۆی دا بەسارۆخانی برای سادقخان و محەمەد عەلی سوڵتانی برا بچووکی سادقخانی، بەخان ناو ناو کردیە سەرکردەی سوارە. خاکی چەند سەد ساڵەی سەربەخۆی کورد کەوتە ژێر حوکمی قاجارانەوە و میللەتەکەش بوونە سوارەی قاجارەکان و بەموددەتێکی کەم بوونە شیعە و لە پاش تێکچوونی حکوومەتیان لە خاکی موکریبی دانیشتن و بوونە جوتیار و باغچەوان. شوعبەیەکی کەمی لە حاڵەتی ڕەوەندیدا مانەوە و مەڕ و وشتر بەخێو ئەکەن. بەزستان لە دەشتی تالاو بەهاوین لە کێوی سەهەند ڕایدەبوێرن.

## ۳- مەمشخانی کوڕی ئەمیرخانی کوردی زەعفەرانە

لە باب و باپیربەوە بەئەمارەتی چناران و میللەتی خۆی ڕادەبوارد، وە لە حکوومەتی قاجارِ دڵگیربوو. هەمیشە لە کەلێن ئەگەڕا دەست نەئەکەوت و لە کۆشەوە دابوو ئیتاعەی قاجاری نەئەکرد.

ساڵی ۱۲۱۳ سادقخانی شکاک بەسوپاهێکی قورسەوە ناردرا سەر مەمشخان کە بیگرێت و شار و مەملەکەتی لێ وێران کات. سادقخان لە ڕووی میللەتپەرستی و کوردایەتییەوە، بەپەنهانی لە مەمشخانی گێڕاوە کە ناچارم چناران ئەگرم؛ بەڵام واچاکە ڕوو بەجێگایەک دەرباز بیت.

مەمشخان چونکە باوەڕی بەسادقخان دەکرد، هەستا چنارانی بەردا و ڕوو بەمەشهەد ڕۆیشت.

کە مەمشخان لە چناران دەرکەوت، سادقخان چوو دەورەی چنارانی دا و گرتی. لە پاش ئەمنیەت و ئاسایش پێدان، مەسائیلی بەرئاوەژوو قاجارەکانی ناچارکرد دەست لە چناران بەردەن.

مەمشخان کە وای زانی گەڕاوە سەر موڵک و مەملەکەتی خۆی و دەستی بەتەشکیلات کردەوە و بانگی سەربەخۆیی لێدا.

ساڵی ١٢١٧ فەتالی شای قاجار لەژێر فەرماندەی حوسێن خانی قاجارا لەشکرێکی قورسی ناردە سەر مەمشخان. مەمشخان نەیهێشت حوسێن خانی قاجار نزیک ببێ لە چنارانەوە و بۆی دەرکەوت و چوو پێشی پێگرت.

لە دوای گەلێک شەڕ و کوژتار حوسێن خان بەشکاوی گەڕاوە. مەمشخان بەدڵخۆشی و تالآن و دیل وەدەست خستن چووەوە چناران (جلد ئەوەڵ، تەئریخ قاجار، لاپەڕە ٦٤).

مەمشخان هەتا ساڵی ١٢٢٨ لەگەڵ حوکمڕانی خەریک بوو. چەندجاران قاجار بۆی چووبن، دەەرقەتی نەدەهاتن و بە شکاوی دەگەڕانەوە.

یوسف خواجەی کوڕی ئایی خواجەی کاشغەری زەمانە لە کاشغەرەوە ڕوو بەمیسر و شام و شارەزووری ئاژووتبوو. لەگەڵ ئاوڕەحمان پاشای حوکمڕانی بابان ڕێککەوتبوو، کە حکوومەتی بابانی دووچار بەئەزیەت کرد ڕوو بەتاران و خوراسان هەڵات. کەوتە نێو کوردەکانی خوڕاسانەوە و بەناوی سونییەتی گەلێکی کورد و تورکمانی ئەو جێگایەی کردە هاودەنگی خۆی و تەپڵی عوسیانی لە قاجاران لێدا.

مەمشخان لەو نێوەدا ناچاربوو یارمەتی یوسف خواجە بکات؛ لە کوردی زەعفەران دەستەییێکی لەشکر دایێ. یوسف خواجە بەناوی شیعە کوژتن کەوتە نێو میللەتی مەزڵوومەوە، دەستی بەتاڵان و کوژتار کرد. فەتالی شای قاجار پێش بەفیتنەگرتنی لەسەر خۆی فەرزکرد، لەشکرێکی قورسی لە ژێر فەرمانی محەمەد وەلی میرزای قاجارا ناردە سەر یوسف خواجە. لە پاش گەلێک کوژتار، یوسف خواجە شکا. کوردەکانی خوڕاسان لەسەر پیاوێکی بێگانە دووچار بەئەزیەت و کوژتار بوون.

مەمشخان لەگەڵ کوژراوان بەدیل گیرا و بە ١٥٠٠ کەس کورد و تورکمانەوە بۆ تاران ناردران و لە مانگی ڕەجەبی ئەو ساڵەدا کوژران. (جلد ئەوەل تەئریخ قاجار لاپەڕە ١٢٢ - ١٢٣).

## ٤- مستەفاخانی کوردی تاڵش

ئەو بنەماڵەی کوردی تاڵش، هەر سەربەخۆ بوون و لە جەنگەڵی تاڵشا ئازاد دەژیان. لە دەوری حکوومەتی کوردی زەند زۆر چاک ڕایاندەبوارد. هەتا دەوری قاجارەکان، حوکمڕانی سەربەخۆ بوون.

ساڵی ١٢٠٥ کە دەستی قاجار لە ئێراندا کەوتە سەر دەستی زەندەکان خاکی ئێرانیش کەوتە ژێر حوکمی ئاقا محەمەدی قاجارەوە، ئەوجا قاجارەکان بەئاسانی بۆ هەموو ئەمارەت و حوکمدارێکی کەنارەکان دەستیان هاوێژت.

ئاقا محەمەد لەژێر فەرمانی جان محەمەدخانی قاجاردا، لەشکری ناردە سەر مستەفاخانی حوکمداری کوردی تالش.

لەشکری قاجار لە ئەردەوێلەوە ڕوو بەتالش بزووت. مستەفاخان لە کوردەکانی تالش لەشکری کۆکردەوە و چوو پێشی بەقاجار گرت و لە هەردوولاوە کوژتار دەست پێکرا، لە نەتیجەدا محەمەدخان شکا و بەپەرێشانی هەڵات و گەڕاوە دوایی. کوردەکان بەتالانکردن و شادمانی چوونەوە تالش.

ساڵی ١٢٠٩ ئاقا محەمەد بۆ گرتنی خاکی ئیبراهیم خەلیلخانیی جوانشێر لەشکرێکی قورسی هەڵگرت و پەلاماری بردێ لەسەر پردی «خودا ئافەرین» مستەفاخانی قاجاری ناردە سەر تالش. مستەفاخانی تالشی هەڵات، گەورە و کاربەدەستانی تالش کە لەوە ئاگاداربوون، ژن و منداڵ و پێویستی ماڵیان هەڵگرت و کەوتنە نێو کەشتی ئاوەوە و ڕوو بەساڵیان هەڵاتن. ئەهالی ساڵیان لە ترسان وە خۆیان نەگرتن.

تالشەکان بەناچاری لەنێو دەریادا لەنگەری کەشتیان بەردا وە بۆ هەڵمەتدانی دوژمن خۆیان ئامادەکرد.

هێندێکیش لە تالشەکان لەنێو چیا و دۆڵەکانی کێوە بەرزەکاندا خۆیان پەنهاندا. لەشکری قاجار لنگیاندا سەر کەشتی کوردەکان و دەستیان بەکوژتاریان کرد، گەلێک ڕوئەسا و ٢٠٠ نەفەر ئەهالیان بەدیل گرتن و بردیانە لای ئاقا محەمەد. بەئەزیەت و وەحشیانە پارچە و لە تکەتیان کردن. هێندێک لە ماڵ و منداڵی تالشیەکانیان ناردە ئەردەوێل و مازندەران.

شانوازخانی شاپلینگ خان کە بەدیل گیرابوو، نوازش کرا و خەڵاتیان کرد، بۆ ڕۆژێک بۆ بەکاربردنیان دڵخۆشیی داوە. (جلد ئەوەڵ، تەئریخ قاجار، لاپەڕە ٣٨).

بەهاتووچۆکردنی پیاوانی خێرخوا، مستەفاخانیان لەگەڵ قاجارەکان ڕێکخستەوە و لە ژێر ئیدارەی قاجارەکاندا مستەفاخان کراوە بەحوکمڕانی تالش.

ساڵی ١٢٢٠ مستەفاخان بەپەنهانی لەگەڵ حکوومەتی عرووس ڕێککەوت و شەرت و قەرار لەنێوانی هەردوولا دەست پێکرا. هێز و ئەسلیحەی لە عرووسەوە بۆ ناردرا؛ ڕۆژ

بەرۆژ لە خۆ کۆکردنەوە خەریکبوو.

ساڵی ١٢٢٢ مستەفاخان لە عرووسەکان دڵ پیس بوو، کەوتە ئەندێشە و ترسی ئەمەوە کە نەبادا عرووس خاکەکەی لێ بگرن و خۆشی پووچکەنەوە؛ ناچار لەگەڵ نایبولسەڵتەنە، عەباس میرزا موخابەرەی کرد.

مستەفاخان لە ئیشی قاجاڕ و عرووس ئاگادار نەبوو کە بەپەنهانی لە ڕێککەوتندا بوون؛ داوای یارمەتی لە قاجاڕەکان کرد. ئەوانیش بەسستی نەجوابیان داوە و نە یارمەتیشیان کرد. بەڵام مستەفاخان خۆی ڕاگرت، کەم کەمە رووی لە سەرکەوتن و بزووتن کرد.

نایبولسەڵتەنە لەبری کۆمەگی کردن، پیرقولی ناو سەرکردەیەکی خۆی نارد و گەلێک ماڵی ئەهالی تاڵشی بارکردن و بردنیە ئەردەوێل. قاقەزیشی لە تاڵشیەکان دەنویسی و دڵخۆشی ئەدانەوە کە لە مستەفاخانیان بپچڕنەوە.

مستەفاخان بەگەرمی لەگەڵ عرووس ڕێککەوت، چەند هەزار ساڵدات و چەند پۆڵکونیک عرووسی بەچەک و ئەسپابێکی زۆرەوە خواست کە بچنە ناوچەی ئەمارەتی تاڵشەوە.

نایبولسەڵتەنە کە لەوە ئاگادار کرا لەشکرێکی قورسی هەڵگرت و چووە نەخچەوان تاکو پەلاماری تاڵش بدات. عرووس لە هەموو گۆشەیێکی تخووبەوە ساڵداتی ئاژووتە پێشەوە، تاکو پەلاماری خاکی قاجاڕ بدا. بەوە عەباس میرزا لە گەیشتنە دڵخوازی پاشکەوت، لە بری هەڵمەت بردن، پەلاماری درایێ.

ساڵی ١٢٢٣ گەلێک شەڕ و کوژتار کەوتە نێوانی عرووس و قاجارەوە. ئاوری شەڕوشۆڕ ئایسا. چەندجار کوژتاری خوێناوی ڕوویدا (جلد ئەوەڵ تەئریخ قاجاڕ لاپەڕە ٩٢ - ٩٣ - هەتا ١٠١).

ساڵی ١٢٢٤ فەرەجولڵاخانی هەوشاری بۆچوونە سەر مستەفاخان ناردرا ئەردەوێل لەگەڵ نەزەر عەلیخانی شاهسەوان کە حاکمی ئەردەوێل بوو ڕێککەوتن کە لەگەڵ مستەفاخان شەڕ نەکەن؛ ئەو هێزەی بەدەستیانەوەیە بەگژ قاجاڕی داکەن. بەوجۆرە لەگەڵ مستەفاخان موخابەرەیان کرد و ڕێککەوتن.

مستەفاخان لەودەمەدا ماڵ و ئەسپابی خۆی ناردبووە کەلای گامیشەوان (جامیشوان) و میر حەسەنخانی کوڕی خۆشی بەسوپاهێکی قورسەوە ناردبووە سەر حوسێن عەلیخانی

باکۆیی. میر حەسەنخان لینگیدا سەریان، عەلیخانی رودباری، هاشم خانی شیروانی، محەمەدخانی برای هاشم خانی گرتن و کوژتاریکی قورسی کرد و گەڕاوە تالش.

لەولاوە سوپاهی قاجار ڕوو بەشاری «لەنکەران» کە پایتەختی تالش بوو ڕۆیشت. دیوار و خانوبەرە و کۆشکی ڕەنگاوڕەنگی مستەفاخانیان ڕوخاند و تالانیان کرد و گەڕانەوە.

مستەفاخان میر هیدایەتی کوڕی خۆی بۆ لای مستەفاخانی شیروانی نارد، کە پێکەوە ڕێککەون و یاریدەی یەکتر بدەن. ئەگەرچی لە یێکە پیاوە گەورەکانی شیروان چووبووە لای مستەفاخانی تالش کە نیوبژی هەردوولا بکات ناوی عومەر سولتان بوو، بەدەست میر حەسەنخان بەکوژت چووبوو، مستەفاخانی شیروان لەوەش چاوپۆشی کرد. دەستە تفەنگ هاویژی هەزار کەسی بۆ نارد، بەچەک و ئەسپاب یارمەتی کرد.

لەودەمەدا محەمەدخانی سەرکردەی هوزارە لە تەرەف قاجارانەوە ناردرا سەر تالش، لەنیوانی هەردوولا کوژتار کرا، قاجار شکان.

فەتالی شا میرزا بزورگی وەزیری نایبولسەلتەنەی ناردە تالش لە شاری لەنکەران. میر گۆنەخانی ئامۆزای مستەفاخانی دلخۆشیی داوە و ناردیە گامیشەوان. لە دواجار خۆی و میر گۆنەخان پێکەوە چوونە لای مستەفاخان، بناغەی دۆستی و ئاشتیان لەتەکا دامەزراند و گەڕانەوە دوایی. لەشکری قاجار لە تالش دەرکەوت و گەڕاوە ئەردەوێل؛ بەلام مستەفاخان لەتەک عرووسا ڕابیتەی نەپچڕاند. سالی ١٢٢٧ عەباس میرزا لە مستەفاخان زۆر دەترسا کە دووچار بەبەلای بکا. کازم ناو ئامۆزاییێکی مستەفاخانی ساز کرد و فەتالی شاش مەلا عەلی گەیلانی ئامادەکرد و ناردیانە لای مستەفاخان کە بناغەی ئاشتی دامەزرێنن و چیدیکە بەقسەی عرووس فریو نەخۆن. چوونیان بێ فایدەبوو، بەپووچی گەڕانەوە.

مستەفاخان زۆر بەلەز لە دەستوبرد خەریکبوو خاکی خۆی دەست خستەوە و ڕەعیەتە بلاوەکانی وەخڕکردن و خزمەکانی کەلەکن قاجارەکان گیرابوون بەریدان و بردنیەوە لای خۆی. لەتەک عرووسا ئیتفاقێکی جوانی کرد و بۆ یارمەتیدانی چەک و ئەسپابیشی لی وەرگرتن (جلد ئەودل، تەئریخ قاجار، لاپەڕە ١٠٤).

شەڕ و کوژتاری عرووس و ئێران لە دەریای قەزوینەوە تا دەشتی ئەردەهان و فارس، موددەتی چوار سال دەوامی کرد. مستەفاخانی تالش وەکو کوردەکانی دیکەی شیروان و

جوانشێر و جەبری لە مەیدانی شەڕدا بەرابەر بەقاجارەکان، ڕاوەستابوون، هێندێک جار سەر دەکەوتن و هێندێک جار لە چیا بەرزەکانیانا خۆیان ڕادەگرت.

ساڵی ١٢٢٨ ناپلیۆن لەگەڵ ئیمپراتۆری عرووس نێوانیان تێک چووبوو، تەمای شەڕ و جیدالی کرد. سەرداری عرووس «یەنەراڵ ڕەدیشجۆف» لەگەڵ حکوومەتی قاجار بناغەی ئاشتی دامەزراند، پۆڵکونێک فریقان ناوی بەوەکالەتی خۆی نارده لای «سەر کوزر وێلی برۆنتی» ئینگلیز کە لە ئێران بوو، وە «مایۆر پاپۆف» ناویشی نارده لای نایبولسەڵتەنە کە لە تەکیانا مامڵەت بکرێ. لەودەمەشدا ئیشی عرووس و قاجار بەهێند داندرا و شەڕ نەما.

مستەفاخانی تاڵش لەوە ئاگادار نەبوو کە عرووس لە ترسی ناپلیۆن لەتەک ئێرانا بەناچاری سولح دەکا، هەر بەهەوای پێشوو ڕایدەبوارد.

نایبولسەڵتەنە ئەودەمی ڕێککەوتنەیەی لەگەڵ عرووس پەلاماردانی مستەفاخانی تاڵشی بەفەرز زانی و شەڕ و کوژتاری ئەو چەند ساڵەی لەسەر کوردەکانی تاڵش کردبوو بەماڵ، جا لەبەر ئەو هەلبەتە لابردنی مستەفاخان واجیب ببوو. لەشکرێکی قورسی هەڵگرت و ڕوو بەتاڵش بزووت.

لەلایێکەوە پیاوانی ئینگلیز و قاجار لەگەڵ یەنەراڵ ڕەدیشحۆف لە هاتووچوونی موسالەحە دابوون و لە لایێکی ترەوە نایبولسەڵتەنە بۆ چوونە سەر تاڵش لە دەستوبردا بوو.

مستەفاخان کە لەوە ئاگادار کرا، ڕۆژی حەوتی شەعبان هەموو جێگا تەنگەکانی گرت و بەداری چەم سەنگەری لە گەلی و دەربەندەکاندا گرێ دا و میر حەسەنخانی کوڕی خۆشی بەسەرداری سوپاه نارده پێش نایبولسەڵتەنە.

مستەفاخان کەشتی شەڕی لە گامێشەوانەوە خستە نێو دەریاوە و لە هەموو لایێکەوە شەڕ دەست پێکرا، قاجار ڕوو بەشاری لەنگەران ڕۆیشتن، تۆپی کوردەکان لەنێو کەشتیدا دەستی بەئاورباران کرد. لە دوو سەعات زیاتر هەردوولا بەتۆپ یەکتریان ئاورباران کرد. لە نێوانیدا چەند زابت و ساڵداتی عرووس کوژران؛ لە نەتیجەدا قاجار شکستەی تێکەوت. بەڵام چونکە سوپاهی قاجار لە سێ جێگای خاکی تاڵش قەڵای دروست دەکرد، سوپاهی شکا و لەو جێگایانە خۆیان گرتەوە.

لە نزیک لەنگەران و لە «قرق ئاغاج» و لە «شلومار» مستەفاخان چوار مانگ ئەو

قەڵایانەی دەورەدا و هەموو شەو و ڕۆژێک تۆپ و تفەنگ ئاوردان لە کاردا بوو.

نایبولسەڵتەنە بۆ موسالەحەکردن لەگەڵ عرووس سادقخانی کوڕی نەجەف قولیخانی کوردی گەرووس و «مستەرلزی» زابتی تۆپ و «مستەر گوملی» دوقتۆری ئینگلیزی ئامادەکردن و بۆ موسالەحەکردن ناردنیەوە لای سەرداری عرووس؛ بەلام سەری نەگرت. جەنەراڵ ڕەدیشچۆف ئەوانەی هەموو بەهەڵخەڵەتاندن زانی و ناردنیەوە دوایی (جلد ئەوەل، تەئریخ قاجار، لاپەڕە ١٢٦).

لەسەر ئەوە شەڕ لەنێوانی عرووس و قاجارِ گەرم بوو. عرووس لە هەموو لایێکەوە تەقویەی کوردەکانی کرد. جەعفەر قولیخانی کوردی دونبولی و مستەفاخانی تالش و مستەفاخانی شیروانی و جەعفەر قولیخانی ئاغای جەبری بەریز لە ئیرەوان و نەخچەوان و قەرەچەباغ و قەرەداغ دەستیان بەکوژتاری قاجارِان کرد.

فەتالی شای قاجارِ لە تارانەوە ڕوو بەئاوربایگان خشا و نایبولسەڵتەی لەشەڕ مەنع کرد. قاجارِ بەشکاوی ڕوو بەتەوریز کشانەوە.

مستەفاخانی تالش چەند قەلاییێکی قاجارِ دروستیان کردبوون گرتنی و گەلێک تالان و ئەسپابی دەستکەوت و خاکی خۆشی لە قاجارِ پاککردەوە.

جلد ئەوەل، تەئریخ قاجارِ، لاپەڕە ١٣٨ دەڵێت: بیست نۆی مانگی شەوالی ئەو ساڵە عەهدنامەیەک لەنێوانی حکوومەتی عرووس و ئێران لە خاکی «قەرەباغ» لە مەحالی (گولستان) لە کەنار چۆمی «زێوە» -کە لەشکرگای عرووس بوو-نویسراوە. هەردوو حکوومەت تەسدیقیان کرد کە دە فەسلە، لە فەسلی دووەم و سێیەمدا قەراریان دا خاکی تالش لە ئەردەویلەوە هەتا ئەنزەلی بە«خان نشین» ناو بنرێت و لەژێر چاوەدێری هەردوو حکوومەتدا ڕابگیرێ و عرووس سوێندخۆر و پشتیوانی بیت.

لەو تەئریخەدا تالش کەوتە ئیدارەییێکی چاک و خاوێنەوە. چاودێریی عرووسیان قبوولکرد و قاجارِیان نەویست. لە تەرەف موهەندیسانی هەردوو حکوومەتەوە تخوبیان بۆ دانان و عرووس بەهەموو هێزێکەوە دەستی بەدامەزراندنی ئەو خاننشینی کوردە کرد. مستەفاخان زۆر بەئازادی لەگەڵ ڕێکی و دامەزراندنی حکوومەتی خەریکبوو.

لە موددەتی دوو ساڵا ئەو خاکەی گەورە و ئاوەدان بوو، زۆر چاک ڕووی لە سەرکەوتن کرد. گەلێک دەوڵەمەند و خاوەند کار و کاسبی و پیشەبوو. وە تۆپ و تفەنگ و قۆرخانەیەکی قورسی پێکەوەنا. لەشکر و سوپاهی، وەکو ساڵدات و قازاخی عرووس

تەعلیم ئەدرا، لە تەرەف عرووسەوە زابت و پیاوانی زانا و کاردارانی بۆ ناردرا بوو. ئومووریشی بەدەستووری فەننی بۆ دامەزراندرا.

مستەفاخان هەتا ساڵی ١٢٣٠ هیجری لەژێر چاودێریی حکوومەتی عرووسا بەحوکمداری تاڵش ڕایبوارد، لە مانگی ڕەجەبدا نەخۆش کەوت و بەئامورزشی یەزدان شادبوو. سێ کوڕی لە پاش بەجێما ١- میر حەسەن ٢- میر حوسێن ٣- عەباس بەگ.

## ٥- میر حەسەنخانی کوڕی مستەفاخانی تاڵش

کە مستەفاخان مرد، کوڕەکانی پێکەوە ڕێک نەکەوتن، شۆڕشیان کەوتە نێوانی. میر حەسەنخان بۆ ئەمەی کە ببێتە جیگانشینی باوکی، چووە لای «سەقاویچ» کە سەرداری عرووس بوو لە ئاوربایەگان. لەوددەمەشدا نێوانی ئێران و عرووس زۆر بەخۆشی ڕادەبرا.

عەباس میرزای [قاقەزی] لە «سەقاویچ»ی نوبسی و داوای میر حەسەنخانی کرد، سەقاویچ زۆر بەناپیاوی میر حەسەنخانی گرت و تەسلیم بەنایب ولسەڵتەنەی کرد. عەباس میرزا تەسلیم بەقولیخانی سەعدەلوویی حاکمی خەڵخاڵی کرد، کە ئاگاداری بکا و هەڵنەیێ.

میر حەسەنخان کەلێنی دەست خۆی خست و هەڵات و چووە تاڵش. سوپاهێکی زۆر چاکی لە کوردی تاڵش سازکرد و پەلاماری خاکی لەنگەرانی دا. چەند شەڕێکی لەگەڵ عەرووس کرد و گەلێک خوێنی لێ ڕشتن و لەنگەرانی گرت و چووە سەر «ئەرگەوان». ئەویشی بەشەڕ و کوژتار لە چنگ عەرووسی دەرخست.

میر حەسەنخان خاکی بابی بەتەمامی لە عرووس ئەستاندەوە و ئالای سەربەخۆیی تێدا هەڵدا و دەستی بەدامەزراندنی حکوومەت کردەوە. «سەقاویچ» لەوە کە ئاگادار بوو، هەڕەشەنامەیەکی بۆ حکوومەتی قاجارِ نارد کە: بۆچی مەیدان بەمیر حەسەنەخان دراوە هێندە کوژتار لە عرووس بکا.

عەباس میرزا سوپاهێکی قورسی لە تەوریز ڕێکخست و لە ڕێگای ئەردەوێڵەوە ناردیە سەر میر حەسەنخان و هەردوولا دەستیان بەکوژتار کرد.

لە لای عرووسەوە مستەفاخانی شێروانی و محەمەدخانی کوردی شەکیی بەلەشکری شەکی و شێروانەوە و ئەلگساندەری والی گورجستان بەتۆپ و قۆرخانەوە ساڵداتێکی زۆری هەڵگرت و لەگەڵ لەشکری کوردەکان ڕوو بەمەحالی شەکی ئاژۆتیان. حاجی محەمەدخانی کوردی قەرەگوێز لەگەڵ مستەفاخان ڕێککەوت و چووە لای.

حکوومەتی قاجارِ لەولاوە مەهدی قولیخانی کوردی جوانشیێربان لە رێگای موقری و بەرکەشات ناردە سەر میر حەسەنخان. مەهدی قولیخان لەگەڵ میر حەسەنخان رێککەوت و بەو لەشکرەی پێی بوو چووە پێش مستەفاخانی شیروان. دوو لەشکری کورد بەگژ یەکتردا چوون و گەلێکیان لێک کوژت.

فەتالی شا کە وایزانی بەپەنهانی یارمەتی میر حەسەنخانی کرد. ئاقا سلێمانی گەیلانی بەفەوجە شکاکەوە ناردە کۆمەکی میر حەسەنخان و ڕوو بەعرووس چوو. گەلێک کوژتاری لێکردن.

مستەفاخان شێروان چاردە ساڵ بوو لەسەر ئەو خاکە لە تەرەف عرووسەوە حوکمڕان بوو. هەروەکو شەوی نۆی موحەرەم کەوتبووە دەستی، لە پاش چاردە ساڵ شەوی نۆی موحەرەم ئەو خاکە کەوتە دەست میر حەسەنخان.

میر حەسەنخان لە قەڵای لەنگەرانەوە چووە سەر قەڵای سالیان و ئەویشی بەشەڕ گرت. لە جلدی ئەوەڵ تەئریخ قاجارِ لاپەڕە ١٩٤دا دەڵێت «سەد هەزار خەروار ئارد کە لە تەرەف مستەفاخانەوە بەتێشوو داندرابوو، کەوتە دەست میر حەسەنخان».

میر حەسەنخان بەئازادی و ڕەشیدی ناوبانگی کرد و لەنێو ئیسلامدا لەبەر زۆری شەڕکردنی لەگەڵ عرووس بە« ئەسبەقولموجاهدین» (اسبق المجاهدین) لەقەبی داندرا و لەگەڵ فەتالی شای قاجارِ نێوانی چاک کرد.

ڕۆژی ١٢ی موحەرەمی ساڵی١٢٤٠ بەحوکمڕانی تالش ناونرا. حکوومەتی قاجارِ ئەو حکوومەتەی لەژێر چاوەدێری خۆیدا تەسدیق کرد و میر حەسەن بە«میر حەسەنخانی تالشی» لەقەب کرا.

هەروەکو باسکرا مستەفاخان و محەمەدخان ڕوو بەخاکی خۆیان کشان، وە بەقاجارِ کوژتن خاکی شەکی و شیروانیان خستەوە دەست و بەزۆری بازوو و شیری تیژ خاکی خۆیان لە قاجارِ پاک کردەوە.

مستەفاخان لەسەر شێروان و محەمەد حوسێن خان لەسەر شەکی بوونەوە بەحوکمڕان و لە ژێر چاوەدێری عرووسا حکوومەتیان دامەزراند.

حکوومەتی قاجارِ بۆ خستنەوە دەستیان کۆشان و پیاوی چاپلووسیان ناردە لایان کە مامڵەت بکەن، بەتۆپ و تفەنگ جواب درانەوە.

میر حەسەنخان لەگەڵ کوردەکانی شەکی و شیروان ڕێککەوت و دەستی بەئومووری

خۆی کرد. گاه لەگەڵ ئێران و گاه لەگەڵ عرووس بەپەنهانی خۆی ڕێک دەخست. بەوجۆرە پێنج ساڵی تەواو و بەبێ کێشە بەحوکمداری ڕایبوارد.

تەشکیلی ئەو حکوومەتە لە عرووس گران هات؛ سەقاویچ سەرداری عرووس هەڕەشەنامەیەکی دووەمی بۆ حکوومەتی قاجاڕ نوویسی و گوتی کە میر حەسەنخان لە دەست عرووس دابوو تەسلیم بەقاجارِ کرا کە نەهێڵن ببزوێت؛ ئێستا حکوومەتێکی وای دروست کردووە سبەینێ پەلاماری قەوقاز دەدات. ئەگەر قاجارِ لەوەدا دەستی نیە، لەشکرێکی بکاتە سەر و ئەمنیش بەلەشکرەوە پشتی لێدەگرم.

عەباس میرزا لەشکرێکی قورسی لە ڕێگای ئەردەوێڵەوە نارده سەر میر حەسەنخان. لەولاشەوە سەقاویچ ساڵدات و موهیماتێکی قورسی بەتۆپ و قۆرخانەوە نارده سەری.

میر حەسەنخان کە لەوە هوشیاربوو ناچار خۆی بەردا و ڕوو بەئەنزەلی و گەیلان هەڵات. لە مانگی شەوالی ١٢٤٥ی هیجری لەوێ خۆی نەگرت و چووە مازەندەران و لەوێوە چووە تاران. فەتالی شای قاجارِ تەمای بوو بیبەخشێ، بەڵام لەولاوە سەقاویچ داوای کرد.

لەنێوانی ئێران و عرووسا گەلێک گفتوگۆ کرا؛ عرووس هەر داوای کرد. فەتالی شا قەراری دا کە تەسلیم بەسەقاویچی بکات و بینێریتە تفلیس.

میر حەسەنخان لەو موددەتەدا نەخۆش کەوت. لە مانگی زیلحەجە بەئامورزشی یەزدان شاد بوو و لە تاران ناژتیان.

خاکی تالش کرا بەدووبەش، لای ئەنزەلی و دەریای قەزوین وەبەر عرووس کەوت، لای ئەردەوێڵیش درا بەقاجارِ. ئیتر ئەو خانەدانە هونەرمەندەی کوردە پووچ کراوە.

## ٦- ئیبراهیم خەلیل خانی کوردی جوانشێر

بنەماڵەی جوانشێر لە خاکی قەرەباغ و قەراچەداغدا حوکمڕان بوو، وە لە [ناو] ئومەڕایانی کوردستانا ناوبانگیان هەبوو. ئیبراهیم خەلیلخان وەکو ئومەراکانی کورد لەگەڵ حکوومەتی زەند پێکهاتبوو. کە سێڵاوی قاجارەکان بەخاکی ئێرانا پەرشبوو، برایم خەلیلخان سەری بۆ نەنەواندن.

ساڵی ١٢٠٧ ئاقا محەمەدی قاجارِ قاقەزی لێ نوویسی کە ئیتفاقی لەتەکا بکا، برایم خەلیلخان بەتۆپ جوابی داوە.

ئاقا محەمەد شەش هەزار پیاوی شەڕکەری ئازای لەژێر فەرماندەی سلێمان خان نیزامولدەولەدا نارده سەری. برایم خان کە تەماشای بەخت و نێوچاوانی کورد و قاجارِی

کرد، مامڵەتی لە شەڕ چاکتر دی. عەبدولسەمەد بەگی ئامۆزای خۆی سازکرد و بۆ تارانی نارد.

مورتەزا قولیخانی قاجارڕ لە نیوەی ڕێگا چووە پێشی شەڕیان پێ فرۆت و برینداریان کرد و بەبریندار ی گرتیان و سەریان بڕی و کەلەشیان نارده شیراز.

برایم خەلیل خان لەو سەربهوردە کە ئاگادار بوو، ڕقی هەستا و ئاوری تێبەربوو. دەزبەجێ لەتەک حکوومەتی عرووسا موخابەرەی کرد. ساڵی ۱۲۰۹ لەتەک والی تفلیسا ڕێککەوتن و پەیمانی خۆشەویستیان گرێدا (جلد ئەوەل، تەئریخ قاجارڕ، لاپەڕە ۳۸).

برایم خەلیل خان لەگەڵ کوردەکانی «شێروان و شماخی و قەبە و دەربەند» گفتوگۆی کرد و ڕێککەوت و هاتوچۆیان دەست پێکرد و بۆ بەرابەری قاجارەکان پێویستانیان سازدا.

لەولاوە ئاقا محەمەد لە بزوتنی کوردەکان خەبەردار بوو؛ سوپاهێکی لە ژێر فەرمانی وەزیر لەشکر میرزا ئەسەدخان نووریدا نارده سەریان. برایم خەلیل خان هەموو جێگا تەنگەکانی گرت و پردی خودا ئافەرین کە لەسەر چۆمی ئاراز بوو، ڕوخاندی. لەمبەرە و بەرەوە تۆپی لێ گرێدا و ئامادەی شەڕ بوو.

لەشکری قاجارڕ بەشەڕ و کوژتار کەوتە نێوانیان، کورد هەرچەندە کۆشان پێشیان پێ نەگیرا. قاجارڕ گەیشتنە سەر پردی خودا ئافەرین و پردەکەیان دروست کردەوە، لە هەر چوار لایەوە بورجیان دانا و پڕیان کرد لە تۆپ و ئەسپابی ئاورین. ئاقا محەمەد بۆ خۆشی بەلەشکرەوە گەیشتە سەریان. شەڕ و کوژتار گەرمەی تێکەوت و لەشکری قاجارڕ لە قەڵای «پەنائاوا» پەنگانەوە.

برایم خەلیل خان بەچوستی شەڕی کرد و ڕیزەی دوژمنی دەشکاند. تۆپ و تفەنگ لە هەردوو لاوە دەستی بەئاورباران کرد. برایم خەلیل خان محەمەد بەگ و ئەسەد بەگی ناردن و جێگا سەختەکانیان گرت.

ڕەزا قولیخانی قاجارڕ هەڵمەتی بردە سەر سەنگەری «تەختی تاوس» برایم خەلیل خان بە دە هەزار شەڕکەرەوە پێشی پێ گرت و دەستی بەکوژتاریان کرد.

ئاقا محەمەد لەو شەڕە شپرزە کرا و تەنگەی پێ هەڵچنرا و کەوتە تەقەلای فێڵ و دەلەسەوە. پیاوانی زانای خستە نێوان کە بەمامڵەت ئیش ببڕنەوە. قاقەزێکی پەیماننامەی بۆ برایم خەلیل خان نارد. ئاقا محەمەد لە قاقەزەکەیدا ئەم شیعرەشی بەفارسی بۆ نوویسی:

ز منجنيق فلک سنگ فتنه می بارد
تو ابلها نەگریزی بەآبگینه حصار

برایم خەلیل خان بەم شیعرە فارسییە جوابی داوە:

گر نگهدار من آنست، که من می دانم
شیشەرا دربغل سنگ نگه میدارد

لەلایێکەوە بەموخابەرە و قاقەز نوویسین، برایم خەلیل خانیان ڕاگرتبوو، لەلایێکی دیکەشەوە شەش هەزار سوارەی قاجارییان ناردبووە سەر برازاکانی برایم خان و بەشەڕ و کوژتار گرتبوویانن.

برایم خان کە لەوە گەیشت، ئاوری لە جەرگ بەربوو، لە هەموو لایێکەوە دەستی بەهەڵمەت بردن کرد و قاجارەکانی هەڵسووڕاند و وەتەنگی هێنان.

ئاقا محەمەد کەوتە پاڕانەوە و قاقەزی لێ نوویسی و دڵخۆشیی داوە و برازاکانیشی بەردا و بۆی ناردەوە. قاجار ڕوو بەئەردەوێڵ گەڕانەوەیان قەراردا (جلد ئەوەڵ - تەئریخ قاجار - لاپەڕە ٣٩).

ئاقا محەمەد گەورە و کاربەدەست و لاوە ئازاکانی قاجاری کۆکردەوە و پێی گوتن کە: «ئێمە بەئومێدی گرتنی ئاوربایەگان و قەوقاز لەشکرمان هێنا سەر قەڵای پەنائاوا، ئێستاکەش هیچمان بۆ نەکراوە و زستانیشی بەسەرهات و لە دەست کورد نفووسێکی قورسیشمان پووچ کرانەوە» جەوان و پیرەکان ئەوەیان بەبیری ئاقا محەمەد کرد، لەسەر ئەوە قەراریان دا دەست هەڵگرن و ڕوو بەئەردەوێڵ بگەڕێنەوە.

خان لە پاش ئەوە دەستی بەخۆ کۆکردنەوە کرد و لەتەک حکوومەتی عرووسا یێکەتی و خۆشەویستی گرێدا و ڕێککەوت. هەرچیەکی پێویستی بوو لە عرووسی کڕی و تۆپ و ئەسپابێکی قورسی پێکەوەنا. بۆ ئینتزامی سوپاه و تۆپ و ئاوردان زابت و زانایانی عرووسی هێنا کن خۆی و بەدەستووری عرووس سوپاهی ڕێکخست.

ساڵی ١٢١٢ ئیمپراتۆری عرووس مرد. ساڵدات و زابتێکی کە لە لای بوو گەڕانەوە دوایی. برایم خەلیل خان تەنها لەگەڵ ئومووری حوکمڕانی خەریکبوو. ئاقا محەمەدی قاجار ئەوەی بەکەلێن زانی و بۆ شکاندنی کوردەکانی تاڵش و شێروان و قەرەباغ لەشکرێکی قورسی سازکرد و لە تاران دەرکەوت و ڕوو بەئەردەوێڵ سوپاهی ئاژۆت.

برایم خەلیل خان کەوتە ترس و تەقەلاوە، ناردی پردی خودا ئافەرینی شکاند و قەڵای

پەنائاوای قایمکرد و جێگا تەنگ و دەربەندەکانی کردە مەتەرێز و بۆسە.

ئاقا محەمەد لەولاوە ڕوو بەپردی خودا ئافەرین لەشکری لێخوڕی؛ کە گەیشتە سەر ئاراز، پردی بەڕوخاوی دی. کەڵەکی سازکرد و لەشکرەکەی بەهەزار ئەزیەت پەڕاندەوە، بەڵام لە کەڵەکدا گەلێک لە لەشکری بەئاوداچوون و خنکان.

برایم خەلیل خان لە خۆی وردبۆو، بەرابەری کردنی بەئەزیەت و پەرێشانی زانی. ژن و منداڵ و ئەسپابێکی پێی دەربازبوو هەڵگرت و ڕووی کردە شەکی و خاکی گزبە.

قاجارەکان بەبێ شەڕوشۆڕ چوونە نێو پەنائاواوە، ماڵ و گەنجینەیەکی چەند سەد ساڵی -کە لە تەرەف ئەو بنەماڵە گەورەیە کۆکرابوونەوە -کەوتە دەست تورکمانی قاجار. ژن و منداڵێکی زۆری کورد بەسەرە ڕمی تورکمان زگدڕان و گەلێک بەدیل گیران. تورکمان گەلێک بەدوڕندەیی و وەحشیانە بزووتنەوە و هێندێک ماڵیشیان بەجارێک پووچ کردەوە.

شەوی شەمووی ۲۱ی مانگی زیلحەجەی ساڵی ۱۲۱۲ دوو کەس لەجەرگ سووتاوانی کورد، چوونە سەر ئاقا محەمەد و بەخەنجەر پارچە پارچەیان کرد و ئەمانەتی حوکمدارەکانی کوردی زەند و هی دیکەی کە لە لای بوون، هەڵیان گرت و چوونە لای سادقخانی شکاک (جلد ئەوەل - تەئریخ قاجار، لاپەڕە ٤٥).

کە ئاقا محەمەد کوژرا، شکستە کەوتە سوپاهی قاجارەوە. برایم خەلیل خان لە هەموو لایێکەوە پەلاماری دان و گەلێکی کوژتن و تالانێکی زۆری دەست خۆی خست و گەڕاوە خاکی خۆی و دەستی بەدامەزراندنەوەی کیشوەری کرد.

ساڵی ۱۲۱۳ فەتالی شای قاجار حوکمداری تازەی ئێران لەشکرێکی لەژێر فەرمانی حوسێن قولیخانی عیزەدینلودا ناردە سەر قەڵای پەنائاوا و بەشکستەیی و پەرێشانی گەڕاوە دوایی. لەو ساڵەدا مانگی سەفەر فەتالی شا لەگەڵ برایم خان موخابەرەی کرد و بناغەی دۆستی و ئاشنایەتیان دامەزراند، حکوومەتی جوانشێر لە تەرەف فەتالی شاوە تەسدیق کرا.

فەتالی شا لە تەورێز بوو، برایم خان «ئەبو فەتح خان»ی کوڕە بچووکەی خۆی ناردە لای، لە مەحالی گەرمە و لەمیانج گەیشتە فەتالی شا و بنچینەی یێکەتیان گرێدا و خەڵات و نیشانی حوکمداری بۆ برایم خەلیل خان نارد و ئەبو فەتح خانیشی بەخان لەقەب کرد (جلد ئەوەڵ - تەئریخ قاجار، لاپەڕە ٥٢).

ساڵی ۱۲۱٥ فەتالی شا بۆ ئاشنایەتی پایەداربوون، حەسەنخانی قەرە گوبزلی بۆ

خوازبێنی نارده پەنائاوا، کچی برایم خەلیل خانی بۆ فەتالی شا خواست و گوێزتیانەوە.

قاجارِ بەوەش دەستیان هەڵنەگرت، هەر ڕۆژەی بەبهانەیەک دەست درێژیان دەکرد. برایم خەلیل خان ناچاربوو دیسان لەگەڵ عرووس ڕێککەوتەوە و ناردی سالّدات و قازاخ و زابتێکی زۆری عرووسی بردە لای خۆی و ئیتفاقێکی قایمیان کرد.

فەتالی شا لەوە زۆر ئەندێشەناک بوو؛ ئەمری دا بەعەباس میرزای نایبولسەڵتەنە کە سوپاهێکی قورس بباتە سەر کوردەکان. ساڵی ١٢١٨ عەباس میرزا لەشکری نارده سەر قەڵای پەنائاوا. لەولاوە برایم خەلیل خان پێی زانی، جەعفەر قولیخانی نەتەوەی خۆی و فەزل عەلی بەگی جوانشێری ناردنە گەنجە. لەولاوە سالّدات و قازاخێکی زۆریان بەئالەت و موهیماتەوە وەرگرت و گەڕانەوە قەڵای شووش.

برایم خان محەمەد حەسەنخانی کوڕی خۆی و سوپاهی قەرەباخ و لەشکری عرووسی نارده سەر پردی خودا ئافەرین، لەولاوە ئیسماعیل خانی دامغانی بەئەمری نایبولسەڵتەنە ببوو بەپێشمەرگەی. لەشکر گەیشتە چوار فرسەنگی پردی خودا ئافەرین، کورد و عرووس بۆ پێش بەقاجارِ گرتن بزووتن و شەڕێکی زۆر چاکیان کرد.

ئیسماعیل خان شپرزە کرا و تەنگەیان پێ هەڵچنی و نزیکی هەڵاتن و شکانیشی بوو، بەڵام عەباس میرزا بەهاواریەوە چوو. کە تاریکی شەو داهات دەست لە کوژتار بەردراوە، کوردەکانیش چوونە قەڵای شووشەوە.

عەباس میرزا لە لایێکەوە هەڵمەتی برد فەتالی شاش لەلایێکی دیکەوە و ڕوو بەتەختی تاوس ڕۆیشت و دەستی بەشەڕ و شۆڕش کرد. عەباس میرزا قەڵای ئاق ئوغلانی گرت و لە ڕێگای چناقچیەوە ڕوو بەقەڵای پەنائاوا ڕۆیشت. برایم خەلیل خان بۆ بەرابەری ئامادەی شەڕبوو.

«گورگین پۆڵۆنیک» و «کاتارا وسکی» فەرماندەی عرووس بەسوپاهێکی عرووسەوە لە گەنجە دەرکەوتن و بەهاواری برایم خەلیل خانەوە چوون و ڕوویان کردە پردی خودا ئافەرین.

نایبولسەڵتەنە کە وایزانی، ناچار بۆ پیش بەپۆڵۆنیک گرتن، جڵەوی سووڕاندەوە، ڕۆژی ٢٥ی مانگی ڕەبیعی یەک، لەشکری قاجارِ پیاوانە کۆشان، تۆپ و تفەنگ لە هەردوولاوە دەستی بەتەقە و گرمە کرد. لە پیاوە ناودارەکانی قاجارِ گەلێک بەر گوللەتۆپ کەوتن.

عرووس لەلایێکەوە لەگەڵ شەڕ خەریکبوو، لەلاییێکی دیکەوە مەتەریزیان دەکۆڵی و لەلاییێکی ترەوە تۆپیان داوێژت.

فەتالی شا کەوتە ئەندێشەوە، حوسێن قولیخانی دامغانی بە شەش هەزار پیاوی ئازاوە ناردە یارمەتی عەباس میرزا. شەش شەو و شەش ڕۆژان لەسەر یێک شەڕ و کوژتار کرا.

لەو شەڕەدا پۆلۆنیک لە سێ جێ زامدار کرا. عرووس بەشەو کەوتنە نێو قەڵای «تەرناوت»ەوە. قاجارِ لەوە گەیشتن چوار دەورەی قەڵایان گرت. پۆلۆنێک هەتا سێ ڕۆژ ئەمانی خواست؛ شەڕ ڕاگیرا. شەوی سێیەم پۆلۆنیک ڕێگای گەنجەی گرت و بۆی دەرچوو (جلد ئەوەڵ - ئەتریخ قاجار، لاپەڕە ٦٦ - ٦٧).

برایم خان لەگەڵ بەخێوکردنی پردی خودا ئافەرین خەریکبوو. لەشکرێکی لە قەڵای پەنائاوا خزاند کە پێش بەدوژمن بگرن، سوپاهێکی ناردە پیش فەتالی شا، تەختی تاوسیشی لە دوژمن بەخێو کرد. عرووس لە هەموو لاییێکەوە ڕوو بەخاکی ئێران کەوتنە بزووتن. فەتالی شا ئەمانی خوازت و ڕوو بەتاران گەڕاوە.

برایم خەلیل خان بۆ نێوان خۆشی ڕاگرتن لەتەک عرووسا «ئیشپەخدر»ی سەرداری عرووسی میوانداری کرد و لە قەڵای شووش یەکتریان چاوپێکەوت و لەسەر ئەمە قەرار و پەیمانیان گرێدا، کە خاکی برایم خەلیل خان لەژێر چاوەدێری حکوومەتی عرووسا ئازاد و سەربەخۆ بێت. حکوومەتی عرووس لە هەموو تەنگانەیێکا بەدراو وچەک و ساڵدات یاریدەی بدات. بەوجۆرە پەیماننامەیان نوویسی و بۆ یەکتریان مۆرکرد، چوارسەد ساڵدات و چوار تۆپی بۆ برایم خان بەجێهێشت و گەڕاوە و چۆوە گەنجە.

برایم خەلیل خان هەتا ساڵی ١٢٢١ بەو پەیمانە لەگەڵ حکوومەتی عرووسا بەخۆشی ڕاییواردو و بەحوکمڕانی بەسەری برد، لەو ساڵەدا هەموو ئومووری حکوومەتەکانی فرەنسە و ئینگلیز و عوسمانی لەگەڵ قاجارەکانا چاککرا بوو. حکوومەتی قاجارِ شکڵێکی حکوومەتیی وەرگرتبوو، ڕۆژ بەڕۆژ لەتەک حکوومەتە گەورەکانا ئیتیفاقی ئەکرد.

برایم خەلیل خان کەوتە ئەندێشەوە، چونکە لەو موددەتەدا گەلێک وەعدەی بەراوەژووی لە عرووس چاوپێکەوت و لە ئیدارە و کردەوەیانا وەڕەز ببوو، قەراری دا کە عرووسی لە خاکی خۆی دەرخا، بەشەرتێ لەگەڵ قاجارِ ڕێککەوێ. لەسەر ئەو فیکرە دەستی بەموخابەرەکردن کرد.

ئەبو فەتح خانی کوڕی خۆی ناردە تاران و بناغەی ئاشنایی و دۆستییان لەتەک قاجارِ دامەزراند.

فەتالی شا بۆ عەباس میرزای نوویسی کە یارمەتیان بکا. عباس میرزا سوپاهێکی سازکردو فەرەجوڵلاخانی شاهـ سەوان و ئامانوڵلاخانی هەو شارو ئیسماعیل خانیدا مەغانی کردنە سەرکردە و خستینە ژێر فەرمانی ئەبو فەتح خانەوەو ناردنی. ئەو لەشکرە چوو لە پردی خودا ئافەرین پەڕییەوە.

جەعفەر قولیخانی کوڕی ئەبو فەتح خان - کە مامی ئیبراهیم خەلیل خان بوو - لە نێو عرووسان بوو. «مایۆر» ناو، سەرکردەکەی عرووس جەعفەر قولیخانی بۆ داوای میرات کردن لە ئیبراهیم خەلیل خان هەوادار کرد و سێ سەد سالْداتی دایێ کە بچێتە سەر ئیبراهیم خەلیل خان. بەو هێزەوە چووە قەڵای گوزیدە.

شەوی بیست وسێی مانگی رەبیعی یەکی سالّی هەزار دووسەد و بیست و یەک لە ڕیگاییێکی کە لە قەڵاوە بۆ مالّی ئیبراهیم خەلیل خان ئەچوو جەعفەر قولیخان و چەند سالّداتێک بەو ڕێگایەدا چوون، لە وەختی خەوا برایم خەلیل خان و ژنی -کە خوشکی سەلیم خانی شەکی بوو-کچێکی- کە خوشکەزای هومانخانی لەگزی بوو-چەند کوڕ و کچی دیکەی ئیبراهیم خەلیل خانیان بەجارێک کوژت (جلّد ئەوەل، تەئریخ قاجاڕ، لاپەڕە ٧٩).

جەعفەر قولیخان بەقسەی مایۆر ئەو گوناهە گەورەیەی کرد بەبێ فایدە بوو. لە نەتیجەدا حوکمداری قەرەباغ لە تەرەف مایۆرەوە درا بەمەهدی قولیخانی کوڕی برایم خەلیل خان.

سەلیم خانی شەکی لەولاوە کە ئەو سەربهووردەی بیستەوە، زۆر دلّگیربوو. قاقەزیکی لە عەباس میرزا نوویسی و گوتی: هەرچەندە لەسەر مستەفاخانی شێروانی هەواداری عرووسم ئەکرد، ئەوا لەسەر مەی مەسئلەی برایم خەلیل خان ڕوو گەردان بووم. بۆ کوژتاری عرووس ئامادەم و چاوەنۆڕی یارمەتیتان ئەکەم.

عەباس میرزا ئەمری دا بەفەرەجوللا خانی شاسەوان، بەهێزێکی بەدەستیەوەیە بۆ یارمەتی سەلیم خان بچێت و لەتەکیا کۆمەکی بکات. (جلّد ئەوەڵ، تەئریخ قاجاڕ، لاپەڕە ٧٩).

## ٧- مەهدی قولیخان، کوڕی ئیبراهیم خەلیل خان

کە جەعفەر قولیخان ئەو بنەماڵەی پووچ کردەوە، چاوەنۆڕی لوتفی مایۆر بوو کە بیکاتە حوکمداری قەرەباغ. مایۆر ناردی مەهدی قولیخانی کوڕی برایم خەلیلخانیی بردە لای خۆی و دڵخۆشی داوە و خەلاتی کرد و تۆپ و چەک و پێویستی دایێ و ناردیەوە سەر قەرەباغ و لە جێگای باوکی دایمەزراندەوە.

مەهدی قولیخان لەگەڵ حوکمڕانی و ئیدارەکردن لەتەک عرووسا خەریکبوو. ڕەعیەتە بڵاوەکانی بەلوتف و میهرەبانی لەسەرخۆی کۆکردنەوە.

ساڵی ١٢٢٦ قاجاڕەکان بەپەنهانی میللەتەکەیان دەبزاوت. عەشیرەتی ئەمیر -کە کورد بوو -لە خاکی قەرەباغا کەوتنە سەر هەوەسی شۆڕش؛ پەلاماری شووشیان دا و لە دەروازەی خەلیفەوە چوونە ژوور. گیشە گیا و ئەنباری دانەویڵەی ساڵداتی عرووس کە بۆ یارمەتی مەهدی قولیخان لە شووش دانیشتبوون، سوتاندیانن (جلد ئەوەڵ، تەئریخ قاجاڕ، لاپەڕە ١١٦).

حاجی محەمەدخانی قەرەگۆیز لە تەرەف فەتالی شاوە ناردرا سەر قەرەباغ. ئەویش بەلەشکرێکی قورسەوە چوو لە چۆمی ئاراز پەڕیەوە. مەهدی قولیخان لە قەلای عەسکەران بۆ بەرابەری ئامادەبوو. حاجی محەمەدخان نەیوێرا نزیک بەو قەلایە بێت؛ لە چۆمی «تەڕتەڕ» پەڕیەوە و بۆ سەر عەشیرەتی جەبرانی کورد ئاژۆت. ئەو عەشیرەتە لەسەر چیا بەرزەکانەوە لنگیان دا سەر قاجاڕان و کوژتاریان لێ کردن و بەشپرزەیی گێڕایانەوە دوایی.

جەعفەر قولیخانی کوڕی میر حەسەنخانی کوڕی برایم خەلیلخان، لەگەڵ کوردی جەبرانی تەمایان بوو لەگەڵ قاجاڕ ڕێککەون؛ بەلام لەمە دەترسان کە ئەبو فەتح خانی برا گچکەی -کە هەواداری ئێران بو- نەبادە بیانگرێت و تەسلیم بەقاجاڕان بکات.

ئەو لەو خەیاڵەدا بوو، عرووسیش ئاور لە گێشە و ئەنبار بەردان لەوانەوە دەزانی. جەعفەر قولیخان و لوتف عەلی ئاغای جەبرانی گرتن و خستنیە حەپسەوە، مەحموود ئاغای جەبرانی هەموو عەشیرەتەکەی هەڵگرت و چۆوە سەر چیا بەرزەکان کە لە کوژتنیان بپارێزرێن.

لەولاوە ئەبو فەتح خانی جوانشێر بەنایبولسەڵتەنەی گوت: کە بۆ ڕزگاربوونی کوردەکان لە دەست عرووسا یارمەتیەک بکا. عەباس میرزا ئەوەی بەکەڵێن زانی لەوە دوازدەی

موحەرەم ئەمری دا لەشکرێکیان ئامادەکرد کە بەهاواری کوردەکانی قەرەباغەوە بچن.

عرووس لەولاوە جەعفەر قولیخان و لوتف عەلی ئاغایان سوارکردن و پەنجا سوار ساڵداتیان لەگەڵ خستن و بۆ گەنجەی بەرێکردن. کە گەیشتنە سەرچۆمی تەرتەر جڵەوی ئەسپەکانیان بەدەست ساڵداتێکەوە بوو، هەوساری جڵەوەکەیان بڕی و دەستیان بەیاڵی ئەسپەوە گرت و بەرکێفکوت هەڵاتن، هەتا خۆیان گەیاندە نێو عەشیرەتی جەبرانی.

هەر کە خۆیان گەیاندە نێو عەشیرەتەکە، بەبارکردنیان دان و ڕوو بەخاکی قاجار ڕۆیشتن؛ چوونە لای عەباس میرزا وە بەلوتف و میهرەبانی نوازش کران. جەعفەر قولیخان کردە حاکمی قەرەباغ و ساڵێ چوار هەزار تومەن جیرەی بۆ بڕیەوە (جلد ئەوەڵ، تەئریخ قاجار، لاپەڕە ١١٧ - ١١٨).

جەعفەر قولیخان بەهێزێکی کە هەیبوو، لە ڕێگای ئەسلاندوز بۆ قەڵای سوڵتان ڕۆیشت و سوارەی چاردا دەرو گەیشتنە هەواری هەوشاری و مەقدەم. لەگەڵ جەبرانی ڕێککەوتن و هەموو عەشیرەتە کوردەکانی قەرەباغی -کە لەنێو میشە و لێڕەوار و چیاکانا خۆیان شاردبووەوە -کۆیان کردنەوە و باریان کردن و لە چۆمی ئارازیان پەڕاندنەوە وە لە کوژتاریان ڕزگارکردن.

لەولاوە نایبولسەڵتەنە سوپاهێکی قورسی بۆ سەر قەڵای سوڵتان نارد کە لەنێونی خاکی شەکی و شێروان و شووش و گەنجەدا هەڵکەوتووە. «مستەر لەزی» ئینگلیز ئەمری دا تۆپە ئاوربارانەکانیان ڕوو بەلەشکرگای مەهدی قولیخانی جوانشێر و عرووس کردنەوە و شەڕ و کوژتار دەست پێکرا.

چەند کەپتان و ئەفیچال و شەرژەند و تەنها مایۆرێکیان کوژتن و مایۆرێک و چەند ساڵدات و تۆپ بەدیل گیران.

مەهدی قولیخان کە وایزانی، لەگەڵ سوارەکانی خۆی لە مەیدانی خوێناوی دەرکەوت و ڕزگاربوو. کە عرووسەکان مەهدی قولیخانیان بەهەڵاتوو دیت، خۆیان تەسلیم بەقاجاڕان کرد.

جەعفەر قولیخانی کوڕی برایم خەلیلخان لەشکری هەڵگرت و چوو شەش هەزار ماڵە کوردی قەرەباغی بارکردن و بردنیە قەرەداغ و لەنێو شەڕ و کوژتاری دەرخستن.

لە قەڵای پەنائاوا چوار سەد ساڵدات و دووسەد سوارەی کورد بەچوار تۆپەوە دەرکەوتن کە بەهاواری لەشکری قەڵای سوڵتانەوە بچن. کە لە شکستەی ئەوان ئاگاداربوون، چوونە

قەڵای «نزناووت». جەعفەر قولیخان بەلەشکرەوە چووە سەریان. ئەوانیش بەو زستانە بەشەو لەو قەڵایە دەرکەوتن و ڕوو بەچیای «جمرق» هەڵاتن. جەعفەر قولیخان کەوتە دوویان؛ بەڵام بەبێ شەڕ گەڕایە دوایی. هێندێک ئەرمەنی کە لە دامێنی ئەو چیایەدا بوون، باری کردن و بردنیە کەنار چۆمی ئاراز و دایمەزراندن.

لەودەمەدا «یەنەڕاڵ مەرکیز» سەرداری عرووس، چووبوو بۆ پێکهێنانی شێخ عەلیخانی قەبە و لەگزیە و داغستان وە مستەفاخانی شێروان کە لەو بزووتنەوەیە ئاگاداربوو، گەڕاوە لە چۆمی «کڕ» پەڕیەوە چووە قەرەباغ و دڵخۆشی مەهدی قولیخانی داوە و «یەنەڕاڵ کتاراوسکی» کردە هاواڵی وە لە قەڵای شووشی دانا و گەڕاوە تفلیس.

عەباس میرزا لەبەر سەرمای زستان و بێ ئالیکی و دانەوێڵە، لەم خاکەدا مانەوەی بەچاک نەزانی و بانگی جەعفەر قولیخانی جوانشێری کرد و بەخەڵاتی حوکمڕانی قەرەباغ و قەرەداغ نوازش کرا و لەسەر قەرەچەداغ دانیشتنی ڕائەسپارد، هەتا قەرەداغ دەست دەخرێ، بۆ خۆشی گەڕاوە تەورێز.

ساڵی ١٢٢٨ نێوانی ئێران و عرووس لەسەر چاکبوون بوو، هەردوولا بۆ پێکهاتن دەکۆشان. عرووسەکان فێڵێکیان کرد، چەند کەسێکی قەرەباغییان ناردە لای جەعفەر قولیخانی جوان شیر و خەڵەتاندیان؛ گوتیان ئێمە لە تەرەف عەشیرەتەکانی قەرەباغەوە هاتووین، ئەگەر سوپاهێکمان لەگەڵ خەن و یاریدەمان بدەن، دەچین ئەو عەشایرەی کە ماون باریان دەکەین و دەیانپەڕێنینەوە.

جەعفەر قولیخان هەڵخەڵەتاندرا و بەیەنەڕاڵی عرووس ڕاگەیاندرا؛ ئەویش لەشکرێکی قورسی ناردە پێش. کە نزیکتربوون، لەشکری قەرەباغ وایزانی کە سوپاهی دۆستە، دووچاری یەکتربوون کوژتاریان دەستپێکرد.

نایبولسەڵتەنە کە لەوە ئاگادار بوو، لەشکری ناردە هاواری جەعفەر قولیخان. دوو شەو و دوو ڕۆژ، بەتۆپ و تفەنگ شەڕکرا. هێندێک لە ساڵداتی عرووس کە لە شەڕی سوڵتان بەدیل گیرابوون، هەڵاتن و خۆیان گەیاندەوە نێو عرووسان.

ئەو ساڵداتە عرووسییان خستە هەوەسی شەبەیخوون. شەوێ بەسەر لەشکری قاجاڕ و کوردیان دادا. لە ئەوەڵ شەڕدا «مستەر گرشت»ی ئینگلیز کە سەرهەنگی فەوجی شکاک و نەخچەوان بوو، لەگەڵ چەند کەسێک کوژران.

نایبولسەڵتەنە لە ئەسپ بەربووەوە و بەهەزار ئەزیەت ڕزگاربوو. شکستەییێکی پیس

کەوتە نێوبان. عرووس سەرکەوت و قاجارِ هەلات. جەعفەر قولیخان لەنێو مەیدان دەرکەوت و چووە مشکین.

مەهدی قولیخانی جوانشێر لە هەموو لایێکەوە جوابی لە عەشایر و گەورەکانی قەرەباغ نارد کە چیدیکە نەبنە مایەی فیتنە. بەهەر جۆرێک بوو رێکیخستن و لەگەڵ عرووس پێکەتیان گرێدا و عرووسیان بردەوە قەرەباغ.

لە پاش چەند ساڵێک حکوومەتی عرووس و قاجارِ ئیتفاقێکی قورسیان کرد و تخووب و سنووریان دامەزراند.

ئەو بنەماڵە گەورەیە لە حوکمدارییەوە بەمەئمووریکی قاجارِ و عرووس رِابواردن، پووچ کرانەوە . (جلّد دووەم، تەئریخ قاجارِ، لاپەرِە ٣٣٤).

## ٨- جەعفەرخانی کوردی بەیات

ئەو زاتە وەک ئومەراکانی کورد حوکمرِانێکی سەربەخۆی ئازاد بوو. لە چاغی حکوومەتی زەندەوە لە نەیشاپوور فەرمانرِەوایی دەکرد.

ساڵی ١٢١٠ ئاقا محەمەدی قاجارِ رِووی لە خاکی خوراسان کرد. جەعفەرخان بەسوپاهی خۆیەوە چووە لای و فەرمانی حوکمرِانیی خۆی پێ تەسدیق کرد و لەتەکیا رێککەوت.

ئاقا محەمەد بەو رِۆیشتنەی کە بەرەو نیشاپوور رِۆیشت، ئەو عەهد و پەیمانەی بەجەعفەرخانی دابوو، بەرگەشتی نواند و نیشاپووری تالانکرد. جەعفەرخان و ژن و منداڵی بەئەزیەت گرتن و ناردنیە تاران و هەموو سەرا و عیمارەتی چەند سەد ساڵەی ئەو بنەماڵە گەورەیەی بەتالان برد.

ساڵی ١٢١٣ جەعفەرخان لە زیللەت و بەند رِزگار بوو و بەحاکمی نیشاپوور ناردراوە سەر خاکی خۆی. بەڵام کە گەیشتە نێو میللەت و خزمانی، دەستوبردی لەسەرکەوتن کرد.

لەوساڵەدا سادقخانی شکاک چووە سەر چناران و فەتالی شای قاجاریش چووە نیشاپوور. جەعفەرخان رێگای چوونە نێو شاری بەقاجارەکان نەدا، بورج و باروو دەروازە و قەڵای شاری توندکرد و تۆپ و موهیمماتی دانا و بۆ بەرابەریکردن ئامادەی شەرِبوو.

ئامۆزاییێکی جەعفەرخان ناوی حوسێن قولیخان بوو؛ بەدڵگیری زیزبوو، پەنای بۆ فەتالی شا برد و بەلوتف و شادی و بەخشش قبووڵی کرد و بۆ رِۆژێکی پێویست لە کەڵێنا رِایگرت.

لەشکری قاجار کەوتە دێهاتی نیشاپوورەوە و دەستیان بەکوژتار و تالانکرد. فەتالی شا لە پاش موعامەلەی دوڕندانە لەگەڵ کوردی نیشاپووردا، کوڕێکی جەعفەرخانی -کە لە لای بەگرە و ڕاگیرا بوو- بردیانە پێش قەڵای نیشاپوور و بانگی جەعفەرخانیان کرد ئەگەر خۆی تەسلیم نەکات، کوڕەکەی بکوژن. جەعفەرخان جوابی نەدانەوە.

فەتالی شا کوڕێکی نازداری لەبەرچاوی جەعفەرخان و کوردەکانا کوژت و سەرەکەیان لە بەدەنی جویّ کردەوە.

جەعفەرخان زیاتر دڵقەوی و ڕق هەستاو بوو، بۆ شەڕ و کوژتار چیرەبوو. تەنگەی بەفەتالی شا هەڵچنی و پەرێشانی کرد.

فەتالی شا ناچار بوو بناغەی ئاشنایی دانێت و فەرمانی حوکمڕانیی جەعفەرخانی تەسدیق کرد و بناغەی ڕێککەوتنی دامەزراندەوە و گەڕاوە تاران.

لە سەفەری فەتالی شا بۆ خۆراسان جەعفەرخان چووە لای و لەتەکیا گەڕانەوە تاران و دووبارە بۆ شەڕکردن لەگەڵیا چووە مەشهەد. کە گەیشتنە مەنزڵی «ئارغیان» جەعفەرخان خەڵات و نیشانی حوکمڕانیی نیشاپووری پێ درا و گەڕاوە نیشاپوور.

ساڵی ١٢١٥ مانگی زیلحەجە، فەتالی شا بۆ گرتنی «ئاق قەڵا» کە ئەڵلایارخانی کوردی لێ بوو، وە بۆ دەستخستنی «سەبزەوار» کە لە دەست کوردەکاندا بوو، سوپاە و موهیمماتی هەڵگرت و لە تارانەوە کەوتە ڕێگا.

١٥ی موحەڕەمی ساڵی ١٢١٦ گەیشتە «یێنگی قەڵا» کە لە یێکە قەڵاکانی ئەڵلایارخان بوو؛ بەهەڵمەتدان گرتیان و تالانیان کرد و لەگەڵ خاک ڕاستییان کرد، وە هەموو ئەهالیەکەیان کوژت و چوونە سەر سەبزەوار (جلد ئەوەڵ، تەئریخ قاجار، لاپەڕە ٥٨).

ئەڵلایارخان بۆ بەرابەی ئامادەی شەڕبوو. لەدوای شەڕ و کوژتارێکی زۆر، بەمامڵەت لەگەڵ فەتالی شا ڕێککەوت؛ بەمەرجێ کچێکی خۆی بەژنی بداتە فەتالی شا پێکهاتن.

فەتالی شا لە سەبزەوارەوە تەمای چوونە سەر نیشاپووری کرد، جەعفەرخان دەستی بەخۆکۆکردنەوە کرد و لەشکری سازدا و بۆ پێش بەفیتنەگرتنی فەتالی شا ئامادەی شەڕبوو. فەتالی شا لەشکرێکی لەژێر فەرماندەی حوسێن قولیخاندا ناردە سەر جەعفەرخان و بەڕەعیەت کوژتن و دێهات سوتاندن ڕوو بەنیشاپوور چوو. جەعفەرخان بۆ پێش پێی گرتنی لە شار دەرکەوت و شەڕ و کوژتار لە هەردوو لاوە دەستپێکرا. حوسێن

قـولیـخـان وەتەنگ هات، بەپەرێشـانـی و بڵاوی لە مـەیدانـی شـەڕ دەرکەوت و بەشکاوی هەڵات.

فـەتالی شـا ئەوجـارەش ناچاری گـەڕانەوە بوو بۆ تاران. جـەعـفـەرخـان بەدڵخـۆشی و تالانێکی زۆر وەدەست خستن ڕوو بەنیشاپوور چوو، دەستی بەئوموور و سوپاه ئامادەکردن و ئەسپاب ڕێکخستن کرد.

ساڵی ١٢١٧ فەتالی شا دیسان بۆ گرتنی نیشاپوور لەشکرێکی قورسی لەژێر فەرمانی شازادە حوسێن خانی قاجاڕدا ناردە سەر جەعفەرخان.

جەعفەرخان بۆیان دەرکەوت و تەنگەی پێ هەڵچنین و بەتۆپ و تفەنگ ئاورباران کردن و هەردوولا شێرانە شەڕ و کوژتاریان لە یەکترکرد و لە دواییدا شازادە شکا و ئەسپاب و جبەخانە و تۆپ و باروتێکی زۆری بۆ کوردەکان بەجێهێشت.

لەو سـاڵەدا فـەتالی شـا، شـازەمـانی ئەفـغـانـی ناردە لای جـەعـفـەرخـان کـە چیـدیکە سەرکێشی نەکات. جەعفەرخان جوابی دا و قسەی بەهێند نەگرت.

فەتالی شا سوپاهێکی بیست هەزاریی لەژێر فـەرمانی ئیـبراهیم خـاندا و پازدە هەزار سوارەی لەژێر فەرمانی سولەیمان خانی قاجاڕدا ناردە سەر جەعفەرخان و ئەمر درا بەهەموو خەوانینەکانی خوراسان کە کۆمەگی ئەو دوو لەشکرە بکەن. لەشکر فریای چوون نەکەوتن. کوژتنی ئیبراهیم خانی ئیعتمادولدەولە کەوتە تاران، لەشکر پاشکەوت و جەعفەرخان دڵقەوی بوو (جلد ئەوەل، تەئریخ قاجارە لاپەڕە ٥٩).

جەعفەرخان هەروەها لەگەڵ حوکمڕانیی خەریک بوو هەتا [لە] ساڵی ١٢٢٨دا مرد و حوسێن قولیخانی کوڕی لە جێی دانیشت؛ هەتا ساڵی ١٢٣١ کەوتە دەست قاجاڕان.

### ٩- عەلیخانی کوردی خەم سە

ئەو پیاوە گەورەیە لە بنەماڵەی میرانی کوردی خەم سە بوو. لە پەرای کەریمخانی زەندا بەڕاستی کەمەری گرێدا بوو. لە میللەت و ئێلی خۆی دەستە لەشکرێکی سوارە و پیادەی هەمیشە لە سوپاهی زەندا هەبوو؛ بۆ خۆشی سەرکردەیێکی ناودار و جەنگاوەر و ڕەشید بوو.

ساڵی ١١٩٨ لەگەڵ جەعفەرخانی کوڕی سادقخانی زەند -کە برازای کەریمخان بوو- بۆ هێندێک مـەسـایل چووبوونە مـەحـالی خـەم سـە. لە ئەوەڵی سـاڵی ١١٩٩دا، عـەلی مورادخانی حوکمڕانی زەند مرد. جەعـفـەرخان بۆ گەیشتنە سەرتەختی حوکمڕان، بەلەز لە

خەم سەوە ڕوو بەشیراز گەڕاوە. عەلیخان بەبهانەی لەشکر کۆکردنەوە خۆی وەپاشدا. عەلیخان کە تەماشای کرد ئاقا محەمەدی قاجاڕ لەلایێکەوە لە سەرکێشی دایە و لە تەرەف گەیلان و ئاوربایگانەوە کوردەکان لە بەند و تەندان و حکوومەتی زەندیش لە کەموکورتی دایە، خۆی کۆکردەوە و ئێلەکەی خۆ بەخێوکردنی لەکن چاکتربوو، دەستی بەپێویست سازکردن و ئامادەبوون کردو چاوەنۆڕی دەم وچاغ بوو.

ساڵی ۱۲۰۰ ئاقا محەمەدی قاجاڕ چووە سەر شاری «قوم» و نەجەف خانی زەند -کە لەوێ حاکم بوو- دەرپەڕاندرا و قوم کەوتە دەست قاجاڕەوە. عەلیخان بۆ ڕۆژی پاشەمین بەپەنهانی موخابەرەیێکی سەروڕۆی لەتەکاکرد.

کە ئاقا محەمەد گەیشتە کاشان، چووە دیدەنی و گەڕاوە و نەبزەییێکی گرت. هەروەکو لە پێشییشدا حاکم سەردارێکی سەربەخۆ بوو، بەجارێک بۆ سەربەخۆیی ئامادەی خۆی بوو.

لەوساڵەدا جەعفەرخانی زەند بەلەشکرێکی قورسەوە چووە ئیسفەهان و تەمای چوونە سەر تارانی هەبوو. عەلیخان کەوتە جووڵانەوە و تۆڵە ئەستاندنەوە لە قاجاڕان و کۆمەگی و یاریدەدانی جەعفەرخان.

ئاقا محەمەد لەولاوە کە ئەوەی زانیەوە لەشکرێکی ناردە سەر عەلیخان کە بیخەن و سەری نەرمکەن. بەڵام هەروەکو چۆن گەیشتن، گەڕانەوە.

ساڵی ۱۲۰۱ ئاقا محەمەد چووە سەر ئیسفەهان و لەوێوە لەشکرێکی ناردە سەر عەلیخان. لە پاش شەڕ و کوژتارێکی قورس، عەلیخان گیرا. لە ئیسفەهان لە عیمارەتی حەوت دەست، میلیان لە چاوی کێشا و کوێریان کرد و بەهەزار ئەزیەت کوژتیان. (جلد ئەوەڵ، تەئریخ قاجاڕ، لاپەڕە ۲۸).

## ١٠- حوسێن قولیخانی کوردی دنبۆڵی

بنەماڵەی دونبوڵی (زازا) زۆر لە پێشینەوە لە خاکی خۆی حوکمڕان بوو. لەو بنەماڵە کوردە حوسێن خان لە چاغی زەکی خانی زەندا، ببوو بەحوکمڕانی خۆی و تەورێز و مەڕەند. بەشەهامەت و ئازایی ناوبانگی کردبوو. لەگەڵ کوردەکانی جوانشێر زۆر دۆست بوو. لە پاشان کچی برایم خەلیلخانیی جوانشێری بۆ خۆی خواست و خزمایەتیشیان پەیاکرد.

ساڵی ۱۲۰۵ ئاقا محەمەدی قاجاڕ کە ڕوو بەئاوربایگان چوو، حوسێن قولیخان لەتەکیا ڕێککەوت.

ئاقا محەمەد کە گەیشتە قەرەچەداغ، حوسێن قولیخان لەتەکیا بوو. زۆری لێی کرد بەبێ لێکدانەوە، خێزانی -کە کچی برایم خەلیلخانی بوو- بەسوورەتی گرەو پێی ناردە قەزوین و حکوومەتی تەورێز و خۆی بۆ تەسدیق کرد.

ساڵی ١٢١٣ کە فەتالی شا چووە سەر ورمێ، حوسێن قولیخان میوانداریێکی بۆ کرد کە تا ئەو ڕۆژە بۆ هیچ حوکمڕانێک نەکرابوو «تاریخ قاجار لاپەڕە «٥١» دەڵێت: «میوانداریێکی وا هیچ حوکمدارێک نەیدیتبوو هیچ حوکمدارێکیش نەیکرد بوو».

حوسێن قولیخان لەوساڵەدا چاغی زستان بەحوکمڕانی خۆی ڕادەبوارد، مرد. لەمە بەولاوە لەباسی جەعفەر قولیخانی برایا دێتە گۆتن.

## ١١- جەعفەر قولیخانی کوردی دنبلی

ساڵی ١٢١٢ی مانگی ڕەبیعی یەک لە تەرەف فەتالی شاوە کرا بەفەرمانگوزاری تەورێز و خۆی؛ بەڵام هەر بەپەرا لە لای فەتالی شا ڕادەبوارد.

ساڵی ١٢١٣ کرا بەحوکمڕانی ئاوربایگان، لە تارانەوە کەوتە ڕێگا. سادقخانی شکاک (هەروەکو لەپێشدا گوترا) لە ترسا دەستی لە گەرمەر و سەردەر بەرداو ڕوو بەشێروان هەڵات.

جەعفەر قولیخان کە گەیشتە تەورێز دەستی بەخۆ کۆکردنەوە کرد و میللەتی گرد کرد و دڵخۆشی دانەوە و سەری لە قاجارەکان وەرچەرخاند. جوابی لە سادقخان نارد کە بگەڕێتەوە و لە تەکیا ڕێککەوێت. ئەو دوو ئەمیرە کوردە ڕێککەوتن. محەمەد قولیخانی هەوشاریشیان کردە هاودەنگ.

حوسێن قولیخانی برازای محەمەد قولیخان بەپەنهانی چووە تاران و سەربهووردی جەعفەر قولیخانی بۆ فەتالی شا گێڕاوە. فەتالی شا بۆ چوونە سەر جەعفەر قولیخان، حوسێن قولیخانی هەوشاری کردە حاکمی ورمێ و سلێمان خانی نیزامولدەولەشی بەلەشکرەوە کردە «**پێشمەرگە**» و بەرێ کردن.

سادقخان بەپەنهانی لەگەڵ حوسێن قولی خانا موخابەرەی کرد. کەلێی ئەمین بوو، هەستا چووە لای. لەولاوە جەعفەر قولیخان ئەمەی زانی، هەستا چووە نێو ئێلە کوردە یەزیدیەکان، لە دنبلی و شکاک و یەزیدی لەشکرێکی کۆکردەوە.

محەمەد قولیخانی هەوشاری چووە نێو شاری ورمێ و لەشکری کۆکردەوە و کەلای لەسەرخۆ گرێدا. حوسێن قولیخان بەپشتیوانی ئێلی بلّباس چووە سەر کەلای ورمێ و دەورەی دا و بەکەم شەڕێک ورمێی گرت. محەمەد قولیخان مامی دەستبەست کرد و سەربهووردی بۆ فەتالی شا نوویسی.

فەتالی شا ئەمری دا بەمیرزا ڕەزا قولیخانی مونشیئولمەمالیک ڕوو بەورمێ بڕوات. کە گەیشتە ورمێ، ماڵی محەمەد قولیخانی تالانکرد و ئەشرەفخانی دەماوەندی کردە حاکمی ورمێ.

فەتالی شا خۆی لەوەدەمەدا گەیشتە ورمێ، بەرگی سووکییان لەبەر محەمەد قولیخانی هەوشاری کرد و هەموو بازاڕیان گرێدا و ئابڕوویان برد و خۆشی لە ئاوربایەگانەوە گەڕاوە.

ساڵی ١٢١٣ مانگی ڕەبیعی یەک جەعفەر قولیخان لەشکرێکی لە کوردی یەزیدی و دنبوڵی و شکاک کۆکردەوە و لە چیاکانی هەکاری ڕوو بەخۆی هەڵمەتی برد. حوسێن قولیخانی براگەورەی خۆی دەورەدا. حوسێن قولیخان لەنێو کەلادا و جەعفەر قولیخان لە دەرەوە دەستیان بەشەڕکرد. حوسێن قولیخانی دنبلی بەلەز قاقەزێکی بۆ فەتالی شا نارد و کۆمەگی لێ خواست. فەتالی شا بەتالووکە ئیبراهیم خانی قاجاڕی بەلەشکرەوە بۆ نارد . حوسێن خان و ئیبراهیم خان بۆ بەرابەری جەعفەر قولیخان لەشکریان ڕیزکرد و لە هەردوولاوە بەشیری تیژ دەست بەخوێن ڕژان و تۆپ و تفەنگ ئاورباران کرد.

حوسێن خان چونکە دونیا دیدە و شەڕ و کار ئامزوودەتر بوو لە جەعفەر قولیخان بەتەدبیر خۆی سەر خست.

جەعفەر قولیخان ناچار دەستی لەشەڕ بەردا و ڕوو بەچیاکانی هەکاری گەڕاوە پاشێ.

چونکە زستان بەسەردا هات، فەتالی شا ئەمری دا ئیبراهیم خان لە تەورێزەوە و جەعفەرخانی لە خۆی دانیشن. لەو ساڵەدا دەمی زستان حوسێن خانی دونبلی لە کەلای خۆی بەئامرزشی خودا شاد بوو.

جەعفەر قولیخان کە مردنی کاکی بیستەوە، لەشکری هەڵگرت و چووە خۆی، ئەهالی شار پێشوازیان کرد و بەشادمانی بردیانە نێو کەلاوە. جەعفەر قولیخان دڵخۆشی ئەهالی داوە، گەورەکانی خەڵاتکرد و لەگەڵ ڕێکخستن و دامەزراندنی ڕەعیەت و سوپاه خەریکبوو. قاقەزێکی بۆ فەتالی شا نوسی و داوای یێکەتی و دۆستایەتی لێکرد و دامەزراندنی حکوومەتی دنبلی لەژێر چاوەدێری قاجاڕانی لێخواست.

فەتالی شا بەمەرجی ئەمە کە جەعفەر قولیخان کوڕێکی خۆی بنێرێتە تاران، بناغەی ئاشنایەتی لەتەکا دامەزرانی جواب داوە. جەعفەر قولیخان کوڕێکی خۆی سازکرد و ناردیە تاران.

فەتالی شا عەباس میرزای کردە نایبولسەڵتەنە و تەورێزیشی کردە ناوچە و بەموهیمماتێکی قورس بەڕێی کرد. عەباس میرزا لە نیوەی ڕێگا گەیشتە کوڕی جەعفەر قولیخان، بەلوتف و میهرەبانی نوازشی کرد و بۆ تارانی نارد.

عەباس میرزا کە گەیشتە تەورێز، قاقەزێکی بۆ جەعفەر قولیخان نوویسی کە تۆ کوڕی خۆت بۆ لای شا ناردووە، ئەبێ بۆ خۆشت بێیە لای من، ئەو قاقەزە جەعفەر قولیخانی وشیار کردەوە و ناچاری خۆ سازکردن و ئامادەبوونی جەنگی کرد.

عەباس چوونە سەر خۆی بەپێویست زانی لەشکری هەڵگرت و لە ڕێگای سەڵماسەوە کەوتە ڕێ. جەعفەر قولیخان کە وای زانی برایێکی خۆی کردە حاکمی خۆی و خۆشی لەشکری هەڵگرت و چووە نێو کوردەکانی شکاک و یەزیدی و سبێکی و دنبوڵی پازدە هەزار پیاوی شەڕکەری ئامادە کرد و ڕووبەڕووی عەباس میرزا سوپاهی ئاژۆت.

عەباس میرزا لەولاوە چووە سەر قەڵای «هود» و دەورەی دا. خان ئەبداڵ خانی کورد کە لە تەرەف جەعفەر قولیخان کرابوو بەحاکم، بۆ پێش بەدوژمن گرتن لە قەڵاوە دەرکەوت و شەڕ و کوژتارێکی جوانی کرد و لە دواییدا بەشکاوی ڕوو بەخۆی هەڵات. قەڵای هود کەوتە بەر زیللەی دوڕندەوە و هەموو تالانکران و کوژران و بەدیل گیران و پووچ کرانەوە.

جەعفەر قولیخان دەشتی سەلماسی پڕ لە ئاو کرد و بۆ خۆشی بەلەشکرەوە ڕوو بەدوژمن ڕۆیشت. عەباس میرزاش ڕێگای خۆی گرت و ڕۆیشت. لە نزیک سەلماس دوو سوپاه دووچاری یەکبوون. ڕۆژی حەوتی ڕەبیعی دوو یەکتریان ئاوربااران کرد. کوردەکان بۆ بەخێوکردنی خاکی خۆیان بەدڵێکی خاوێن تێکۆشان.

دوژمنی بەهێزتر و زۆرتر بوو؛ ئازایی کورد خۆی نەنواند. کورد لە دوای گەلێک کوژتار شکا و روو بەقەڵای ماکۆ هەڵات. جەعفەر قولیخان ماکۆی قایمکرد و لەشکر و سوپاهی تێدا دانا.

عەباس میرزا بۆ کوژتار خۆی گەیاندە کەلای خۆی. ئەگەر چی لەشکرێکی زۆری لە قوڕی دەشتی سەلماس مرد، بەڵام گەیشتە کەڵای خۆی و شیری لە ئەهالی مەزلووم نا. لە پاشان پیر قولیخانی قاجاڕی کردە حاکمی خۆی و بۆ خۆشی ڕوو بەتەورێز گەڕاوە.

جەعفەر قولیخان گەیشتە ماکۆ و لەتەک حکوومەتی عرووسا موخابەرەی دەست پێکرد و لەگەڵیان ڕێککەوت. عرووس قوەتێکی بۆ نارد کە خاکی خۆی پێ ڕزگارکاتەوە. ساڵدات و پۆڵکۆنیک و زابتێکی زۆری عرووسی بردە لای خۆی و پێویستیی خۆی ئامادەکرد و لە خۆ کۆکردنەوە و سوپا سازکردن دەکۆشا.

ساڵی ١٢٢٠ عەباس میرزا کە تەماشای کرد جەعفەر قولیخان ڕۆژ بەڕۆژ هێز پەیا ئەکا و سوپاهێکی بەمەشق فێرکردووی ئامادە کردووە و تۆپ و تفەنگ و موهیممات پێکەوە ئەنێ، لەوە کەوتە ترسێکی تەواوەوە و بۆ بەرابەری کردن و لابردنی لەشکری ڕێکخست.

مەهدی قولیخانی بەگلەر بەگی ئێرەوان و حوسێن قولیخانی حاکمی ورمێ و ئیسماعیل خانی حاکمی خۆی و کەلب عەلیخانی حاکمی نەخچەوان، هەریێک بەسوپاهی خۆیانەوە و عەشیرەتێکی کە لەژێر دەستیانا بوو، بۆ شەڕی جەعفەر قولیخانی موهەییا کردن.

عەباس میرزا حاجی محەمەدخانی قەرەگۆیزی نارد کە لە بەرابەر کەلای «تالین» کەلایەک دروست کا و هەزار کەسی شەڕکەری ئازای تیا دانێت کە ڕێگای هاتن و چوون و دانەوێڵە لە جەعفەر قولیخان گرێدەن. جەعفەر قولیخان کە لەوە ئاگاداربوو، دەستی بەپێویست ڕێکخستن و سوپاه ئامادەکردن کرد؛ هەتا ساڵی ١٢٢٨ بەوجۆرە ڕایبوارد و هەمیشە لەگەڵ قاجارا شەڕوکێشەی هەبووە، لەگەڵ عرووسا سوێند خۆربوو.

لەو ساڵەدا بۆ یارمەتی مستەفاخانی تاڵش چووە شێروان و لە وڵاتی شەکی پێشی بەقاجار گرت و گەلێک کوژتار و ئازایی نواند.

عەباس میرزا سوپاهێکی ڕێککەوتووی لەژێر فەرمانی پیر قولیخانی قاجارا ناردە سەری و نزیک بەشەکی بوون. جەعفەر قولیخان چووە پێشیان و تەنگەی پێ هەڵچنین. شکستە کەوتە لەشکری قاجارەوە و میقدارێکی زۆرکەمیان ڕزگاربوون و بەپەرێشانی خۆیان گەیاندە ئەردەوێڵ.

عەباس میرزا لەولاوە لەشکرێکی قورسی هەڵگرت و ڕووی لە خاکی شەکی کرد.

جەعفەر قولیخان لە «ئاق ئوغلان» لەشکری خۆی دابەزاند و بەشەو پەلاماری قاجارانی دا و شکا و شکاندی و نایبولسەڵتەنەش لە ئەسپ بەربۆوە و لە چەند جێگای بریندار بوو. بەهەزار ئەزیەت خۆی لەو مەیدانە خوێناوییە ڕزگار کرد. ئالەت و ئەسپاب و تۆپ وتفەنگی عەباس میرزا کەوتە دەست کوردان. نایبولسەڵتەنە خراپ شکستەی خوارد و بەپەرێشانی گەیشتەوە تەورێز.

لەودەمەدا عرووسیش لە نەخچەوانەوە ڕوو بەئێلی موغایر هەڵمەتی برد و دەری ڕێڵدز و قەرەباغ کەوتە دەستیان.

جەعفەر قولیخان هەروەها لەسەر خاکی خۆی و شەکی حوکمڕان بوو. ساڵی ١٢٣٠ ئیسماعیل خانی کوڕی لەسەر شەکی دانا و بۆ خۆی گەڕاوە ماکۆی و لەوێ مرد.

ئەهالی شەکی سەریان لە ئەمری ئیسماعیل خان سووڕاند. عرووس بەهێزی خۆیەوە دوژمنەکانی ئیسماعیل خانی گرتن و تەفروتوونای کردن. ئیسماعیل خان دەستی بەهێز پەیاکردن کرد. میر ئەسلان خانی برای جەعفەر قولیخان لەگەڵ چەند کەسێکی خۆی پەنایان بردە لای عەباس میرزا .

ساڵی ١٢٤٣ عرووس هەموو ئاوربایەگانی گرت. نایبولسەڵتەنە عەباس میرزا لە خۆی قایمەی شەڕی کرد. لە پاشان لەوێش بەرابەری پێنەکرا و کەلای خۆی دا بەمیر ئەسلان خانی دنبۆڵی و کردیە حاکم و بۆ خۆشی ڕوو بەسندوز و ساین کەلا هەڵات و بۆی دەرچوو (جلّد ئەوەڵ، تەئریخ قاجار، لاپەڕە ٢٠٤ - ٢٠٥).

میر ئەسلان لەتەک «بسقاویچ»ی سەرداری عرووسی موخابەرەی کرد و بەئیتفاق عرووسی بردە نێو کەلای خۆی و بەواسیتەی ئەوانەوە حوکمڕانی ئەکرد. کە حکوومەتی ئێران و عرووس ڕێککەوتن، میر ئەسلان هەتا مرد لەژێر ئیدارەی قاجاران حاکمی خۆی بوو. ئەو حکوومەتە کوردییەی پارچەکرد و لە پاشان لەبەر دوولایی ئیسماعیل خان و میر ئەسلان خان کە هەریێک لەژێر ئیدارەییێک دا دەگەڕان، زۆری پێنەچوو حکوومەتەکەیان پووچ کرا و هەریێک لەوانە لە ئەولادیان بوون بەمەئمووریێکی ییێک لەو دوو حکوومەتانەی زەبەر دەست.

## ١٢- سولەیمان خانی کوڕی میر ئەسلان خانی کوردی دنبۆڵی

کە بابی چووە لای قاجاران، کەوتە ریزەی مەئموورانی قاجارەوە. هەریەک بەبڵاوی لە دائیرە و لەشکرێکا دەژیان و لە شارەکانی ئێران بڵاوکرابوونەوە.

ساڵی ١٢٦٢ حکوومەتی قاجار سست و پەرێشان بوو. خان و میرانی خوراسان - هەروەکو دێتە گۆتن -لە قاجار ڕوو گەردان بوون و هەوای سەربەخۆیی لە مێشکیانا دەجووڵایەوە.

حکوومەتی قاجار لە ئازایی و ئیشگوزاری سلێمان خانی دنبلی ئەمین بوون و باوەڕیان پێ هێنا کە زۆر چاک پەرا ئەکات؛ ئەویان سەرپشک کرد کە ئەحواڵی میرانی کوردی

خوراسانیان بۆ ئاشکەرا کات کە لە چی دەرەجەیەکدا بەهێز و کاربین. بۆ ئەو ئارەزووە کرا بەحاکمی بەستام.

هەشتی مانگی جەمادی دووەم، حکوومەتی بەستام و شاردر لە تەرەف محەمەد شای قاجارەوە درا بەسلێمان خان و مەهدی قولیخانی کوڕی کرا بەوەزیر. لەپێشدا مەهدی قولیخان بەناوی بابیەوە لە تاران دەرکەوت و ڕووبە بەستام ڕۆیشت و دەستی بەپشکنینی ئوموری کوردی خوراسان کرد.

لە پاشان سلێمان خان ڕوو بەفەیرووزکۆ لە تاران دەرکەوت، لە ڕێگای ڕانیەوە کە جەعفەر قولیخانی کوردی شادی بۆ سەرکێشی حەسەنخانی سالاری بزاوتەوە و هێندێک تورکمانی گۆگلان و دەوروپشتی کردە هەواداری. سلێمان خان ئەو سەربهووردەی بۆ تاران نوویسی و ناردی.

سلێمان خان لە فەیرووزکۆوە ڕوو بەخاکی «چاردە و کەلاتە» ڕۆیشت. لەوددەمەدا جەعفەر قولیخان چووبووە سەر خاکی نەردین و جاجرم و گرتبوونی. ژن و منداڵی محەمەد حەسەنخانی قاجار کە لەوێ بوون، بەدیلی گرتبوون. محەمەد حەسەنخان بەتەنها سوارەی خۆی رزگار کرد و ڕوو بەبەستام هەڵات و پەنای بردە بەر مەهدی قولیخان. مەهدی قولیخان بەئیحترامەوە بۆ تارانی نارد.

سلێمان خان بەپشکنینی خەوانینی کوردی خوراسان چووە بەستام؛ ئوموری بەستامی دامەزراند و چەند قسەهێز (جاسووس)ی بەکرێ ناردە نێو خەوانینەوە و هێندێکی بەپەنهانی ناردە ئوستراباد و بروجەرد. بەوجۆرە زۆرچاک پەرای قاجارەکانی دەکرد و کەمکەمە ئێلەکانیشی ڕامکردن.

ئاسەفولدەولە بۆ هێز پەیاکردن، سالار کوڕی خۆی ناردە لای محەمەد شای قاجاری و نشوری موتەوەلیەتی مەشهەدی وەرگرتو ڕووی لەشار کرد کە میرزا محەمەدخان بەگلەربەگی بەتایبەتی ڕەوانەی خوراسان بکات و ئەمرێکیشی وەرگرت کە سلێمان خانی دنبلی لە بەستامەوە پێنج سەد تفەنگداری سوارە و سەد پیادەی لەگەڵ خات و دوو دانە تۆپیشیان بداتێ، هەتا دەگەنە خوراسان.

لەوەدا فیکری سالار کەمکردنەوەی قوودتی سلێمان خان و زیادکردنی هێزی خۆی بوو، بەم فیکرە کە زوو بتوانێ بەستام بگرێ. بەڵام سلێمان خان وشیاربوو، زۆر زوو نەخەڵەتاو دە ڕۆژ دەستاودەستی بەمیرزا محەمەدخانی کرد و سەربهوردی بۆ محەمەد شا نوویسی.

شا ئەمری دایێ کە زوو پێویستیی بۆ ساز بکات و بەڕێی بکا. سلێمان خان وەکو ئەمری پێ کرابوو کردی.

میرزا محەمەدخان کە گەیشتە مەشهەد بەتەدبیری سالار، سوارە و تۆپەکانی ناردەوە و میرزا محەمەدخان لەگەڵ سالار ڕێککەوت و دەنگی سەربەخۆییان بلّندکرد.

محەمەد شا لەشکری کوردی هەوشار وساینکەلا و موکری خواجەوەندی لەگەڵ دوو تۆپ، لە مانگی ڕەمەزانی ساڵی ١٢٦٣ بۆ بەستامی بەڕێکردن.

لەولاوە سالار هەتا سەبزەواری خستە دەست. جەعفەر قولیخانی کوردی شادی بەدوازدە هەزار کوردەوە لە ڕێگای کەلاتە خیچەوە چوو لە قەهیچ لەشکربەزی کرد. لەگەڵ لەشکری موکری سەعاتێک دوور لە بەرابەر یەکتر ڕاوەستان.

محەمەد شا وەڵامی بۆ سلێمان خان نارد کە ئاگادار بێت و ئەگەر نەتوانێ بەرابەری بکا بەگژیا نەچێ و بگەڕێتەوە پاش. سلێمان خان لە گەڕانەوەدا خراپەی لە چاکە زیاتر ئەدی، لەبەرئەوە قەراریدا هێندێک لەشکر لە بەستام و هێندێکیش لە کەلای قاسماوە دانێت و ئەوەی بەدەستەوە ماوە لە مەیداندا لەگەڵ جەعفەر قولیخان شەڕی پێ بکات و ئەگەر شکا لە یێکێک لەو کەلایانەدا خۆی بگرێتەوە.

لەودەمەدا قسە هیزێک چووە لای سلێمان خان و پێی وت کە چوار کوردی کوداری کە لە گوندی ئەبر بەستام دادەنیشن، لەگەڵ جەعفەر قولیخان ڕێککەوتوون کە ئاور لە جبەخانە بەردەن. سلێمان خان دەزبەجێ هەر چواری گرتن.

ئیبراهیم خانی سەڵماسی و مەجید خانی موکری، لەشکریان بردە بەرابەر جەعفەر قولیخان و ڕاوەستان و شەڕ و کوژتاریان دەست پێکرد. ئەسپی مەجید خان کوژرا و لەم شەڕەدا مەهدی قولیخانی دنبلی زۆر ئازایانە شەڕی کرد و سەرکەوت.

ساڵی ١٢٦٦ سلێمان خان بوو بەحاکمی (توربەت) کە شارێکی قیتعەی خوراسانە. ئەو بنەماڵە گەورە کوردە لە حوکمڕانی و سەربەخۆییەوە بوون بەنۆکەر و مەئمووری قاجاران.

## ١٣- مستەفاخانی کوردی شێروان

بابوباپیری مستەفاخان لەسەر خاکی شێروان حوکمڕان بوون و بەئازایی و سەربەخۆیی ئەژیان و لەتەک هەوشاری و زەندەکانا بەئیدارەیەکی باش ڕایانئەبوارد.

ساڵی ١٢٠٩ پریشکی فیتنەی قاجارِ هەروەکو ئومەڕای کوردەکانی دیکەی سووتاند، وە لە مەستەفا خانی شێروانیش کەوت.

ئاقا محەمەدی قاجارِ لەشکرێکی لە ژێر فەرمانی مستەفاخانی قاجارِدا ناردە سەر شێروان. کوردەکان بۆ پێشگرتن دەرکەوتن و لە دوای شەڕ ڕوو بەچیا بەرزەکانی شێروان کشانەوە. لەشکری قاجارِ کەوتە نێو شێروانەوە و دەستیان بەکوژتار و تاڵانی ئەهالی کرد و گەلێکیان دێهات سووتان. گەورە و سەرکردەی کوردی شێروان و شەکی بەزنجیرکراوی بۆ تاران ناردران.

ئاقا محەمەدی قاجارِ لەو دەمەدا لە تەرەف گەنجە بوو. مستەفاخانی قاجارِ گەلێک دیل و دیاری هەڵگرت و بۆ لای ئاقا محەمەد چوو و کەوتە ڕیگا. مستەفا خانی شێروان بەلەشکریکی لە دەستیا مابوو، لەسەر ڕێگایا ڕاوەستا و پیشی بەقاجارِان گرت. کە نزیکبوونەوە دەستیان بەقاجارِ کوژتن کرد. مستەفاخانیان گرت. کوژتیان و چەند ماڵ و ئەسپاب و دیلێکی کە پێیان بوو، وەریان گرتەوە و لە سوپاهی قاجارِیش کەسێکی لێ ڕزگار نەبوو؛ هەمووی وەبەر شیری کوردان کەوت.

ئاقا محەمەد کە لەوە ئاگادار کرا چووینی بۆ سەر مستەفاخانی شێروان بەپێویست زانی. عەلی قولیخانی قاجارِی بەدەستە لەشکر و تۆپ و موهیمماتەوە ناردە سەر شێروان.

مستەفاخان لە خاکی «فنداغی» پێشی بەقاجارِان گرت و شەڕ و کوژتاریان هەڵایساند و لە دوای خوێن ڕێژیکی زۆر عەلیخان وەتەنگ هات و شکا و بەپەرێشانی هەڵات.

مستەفاخان دەستی بەدامەزراندنەوەی خاکی شێروانی کرد و لەگەڵ حکوومەتی عرووسا بینای موخابەرەی دامەزراند. ساڵی هەزار و دوو سەدو یەک پەیمانی لە تەکا بەست و هێزێکی زۆری لە ساڵدات، لە تۆپ، لە پێویستی و لە زابیتی بردە لای خۆی و دەستی بەدەستوور فێرکردنی سوپاهی کورد کرد. ئەوەڵ ساڵێک ڕاوەستابوو.

لە ساڵی هەزار و دووسەدو دوازدە ئیمپراتۆری عرووس مرد و نەختێک پشێوی کەوتە عرووسیاتەوە. ساڵداتێکی لە شێروان بوون؛ بەناچاری گەڕانەوە دوایی و شێروانیان بەردا

و مستەفاخان بەتەنها لەگەڵ ئیدارە خەریکبوو؛ بەڵام ڕابیتەی لەتەکیا هەر مابوو.

ساڵی ١٢١٨ سەردار سوپاهی عرووس «ئیشپەخدەر» لە گەنجەوە ئیتفاقنامەیەکی بۆ مستەفاخان نوویسی و ناردی. دووبارە پێکەتیان تازەکردەوە و پەیمانی کرد کە لە هەموو دەمێکا دەتوانی یاریدەی بدا. لە مستەفاخانی خواست کە بچێتە شێروان و ئوموری لەشکری بۆ دامەزرێنێت.

ئیشپەخدەر بەلەشکرێکی قورسی عرووسەوە ڕوو بەشێروان کەوتە ڕێگا. نایبولسەڵتەنە لەوە کەوتە ترس و ئەندێشە. لەشکرێکی ڕێککەوتووی لەژێر فەرمانی پیر قولیخانی قاجاڕی سازکرد. حوسێن قولیخانی قاجاڕ، عەسکەر خانی کوردی هەوشار، ئەحمەدخانی کوردی مەقدەم، بەگلەر بەگی تەورێز و مەراغە، بەتۆپخانە و ئەسپاب و موهیماتەوە ناردران. عەباس میرزا بۆ خۆشی بەسوپاهێکی گرانەوە لە ڕێگای ئەردەوێڵەوە ڕۆیشت.

حوسێن قولیخان قاقەزێکی لە ئیشپەخدەر نوبسی کە مولاقاتی بکا بۆ ڕێککەوتن و مەشوەرەت بەیەکتر بکەن. ئیشپەخدەر قبووڵی کرد و لە جێگاییێکا چاویان بەیەککەوت. حوسێن قولیخان ئیشپەخدەری کوژت و سەرەکەی بۆ فەتالی شای قاجاڕ بەدیاری نارد.

مستەفا خانی شێروان کە تەماشای کرد ناتوانێت پێش بەسێلاوی بەلای قاجاڕان بگرێت، تەدبیرێکی چاکی کەوتە بیرەوە. قاقەزێکی لە ئەحمەد خانی کوردی مەقدەم نوبسی و لەبەر کوردایەتی لێی ئەمین بوو؛ قەراری لەگەڵدا لە کەنار چۆمی «کەڕ» دیدەنی بکا. ئەویش بەو دڵ ئەمین بوو، چوو چاویان پێک کەوت.

ساڵی ١٢٢٠ ئەحمە خانی مەقدەم بوو بەناوبژی مستەفاخان و نایبولسەڵتەنە و پێکی هێنان. مستەفاخان خۆی لە شەڕی قاجاڕان پاراست و گۆشەگیربوو؛ بەڵام ڕابیتەی لە عرووس نەبڕی.

ساڵی ١٢٢١ مستەفاخان دیسان لەتەک عرووسا ڕێککەوتەوە و ئیسماعیل خانی برای خۆی و سوپاهێکی باشی هەڵگرت و چووە سەر چۆمی «کەز» و ئیسماعیل خانی برای ناردە شەڕی قاجاڕان.

لەولاوە نایبولسەڵتەنە لەشکرێکی لەگەڵ حوسێن خانی سەردارا ناردە سەر مستەفاخان و هەردوولا بۆ شەڕکردن ڕیزبوون و تۆپ و تفەنگ کەوتەکار و خوێنێکی بێژمار ڕژا. قاجاڕ نەشیان خۆ ڕاگرن و بەشکاوی و پەرێشانی گەڕانەوە.

نایبولسەڵتەنە لە پڕێکا گەیشتێ و نەجەف قولیخانی کوردی گەڕووسی ناردە کەلای

«فیت» کە جێگای ئەمارەتی مستەفاخان بوو، تاکو گفتوگۆی لە تەکا بکا و بناغەی ئاشنایی دامەزرێنێت. بەهەر جۆرێک بوو نەجەف قولیخان مستەفاخانی تێگەیاند و لەگەڵ نایبولسەڵتەنە پێکی هێنان. مستەفاخان بۆ دڵپاکی محەمەد عەلی بەگی خالۆزایخۆی نارده لای عەباس میرزا.

عەباس میرزا سولحێکی بەفێڵ کرد و مستەفاخانی خەڵەتاند و لەناکاو لنگیدا سەر شێروان و کەلای شێروانی گرت و ئەهالییەکی تێدابوو کوژتنی و چووە سەر قەبیلەی مورادخانی کورد -کە شەش هەزارماڵبوون- هەمووی بارکردن و ناردنیە موغان.

مستەفاخان فێڵێکی وەبیرهاتەوە. کە سەلیم خانی شەکی لە قاجاڕان فریو دا و بیخاتە سەر هەوەسی شەڕ لەگەڵ قاجاڕانا. قاقەزێکی لێ نوویسی ئاگادار بێ کە حەسەنخانی برای سەلیم خان لە تەرەف عەباس میرزاوە بۆ گرتنی سلیم خان تەعیین کراوە.

سەلیم خان لەوە ئەندێشەی کرد و میللەتی خۆی هەڵگرت و چووە کێوی گوڵشەن گورسەن.

نایبولسەڵتەنە بەهەزار کێشە و ئەزیەت خەریکبوو دڵی سەلیم خانی دامەزرێنێتەوە و ڕامی کات. هەتا نایبولسەڵتەنە لەگەڵ سەلیم خان خەریک بوو کە لە دەست دەرنەچێت، مستەفاخان لە خۆکۆکردنەوە و هێز پەیداکردن دەکۆشا، گەلێک کەسی لەژێر ئالایدا کۆبونەوە و زۆر هێزیشی وەخڕکرد.

نایبولسەڵتەنە کە لەوە ئاگادار بوو، بەناچاری دەستی لە شێروان بەردا.

مستەفاخان ناردی دوو هەزار ساڵدات و چوار تۆپ و چەند پۆڵکۆنیکێکی هێنا لای خۆی و لەگەڵ کوردەکانی ساڵیان بناغەی دامەزراند؛ ئاشنایەتی و دۆستیی خستە پیشەوە و هینانیە ژێر حوکمەوە.

مستەفاخان لەشکرێکی هەڵگرت و چووە سەر خاکی «جەواد»، بەهەر جۆرێک بوو گرتی و لنگیدا سەر پیر قولیخانی قاجاڕ و بەشەوەیخون بردن میللەتی خۆی لە دەست ڕزگارکردن و پیر قولیخانی شکاند و گەلێک تالانی لێ گرت و کوژتارێکی زۆری لێکرد.

میر باقیربەگ برای مستەفاخان هەواداری قاجارەکان بوو؛ بەلەشکرێکەوە ناردرا کەلاو شاری ساڵیان بەخێوکا. ئاگای لە شکستەی پیرقولیخان و دەست درێژی مستەفاخان بەسەر ساڵیاندا نەبوو. بەهەواییێکی ئازادەوە ڕوو بەساڵیان چوو، لەناکاو کوردی تاڵش کە بۆ یارمەتی مستەفاخان دانیشتبوون، میر باقیربەگ و لەشکرەکەیان بەدیل گرت.

ئەو بزووتن و شەڕ و کوژتارەی کە مستەفاخان ئەیکرد، چاوی قاجارەکانی شکاند؛ وە لەو کەلێنەدا «نەبلیسین» ناو سەردارێکی عرووس چووە سەر باکۆ و بەزۆر گرتی و قاجاڕی لێ دەرخست. عرووس لە هەموو لایێکەوە پەلاماری قاجارەکانیان ئەدا دەریان دەپەڕاندن.

مستەفاخان بەکەم چاغێک سالّیان، موغان و شەکی خستە دەست خۆی. سەلیم خانی لەگزی بۆ بەرابەری لەشکرکێشی کردوە و لە دواییدا هەلات و مالّ ومندالّی خۆی ڕزگارکرد و چووە تەوریز.

مستەفاخان قاقەزێکی لە خانی تالّش نوسی کە ئێلی شێروان و موغان و «ڕوودەبار»، لە تەرەف قاجارەکانەوە لە وەتەنی خۆیان باریان پێ کردبوون و دوورخرابوونەوە، داوای لێ کرد و بۆی نوویسی ئەگەر وانەکا سێ سەد کەس خزم و خۆێشی مستەفاخانی تالّش کە لە لای ئەوە دەیانکوژێت.

مستەفاخان سەربەوردەکەی لە عەباس میرزا نوویسی و بەزبان خۆشی، خانی شێروانی ڕاگرت و نەیهێشت دلّگیر و ڕەنجیدە بێت.

مستەفاخانی شێروان بەوجۆرە لەگەلّ مەملەکەتداری خۆی و ئیتفاقی لەتەک عرووس و دوژمنی لەگەلّ قاجاڕ و دۆستی لەگەلّ ئومەرا و دراوسێ و سەردارە کوردەکانا ڕایدەبوارد.

سالّی ١٢٢٤ مستەفا خانی تالّش بۆ ییێکەتی و یاریدەدان لەگەلّ خانی شێروان موخابەرەی دەست پێکرد. مستەفاخانی شێروان لە بنەمالّە و گەورە پیاوەکانی شێروان، عومەر سولّتان خان ناوێکی هەلّبژارد و ناردیە تالّش کە بناغەی ئاشنایەتی توندکا. عومەر سولّتان لەگەلّ میر حەسەنخانا قسەگیر نەبوو؛ میر حەسەنخان عومەر سولّتانی کوژت؛ هەروەکو لە باسی مستەفاخانی تالّشا گوترا.

مستەفاخانی شێروانی بناغەی ئاشنایەتی لەوەدەمە نازکەدا تێک نەدان و دۆستی پەیداکردن و دەستی لە خوێنی عومەر سولّتان خان هەلّگرت و تیپێک هەزار کەسی ئازای تفەنگ بەدەستی بۆ کۆمەگی ناردە تالّش کە لەژێر فەرمانی مستەفاخانی تالّشا شەڕ لەگەلّ قاجاڕ بکەن.

فەتالی شای قاجاڕ لەولاوە فەرەجوللاخانی بەسوپاهێکی زلەوە ناردە سەر مستەفاخانی تالّش. لە پاش گەلێک شەڕ و کوژتار ئەمیر گۆنەخانی کورد بەناوبژی کەوتە نێوانی. فەرەجوللا دەستی هەلّگرت و گەڕاوە شێروان، بەئازادی و سەربەخۆیی بوو بەحاکم.

سالّی ١٢٤١ حکوومەتی عرووس و قاجاڕ نێوانیان ئالّۆز بوو. موجتەهیدانی شیعە

فتوای غەزایان دا. فەتالی شا لەپێش هەموو چتێکا دیوارێکی توندی وەکو مستەفاخان لە پێش لابردنی بەفەرز زانی. ئەمری دا لە هەموو گۆشەیێکی ئێرانەوە سوپاه کۆکرانەوە و ئەردەوێلّیان کردە لەشکر بەز. ئەوەندەی لە هێزی قاجاراندا بوو لە ئەردەوێل کۆکرایەوە.

مستەفاخان لەولاوە خۆی کۆکردەوە و پێویستانی ساز کرد و داوای کۆمەگی لە عرووس کرد. حکوومەتی عرووس موهیممات و ئەسپابێکی زۆری نارده تخووبی شێروان. لە هەموو نوقتەیەکی شێروانا شەڕ و کوژتار هەلایسا. قاجاڕ و شێروانی بەتۆپ و تفەنگ ئاورباراني یەکتریان دەکرد. عرووس کەوتە ترسەوە و ناردی ئۆردوێکی تەواو سالّداتی هێنا و خزاندیە نێو خاکی شێروانەوە. هەموو بەرابەر بەقاجاڕ ڕاوەستان و دەستیان بەشەڕ و کوژتار کرد.

مستەفاخانی شێروان و محەمەد حوسێن خانی کوردی شەکی، لەشکری کوردەکانیان هەلّگرت و ئەلگساندەر میرزا والی گورجستان بەئالەت و تۆپ و تۆپخانە و سالّداتێکی زۆرەوە ڕوو بەمەیدانی شەڕ چوو.

حاجی محەمەدخانی کوردی قەرەگۆیز کە هەواداری قاجاڕ بوو، لەتەک مستەفاخانا ڕێککەوت و چووە لای. لەولاوە قاجاڕەکان مەهدی قولیخانی کوردی جوانشێریان لە ڕێگای موقری و خاکی بەرگشاتەوە بۆ پێش مستەفاخان بەرێکرد.

کورد و عرووسێکی بۆ بەخێوکردنی خاکی شووشی کە لە تەرەف مستەفاخانەوە دانرابون لە نزیک کەلای شووشی لەگەلّ شازادە ئیسماعیل میرزا بەشەڕ هاتن و لە هەردوولا کوژتاری بێژمار کرا و شازادەش بەنیوە شکان گەڕاوە.

فەتالی شا میر حەسەنخانی کوڕی مستەفاخانی کوردی تالّشی کە هەواداری بوو، بۆ شەڕ ئامادەی کرد و ئاقا سلێمانی کوردی گەیلانی بەتیپی شکاکەوە لەگەلّ خست و ڕوو بەکەلای لەنگەران بەرێکرد؛ میر حەسەنخان بەزۆر ئەو کەلایەی گرت. ئەو کەلایە چاردە سالّ لەوەپێش شەوی نۆی موحەڕەم کەوتبووە دەست مستەفاخانی شێروان؛ هەربەوجۆرە شەوی نۆی موحەڕەم کەوتە دەست میر حەسەنخانی تالّشی.

فەتالی شا ئەمری دا کەلای لەنگەرانیان بەجارێک ڕوخاند. میر حەسەنخان لە لەنگەرانەوە ڕوو بەسالّیان ڕۆیشت و ئەویشی گرت. سەد هەزار خەروار ئاردی کە مستەفاخان بۆ لەشکری بەتێشوو دانابوو، کەوتە دەست میر حەسەنخان (جلّد ئەوەلّ، تەئریخ قاجاڕ، لاپەڕە ١٩٤).

میر حەسەنخان دوازدەی موحەڕەمی ئەو ساڵە بەئەمری فەتالی شا بوو بەحوکمڕانی تالش.

هەروەکو گوترا مستەفاخانی شیروان بۆ هێز پەیداکردن چووبووە گەنجە و لەشکر و سوپاهێکی قورسی کۆکردەوە و ئەلگساندەری والی گورجستانی هەڵگرت و چووە سەر قاجاڕان و بەزۆری خۆی خاکی شیروانی ئەستاندەوە.

فەتالی شا لەشکرێکی لەژێر فەرمانی حاجی محەمەد خانی قاجاڕدا بەتۆپ و جبەخانەوە نارده سەر مستەفاخان. لە نزیک ساڵیان مستەفاخان چوو پێشی گرت و لە جێگاییێکی پێی ئەڵێن «جەواد» بەتۆپ و تفەنگ یەکتریان ئاورباران کرد. قاجاڕ شکان و هەڵاتن؛ مستەفاخانیش خاکی خۆی لە دوژمن خاوێن کردەوە و ئالەت و ئەسپابێکی زۆری دەستکەوت. شیروان بۆ مستەفاخان و شەکی بۆ محەمەد حوسێن خان خاوێن کرانەوە و هەریێک لەسەر خاکی خۆیان دامەزرانەوە و لەگەڵ عرووسا موتەفیق بوون و لەژێر ئیدارەییێکی چاکا دەستیان بەحوکمڕانی کرد.

قاجارەکان بەو شکستەیە تەنگاوبوون و تەمای ڕێککەوتنیان کرد و پیاوانی زانایان خستە نێوانی کە ڕێکیان خات. مستەفاخان بەگوللە جوابی دانەوە.

فەتالی شا کە تەماشای کرد سولْح ناکرێ، ئەمری دا پەلاماری کەلای شووشی بدرێ و بخرێتە سەر شاری باکۆ.

لەشکری قاجاڕ ٢٤ی موحەڕەم لە ئەردەوێڵ دەرکەوت و ڕوو بەشیروانە ئاژۆتی.

فەتالی شا بیست هەزار کەسی بەتۆپەوە ساز کرد و لە ژێر فەرمانی ئاسەفولدەولەدا لەگەڵ نایبولسەڵتەنە بۆ سەر کەلای شووشی ناردن و دوو هەزار تومەن دراوی پێدان کە لە پێویستی خەرج کەن. نایبولسەڵتەنە بەو هێزەوە کەوتە ڕێگا.

مستەفاخان کە لەوە ئاگادار بوو هاواری لە عرووس کرد کە یاریدەی بدات. «مەدەدۆف» ناو گەورەییێکی عرووس بە چل هەزار ساڵدات و قازاخ و ٢٠ تۆپ و جبەخانەییێکی قورسەوە بەهاوارییەوە چوو و دەست بەشەڕ و کوژتار کرا. وەلیعەهدی قاجاریان شکاند و پەرێشانیان کرد.

مستەفاخان بەلەشکری کوردانەوە بەرەو نایبولسەڵتەنە ڕۆیشت و شەڕ گەرمەی تێکەوت و کوردەکان تەنگەیان بەنایب ولسەڵتەنە هەڵچنی و شکاندیان و بەهەزار ئەزیەت و پەرێشانی ڕوو بەتەورێز گەڕاوە.

مستەفا خان تالان وئەسپابێکی زۆری دەستکەوت و گەلێک قاجاڕی بەدیل گرت و گەڕاوە جێگای خۆی و دەستی بەڕێکخستنی ئوموور کردەوە.

مەدەدۆف لە مانگی جەمادی دووەمدا لە ئاراز پەڕیەوە کە ئێلەکانی قەرەباغ بباتەوە جێگای خۆیان. نایبولسەڵتەنە ناچاربوو لەشکرێکی نارده پێشی کە نەهێڵێت؛ بەڵام زستان و بەفر نەیهێشت شەڕ بکرێ.

شێروان بەوجۆرە لەژێر حوکمڕانی مستەفاخان و ئیدارەی عرووسا ماوە، هەتا کەمکەمە ئەو حکوومەتە بچووکەی کورد پووچ کراوە.

## ١٤- ئەمیر نەسیرخانی کوردی هەکاری

ئەمیر نەسیرخان کوڕی مستەفاخانی میری هەکارییە. چونکە بابی لەگەڵ حکوومەتی قاجاڕانا ڕێک کەوتبوو، نێوانیان تێکچوو و بەگژیەکدا چوون. باب لە دەست کوڕی وەتەنگ هات.

ساڵی ١٢٣٥ حکوومەتی عوسمانی و قاجاڕ لەسەر عەشیرەتانی «حەیدەران و سپیکان» بەشەڕهاتن. کوردی هەموو وڵاتی وان و بایەزید و ئەرزەڕۆم و مووش و بتلیس، لە ژێر پێیانا پلیخانەوە.

نەسیرخان لەودەمە خوێنینەدا بوو، بەرهەڵستی خاکی هەکاری، وە لە پشێوی تورک و قاجاڕی پارازت. بەڵام مستەفاخانی باوکی دەیەویست بکەوێتە ژێر چاودێری قاجاڕانەوە.

ئەمیر نەسیرخان بەکۆمەگی عوسمان بەگی کوردی هەرتووشی لەشکرێکی قورسی لە کوردی وان و هەکاری کۆکردەوە و چووە سەر خاکی سەلماس و خۆی و کوژتارێکی زۆریان لە قاجاڕان کرد و خاکەکەیان خستە دەست خۆیان.

ساڵی ١٢٣٧ نەسیرخان و عوسمان بەگ هەزار پیاوی شەڕکەریان هەڵگرت و لە چیاکانی هەکاری ڕوو بەدەشتێ چوون. نایبولسەڵتەنە لەشکرێکی نارده پێشیان. سەرداری لەشکر یووسف خان بوو؛ کورد و قاجاڕ بەگژیەکدا چوون. لە دوای گەلێک کوژتار ئەمیر نەسیرخان شکا و ڕوو بەکێوەکان هەڵات. لە نێوانی ئەمیر نەسیرخان و یووسف خانا چەند شەڕێک کرا؛ بەڵام مەرگ مۆڵەتی نەدا و ئەمیر نەسیر بەمردن مرد.

مستەفاخان لەگەڵ قاجاڕان ڕێککەوت و چووە تەورێز و گەڕاوە پایتەختی ئەمارەتی خۆی کە «باش قالان» بوو.

نایبولسەڵتەنە خوازبێنی کچی مستەفاخانی کرد بۆ وەلیعەهد محەمەد میرزا، کە لە

دوایی فەتالی شا بوو بەپادشا. مستەفاخان وەلیعەهدی کردە زاوای خۆی و بەجارێک لەتەکیانا ڕێککەوت.

## ١٥- ئەمیر گۆنەخانی کوردی زەعفەران

ئەو ئەمیرە کوردە لە چاغی زەندەکان حاکمی «خەبوشان» بوو. لە سەرکەوتنی قاجاڕدا گۆشەگیریی کرد.

ساڵی ١٢٠٥ ئاقا محەمەدی قاجاڕ لەتەک ئەمیر گۆنەخاندا خەریکبوو بیخاتە دەست؛ نەشیا.

ساڵی ١٢٠٩ ئاقا محەمەد چووە خاکی خوراسان. ئەمیر گۆنەخان لە خاکی «ئەرغیان» چووە کنی و حوکمڕانیی خەبوشانی پێداوە.

ساڵی ١٢١٣ فەتح عەلی شای قاجاڕ چووە مەشهەد. ئەمیر گۆنە لە شاری چناران دیدەنی کرد و گەڕایەوە؛ زۆری پێنەچوو میرزا شەفیع خان سەدری ئەعزەمی قاجاڕ بۆ خوازبێنی کچی ئەمیر گۆنە بۆ شازادە حوسێن عەلی میرزا مارەیان کرد و بردیانە تاران. ئەو ئەمیرە کوردە بەوجۆرە هەتا ساڵی ١٢٢٨ لەگەڵ حوکمڕانی خەبوشان و ئیدارەکردن خەریکبوو. زۆر موحتەڕەم و قسەڕەوا بوو. ڕۆژ بەڕۆژ نفووسی زیاد دەکرد و داراتر دەبوو. لەوساڵەدا ڕەزا قولیخانی کوڕە گەورەی کەوتە سەر هەوەسی حوکمڕانێکی سەربەخۆ و هەموو گەورە و سەردارە خێڵەکانی کورد و خەوانینەکانی خوراسانی کردە هاودەنگ و لە قاجاڕان بڵندبوو. لەو نێوانەدا ئەمیر گۆنە دووچار بەئەزیەت کرا، هەروەکو دەگوترێ.

ساڵی ١٢٣٠ی مانگی جەمادی دوو، فەتالی شا لەشکرێکی لەژێر فەرمانی ئیسماعیل خانی دامغانیدا ناردە سەر خەبوشان. هەواداەکانی ئەمیر گۆنەخان لە ئیسحاق خانی قەرایی، قۆجەخانی کەیوانی، بەگلەرخانی چاپش بوون و سوێندیان لەگەڵ خواردبوو، پێشیان بەسوپاهی دوژمن گرت و شکاندیان. ئەمیر گۆنە خان بۆ ناوبژی چووە تاران و گەڕاوە. بۆ بناغە دامەزراندن،ڕەزا قولیخانی کوڕی و نەجەف عەلیخانی کوردی شادی ناردنە تاران و ئیتفاقێکی بچووکیان کرد و گەڕانەوە.

ساڵی ١٢٣١ حکوومەتی قاجاڕ لەشکری ناردە سەر خەبوشان. ئەمیر گۆنە خان چووەکن سەرداری لەشکر و نەیهێشت شەڕ بکرێ و گەڕاوە.

ڕەزا قولیخان لە بابی ئەمین نەبوو؛ گرتی و حەپسی کرد. لە پاش دووساڵ بەئیتفاق و تکای سەدری ئەعزەمی قاجاڕان ئەمیر گۆنەخان ڕزگاربوو.

## ١٦- ڕەزا قولیخانی کوڕی ئەمیر گۆنەخان

ئەو دلێرە کوردە هەمیشە لە جەوروزوڵمی قاجاڕان دڵگیر و ڕەنجیدە بوو. لەگەڵ هەموو گەورەکانی کوردی خوراسانا ڕێککەوت و بەپەنهانی کردنیە هەواداری خۆی کە لە چنگ حکوومەتی قاجاڕان ڕزگاربن.

ڕەزا قولیخان لەژێرەوە هەموو خاکی خوراسانی خستە ژێر حوکمیەوە، بەگەورە و بچووکی ئەو خاکەوە کەوتنە ژێر فەرمانی ڕەزا قولیخانەوە. دەستی قاجاڕ لە خوراسانا کورتبوو.

والی خوراسان محەمەد وەلی میرزای کوڕی فەتالی شابوو. گەورەکانی کورد بۆ تارانیان نوویسی کە ئەو پیاوە بەکار نایەت و لایبەن. ڕەزا قولیخان ناردیە دووی هەموو خەوانینی خوراسان و گەورە و کەیخودایانی کورد. لە دەشتی گورگان کۆبوونەوە. ڕۆژی چوارشەمە ٢٧ی شەعبانی ١٢٢٨ هەموویان بۆ ڕەزا قولیخان سوێندیان خواردبوو. بەپێکیەتی ئیتفاقێکی تەواویان گرێدا کە حکوومەتێکی کوردی نەشتمانی (وطنی) لە خاکی خوراسان دامەزرێنن و ژێر حوکمی کەس قبوڵ نەکەن. قاچاڕ لە خاکی خوراسان دەرخەن.

لەسەر ئەو ئیتفاقە دەستیان بەسەرکێشی کرد، ناردیان دراو و ئەسپی فەتالی شایان برد، ماڵات و ڕەوە ئەسپی شازادەیان تالانکرد و قاجارەکانیان وەتەنگ هێنا (جلد ئەوەڵ، تەئریخ قاجاڕ، لاپەڕە ١٣٤).

حکوومەتی قاجاڕ لەشکرێکی قورسی ناردە سەر ڕەزا قولیخان. شەوی شەممەی مانگی ڕەبیعی دوو ١٢٢٩ لەشکری کورد پەلاماری قاجاڕیان دا. لە دوای گەلێک کوژتار و تاڵان کە ڕۆژ بووەوە بەتۆپ و تفەنگ بەرابەر ڕاوەستان. کوردەکان زۆر بەگەرمی تێکۆشان. سەردار لەشکری قاجاڕ ئیسماعیل خانی دامغانی شکستەی تێکەوت و تەنگەی پێ هەڵچنرا و هەڵات. فەتالی شا جاری دووەم لەشکرێکی دیکەی سازکرد؛ بەڵام چونکە محەمەد زەمان خانی قاجاڕ سەرکێشی کرد، نەشیا ئەو لەشکرە بنێرێتە سەر کوردەکان.

کوردەکان بەجارێک خاکی خوراسانیان خستە دەست خۆیان. تەنها شاری مەشهەد لە دەست والیدا مابوو؛ ئەویش هەموو ڕۆژێ لە دەست کوردەکانا وەتەنگ هێنرابوو. ڕەزا قولیخان ناردی لەگەڵ خانی خارەزما ئیتفاقی گرێدا و سوێندی پێ خوارد.

ساڵی ١٢٣٠ حکوومەتی قاجاڕ لەشکرێکی قورسی ناردە سەر خەبوشان.

ڕەزا قولیخان پێشی پێگرت و بەشەڕ و کوژتار، ڕۆژی هەشتی شەعبان لەشکری قاجارِی شکاند و تالان و دیلێکی زۆری دەستکەوت. لە دوای ئەو هەموو شەڕە، فەتالی شا، بەمورادی هاتوو حکوومەتی بۆ تەسدیق کرد کە ڕەزا قولیخان حوکمڕانی خەبوشان و نەیشاپوور و شارەکانی دەوروپشتی بێ و نەجەف عەلیخانی کوردی شادی وەزیری بێ و محەمەد وەلیخان حاکمی مەشهەد بێت. ئەو حکوومەتە لەتەک قاجارانا ڕابیتەی هەبێ و فەتح عەلی شای قاجارِ بەپادشاهی بناسن و سککە و خوتبە بەناوی هەردووکیان بێت. کە ئەو ئیتفاقە ڕێکخرا، هەیئەتی سوفەرای تاران، چوونە خەبوشان و بناغەی ئیتفاقیان توندکرد و گەڕانەوە.

ڕۆژی ٢٢ی مانگی شەوال، ڕەزا قولیخان و نەجەف عەلیخان بۆ دیدەنی فەتالی شا چوونە تاران و بەئیحترامەوە پێشوازی کران و ئیتفاقنامەیەکی لە نێوانی قەرار درا بوو، دووبارە لەسەری ڕێککەوتنەوە و گەڕانەوە خەبوشان.

سالّی ١٢٣١ شازادە چووەسەر کەلای «ڕادەگان و دەرەجز» کە خاکی کوردبوو. ڕەزا قولیخان کۆشا کە ئیتفاقیان تێک نەچێت، بێ سوود بوو. ئەمیر گۆنەخان هەلآت چووە لای شازادە، ڕەزا قولیخان لەشکری هەلّکرت و پێشی بەشازادە گرت و وەتەنگی هێنا و شکاندی و بابیشی بەدیل گرت و بردی حەپسی کرد. ڕەزا قولیخان ناردی لەگەلّ حاجی فەیرۆز خانی والی هیراتا ئیتفاقی کرد.

سالّی ١٢٣٢ حکوومەتی قاجارِ شوجاعو لسەلّتەنەی بەسەفیری نارده خەبوشان ٢٠ی جەمادی یەک ڕەزا قولیخان پێشوازی کرد و بردیە خەبوشان؛ دووبارە ئیتفاقیان گرێداوە. شوجاعو لسەلّتەنە خواهیشتی لە ڕەزا قولیخان کرد، بۆچوونە سەر هیرات کۆمەگیان بکا، ئەویش پەیمانی پێدا.

سالّی ١٢٣٣ فەتح خانی وەزیرلئەعزەمی ئەفغانی چوو هیراتی گرت و وەلآمی ناردە لای ڕەزا قولیخان کە ئیتفاقی لە گەلا بکات. بۆچوونە سەر مەشهەد ڕێککەوتن (جلّد ئەوەلّ، تەئریخ قاجارِ، لاپەڕە ١٥٨).

فەتح خان لەولاوە و لەشکری کوردیش لەم لاوە چوونە سەر مەشهەد. لەو دەمەدا حکوومەتی قاجارِ لەشکرێکی قورسی لە تارانەوە ناردە کۆمەگی شازادە. لە دوای گەلێک کوژتار، هەردوولا بەمامەلّەت پێکهاتن. موئتەمەری هەردوولا کە میحراب بەگ و شەرەفخان بەگی کوردی شادی بوون، لە تەرەف کوردەکانەوە بەمەندووبی لەگەلّ شازادە

محەمەد تەقی میرزا، لەسەر دەستووری پیشوو ڕێککەوتنەوە، بەڵام قاجاڕیان فێڵیان کرد. لەلایێکەوە بۆ مامڵەت مەجلیسیان گرت و لەلاییێکی دیکەوە دە هەزار شەڕکەریان نارده خەبوشان کە بیگرن. لەوددمەدا ڕەزا قولیخانی کورد چووبووە «تەربەت». خەبوشان لە سوپاە چۆڵ بوو، فەتالی شای قاجاڕ دەورەی خەبوشانی گرت و وەتەنگی هێنا. ڕەزا قولیخان هەرچەندەی کۆشا لە دەرەوەی خۆی بگەێنێتە نێو شارەوە مومکینی نەبوو، ناچار ڕوو بەکەلای شێروان چوو؛ تێیدا دانیشت. بیستی ڕەمەزان سەدرەلئەعزەم لە تەرەف فەتالی شاوە چووە لای ڕەزا قولیخان کە خۆی تەسلیم کا نەبوو. لە دوای ئەوە شار و دێهاتی دەورەی خەبوشان لە تەرەف قاجارەوە تالانکران و کوژتارێکی قورسکرا و ئاوایی سووتاندران. لە مووددەتی سێ ڕۆژا هەموو وڵاتی خەبوشان وێران کرا و کەلای شێروان و خەبوشانیش بەتۆپ و تفەنگ ئاوباران کرا. (جلد ئەوەل، تەئریخ قاجاڕ، لاپەڕە ١٦٤).

ڕەزا قولیخان لە هەموو لاییێکەوە لەگەڵ شەڕ خەریکبوو. گەورەکانی کورد کە لە لای فەتالی شابوون، لەگەڵ شا گفتوگۆیان کرد کە ژن و منداڵ و هەژار، بەبێ گوناهی کوژتن ڕەزا قولیخان ناترسێنێت. لەسەر ئەوە عولەما و ریش سپیان خستە نێوانی و بەمامڵەت کردن خەریک بوون و پێکهاتن. لەو شەڕەدا زیانی ڕەزا قولیخان ٦ تۆپ و ٢٠٠ زەنبورەک و ٦٠٠ شمخال و ٢٠٠٠ تفەنگ بوو کە کەوتبووە دەست قاجاڕان، فەتالی شا گەڕاوە لەگەڵ ڕێکخستنەوەی خاکی خۆی خەریکبوو.

ساڵی ١٢٣٦ فەتالی شا موعتەمیدولدەولەی نارده کن ڕەزا قولیخان؛ گرێی یێکیەتی و ئاشنایەتیان دامەزراندەوە. لە دوای ئەوە ڕەزا قولیخان بۆ باوەڕیی حوسێن قولیخانی کوڕی خۆی و عەلی مورادخانی کوڕی نەجەف عەلیخانی کوردی شادی و مەهدی قولیخانی کوردی قەرایی بەموعتەمیدی ناردنە تاران، لە دوای ئیحترام و پێکهاتنەوە گەڕانەوە خەبوشان.

ساڵی ١٢٤٣ دیسان بەفیتنە ئەنگێزی محەمەدخانی قەرایی، شۆڕش کەوتە نێوانی ڕەزا قولیخان و قاجاڕان. هەلاکۆ میرزای والی مەشهەدی لێخست و گرتی و ناردیە خەبوشان و شاری مەشهەدی خستە دەست خۆی. نیشاپوور و ئەترافیشی گرت و جەعفەر قولیخانی کوڕی نەجەف عەلیخانی کوردی شادی -کە زاوای بوو- کردیە حاکم و لەسەری دانا. هەلاکۆ میرزاشی ناردە سەبزەوار. ئەو حاڵە چوار ساڵ دەوامی کرد. بەڵام چەند جاران قاجاڕ و کورد شەڕیان کرد، هەر کورد سەرکەوت و قاجاڕ شکان.

محەمەد خانی قەرایی ببوو بەهەواداری قاجاڕ و مەشهەدیشی گرتبوو. ڕەزا قولیخان کوردەکانی زەعفەران و شادی و جیهان بەگی نارد و خانیان دەرپەڕاند و مەشهەدیان گرتەوە.

ساڵی ١٢٤٦ نایبولسەڵتەنە بۆ دامەزراندنەوەی خوڕاسان لەشکری برد و چەند کەڵای ڕەزا قولیخانی گرت و ڕۆژ بەڕۆژ ڕەزا قولیخان ڕووی لە سەرەوژێری کرد؛ بەڵام زوو میرزا ڕەزای موعتەمیدی خۆی نارد و لە دوای گەلێک کێشە نایبولسەڵتەنە ڕوو بەمەشهەد دەچوو، گەڕاوە. ڕەزا قولیخان دووبارە دامەزراوە.

ساڵی ١٢٤٧ نایبولسەڵتەنە کچی خۆی دا بە کوڕی محەمەد و کچی ئەویشی بۆ کوڕی خۆی خواست. ئەوە بووە مایەی تێکدانی یێکەتی کوردی خوڕاسان، قەراری دا بیکاتە پایتەخت؛ بەڵام کوردەکانی زەعفەران کۆمەگی قاجاڕانیان کرد و سەربازیان بردە خەبوشان. ییزدان وێردیخانی برای جەعفەر قولیخان بەسێ هەزار سوارەی کوردی شادی و بۆ بەخێوکردنی ئەو خاکە لە کەڵات دانیشت. مانگی ڕەمەزانی ساڵی ١٢٦٢ سالار تەپڵی ئازادی و سەربەخۆیی خاکی خوراسانی لێدا و ئاڵای سەرکێشیی بڵندکرد.

حکوومەتی قاجاڕ سوپاهێکی قورسی تێکەڵاو لە کوردانی هەوشاری و موکریانی و ساین قەڵایی و خواجەوەندی و عەبدولمەلەکی سازکرد و لەژێر فەرمانی سەرتیپ برایم خەلیلیخاندا، ناردیانە سەر خوڕاسان و لە ڕێگای بەستامەوە کەوتنە ڕێگا. جەعفەر قولیخان بە ٣٠٠ سوارەی کورد پێشی پێگرتن. لەشکری قاجاڕ بەتۆپ و تفەنگ کوردی خوڕاسانیان ڕاگرت. جەعفەر قولیخان بەفێڵی نایبولسەڵتەنە کارێزی لە بورج دا و ئاوری تێبەردا، بەشەڕ و کوژتار ئەو کەڵایەی گرت و ٣٠٠ شەمخال، ٣٠٠ ئەسپ، ٥ خەروار باڕووت، ٦٠٠ خەروار گەنم، ٦٠٠ تفەنگ کە ڕەزا قولیخان لەو کەڵایەدا دایناببوو کەوتە دەست نایبولسەڵتەنە. (جلد ئەوەڵ، تەئریخ قاجاڕ، لاپەڕە ٢٥٦).

خاکی قیتعەی چناران هەموو گیرا. ڕەزا قولیخان خێڵ و میللەتی خۆی بەجارێک لە خابوشان کۆکردەوە و بۆ بەرابەری کردن ئامادە بوو. گەورەکانی هەموو لە خۆی کۆکردنەوە. ڕەزا قولیخان ناردیە دووی جەعفەر قولیخانی کوردی شادی کە زاوای خۆی بوو، بە هەزار سوارەی کورد و بە هەزار شەمخاڵۆنەوە لەسەر کەڵای خەبوشانی دانا و حوسێن قولیخانی کوڕی خۆشی بە ١٠٠٠ سوارەی شەمخاڵوانەوە ناردە کەڵای شێروان کە پاسەوانی بێ.

نایبولسەڵتەنە ڕوو بەخەبوشان چوو؛ کەڵای «ڕادەگان»ی گرت و چووە تەپەی تاوس.

نەجەف عەلیخانی کوردی شادی لە ڕەزا قولیخان جوێ بووەوە و چوو گەیشتە نایبولسەڵتەنە.

حوسێن قولیخان کوڕی ڕەزا قولیخان شەوەیخونی لە سوپاهی قاجاڕدا و گەلێکی لێ کوژتن. لەولاوە کامران میرزا و یار محەمەدخانی ئەفغانی، بەلەشکرێکی قورسەوە لە ١٢ی ڕەبیعی یەکەم گەیشتە یارمەتی نایبولسەڵتەنە.

ڕۆژ بەڕۆژ لەشکری نایبولسەڵتەنە زل دەبوو. هاواڵەکانی ڕەزا قولیخان بۆ موساڵەحە لە عولەمایانی کوردی خەبوشان مەلا حوسێنی گچکەی ناردە کن نایبولسەڵتەنە کە پێکیان بێنێت. ئەویش بەم مەرجە کە خەبوشان بەدەستەوە بدات و بۆ خۆشی بچێتە کن نایبولسەڵتەنە سوڵح دەکرێت. ڕەزا قولیخان نەیکرد و بۆ شەڕ و کوژتار ئامادە بوو.

نایبولسەڵتەنە لە هەموو لایێکەوە دەستی بەپەلاماردان و لغوم لێدان و ئاوربارانی خەبوشانی کرد. گەلێک کوژتار لە هەردوولاوە کرا، لە نەتیجەدا بەمامڵەت ڕەزا قولیخان خۆی بەدەستەوە دا.

ڕۆژی هەشتەمی ڕەبیعی دووەم ڕەزا قولیخان کەوتە دەست نایبولسەڵتەنە. ڕۆژی نۆیەم خەبوشان تەسلیم کرا. ژنی ڕەزا قولیخان کە کچی نەجەف عەلیخانی کوردی شادی بوو، کراسێکی تێل زێری گەوهەرچن کە بە دە هەزار مسقاڵ زێر کرابوو، لەگەڵ ١٠ سەر ئەسپی چاک و ٣ سەر وشتری لووک بەپێشکەشی دایە نایبولسەڵتەنە (جلد ئەوەڵ، تەئریخ قاجاڕ، لاپەڕە ٢٥٦).

شارانی خەبوشان و نیشاپوور و بام و سەفی ئاوا و جیهان ئەرغیان و چناران و ئەمیر ئاوا کە خاکی پاکی کوردی زەعفەران و شادی و جیهان بەگی و خێلاتی دیکەی کوردی خوراسان بوون، لەژێر حوکمڕانێکی وەکو ڕەزا قولیخانا بوو، کەوتە ژێر پەنجەی قاجاڕەوە.

لە دوای تالان و کوژتار کردنیان، نایبولسەڵتەنە ڕەزا قولیخانی بردە مەشهەد. ڕۆژی ٦ی جەمادی یەک ڕەزا قولیخان تەمای هەلاتنی هەبوو؛ بەلام نەیتوانی. نایبو لسەڵتەنە هەستا چووە سەر شاری «سرەخس». جلد ئەوەل، تەئریخ قاجاڕ لاپەڕە ٢٥٨ دەڵێت: لە کوردی سەرخەس ٤٥٠ کەس بەدەست نایبولسەڵتەنە بەکوژت چوون. لە دوای ئەوە نایبولسەڵتەنە گەڕاوە مەشهەد، ڕەزا قولیخان و محەمەدخانی خستە زیندانەوە و تووشی مەرارەتی کردن.

ساڵی ١٢٤٨ دوای مانگی زیلحیجە، نایبولسەڵتەنە ڕەزا قولیخان و محەمەد خانی

لەگەڵ خۆی بردە تاران و بۆ ئاوربایەگانی بەڕێکردن.

٢٠ی موحەرەمی ساڵی ١٢٤٩ لەشاری میانە (میانج) ڕەزا قولیخان مرد و لەمیانە نێژرا (جلّد ئەوەل، تەئریخ قاجار، لاپەڕە ٢٦٥).

لە دوای ڕەزا قولیخان هەردوو کوڕەکانی کە سامخان و ئەبوفەزڵخان بوون، هەتا ساڵی ١٢٦٤ لە تاران دەستبەسەربوون و لە پادشا ڕوو گەردان بوون و هەڵاتن و چوونە خەبوشان. گەلێک پەرایان کرد و تۆڵەیان لە خالانی کە کوردی شادی بوون کردیانەوە. (تەفسیلی ئەوانە هەموو لە کتێبی »میللەتی کورد«ی ئێمەدا دێتە گوتن، موراجەعە بفەرموون).

## ١٧- ئیبراهیم خان کوردی شادی

ئیبراهیم خان سەرداری کوردی شادی بوو. وە لە جاغی حکوومەتی زەندا سەرکردەیەکی سوپاهی زەندەکان بوو. کە زەند کەوتن ساڵی ١٢١٠ ئاقا محەمەدی قاجار چووە سەر خاکی خوراسان، ئیبراهیم خان بەدەستوورێکی جوان لەتەکیا ڕێککەوت و حکوومەتی «ئەسفراین»ی بۆ تەسدیق کرا و بەگۆشەکیری ڕایبوارد.

ساڵی ١٢١٥ ئیبراهیم خان لەگەڵ فەتح عەلی شای قاجارا ڕێککەوت و ئیتفاقیان گرێدا.

## ١٨- نەجەف عەلیخانی کوردی شادی

نەجەف عەلیخانی کوردی دلسۆژ، برازای ئیبراهیم خان بوو؛ گەلێک حەزی بەرزگار بوون ئەکرد. بەڵام لە دەستی نەدەهات. لە ساڵی ١٢٢٨دا لەگەڵ ڕەزا قولیخان ڕێککەوت و لە هەموو شەڕ و کوژتار و ڕاو و تەدبیرێکا هاودەنگی بوو. ساڵی ١٢٤٨ وە دوای مانگی سەفەر لەبەر نارێکی خەوانینەکانی کوردی خوراسان، ناچار بوو لە ڕەزا قولیخان پچڕاوە وەکو لە سەربهوردی ڕەزا قولیخانا یەک بەیەک گوتران. بەڵام جوێ بوونەوەی نەجەف عەلیخان بوو بەمایەی تێکدانی حکوومەتی کوردی زەعفەران و شپرزەیی هەموو کوردەکانی خوراسان.

هەروەکو گوترا نەجەف عەلیخان کە لە ڕەزا قولیخان پچڕاوە، کوڕ و کچەکانیشی ڕزگارکرد. جەعفەر قولیخانی کوڕی کە هەم زاوا و هەم سەردار سوپاهی ڕەزا قولیخان بوو، هێنایە کن خۆی و تێکەڵ بەسوپاهی قاجاری کرد. ساڵی ١٢٤٨ مانگی موحەڕەم

نایبولسەڵتەنە چووبۆ تاران و جەعفەر قولیخانی لەگەڵ خۆیا بردە کن فەتالی شا و بەخەڵات و ڕوتبەوە بردیە مەشهەد.

مانگی ڕەبیعی دووەمی ئەو ساڵە، وەلیعهەد محەمەد میرزا چووە سەر هیرات. نەجەف عەلیخان بەلەشکری کوردی شادی و هەموو «چەمشکزک»ەوە بۆ یارمەتی لەتەکیا چووە گەلێک پەرای کرد. کەلای «کۆسە» و چەند شارێکی کوردەکان کە لەسەر ڕێگا بوون بەتەواوەتی گرتیان. لەسەر پردی «نەقرە» لەگەڵ ٥ هەزار کەسی ئەفغانی بەشەڕ هاتن و شکاندیان. کە گەیشتە سەر شاری هیرات کوردەکان لە دەورەی شار سەنگەریان دروستکرد و بەگەرمی شەڕیان کرد.

مانگی جەمادی دوو جەعفەرقولیخانی کوڕی وەڵامی دایێ کە نایبولسەڵتەنە مرد. نەجەف عەلیخان بۆ ئەمەی لەشکر نەشکێت، زۆر بەلەز لەگەڵ کامەران میرزا مامڵەتی کرد. کە مامڵەتی هیراتی تەواوکرد، لە ١١ی جەمادی دوو ١٢٤٩ لە هیراتدا دەست بەدامەزراندنی ئوموورکرا و گەڕاوە مەشهەد، ولیعەهد چاوەنۆڕی ئەکرد. لەگەڵیا چووە تاران و گەلێک ناوبانگی کرد.

ساڵی ١٢٥٣ نەجەف عەلیخان بوو بەسەردار سوپاهێکی ڕەسمی قاجاڕان. ساڵی ١٢٥٤ لەگەڵ محەمەد شای قاجاڕ چووە سەر هیرات و دەورەی دا. جەعفەر قولیخانی کوڕی بە ١٠٠٠ سوارەی کوردەوە بەکۆمەگیەوە چوو. لەو شەڕ و کۆششەی هیراتدا پەرایێکی زۆریان بۆ محەمەد شا کرد. لە تاریخ قاجاڕ، جلدی دووەم، لاپەڕە ٣٥١) لەوە زیاتر باسی نەجەف عەلیخانی نەکردووە.

## ١٩- جەعفەر قولیخانی کوڕی نەجەف عەلیخان

ئەو پاڵەوانە کوردە، یێکە ستوونی حکوومەتی ڕەزا قولیخانی کوردی زەعفەران بوو، وە گەلێک پەرای کردبوو، هەروەکو سەربهوردی بەدرێژی لە کتێبی ئێمە بەناوی «میللەتی کورد» دێتەگوتن. ئەو پیاوە کە بە ١٠٠٠ سوارەوە چووە یاریدەدانی باوکی لە هیرات زۆر چاک تێکۆشا لەگەڵ سەردار سوپاه ئاسەفودەولە ڕێک کەوت و چووە سەر «مەرغاب» و گەلێک تورکمانی کوژت و بەدیلی گرت و چووە سەر خەلیفە عەبدوڕەحمانی تورکمان و نادر میرزا. کە هیزی ئەفغان و تورکمان ٢٠ هەزارکەس بوو، شەڕی لەتەکیانا کرد و شکاندنی. چووە سەر خاکی «مەیمەنە و سەرپەل»، شێر محەمەدخانی هوزارە و جمشیدخان لە ترسان پێشوازیان کرد. میزراب خانی والی هوزارە بۆ دەشتی گورگانی هەڵبڕی.

مەخدووم قولیخان ناچاربوو محەمەدخانی کوڕی بەدیارییەوە نارده کنی؛ جەعفەر قولیخانیش گەڕاوه.

جەعفەر قولیخان هەرچەنده لەگەڵ قاجاڕان تێکەڵ ببوو، بەڵام چاوی هەر له ڕزگار بوون بوو. له سەفەری هیرات لەگەڵ ئاسەفولدەوله ئیتفاقی کرد که خوڕاسان له پەنجەی قاجاڕان دەرخەن.

جەعفەر قولیخان له مەشهەد لەگەڵ حەسەنخان سالاری کوڕی ئاسەفولدەوله ڕێککەوت و کردیه هاودەنگی خۆی. ساڵی ١٢٦١ جەعفەر قولیخان کچی خۆی دا بەسالار و خوشکی سالاری بۆ خۆی خوازت و بوون بەخزم و پیویستی بڵندبوون و خۆ ڕزگارکردنیان سازکرد و شەو و ڕۆژ خەریکبوون.

ساڵی ١٢٦٢ مانگی ڕەبیعی دوو حاجی ئاقاسی وەزیری لەشکری قاجاڕ که له مێژبوو ئاگاداری له جەعفەر قولیخان پەیدا کرد بوو، هەڕەشەنامەیەکی بۆ ئاسەفولدەوله نارد که بەلەز جەعفەر قولیخانی بۆ تاران بەرێکات. سالار بەبەرئاودژوو وەلامی داوه، هەتا چەندجار ئەو هەڕەشەنامەیه ناردرایه خوڕاسان، ئاسەفولدەوله و سالار نەیانبهیست. جەعفەر قولیخان سالاری کردبوو بەمەتاڵ و بەناوی سالارەوه ئیشی دەکرد. حکوومەتی قاجاڕ وشیاربوو، که ئەوه فێتی جەعفەر قولیخانه؛ دەنا سالار ئەوه نییه.

جەعفەر قولیخان هەستا چووه نێو تورکمانی گوگئالان و چووه کن سلێمان خانی حاکمی ئوستراباد بۆ سەر بلندکردن و خرۆشاندن، سلێمان خانی ناونا «خانی خانان» و گەڕاوه خاکی نەروین و جاجرمی گرتن و خستنیه سەر خاکی خوڕاسان. جەعفەر قولیخان شەووڕۆژ تورکمانی هاندەدان و بەگژ حکوومەتی قاجاڕی دائەکردن.

جەعفەر قولیخان چووەسەر شاری کەلات و گرتی و خۆی چۆڵکرد و کشاوه چیاکان. ئەو ڕۆژه هەرسبەینێ چادریان گوللەباران کرد. له کوردی شادی کەس نەکوژرا بەڵام له لەشکری قاجاڕ ئەسپی مەجیدخانی موکری کوژرا.

جەعفەر قولیخان چوو کەڵای سەفی ئاوای گرت و تەسلیم بەبەگلەربەگی محەمەدخانی برای سالاری کرد و بۆ خۆشی چووه مەشهەد.

لەولاوه محەمەد عەلیخانی ماکۆیی به ١٠ تۆپ و ٤ فەوج سەربازەوه ڕوو بەخوڕاسان چوو. دەستەسوارێکی کورد چوونه پێشی و لەگەڵ سپێدەدا بەدوژمنیان دا داسو گەلێک شەڕ و کوژتاریان کردن و گەڕانەوه و له ڕێگا تووشی لەشکری ئیبراهیم خەلیفەخان بوون و

لەگەڵ ئەوانیش شەڕ و کوژتاریان کردن و سەرکەوتن و بەتاڵان گرتنێکی زۆر گەڕانەوە. لەو دەمەدا حەمزە میرزا بەلەشکرەوە لە تاران گەیشتە لەشکرەکەی دیکە. سێ قۆڵ لەشکر ڕوو بەسالار و جەعفەر قولیخان چوون.

ڕەزا قولیخان کەوتە ئەندێشەوە، هەواداری پەیداکردن و دەستی بەخۆ کۆکردنەوە کرد. نایبولسەڵتەنە قایمقامی خۆی نارده کن نەجەف عەلیخانی کوردی شادی کە دڵخۆشی ڕەزا قولیخان بداتەوە؛ بەڵام بەفێڵ و چاپلووسی نەجەف عەلیخانیان لە ڕەزا قولیخان پچڕیەوە و بەپەنهانی گەلێک لە گەورە کوردەکانی کردە هاودەنگی خۆی و ڕەزا قولیخانی بێ هێزکرد.

ساڵی ١٢٤٨ نایبولسەڵتەنە بەبهانەی چوونە سەر هیرات لەشکرێکی قورسی سازکرد، سەری موحەڕەم لە دەری مەشهەد لەشکربەزی کرد، لە دوای شەش ڕۆژ ڕوو بەخاکی ڕەزا قولیخان چوو و دەستی بەگرتنی شار و کەلایانی کرد. کەلای «میراوە» کە یەکە بینا گەورەی ڕەزا قولیخان بوو، مانگێک لەتەکیا شەڕیان کرد، لە ٨ی مانگی سەفەردا جەعفەر قولیخان لە دووەمین ڕۆژ زۆر ترسا، زێڕ و گەوهەرێکی بێژمار و ١٤ ئەسپی سواری لە جێگایەکی توند پەنهان کرد و لەگەڵ سالار چوونە بەرابەری قاجاڕان و لە خاکی «ئەرمیان» لەشکریان ڕاگرت. گەورەکانی هوزارە و ڕادەگان و خوراسان لێیان جوێ بوونەوە و لەشکرەکەیان هەموو بەجارێک چوونە لای شازادە. قازیی نیشاپوور و سەرهەنگی تۆپخانە بەدەستەیانەوە پشتیان لە جەعفەر قولیخان کرد و چوون. جەعفەر و سالار بەناچاری ماڵ ومنداڵ و نەقدینەیان هەڵگرت و هەڵاتن. ژن و منداڵانیان لەنیو خێڵی شادیدا بەجێهێشت و بۆ خۆیان چوونە نێو تورکمانی ئاغاخان و «آق اوقلان ئان بەیگی» گەورەی ئەو خێڵە، ڕایگرتن.

کە ئەوانە هاتن، شازادە دەستی بەگرتنی خاک و کوژتنی ئەهالی کرد. میللەت وەرزبوون و بەپەنهانی کۆمەڵەیان بەست و لەگەڵ جەعفەر قولیخانا موخابێرەیان کردە ئەو زستانە بەسەر چوو؛ لە بەهارا جەعفەر قولیخان بەیارمەتی خێڵی تورکمان و فەوجێ بەیات -کە لە لایەن قاجارەوە لە خاکی [سملّقان] بوون- شکاندران و چوونە «بزونجرد». کوردەکانی شادی یارمەتیاندان و لەدوای گەلێک کوژتار و چەند شەرێک بزونجردیان گرت، بەڵام شەش مانگ شەڕکرا. لە دوایی چوونە سەر کەلای «خان» و گرتیان و گەلێک تاڵانیشیان دەست کەوت.

سالّی ١٢٦٣ جەعفەر قولیخان سرەخس و ئاقدەربەندی خستە دەست خۆی و بەلەشکرەوە چووە «کالّی قووتی» و ڕوو بەحەمزە میرزا کشا. سوارەی قاجارییان لە تۆپخانە پچڕیەوە و دەستیان بەکوژتاریان کرد. لەشکری شازادە زۆر کەمی ڕزگاربوو. لە هەموو لاییکەوە لەشکری قاجاڕیان وەتەنگ هێنا و پیچایانەوە و بردیانە نێو شاری مەشهەد. هەموو لەشاری مەشهەد خزاندران و کورد دەورەی حەمزە میرزایان لە ئەرکدا داو هەموو خاکی خوراسان کەوتە دەست جەعفەر قولیخان.

لەشکری قاجاڕ کە شاری مەشهەدیان دەورەدا، عولەمای مەشهەد فتوایان دا کە کوژتنی قاجاڕان دروستە. ئەهالی بەجارێک بوونە هەواداری کوردەکان و دوژمنی شازادە. شەڕ و کوژتار کەوتە نێوشار. ئەهالی دەستیان بەتالآنکردنی ئەنبار و جببەخانە و بارخانەی شازادە کرد، وە نزیک سالّێک شەڕ و کوژتار لە دەورەی شاری مەشهەد و لەنێو شاردا دەوامی کرد. لەودەمەدا محەمەد شای قاجاڕ مرد و ناسرەدین شا لەسەر تەخت دانیشت.

ئەگەر چی مەشهەد لە گرتن دابوو، بەلآم لەو وەختەدا سام خانی کوڕی ڕەزا قولیخانی زەعفەران لە ئەسارەتی تاران ڕزگاربوو و گەڕاوە خەبوشان. کوردەکانی خەبوشانی لەسەر خۆی کۆکردنەوە و بوو بەهەواداری قاجاڕ و دوژمنی سالار و جەعفەر قولیخان؛ چونکە لە وەختی خۆیا جەعفەر قولیخان و بابی لەگەلّ ڕەزا قولیخان بابی سامخان خەیانەتێکیان کردبوو و بۆ تۆلّە ئەستاندنەوە ئامادەبوو، ئەوە بەجارێک پشتی جەعفەر قولیخان شکاند و حکوومەتی کوردی شادی تێکدا.

جەعفەر قولیخان لەوە گەیشت کە سامخان تۆلّەی لێ دەکاتەوە، ناچار لە سالّی ١٢٦٤ مانگی موحەڕەم بۆ حاجی نوور محەمەدخان سەرداری سوپاهی قاجاڕی نوویسی و بەپەنهانی لەتەکیا ڕێککەوت و بۆ پاشە چەند ڕۆژ بناغەیەکی دانا کە تێدا نەچێت. بەهێز و توانای کورد و ئەهالی مەشهەد، لەسەری ئەو سالّەدا، یار محەمەدخانی ئەفغانی کە پشتیوانی حەمزە میرزا بوو لەگەلّ حەمزە میرزا مەشهەدیان بەردا و ڕوو بەهیرات هەلآتن. سالار و جەعفەر ٣-٤ قۆناغ کەوتنە دووایان و گەڕانەوە و مەشهەدیان خستە دەست و حکوومەتێکی جوانیان دامەزراند.

جەعفەر قولیخان بەلەشکرەوە چووە خەبوشان و نەیشاپوور. سلێمان خانی کوردی جوانشێر کە لە لایەن ناسرەدین شاوە ناردرابوو لەگەلّ جەعفەرقولیخان موخابەرەی کرد و ئەمینەتیشی دا -هەروەکو لەباسی جوانشێر گوترا- ئیتفاقێکی داپۆشراویان کرد.

قاجاڕ لە هەموو لایێکەوە دەستی بەلەشکر ناردن کرد، کوردەکانی خەبوشان لە جەعفەر قولیخن ڕوو گەردان بوون. جەعفەر قولی خان زۆر ترسا و لەسەر قسەی سەردار سوپاه و سلێمان خان -کە لەتەکیا کردبوویان- لەشکرەکانی کوردی هەمووی کۆکردەوە و بەبهانەی شەڕەوە لە سالار جوێ بوودەوە و هەستا چووە بزونجورد کە نەشتمانی پەتی بوو. لە «ڕوویین» لەگەڵ سلێمان خان یەکتریان دی و پێکەوە چوونە بزونجورد. ڕۆژی هەینی، یەکەمی ڕەبیعی یەکەمی ١٢٦٤ جەعفەر قولیخان لە بزونجورد دەرکەوت و ڕوو بەتاران چوو. سێ ڕۆژ لە پێش جەژنی نەورۆزا لە تاران دیدەنی ناسرەدین شای کرد و بەخەڵات و نیشان و بەرات دڵخۆشی دراوە (تەئریخ قاجاڕ، جلّد ٣، لاپەڕە ٥١٥).

جەعفەر قولیخان لەو ڕۆژەوە بوو بەمەئمووریکی قاجاڕان و سالار لە سەرکێشیی داماوە. جەعفەر قولیخان هەمیشە لە مەجلیسی خاسی ناسرەدین شا دادەنیشت. ساڵی ١٢٧١ بوو بەحوکمداری «ئوستراباد و جاجرم و نەروین». لەوێ گەلێک پەرای کرد و زۆر بەشەرەف و ناوداری ژیا و تورکمانی ئەو جێگایانە هەمووی ڕامکردن و خستنیە ژێر حوکمەوە.

بە درێژی حکوومەتی شادی و حوکمڕانی جەعفەر قولیخان و سەربهوردیان و سەربهوردی سالار و کوردەکانی خوراسان لە دوای جەعفەر قولیخان لە کتێبی ئێمەی «میللەتی کورد» دایە.

## ٢١- خان ئەبداڵ خانی کوردی بەختیاری

ئەو ناودارە زرینگە کوردە، سەردار خێڵی کوردی بەختیاری و سەردار سوپاهی زەندەکان بوو. بەشان و شەوکەت و ڕەشیدی ناوبانگی کردبوو.

ساڵی ١٢٩٩ شۆڕش کەوتە نێو حکوومەتی کوردی زەند، سەرکێشەکانی تورکمانی قاجاڕ، لە هەموو لایێکەوە کوردیان وەتەنگ هێنا. خان ئەبداڵ خان لە هەموو شەڕەکانی کورد و قاجاڕا یارمەتی کوردەکانی ئەدا. لە دووەمینی ئەو ساڵەدا تەقیخان لە دەست ئاقا محەمەدی قاجاڕ، گورفتار بوو، کوژرا. سەرکردەی شەریرەکانی قاجاڕ بەوە زۆر هەوادار و بەنەشەخوش بوون و دەستیان بەوەتەنگ هێنانی کوردەکان کرد.

خان ئەبداڵ بەلەشکرێکی قورسەوە کوردی گوڵبایەکان، فەراهانە و کوردی بەختیارییەوە ڕوو بەئەسپەهان چوو کە پێش بەدوژمن بگرێ. لە دێی «عەسکەران» لەگەڵ قاجارا تێکهالان و دەستیان بەشەڕ و کوژتار کرد. دوو شەو و ڕۆژان بەگەرمی کوژتاریان لە یەکتر

کرد. خان ئەبدالْ ناچاربوو کە سەنگەرەکانی بەردا و ڕوو بەچیا بەرزەکان بکشێتەوە. بەلەز گەیشتە چیاکانی ئەسپەهان. دوژمن دەستی لێ بەرنەدا و دەورەی دا و لە دوای گەلێک شەڕ و کوژتار، قاجارِ تەنگەی بەخان ئەبدالْ خان هەلْچنی. خان ئەبدالْ خان و چەند سەرهەنگ و گەورەی سوپاهی کەوتنە دەست قاجاڕان و سەریان بڕین. مالْ و ئەسپاب و چەکێکی قورسی کورد کەوتە دەست قاجاڕان. ئەوەی لە کوردەکانی بەختیاری مابوون کەوتنە چیاکان. ئیسماعیل خانی بەختیاری بۆ ئەمە فیتنە بکوژێتەوەو لەگەلْ ئاقا محەمەدخان ڕێککەوت، هەموو میللەتەکەی کۆکردەوە و پارازتی. (تەئریخ قاجارِ، جلْد یەک، لاپەڕە ٢٦ - ٢٧).

## ٢٢- محەمەد قاسم خانی کوردی پیرانوەند

ئەو پیاوە زۆر بەبیر و کوردپەروەر بوو. کە چاوی بەزولْم و جەوری قاجارِ و کوژتاری کورد کەوت، دلْگیربوو و کەوتە ئەندێشە و فیکری دەستە و دایرە پەیداکردن. چونکە خاوەند فەن و پیشە و هونەر بوو، بەئازای و زرینگی گەلێک کەسی بەناوی دین خستە ژێر فەرمانی خۆیەوە و موریدی زۆربوون. سەید ناو کوردێکی زۆر وریای کردە خەلیفەی خۆی و لەنێو میللەتدا چاوڕای پێ دەکرد. هەموو فیکر و تەدبیری بە«سەید» بوو؛ بەو دەستوورە گەلێک هێزی پەیدا کرد.

سالْی ١٢١٤ هەستا چووە (کاشان) و بەکیمیاگەر و زانا ناوبانگی خۆی بلاّوکردەوە. هەموو میللەتی شار و دەرەوەی کاشان بوون بەموریدی.

شازادە حوسێن قولی میرزای برای ئاقا محەمەدی قاجارِ لەوەدەمەدا حوکمڕانی کاشان بوو؛ بەنادیتە گورفتاری فەن و زانای محەمەد قاسم خان بوو.

محەمەد قاسم خان بۆ گەیشتنە دلْخوازی -کە تۆلْە لە قاجارِ کردنەوە بوو- داو و تەلْەیێکی زۆری بۆ شازادە داناوە کە تووشی کات. بەو واسیتەیە گەیشتنە یەکتر و محەمەد قاسم خان بۆ بەگژ فەتالی شا کردنی و هەوای حوکمداری هانیدا، گەورە پیاوەکانی کاشان -کە موریدی بوون -تێگەیاندران کە شازادە ببزوێن و بۆ حوکمداری بلْند کەن. لە دواییدا شازادەیان خستە سەر هەوەسێک ئەگەر محەمەد قاسم خان و سەید ئارەزوو بکەن، بەڕۆژێک هەموو خاکی ئێران دەخەنە ژێر حوکمی شازادەوە؛ بەلاّم محەمەد قاسم خان زۆر بەگرانی خۆی دەنواند.

سالْی ١٢١٥ و مانگی زیلحیجە بەهەزار تکا و خواهیشتی موریدان ڕێگا بەشازادە

درا کە بچێتە زیارەتی قاسم خان. تەئریخ قاجارِ، جلد یەک، لاپەرە ٦١ دەڵێت: شازادە لە بەرابەر محەمەد قاسم خان وەکو کۆیلە (بەندە) دەست بەسینە لەپێشی ڕادەوەستا. محەمەد٠قاسم خان بەشازادەی گوت لە قاجاڕان بەدخوا زۆرن. بەئیشارەتی ئەو هەمووی گرتن و چاوی کۆڵێن و حەپسی کردن و ماڵی گەلێکی تاڵانکردن، بەوە زیللەیەکی قورسی لە قاجاڕان دا.

محەمەد قاسم خان ئیشارەی بەشازادەدا چوونە سەر ئەسپەهان و گرتیان. مانگی ڕەبیعی یەک ١٢١٦ شازادە تەقیخانی برای حوسێن قولی میرزا بوو بەحاکمی ئەسپەهان. لە دوای ئەو شازادە و قاسم خان چوونە ئەسپەهان و حکوومەتێکی جوانیان دامەزراند. شازادە بوو بەپادشا و محەمەد قاسم خان وەزیری دەستە ڕاست، سەید وەزیری دەستەچەپ و سکە لە زێر و زیو و مس بەناوی حوسێن قولی لێدرا و لەسەر مینبەر خوتبەی بەناوی خوێندرا و چەک و پێویست و دانەوێڵە و لەشکرێکی قورسیان پێکەوەنا.

فەتالی شا لە تارانەوە لەشکری هەڵگرت و چووە سەر ئیسپەهان. شازادە بەمەشوەرەتی قاسم خان بۆ لەشکر کۆکردنەوە چوونە «سێلاوخوڕ» و نێو خێڵی پیرانوەند و باجەلان. حاجی جەعفەرخانیان کردە نایبولسەڵتەنە و لە ئەسپەهانیان دانا. محەمەد قاسم خان لە ڕێگا کە دەچوون بەشازادەی گوت بۆ میللەت وە دەستخستن و چاوترساندنی دوژمن نەوەکو ڕوو بەفەتالی شا هەڵێت و شۆڕش بخاتە نێو حکوومەتەوە. واچاکە شازادە محەمەد تەقیخان میرزای برات بکوژی، هەرچەندە هانی دا شازادە براکەی خۆی نەکوژت. لەولاوە فەتالی شا گەیشتە ئیسپەهان و وەتەنگی هێنا و دەورەی دا. «ئاقاجانی» قاجاڕ لە سێلاوخور و «محەمەد عەلیخان» لە بروجەرد ڕووبەڕووی شازادە ئامادەی شەڕ بوون. شازادە ڕوو بەخاکی «کەمەرە» چوو. قاسم خان لە ئیشی گەیشت کە پووچە، تەمای هەڵاتنی هەبوو؛ بەڵام شازادە گرتی و زنجیری کرد. لە دوای دوو ڕۆژ موریدەکان دزیانەوە، لەگەڵ سەید هەڵاتن و بۆی دەرچوون.

شازادەش گورفتاری دەستی فەتالی شابوو. فەتالی شا گەلێک لە کوردەکانی باجەلان و پیرانوەندی گرتن و کوژتنی و گەلێکیشی دووچار بەئیزا و «ئەزیەت» و تاڵان کردن .

## ٢٣- ئەسەدخانی کوردی بەختیاری

ئەسەدخان لە خاکی لوڕستانا بەحوکمڕانی ڕایدەبوارد و سەری بۆ هیچ کەس نەچەماند و بەسەربەخۆیی و ئازادی فەرمانڕەوایی دەکرد.

حکوومەتی قاجارِ شازادە محەمەد تەقی میرزای کردە حوکمداری لورِستان و بەختیاری و ناردیە پێشەوە. شازادە وەزیری خۆی میرزا عەلی کرایلی، ناردە کن ئەسەدخان کە رامی کات و بیخاتە ژێر پەنجەوە.

شازادە محەمەد عەلی میرزای حوکمداری عیراق لەلایێکی دیکەوە سندووقداری خۆی ناردە کن ئەسەدخان کە دڵخۆشی بداتەوە.

ئەسەدخان جوابی بەهەڕەشە دانەوە و هەردوو ناودارەکانی گرتن و حەپسی کردن.

ساڵی ١٢٣١ حکوومەتی لورِستان درا بەمحەمەد عەلی میرزا؛ ئەمیش لەشکری سازکرد و چووە سەر ئەسەدخان، لە کەلای «وزمیران» کە جێگای دانیشتنی ئەسەدخان بوو، بەدوو فرسەنگ دوور، لەشکربەزی کرد. چونکە کەلاکەی زۆر سەخت بوو. شازادە نەدەشیا بچێتە سەری؛ نەرمی نیشاندا. میرزا محەمەدی وەزیری خۆی ناردە کن ئەسەدخان کە نوازشی بکات.

ئەسەدخان چونکە دووربین و ئازا و زانابوو بەماملەت لەگەڵ شازادە رێککەوت؛ لە جێگای خۆی دامەزراوە. بەڵام لەژێر ئیدارەی قاجاران دەستی بەحکم فەرمایی کرد.

ساڵی ١٢٥١ بەهرام میرزا چووە سەر محەمەد تەقیخانی کوردی کنورِسی. جەعفەر قولیخانی کورِی ئەسەدخان بەگەورەکانی کوردەوە لە دیزفوول گەیشتە شازادە و گەراوە وزمیران؛ دووبارە حوکمرِانیەکەیان تەسدیق کراوە.

ساڵی ١٢٦٥ شازادە ئیحتشامو لسەڵتەنەی قاجارِ بۆ دامەزراندنەوەی بەختیاری و باجەلان لەشکرێکی زلی بردە سەر سنووری لورِستان و فەرمانێکی بۆ ئەسەدخان و مەنشوورێکی بۆ ئەهالی ناردن کە ئەسەدخان حوکمرِانی هەموو لورِستان و بەختیارییە و باقیرخان وەزیریەتی.

ئەسەدخان لەوە کەلێنی دەست خست و هێزێکی چاکی پەیدا کرد؛ بەڵام شازادە بەفرِوفێڵ رۆژ بەرۆژ دەستی سیاسەتی خستە ناو کوردستانی بەختیارییەوە.

ئەبراسیاب خان و قاسم خانی باجەلان و عەلی محەمەدخانی بەختیاری -کە یەکە پشتیوانی ئەسەدخان بوون- فریوی دان و بردنیە کن خۆی بەمیوانداری شەوێک، بەدەسیسەی گرتن و زنجیری کردن و هاوێژتنیە زیندانەوە. لە پاش ئەوە لینگی دا سەر خێڵەکانی کوردی مەمیوەند و زڵقی و بەختیاری و سەرلەک، هەتا سنووری چەمەنی فەتحاوای ئاژوت.

خوسرەوخانی کوردی سەرلەک پیاوێکی ڕەشید و زرینگ و کورد پەرست و ئازابوو، لەگەڵ هەموو گەورەکانی کورد یێک بوو. شازادە بۆ دیتن و گفتوگۆ لەتەکیا کردن، قاقەزێکی بۆ نارد، خەسرەوخان بەبێ ئەندێشە پەنجا سواری هەڵگرت و چووە کن شازادە و یەکتریان دی و لە گۆشەیەکی لەشکرگاهەوە، چادری خۆی هەڵدا.

شازادە دەسیسەی قاجاریەتی دامەزراند بوو، کە لەناکاو و لە وەختی میوانداریدا بیکوژن. خوسرەوخانیش بەئازایی خۆی دەخوڕی و لە نامەردی دوژمن نەگەیشتبوو.

ڕۆژی دووەم چووە کن شازادە. لەناکاو قاجارەکان بەسەریان دادا و لەنێو چادری شازادە میری دڵپاک و گەورەی کوردیان بەنامەردی گرت و زنجیری کرد و ناردیانە تاران. هەر بەو فێڵ و دەلەسەیە ناردبوویە دووی ئەسەدخان و ئەسەدخان لەنێو چادری خۆیا بەنامەردی لەو ڕۆژە، هەردووکی گرتن و بۆ تارانی بەرێکردن.

خان جان خانی بەختیاری و گەورەی خێڵی چوار لینگ کە لە ئازا و ڕەشیدانی بەناوبانگی کوردی چوار لینگ بوو، لە فڕوفێڵ و دەڵەسەی شازادە ئاگادارکرا و هەموو خێڵەکانی کۆکردنەوە و لە کەڵای «فەهرەنیک» خۆیان ئامادەکرد، کە پێش بەشازادە بگرن.

سشازادە چووە سەریان و دەست بەشەڕ و کوژتار کرا، لە یێکەمین هەڵمەتدا کوردەکان گەلێکیان لە شازادە کوژت. دووەمین جار هەژدە سەر و جەوادخانی سەرهەنگیان کوژت، سێ شەو و ڕۆژان شەڕ و کوژتار کرا. شازادە کەلای وەتەنگ هێنا. شەوی زیلحیجە، خان جان خان دەستە لەشکرەکەی لە کەلێنێکەوە لە کەلا دەرکەوتن و چوونە کەلای «عەلیاوا».

ئەهالی شاری فەهرەنیک داوای ئامانیان کرد، لەشکری قاجار زۆر بەدوڕندانە کەوتنە نێو شار و گەلێک ئەتک و سووکییان کرد و کەلاکەیان ڕووخاند. شازادە چووە سەر خێڵی کوردی «بەسحەنی». میللەتی بەسحەنی ژن و منداڵ و ماڵیان ناردە چیا بەرزەکان و پیاوەکانیش ڕوو بەشەڕکردن چوونە پێشەوە. دوو شەو و دوو ڕۆژان شەڕ و کوژتار کرا ٦٠ کەس کورد و ٣٠٠ قاجار لەو شەڕەدا کوژران.

## ٢٤- حاجی هاشیم خانی کوردی بەختیاری

ئەو پیاوە کوردە لە «لبنان ئەسپەهان» دادەنیشت. کوردی بەختیار زۆر لێی کۆبووبوونەوە و ڕۆژ بەڕۆژ هێزیان زۆرکرد و لەگەڵ سەرکەوتن خەریکبوون و میللەتی ئەو خاکەیان هەموو خستە ژێر فەرمانی خۆیانەوە. هەر حوکمدارێکی قاجار لە ئەسپەهان بەئارەزووی ئەوان

نەبزووتایەتەوە دەشیان عەزلی بکەن. ئەمینولدەولە عەبدوللاخان کچی حاجی هاشم خانی خواست.

میرزا عەلی محەمەدی کوڕی عەبدوللاخان سالّی ١٢٣٨ لە لایەن فەتالی شای قاجارەوە کرا بەحوکمداری ئەسپەهان. ئەو پیاوە بەناوی ئەمە کە خوارزای حاجی هاشم خان بوو، گەلێک تەقەلای دا کە فەرمانی خۆی بخاتە نێو ئەو میللەتەوە؛ نەشیا؛ بەلّکو ئەوان زیاتر دەست درێژیان کرد. میرزا عەلی محەمەد لە دەستیان شکایەتی کرد.

سالّی ١٢٤٠ فەتالی شا لەشکری بردە ئەسپەهان و چووە سەر حاجی هاشم خان. لە پاش شەڕ و کوژتارێکی قورس، مانگێک لەسەریێک، هاشیم خان بەدیل چوو. شای بێژراو هەردوو چاوی ئەو گەورە کوردەی لە خوتوخۆڕایی کوّلّی و کوێری کرد. ٥٠ هەزار تومەن زێڕی لە ئەمینولدەولە عەبدوللاخانی ئەستاند و میرزا عەلی محەمەدی لە حوکمداری خست. (تەئریخ قاجار، جلّد یەک، لاپەڕە ١٨٨).

## ٢٥- محەمەد تەقیخانی کوردی کنورسی بەختیاری

محەمەد تەقیخانی کوڕی عەلیخان، لە ئومەریانی بەختیاری بوو لە کەلای «تەل» بەسەربەخۆیی ڕایدەبوارد. حکوومەتی قاجار نەشیابوون سێبەری ڕەشی خۆیان باوێژنە سەری. حاکم و شازادەکانی قاجار خودا خودایان بوو محەمەد تەقیخانیان لێ نەئالّۆزێ.

سالّی ١٢٤٨ لەشکرێکی ٨٠ هەزار کەسی هەلّگرت و چووە سەر شوشتەر. ئەسەدوللّا میرزای قاجار نەشیا بەرابەری بکات و تەسلیمی بوو. محەمەد تەقیخان چوو دیزفوول و ڕام هورمزی گرتن. مەنسوورخانی بەهبەهانی و وەلیخانی مەمنی کردنە هاودەنگ و جەمال خانی دەشتیشی خستەژێر ئەمرەوە.

محەمەد تەقیخان مەئموورانی قاجاری لە خاکی خۆیدا دەرکردن و ئالای سەربەخۆیی هەلّدا.

سالّی ١٢٤٩ فەتالی شا، لەشکرێکی هەموایی لێکرد و هەموو خاکی ئێرانی لە محەمەد تەقیخان دەنگدا کە شەڕی لەگەلّ بکەن. هەموو شازادە و حاکم و لەشکر و سوپاهەکانی لە ئەسپەهان کۆکردنەوە؛ بەلّام مەرگ نەیهێشت بگاتە دلّخوازی [لە] ١٩ی جەمادی ٢ی سالّی ١٢٥٠ فەتالی شا لە ئەسپەهان مرد و نەشیا بچێتەسەر محەمەد تەقیخان.

محەمەد تەقیخان کە وایزانی دەستی بەشار و دێهات گرتن کرد و لە هەموو خاکی

پارسەوە، هەتا کاشانی خستە ژێر فەرمانی خۆیەوە و لەگەڵ پێویست و ڕێکخستن خەریکبوو.

ساڵی ١٢٥٠ بەهرام میرزای قاجارِ لە لایەن محەمەد شاوە کرا بەحوکمداری لوڕستان و کرماشان. میرزا هیدایەتی ئەردەلانی و سلێمان خانی گۆران و ٢٠٠ دووسەد سوارەی کوردی شکاک و تیپێک کوردی مەراغەی هەڵگرت و لە ڕێگای سابلاغ و موکریانەوە ڕوو بەسنە چوو. لەشکری سنە و گۆران و کەلهوڕ و ئەو کوردانەی بەسلێمان خان و میرزا هیدایەت کۆکردەوە و چووە سیروان و هەموو خێڵی کوردی لێ کۆبووەوە. عەبدوللا پاشای بابان چووە کنی و لەوێوە چووە کرماشان و محەمەد عەلیخانی موکری ناردە خوزستان کە لەشکری بۆ کۆبکاتەوە و ئەسەدوللا میرزای قاجاری بگرێت و بگەڕێتەوە. بەوجۆرە لەشکرێکی قورسی لە کورد کۆکردەوە و ڕوو بەلوڕستان چوو.

تەقیخان لەو لەشکرە ئەندێشەی پەیدا کرد. زۆر بەلەز لەگەڵ هێز پەیداکردن و لەشکرکێشی خەریکبوو. ساڵی ١٢٥١ بەهرام میرزا دەستی گەیاندە خاکی لوڕستان و وەلیخانی مەمەنیش -کە یێکە پشتیوانی تەقیخان بوو- لەناوی برد؛ هەروەکو لە باسی خۆیا دەگوترێ. وڵاتی فەیلی گرت و گەلێک گەورەی کوردی لەناوبردن. زۆر لە ناودار و سەرفرازانی کورد بەدیل ناردیانە تاران و گەلێکی کوژتن.

محەمەد تەقیخان کە تەماشای کرد دوژمن کورد بەکورد دەکوژێت، ناچار میرزا شەفیع خانی بەختیاری کە وەزیری بوو، ناردە لای کە مامڵەت بکات. لە دواییدا شازادەش میرزا ئەمین خانی کوردی عەلیاوای لەگەڵی خست و ناردیە کن محەمەد تەقیخان کە نەترسێت و ئەندێشە نەکات.

محەمەد تەقیخان چونکە لەگەڵ فەیلی و لوڕستان و خوزستان پێکهاتبوو کە یارمەتی بدەن، لەبەرئەوە پەیمانەکانی بەهرام میرزای نەویست. لە پاش نەورۆژ شازادە ڕوو بە محەمەد تەقیخان لەشکری برد. محەمەد تەقیخانیش ئامادەی شەڕبوو؛ بەڵام عەلی تەقیخانی برای ناردەکن شازادە کە پێک بێن و شەڕ نەکەن.

«ڕاڵنسن» ساحیبی ئینگلیزی کە سەردار سوپاهی شازادە بەهرام میرزا بوو، قەراری دا کە پێک بێن و جێگایەکی بۆ دانان کە یەکتر ببینن. شازادە بەهرام میرزا و ڕاڵنسن ساحیب، لە لەشکر دوورکەوتنەوە. محەمەد تەقیخان لەولاوە هات و لەو جێگایەدا یەکتریان دی. ڕاڵنسن هەموو قسەکانی تەقیخانی پەسندکردن و پێکهاتن.

بۆ سبەینێ ڕاڵنسن بە ٣٠ سوارەوە چووە کن محەمەد تەقیخان، شیرێکی گەوهەربەند و

کەوڵێکی سمۆرەی بەدیاری بۆ برد. سێ ڕۆژ لەوێ ماوەو و هەموو کێو و چیا و دۆڵ و دەرەکانی ئەو خاکەی دیت و گەڕاوە. محەمەد تەقیخانیشی لەگەڵ خۆی بردە لەشکرگای شازادەوە.

محەمەد تەقیخان ۲۲ ڕۆژ لەکنیان ماوە و ٤ پەیمانیان لەگەڵ کرد. محەمەد تەقیخانی چووە و شازادەش گەڕاوە دیزفوول.

لەسەر شکایەتی کوردەکانی بەختیاری و گۆران و زەنگەنە و مەمەنی و باجەلان و لوڕ، ساڵی ۱۲۵۳ ڕۆژی ١٤ی شەوال بەهرام میرزا لە حوکمداری کەوت و چووە تاران. مەنوچەهرخانی موعتەمیدولدەولە کرا بەمەئمووری سنووری هەردو عیراق.

لە ساڵی ۱۲۵۵ شاهرۆخ خانی کوردی حەوت لینگ کە حوکمڕانی «جانگی» بوو، لە قاجاران بڵندبووو چیا بەرزەکانی کردە سەنگەر و لینگیدا سەر شازادە و هەڵیبڕی و لە چۆمی کەرەندی پەڕاندەوە.

محەمەد تەقیخان لەولاوە لەشکری هەڵگرت و لە ئاوی کەرەند پەڕیەوە و بەگژ شازادەدا چوو، دەستی بەکوژتار کرد. ۱۵ شەو و ۱۵ ڕۆژان شەڕ و کوژتار بوو (تەئریخ قاجار، جلد ۲ لاپەڕە ۳۷۹).

پیاوانی هەردوولا کەوتنە ناوبژی؛ بەهەر جۆرێک بوو شازادەیان لە چنگ محەمەد تەقیخان ڕزگار کرد. محەمەد تەقیخان هەتا ساڵی ۱۲۵۷ لەشکری شەڕکەری بوو بە ۱۰ هەزار سوار و ۲۰ هەزار پیادە. لە بەندەری فارسەوە هەتا نزیک ئەسپەهانی خستەژێر فەرمانییەوە.

مەنوچەهرخان لە پایزی ئەو ساڵەدا بەبەفر و سەهۆڵ لەشکرێکی قورسی هەڵگرت و لە ئەسپەهان دەرکەوت و ڕوو بەلوڕستان ڕۆیشت. بەڵام قاقەزێکی بۆ تەقیخان نارد و داوای محەمەد کەریمخانیی برای کرد کە بۆی بنێرێت و قسەی لەگەلا بکات. لە دوای ئەوە قەراریان دا مەنوچەهرخان هەستا چووە کن محەمەد تەقیخان و لە کەلای «تەل» شەوێک ماوەو و گەلێکیان گفتوگۆ کرد. لەسەرئەوە کە لە بەهارا بچێتە شوشتەر و چاوی بەمەنوچەهرخان بکەوێت ڕێککەوتن و شەڕ ڕاوەستا.

لە بەهارا منوچەهرخان چاوەنۆڕی کرد، محەمەد تەقیخان نەچووە کنی. سەید محەمەد حوسێنی شوشتەری ناردەکن تەقیخان، سوێند و پەیمانی بۆ خوارد کە سبەینێ بباتە کن مەنوچەهرخان.

محەمەد تەقی خان هەستا چووە دەشتی «لە بهری» کە پێنج فرسەنگ لە شووشتەر دوورە، دابەزی کە منوچەهرخانی بچێتە کنی. منوچەهرخان نەیوێرا و پەیمان و مامڵەتیش تێکدرا.

ئەسەدخانی بەختیاری چونکە ڕقی لە محەمەد تەقیخان بوو، لەشکرێکی زلی کۆکردەوە و لەژێر فەرمانی جەعفەر قولیخانی کوڕی خۆیا ناردیە کۆمەگی مەنوچەهرخان. لە کوردی چوار لینگ و حەوت لینگ دیسان لەسەر مەنوچەهرخان کۆبوونەوە. عەلی ڕەزاخانی بەختیاری کە باوکی بەدەست تەقیخان کوژرا بوو، بۆ تۆڵەکردنەوە چووە کن مەنوچەهرخان، بەوجۆرە محەمەد تەقیخان زۆر بێ هێزبوو.

محەمەد تەقیخان کە لە کوردەکان نائومێد بوو، ناچار هاواری لە شێخ تامرخانی عەرەب گەورەی خێڵی «جەعب» کرد و کۆمەگی کرا.

مەنوچەهرخان قاقەزێکی لە شێخ تامرخان نوویسی کە لەگەڵ تەقیخان باوەڕبێنن و بۆ مامڵەتکردن سوێندی بۆ خواردن و سلێمان خان سەرتیپی ناردە کنی و خەڵەتاندنی.

شێخ تامرخان و محەمەد تەقیخان هەستان چوونە کن مەنوچەهرخان. محەمەد تەقیخان بەپەنهانی خرایە ژێر چاودێرییەوە و شیخ تامر ئیزن درا کە بڕواتەوە. کە گەڕاوە ماڵی خۆی ناموسی خێڵی شێخ تامرخانی بزاوت، زۆرچاک ماڵ و منداڵی محەمەد تەقیخانی بەخێوکرد و کوردەکانی ڕاگرت و پەنایدان. موعتەمیدولدەولە وەڵامی دایێ کە ژن و منداڵی تەقیخان تەسلیم کات؛ ئەویش وەڵامی (جوابی) نەداوە. لەسەرئەوە گەلێک شەڕ و کوژتار کرا و ئەو شێخە بەناموس و غیرەتدارە عەرەبە دەستی لە ناموسی بەرنەدا و چەند جاران لەگەڵ موعتەمیدولدەولە شەڕی کرد و ژن و منداڵی کوردی تەسلیم بەدوژمن نەکرد.

موعتەمیدولدەولە لە دوایی چووە سەر (فەلاحیە) و لە هەودوولا شەڕ و کوژتارێکی قورس کرا، لە ئاخیرا شێخ تامیر شکا و بەمامڵەت ڕای گرت و گرەوی دایێ کە پەیمانی خۆی بەجێ بێنێت. موعتەمیدولدەولە ڕوو بەشوشتەر گەڕاوە. تەقیخان بەکۆت و زەنجیر گیرا و ئیزاوی درا.

عەلی نەقیخانی برای مەحەمەد تەقیخان بۆ لابردنی فیتنە ژن و منداڵی برای هەڵگرت و لە فەلاحیە دەرکەوت. لەنێوان لەشکری قاجاڕ و عەلی نەقیخانا چەند شەڕ و کوژتاری بێژمار کرا.

محەمەد کەریمخانی برای و گەلێک لە گەورەی کوردەکان کوژران، بەڵام دوژمنی شکاند و کەوتە چیا بلّند و بەرزەکانەوە.

موعتەمیدودەولە دووبارە داوای ماڵی محەمەدتەقی خانی لە شێخ تامیرخانی کرد کە تەسلیمی بکا. شێخ تامیر تەسلیمی نەکرد، لەبەرئەوە موعتەمیدودەولە لەشکرێکی قورسی بردەسەری. لە دوای گەلێک شەڕ و کوژتار و خوێن ڕژانێکی زۆر، شێخ تامیرخان شکا و هەڵات.

خاکی فەلاحیە و لوڕستان و بەختیاری، هەموویان نزیک بەوێران بوون کران و بەجارێک تاڵانکران. ٥٩ دانە تۆپ و ٢ خومپارە و ١ قفز؟ و ٢ هەزار سەرە ئەسپ لە محەمەد تەقیخان گیرابووە لەگەڵ محەمەد تەقیخان بەزنجیرکراوی و ئیزاوەوە ناردرا تاران (تەئریخ قاجاڕ، جلّد ٢ لاپەڕە ٤٠٣).

ساڵی ١٢٥٨ عەلی نەقیخان لەگەڵ فەرهاد میرزا موخابەرەی کرد و لە مانگی جەمادا چووە کنی و لەوێوە ناردرا تاران.

ئەو حکوومەتە بچووکە کوردە بەشەرەفە، بەوجۆرە لەگەڵ حکوومەتی فەلاحیە، بەدەست قاجاڕان پووچ کراوە.

## ٢٦- وەلیخانی کوردی مەمەنی

وەلیخان لە وڵاتی شیرازا حاکمێکی سەربەخۆ و فەرمانڕەواییێکی بێ پرسیاربوو. خێڵی کوردی مەمەنی لەژێر ئەمری ئەو گەورە کوردەدا زۆر دەوڵەمەند و سەرکەوتوو بوون و بەجارێک وڵاتی شیرازیان خستبووە ژێر دەستەوە.

وەلیخان کەلایانی زۆر سەختی هەبوو، کە بەسەختترین ناوبانگیان کردبوو، یەک «گوڵ و گوڵاو» و دوو «سپید» کە باب وباپیریشی لە سەریان حوکمڕان بوون.

ساڵی ١٢٥١ محەمەد شای قاجاڕ لێی کەوتبووە فڕوفێڵان. مەنوچەهرخانی موعتەمیدولدەولە قاقەزێکی پەندامێزی بۆ نارد. وەلیخان بەچاکی پەسندی کرد و محەمەد باقیرخانی کوڕی خۆی ناردە کن مەنوچەهرخان. بەگەورەییەوە ڕاگیراو ڕائەسپاردرا کە بگەڕێتەوە بابی بنێرێتە کنی.

محەمەد باقیرخان کە گەڕاوە بەبابی گوت و لە فڕوفێڵی قاجاڕانی ئاگادارکرد.

وەلیخان ماڵ و منداڵی بردە کەلای سپید و خێڵەکەشی لە کەلای کۆڵ و گوڵا و

کۆکردەوە و باقیرخانی لەسەر دانان. وەلیخان چوو کەلای «نوراوا»ی توندکرد و پەلاماری دوژمنی دا. محەمەد تایەرخان و ڕەزا قولیخان و سەلیمخان -کە سەرکردەی لەشکری قاجاڕ بوون- بەدیل گیران و لەشکرەکەشی شپرزەکرا و کوژران.

موعتەمیدولدەولە لەشکرێکی قورسی لە ژێر فەرماندەی «وش»ی ساحیبی ئینگلیزی دا ناردە سەریان.

وەلیخان خێڵەکەی بردە سەر تۆقەسەری چیاکان و بەشەو پەلاماری دوژمنی دا. شەڕ و کوژتار دوو مانگ پایەداربوو؛ کورد هەر بەشەو شەڕی دەکرد.

موعتەمیدولدەولە وەتەنگ هات و داوای یارمەتی لە تاران کرد. محەمەد شا لەشکرێکی زلی بۆ نارد و قاقەزێکیشی بەهەڕەشەی بۆ نوویسی کە دەست لە وەلیخان بەرنەدات.

وەلیخان ئەسیرەکانی بەردان و ڕوو بەخاکی بەهبەهان چوو. موعتەمیدولدەولە کەوتە خاکی وەلیخانەوە.

خواجە حوسێنی گولاوی کە هاودەنگی وەلیخان بوو، کەلای گوڵی دا بەوەلیخان و ژن و منداڵی تێدا دانا و باقیرخانی کوڕی کردە پاسەوانییان و بۆ خۆشی بەسەرکێشی لەگەڵ وەلیخان بەشەڕ و کوژتار دەکۆشا.

موعتەمیدولدەولە بەهەزار شەڕ و کوژتار لەشکری گەیاندە بەهبەهان. خواجە حوسێن خیانەتی کرد و ٣٠٠ سەربازی بردە نێو کەلای گولاوەوە کە ئەو کەلایە بەسەر کەلای گوڵیدا زاڵبوو. سەرباز لە سەرەوە بەتۆپ و تفەنگ کەلای گوڵییان ئاورباران کرد و لە خوارەوەش موعتەمیدولدەولە بەلەشکرەوە دەورەی دا.

محەمەد باقیرخان مانگێک شەڕی کرد و لەو کەلایەدا ماوە و لە پاشان بەزۆر ژن و منداڵی وەلیخان و محەمەد باقیرخان هەرچیەکی لەو کەلایەدا بوو بەدیل کەوتە دەست قاجاڕان.

وەلیخان ناچار ڕوو بەخاکی کازرۆن هەڵات. لەشکری قاجاڕ کەوتە سەری. وەلیخان لەوێشەوە ڕوو بەشیراز هەڵات و لە گوندی «خانەزنان» شەوێک ماوە. ئیسماعیل خانی قەرەگۆزی قاجاڕ بەلەشکرەوە دەورەی دا و گرتی و بەزنجیر و پاڵەهەنگ ناردیە تاران (تەئریخ قاجاڕ، جلد ٢ لاپەڕە ٣٢٨) دەڵێت:

لەشکری موعتەمیدولدەولە بەکورد کوژتن گەڕاوە و هێندەیان کورد کوژتبوو لە کەللەی

سەری کوردانی مەمنی چەند منارە بیناکران و گەورە و سەرکردەکانی کورد چاوکوڵدران و لە دەمی تۆپ گرێدران و کا لە کەللەسەریان ئاخنرا. ئەو جەور و دوڕندەییە لە ساڵی ١٢٥١ دابوو.

حکوومەتی قاجارِ کوردی مەمنی هەموو دەربەدەرکرد و تورکمانی قەشقایی بردەسەر خاک و دێهاتەکانیان. کوردێکی لەو خاکەدا مابوون شەش ساڵ پێکوتی تورکمانیان خوارد. ساڵی ١٢٥٧ کوردەکان کۆبوونەوە و دەستیان بەتورکمان کوژتن کرد و لە هەموو لایێکەوە شیریان تێنان و نزیک پووچکردنەوەیان کردن.

فەرهاد میرزای قاجارِ حاکمی شیراز چووە سەر کوردەکان. بەشەڕ و کوژتار کەلای «تووس» و کەلای «مەوزەر» کەیێکە کەلا سەختەکانی کوردی مەمنی بوون گرتن و ڕوخاندنی و خێڵی «ڕۆستەم، بەکش، جاوی، دوژمنیار» کە هەریەک تیرەیەکی مەمنی بوون، گرتن و بڵاوی کردنەوە. «خان عەلیخان»ی سەردار خێڵیان هەڵات و چووە خاکی «ماهوور میلاسی». عەلی وەیسخانی برای خان عەلیخان و چەند گەورەیەکی کوردی لە دەم تۆپ گرێدان و کوژتن. لە خێڵی کوردی مەمنی «باوی، ئاجری، نووئی، یار ئەحمەدی» و گەلێکی دیکەی بارکردن و بەحاجی شوکرولڵاخاندا ناردنیە شیراز و بۆ خۆشی بەوێرانکردن و کوژتن و ئاوایی سووتاندن گەڕاوە شیراز. تەئریخ قاجارِ، (جلد دووەم، لاپەڕە ٣٢٦ - ٣٢٧ - ٣٢٨ - ٣٢٩). ئەو جەور و دوڕندەییە، بەئاخ و جگەرسۆزشەوە باس ئەکات.

ساڵی ١٢٥٨ خان عەلیخان لەگەڵ فەرهاد میرزا ڕێککەوت و بوو بەحوکمڕانی وڵاتی مەمنی.

خان عەلیخان کە بوو بەحوکمڕانی وڵاتی مەمنی، دەستی بەڕێکی و پێکی وڵاتی مەمنی کرد و ئەو کورد و خێڵاتە کوردە پەڕاگەندانەی گرد کردەوە (تەئریخ قاجار - جلد دووەم - لاپەڕە ٤٢٢).

لەو خێڵاتە کوردە ئەمڕۆکە لە «چانوخار»ی لە ئەترافی شاری سلێمانی و لە دێهات و مولکی شێخ مەحموود دا بەبڵاوی و لە دەشتی شارەزووردان.

## ٢٧- نەسیرخانی کوردی جودەکی (دلڤان)

نەسیرخان گەورەی کوردی دلڤان بوو. بەزرنگی و ڕەشیدی بێکە پاڵەوان بوو. لە حکوومەتی قاجاڕ ڕووگەردان بوو و دەستی بەشەڕ و کوژتار کرد.

ساڵی ١٢٦٧ گەورانی سجوعب» لەناکاو و بەنامەردی نەسیرخانیان گرت و دایانە دەست ئیلدرام میرزای قاجاڕ.

لەودەمەدا ناسرەدین شا لە ئیسفەهانەوە ڕوو بەلوڕستان دەچوو، نەسیرخانیان پێشکەشکرد. ئەویش بەزەنجیر و پاڵەهەنگ ناردیە تاران و براکەشی کردە گەورەی خێڵی دلڤان.

ناسرەدین شا، هەموو گەورە و سەردارەکانی دلڤانی گرتن و خستنیە زیندانەوە. کە ناسرەدین شا ڕۆیشت، خێڵەکان کۆبوونەوە و بەسەر لەشکری شازادەیان دادا و ٧ سەرباز و تۆپ ئەندازێکیان کوژت و لەشکری قاجاڕیان وەتەنگ هێنا.

ئیلدرم میرزای قاجاڕ ناچاربوو، بەندیەکانی بەردان ڕووبە بروجەرد گەڕاوە.

کوڕانی نەسیرخان لەشکرێکی چاکیان کۆکردەوە و چوونە سەر مامیان -کە لە گرتنی نەسیرخانا دەستی هەبوو- گرتیان و کوژتیان و هەموو خێڵاتەکەشیان خستە ژێر حوکم و فەرمانی خۆیانەوە (تەئریخ قاجاڕ، جلد سێیەم، لاپەڕە ٦١٥).

## ٢٨- بوداقخانی کوردی موکری

ئەو گەورە کوردە پاڵەوانە، لەنێو کوردی موکریان بەبوداق سوڵتان ناوبانگی کردبوو و بەعەدالەت و دادخواهی بەنەوشیرەوانی دووەم ناونرابوو. پیاوێکی میللەتپەروەر و دادخوا و تێگەیشتوو بوو.

ساڵی ١١٩٨ لەگەڵ حکوومەتی زەندا ڕێککەوت و بەموستەقیللی ڕایبوارد. لەو ساڵەدا لەتەک عەلی مورادخانی زەند ڕێککەوت و ئەمارەتی موکریانی خستەوە دەست. هەر لەوساڵەدا جەعفەر قولیخانی برای ئاقا محەمەدی قاجاڕ چووە سەر موکریان. بوداقخان بەهێزی کوردەکانەوە پێشی پێگرت و لە دوای شەڕ و کوژتارێکی قورس قاجاڕی شکان.

ساڵی ١٢١٠ ئاقا محەمەدی قاجاڕ موخابەرەی لەگەڵ بوداقخان کرد و ئەمارەتی موکریانی بۆ تەسدیق کرد.

سالّی ١٢١٣ فەتالی شاش حکوومەتی بوداقخانی تەسدیق کرد و گەلێک پیاوانی گەورەی کوردی موکریان کەوتنە سوپاه و دەوائیری قاجارانەوە. مەجیدخانی موکری بەسەرهەنگی بوو بەسەرکردەی لەشکر. ئیسماعیل ئاغای دێبوکری لە دیوانی پادشاهیدا بوو بەیاساولّ. سالّی ١٢٢٦ حکوومەتی قاجار، تورکمانی قەرەپاپاقیان لە دەشتی سندوس دامەزراند. خێلّی بلّباس لینگیاندا سەر قەرەپاپاقەکان و گەلێک کوژتار و تالانیان لێکردن و هەتا چوونە سائین قەلا بەقاجار کوژتن رۆیشتن.

بوداقخان لە نایبو لسەلّتەنە عەباس میرزای نوسی: لەشکرێکی قورسی لەژێر فەرمانی ئەحمەدخانی کوردی مەقدەم و عەسکەخانی هەوشاریدا نارده سەر بلّباسەکان. لە پاش گەلیک شەڕ و کوژتار بوداقخان بەمامڵەت رێکی خستنەوە.

سالّی ١٢٣١ دووبارە خێلّی بلّباس بۆ قاجار کوژتن لە چیاکان چوونە خوار. بوداقخان نەشیا پێشیان پێ بگرێت، بۆ نایبو لسەلّتەنەی نوسی کە کۆمەگی بکا. ئەویش ئەمیرخانی خالّی خۆی و جەعفەر قولیخانی مەراغەی بەلەشکرەوە نارده هاواری بوداقخان. پێشیان بەخێلّ گرت و شەڕ و کوژتاریان گەرم کرد و لە هەردوو لاوە نزیک ١٠٠٠ کەس کوژران. بلّباس زۆر پیاوانە بزووتنەوە و ڕوو بەچیاکان گەڕانەوە (تەئریخ قاجار، جلّد یەک، لاپەڕە ١٤٩).

بوداقخان لەژێر ئیدارەی قاجاراندا زۆرچاک حوکمڕانی کرد و کیشوەرەکەشی لە شۆڕشی قاجاران پارازت.

## ٢٩- سەردار عەزیزخانی موکری

عەزیزخان لە بنەماڵەی «بابامیر»ی کوردی موکریانە؛ لە دێی «وەستان» و لەنێو گەورک و لە نزیک شاری سەردەشت هاتۆتە دونیاوە و لە دەوری یێکەتی بوداقخان لەگەلّ قاجارانا، عەزیزخان چووە تەورێز و بەسوارچاکی و ڕەشیدی و زرینگی ناوبانگی کرد. میر نەزەر عەلی حەکیمباشی زۆری خۆشویست و خستیە ریزی نیزام و سوپاهی قاجارەوە. بەهونەر و دلێری خۆی زۆر زوو سەرکەوت و بوو بە«سەرهەنگی نیزامی».

سالّی ١٢٥٣ لە شەڕی قاجار و ئەفغان لە دەوری هیرات، یار محەمەدخانی ئەفغانی پیاوێکی خواست کە گفتوگۆی مامڵەتی لەتەکا بکا. حکوومەتی قاجار عەزیزخانیان هەلّبژارد و ناردیان و بەکەم مووددەتێک ڕێکی خستن. عەزیزخان گەلێک پەرای کرد و بەناوبانگ بوو، ڕۆژ بەڕۆژ دەکەوتە بەرچاوان.

سالّی ١٢٦٣ بۆ دامەزراندنەوەی شۆڕش، عەزیزخان لە ژێر ئەمری حوسێن خانی ئاجوودانباشی کە کوردی گەڕووس بوو، چووە خاکی شیراز. ئەهالی شیراز لە حوسێن خان دڵگیربوون و دەستیان بەسەرکێشی و سەرباز کوژتن کرد. عەزیزخان زۆر بەدلێری و زانایی پێشی بەو فیتنەیە گرت. لە سالّی ١٢٦٤ و شەشی شەوال ڕۆژ بەڕۆژ دوژمنەکانیان بەهێزبوون و عەزیزخانیان دەورەدا و شەڕ و کوژتار زۆر دەوامی کرد. ئەهالی هێزیان گەیشتە ٢٠ هەزار شەڕکەر. عەزیزخان ٥٠ سەربازی پێ مابوو و هیدیکە بەخاوەند مەنسەبانەوە تێکەڵ بەئەهالی بوون. عەزیزخان وەکو شێر بەدوومانگ ئەو هێزەی شکاند و ئاسایشی بەشیراز دا.

لەودەمەدا محەمەد شای قاجارِ مردبوو؛ ناسرەدین شا لەسەر تەخت دانیشتبوو، میر تەقیخانیش ببوو بەئەمیر نیزام کە یێکە خۆشەویستی عەزیزخان بوو، زۆرچاک باوەڕی بەعەزیز خان هێنابوو و لەکن ناسرەدین شا زۆری پێ هەڵگوتبوو و بەپەسندیی خستبوویە پێشەوە. ناسرەدین شا، هەرچەندە بەئەمیر نیزام باوەڕی کردبوو، بەڵام کۆشەوە و ئازایی عەزیزخان لەشەڕ، هێندەی دیکە نیشاندابوو، بەم شیعرە فارسییە خواستیە تاران:

عزیزا بیا تا عزیزت کنم

همه أهل ایران کنیزت کنم

عەزیزخان بەلەز ڕوو بەتاران لە شیراز دەرکەوت و سەری مانگی موحەڕەم ١٢٦٥ گەیشتە تاران.

ئەمیر نیزام هەموو ئومووری نیزامی تارانی خستە ژێر فەرمانی عەزیزخانەوە و ڕوتبەی ئاجوودانباشی لە شا بۆ وەرگرت و بەلەز بۆ پێشەوەی بڵندکرد.

وەلیعەهدی ڕووس چووبووە ئێرەوان. ناسرەدین شا نیشانە و خەڵاتێکی شایانی سازکرد و عەزیزخانی بەسەفارەت ناردە ئێرەوان و کە گەیشتە زەنگان فیتنە و شۆڕشێکی قورسی «بابی» کەوتبووە زەنگان.

عەزیزخان بۆ دامەزراندنەوەی ماوە و ناردی عەلیخانی کوڕی خۆی -کە سەرهەنگی تیپی تەورێز بوو- میرزا حەسەنخانی وەزیرو لنیزام کە برای ئەمیر نیزام بوو، بردنیە زەنگان و ئومووری بۆ ڕێکخستن و فیتنەی کوژاندەوە و چووە ئیرەوان. لەسەر چۆمی ئاراسەوە پێشوازی کرا و بەئیحترامەوە گەیشتە ئێرەوان و دیاری و پێشکەشەکانی بردە کن وەلیعهەد ئەلگساندەر. بەگەورەییەوە پەسندکرا و لە خوسووس کوردستان و موکریانەوە

ئیتفاقێکی سری گرێدا و گەڕاوە تەورێز.

ئومووری سەر بەتەورێز و مەراغەی ڕێکخست و ڕوو بەتاران [گەڕاوە]. لە لایەن ناسرەدین شاوە پێشوازی کرا (تەئریخ قاجارِ، جلّد ٣، لاپەڕە ٥٥٩ - ٥٦٣).

ساڵی ١٢٦٧ ناسرەدین شا چووە ئیسپەهان و عەزیزخانی کردە مەئمووری ئینتیزامی پایتەخت و بەخێوکردنی ئەرک. لە مانگی زیلقەعدەدا لەگەڵ ئەو مەئمووربیەتە خەریکبوو، سوارەی کوردی موکری، سابلاغ، کەرەند، کەلهوڕ هەوشاری کردنە پاسەوان و عەلیخانی کوڕی خۆی لەسەردانان و زۆر بەتوندی لەگەڵ وەزیفەی خەریکبوو.

ناسرەدین شا کە گەڕاوە، عەزیزخانی کردە سەرداری کوللی عەساکری ئێران. بەشیر و حەمایلی گەوهەربە.. خەڵاتی کرد. ئەو ڕوتبەیە هەتا ساڵی ١٢٧٤ ڕۆژ بەڕۆژ لە بڵندتر دابوو. لەوساڵەدا کاری سەدرولئەعزەم کەوتە عوهدەی میرزا ئاقاخانی ئیعتیمادودەولەوە، کە لەوەپێش دوژمنی سەردار عەزیزخان و ئەمیر نیزام بوو. میرزا ئاقاخان دەستی بەموفسیدی و بەدخواهی عەزیزخان کرد و بەچەند مەتەڵەی موهیمی سیاسی ئیتیهامی کرد. دووەمین توهمەتێکی ئەوەبوو کە گۆیا لەگەڵ ڕووس ئتیفاقی هەبووە کە بۆ کوردەکان کارێک بکات و لەبەر سوننیەتی لە ئیدارەی شیعە بێزاری تەمای ڕزگاربوونی هەیە و کورد لە ژێر پەنجەی تورکان دەرخات و لەگەڵ وەزیر موختاری ئینگلیزدا بەپەنهانی ڕێککەوتووە کە کوردستانی ئاورپایەگان و لوڕستان بکەنە یەک پارچە و لەژێر حوکمی قاجارانی دەرخەن و وەکو ئەفغانستان ئیدارەی بکەن.

بەڵام تەئریخی قاجارِ جلّدی ٣ لاپەڕە ٧٣ دەڵێت: لە هەموویان زیاتر مەبەست لە لابردنی عەزیزخان ئەوەبوو کە حیشمەت و گەورەیی سەدرولئەعزەم بەوجودی عەزیزخان پەست بوو و میرزا ئاقاخان لە پێشگاهی پادشا بێ ڕەواج بوو. ئەو لاپەڕەی تەئریخە زۆر بەدرێژی حەللی کردووە کە جگە لەوە کە عەزیزخان کوردێکی ئازا و زرینگ بوو، لەگەڵ وەزیفەی خۆی ڕاست بوو، لە دەوری ئەودا فڕوفێڵی ئاغاخان سەری نەدەگرت، چیدیکە نەبوو.

ڕۆژی ٢٠ی شەوال ساڵی ١٢٧٤ لە سەرداری کوللی عەزل کرا و لە پاش چەند ڕۆژان ڕوو بەبۆکانی موکری لە تاران دەرکەوت. هەتا ئەمڕۆکەش بەناوی سەرداری عەزیزخانەوە گەلێک ئاساری لە تاران و شارەکانی ئێرانا هەرماون. چار ڕاهی عەزیزخان لە تاران ئەمڕۆکە بەو ناوە مەوجوودە.

بەکۆمەگی یەزدان تەواو بوو

## میللەتی کورد

* مـێـژوو (تأریـخ)ی تیـرە و ڕەگـەزی کـورد، لە عـەسـری پێـنجـەمـینی مـیـلادەوە، هەتا ئەمڕۆ. سەربهـورد و کردەوە و ژیان و تێدا چوونی هەموو پادشا و فەرمانڕەوا و میـر و زانا و تێگـەیشـتـوو و بوێژ و نـوویسـەر و مـێـژوویینـی کـورد. بە١٢ بەرگ پەرتووک (کـتـیب) نـوبسـراوەتـەوە. بـەرگـی ١٠ - ١١ -١٢ بـەوێـنـە ڕازاندراوە. بۆ چاپکـردنـی چاوەنۆڕی یارمەتی کورد پەرستەکانین.

* هەر دانەیێکی پەڕتووکی (ناودارانی کورد) یەک ڕوپیەیە.

# ئاوڕێکی پاشەوە

بەرگی دووەم

## جزمی سێیەم

پادشایانی بنەماڵەی عەلی گچکە و چەند ئەمیرێکی دیکە لە هەولێر

## پێشەنگ

# هەولێر - هۆلێر یاخود (اربیل - آربیل)

## مێژوویی و هەڵکەوتی جوگرافیای

قەڵای هەولێر، قەڵاییێکی قایم سەخت و چەند هەزار ساڵییە، مێژووی ئەو زۆر لە پێش میلادە، کوردەکانی گۆڵشەنییەکان قسی سیترو دایمەزراندووە و لە هەموو گەڕێک (عصر)دا هەمیشە ناوچەی کێش و ئاینی میللەتی کوردان بووە، پەرستشیانەی (هور - خووا) لەوێ بوو، لەبەرئەوە بەهەولێر ناوبانگی کردووە، لەبەر شەڕی ئەسکەندەری گەورە و شکەستەی دارای سێیەم کە دوای حوکمداری کوردەکان (مادی) بووە، هەولێر لە کتێبانی ڕۆژهەلات و ڕۆمییەکاندا زیاتر ناوبانگی کرد. هەولێر لە گەڕی کوردەکانی قسیدا لە تەرەف یوزئاسپی حەکیمەوە کە پەرستشیانەییێکی بەدەزگایەکی قورسەوە تێدا هێنا وەجوود، زیاتر ڕەونەق ئەفزا بوو، هەر کەسێکی ئاینی مەئاوای هەبووبێ بۆ پەرستش دەچوونە هەولێر، لە چاغی حوکمداری ئەردەشێری بابەگاندا کە یێکەمین پادشایانی ساسانییەکان بوو، ئاردیۆراڤی حەکیم کە کوردێکی زانا و تێگەیشتووی شارەزوور بوو، کتێبی زندە ئەڤێستای سەر لە نوێکە نوسیییەوە و کتێبی (ئاروی ویراڤنامە)ی بەکوردی لە هەولێر دامەزراند، بەکۆشەوەی ئەو حەکیمە کوردە و بەهیمەتی پادشاییێکی وەکو ئەردەشێر، هەولێر زۆر چاک ڕووی لە ئاوابوون و گەورەیی کرد. لە دەستپێکردنی ئیسلامییەت و پەلاماری ئەسحاباندا، هەولێریش وەکو شارەکانی دیکەی کوردستان، دووچار بەگەلێک زیللەتی قورسبوو، ئەهالییەکەی هەموو دەربەدەر و پەرێشان کەوتن و شارەکە وێران و خراپ کرا. لەبەر ئەوە شاری هەولێر لەو دەمەدا لە جێگای شار و قەڵای ئێستا نەبووە، لە ڕۆژاوای شاری ئێستا بەسێ سەعات دوور، واقیع ببوو، وێرانەکانی و تەپە و کۆنە خراپەکانی ئێستاکەش شاهیدی دەدات کە گەلێک جار لەو جێگا کۆنانە چتی بەقیمەت و ئاساری پێشینی تێدا دۆزراوەتەوە، تەپە و جێگا و کاولەکانی لێمان ئاگادار دەکا کە: شارێکی زۆر زل لە ژێر ئەو خاکەدا بێ!

هەولێر ٨٠ کیلۆمەترە لە شەرقی جنووبی مووسڵەوە و ٧٥ کیلۆمەترە لە شیمالی غەربی کەرکووکەوە، لە نێوەڕاستی دەشتێکی گەورە و پان لە نێوان هەردوو چۆمانی (زێ - زاب)دا واقیعە، یاقووت حەمەوی لە مەعجەمیدا دەڵێت: درێژایی هەولێر ٦٩ دەرەجە و نیوە، پانایی ٣ دەرەجە و نیو سێ یەکێکە. بوستانی لە (دائره المعارف)دا دەڵێت: هەولێر قەڵاییێکی زۆر سەخت و شارێکی زۆر گەورەی هەبوو، قەڵاکەی هەر چوار دەوری خەندەقێکی پان و قووڵ و پڕ لە ئاوی هەبوو، دیوار و شوورەی شار کە لە ئەترافی شار دروست کرابوو، لە نزیک پشتی شەقڵاوەوە یەکدەکەوتنەوە. قەڵاکە لە سەرتەپەیەکی گەلێک گەورە لە خۆڵ و سەرتەپەیەکی پان و بەرین دامەزراوە. لەنێو ئەو قەڵایەدا بازاڕ و دوکان و قەیسەری و خانووبەرەی چاک و جوان بۆ رەعیەت، مزگەوت بۆ نوێژ و (گەرماوە - حمام)ی تێدایە، ئەم قەڵایە گەلێک لە قەڵای حەلەب دەچێ، بەڵام ئەو گەورەتر و بڵندترە.

شەمسەدین سامی لە (قاموس الاعلام)یدا دەڵێت: هەولێر دوو گەڕەکە، یەکێک لەسەر قەڵا و دووەم لە بەردەمی قەڵاکەیە، گەڕەکی بەردەمێ قەڵا چوار پێنج ئەوەندەی گەڕەکی نێو قەڵایە، هەرچێکو شاری خوار قەڵایە، ئەمیر موزەفەرەدین کۆک بەری بینای کردووە، بازاڕ و خان و مزگەوت و خانووبەرە و خانەقا و مەدرەسە و میوانخانە و تیمچەیەکی زۆری تێدا دروست کرد، شوورە و دیوارێکی پان و بڵندی بەدەورەدا کێشا و لەگەڵ قەڵا لێکی داوە. بوستانی دەڵێت: ئەمیر موزەفەرەدین بەگەورەکردنەوەی شاری هەولێر و شوورە بەدەوریدا کێشان، شان و شەرەف و شەوکەتێکی هێندە زلی پەیدا کرد، لەگەڵ حوکمدارەکانی دەوروپشت و سوڵتانەکان ڕقەبەری دەکرد، پادشاکان لە لێقەوماوی پەنایان بۆ دەبرد و ئیفتیخاریان پێوە دەکرد لە هەموو حوکمدارەکانەوە سوفەرایانی دەچووە لای و لە هەموو لایێکەوە بازرگان و خاوەند سەروەتن دەچوونە لای و دادەمەزران، زۆری پێنەچوو لەبەر عەدالەت و دادخواهی ئەو ئەمیرە چاکە و پیاوەتی ئەو، هەولێر بوو بەشارێکی زۆر زل لە ڕۆژهەڵاتدا و بوو بەپایتەختێکی گەورەی کوردستان و بەدەوڵەمەندی و جوانی ناوبانگی بەهەموو ئاواییێکی دونیادا بڵاوبووە، لەگەڵ ئەوەش دێهاتەکانی لەبەر گەورەیی ببوون بەقەسەبچەییێکی زلە و نفووسی زۆر زیاد ببوو، لە کڕین و فرۆتن و چاندندا لە هەموو پارچەییێکی حوکمدارەکانی کورد بەقازانجتر بوو، ئەهالی و ڕەعییەت ، سوپاهی و سەرکردە و مەئموورەکانیشی کورد بوون، حکوومەتێکی کوردان بوو لە خاکی کوردستاندا.

(ابن الاثیر) لە (التاریخ الکامل)دا دەڵێت: هەولێر چەند قەڵاییێکی زۆر قایمی وەکو

(خفتیزەکان - خفتیسکان) لە چیا و کێو و دەشتدا هەبوو، هەریێک لەو قەڵایانە بەسوپاه و ئەمیرێکەوە قایم کرابوون و لە وەختی پێویستدا لە هەولێر ئامادە دەبوون.
یاقووتی حەمەوی دەڵێت: هەولێر دار و باغ و باغچەی نەبوو، بەری داری لە چیاکانی شیمالییەوە بۆ دەچوو، هەموو چاندنیان بەئاوی کارێز و چاڵاوە، بۆ خواردنەوەش لە ئاوی کارێزیان وەردەگرت، ئاوی کارێز و چاڵاوانی زۆر خۆش و بەتامە و سووکە، لەگەڵ ئاوی زێ و دەجلە و فورات فەرق ناکرێن، بەڵکو لە ئاوی زێ و دەجلە بەتامترن.

## بەندی یەکەم

## سەربهوردی ئەمیر عەلی گچکەی کوڕی بەگتەگین

## (٥٠٠ - ٥٦٣ ھ)

بنەماڵەی حوکمدارەکانی کوردی هەزبان چەند ساڵێک لە کوردستاندا سەربەخۆ فەرمانڕەواییان کردووە، نەکەوتنە ژێر باری بیانیانەوە، بەڵام لە دەوری ئەمیر ئاقسەنقەری زەنگیدا، بەگتەگین خێوی هەولێر لە دەستکەوتبوو، عەلی گچکەی کوڕیشی نەوەشیا لەگەڵ ئومووور خەریک بێ، کەمکەمە نزیک بەنەبوون ببوون. ئەمیر عەلی کە بەگچکە ناوبانگی کردووە لەگەڵ ئەمیر ئاقسەنقەردا وەها ڕێککەوت، بەشەرتی هەولێر بەرە بەرە بدرێتەوە عەلی گچکە. لەبەر بێ دەسەلاتی بەگتەگین، ئەمیر عەلی کەوتە ڕیزەی ئەمیرێکی ئاقسەنقەر لە سوپادا. ئەمیر عەلی لەگەڵ ئاقسەنقەر وەها ڕێککەوت و خەزمەتی بەڕاستی بۆ دەکرد کە هەموو کەس قینیان لێ دەبووەوە، بەڵام بەرەغمی دوژمن خۆی پێشخست و لە یەکە ئەمیرانی ئاقسەنقەر دەهاتە ژماردن. کە ئەمیر ئاقسەنقەر نەما عیمادەدین زەنگی بوو بەئەتابەگ، ئەمیر عەلی گچکە زیاتر کەوتە بەرچاوان و خۆشەویست بوو، ڕووی لە زیادبوون کرد و ڕۆژ بەڕۆژ ئازایی و زرنگی لەنێو چاوانیدا دیاری دەکرد، لە کار و پیشە و شەڕدا خۆی دەنواند.

ساڵی ٥٣٦ خەلیفەی عەباسییان ڕاشیدبیللا لە دەست مەلیک مەسعوودی خێوی هەمەدان کەوتە تەنگاییەوە، زەینەدین عەلی گچکە بەسوپاهی هەولێرەوە لەگەڵ ئەتابەگ عیمادەدین چووە بەغدا و کۆمەگی خەلیفە بکات. سولتان مەسعوود کە دەورەی بەغدای دا تەماشای کرد حوکمدارانی کوردستان کە زەینەدین عەلی گچکەی خێوی هەولێر و عەلائەدین کوڕی ئەحمەدێل خێوی مەراغە بەلەشکری کوردی مەراغەوە و ئەمیر عیسا حەمیدی خێوی ئاکرە و شووش و دەوروپشتی بەسوپاهی کوردی زێبار و حەمیدییەوە و ئەمیر ئەحمەدی کوڕی ئەبیهەیجای کوردی هەکاری بەلەشکری کوردانی ئەشب و جزیرە و نووشییەوە یاریدەدەری خەلیفە دەدەن، تەمای سوڵحی کرد و ئومەراکانی کورد ڕازی نەبوون و بۆی دەرکەوتن و بەپەرێشانی دەربانکرد و بەکەیفەوە گەڕانەوە و ڕوویان کردەوە

کوردستان. عەلی گچکە لەگەڵ عیمادەدین زەنگی چووە سەر شارانی ئورفە و بیرەجگ و نسێبین و سەرین چاوە - رأس العین - لەتەک فرەنگدا شەڕ و کوشتاریان کرد و ئەو جێگایانەیان خستە ژێر حوکمەوە، لەو دەمەدا کە لە دەوروەی بیرەجگ بوون، مانگی زیلقیعدەی ساڵی ٥٣٩ه نەسرەدین چقر والی مووسڵ کوژرا، عیمادەدین لەوە ترسی لێ پەیدا بوو، لە پشێوی کوردستان ئەندێشەناک بوو کە نابادا دووچار بەسەر کێشی ببن. ئەمیر عەلی گچکەی کوردی هەولێری کە لەلای بەپیاوێکی زرنگ و ئازا و بیرتیژی خۆی نواندبوو و لەنێو کوردستاندا ناوبانگی هەبوو، عیمادەدین لە هەموو ئومەراکانی زیاتر خۆش دەویست و ئیعتمادێکی تەواوی پێ بوو و ئەمنیەتی لێ حاسڵ کردبوو، لەبەرئەمە کە عەلی گچکە چاتر لە ئوموری کوردستان ئاگادار و بەشەهامەت بوو، کردیە ئەمیری جەیش و نایبی خۆی و والی مووسڵ و بەزەینەدین لەقەبی کرد و ناردرایەوە مووسڵ. کە گەیشتە مووسڵ بەلەز قەڵای خستە دەست خۆی و لەشکر و سوپاهی ڕێکخست و دزدارێکی باوەڕ پێهاتووی لەسەر قەڵا دانا و چووە نێو شار و دەستی بەدامەزراندنی ئەهالی و شار کرد و مەیدانی شۆڕشی لە کەلێن دانیشتووەکان گرێ دا و دەستی بەحوکمداری و مەملەکەت ڕازاندنەوە و دڵخۆشی ئەهالی دانەوە کرد و هەموو ئومورێکی عیمادەدینی هێنایە ژێر پەنجەی خۆیەوە.

ساڵی ٥٤١ عیمادەدین لە قەڵای جوعبر کوژرا، مەلیک ئەرسەلانی کوڕی سوڵتان مەحموود تەمای لە موڵک و خاکی زەنگی کرد. سەیفەدین غازی کوڕی زەنگی لەسەر شارەزوور دانیشتبوو، زەینەدین بەلەز ناردیە دووی غازی حوکمداری شارەزور لە مەسەلەی مەلیک ئەرسەلان ئاگاداری کرد و خواستییە مووسڵ، لەولاشەوە چوو پێشی بەلەشکری ئەرسەلان گرت، جەمالەدین وەزیری مەلیک ئەرسەلان کە سەرکردەی سوپا بوو دەردەستی کرد و خستییە زیندانەوە. سەیفەدین غازی کە گەیشتە مووسڵ زەینەدین ئەوی بەحوکمدار قەبووڵ کرد و هەموو مەملەکەت و خەزینەی تەسلیم کرد، سەیفەدینیش زەینەدین عەلی گچکەی کردە ئەمیری جەیش و نایبی خۆی لە موڵکدا و بەوالی مووسڵی دانا.

زەینەدین دەستی بەڕێکوپێکی ئوموری کیشوەر و سوپا کرد و ڕۆژ بەڕۆژ بۆ گەورەبوونی سەیفەدینی دەکۆشا، هەر لەو ساڵەدا جۆسلین حوکمداری فەرەنگ لە ئورفە خزا و ئاڵای سەرکێشی لە سەیفەدین هەڵدا و دەستی بەخراپە کرد. زەینەدین بەسوپاهێکی قورسەوە چووە سەری. بەڵام لەولاوە شەهید خێوی حەلەب پێشدەستی کرد و لینگیدایە سەر (رەهە) و گرتی و تاڵانی کرد. زەینەدین کە وایزانی گەڕاوە مووسڵ. نورەدین گەلێک

دیاری و چتی چاکی لەگەڵ چەند جاریەیەکی بەقیمەتی بۆ زەینەدین نارد و خەڵاتی کرد و قاقەزێکی منەتداریشی لێ نووسی. ساڵی ٥٤٢ زەینەدین سوپاهێکی ڕێککەوتووی هەڵگرت و چووە سەر ماردین و قەڵای دارا، دەستی کرد بەگرتنیان، حیسامەدین تەمرتاش خێوی ماردین بەپاڕانەوە زەینەدینی ڕاگرت کە نەبێتە مایەی خراپی و وێرانیی، زەینەدین بەشەرتی ئەمە حیسامەدین کچی خۆی بدا بەسەیفەدین غازی مامەڵەتی کرد و گەڕاوە مووسڵ. ساڵی ٥٤٣ موعینەدین وەزیری موجیرەدین ئەبق خێوی دیمەشق لە دەست فەرەنگ وەتەنگ هاتبوو، بۆ کۆمەگیکردن هاواری لە سەیفەدین غازی کرد کە بەسوپا یاریدەیان بدا، سەیفەدین لەشکرێکی ڕێککەوتووی بۆ زەینەدین ساز کرد، زەینەدین بەهیمەتێکی بەرزەوە ڕوو بەدیمەشق چوو، فەرەنگ چونکو لە ئازایی زەینەدین شارەزا بوون، زانیان دووچاری بەڵا دەبن، لە پێش گەیشتنی زەینەدین دەستیان لەو خەیاڵە بەردا و گەڕانەوە جێگای خۆیان، زەینەدین لە پاش گەیشتنە دیمەشق و ماندوویان حەساوە، بەکەیف و شادی ڕوو بەمووسڵ چوونەوە.

ساڵی ٥٤٤ سەیفەدین غازی مرد، بەلەز قوتبەدینی برای سەیفەدینی کردە حوکمداری مووسڵ. زەینەدین چووەماڵی قوتبەدین و سواری کرد و کەوتە پێشی هەتا بردیە خانووی حوکمداری دیوانەوە و جاڕی کێشا و هەموو ئەهالی و ئومەرایانی کۆکردەوە و بەزۆر خستیە ژێر ئەمری قوتبەدینەوە و خەزینە و سوپاهی هەموو تەسلیم کرد، قوتبەدین دیسان زەینەدینی بەئەمیری جەیش و والی مووسڵ داناوە. زەینەدین کە حوکمداریی قوتبەدینی دامەزراند، جزیرەشی هێنایە ژێر حوکمییەوە، خێوی ژەنگار قاقەزی لە نورەدین مەحموود خێوی حەلەب نوویسی: ئەگەر بێتە سەر ژەنگار شاری بەبێ شەڕ دەداتە دەستی، نورەدین بەتالووکە لەشکری هەڵگرت و چووە ژەنگار، عەبدولمەلیک خێوی ژەنگار شار و قەڵای تەسلیم کرد و بەکەیفوخۆشی نورەدینیان بردە نێو قەڵات. زەینەدین عەلی گچکە کە لەوە ئاگادار بوو لەشکری هەڵگرت و چووە سەر ژەنگار و گەیشتە تەلیعفەر و قاقەزی لە نورەدین نوویسی کە: ئەوە چتێکی چاک نییە، لەو خسووسەوە ناردراو لە هاتوچۆدا بوو، لە نتیجەی گفتوگۆدا بەمامەڵەتیان کرد کە: نورەدین دەست لە ژەنگار بەردا و قوتبەدین لە حومس وازبێنێت، زەینەدین ئەو سوڵحەی بەچاکتر زانی، لەسەر ئەوە نورەدین گەڕاوە چووە حەلەب و زەینەدین ئومووری ژەنگاری دامەزراندەوە و بەر بەمووسڵ جڵەوی سووڕاندەوە، لەو سوڵحەدا زەینەدین خزمەتێکی گەورەی بۆ گەورەی خۆی کرد، چونکو بەبێ شەڕ و کوشتار فیتنەی پیاوێکی وەکو نورەدینی کوژاندەوە.

سالّی ٥٥١ زەینەدین بۆ سەرپەرشتی کوردستانی شارەزوور لە مووسڵ دەرکەوت و بەگەڕان ڕۆیشتە شارەزوور، خێوی هەمەدان سوڵتان محەمەد دیاری و خەڵاتێکی زۆری بۆ زەینەدین نارد و گەلێک چتی گرانبەهای پێشکەش کرد، سوڵتان محەمەد بەئومێدی کۆمەگی و یارمەتی، دڵداری زەینەدینی بەدیاری دەداوە. زەینەدین بەمنەتداری ئەو چتمەکەی قەبووڵ کرد. زەینەدین ئەمیر بزان کوردی شارەزووری کردبوو بەنایبی خۆی و لەسەر شارەزووری دانابوو، ئومووری بۆ ڕێکخست، لەو دەمەدا سوڵتان محەمەد خێوی هەمەدان بەلەشکرەوە چووە سەر سولەیمان شا سوڵتان خەلیفە پێکەوە بەشەڕ هاتن، لە نەتیجەدا سولەیمان شا شکا و بەسەر شارەزووردا ڕوو بەبەغدا هەڵات، زەینەدین لە مانگی جەمادی یەک ئەمری نە ئەمیر بزان خێوی شارەزوور کرد و چووە پێش سولیمان شا بەدیل گرتی و بردیە لای زەینەدین بەئیحترامەوە ڕایانگرت، کە زەینەدین ڕوو بەمووسڵ گەڕاوە لەگەڵ خۆی بردی و بەعیزەت و ئیکرامەوە لە مووسڵدا حەپسی کرد و دەستبەجێ لە سوڵتان محەمەدی گێڕاوە، لە شوکرانەی ئەوە دیاری و سەوقاتێکی زۆری بۆ نارد و وەعدەی دایە لە هەموو ئومووری‌ێک و بەهەموو دەمێک بۆ یاریدەدانی زەینەدین ئامادەیە و لە بەرابەر دوژمندا ڕاوەستاوە.

لەو ساڵە و لە مانگی زیلحیجەدا سوڵتان محەمەد خۆی کۆکردەوە و تەمای چوونە سەر بەغدای کرد و لە زەینەدین عەلی کچکە گێڕاوە ئەگەر یاریدەی بدا تاکو لەو چوونە پەلە بکا، زەینەدین لێی ڕائەسپارت: ئەو لەولاوە بچێ و زەینەدین لە مووسڵەوە بەسەر بەغدا دەدات، سوڵتان محەمەد بەپشتیوانی زەینەدین و یارمەتی ئەوەوە لەشکری هەڵگرت و چووە سەر بەغدا، زەینەدین لەولاوە سوپاهێکی ڕێکخراوی پێکەوە نا ڕوو بەبەغدا سوار بوو، بەمەملەکەتی خەلیفە گرتن ڕۆیشت هەتا گەیشتە کەناری شار، بەغدای دەورەدا و وەتەنگی هێنا، ئەهالی بەغدا کەوتنە ترسولەرز و خۆپێچانەوە، هەموو ماڵ و ئەسپابیان بردە خانووی خەلیفەوە، خەلیفە پردی پساند و کەشتی شەڕ و باری خستە کار، زەینەدین لە هەموو لایێکەوە دەستی بەتاڵان و گرتنی شار کرد، لە کووچە و کۆڵانانی شار دەست پێ کرا، گەڕەکی کەرخ کەوتە دەست زەینەدین، ئەهالی کەرخ بۆ تاڵانگرتن یاریدەی زەینەدینیان دا و لەگەڵ لەشکر کەوتن. زەینەدین گەلێکی ماڵ و چتی چاک دەستکەوت، خەلیفە دەستی بەچەک و ئالەتی شەڕ بڵاوکردن کرد بەسەر ئەهالیدا، ئەهالی بەغدا لە دەورەی تاجی خەلافەت کۆبوونەوە و لە هەموو لایێکەوە دەست بەمەنجەنیق گرێدان و تیرهاوێژتن کرا، پشێوییێکی وا کەوتە بەغداوە کەس ئاگای لە کەس نەبوو.

٢٠ی مانگی موحەڕەمی ٥٥٢ زەینەدین بەسوپاهییەوە سوار بوو، سولّتان محەمەد لەولاوە لەشکری خۆی گەیاندە زەینەدین، هەردوو سوپا ڕوو بەڕقە ڕاوەستان و تاجی خەلیفەیان دایە بەر تیر و مەنجەنیق، هەتا شەو بەسەر داهات و بەئەسپایی دەبزووتنەوە، کە شەو هات شەڕ و کوشتار گەرم کرا و هەڵمەتدان توند بوو، نەفت و ئاگرباران و مەنجەنیق و تیرهاویّتن بەگەرمی کەوتنە کار، زەینەدین دەم بەدەم سەر دەکەوت، ئەو شەڕە گەلیّکی زەرەر لە خەلیفە دا و چەند ڕۆژ دەوامی کرد و گەلیّک پیاو کوژرا و ماڵ تالاّن کرا. ڕۆژی سێیەمی مانگی سەفەر سبەینە زوو ئەهالی بەغدا دەستیان کرد بە لە دجلە پەڕینەوە، زەینەدین هەرچییّکی پەڕییەوە گرتی و کوشتی، بۆ ئەهالی بەغدا و بۆ خەلیفە لەو ڕۆژە ڕەشتر و بەنەگبەتر ڕووی نەداوە، زەینەدین پردی لەسەر دجلە هەڵبەست و لەشکری پەڕاندەوە بۆ بەری ڕەسافە، ئەمجا شەڕ و کوشتار کەوتە هەردوو گەڕەکی بەغداوە. زەینەدین بۆ خۆی لە کەرخ شەڕی دەکرد و لەشکرەکەشی لە بەری ڕەسافە کوشتاری دەکرد. (ابن الاثیر) لە بەرگی یازدەیەمی (التاریخ الکامل)دا دەڵێت: زەینەدین لەبەر خۆشەویستی دین و ئیسلامییەت حەزی بەکوشتار نەکرد، بەلاّم خەلیفە زۆر ناشایستەیی دەکرد، بۆیە زەینەدین ناچار دەبوو شەڕی دەکرد، دیسان دەڵێت: ئەگەر زەینەدین کەیفی لە کوشتار و خراپە بوایە، شەڕ هێندە دەوامی نەدەکرد، ڕۆژی ئەوەڵ کە گەیشتە کەرخ بەغدای دەگرت و خەلیفەی دەکردە دیل، لەبەرئەوە شەڕ دەوامی کرد و خەلیفە و ئەهالی بەغدا سووکایەتییان زۆر بەسەردا نەهات. لەشکری زەینەدین ڕوو بەڕەسافە پەڕینەوە، سولّتان محەمەد بۆ گرتنی قەلاّ و جێگایانی سەخت ٤٠٠ دانە نەردیوانی بەدروستکردندا، کە بەدیوارانییەوە نێت و لەشکری پێدا سەرخاتە سەرەوە، تاکو بچنە ئەو دیوەوە. ئەهالی بەغدا کە وایانزانی دەروازەیان کردەوە و بۆ تەسلیم بوون هاواریان دەست پێ کرد. سولّتان محەمەد لە ٢٤ی ڕەبیعی یەکدا وەلاّمی بۆ هات کە مەلیکی برای پەلاماری هەمەدانی دا و گرتی هەموو ماڵ و خەزێنەی خستە ژێردەستەوە، سولّتان محەمەد بەناچاری دەستی لە بەغدا هەڵگرت و ڕوو بەهەمەدان گەڕاوە. لەو شەڕە زەینەدین عەلی گچکە ماڵ و ئەسپابێکی دەستکەوتبوو، کۆی کردەوە و سوپاهی وەخڕ کرد و ڕوو بەمووسڵ تەپڵی شادی لێدا و گەڕاوە.

ساڵی ٥٥٤ نورەدین شەهید نەخۆش کەوت، ئەمیری ئێران برای تەمای لە موڵک و حوکمداریی برای کرد و ئالاّی سەرکێشی هەڵدا و چووە سەر حەران گرتی و خستیە ژێر حوکمەوە، نورەدین کە لە نەخۆشی ڕزگار بوو هەستاوە سەر خۆی، لەشکری حەلەبی

هەڵگرت و چووە سەر حەران، ئەمیری ئێران حەرانی بەردا و هەڵات، نورەدین کە حەرانی خستەوە دەست پێشکەش بەزەینەدین عەلی گچکە کرد. لەو ڕۆژەوە حەران بوو بەموڵکی تایبەتی زەینەدین. ساڵی ٥٥٥ سوڵتان محەمەدی کوڕی سوڵتان مەحموودی خێوی هەمەدان مرد، ئومەرا و ئەعیان و ئەهالی هەمەدان، قاقەزێکی پاڕانەوەیان لە زەینەدین نوبسی کە سولەیمان شا بەربدا و بینێرێتە هەمەدان و بیکەنە سوڵتان، بەو شەرتە قوتبەدین ئەتابەگی مووسڵ ئەتابەگ و زەینەدین ئەمیری جەیش و جەمالەدین وەزیری بێت، ئەو قاقەزە کە گەیشتە مووسڵ، زەینەدین سولەیمان شای لە بەند ڕزگار کرد و تەدارەکی سوڵتانی بۆ ڕێکخست و پێویستی حوکمداریی بەچاکی ساز کرد و سوێندی دا کە لەسەر قەراری خۆی ڕاوەستێ و خیانەت لەگەڵ زەینەدین و قوتبەدین نەکا. بەو شەرت و قەرارە لێی ئەمین بوو، لەگەڵی سواربوو ڕوو بەهەمەدان ڕۆیشتن، کە نزیک هەمەدان بوونەوە، هەموو ڕۆژێ دەستە بەدەستە پێشوازی دەکران، سوپاهـ و ئومەرا و گەورە، دەستە دەبوون و دەچوونە ئیستقبالیان، هەتا گەیشتنە هەمەدان، لەشکرێکی قورسیان لەسەر کۆمەڵەی بەست، زەینەدین کە چاوی بەو سوپاهە کەوت و لە ئومەرا و سەرکردەکانی وردبووەوە، کەوتە ئەندێشە و ترسی لێ پەیدا بوو، تەماشای دەکرد بزووتنەوەیان بۆنی ئاشنایەتی لێ نەدەهات، لەبەرئەمە نەبادا بێ ئەدەبی پێ بکرێ و قسەی سووکی پێ بلێن، بەڕەنگێکی زرنگانە خۆی نواند و بەرەو شتێکی چاوڕاوی لە هەمەدان جوێ بووەوە و بەلەشکرەکەی خۆیەوە گەڕاوە مووسڵ وسولیمان شای لە هەمەدان بەجێ هێشت. ساڵی ٥٥٦ زەینەدین تەدارەکی گرت و لەگەڵ شێرکۆی کوڕی شادی کە مامی سەلاحەدینە چووە حەج ئەدای حەکی کرد و گەڕاوە. ساڵی ٥٥٩ی مانگی ڕەمەزان فەرەنگ لە هەموو لایێکەوە نورەدین شەهیدیان وەتەنگ هێنا، لەشکری نورەدین لە شاری حارم لە دەست فەرەنگ شکا و بەپەرێشانی ڕوویان لە هەڵاتن کرد و فەرەنگ کەوتنە دووی شکستەی موسڵمانان، زەینەدین عەلی گچکە لەو دەمەدا بەفریایان کەوت و لەشکری ڕوو بەفەرەنگ ڕاکێشا، لە پاش گەلێک کوشتار و خوێن ڕژاندن، ماڵ و ئەسپاب زۆر و عەسکەرێکی بێ ژماری بەدیلگرت، فەرەنگی شکاند و کەوتە دوویان و کوشتاری لێ کردن و نەیهێشت پیاوێکیان لێ ڕزگار بێ، کۆمەڵەییێکی دیکەی فەرەنگ بەئومێدی ئەمە کە موسڵمانان شکاون، تالانیان لێ بگرن، کتوپڕ تەماشایان کرد بەسەر کۆمەڵە کوژراوی فەرەنگدا کەوتن و دەستیان لە چووین سست بوو، لە ترسان گەلێکیان لە ئەسپ بەربوونەوە و سەرسامان و شیر و مەتالیان لە دەست بەربووەوە. زەینەدین چاردەوری ئەوانیشی گرت و

شیری تێنان و دەستی کرد بەکوشتاریان، ئەوانیش بەناچاری دەستیان لە ئالەت و چەکی شەڕ و کوشتار گەرم بوو، خوێن وەکو جۆگەلە ڕەوانبوو، فەرەنگ ئەو ڕۆژە ڕۆژی نەگبەتی بوو، بەلاییێکی وایان بەسەردا هات هیچ نەیانبیستبوو. (ابن الاثیر) لە (التاریخ الکامل)دا دەڵێ: فەرەنگێکی بەدەست زەینەدین کوژران، ژمارەیا لە ١٠ هەزار کەس بەرەو ژوورتر بوو، ئەسیر و بریندار لە ژمارە بەدەر بوو، نورەدین شەهید کە ئەوەی زانییەوە زۆر دڵشاد و بەکەیف بوو، سوپاه و لەشکری نورەدین دەستیان کرد بەشایی و ڕازاندنەوە، نورەدین کەلێنی دەستخست ڕوو بەئەنتاکییە سوپاهی ئاژۆت و جاڕی جیهادی بەنێو ئیسلاماندا کێشا، بێحەد خێوی ئەنتاکییە بەسوڵح پێشوازی نورەدینی کرد، بەڕێی کۆمەگی ئەسیرێکی زۆری فەرەنگی لە زەینەدین کڕیەوە. زەینەدین چووە سەر شاری حارم و بەشەڕ گرتی، ئەهالی فەرەنگی کە لە حارم دابوون کوشتنی.

ئەو مەرزوبوومە لە سایەی شیری تیژی زەینەدینەوە لە فەرەنگ چۆڵ کرا، دەست و بازووی ئەو ئەو خاکە لە دوژمن خاوێن کراوما نورەدین لە تەنگانی ڕزگار بوو ڕوو بەقەڵای بانیاس چوون کە نزیک دیمەشقە، ئەودەمە لە دەست فەرەنگدا بوو، زەینەدین لە بانیاس بۆ گەڕانەوە خاتر خواهی لە نورەدین کرد و بەکەیفوخۆشی و تالانێکی زۆرەوە گەڕاوە مووسڵ.

ساڵی ٥٦٣ زەینەدین عەلی گچکە کە نایب و ئەمیری جەیش و هەمەکارە و والی مووسڵ ئەتابەگەکانی زەنگی بوو لە مووسڵدا، لە حوکمداری قوتبەدین مەودودا حاکم بوو، لە دەوڵەتیدا زۆرترین خاک و مەملەکەت بەرەی ئەو بوو، هەولێر و شارەزوور و تەواوی قەڵایان و هەموو مەملەکەتی هەکاری و قەڵایانی ئەشب (ئامید) و هی دیکە و تەواوی خاکی حەمیدی و ئاکرە و تکریت و ژەنگار و حەران و قەڵای مووسڵ و دەوروپشتی هەموو لە ژێر حوکم و پەنجەی زەینەدیندا بوون و بەرەی ئەو بوون و ژن و ماڵ و گەنجینە و سەروەت و سوپاهی خسووسی خۆی لە هەولێر لە ژێر ئیدارەی ئەمیرێکی خۆیدا بوو، شارەزووریش هەر هی خۆی بوو، ئەمیرێکی لەسەر دانابوو. لەبەرئەمە کە پیر ببوو و عومری لە سەد زیاتر بوو، ڕەخنە بەگوێ و چاوی گەیشتبوو، کەنارگیری بەچاکزانی، شارەزوور و هەولێری بۆ خۆی هەڵبژارد، چونکو خاک و وەتەنی خۆی بوو، قەڵا و شارەکانی دیکەی، کە باس کران، هەمووی پێشکەش بەقوتبەدین مەودود کرد و خستیە ژێر حوکمیەوە و شەرت و قەراری لەگەڵ گرێدا و سوێندیان بۆ یەکتر خوارد کە زەینەدین وەکو عەهد و پەیمانێکی لەگەڵ باب و براکانی هەبوو، شارەزوور و هەولێر لە دەست زەینەدین قەرارگیر بێت، بەو شەرتە زەینەدین دەستی لە مووسڵ بەردا و گەڕاوە هەولێر و

لەگەڵ ماڵ و منداڵی خۆی دانیشت.

زەینەدین ئەمیرێکی ئازا و زرنگ و تێگەیشتوو خۆش ڕەوشت و دڵپاک و بەختەوەر و بێ ترس و بەدەهشەت بوو، لە هیچ شەڕێکدا هەڵاتن و خۆ شاردنەوەی نەدەزانی، لەگەڵ سوپاه و ئەمیر و هەژار و فەقێ و مێزەر بەسەراندا دڵسۆز و بەبەخشش و خەڵات و بەرات بوو، چەلێکی (حەیسە بەیسە)ی شاعیری مەشهوور بەقەسیدەیەک پێیدا هەڵگوتبوو، تەمای کردبوو بۆی بخوێنێتەوە، پێی گوت: (مەیخوێنەوە نازانم چی دەڵێن بەڵام هێندە دەزانم چتێکم لێ دەخوازێ) دەستبەجێ ئەمری دا ٥٠٠ سەد لیرە و ئەسپێک و خەڵاتێکیان دایێ، هەمووی بەژمار بایی هەزار زێڕ بوو.

زەینەدین لە گەلێک شەڕاندا خزمەتی ئیسلامەتی کرد، زۆر بەدین و بەتەقوا بوو، لە شەڕی فەرەنگدا زۆری پشتیوانی کرد و کۆشا، بۆ ئاوەدانی مەملەکەت و عیمارەت و چاندن و بازرگانی و سەروەتی مەملەکەت زۆری تەقەلا دا. (ابن الاثیر) لە (التاریخ الکامل) و (ابن شداد) لە (سیره صلاح الدین)دا دەڵێ: زەینەدین لە سەد ساڵ زیاتر ژیا، لە دوای عومریدا لە هەردوو چاوان نابینا بوو، لە هەردوو گوێیان نابیست و کەڕ بوو، زەینەدین کە دەستی لە مووسڵ بەردا و گەڕاوە هەولێر، دەستی بەڕێکوپێکی قەڵا کرد و حوکمدارێکی چاک و ڕێکی دامەزراند و دەستی بەئومووری ڕەعییەتپەروەری و مەملەکەتداری کرد، بەبەخش و ئینعام ڕۆژ بەڕۆژ میللەتی دڵخۆشی دەداوە. زەینەدین شەوی یەکشەمەی ١٥ی مانگی زیلحیجەی ساڵی ٥٦٣ لە شاری هەولێر بەئامرزشی یەزدان شادبوو، لە نێوەڕاستی شار لە قەبرستانێ کە بەقەبرستانی مزگەوتی گەورەی کۆن (عتیق) ناوبانگی کرد ناژترا، ئەو جێگایە ئەمڕۆکە کەوتۆتە جنووبی شارەوە و نزیک بەگڵکەندی ڕێگای کەرکووکە. ئەهالی هەولێر و هەموو دەوروپشتی بەمردنی غەمناک و ڕەشپۆش بوون، چونکو میللەتی کوردی هەولێر و شارەزوور لە ژێر سێبەری ئەو ئەمیرە کوردە عادیلەدا، دوور لە هەموو بەڵا و ئەزیەت و ڕەنج بوون.

زەینەدین عەلی گچکە هێندەی بەزرنگی و زەبەردەستی و شەڕکەری ناوبانگی کردبوو، سەد چەندان بەخێرخواهی و دادڕەسی و تەرەقی پێدانی عیلم و فەن سەرکەوتبوو. لە گەلێک جێگایاندا مزگەوت و مەداریس و خانەگایانی بینا نابوو، لە مووسڵ مزگەوت و مەدرەسەییێکی زۆر جوانی بینا کرد و مەوقووفە و جیرەییێکی زۆری لێ گرێدا، کە زینەدین مرد بەکۆمەگی ئومەرا و ئەعیانی کوردان موزەفەرەدین کوک بەری کە کوڕی گەورەی

زەینەدین بوو، لە عومری ١٤ ساڵانەدا کردیانە حوکمداری هەولێر و شارەزوور. سەیفەدین غازی ئەتابەگی مووسڵ بەتەحریکی موجاهیدەدین قایماز بۆ سوڵتانی میسر و بۆ خەلیفەی نوویسی و کۆشا و تەقەلای دا موزەفەرەدینیان لە حوکمداری عەزل کرد، ئەحوالی ئەو لە باسی خۆیدا بەدرێژی دێتە گۆتن.

## بەندی دووەم

## حوکمداری زەینەدین یووسف ئەبا موزەفەر کوڕی زەینەدین

## عەلی گچکە لە هەولێر ٥٦٣ - ٥٨٦ ھ

کە زەینەدین مرد و موزەفەرەدین عەزل کرا، موجاهیدەدین قایماز تەمای موڵکی شارەزوور و هەولێری کرد کە بیکاتە بڕبڕەی خۆی، بۆ بەجێهێنانی ئەو فیکرە، جگە لەمە یووسفی کوڕی ئەمیر عەلی گچکە، کە برایێکی چکۆڵەی موزەفەرەدین بوو، بەحوکمداری دابمەزرێنێت و خۆی ببێتە پشتیوانی، چارەیێکی دیکەی لەوە پەیدا نەکرد، لەبەر گەیشتنە دڵخواز و دەستبەسەر هەولێر و شارەزووردا کێشان، یووسفی کردە حوکمدار و لەقەبی موزەفەری و زەینەدینی دایە و بۆ خۆی لەگەڵ حوکمداریی ئەو دوو قیتعە کوردستانە خەریکبوو. ئەتابەگی مووسڵ سەیفەدین غازی کوڕی مەودوود بۆ سوڵتان و خەلیفەی نوبسی کە: موزەفەرەدین نەیدەتوانی ئیدارەی مەملەکەت بکا عەزلم کرد، موجاهیدەدین قایماز کرا بەئەمیری جەیش و وەزیر و وەکیلی زەینەدینی یووسفی کوڕی ئەمیر عەلی گچکە و لەسەر حکوومەتی هەولێر و شارەزوورمان دانا، بەڕاستی هەمەکارە و ئیش لە دەستهاتوو هەر موجاهیدەدین بوو. حکوومەتی کوردستانی هەولێر و شارەزوور کەوتە ژێر پەنجەی موجاهیدەدینەوە، زەینەدین بەناو حوکمدار بوو.

ساڵی ٥٧١ سەیفەدین ئەتابەگ قایمازی کردە ئەمیری جەیشی مووسڵ و حکوومەت. سەیفەدین ئەتابەگ بێت و قایماز ئەمیری جەیش و نایب بێت. زەینەدین یووسف لەو کردەوە کەمێک بووژاوە و نەفەسی هاتە بەر و دەستی بەخۆ کۆکردنەوە کرد. محەمەد شەهابەدینی کوڕی ئەمیر بزان خێوی شارەزووری کردە ئەمیری جەیشی خۆی و ئومەرایانی کوردی لە خۆ کۆکردەوە و دەستی بەهێز پەیداکردن کرد.

ساڵی ٥٧٢ بەهاندانی زەینەدین سەری لە موجاهیدەدین وەرسووڕاند و بەیانی ئەمەی کرد کە لە فیتنەی ئەمین نییە، هەستا چووە شارەزوور و ئاڵای سەربەخۆیی هەڵدا و لە سەیفەدین غازی ڕووگەردانی کرد. شەهابەدین لەشکری کۆکردەوە و لە ژێرەوە زەینەدین لە

هەموو ئومەراکانی کوردستان گێڕاوە یاریدەی شەهابەدین بدەن. سەیفەدین کەوتە تەقەلاّ و قاقەزی بۆ شەهابەدین نارد کە هیچ نەبزوێتەوە، شەهابەدین گوتی: قایماز کۆنە دوژمنە و بەدنیهاد و پیسە و لە ژێر ئەمریدا ناتوانم خۆ بەخێوکەم، هیچ چارە نەما ئەمجا جەلالەدین وەزیری ئەتابەگ قاقەزێکی پەندئامێزی لە شەهابەدین نوبسی و لە قایمازی ئەمین کرد و دەرعەهدە بوو، شەرت و قەراری دایە کە قایمەز دەست لە هەولێر و شارەزوور بەردات، لەسەر ئەو قاقەزە شەهابەدین خۆی کۆکردەوە و ئەتابەگیی سەیفەدینی قەبووڵ کردەوە و هەستا چووە مووسڵ و ئەتابەگی دیت و گەڕاوە شارەزوور، لەو ڕۆژەوە موجاهیدەدین قایماز دەستی کورتبووە، بەڵام نفووزێکی مابوو. ساڵی ٥٧٩ لە مانگی جەمادی یەکدا عیزەدین مەسعوودی ئەتابەگی مووسڵ، لەبەرئەمە کە موجاهیدەدین دەستی بەسەر هەموو مەملەکەتیدا گرتبوو، لە بەندی کرد. زەینەدین یووسفی خێوی هەولێر لەوە کەلێنی دەستکەوت، تاکو ئەو ڕۆژە چونکو منداڵ و ساوا و لە کار و ئیشدا خاو و بێ کردەوە بوو، نەیدەتوانی خۆ لە قایماز ڕاست بنێت و بەهەموو جۆرێک لەگەڵ قایمازی ڕادەبوارد. زەینەدین کە زانی قایماز گیرا، لەگەڵ ئەمیری شارەزوور و دەکۆک ڕێککەوت و گرتی قاقەزێکی لە سوڵتان سەلاحەدینی ئەیووبی نوبسی و بەیانی ئیتاعەتی کرد، بۆ ئەمە هەمیشە لە خزمەتیدا بێت و بەخۆی و لەشکریەوە ئامادەی هەموو کارێکی بێت.

سەدرەدینی شەیخولشیوخ بۆ مامڵەتی نێوانی سوڵتان و عیزەدین لە تەرەف خەلیفەوە ناردرا. عیزەدین ئەتابەگ قازیی محیەدینی شارەزووری لەگەڵ خست و ناردیانە خزمەت سوڵتان کە: سوڵح بکەن. سوڵتان بەشەرتی ئەمە عیزەدین چ دەخلی بەسەر شارەزوور و دەهۆک و هەولێرەوە نەدابێ سوڵحی قەراردا. لەولاوە قازیی محیەدین بەوە ڕازی نەبوو، بەڵام سوڵتان دەستی لەو کوردستانە بەرنەدا، لەو ڕۆژەوە زەینەدین یووسف و ئەمیر شەهابەدین خێوی دەکۆکا بوونەیەک و لە ژێر چاوەدێری سوڵتاندا کوردستانی خۆی کۆکردەوە، زەینەدین یووسف دەستی بەتەدارەک گرتنی حوکمداری و مەملەکەتپەروەری لەشکر و سوپا و ئەسبابی فەڕ کرد، ساڵی ٥٨٠ موخافیرە دێن. قایماز کە لە بەندیخانەی ئەتابەگ ڕزگار بوو چووە ئاوربایەگان، شەمسەدین پاڵەوان لە داخی سەلاحەدین سوپاهێکی قورسی بۆ موجاهیدەدین پێکوەنا و ناردیە سەر هەولێر. قایماز بە (٣٠) هەزار سوارەوە ڕوو بەهەولێر خشا و بەسووتانی ئاوایی و دێهات و کوشتاری ئەهالی و تالان و وێرانکردن و ئەتک و سووکی و شەپرزە بەسەرهێنانی میللەتی کورد، بەر بەهەولێر چوو کە: قەلاّ بگرێت. زەینەدین یووسف بەلەشکری کوردی هەولێرەوە چووە سەر قایماز و

سوپاهەکەی کە بەدێهاتاندا بۆ تالاّنکردن بلاّوبوونەوە، لەناکاو زەینەدین هەلّمەتی دایە سەر دوژمن و دەستی بەکوشتارکردن کرد و بەڕاستی ئەو ڕۆژە جەوهەری خۆی نواند و ناوبانگی کرد. قایماز جگە لە هەلاّتن چارەییێکی دیکەی نەما و پشتی کردەوە و هەلاّت، زەینەدین بەسوپاهەوە کەوتە سەری و لە پاش گەلێک کوشتار و تالاّن و دیلگرتن، کەمێکی خۆی ڕزگار کرد و بەپەرێشانی خۆیان لەنێو بێشە و لێرەواراندا ڕزگار کرد. زەینەدین بەکەیف و شادی و سەرکەوتن و سەرفرازیی سوپا گەڕاوە هەولێر و بەتەواوی خۆی لە دوژمن ڕزگار کرد و خاکی خۆی لە هەوادارانی قایماز پاک کردەوە، ئەوجا ئومێدێکی چاکی بەخۆی پەیدا کرد کە: دەتوانێت بەئازادی و سەربەخۆیی بژی. لەولاوە موجاهیدەدین بەهەزار ئەزیەت و بەدوو نۆکەری خۆیەوە شەپرزە و ڕووت خۆیان گەیاندە مووسڵ. ساڵی ٥٨١ سوڵتان سەلاحەدین بۆ گرتنی مووسڵ بەر بەجەزیرە لەشکری کێشا. زەینەدین یووسف بەلەشکری هەولێر و شارەزوور چووە پێشوازی سوڵتان، لەو دەمەدا سوڵتان گەیشتبووە حەران، ئەمری دا زەینەدین یووسف لەگەڵ موزەفەرەدینی برای چووە سەر مووسڵ و بەتوندی دەورەی مووسڵیان گرت و خستیانە تەنگانەوە، لەلای ڕۆژهەلاّتەوە پەلاماری شاریان دا، موددەتێکی تەواو، تاکو سوڵتان چووە میافارقین دەورەدانی مووسڵ دەوامی کرد، ئەوجا زەینەدین گەڕاوە هەولێر. ساڵی ٥٨٥ سوڵتان لە عەکا شەڕی لەگەڵ فەرەنگ دەکرد، فەرەنگ سوڵتانیان وەتەنگ هێنابوو، سوڵتان قاقەزێکی لە پادشایانی کوردستان نویسی بەهاواریەوە بچن. زەینەدین یووسف بەسوپاهی کوردی هەولێر و شارەزوور چووە هیمدادی و لە دەرەوەی عەکا گەیشتە سوڵتان و لەو شەڕەدا گەلێک خزمەتی کرد.

زەینەدین یووسف لە هەموو شەڕێکدا پێشدەکەوت و لە کوشتار و هەلّمەتاندا ناوبانگی کرد، لە شەڕی سووتاندنی بورجی عەکا و لە شەڕی کەشتیی دەریادا لە هەموو کەس زیاتر بەگیان و دڵ دەکۆشا و گیانفیدایی دەکرد، لەو شەڕانەی وادا کە لاپەڕەی تەئریخ وای نەنووسیوەتەوە، زەینەدین لە پێش دوژمندا ببوو بەسوپەرێکی قایم.

ساڵی ٥٨٦ لە ٢٠ی جەمادی دووەم فەرەنگ لە عەکادا لە خەندەقانی خۆیاندا هەلّمەتیان بردە سەر سوپاهی سەلاحەدین، فەرەنگ هێندە زۆربوون نەدەهاتنە ژمار، ڕوو بەلەشکری میسر چوونە پێشەوە، مەلیک عادیلی برای سوڵتان سەرداری سوپاهی میسر بوو، کە ئەوەی زانی بۆ فەرەنگ سوار بوو شەڕ دەست پێ کرا، فەرەنگ کەوتنە نێو چادر و لەشکرگای میسریانەوە و دەستیان بەکوشتار و تالاّنی کرد، میسرییەکان لەنێو چادراندا

دەستیان بەفەرەنگ کوشتن کرد، بەزۆری بازووی کوردان فەرەنگیان بەشەپرزەیی لەنێو چادرەکان دەرکرد و ڕوو بەسەنگەری دوژمن چوون، لەو شەڕەدا نزیک ١٠ هەزار فەرەنگ کوژرا. زەینەدین یووسف خێوی هەولێر لە پاش سوپاهی مووسڵ گەیشتە پێشەوە و پەلاماری فەرەنگی دا و خوێنی فەرەنگ لەبەر شیر و تیر و بڕندەی کورد وەکو ئاوی ڕەوان لەو دەشتەدا دەڕۆیشت و تەواوی کەناری عەکا ببوو بەگۆمی خوێن. زەینەدین یووسف لە پاش گەلێک شەڕ و کوشتار و جیهاد لە خزمەت سەلاحەدیندا گەڕاوە و چووە ناسریە، کەمێک ماوە کە ماندووی بحەسێتەوە، نەخۆش کەوت. ٢٨ی مانگی ڕەمەزانی ساڵی ٥٨٦ لە شاری ناسریە بەئامرزشی خودا گەیشت و هەر لەوێ ناژتیان، خوای لێخۆشبێ. عیمادی کاتیب و (ابن الاثیر) دەڵێن: لە ١٨ی ڕەمەزاندا مرد، بەڵام (حافظ ابا خطاب) لە کتێبی (حرق العین)دا دەڵێ: لە ٢٨ی ڕەمەزاندا مردووە، خوا دەیزانێت.

کە خەبەری مردنی زەینەدین یووسف بەکوردستان ڕاگەیشت، موجاهیدەدین قایماز تەمای گرتنی هەولێری کرد و قاقەزی لە ئەهالی نوسی قبوولێکەن، میللەتی کورد بەهەڕەشە جوابیان داوە و قەبووڵیان نەکرد، قایماز لە ترسی سوڵتان سەلاحەدین نەیوێرا بەزۆر بچێتە سەر هەولێر.

## بەندی سێیەم

## حوکمداری سوڵتان موزەفەرەدین کۆک بەری کوڕی زەینەدین عەلی گچکە ٥٧٦ - ٦٣٠ھ

ساڵی ٥٦٣ کە زەینەدین عەلی گچکە مرد، موزەفەرەدین ١٤ ساڵانە بوو، لەبەر شۆخی و بەرگی جوان و کۆک لەبەرکردن لەنێو ئەهالیدا بەکۆک (پۆشتە) بەری ناوی لێنرا، یەعنی کۆکبەری پۆشتە لەبەر، بەڵام موئەریخەکانی تورک لەسەر ڕەوشتی خۆیان کە هەمیشە حەقایقیان بزر کردووە و گەڕاون لەمە کە ناوێک بکەنە تورکی و نیسبەتی پیاوێکی گەورە و نامداری کورد نەدرێ، لەبەر تەعەسوب ناوی عەلی کوچک (گچکە)یان لەبیرچووە کە کوردییێکی پەتیە، هێنایان کوک بەربیان بەگوگ بۆری یەعنی گورگی بۆر لە کتێبانی خۆیاندا قەیدیان کرد، بەڵام حافز عیزەدین کە لە خوتەبایانی موزەفەرەدین و هەمعەسری بووە لە تەئریخچەیەکی کە نوبسیویەتییەوە دەڵێ: زەینەدین چونکو کورتە باڵا بوو بەکوچک و گچکە ناولێندرا، موزەفەرەدینی کوڕی چونکو لاوێکی چاک و پۆشتە بوو، هەموو دەمێ جلوبەرگی لە هەموو کەس چاکتر و جوانتر لەبەر دەکرد و ئەو بەرگەی لێ دەهات بەکۆکبەری یەعنی پۆشتە لەبەر ناوبانگی کرد.

موزەفەرەدین کۆک بەری لەسەر ڕائەسپاردنی بابی و ڕێککەوتنی ئومەرا و گەورەی دەوڵەتیان بوو بەحوکمداری هەولێر و شارەزوور و دەکۆک (داقوق - تاوق). موجاهیدەدین قایماز نایبی ئەتابەگی مووسڵ چاوی لە مەملەکەتی موزەفەرەدین بڕی کە بیخاتە ژێر پەنجەی خۆیەوە و دەستی بەسەردا بکێشێ، قایماز کەوتە فڕوفێڵ و بهانەگرتن و لەمە زیاتر چارەیەکی نەدۆزییەوە کە بۆ سوڵتانی میسر و خەلیفەی بەغدا بنویسێ کە: موزەفەرەدین ناتوانی ئیدارەی مەملەکەت و ڕەعیەت بکا، لەو ڕێگایەوە دەستی بەفیتنە و فەسادی و ئاشووب کرد و شۆڕشی خستە نێو ڕەعیەت و سوپاهی هەولێرەوە و قاقەزی بەئاتەبەگ لە سوڵتانی میسر و خەلیفە نوبسی کە: موزەفەرەدین منداڵە و بەدمەسرەفە و خەزێنە و ماڵ و سەروەتێکی ئەمیر عەلی گچکە کۆیکردۆتەوە، بەخۆڕایی لە بڵاوکردنەوەی

خــەریکە و هەرچی هەیە دەیداتە بەرگ و ئەم و ئەو، بەو دەســـتـــووره زۆری پێناچێ مەملەکەت ڕوو لە وێرانە دەکا و سوپاهی بڵاوەی تێ دەکەوێ و خەزێنە چۆڵ دەکرێ. ئەو جۆرە قـاقـەزانەی نارد و لەمـلاشـەوە قـایماز دەسـتی هاوێتـە سـەر مـوڵک و ئەمـلاکی موزەفەرەدین و کەم کەمە لە پەروپۆی کردەوە.

موزەفەرەدین کە لەوە وردبووەوە گوتی: مادامە برا گچکەکەی دەبێتە حوکمدار وا چاکە دەست لەوە بەردا، بەناچاری دەستی لە حوکمداری بەردا و ڕووی لە بەغدا کرد و پەنای بردە بەر خەلیفە کە چارێکی بکا، هەرچەندە کۆشا و هاواری کرد و تەقەلای دا چی بۆ نەکرا، بەناعیلاجی لە بەغدا دەرکەوت و چووە مووسڵ و خۆی هاوێتە کن ئەتابەگ سەیفەدین غازی کوڕی مەودوود، ئەتابەگ پێی خۆشبوو یاریدەی بدات و بینێرێتەوە سەر حوکمداریی خۆی، بەڵام لەبەر قایماز نەیدەوێرا خۆی تێبگەیێنێ. موزەفەرەدین زەمانێک خزمەتی ئەتابەگ سەیفەدینی کرد، لە پاشان بەواسیتەی قایماز ناردرایە سەر شاری حەران و مودەتێک لە حەران مەئمووریەتی کرد و بوو بەمەئموورێکی قایماز، لە پاشا ساڵی ٥٧٧ عیزەدین ئەتابەگی مووسڵ حەرانی بەبرە دا بەموزەفەرەدین و قەڵای حەرانیش لەبەر ئیعتیماد پێکردن خستە ژێر پەنجەیەوە.

ساڵی ٥٧٨ موزەفەرەدین قاقەزێکی لە سوڵتان سەلاحەدین نوبسی کە بۆ گرتنی جزیرە خزمەت دەکا، دەمێکی قاسیدی موزەفەرەدین گەیشتێ، سوڵتان بەیرووتی دەورە دابوو شەڕیان دەکرد، کە سوڵتان قاقەزی خوێندەوە کەوتە سەر هەوا و هەوەسی چوونە ڕۆژهەڵات، چونکو موزەفەرەدین لە قاقەزەکەیدا وەعدەی دابوو، هەردەمێکی سوڵتان لە فورات پەڕیبەوە، موزەفەرەدین بەسوپاهەوە یاریدەی بدات، لەوێدا گەلێک بەیانی لێ خۆشهاتنی لە سوڵتان کردبوو، گرتنی کوردستان بەیانی حەزکردن و سەربەرزی نیشان دابوو. سوڵتان کە وایزانی زۆری لێ خۆش هات و شادمان بوو، ئەوەی بەخاڵی چاک زانی، بۆ پێش و بەرەی کاری سەڵتەنەت دەستبەجێ خۆی کۆکردەوە و ڕوو بەفورات دەستی بەلەشکر ناردن کرد. سوڵتان کە نزیک بەفورات بوو، موزەفەرەدین بەسوپاهـ و دەزگاوە چووە پێشوازی، سوڵتان کە چاوی بەلەشکری کورد کەوت، گەشاوە و دڵی ڕوونبووەوە. موزەفەرەدین بۆ گرتنی بیرەجگ، سوڵتانی نوازش دا، بیرەجگ جێگاییێکی سەخت و قەڵاییێکی قایمی لەسەر فورات هەبوو، کەوتۆتە لای خاکی جزیرەوە، خێوی بیرەجگ بۆ ئیتاعەتکردنی سوڵتان چووە پێشوازی و پردیان لەسەر فورات هەڵبەست، سوڵتان و موزەفەرەدین و خێوی بیرەجگ بەلەشکر و قۆشەنەوە لە فورات پەڕینەوە بەری

بیرەجگ. هێشتا سوڵتان لە دیمەشق بوو، عیزەدین ئەتابەگی مووسڵ و قایمازی نایبی، زانیان سوڵتان تەمای گرتنی جزیرەی کردووە و سوپاهێکی زۆریان کۆکردەوە و چوونە نسێبین کە نەبادا سەلاحەدین بچێتە سەر حەڵەب و بیگرێ، زوو بەفریا بکەون و نەهێڵن، بەڵام کە سوڵتان لە فورات پەڕییەوە، مەسەلە وەرچەرخا، زانیان چوونە پێش چاک نییە و لە نەتیجەدا مووسڵ لە دەست دەردەچێ، بەناچاری گەڕانەوە مووسڵ و سوپاهەکەیان ناردە شاری ڕەها نیگەهبانی بکەن و نەیەڵن سوڵتان بیگرێت.

لەولاوە کە سوڵتان ئەوەی بیست بۆ گرتنی ئەو خاکە غیرەتی زیاد کرد و تەمای لێ نیشت، ئەو ڕۆژەی لە فورات پەڕینەوە، موزەفەرەدین لەگەڵ هەموو پادشاکانی کوردستان موخابەرەی کرد و بۆ ئیتاعەتکردنی سوڵتان دڵخۆشی دانەوە و چاووڕای دەست پێ کرد، هەموو پاشا و ئومەرایانی کوردستان قاقەزیان بۆ نوویسی و ئیتاعەتی سوڵتانیان قەبووڵ کرد و وەعدەیان دایێ بەماڵ و سوپا یارمەتی و کۆمەگی بکەن، لەو ڕێگایەدا بەڕاستی و بەدڵ و گیان بکۆشن. لە دەمێکی سوڵتان لە دیمەشق بوو نورەدین کوڕی قزڵ ئەرسەلان چووە خزمەتی، شەرت و قەراریان دا کە ئامێد گیرا سوڵتان بیدا بەنورەدین، لەودەمەدا کە سوڵتان لە بیرەجگ بوو، نورەدین بەقاقەزی ئەوەی وەبیر هێناوە. سوڵتان لە پاش گرتنی بیرە چووە سەر ڕەها، لە مانگی جەمادی یەکدا دەورەی دا وەتەنگی هێنا کوشتارێکی زۆر کرا و شەڕ گەرمبوو، ئەمیر فەخرەدین مەسعوودی زەعفەرانی خێوی ڕەها کە: تەماشای کرد، دەورەدانی لێ وەتەنگ هات و کوشتارێکی بێ ژماری لێ کرا، دوای کار و ئیشی بەخراپ هاتە بەرچاوان، گرتی قاقەزێکی لە سوڵتان نویسی، بەشەرتی ئەمینکردن شاری تەسلیم دەکا، سوڵتان ئەمنیەتی دایێ، بەو شەرتە شاریان بەدەستەوە دا، کە شار گیرا سوڵتان دەورەی قەڵای گرت و وەتەنگی هێنا، دزداری قەڵا بەئەمان و ئەمنیەت خواستن قەڵای تەسلیم کرد، ئەسپاب و خەزێنە و ماڵێکی هەبوو کەوتە دەست سوڵتان، بەشار و قەڵا و سوپاه و ئالاتەوە پێشکەش بەموزەفەرەدین کوک بەری کرد، لەوێوە چووە سەر حەران، لە پاش کەم شەڕێک حەرانیش گیرا، سوڵتان دیسان دایە موزەفەرەدین، ئەمجا موزەفەرەدین بوو بەخێوی ڕەهاوحەران و ڕەقە، لە پاشان سوڵتان کە چووە سەر مووسڵ شاری شمیسانی گرت و ئەویشی بۆ موزەفەرەدین خستە سەر ڕەها و حەران و ڕەقە.

سوڵتان کە چووە سەر نسێبین و خاپوور و ئەو دەورو پشتە، بەشەڕ گرتنی، تەمای لە مووسڵ گرتن کرد، لە نسێبین هەموو ئومەراکانی کوردستانی کۆکردنەوە و مەشوەرەتی چوونە سەر مووسڵی خستە پێشەوە و ڕوو بە چ شارێک چوو لێی خواستن، هێندێک لە

ئومەراکـانی داوای سەر مـووسڵ و هێندێک چوونە سەر ژەنگار و هێندێک چوونە سـەر جزیرە عـومەریان گرت، موزەفەرەدین گوتی: چوونە سەر جێگایانی تر چاکتـرە لە چوونە سـەر مـووسڵ، چونکو کە چووینە سـەر مـووسڵ مـوجاهیـدەدین قایماز و عـیـزەدین دەچنە قەڵایانی قـایمی کـوردستـان و خۆ دادەمـەزرێنن و لە دەست دەردەچن، بەڵام کـە جێگایانی دیکەمان گرت، مووسڵ بەئاسانی دەکەوێتەوە دەست، ناسرەدین محەمەدی کوڕی شێرکۆ، ئامۆزای سولتـان لەمێژبوو لەگەڵ سولتـان قەراری هەبوو، نزیک ١٠٠ هەزار دینار پارەی بۆ سـولتـان خـەرج کـردبوو کـە مـووسڵ گـیـرا بیـدرێتێ، لەبەرئەوە ناسـرەدین قـسـەی موزەفەرەدینی بەچاکزانی، ئەو مەشوەرەتەیان عـەرز کرد، سولتـان قسـەی موزەفەرەدینی قەبووڵ کـرد و ڕوو بەمووسڵ ڕۆیشتن. کـە سوپا نزیک بەمووسڵ بوو، سولتـان لە ئۆردوو جـوێ بووەوە. موزەفـەرەدین و ناسـرەدینی لەگـەڵ خـۆی هەڵگرت و سێ بەسێ چوونە سـەر جێگاییێکی بڵند و تەماشای شاری مووسڵیـان کرد، سولتـان مووسڵی گەورە و تونـد و دەورە بەشـوورە و بورج و باررووی کـەوتە بەرچاو، ڕووی لە موزەفـەرەدین و ناسرەدین کرد و پێی گوتن: ئێـوە منتان فریو دا و بەفـێڵ منتان کێشا سەر شارێکی گەورەی قایم ، ئێستـا کە ئەگـەر پەلامـاری بدەم و بشکێم نامـووس و شـەرەف و هەیبـەتم دەشکێ و ناتوانم خـۆ بگرمەوە. لە پاشان سولتـان گەڕاوە لەشکرگاهی خۆی. موزەفەرەدین و ناسرەدین گەلێک دڵخۆشی سولتـانیان داوە و خستیانە سەر هەوەسی چوونە سەر مووسڵ. سبەینێ کە ڕۆژ بووەوە مـووسـڵـیـان دەورەدا و هەر چار کـەناری شـاریان وەتەنگ هێنا ، مـەنجـەنیق و ئاگرهاوێژیان گرێدان و دەستـیـان کـرد بەبەرد و ئاگـربارانی مـووسڵ، تیـرهاوێژ لە هەمـوو لاییێکەوە هەڵمـەتیـان دەبرد. نە عـیـزەدین و نە مـوجـاهیـدەدین و نە لەشکرێک بۆیان دەرکەوتن، سـولتـان بەتکای سەدرەدینی شێخی شیوخ بەئەمانەت دەستی لە مووسڵ بەردا و چووە سەر شاری ژەنگار، بەکۆشەوە و کردنی موزەفەرەدین و ئومەراکانی کوردی زەرزاری کـە لەنێـو ژەنگار دادەنیـشتن، لە کـەلێنێکەوە دەروازەی باشـووریان بۆ سـولتـان کـردەوە، شـەرەفـەدین برای ئەتابەگی مـووسڵ کـە خێـوی ژەنگار بوو وەختـێکی لەوە ئاگـادار بوو، بێجگە لە ئەمان چارەییێکی نەدۆزیەوە و داوای ئەمانی کرد و سولتـان ئەمانی دا و شار و قـەڵای تەسلیم کـرا، لە نەتیجەی خزمـەتی موزەفـەرەدین گـەلێک جێگای تر کـەوتنە ژێر حوکمی سەلاحەدینەوە.

موزەفەرەدین لە گرتنی دیاربەکر و ئامێد و عـەینتاب و هەمـوو ئەرازی جزیرەدا خزمـەتی بێ ژماری بۆ سەلاحەدین کرد، چونکو لە فیکر و تەدبیردا نەدەخەڵەتا ، لە شەڕ و کوشتاردا

بێ ترس بوو ، لەبەرئەوانە ڕۆژ بەڕۆژ سولّتان حەزی لە موزەفەرەدین دەکرد و دەمبەدەم منەتداری دەبوو ، لە هەموو جێگایەکدا بەقەدر و حورمەت دەستی خۆشەویستی بەپشتەوە دەنا و گەورەی دەکرد.

سالّی ٥٧٨ و لە مانگی زیلحیجە ، سولّتان خوشکی خۆی کە ڕابیعە خاتوون بوو ، لە موزەفەرە موزەفەرەدین کۆکبەری مارە کرد ، ئەمجا خزمایەتی و زاوایەتی خۆشەویستبوونی زیاد کرد ، زرنگی و ئازایی و زەبەردەستی و تێگەیشتن و ڕاستی و غیرەت، ڕۆژ بەڕۆژ موزەفەرەدینی لەبەرچاوی سولّتان گەورە دەکرد ، خوا بەخت ویومنێکی وای دابوو بەموزەفەرەدین، لە ئومەرا و پادشایانی کوردستاندا نەیدابوو بەکەسێکی دیکە ، دەستی دەبردە هەر کارێکەوە با چەندە گرانیش بوایە ، بۆی ڕێک دەکەوت و بەئاسانی دەکەوتە دەستییەوە.

موزەفەرەدین گەلێک دلّی بەمووسلّەوە بوو و چاوی تێ بڕیبوو ، لەبەر حەزلێکردنی هەموو دەمێک قاقەزی لە سولّتان دەنووسی و گرتنی مووسلّی وەبیر دەهێناوە، لەو ڕێگایەدا کە مووسلّی دەستکەوێ ٥٠ هەزار دیناری بۆ سەلاحەدین پەخش کردبوو ، سولّتان لەوە کە گرتنی مووسلّی لەکن بەئەزیەت و گرانبوو ، ڕقی لەو نویسراوانەی موزەفەرەدین دەبووەوە ، ئەگەرچی موزەفەرەدین بوو بەسەبەبی گرتنی جزیرە و بۆ دەسخستنی جزیرە گەلێک تەقەلاّی دا و خۆی ماندوو کرد و زەرەری کێشا ، لە بەرابەری ئەو هەموو خزمەتەی بۆ سولّتانی کرد و ڕێگای چاکی نیشان دا ، سولّتان موزەفەرەدین ڕەنجیدە بوو.

سالّی ٥٨١ سولّتان بۆ گرتنی مووسلّ دووبارە خۆی کۆکردەوە و کەوتە ڕێگا ، کە گەیشتە حەران دەزبەجێ موزەفەرەدین کۆکبەری گرت و خستیە زیندانەوە، زۆری پێنەچوو ئومەراکانی کوردان لەو مەسەلەیە دلّگیر بوون و کەوتنە تەقەلاّ ، سولّتان لەوە ئاگادار بوو ، کەوتە ئەندێشە و ترسەوە، کە تەماشای کرد کاروباری حوکمداری و کیشوەرگیریی بەرئاوەژوو ڕووی وەرسووڕاند ، ڕۆژهەلاّت لە دەستچوون و تەشوبشاتێکی زۆر کەوتە نێو لەشکرگایەوەی هاتە بەرچاوان، گرتنی موزەفەرەدینی لە زەرەر زیاتر چیدیکە لێی نازێتەوە ، ئەمری دا بەریاندا و خەلاّتی کرد و بەئینعام و بەخشش و نوازش دلّشادی کرد.

کە سولّتان ڕووی لە مووسلّ کرد ، موزەفەرەدین بەسوپاهێکی قورسەوەی لە خزمەتدا چووە سەر مووسلّ ، لەبەرئەمە هێندێک بۆ ماملّەت کەوتنە نێوانی ، سولّتان تەمای

دەستهەڵگرتنی لە مووسڵ کرد، موزەفەرەدین و فەقێ عیسێێ هەکاری و ئەمیر ئەحمەدی کوڕی مەشتووبی هەکاری لە یەکە ئومەرایانی قیمەتداری سوڵتان بوون، ڕوویان لە سوڵتان کرد دەست لە مووسڵ بەردان مایەی شکستەی شەوکەتی سەڵتەنەتە، پیاو بەقسەی ژنێک کە کچی زەنگییە چۆن دەست لە مەملەکەتێکی وەکو مووسڵ بەردەدا. لەسەر ئەوە بۆ گرتنی مووسڵ ئامادە کرانەوە، موزەفەرەدین بەسوپاه و قوشەنێکی قورسەوە، کوردی حەران و سروج، زەینەدین یووسف برای خێوی هەولێر بەسوپاهی هەولێر و شارەزوورەوە، لەگەڵ هێندێک لە ئومەرایانی کوردستان، چوونە سەر مووسڵ، هەروەکو لە باسی زەینەدین یووسف گوترا، لای ڕۆژهەڵاتی مووسڵیان وەتەنگ هێنا، کوڕی مەشتووب لەولاوە چووە سەر خاکی هەکاری، قەڵای جزیرە و بۆتان و دەوروپشتی دەورەدا، ئومەرا و حوکمدارەکانی کوردی هەکاری بەسوپاه وماڵەوە یاریدەیان دا، شەڕ و کوشتار کرا و چەند جێگای سەختی ئەوێ گیران، موزەفەرەدین و زەینەدین ڕۆژهەڵاتی مووسڵیان توند کرد، هەموو ڕۆژێ شەڕ و کوشتار بوو، لە ئاخریدا سوڵتان بەمامڵەت مووسڵی بەردا. کە سوڵتان کشاوە، موزەفەرەدین بەلەشکریەوە چووە سەر شاری خڵات کە لە ڕۆژئاوای دەریاچەی وانەوەیە، لە جنووبی غەربی شاردا سوپاه و ئۆردووی دامەزراند، شەڕ و کوشتار دەست پێ کرا، خلاتی وەتەنگ هێنا، لەسەر ئەمە ئەهالی و ئەمیری خلات قاقەزی لە سوڵتان نوویسی کە سوڵتان لە میافارقین بوو، بەئەمری سوڵتان، موزەفەرەدین بەسوڵح دەستی لە خلات بەردا و بەشادییەوە گەڕاوە و چووە حەران.

هەر لەو ساڵەدا بوو، مانگی شەعبان موزەفەرەدین بەئەمری سەلاحەدین لەشکری بردە سەر مووسڵ و لە نسێبینەوە چووە کفرزەمار، لەو دەمەدا سوڵتانیش گەیشتە موزەفەرەدین، شەعبان و ڕەمەزانیان لە کفرزەمار بەسەربرد، لەولاوە عیزەدین ئەتابەگی مووسڵ کەوتە تەقەلای پاڕانەوە بەناردنی پیاوی خەلیفە و خۆیەوە، بەم شەرتە لە ڕۆژهەڵاتی زابەوە کە عیبارەتە لە هەولێر و شارەزوور و دەکۆکا، عیزەدین لێیان دەستبەرداربێ و حەقێکی بەسەر جزیرەشدا نەبێ، لە پاش گەلێک پاڕانەوە سوڵتان بەسوڵح دەستی لە مووسڵ بەرداوە.

ساڵی ٥٨٣ی ڕۆژی پێنج شەممە و جومعە و شەممە کە دووی هەتا پێنجی ڕەبیعی دووەم بوو، موزەفەرەدین بەسوپاهی کوردستانەوە لە واقیعەی حەتین لە مەیدانی کوشتار و شەڕی فەرەنگا پیاوانە کۆشا و هونەر و ئازایی دەنواند و کوشتارێکی وای کرد، هەموو موئەریخەکان لە مەدحکردن و پیداهەڵگوتنیا حەیران ماون، لە دەست و برد و چالاکی و

ئازاییدا لەو ڕۆژەوە بەناوبانگ هەموو ڕۆژهەڵاتی پڕ کرد، هەر شەڕێکی لەوەپاش کە دەکرا موزەفەرەدین ئاسا ناودەبرا، ئەومەرا و پادشایانی فەرەنگ بەسوپاهیانەوە پۆل پۆل بەدیل دەگیران و دەناردرانە پێش دەمی سەلاحەدین، ئەسپاب و کەلوپەل و ماڵ بەقەنتاران تاڵان دەکرا و دەخرایە ژێر پێی سەلاحەدین. سەرکەوتنی لەشکری سوڵتان و کەوتن و گرتنی فەرەنگ لە سایەی غیرەت و دەست و بردی موزەفەرەدین بوو، لەو ڕۆژەدا گەلێکی خزمەت کرد و گەلێک یاریدەی سوڵتان و عالەمی ئیسلامەتی دا و بەڕاستی چاک سەرکەوت.

موزەفەرەدین لە پاش واقیعەی حەتین لە تەبەریە و عەکادا گەلێک خزمەتی شایستە و ئازایی و زرنگی و سەداقەتی نیشاندان، کە عەکا گیرا موزەفەرەدین گەڕاوە جێگای خۆی و لەگەڵ ئوموری حوکمداریی کوردستان و لەشکر و سوپاه و ڕەعیەتپەروەری خەریکبوو. لە تەئریخی عیمادەدینی ئیسپەهانی و بەهائەدین کوڕی شەدادا هاتووە کە: موزەفەرەدین کۆکبەری لە غیرەت و ئازایی و هەڵمەتاندا و لە خۆڕاگرتن و چوونە پێشدا و لە وەختی تەنگانی و سەختیدا، سەبر و تەحەمولێکی ئاوای دەکرد، لە ئومەراکانی دیکەدا نەدەتیرا. بەو سیفەتانەی لە سەرەوە بێژران، لەنێو هەموو حوکمدار و ئومەراکانی کورد و ڕۆژهەڵاتا ناوی کردبوو و خۆزی پێ دەخوازرا، با خسووس واقیعەی حەتین زیاتر ناوی بەنێو ڕۆژهەڵاتا بڵاو کردەوە، چونکو ئەو نەبوایە فەرەنگ زۆری هێنابوو بۆ کوردان و ئومێدی چاکە چاودێری نەدەکرا. بەڵام موزەفەرەدین بەسوپاهی کوردی حەران و سروج و ڕەها و جزیرە بەجارێک کۆمەڵەی فەرەنگی بڵاو دەکردەوە. هەر بەدەست موزەفەرەدین نەسرەت و زەفەر کەوتە دەست سوڵتان.

ساڵی (٥٨٥) فەرەنگ بەقووەتەوە چوونە سەر عەکا، سەلاحەدین قاقەزی بۆ هەموو حوکمدارەکانی کوردستان نارد و داوای یارمەتی لێکردن. موزەفەرەدین بەسوپاهی کوردانەوە هەستا گەیشتە فریای سەلاحەدین، لە هەموو شەڕ و کوشتاری فەرەنگیدا لەگەڵی بوو، لەو شەڕانەی کە لە تەواریخاندا مەشهوورن، موزەفەرەدین هەر بەگیان و دڵ دەکۆشا و ئازایەتی خۆی و میللەتی نیشان دەدا.

(ابن الاثیر) لە تەئریخی (الکامل)دا دەڵێ: لە شەڕی مەشهووری عەکادا زەینەدین یووسف خێوی هەولێر بۆ یاریدەدانی سوڵتان بەلەشکری کوردی هەولێر و شارەزوورەوە چووە سەر عەکا، لە پاش چەندێک نەخۆشی لە ١٨ی ڕەمەزانی ساڵی ٥٨٦دا لە شاری ناسیرە لە نزیک عەکایە مرد. لە عیمادەدین کاتب لە کتێبی (البرق الشامی)دا دەگێڕێتەوە و دەڵێ: کە بیستمان زەینەدین مرد بۆ سەرەخۆشی چووینە لای موزەفەرەدین

کە برا گەورەی زەینەدین بوو، لەو برایەش زیاتری نەبوو چاومان پێکەوت، موزەفەرەدین هەموو ئومەراکانی زەینەدینی برای خۆی گرتبوون و لەنێو چادردا سندمی خستبوونە پێیانەوە، یەکێک لەوانە (ئەمیر بەلداجی) خێوی خەفتیزەکان بوو، ئەویش لەوانە دەترسا کە لێی ڕووگەردان بن و ئیتاعەتی نەکەن، موزەفەرەدین لەگەڵ وەدەستخستنی حوکمداریی هەولێر خەریکبوو. موزەفەرەدین لە پاش مردنی زەینەدینی برای، قاقەزێکی لە سوڵتان سەلاحەدین نوویسی و لەوێدا گوتی: کە دەست لە حەران و قەڵای ڕەها و شەمسیات و دەوروپشت هەڵدەگرێت، بۆ ئەمەی سوڵتان لە بری ئەوانە هەولێر و دەوروپشتی دەربەندی قەرابلی و قەفچاق و شارەزوور بەتەمامی بداتێ، سوڵتان بەوە دڵخۆش بوو، ئەمریان دایە موزەفەرەدین و ئیزنی خواست و ڕوو بەهەولێر ڕۆیشت. لە مانگی زیلحیجەی ساڵی (٥٨٦) گەیشتە هەولێر، ئەهالی پێشوازییان کرد و بەئیحتیرامەوە بەردایان و داخیلی قەڵایان کرد. بەموددەتێکی زۆر کەم خاکی شارەزوور و دەکۆک ، خەفتیزەکان و دەربەندی قەرابلی و قەفچاقی خستە ژێر حوکمەوە. ئومەرا و سەردارانی کورد بەدیاری و بەخششەوە چوونە لای و ئیتاعەتیان قەبووڵ کرد. موزەفەرەدین بوو بەبەلایەکی گەورە و بارێکی قورس لەسەر گیان و ڕۆحی بنەماڵەی ئەتابەگانی مووسڵ و موجاهیدەدین قایمەز. موزەفەرەدین کە ئومووری هەولێر و حوکمداریی خۆی ڕێکخست، دەستی بەئاوەدانکردنی شار و قەڵا و بازاڕ و جێگایان کرد، لە دەورەی قەڵای هەولێرەوە دیوارانی قایمی دامەزراندەوە و دەوروپشتی کردە خەندەقێکی قووڵ، لە دامێنی شار ڕوو بەجنووب بازارێکی گەورە و گەلێک کاروانسەرا و خانەگایەکی زۆر گەورەی بینانا و منارەیێکی بڵندی لە نێوەڕاستی حەوشەی ئەو خانەگایە دامەزراند، کە ئەمڕۆکەش ئەو منارەیە ماوەتەوە بەڵام گەلێک جێگای وێرانە. لە دەوروپشتی شار هەروەکو لە نەقشەدا دیارکراوە شوورەیێکی پانی بەدەوری شاردا کێشاوە و بەکونگرە و سەنگەر قایمی کرد، دەورەی ئەو شوورەشی کردە خەندەقێکی قووڵ و پان و پڕ لە ئاوی کرد. لە هەموو لاییێکەوە عولەما و زانا و کارگەر و پیشەکارانی بەئینعام و بەخشش دڵخۆشی دەداوە و دەیبردنە هەولێر. هەتا بەموددەتێکی کەم شاری خوارەوەی قەڵای هەولێری وا ئاوا کرد کە جێگای خانووی تێدا دەست نەدەکەوت.

ساڵی ٦٠٠ ئەتابەگی مووسڵ نورەدین چووە سەر مووسڵ. موزەفەرەدین ئەو دەمەی بەکەلێن زانی و سوپاهی کۆکردەوە و پەلاماری مووسڵی دا، دێهات و ئاواییەکی لەسەر ڕێگادا بوون، کە لە زاب پەڕیەوە تالانی کردن و گرتنی، هەتا گەیشتە نەینەوا. بەشەڕ

نەینەوای گرت و تالانی کرد و دوکان و بازاڕەکەی هەموو سووتاند و دەوری شاری مووسڵی دا. نایبی مووسڵ خەبەری دا ئەتابەگ و کرداری موزەفەرەینی پێ ڕاگەیاند. ئەتابەگ بەئومێدی چوونە سەر هەولێر لە نسیبینەوە بەتالووکە خۆی گەیاندە مووسڵ. موزەفەرەدین لەولاوە ئاگادار کرا و بەپەلە سوار بوو لە زێ پەڕیەوە و گەڕاوە هەولێر. لەو دەمەدا مەلیک ئەشرەفی کوڕی مەلیک عادیلی ئەیووبی قاقەزێکی لە موزەفەرەدین نوسی: ئەگەر بچێتە سەر مووسڵ ئەویش لەولاوە ئەتابەگی وەتەنگ بێنێت، کە موزەفەرەدین مووسڵی بگرێ و بیخاتە ژێر حوکمەوە مەلیک ئەشرەف یاریدەی بدات و مووسڵیشی بۆ بخاتە سەر هەولێر. موزەفەرەدین بەنوسراوان لەگەڵ مەلیک ئەشرەف ڕێککەوتن و دەستی بەخۆ کۆکردنەوە و سوپا ڕێکخستن کرد، لە کۆشەوە دابوون نوورەدین بەلەز چووە سەر مەلیک ئەشرەف پێشی پێی گرت، موزەفەرەدین هەتا وەخۆ کەوت بچێتە سەر مووسڵ نورەدین لە دەست مەلیک ئەشرەف شکستی خوارد و گەڕاوە مووسڵ و ئیتر فرسەتی لە دەستچوو.

ساڵی ٦٠٢ موزەفەرەدین لەگەڵ عەلائەدینی خێوی مەراغە موخابەرەی کرد و ڕێککەوتن کە: بچنە سەر ئەبوبەکر پەهلەوانی خێوی تەورێز، لە پاش ڕێککەوتنیان موزەفەرەدین سوپاهێکی قورسی کۆکردەوە و ڕوو بەمەراغە ڕۆیشت، لەولاوە عەلائەدینی کوڕی ئەحمەدێل لەشکری کوردی ئاوربایەگانی خڕ کردەوە و چاوەنۆڕی موزەفەرەدینی کرد. موزەفەرەدین بەعیزەت و پێشوازیکردنەوە گەیشتە مەراغە و بەهەموو لایێکی ڕاگەیاند کە ئەبوبەکری پەهلەوان شەو و ڕۆژ مەستە و شەراب دەخواتەوە و ئاگای لە مەملەکەت و ڕەعیەت نییە و شەریعەتی خستۆتە پاشەوە و لابردنی بەشەرع واجیب بووە، بەو بهانەیە سوپاهی خۆیان هەڵگرت و ڕوو بەتەورێز لە مەراغە دەرکەوتن.

ئەبوبەکر پەهلەوان کە لەوە ئاگادار بوو، قاقەزێکی لە ئیتغمش خێوی هەمەدان و ئیسپەهان و ڕەی نوویسی و هاواری لێ کرد. ئیتغمش لە نزیک قەزوین لەگەڵ ئیسماعیلییەکان شەڕی دەکرد، بەلەز ڕوو بەتەورێز ڕۆیشت و قاقەزێکی لە موزەفەرەدین نوویسی: ئێمە ئیعتیمادێکی تەواومان بەتۆ هەبوو کە: پیاوێکی نوێژکەر و بەدین و خێرخوا و موسالەمەتپەروەر و دوورە شەڕی، بەڵام ئێستا بەرئاوەژی ناوبانگت دەبیستینەوە، ئەوە لێمان ئاشکەرا بوو کە لە فەسادی و شۆڕش و شەڕ و فیتنە دەگەڕێی، من حەز ناکەم خۆ دووچار بەبەلا و شەڕ بکەی، دەست لەو فیکرە بەردان بۆ پاشەڕۆژت خێری تێدایە.

موزەفەرەدین کە ئەو قاقەزەی گەیشتێ دڵی نەرمبوو کوڵی گریانی هەستا و لەو چوونە پەشیمان بووەوە و تەمای گەڕانەوەی کرد. عەلائەدین پێی گوت: نە بۆ من و نە بۆ تۆ چاک نییە بگەڕێیتەوە، چونکو ئێمە سوپا و لەشکرمان کۆکردەوە و هەموو کەس پێی زانی، ئێستاکەش بگەڕێیتەوە، حکوومەت و مەملەکەتی منی تێدا وێران دەبێ، ئەوە سوپاه و ئەوە مەملەکەت و ئەوە ڕەعیەت، وەکو عایلەی پەهلەوان لێم داگیر بکەن تۆ بیخە ژێر حوکمەوە. عەلائەدین هەرچەندە پاڕاوە و کۆششی کرد موزەفەرەدین لە گەڕانەوەی دەستی هەڵنەگرت و ڕازی نەبوو. عەلائەدین چەند تەقەلای دا و دەلایل و بورهان و چتی نیشان دا چارەی نەکرد. موزەفەرەدین بەسوپاهی خۆیەوە سواربوو، بەدۆڵ و دەرە و چیا و هەڵدێری سەخت و گرژدا گەڕاوە هەولێر.

ساڵی ٦٠٦ مەلیک عادیلی برای سەلاحەدینی ئەیووبی تەمای گرتنی ژەنگاری کرد، موزەفەرەدین بەپشتیوانی خزمەتەکانی پێشووی و سەداقەتی لەگەڵ عایلەی ئەیووبیاندا لە خۆی ڕاددیت کە تکای هەرچییەک لە هەر ئەفرادێکی ئەیووبیان بکرێت لێی قەبووڵ دەکەن و ئیحترامی دەگرن. گرتی قاقەزێکی لە مەلیک عادیل نوبسی و خواهیشتی لێ کرد ژەنگار بکا بەخاتری ئەو و بیبەخشێت. قاقەزی موزەفەرەدین کە گەیشتە دەست مەلیک عادیل، بەساردی و قەبووڵ نەکردن قاسیدەکەی بەدڵشکاوی ناردەوە پاش. موزەفەرەدین لەوە گەلێک دڵگیر بوو و زۆری پێ ناخۆش هات، لەو دەمەوە ڕووی لە سەڵتەنەتی ئەیووبیان وەرگێڕا و قەبووڵی نەکردن. موزەفەرەدین لەسەر ئەو کارە ئەمجا بۆ هەواڵ پەیداکردن و پشتیوانی سەعی کرد کە خۆ لە شەڕی مەلیک عادیل بپارێزێ. گرتی قاقەزێکی لە مەلیک زاهیری غازی کوڕی سەلاحەدین خێوی حەلەب نوبسی و یەکێکی لە کەیخوسرەوی کوڕی قلیج ئەرسەلان خێوی ڕۆم نوبسی و کردنیە هاودەنگی خۆی و لەگەڵیان ڕێککەوت، ئەوانیش جوابیان داوە: هەردەمێکی مەلیک عادیل قسەیێکی موزەفەرەدین قەبووڵ نەکات، هەر کەسەی لە سنووری خۆیەوە هەڵمەتی بەرنە سەر خاکی عادیل و بیگرن. بەو شەرتانە موزەفەرەدین گەلێک کۆمەگی پەیدا کرد.

کوڕانی زەنگی لەگەڵ یەکتر نێوانیان تێکچووبوو. مەلیک عادیل ئەوەی بەکەڵێن زانی، لە شامەوە ڕوو بەخاکی قوتبەدین کشا. قوتبەدین و نورەدینی خێوی مووسڵ لە بەرابەر مەلیک عادیلدا جگە لە شەڕ و پێشپێگرتن چارەیەکیان نەدۆزییەوە و لەگەڵ خۆ کۆکردنەوە خەریکبوون. موزەفەرەدین کە لەوە ئاگادار بوو، ڕۆژی تۆڵەی کەوتەوە بیر. ئەو ڕۆژەی لە مەلیک عادیل بەکەڵێن زانی و دەزبەجێ قاقەزێکی لە قوتبەدین ئەتابەگی

نوبسی و دایە دەست وەزیری خۆی و ناردیە مووسڵ. وەزیر بەشەو گەیشتە سەر دەجلە و خەبەری دا، بەلەز کەشتییان بۆ ساز کرد و پەڕاندیانەوە. وەزیر چووە لای نورەدین و قاقەزەکەی دایە دەستی. نورەدین بەدرەجەییێکی نیهایەت شادبوو، چونکو مەسەلەی موزەفەرەدین بەهیچ کلۆجێک نەدەکەوتە بیری کەسەوە. کە قاقەزەکەی خوێندەوە، موزەفەرەدین لێی نوویسیبوو: بۆ نەهێشتنی مەلیک عادیل بەهەموو جۆرێک یاریدەی دەدەم و شەرتی ئیتفاقیش لەسەر داخوازی ئەوان بێت.

نورەدین بەو شەوە و بەسوێندخواردن و شەرت و قەرار ڕێککەوت و شرووتی ئیتفاقیشی خستە بەر ویجدانی موزەفەرەدینەوە کە: هەرچۆنێک دڵخوازی بێ ئەو ڕازییە. بەو جۆرە نورەدین جوابی قاقەزی نوبسیەوە و بەئیحترامەوە وەزیریان بەڕێ کرد.

موزەفەرەدین گرتی قاقەزی لە خەلیفە ناسرەدین بیللا نوبسی کە: مەنعی مەلیک عادیل بکەن نەچێتە سەر مووسڵ و بەسوڵح ژەنگار لە دەست شەڕی ڕزگارکەن و خەلیفە پیاوێک بنێرێتە لای مەلیک عادیل کە دەست لە ژەنگار بەردا و با نەبێتە مایەی شەڕوشۆڕ. موزەفەرەدین بەسوپاهی کوردانەوە چووە کۆمەگی نورەدین لە مووسڵ، قەرارگاهی لەشکری دامەزراندەوە و جوابی نارد لە هەموو لایێکەوە ئومەرایانی کورد لەسەری کۆبوونەوە و چاوەنۆڕی هاتنی عادیلیان کرد و بەئومێدی پیاوی خەلیفە بوون، مەلیک عادیل لەولاوە ژەنگاری دەوردا، خێوی ژەنگار بەپشتیوانی موزەفەرەدین و ئومێدی یارمەتی بەچست و چالاکی بەرابەر بەمەلیک عادیل ڕاوەستا، لە دواییدا قاسیدی خەلیفە و پادشاکانی دیکە گەیشتنە لای موزەفەرەدین و بەهەموو لایەکەوە کەوتنە سەر مەلیک عادیل و ناچاری ماملەتیان کرد و بەسوڵح ژەنگاری بەردا و لە دەست خێوی خۆبدا قەرارگیر بووەوە. لەو دەمانەی موزەفەرەدین لە مووسڵدا چاوەنۆڕی قاسیدانی دەکرد، دوو کچی خۆی لە دوو کوڕی نورەدینی خێوی مووسڵ مارەکردن، کوڕەکان یەکی عیزەدین مەسعوود و دووەم عیمادەدین زەنگی بوون. لە پاش شادی و کەیف موزەفەرەدین گەڕاوە هەولێر و لەگەڵ تەدبیر و ئیدارەی مەملەکەتی خۆی خەریکبووە.

ساڵی ٦١٢ خەلیفە لە خێوی هەمەدان مەنکەلی ڕەنجیدە بوو، هاواری لە هەموو ئومەرا و حوکمدارەکانی کوردستان و باقی ئومەرایانی دیکە کرد، موزەفەرەدین بەلەشکری هەولێرەوە چووە سەر مەنکەلی و بەشەوکەت و شانی کوردایەتییەوە لە ناو هەموو حوکمدارەکاندا سەرکەوت و بەموەفەقی و فەتحوزەفەر گەڕاوە و دەنگی ئازایی و تەدبیری

دونیای پڕ کرد.ساڵی ٦١٥ عیمادەدین زەنگی کە زاوای موزەفەرەدین بوو، لەسەر ئاکرە حوکمداری دەکرد، سوپاهی کۆکردەوە و چووە سەر زۆزان و هەکاری، بەدرەدین خێوی مووسڵ کە کوڕی مەلیک قاهیر بوو، بۆ بەرابەری عیمادەدین لەشکرکێشی کرد و چووە سەر موزەفەرەدین چونکو پشتیوانی عیمادەدین زەنگی بوو. لە بەدرەدینی گێڕاوە و گوتی: من شەرتێکم لەگەڵ بابی ئەوان کردووە کە خۆ لە مووسڵ و ئەترافی نەگەیێنم و حەز دەکەم شەرتی خۆم نەشکێنم، بەڵام کەسێک دەست باوێژێتە هەکاری و زۆزان و یەکێکی دیکە بچێت پێشی پێ بگرێت، ناچار دەبم بەرابەری بکەم و یەکە کەسێکی هەڵمەتی بەرێتێ ئەمن دەبم، بەدرەدین لە ترسی موزەفەرەدین نەیوێرا بچێت و بەناچاری گەڕاوە. موزەفەرەدین یاریدەی عیمادەدینی دا زۆزان و هەکاری و شووشیشی کەوتە ژێر حوکمەوە. لە پاش گرتنی ئەو خاکانە سوپاهی هەولێر چوونە جێگای خۆیان. لەولاوە بەدرەدین خێوی مووسڵ لەگەڵ مەلیک ئەشرەف بەمامڵەت ڕێککەوت، مەلیک ئەشرەفیش لەگەڵ حوکمدارانی حەسەنکێف و ئامێد و ماردین گرێی یەکەتی و ئیتفاقیان گرێدا، مەلیک ئەشرەف لە موزەفەرەدینی نوبسی: ئەمرۆکە فەرەنگ لەسەر ئێمە شاڵاوی هێناوە لە بری یاریدەم بدەن ڕۆژی دوژمنایەتی نییە، ئەگەر کۆمەکیشم نەکەن دوژمنم بۆ پەیدا مەکەن، وا چاکە لەسەر ڕەوشت و قاعیدەی پێشوو بەئیحترامی خۆتانەوە دامەزرێنەوە و خۆ تێکەڵ بەشەڕ و کوشتار نەکەن و کەلێن نەخەنە دەست دوژمنان، ئەگەر وانەکەن ناچارم بەسوپاهێکی قورسەوە دێمە سەرتان... مەلیک ئەشرەف ئەو قاقەزەی نارد و جوابی نەدراوە چونکو لەگەڵ حوکمدارانی حەلەب و ڕۆم ڕێکبوون. بەڵام بەو قاقەزە زیاتر ئەهەمیەتی بەهێز پەیداکردن و سوپاه و ئالەتی شەڕدا. مەلیک ئەشرەف بەسوپاهەوە ڕوو بەنسیبین ڕۆیشت کە یاریدەی بەدرەدین بدات.

بەدرەدین کە وایزانی بەسوپاهەوە چووە سەر ئامێدی کە لە دەست عیمادەدین خێوی ئاکرە حەمیدیدا بوو. موزەفەرەدین بەسوپاهی هەولێر و شارەزوورەوە یاریدەی عیمادەدینی دا، بەڵام هەتا لەشکری هەولێر کۆکراوە. بەدرەدین لەبەر دامێنی ئاکرە بەسەر عیمادەدینی دادا و شکاندی. ئەویش بەپەرێشانی خۆی گەیاندە هەولێر و پەنای بردە بەر موزەفەرەدین، موزەفەرەدین بەوە زۆر دڵگیر بوو.

٢٠ی مانگی ڕەجەبی ئەو ساڵە موزەفەرەدین لەشکری کۆکردەوە و بەقووەتەوە چووە سەر مووسڵ کە لە زێ پەڕیبیەوە هەتا نزیک مووسڵ بەتاڵان و وێرانکردن ڕۆیشت و لەشکری بەدەوری مووسڵدا بڵاو کردەوە و گەلێکی خراپی کرد. بەدرەدین بەپەلە کوڕێکی خۆی

نارده حەلەب و هاواری بردە بەر مەلیک ئەشرەف، لەولاشەوە لەشکری ئەشرەف لە نسێبین بوو. بەدرەدین لەوانیش پاراوە کە یاریدەی بدەن. ئەمیر ئەیبەگ سەرلەشکری ئەشرەف بوو، بەلەز خۆی گەیاندە مووسڵ و تەمای چوونە سەر هەولێری کرد. بەدرەدین نەیهێشت و پێی گوت: ماندووتان بحەسێننەوە لە پاشان لە دەجلە بپەڕنەوە و بچن. موزەفەرەدین لەولاوە کە هاتنی ئەیبەگی بیست لەشکری هەڵگرت و عیمادەدینی لەگەڵ خۆی خست و ڕوو بەمووسڵ لە زێ پەڕیەوە و خشا. بەدرەدین کە وایزانی لەشکرەکەی لە موزەفەرەدین پڕ کرد و بزاوتنی و ڕازاندنیەوە و تیپی دامەزراندن و ڕاست و چەپی ڕێکخست و پاش و پێشڕەوی سوپاهی ڕاگرت و پیاوە ئازا و ناودارەکانی خستە کەنارەوە، یەکێک لە ئومەرا گەورەکانی لە لای ڕاست دانا و ئەمیرەکانی دیکەی لە چەپەوە سازکردن. شەوی نزیک خەوتنان ئەو ئەمیرە کە لە ڕاستەوە بوو، تەمای چوونە لای چەپی لەشکری کرد، دوژمنی بەقووەت کەوتە بەرچاو. موزەفەرەدین لەولاوە باڵی ڕاستی سوپای بەدرەدینی پێچاوە و وەتەنگی هێنا و پەلاماری دا و بڵاوی کردەوە، هەڵمەتی باڵی چەپی دوژمنی دا و شکاندی. بەدرەدین چونکو لەنێو چەپی سوپادا بوو، لەو دوو باڵە شکاوە ئاگادار نەبوو، لە پڕدا موزەفەرەدین ڕوو بەسینگی دوژمن هەڵمەتی برد، ئەیبەگ و بەدرەدین هەرچەند کۆشان، ڕاوەستان مومکین نەبوو، لە پاش شەڕ و کوشتارێکی زۆر، موزەفەرەدین لە سێ فرسەخێکی ڕۆژهەڵاتی مووسڵ، بەدرەدین و ئەیبەگی بەپیسی شکاند و تاڵان و ئەسیرێکی زۆری دەستکەوت. بەدرەدین هەڵات و موزەفەرەدین کەوتە سەری و نزیک سپێدە بەدرەدین و ئەیبەگ و سوپاهێکی لە کوشتار ڕزگار ببوو، بەهەزار ئەزیەت و پەرێشانی خۆیان گەیاندەوە مووسڵ و لە دەجلە پەڕینەوە و چوونە قەڵای مووسڵەوە و دەروازە و بورجیان گرێدان. ئەهالی مووسڵ کە تەماشایان کرد بەدرەدین بەساغی ڕزگار بوو، دڵشاد بوون.

موزەفەرەدین هەر لە دووی شکستە بوو، بەتاڵان گرتن و کوشتار گەیشتە سەر دەجلە و دابەزی، سوپاه و ئۆردووی کۆکردنەوە، ئەسیران و تاڵانی بەبەردەمدا ڕابواردن. لەو بەرەوە مووسڵییەکان بەدڵتەنگییەوە چاویان لێی بوو، بەڵام چی لە دەست نەدەهات. لە پاش کەمێک ئاسوودەگی ماندوو حەساندنەوە، چوونە سەر نەینەوا و گرتیان، سێ ڕۆژ لەوێدا دانیشتن، لە هەر چوار کەناری مووسڵەوە تاڵان و گرتن کرا، لە دواییدا موزەفەرەدین بەکەیف و شادمانی چووە هەولێر و لە زاب پەڕیەوە. بەدرەدین پیاوانی گەورە و کەیخودایانی شاری نارده لای موزەفەرەدین، لەسەر زاب گەیشتنە موزەفەرەدین و بناغەی

مامڵەتیان لەسەر ئەوە دامەزراند: لەو ڕۆژەوە بەولاوە هەر کەس لەسەر خاکی خۆی حوکمداریی بکا، ئەو خاکەی لە ژێردەستیدا بووە هەر بمێنێت و کەس لەگەڵ کەس شەڕ نەکا و بەدۆستی ڕایبوێرن. لەسەر ئەوە مامڵەت قەرارگیر بوو و گەڕانەوە جێگای خۆیان. عیمادەدین چووە سەر مەملەکەتی خۆی، جگە لە قەڵای کاواش هەمووی خستە دەست، پیاوی موزەفەرەدین لەسەر مەسەلەی قەڵای کاواش کە لە هەموو قەڵاکانی هەکاری و زۆزان قایمتر بوو هاتوچۆی کرد، بەدرەدین نەیدا بەدەستەوە، هەر لەسەر ئەوە نەختێک مامڵەتەکە بەساردی ماوە.

موزەفەرەدین دیسان لەگەڵ پادشا و حوکمدارەکانی دوور و نزیک و دەوروپشت دەستی بەموخابەرە و یەکەتی کردەوە و هاودەنگانی زۆرکردن و لە مەلیک ئەشرەفی وەرگێڕانەوە و نەیهێشت حوکمدارێک بەمەلیک ئەشرەفەوە دڵگیر بێت و هەمیشە بۆ ڕێکنەکەوتنیان لەگەڵ مەلیک ئەشرەف لە کۆشەوەیەکی زۆر دابوو، دایمە حوکمدارەکانی لە کردەوەی مەلیک ئەشرەف ئاگادار دەکردن. پادشاکان بەقسەی موزەفەرەدین ئیعتیمادیان هەبوو و پێیان باوەڕ دەکرد و هەرچییەکی بگوتبایە بەڕاستیان دەزانی بەدرەدین لە ڕقی موزەفەرەدین چوو لەگەڵ مەلیک ئەشرەف ڕێککەوت و بزووتنەوە و کۆششی موزەفەرەدینی بۆ نوبسی. موزەفەرەدین بەپەنهانی لەگەڵ ئومەراکانی مەلیک ئەشرەف موخابەرەی دەست پێ کرد، بەشەرت و قەرار هەمووی کردنە هەواداری خۆی، گەورەترین ئومەرایانی ئەشرەف ئەمیر ئەحمەدی کوڕی مەشتووب کوردی هەکاری و ئەمیر محەمەد عیزەدین کوردی حەمیدی ئاکرەیی و چەند ئومەرایانی دیکەی سەردار و سوپاهی لە ئەشرەف جوێکردنەوە و بەئومێدی چوونە هەولێر کەوتنە ڕێگا. لەولاشەوە خێوی دیاربەکر و خێوی ماردین مەلیک ئەشرەفیان لە چوونە مووسڵ مەنع کرد و نەیانهێشت بەهاواری بەدرەدینەوە بچێت، بەناچاری بەسوڵح پێکهاتن. بەڵام ئەشرەف هەر ڕووی لە مووسڵ کرد و ڕۆیشت. موزەفەرەدین کە لەوە گەیشت، لەشکری هەڵگرت و چووە سەر زاب و لە گوندێک (دێ) کە بە (سەلامە) دەناسرێ دابەزی. لەودەمەدا وەڵامی خێوی دیاربەکری گەیشتێ و پێیان ڕاگەیاند کە لەگەڵ مەلیک ئەشرەف مامڵەت کراوە، لە قاقەزێکی بۆی هاتبوو نوبسرابوو کە: ئێمە لەگەڵ ئەشرەف ڕێککەوتین، بەڵام هەرچۆنێکی موزەفەرەدین پێی خۆشبێ و داوا بکا لەگەڵی یەک و هاواڵن... موزەفەرەدین بەوە دڵشاد بوو، بەکەیفەوە گەڕاوە هەولێر. دیسان قاقەز لەسەر قاقەزی لە ئومەرا و حوکمدارەکانی دەنوبسی کە لە یەک ئاگادار بن و لە دوژمن بێباک دانەنیشن و خۆشەویستی سست نەکەن. سالی ٦١٧ تەتەر لە

ئاوروپایگانەوە بەخراپەکردن چوونە سەر مەراغە و فیتنە و فەساد و کوشتارێکی زۆریان لەو خاکەدا کرد. موزەفەرەدین لە ترسی ئەمە نەبادا بەدۆڵ و دەرە و تەنگی کوردستانی سۆراندا لە چیایان سەرکەون و هەولێر وەتەنگ بێنن، قاقەزی لە هەموو حوکمدارەکانی نزیکی نوویسی کە بەسوپاه و لەشکر یاریدەی بدەن. بۆ بەدرەدینی خێوی مووسڵیشی نوبسی بەسوپا یاریدەی بدات تاکو لە پێش تەتەردا بچێتە سەر ڕێگایان و نەهێڵێت لە کێوان سەرکەون. موزەفەرەدین لە هەموو لایەکەوە سوپاهی کۆکردەوە. ساڵی ٦١٨ی مانگی سەفەر بەو قووەتەوە چوو هەموو جێگا بڵند و تەنگەکانی گرت و ڕێگای تەتەری بڕیەوە، چونکو لەو کێوانەدا جێگای وا هەبوو تەنها پیادەیەک نەبوایە ڕێگای هاتوچوونی نەدەبوو. موزەفەرەدین بۆ ئەمە ئەو ڕێگایانە لە دەست دەرنەچێ، لە پێشدا هەمووی خستە ژێردەستی خۆیەوە. تەتەر لە ئاوروپایەگانەوە ڕوو بە(دەکۆک) ڕۆیشتن، موزەفەرەدین بەلەشکرەوە چووە دەکۆکا و پێشی بەتەتەر گرت، تەتەر لە ترسی موزەفەرەدین نەیانوێرا خۆ بنوێنن و دەستیان لە دەکۆک بەردا و بەپەرێشانی ڕوو بەئاوروپاییەگان گەڕانەوە، پاشی موزەفەرەدین لەگەڵ سوپاهی هەولێر مووسڵ و شارەزوور بەتالانێکی زۆرەوە گەڕانەوە.

ساڵی ٦٢١ موزەفەرەدین گرتی و قاقەزی نوویسین و ناردنی بۆ شەهابەدین غازی ئەیووبی خێوی خلات و بۆ مەلیک موعەزەم مووسا خێوی دیمەشق کە لەگەڵی ڕێککەون و هەریەک لە سنووری خۆیەوە، خاک لە مەلیک ئەشرەف بیگرێت و موزەفەرەدین بچێتە سەر مووسڵ و بیخاتە دەست، ئەوانە هەریەک لە جێگای خۆیەوە بزووتن و چوونە سەر خاکی مەلیک ئەشرەف، لەولاوە موزەفەرەدین لەشکری کۆکردەوە و چووە سەر مووسڵ. بەڵام هەرچێکو مەلیک موعەزەم بوو کە ڕوو بەخاکی ئەشرەف بزووت، برای لە میسرەوە هاواری لێ کرد، بەناچاری لەوە دەستی هەڵگرت و جڵەوی خۆی و سوپاهی بەر میسر سووڕاند و بەهاواری برایەوە چوو، هەرچێکو خێوی خلات بوو نەپەرژا ببزوێتەوە، مەلیک ئەشرەف گەیشتە سەری و گرتی و لە پاشان لە گوناهی خۆشبوو. موزەفەرەدین کە بەلەشکرەوە ڕووی لە مووسڵ کرد، ڕۆژی ١٣ی جەمادی دووەم دەورەی مووسڵی وەتەنگهێنا و بۆ شەڕ و کوشتار ئامادە بوو، چاوەنۆڕی کۆمەگی دەکرد و بەئومێدی ئەوەش کە مەلیک ئەشرەف بۆی بگرێتەوە و نەچێتە سەر خلات، مەیدان بۆ غازی چۆڵ بکا. بەدرەدین لوولوو لەوە زۆر ترسی هەبوو، هەموو دەم سوپاهی سازبوو. لە بەختی موزەفەرەدین لەودەمەدا لەشکرەکەی لەگەڵ مەلیک ئەشرەف ناردبووە سەر خلات، لە مووسڵدا دانەوێڵە و خواردەمەنی قاتوقڕی و گرانی تێ کەوتبوو، ئەهالی مووسڵ زۆر وەرز ببوون. موزەفەرەدین ١٠ ڕۆژان مووسڵی

وەتەنگ هێنا. ڕۆژی جومعە و حەوتەمی مانگی جەمادی مابوو، مووسڵ گرتنی بەبێ خوێنڕژتن لە لای گرانبوو، ئەویش لە خوێنڕێژی هەژارانی حەز نەدەکرد، هەروەها بۆ خۆشی دانەوێڵە و خواردنی کەم پێمابوو، لەولاشەوە ئەشرەفیش خلاتی گرتبوو غازی بەدیل گیرابوو. موزەفەرەدین لەو چوونە سەر مووسڵە پەشیمانانە بەری خۆی داوە هەولێر. لەو ١٠ ڕۆژانەدا شەڕێکی وا نەکرا، بەڵام پیاوەکانی جار بەجار پەلاماری دامەنی شوورەی شاریان دەدا و کەسێکیش بۆ ئەوان دەرنەدەکەوت، ئەوانیش دەگەڕانەوە لەشکرگای خۆیان. موزەفەرەدین لە گەڕانەوە موددەتێک لە کەنار زاب لە سنووری خۆی سوپاهی دامەزراند و فەراری گرت کە نەبادا کەسێکی بچێتە لا یاخود نەبادا تەعەڕوزی بکرێت، کە تەماشای کرد هیچ نەبوو گەڕاوە هەولێر.

ساڵی ٦٢٢ جەلالەدین خوارزمشا گەیشتە عیراق و لەوێوە ڕوو بەکوردستان هەڵمەتی بردە سەر دەکۆک و دەورەی دا، ئەهالی بەدەست و باسکیان زۆر چاک بەرابەریان کرد و شەڕ و کوشتاریان گەرم بوو. جەلالەدین لە نەتیجەدا بەشەڕ دەکۆکای گرت و تالان و کوشتارێکی زۆری لێ کردن. موزەفەرەدین لەوە ئاگادار بوو، بەلەز پیاوی ناردە لای و دەستی جەوری لەسەر کوردەکانی دەکۆکا لابرد و بەمامەڵەت لەگەڵ یەکتر ڕێککەوتن، لەپاش چەند جار قاقەز لێک نووسین قەراریان داوە پێکەوە سوێندیان بۆ یەکتر خوارد بەشەرتی جەلالەدین ئاورباپەگان بگرێت و لەوێوە بچێتە سەر خلات و خاکی ئەشرەف بخاتە ژێر حوکمی خۆیەوە. لەملاشەوە موزەفەرەدین لینگداتە سەر مووسڵ و لە ژێر پەنجەی بەدرەدینی دەرخات، ئەو شەرتە بوو بەبنچینەی مامڵەتیان و بۆ یەکتر پەیمان و سوێندیان خستە پێش و بوون بەسوێندخۆری یەک. موزەفەرەدین بۆ مەملەکەتی خۆی سنوورەکانی بەپەنهانی بەلەشکر قایم کرد نەوەکو جەلالەدین فێلێکی لێ بکا، بەو جۆرە خۆی و مەملەکەتی لە شەڕ پارازت هەتا جەلالەدین بەری خۆی کردە ئاورباپەگان و ڕۆیشت. موزەفەرەدین لەسەر موعاهەدەیەکی لەگەڵ جەلالەدینی گرێدا بوو، قاقەزی لە مەلیک موعەزەم خێوی دیمەشق نوبسی و لە خێوی ئامێد و ماردینیشی گێڕاوە، لەوانیشەوە قاقەزی وەرگرتەوە، کە ئەوانیش لەگەڵ ئەو عەهد و پەیمانەن. ساڵی ٦٢٣ موزەفەرەدین تەدارەکی لەشکری گرت و خۆی کۆکردەوە، هەتا سوپاهێکی قورسی پێکەوەنا و چووە سەر مووسڵ و گەیشتە سەر زاب و پەڕینەوەی بەچاک نەزانی، سەرزابی کردە لەشکربەز، لەولاوە جەلالەدین لە تفلیسەوە ڕوو بەخلات سپاهی دەنگدا. لە ڕێگادا پێیان گوت کە نایبی ئەو لە کرمان سەری لەژێر حوکمی وەگەڕاند، بەناچاری ڕوو بەکرمان

لەشکری ئاژۆت. بەدرەدین بەگەیشتنی موزەفەرەدین بۆ سەر زاب قاقەزێکی بۆ ئەشرەف نویسی، لەوەدەمەدا ئەشرەف لە شاری ڕەقە بوو، ڕوو بەحەران لەشکری بۆ سەر مووسڵ ئاژۆت، خێوی ماردین بەلەشکرەوە پێشی پێ گرت، تیروکەوان و شیر و خەنجەر بۆ یەکتر کوشتن ئامادە کران و شەڕ گەرم بوو، لە هەردوو لا گەلێک کوژران، ئەشرەف بەشەڕ ماردینی گرت و تالانی کرد و ڕووخاندی، لەولاوە مەلیک موعەزەمی ئەیووبی بۆ گرتنی خاکی ئەشرەف ڕوو بەحومس لەشکری برد و قاقەزێکی لە ئەشرەفی برای نوویسی: ئەگەر دەست لە ماردین و مووسڵ بەرنەدەی حەما و حەلەب دەگرم نایدەمەوە پێت، مەلیک. ئەشرەف بەناچاری ماردینی بەردا و دەستی لە چوونە مووسڵ هەڵگرت و چووە حەلەب. مەلیک موعەزەم قاقەزێکیشی لە موزەفەرەدین نوویسی: دەست لە مووسڵ بەردات، لەسەر قاقەز و بزووتنی مەلیک موعەزەم هەرکەس ڕوو بەخاکی خۆی لەشکری کێشاوە دوایی، بەڵام لەو کێشەدا مووسڵ و ماردین دووچار بەوێرانە و ئاشووب و زەرەرێکی بێ ژمار بوون. ساڵی ٦٢٧ سۆنج ناو پیاوێک لە چیای کوردستاندا دەستی بەجەردەیی کردبوو، گەلێک شەڕفرۆش و ئاشووبخوا هو پیاوی ناڕاستی لەسەر کۆبووەوە و دەستە تەریدەیەکی گەورەی پێکەوە نابوو، لە هەموو لایەکەوە تالان و بڕەوی دەکرد و لینگیدا سەر قەڵای (سارۆ) کە لە یەکە قەڵایانی موزەفەرەدین بوو گرتی و خستیە ژێر حوکمی خۆیەوە و ئەمیری ئەو قەڵایەی کوژت کە ناوی عیزەدینی کوردی حەمیدیی ئاکرەیی بوو. موزەفەرەدین زۆر زۆر دڵگیر بوو، لەشکری کۆکردەوە و چووە سەر سۆنج، لە دوای کوشتار و شەڕ موزەفەرەدین دەرەقەتی نەهات و لەسەر ئەوە کە قەڵات لە دەست سۆنجدا بمێنێتەوە مامڵەتیان کرد، موزەفەرەدین بەدڵێکی ساردەوە گەڕاوە هەولێر.

ساڵی ٦٢٨ دەستەیێکی تەتەر لە خاکی ئاوربایەگانەوە بەشەڕ و تالان و کوشتار و ئاوایی سووتاندن ڕوویان لە هەولێر کرد و گەیشتنە هەر خاک و زەوی و شار و دێهاتێک تالانیان کرد و سووتاندیان و وێرانیان کرد و ئەهالییەکانیان دەکوژتن و ئەتک و سووکییەکی تەواویان بەسەر عرز و ناموسی میللەت دادێنا، بەو ڕەزالەتە ڕۆیشتن گەیشتنە هەولێر، موزەفەرەدین هاواری لە بەدرەدین کرد، موزەفەرەدین بەسوپاهی هەولێر و مووسڵەوە چووە پێش تەتەرەکان، ئەوانیش کە وایانزانی بەسەر شاری کەرخینی و داکۆکادا بەسەلامەتی لە کوردستانی شارەزوور دەرچوون و گەڕانەوە ئاوربایەگان. نە موزەفەرەدین و نە حوکمدارێکی دیکە نەکەوتنە سەریان بیانکوژن و نەهێڵن ڕزگار بن، موزەفەرەدین لەشکرەکەی گێڕاوە هەولێر.

موزەفەرەدین شەوی سێشەممەی ٢٧ی موحەڕەمی ساڵی ٥٤٩ لە قەڵای مووسڵ لە دایک بووە، بابی بەکەماڵی ڕەوشت چاکی پەروەردەی کرد، چونکو ئەمیر عەلی گچکە لە مووسڵدا ئەمیر و نایبێکی خاوەند هێز و شەوکەت بوو، مامۆستایانی زانا و تێگەیشتووی بۆ ڕاگرتبوو، لەسەر فەننی عەسری خۆی تەربیە دەکرا.

موزەفەرەدین لە پاش ٨١ ساڵ ژیان، شەوی جومعەی ١٤ی مانگی ڕەمەزانی ساڵی ٦٣٠ لە قەڵای هەولێر وەفاتی کرد و هەر لە هەولێر و لە ناو قەڵادا ناژتیان. بەڵام ڕەبیعە خاتوونی خێزانی چووە دیمەشق و لە پاش ٨٠ ساڵ عومر لە مانگی شەعبانی ساڵی ٦٤٣ لە دیمەشق مرد و لە چیای قاسیۆن کە ئەمڕۆکە بەساڵحیە و محەلەی کوردان ناو دەبرێ لە شیمالی شار مەدرەسەیەکی بۆ خۆی دروست کرد بوو، مەوقوفەیەکی تەواوی لێ گرێدابوو، لەو مەدرەسەیە ناژتیان، ئەمڕۆکەش ئەو مەدرەسەیە ماوە ساڵی ١٣٤٠-١٣٤١-١٣٤٢ کە دەچوومە دیمەشق، مەدرەسەی ڕەبیعە سوڵتان خاتوون لە گەڕەکی کوردان کرابوو بەمەدرەسەیێکی ئیبتدائی بۆکوردەکانی ساڵحیە و نزیکەی ٣٠٠ منداڵی کوردان لەوێیان دەخوێند.

## ڕەوشت و خوو و کردەوە و ژیان و دیانەتی موزەفەرەدین

موزەفەرەدین بەتەبیعەت پیاوێکی دیندار و خێرخوا و شەریعەتپەرست و عیلمخوا و سۆفی مەشرەب و دۆستی شێخ و مەلا و زاهیدان بوو، لە کاری خێر و حەسەناتدا زۆر ئازا و بەغیرەت و بەکۆشەوە بوو، گەلێک چتی گەورەی بینا کرد. موئەریخەکان و عولەمای دینی، بڕێکی دەڵێن: موزەفەرەدین مەولودی نەبەوی ئیختراع کرد و لەوەدا فەلسەفەی نواند و گەلێکی موبالەغەی تێدا دەکرد. خێرات و چاکەیێکی لە ئەو چاوپێکەوتراوە لە هیچ حوکمدارێکی ئەو زەمانە و پێش و پاش نەدیتراوە، لە هەموو چتێک زیاتر خۆشەویستی و حەزلێکردنی ئەو ڕوحم بەبێ دەستان و بەزەیی بەهەژاراندا هێناوە و دەستگرتنی دەستەنگان و کەوتووان بووە، ڕۆژی چەند قەنتار نانی بەپاتن دەدرا و بەسەر هەژار و دەروێزەکەران بڵاو دەکراوە و چەند قەنتاریشی دەنارده مەدرەسە و مزگەوتان، هەژار و بێ دەست و پێیانی کۆ دەکردەوە و دەستە بەدەستە نان و خواردنی دەدانێ. کە بۆ جێگایێک سواربوونی ببوایە، خەڵکی بەڕێز لەبەر دەروازە کۆ دەکردنەوە و هەریەک بەهێندی پێویست لە بەرگ و خواردن و لە پاپووج و لە دراوی دەدانێ، بۆ ئەمەی هەتا لەو چوونە دەگەڕێتەوە دانەمێنن. ئەگەر زستان بوایە پێویستی سەرما، ئەگەر هاوین بوایە چتی

فینکی بەسەردا دەبەخشین، ئەگەرلە سەفەرێک بگەڕابایەوە بەو جۆرە دیسان هەموو هەژارەکانی کڕ دەکردنەوە و هەریێک بەقیاسی خۆی بێ ئیحتیاجی دەهێشتن و پێویستی دەدانێ.

بۆ کوێر و پارێزکاران چوار خانەقای دروستکردن و لە هەموو لایێکەوە کوێر و پیاوە پارێزکارەکانی کۆکردنەوە و لەو خانەقایانەی دانان، هەموو ڕۆژێ تێشت و جیرەیێکی باشی بۆ گرێدابوون و هەموو سبەینێی زوو دەیاندانێ، ئێواران بۆ خۆشی بۆ سەرپەرشتی دەچووە نێویان و یەک یەک پرسیاری لێ دەکردن و پێویستیانی لێ دەخوازتن، ئەگەر جیرەیان کەمبوایە یاخود چتێکی دیکەیان بوبستایە بۆیانی زیاد دەکرد و هەموو لەوازیمی بۆیان تەواو دەکرد و لەگەڵیان گەمەی دەکرد و پێدەکەنی و دڵخۆشی دەدانەوە. بۆ بێوەژن و بێ کەسان خانووێکی دروست کرد و بۆ منداڵی گچکەی بێ کەس و هەتیوو یاخود منداڵێکی لە پیاو ژنێکی فەقیر بووبێت دروست کرد و دایەن و ژنی شیردار و خزمەتکار و کەنیزەکی بۆ بەخێوکردنیان ڕاگرت و هەر پێویستییەکیان هەبوایە دەیدانێ، لە هەر لایێکەوە ژنی بێ کەس یاخود ژنەکی فەقیر و دەست تەنگ بزابایە دەزبەجێ بەمنداڵەوەیان دەبردە خانووی گوتراو، هەتا گەورە دەبوون بەخێو دەکران، ئەگەر گەورە بوون یا دەبوونە خوێندەوار و کاتب یا دەبوونە سنعەتکار و بەئیش، چونکو هەرکە بوون بەچوار ساڵانە لەگەڵ تەربیە و خوێندنیان خەریک دەکردن. موزەفەرەدین هەموو ڕۆژێ بۆ خۆی دەچووە ئەو هەتیووخانەیە و ئەحوالی دەپشکنین و لێی دەپرسین و تەماشای دەکردن و یەک یەکە سەرپەرشتیانی دەکرد، هەموو دایەنەکانی بەبەخشش و خەڵات دڵخۆشی دەدانەوە و هەر ڕۆژەی بەجۆرە دیاریێکەوە دایەن و خزمەتکارەکانی شادمان دەکرد. تیمارخانەیێکی زۆر چاکی بۆ نەخۆش و دەردەداران بینانا و حوکەمای بەناوبانگی کردنە مەئمووری ئەو تیمارخانەیە، لە هەموو لایەکەوە نەخۆش دەچوونە ئەوێ و بەخواردن و دەرمانکردن و پێخەفیانەوە بەخێو دەکران. خۆشی ڕۆژی جارێک سەری تیمارخانەی دەدا و پیاو بەپیاو نەخۆشەکانی دەدیت و داوای هەرچییەکیان بکردبا دەیدانێ و ئیشتهادیان لە هەر خواردنێک بوایە بۆی دەناردن، بەقسە و زبانی خۆش گفتوگۆی لەگەڵ دەکردن و دەستی دەگرتن و تەماشای نەخۆشی و برینی دەکردن، بەخەڵات و بەخشش بەنێویاندا دەگەڕا، حەکیمەکان و کارکەر و خزمەتکارەکانی بەزبانخۆشی و ئینعام دڵخۆشی دەدانەوە و لە هەموو جێگایەکدا دەستی قەدر و حورمەتی دابوونێ.

هەروەها میوانسەراییێکی زۆر جوان و خۆش و بەدەستووری چاک کردبوو، ناسراو و

نەناسراو، گەورە و گچکە لە دەرەوە بچووبانایە هەولێر دەبوو لەو میوانسەرایە دابەزیبان، دەوڵەمەند و هەژار و سوپا و بەهێز و بێ هێز لەوێ میوان دەبوون و هەرکەس بەشانی خۆی و جێگا دامەزراندن خزمەتیان دەکرا، سبەینێ و نیوەڕۆ و شێوان جیرەی خواردن بۆ میوان دەناردرا، شەوێ بەداپۆش و پێخەفی شایستە دادەمەزران، لە وەختی ڕۆیشتن و چووندا بۆ ڕێبوار تیشووی ڕێی دەدایێ و هەرکەس بەدەستوور و شانی خۆی و ڕێگای دوور و نزیکی خواردنی ڕێگاشیان دەدرایێ و بەخۆشی و شادی میوان بەڕێ دەکرا.

لەسەر مەزهەبی شافیعی مەدرەسەیێکی بۆ تەحسیلی عیلم بینانا و مەدرەسەییێکی بۆ حەنەفی دروست کرد، لەو هەردوو مەدرەسە گەورانەدا لە عیلمی نەحوو سەرف و بەیان و مەنتیق و عرووز و تەفسیر و حەدیس و تەجوید و نوبسین، مامۆستایانی بەفەزڵ و هونەری ڕاگرتن و بەجیرەو خەڵات و بەرات تەدریسیان دەکرد. گەلێک جاران بۆ گوێداری تەدریس دەچووە حەڵقەی شاگردانەوە. مەلا و شاگردەکانی بەخەڵات دڵخۆشی دەکردن، گەلێک جار بەرگی بەری خۆی دەرخستووە و بەخەڵات داویتیە مودەڕیس و شاگردان. پیاوی بەد ئەخلاق و ڕەوشت پیس و بێ مروەتی نەدەهێشت لە مەملەکەتیدا بمێنێت و پیاوانی خراپ نەیاندەتوانی بچنە لای، زوو دەینارد بەزیللەت و ئەزیەت لە شار و خاکی خۆی دوور دەخستنەوە. بۆ سۆفی تەریقەتان دوو خانەقای زۆر قایم و مەحکەمی بینا کرد و پیاوانی بەدین و گەورەی پارێزکار و ڕەبەنی تێدا کۆکردبوونەوە، گەلێک خەڵوەتنشین و دایم بەڕۆژیی تێدابوو، هەر سۆفییەکی دەرەوە بچووبایە نێو شارەوە ڕووی لە هەر خانەقایەک بکردبایە بەعیزەت و شەرەفەوە قەبووڵ دەکرا و هەر داخوازیە هەبوایە بۆی جێبەجێ دەکرا، لەو دوو خانەقایەدا هێندەی سۆفی تێرژابوو، خەڵک تێیدا سەرگەردان بوو، ئەوقافێکی زۆری لێ گرێدابوو، هەرکەسێکی پێویستییەکی هەبوایە، یاخود بۆ جێیەک بچووبایە هەرچییەکی لازم ببوایە لەو ئەوقافەی دەدرایێ. موزەفەرەدین بۆ خۆی دەچووە نێویان و گوێدری دەکردن و تەفتیشی کاروبار و ڕەوشت و خووی هەمووانی بەچاوی دەکرد و لە هەموو ئیش و فیکرێکیان ئاگادار دەبوو، ساڵی دوو جاران بەوەزیرێکی خۆیدا ماڵ و دراوێکی زۆری دەنارده شارەکانی کەنار دەریا و دەیاندا بەدیلگیراوەکانی کە لە دەست فەرەنگ دابوون، دیاری و خەڵاتی بۆ سوپاه و شەڕکەرەکانی لە جیهاددا بوون دەنارد، ئەگەر ناردراوەکان بیانتوانیایە بگەنە لای دیلەکان بۆ خۆیان بەدەستی خۆیان دەیاندانێ، ئەگەر پێیان نەکرابا بەپیاوێکی ئەمیندا بەهەر کلۆجێک بایە بۆیانی دەنارد.

موزەفەرەدین گەلێک ساڵان دەچووە حەج و هەر کەسێک حەزی چوون بوایە لەگەڵی دەچوو، بەوانەی لەگەڵی بچووبانایەتە حەج ٥ هەزار دیناری دەدایێ و مەسرەفی ڕێگاشی دەخستە سەر خۆی. لە خزمەتکارانی حەرەم و موجاویرانی مەککە هەر چەندێک هەبوونایە بەهەمووانی خەڵات و بەرات دەدا و پارەیێکی زۆری بەسەردا دەبەخشینەوە. بەدراوێکی زۆر و مە سرەفێکی قورس ئاوی بردە چیای عەرەفات، لە ڕێگا و سەرچیادا حەوز و ساراداوانی زۆری دروستکردن تاکو ڕێبوار ئەزیەت نەکێشن و تینوو نەبن. گەلێک ئاساری دیکەی چاکی لە مەککە و عەرەفات دروست کرد، ئێستاکەش زۆری ماون. لە عەرەفات چالاوێکی زۆر قووڵی کۆڵی. لە ساڵی ١٣٤١دا دۆزراوە، لە عەرەفات قەبرێکی بۆ خۆی دروست کرد ئەگەر مرد لەوێ بینێژن.

## دەستووری دامەزراندنی مەولودی پێغەمبەر و مەخاریجی

موزەفەرەدین لەبەر دینداری و حەزلێکردن هێندە بەدیندا چووە خوارێ و هێندە لە موقەدەساتدا غەرقبوو، دەستی بەفەلسەفەتی دین کردبوو، ڕۆژی هاتنە دونیای محەمەد (ص) کەوتە خەیاڵەوە، لەو ڕۆژە گەورەتر ڕۆژێک نەکەوتە خەیاڵەوە، چونکو مەسەلەی (لەولاک) حەلکردنی بەمە نەتیجە بەخش بێ، مادامە ئەو ڕۆژە ڕۆژێکی پیرۆز و گەورەترین ڕۆژانی موقەدەسە، دەبوایە بۆ ئەو ڕۆژە زیاتر مەسرەف و کەیف بکرێ و بەشادی و خواردن و بەخشین ڕازاندنەوە بەسەر ببرێت چاکترە. هینای ئەوەی خستە ژێر دەستوورێکی ڕێککەوتووەوە، بەکورتی تەئریخچەیەکی زنجیرەی بنەماڵەی باب و باپیری دایکی محەمەد (ص) هەتا ڕۆژی لەدایکبوون و کردەوە و کۆشینی دەوری منداڵی ئەو حەزرەتەی نویسیەوە کە لە مەجلیسدا بەدەنگێکی خۆش بخوێندرێتەوە، تاکو هەموو کەس لەو تەئریخە ئاگادار بێت. جا لە پێش خوێندنەوەیدا لە ئەهالی شار و وڵاتانی نزیکی وەکو بەغدا و مووسڵ و جزیرە و ژەنگار و نسێبین و ماردین و ئاوربایەگان و ئەو دەوروپشتانەی دەگێڕاوە، مەلا و فەقێ و سۆفی و واعیز و شوعەرا و ئودەبا و پارێزکار و گەورەکانی بەجارێک میوانی دەکردن. لە ئەوەڵی موحەڕەمەوە هەتا مانگی ڕەبیعی یەک ئەو عالەمە دەستیان دەکرد بەچوونە هەولێر، هەتا مانگی مەولود لە هەر چوار کەناری دونیاوە حەشاماتێکی بێ ژمار دەڕژا نێو هەولێرەوە کە گوێدێری مەولود خوێندنەوە بکەن، ئەو هەموو عالەمە لە موزەفەرەدین میوان دەبوون و هەتا دەگەڕانەوە مەسرەفی دەکێشان. هەر بۆ ئەو مەوسیمە دار و تەختەیێکی زۆری کۆ دەکردنەوە، لە دەروازەی قەڵاوە هەتا

دەگاتە خانەقای گەورە، کە ئەمڕۆکە کۆنە منارەکەی لە ڕۆژئاوای شار ماوە ٢٠ گومبەزی بەتەختە و دارێک و نهۆم و دوو نهۆمی و چوار پێنج نهۆمی دروست دەکردن، گومبەزی بەرخانەقای بۆ خۆی دادەمەزراند، ئەوانی دیکە بۆ ئومەرا و وەزەرا و ئەعیان و دەوڵەت دەڕازاندەوە، هەر نهۆمێکی بۆ سنفێکی شایستەی بۆ دادەخران، کە دەبوو بەیەکەمین مانگی سەفەر، ئەو گومبەزانە بەپارچەی ئاوریشم و زێڕ بافت و چاک و جوان دەکران، لە هەر نهۆمێکی ئەو گومبەزانەدا دەستە دەنگبێژێک و سەماکەر و دەسەتەیێک قسەخۆش و نەقال و گەمە و تەرانەکەری تێدا دادەندرا، هەریەک لە مەقامی خۆیدا بەگوتە و خۆشخوانی ڕایاندەبوارد، لە هەموو گومبەزێکا ئەو تەرتیباتە هەبوو، هەموو کەسێک لە دەستپێکردنی ئەو مەوسیمە کە ئەوەڵی موحەڕەم بوو هەتا دوایی مەولود خوێندن کەس لە کڕین و فرۆتنی و داد و بستاد نەدەکۆشا، هەر یەک بەجۆرێک لەگەڵ کەیف و شادمانی خەریکبوون. خانەقای گەورە لە مەیدانی گەورە نزیک بوو، گومبەزی موزەفەرەدین لەبەردەرگای ئەو خانەقایە دادەندرا، شەو و ڕۆژ بەزموڕەزم و زیلوبەم بوو. هەموو ڕۆژێ پاش نوێژی ئێواریێ لە قەڵاوە ڕوو بەخانەقا دەچووە خواریێ و گومبەز بەگومبەز دەچووە پێشیان ڕادەوەستا و گوێی لە خوێندن و قسە و گەمە و تەرانەیانی دەگرت، هەتا دەگەیشتە گومبەزی نزیک خانەقا یەک بەیەک لە گۆرانیبێژانی ئەو گومبەزانە ڕادەما و لە دوایی دەچووە خانەقا و هەتا نوێژی سبەینێی دەکرد دەماوە و ئینجا سوار دەبوو دەچووە ڕاوکردن و هەتا نیوەڕۆ دەگەڕاوە و دەچووە قەڵا و لەگەڵ ئومووری خەڵک و خواردن و ئیسراحەتی خەریک دەبوو، کە نوێژی ئێوارەی دەکرد، دەچوو بەسەر گومبەزەکاندا دەگەڕا، بەو جۆرە هەتا مەولود دەخوێندرا کار و پیشەی ئەوە بوو. لەبەر ئیختیلافی قسەی عولەما کە هێندێک گوتوویانە تەوەللودی ١٢ی مانگ و هێندێک ١٣ی مانگی ڕەبیعی یەکیان بەمەولود داناوە. لە پێش مەولودا بەدوو ڕۆژ لە چوارپێ و باڵندەی گۆشتی دەخوریێ هەزار بەهەزاری بۆ کوشتنەوە دەخستە مەیدانیێ. گۆرانیبێژ و دەهۆڵ کوت و زوڕنالێدەر و بۆڕێژەن لە پێشەوە ئەهالی بەچەپڵە و هەڵپەڕین، ئەو دەعبا و چوار پێیانەیان دەبردە مەیدانیێ و دەستیان بەکوشتنەوەیان دەکرد، لەو مەیدانانەدا مەنجەڵی گەورە و زلیان لەسەر کوانی ئاور دادەنا و لەگەڵ کوڵینی خەریک دەبوون. خواردەمەنی و چتی ڕەنگاوڕەنگ و شیرینی خۆرشتی خۆشیان لێدەنا.

موزەفەرەدین شەوی جەژنی مەولود، نوێژی شێوانی لە قەڵا دەکرد، لە پاشان لە قەڵا دەچووە خوارەوە و مەشعەل و شەمدانی گەورەیان گەلێک لە پێشەوە هەڵدەگرت، چەند

شەمێکی زۆر زلەی وا کە هەریەک لە ئێستریکیان دەنا، لە پشتی ئێسترەکەیان گرێ دەدا و دوو پیاو لە پێشەوە ڕاست و چەپ دەیانگرت و بەسووتاندن دەیانئاژۆت. چەند شەمی وا بەئێستر و چەند مەشعەلی گەورە و چوار فەنەری زلیان دایساند، مەشعەلی دیکەی چکۆلە و شەم لە شەمدانان بەدەست هەڵگیراوە، پیر سونەیەکی بێ ژماریان دەستە دەستە لە پێشەوە ڕادەگرت. موزەفەرەدین بەو زینەت و دەبدەبەیە وە دەچووە خانەقا و گوێدێری مەولود خوێندنی دەکرد و هەتا نیوەشەو دەماوە و ئەوجا دەگەڕاوە و دەچووە ئەو گومبەزەی کە بۆ ئەو ڕازابووەوە و هەر چوار کەناری پەنجەرە بوو. سبەینێی زووی جەژنی، هەموو سۆفی و پارێزکار و واعیز و مەولودخوێن خەڵات دەکران. سۆفییەکان لە قەڵا لەبەردەرگای موزەفەرەدین ڕاوەستان، خەڵات کە بۆ ئەو ئەسنافانە دەناردرا، سۆفییەکانیان ڕیز دەکرد و لە دوای یەک ڕادەوەستان و هەریەک جۆرە خەڵاتێکی بەدەستەوە دەگرت، بەڕیز لە قەڵا دەچوونە خوارێ هەتا دەگەیشتنە خانەقا بەتیپ دەڕۆیشتن، ئەو ڕۆژە کورسی بۆ واعیز دادەندران و وەعزیان دەست پێ دەکرد.

موزەفەرەدین لە گومبەزی خۆیدا دادەنیشت، ئومەرا و گەورەی سوپاه و ئەعیانی دەوڵەت و ماقووڵ و سەردار و کەیخودای شاری دەچوونە لای دادەنیشتن. ئەهالی شار و دێهات و سوپا لە دەوروپشتی گومبەزی ئەو کۆ دەبوونەوە، پەنجەرەی لایەکی دەنۆڕیە مەیدانی گەورە، ئەو مەیدانە گەلێک گەورە و بەرین بوو، هێندێک جاران تەماشای سوپاه و قوشەنی دەکرد کە لە مەیداندا ڕیزیان بەستبوو، جارجارەش لە ئەهالی ڕادەما و کەمێکیش گوێی لە واعیز دەگرت، بەو جۆرە دەمی خۆی ڕادەبوارد هەتا سوپا بەئەسپایی دەهات، ئەوجا دەیگوت: خواردن سازکرێ، سفرەیێکی درێژ لەمسەر و سەری مەیدانی پڕ دەکرد، ڕادەخرا بەخواردنی ڕەنگاوڕەنگ دەڕازاندراوە، هەژار و بێ کەس و فەقیری لەسەر کۆ دەبووەوە. لە بۆ خانەقا خوانچەی مس دەچوو، ژووری ئەو پیاوانەی لە دەرەوەی کورسی واعیز دادەنیشتن لەو خوانچە خواردەمەنیانە کۆ دەبوونەوە، لە پاش خواردن دەست بەوەعز خوێندن دەکرا و هەتا چێشتانێ وەعز دەخوێندرا. موزەفەرەدین واعیز و ئودەبا و شوعەرا و ڕوئەسا و فوقەها و دەنگبێژ و خوێندەوار و گەورەکانی یەک بەیەک دەخواستە کن خۆی، بەناوی جەژنە پیرۆزد و خۆشەویستی ئەو ڕۆژە خەڵاتی دەکردن و بەخششی دەدانێ، کە ئەوانەی هەموو خەڵات دەکرد، دڵخۆشی دەدانەوە و هەڵدەستا دەگەڕاوە قەڵا، کە چەند ڕۆژێک لە جەژن ڕادەبورد بۆ ئەوانەی بۆ مەولود لە جێگایانی دوور هاتبوونە هەولێر، تەدارەکی گەڕانەوەی بۆ دەگرتن و هەموو پێویستییانی دەدانێ لە خەرجی و خواردن و

سواربوون بۆ ڕێک دەخستن بەدیاریەکی چاک و شایستە بەڕێی دەکردن، ئەگەر هێندە پیاوێکی ماقووڵ پاسەوانی بویستایە لەگەڵی دەناردن هەتا دەگەڕاوە جێگای خۆی. حافز ئەبا خەتابی کوڕی وەحیە لە کتێبی (حرق العین) کە تەرجومەی ژیانی خۆیەتی دەڵێ:
موزەفەرەدین گەلێکی ئەهەمییەت دابوو بەمەولود، ئەو ڕۆژەی بەچراخانی و بەزمورەزم و هەڵپەڕین و کەیف و خۆشییەکی وا بەسەر دەبرد کە هۆشی زرنگ تێیدا کەودەن دەبوو، دیسان دەڵێ: چوومە لای موزەفەرەدین میوانداریێکی چاک و خزمەتێکی شایستەی زیادی کردم و خەرجی دامێ، کە ناردمییەوە بەسواری بەڕێی کردم هەزار زێڕی زەردیشی لە پاش خەلاتێکی گرانبەهای بۆ سەرفی عیال خستە کیسەمەوە. دیسان دەڵێ: کە خوانی دەچووە پێشی ئەگەر پارویێکی خۆش یا شیرینی باشی لەسەر بوایێ دەیگوت: ئەمە بۆ فلان عالیم و فازیلی گەورە چاکە، یاخود دەیگوت: بۆ فلان پارێزکاری ببەن، لە شیرینیات و مێوە و تەڕەدا دیسان هەروەها بوو.

موزەفەرەدین لەگەڵ بوونی بەتەبیعەت کەرەم و بەخشین و دڵنازکی لەگەڵ ئافەریدە ببوو، زۆر زبانخۆش و ڕەوشت چاک و دڵپاک و ڕوو شیرین و دەم بەکەنین بوو، باوەڕ خاوێن و دڵنازک و خۆشڕەوشت و بەمیهرەبان بوو، لە توندوتیژی و گرژی دوور بوو، بەبەخشش و بهوردن بوو لە دیندار و خوێندەوار و پڕ هێزکار و ئەهلی سوننەت و جەماعەتی حەز دەکرد و لەگەڵیان بەبەخشش و خەلات و بەرات بوو، شوعەرا و ئەودەبا و موئەلیفانی زۆر بەقەدر و قیمەت ڕادەگرت و ئەگەر دەچوونە لای نوازشی دەکردن و ئینعامێکی چاکی دەدانێ. لە گچکەیی و منداڵییەوە عیلمی تەئریخی خۆش دەویست و بەدڵ حەزی لێ دەکرد و هەموو دەمێک لەگەڵ تەماشاکردنی خەریک بوو زیاد لە علوومانی دیکە، زۆری دەخوێندەوە و هەمیشە لەگەڵی خەریکبوو، کە دەشچووە سەفەرانی هەموو دەمێک کتێبی تەئریخی لەگەڵ خۆی دەبرد و لە تەماشاکردنیدا لەززەتی لێ دەبرد.

## بەندی چوارەم

## ئەمیر شەرەفەدین

ساڵی ٦٣٠ کە موزەفەرەددین کۆکبەری مرد، بەدرەدین لوولوو تەمای لە هەولێر کرد، ئەمیر شەرەفەدین جەلالی کە لە یەکە ئومەرا و دەستدرێژانی موزەفەرەددین بوو هەولێری بەدەستەوە نەدا و بەهەموو جۆرێک کۆشا و هێزی پەیدا کرد، لەگەڵ ئەهالی و ئەشرافی هەولێر و سوپاهی و سەرکەردان رێککەوت، بەرابەر بەبەدرەدین خۆیان ڕاگرت، موددەتێکی زۆر بەو جۆرە هەولێر بەدەستەوە نەدرا، هەتا سالآنی ٦٥٠ جار بەجار بەدرەدین سەردەکەوت و جار جار شەرەفەدین بەرز دەبوو، لەو ساڵەدا شەرەفەدین لە شاردا بێ هێز ما و بەناچاری بۆ دەرەوە ڕۆیشت کە سوپا کۆبکاتەوە. بەدرەدین بەدڵخۆشیدانەوەی ئەهالی ئەمیر ساحیب کوڕی سەلایەیان کردە ئەمیری هەولێر. شەرەفەدین ڕۆژ بەڕۆژ لە دەری شاری سوپاهی کۆ دەکردنەوە و قەلآکانی دەرەوەی هەولێری لە دەست خۆیدا ڕاگرتن، بەدرەدین هەر چەند کۆشا نەیتوانی گوندێکی دەری شاری هەولێر بکاتە ژێردەستی.

ساڵی ٦٥٦ لە ئەواخیری زیلقەعدەدا هەلاکۆخان بەئیتفاقی شەرەفەدین قاقەزێکی لێ نوبسی و لەگەڵی ڕێککەوت. سوپاهێکی قورسی هەڵگرت و چووە سەر هەولێر، ئەمیر ساحیب سەلایە کە تەماشای کرد لەگەڵ هەلاکۆ خان شەڕکردن دوایی پەشیمانییە بۆ مامڵەتکردن کۆشا، ئەهالی هەولێر کە ئەوەیان زانییەوە کە ساحێب لەگەڵ تەتەر مامڵەت دەکا، کۆبوونەوە و چوونە لای گەڤیان لێ کرد و پێیان گوت: بەهیچ جۆرێک ناخوازین ڕێگا بەتەتەر بدەی کە بێنە هەولێرەوە، لەسەر ئەوە هەموو ئەهالی لەشکرکێشیان کرد بۆ پێش بەتەتەر گرتن و ئامادەی شەڕبوون، لەولاشەوە هەلاکۆ ڕۆژ بەڕۆژ ڕوو بەهەولێر نزیک دەبووەوە. ساحیب گرتی بەپەنهانی قاقەزێکی لە بەدرەدین نوبسی و هەموو بزووتن و سەربهوردی ئەهالی بۆ ئاشکرا کرد و نزیکبوونەوەی تەتەریشی لێی نوبسی. بەدرەدین لەوە گەلێک دڵتەنگبوو، دەزبەجێ نارداراوێکی نادرە لای هەلاکۆ و بەمامڵەت ٧٠ هەزار مسقاڵ زیوی دایێ و هەولێری لە ئاشووبی تەتەر ڕزگار کرد و هەلاکۆی لە چوونە هەولێر

پەشیمان کردەوە، هەولێر دیسان لە ژێر ئیدارەی بەدرەدیندا ڕاوەستاوە. کە هەلاکۆ ئەو پارەیەی وەرگرت و دەستی لە هەولێر بەردا و لە خاکی هەولێر دەرکەوت، شەرەفەدین گوێبیستی ئەوەبوو، لە چیای شیمالی هەولێر لەگەڵ لەشکر کۆکردنەوە خەریکبوو، هیچ ڕانەوەستا و بەو لەشکرەوە کە کوردەکانی چیای شیمالی هەولێر بۆ پشتیوانی یاریدەیان دا بۆ چوونە سەر شاری هەولێر، بەبێ شەڕ و کوشتار هەولێری خستەوە دەست خۆی، ساحیب هەلات و ڕوو بەمووسڵ ڕۆیشت.

ئەمیر شەرەفەدین کە هەولێری گرتەوە، دەستی بەڕێکخستنی ئومووراتی و دڵخۆشیدانەوەی ئەهالی کرد، لە هەموو لایێکەوە ئومەراکانی شارەزوور و داکۆکای لەلای خۆ کۆکردنەوە و بەخەلات و بەرات نوازشی نواند، لە پاش هێز پەیداکردن لەخۆ ئەمین بوونەوە گرتی و قاقەزێکی لە هەلاکۆ خان نوویسی و داوای ئیتفاقی لێ کرد، هەلاکۆ جوابی دایەوە و گوتی: بەم شەرتە ئیتفاق دەکەم بەلەشکرێکی زۆری کوردستانەوە یاریدە بدرێ و لەگەڵ ئەوە سوپاهێک هەڵگرێ و بچێتە سەر جۆڵەمێرگ.

ئەمیر شەرەفەدین کە ئەوەی زانی لەگەڵ ئەمیرە کوردەکان بیریان کردەوە و بەڕێککەوتنی هەمووان سوپاهێکی چاکیان هەڵگرت و لەگەڵ لەشکری تەتەر ڕێککەوتن و ڕوو بەجۆڵەمێرگ ڕۆیشتن، لە نیوەی ڕێگادا بەدرەدین لەولاوە دەستەیەکی نژوە ڕێککرد و بەپەنهانی ناردنیە پێش شەرەفەدین کە ڕێگای لێ بگرن، ئەو نژوانە شەو کەلێنیان دەستکەوت و بەکۆمەڵە خۆیان گەیاندە نێو چادری شەرەفەدینەوە و لە شیرین خەودا وەبەر خەنجەریان دا و کوژتیان، لەشکرەکەی شەرەفەدین بلاوەی تێکەوت.

## ئەمیر مختەس لەسەر هەولێر

کە شەرەفەدین کوژرا، بەدرەدین دەزبەجێ لەگەڵ هەلاکۆ بناغەی موخابەرەی دامەزراندووەوە و بەهەر جۆرێک بوو هەولێری خستەوە دەست. گرتی مختەسی برای سایی سەلمان حەکەمی کردە ئەمیری هەولێر. هەتا ساڵی ٦٥٩ هەولێر لە دەست مختەس دابوو.

## ئەمیر تاجەدین عیسا کوڕی مختەس

کە مختەس مرد بەئیتفاقی هەمووان و ڕێککەوتنی ئەمیر تۆرانی تەتەر تاجەدین کرا بەئەمیری هەولێر. بەو جۆرە زەمانێک بەئیمارەتی هەولێر ڕایبوارد، لە پاشان ئەمیر موبازار کاک بەگی کوردی هێزی پەیدا کرد و چووە سەر هەولێر تاجەدین ناچار هەولێری بەردا و چووە لای برای ئەمیری.

## ئەمیر موبازار کاک بەگ

ئەمیـر مـوبازار کاک بەگ کـە هەولێـری خسـتـە ژێر حوکـمی خۆیەوە، کـار و پیـشـەی حکوومـەتی ڕێکخسـت و لەگـەڵ لەشکر و سـوپا کـۆکـردنەوە و دڵداری ئومـەرا و ئەهالی کوردستـان خەریکبوو، بەدار و عەدل کوردستـانی خستە ژێر باری منەتەوە. لەولاشەوە کە تاجەدین فیـراری کـرد و چووە لای سەعـدودەولەی برای سـاحیـبی دیوانی تەتەرەکان بوو، دەسـتی بەتەشـویشـات و قـووەت پەیداکـردن کـرد، لەلای تەتەرەکـان کـرا بەسوپاهدار و سەرلەشکر. ساڵی ٦٨٣ سوڵتان ئەحمەد ئێلخانی چوارەم کە نەوەی هەلاکۆ بوو، بەنیەتی گـرتنی عـیـراق، سـوپاهێکی قـورسی هەڵگرت و ڕوو بەعـیـراق ڕۆیشت. تاجـەدین کـە کەوتبووە ڕیزی گەورە ئومەرایانی سوڵتان ئەحمەدەوە لەشکرێکی گەورەی لە کورد و تەتەر هەڵگرت بۆ گـرتنی دیاربەکر ڕوو بەمـووسڵ بزووت و لەشکرەکەی ئاژۆت، کـە گـەیشـتـە مووسڵ بۆ مـاندوو حەسانەوە موددەتێک دانیـشـتنی قەرار دا، سـەعـدودەولەی سـاحیـبی دیوانی کوڕی مختەس کە لای سوڵتان ئەحمەد گەورەترین پیاوێک و ساحیب دیوان بوو. سوڵتـان ئەحمەد بۆ سەر ئەمیر مـوبازار کاک بەگ دڵخۆشی داوە و تۆڵەی ئەستاندنەوەی خستە قینەوە و بەهەر کلۆجێک بوو سوڵتان خرا سەر هەوەسی چوونە هەولێر و قەراری دا کـە هەولێری گـرت بیـداتەوە تاجـەدین و ڕوو بەهەولێـر جڵـەوی ئەسـپی سـووڕاند، ئەمیـر موبازار کاک بەگ کە ئەوەی زانییەوە خۆی ڕێکخست و هەستا پەنای بردە بەر سوڵتـان ئەحـمەد کە لە بەڵای بپـارێزرێت، کە گـەیشـتـە ئۆردووگـای سوڵتـان، دەست و پێـوەندانی سوڵتـان بەبێ ئەهەمیەتی تەماشایان کرد و ئیحـترامیـان نەگرت. سوڵتـان کە لەوە ئـاگادار بوو، ئەمـیـری کـوردان پەنای بۆ بردووە، فـێـلـێـکی کـرد کـە بەخـەیانەتی بیگرن، گـرتی قـاقـەزێکی بەزوبانی ئەمیر موبازار کاک بەگەوە بۆ ژن و منداڵەی نوبسی کە بەگەیشـتنی ئەم قاقـەزە ڕانەوەستن و بچنە لەشکرگای سوڵتـان، لەو دەمەدا مـەبەستی سوڵتـان ئەمە بوو کە بەجارێک هەمووان بخـاتە دەست و بیـانکوژێ، بەڵام بەئارەزووی نەگەیشت، کە ئەمیـر مـوبازار کـاک لە فـڕوفـێـڵی سـوڵتـان ئاگـادار بوو و هوشـیـار کـراوە. گـریگـۆربۆس لە تەئریخـەکـەیدا دەڵێ: ئـەو ئەمـیـرە کوردە کـە تێـگەیشت سوڵتـان لە تەکـیا فـیـکرێکی زۆر خەراپی هەیە، بەچوستی و چالاکی خۆی لەبەر پەنجەیا دەرپەڕاند و هەڵات و چووە هەولێر و دەستی بەتەدارەک گرتن کرد. لەولاوە ناردراوەکەی سوڵتـان زانییەوە کـە ئەمیر موبازار کـاک لە دەست دەرچوو فڕوفـێڵی سـوڵتـان سەری نەگـرت، بەنائومێـدی لە نیـوەی ڕێگادا

پاشەوپاش گەڕاوە و سەربهووردی بەسوڵتان گوت. سوڵتان تەمای بوو دەست لە هەولێر بەرنەدا، لە بەختی ئەمیری کوردان زستانی بەسەردا هات، ئەو ساڵە بەفر و سەرمایەکی زۆر ڕوویدا، لەشکرکێشی بەدژوار دەست دەخرا، بەناچاری ڕوو بە گەرمەسێر باری کرد و چەند ئاوایییەکی کوردانی کە لەسەر ڕێگادا بوو، لەپێشدا خەرج و باجیان لێ وەرگیرا لە پاشان تالانکران و ئاواییەکە وێران کران، گەورە و گچکە و ژن و منداڵ هەموو کوژران.

لەولاوە ئەمیر موبازار کە گەڕاوە هەولێر ڕانەوەستا و ڕووی لە چیا و کێوانی کوردستان کرد، لەشکرێکی زۆری کۆکردەوە و بەهەموو دێهات و ئاوایی هەولێردا سووڕی خوارد و هەموو میللەتی ئەو جێگایانەی کە لە ژێر حوکمیدا بوو کۆیکردنەوە و بردنیە نێو قەڵای هەولێرەوە تاکو لە ئاشووب و خراپەی ئێلخانییەکانی بپارێزێت، نەیهێشت نەفەرێک ڕەعیەت لە دەرەوەی قەڵادا بمێنێت و هەموو خزاندە نێو قەڵاوە، بەو جۆرە قووەتی سوپاهی زیاد بوو، بەدڵێکی پاک بۆ بەرابەری ئێلخانییەکان موهەییا بوون. ئەحمەد ئەرگۆن ئێلخانی حەوت جاران لەسەر یەک لەشکری ناردە سەر قەڵای هەولێر و دەورەی دا، چی کرد و نەکرد نەشیا ڕێگای پێ بەرێ. ئەمیر موبازار هەموو جارێ بۆیان دەردەکەوت و لە ژێر دیواری قەڵای شاری دوور دەخستنەوە و کوشتارێکی زۆری لێ دەکردن و دەیشکاندن و بەخۆشیی دەگەڕاوە نێو شارەوە، ئێلخانییەکان لەو شەڕانەدا گەلێک ئەزیەتیان کێشا و ماڵی شەرکەرێکی زۆریان کەوتە دەست، ئەمیری هەولێر هەرچەندە کۆشا لە زەرەر زیاتر چی دیکەیان دەست نەکەوت و بەناچاری دەستیان لە هەولێر بەردا و لێیاندا ڕۆیشتن. کە ئێلخانییەکان هەولێریان بەجێ هێشت ئەوەڵ مانگی ڕەشەمە بوو، ئەمیر موبازار لەگەڵ ڕێکی و دامەزراندنەوەی میللەت و وەتەن خەریکبوو. چوار مانگی بەسەرچوو، لە مانگی مایسی ئەو ساڵەدا ٢٠٠ پیاوی شەرکەری فەرەنگی چەلیپایی (ئەهلی سەلیب) بەئومێدی تالانکردنی هەولێر چوونە سەر چۆمی زێی مووسڵ کە پرد دروستکەن و بپەڕێنەوە، کوردەکانی هەولێر کە ئەوەیان زانی کەوتنە ترس و ئەندێشەوە، بێجگە لە شار بەردان و هەڵاتن چارەیان نەدۆزیەوە، ئەهالی هەموو بەکۆمەڵ چوونە لای ئەمیر و پێیان گوت، ناچار ئەمیریش بەقسەی ئەهالی خەڵەتا و بەجارێ شاریان بەردا و ڕوو بەچیاکانی شیمالی هەولێر ڕۆیشتن، لەولاوە کە ئێلخانییەکان لەوە ئاگادار بوون، بەجارێ چوونە نێو هەولێرەوە و حکوومەتیان تێدا دامەزراند و لەگەڵ ڕێکخستنی ئوموور خەریکبوون. ئەمیر موبازار لەولاوە کە زانییەوە سوپاهێکی قورسی کۆکردەوە و بەهێزێکی تەواوەوە، ڕوو بەهەولێر لە چیاکان چووە خوارەوە، کە گەیشتە دەشت ئێلخانییەکان لە قەڵادا خۆیان قایم

کرد. ئەمیری کوردان دەورەی هەولێری دا، لە پاش چەند ڕۆژ شەڕ، دوژمنی ناچار بەهەڵاتن کرد، ئێلخانییەکان لە دەورەلێدان وەرزبوون و لە قەڵا دەرکەوتن، ئەمیر موبازار کەوتە سەریان و گەلێکی لێ کوژتن و تاڵانێکی زۆری لێ دەستاندن و لە ئێلخانییەکان پیاوێک خۆی ڕزگار نەکرد، هەرچی کوژرا و هەرچی بەدیل گیرا، کورد بەچاکی تۆڵەی خۆیان وەرگرتەوە، ئەمیر بەو شەڕە گەلێک هێزی پەیدا کرد، ئەوجا بەچاکی شاری ئاوا کردەوە. ئەو شەڕ و کوشتارەی کە کوردانی هەولێر کردیان بەهەموو لایەکدا دەنگیدایەوە، لە سووریادا عەرەبانی بەدەوی و عەرەبانی جزیرەی عەرەب کە ئەوەیان بیست، هەوای تاڵانکردنی کوردستانیان کەوتە سەر، گۆیا شاری هەولێر وێرانە و کەسی تێدانەماوە، ئەوانیش دەچن تاڵانی دەکەن، بەجارێک وەکو مێش پلوورەی بەست و کەوتە ڕێگا، کە گەیشتنە نزیک مووسڵ بەچاکی لە ئەحواڵ ئاگادار نەبوون و قووەتی کوردان لە هەولێردا و لە چی حاڵێکدایە نەیانزانیبوو، بۆ ئاگاداری و تێگەیشتنی ٢٠٠ سوارێکیان بەلەز ناردە هەولێرو، ئەمیر موبازار بەچەند سوارێکی کورد بۆیان لە قەڵا دەرکەوتنە دەرەوە. تاتەکان کە وایانزانی بەبێ شەڕ پشتیان لە شار کرد و ڕوویان لە هەڵاتن نواند، ئەمیر و سوارەی کورد کەوتنە سەریان و دەستیان هەڵنەگرت و شیری تیژیان کێشا و دەستیان بە تات کوژتنێ کرد. لەو ٢٠٠ سوارە ٤یان بەپەرێشانی ڕزگار بوون. ئەمیر موبازار بەشادی و دڵخۆشییەوە، بەتاڵانگرتن گەڕاوە ئەهالی هەولێر بۆ پیرۆزبایی هەتا دەری شار پێشوازییان کرد و بەکەیفەوە چووە نێو شاری هەولێرەوە و لەگەڵ دامەزراندنی حکوومەت و ئاسوودەگی ڕەعیەت خەریکبوو، ڕۆژ بەڕۆژ ڕووی لە زیادبوون کرد. گریگۆریوس بەرایەریش کە لە چاغی ئێلخانییەکاندا بووە، کە لە تەئریخی ساڵی ١٢٨٦ میلادی لە مەراغە نویسییەوەتەوە بەزمانی ئاسووری هێندە لەو ئەمیرە کوردەی باس کردووە. ئەمیر موبازار کاک بەگ، هەتا قوبادی بابا ئەردەڵان هەولێری لەگەڵ شارەزوور کرد بەیەک حکوومەت، دەوامی کرد. بەئومێدی خودا دەست بەجزمی چوارەم دەکەین، پێشترینی باس لە ئەمیر شەمسەدین جگەرمژ دەکا.

تەواوبوو

لێ وەرگیر – مەئخەز

* التاريخ الكامل – ابن الاثير – عەرەبی.
* مرآت العبر – سعيد پاشای دیاربەکر – تورکی.

* سیرت صلاحیه - عمادی کاتب - عەرەبی.
* قاموس الاعلام - شمس الدین سامي - تورکی.
* بەرایەریش: گریگۆریۆس (مطران ابو الفرج) - ئاسووری
* حرق العین - حافظ أبا خطاب - عەرەبی.
* دائرة المعارف - بطرس بستاني - عەرەبی.

# دێریکی پێشکەوتن

میژووی دوو دەوڵەتی مەزنی «دوشتێکباز - هەزبانی»یە کە لە

ئاوربایەگان - دیاربەکر - ئەرگیش - جزیرە - مووسڵ -یدا بەئازادی

و سەربەستییێتی فەرمانڕەواییان کردووە.

کردەوەی

**داماو (حوسێن حوزنی) موکریانی**

بەندی یەکەم

لە ساڵی ٣٥٦ تا ٤٨٩ هـ

زنجیرەی چاپی پێشوو : ١١

دیارێکی

# پێشکەوتن

مێژووی دوو دەوڵەتی مەزنی دوشتێکباز ـ وەهەزبانی بە
کە لە آوربایەگان ، دیاربەکر ، ئەرگیش و
جزیرە، موصلیدا بەآزادبوەربەستێی فەرمانڕەوایی یانکردووە

کردەوەی

داماو ( حسین حزنی ) موکریانی



﴿ چاپی دووەمـین ﴾

چاپخانەی کوردستان

هـەولـێر

٢٥٧٤ کوردی ( ١٩٦٢ )

# پێشەکی

# و

# بەسەرهاتی داماو «حوسێن حوزنی» موکریانی

پێشکەوتن کە مێژووی دوو بنەماڵەی بەرزی میراتی کوردانە کە یەکەمییان دەوڵەتی «دۆستێک-باز»ە؛ لەدیار بەکرو ئەرکیش و تبلیس و جزیرە و موسڵێدا هەڵکەوتووە؛ دووەمینیان دەوڵەتی «هەزبانی»یە لە «ئاردەوێڵ» و «تەورێز» و «مەراغە» و گشت شوێنەکانی تری ئازەربایجانێکدا فەرمانڕەواییان کردوو. کردەوە و یادگاری مێژووناسی ناودار و گران، داماو حوسێن حوزنی موکریانی برامە و بۆ جاری یەکەمین لە ١٩٢٧دا لە ڕەواندزێ لە چاپخانەی زاری کرمانجی خۆماندا چاپکراوە. لەڕووی ئەوەوە کە مێژووی «پێشکەوتن» لە مێژە نەماوە زۆر بەکەڵک و جێگای سوودەو داخوازیش زۆرە، بەمایەی سەربڵندێتی و بەختیاری خۆمی دەزانم کە سەرلەنوێ چاپی کەمەوە. بەڵکوو بەو هۆیەوە خونچەی ڕەوانی پاکی برا خۆشی نەدیتوەکەم لەناو گوڵزاری بەهەشتی کوردستانیدا لە خۆشیان بپشکوێ و بگەشێتەوە.

## بەکورتی بەسەرهاتی داماو

حوسێن[1] کوڕی سەید عەبدوللەتیفی کوڕی شێخ ئیسماعیل کوڕی شێخ عیسای کوڕی شێخ لەتیفی خەزاییە. نێو بانگی هەندەرانی «حوزنی» وناز ناوی کوردستانی «داماو»، «خدۆک» و «بێژەن»ە.

داماو شەوی پێنج شەمەی ٢٢ رەبیعی یەکەمی ساڵی ١٣١١ لە سابلاخ (مەهاباد)دا لەگەڕەکی حاجی حەسەنیان پێی ناوەتە ناو مەیدانی ژیانەوە.

لەلای باوکی و خاڵەکانی و قوتابخانانەدا، وە چەند ساڵێکیش لە رووسیەو ئەستەمبووڵێدا خوێندوویە. کوردی و فارسی و ئارەوی رووسی و هیندی و ئەفغانی و ترکی باش دەزانی. کەمێکیش سەری لە زمانی فەرانسەیی و ئینگلیزی دەردەچوو؛ جار جارەش هەڵبەستی دادەنا.

داماو لە تەمەنی دوازدە ساڵانەییدا نیشتیمان و کەس و کاری خۆی بەجێهێشت، وەبە رێگای مەراغە و تەورێزێدا رووی لە ئێرەوان و موسکۆ و پەتریسبورغێ کرد. دوو ساڵانی لەوێدا رابوارد. دوایە بەرەو هیندوستان و ئەفغانستان و ئەستەمبووڵی رۆیشت. دوو ساڵیش بە پیشەی مۆر هەڵکەندن و خۆشنووسی لە ئەستەمبووڵێدا رابوارد و چەند ساڵێکیش بۆ خڕ کردنەوەی شوێنەواری مێژوویی لەبەرگی گەڕۆکیدا بەهەموو گۆشەو قوولینچکێکی کوردستاندا گەڕا. لەدویەدا چاپخانەیەکی پوختی بۆ خزمەتی زمان و مێژوو و وێژەی کوردی لە ١٩١٥ی زایینیدا لە شاری هەڵەبسێ دامەزراند و بۆ خۆشی دوازدە ساڵانی تێدا مایەوەو لەوێدا بەپیشەی مۆرهەڵکەندن و خۆشنووسی تابلۆ (لوحە)ی زەرد، مۆری جیل، لاستیک، لەسەر شووشە ناو وێنەو نەخش و نیگار هەڵکەندن، زەنکوغرافی، چاپخانە، وە لەسەر هەموو جۆرە کاتێکی نرخداری وەکو زێڕ و زیو و ئاقێق و یاقووت و پیرۆزە و دوڕ ئەڵماس، ناو و نەخش و نیگار هەڵکەندنی رابوارد.

ئیتر لە سووریەوە لە ساڵی ١٩٢٥دا بەماڵەوە هاتە بەغدا. لە پاش ٦ مانگان بەهەشتی سەید تاهای شەمزینی بەسواری فرۆکەی لەگەڵ خۆی بردیە رەواندوزێ و چاپخانەکەشی لەوێدا بەناوی «مەزرەکەی زاری کرمانجی» دامەزراند.

داماوی خۆشی نەدیتوو چارەڕەش لەڕووی ئەوەوە کە لە موکریانێدا بیروبارەڕ لەسەر

---

(١) ئەو چەند لاپەڕەیەم لەبەسەرهاتێکی چەند سەد لاپەڕەییەوە کورت کردۆتەوە.

ئەوە کـۆبۆوە کە بیکەنە پێشـەوا و سـەرۆکی خـۆیـان، دەست بەجێ لە ١٩٤٣دا لە لایەن کلکەکانی ئینگلیزانەوە بوختان و شلّتاخێ دزیەتێ پێکراو خرایە بەندیخانەوە وناچاریش کرا کە بچێتە بەغدا. ئیتر لەوێ دەست بەسەرکراو تا کوژتیان نەیانهێشت کوردستان ببێتەوە. بەلاّن ئینگلیزان ئەوەندەشیان پیاوەتی لەگەلّ کرد کە بۆ بەدناوی و ئابڕوو بردنی دەهۆلّی کۆڤارو ڕۆژنامەی «دەنگی گیتی تازە»یان لەمل کرد. ئینگلیزی خوێنمژی هەژار کـوژ، بەوەشـیـان واز لـێ نەهێنا؛ لە ١٩٤٧دا دەرمـاندا و یان کـرد و تالاّوی مـەرگـیـان دەرخواردا.

«دامـاو» هیـچ جـۆرە منداڵێکی نەبوو تاڵەپاش بەجێ بمێنێ؛ بەلاّن یادگـاری وای بەجێهێشتوون کە هەتا هەتایە نەخۆشی نابن و لەناو ناچن و ڕۆژگاریش دەستەلاّتی تەفر و توونا کردنیان نییە.

یادگارە چاپکروەکانی داماو «حوسێن حوزنی» ئەوان:

١- خونچەی بەهارستان (مێژوو)

٢- پێشکەوتن (مێژوو)

٣- مێرگەی دلاّن (مێژوو)

٤- ناودارانی کورد (مێژوو)

٥-ئاوڕێکی پاشەوە (مێژوو)

٦- شاهە نشایانی کوردی زەند (مێژوو)

٧- کورد و نادرشا (مێژوو)

٨- میرانی سۆران (مێروو)

٩- کوردستانی موکریان (مێژوو)

١٠- بەکورتی هەڵکەوتی دێرێکی (مێژوو)

١١- خۆشی و ترشی (چیرۆک)

١٢- خۆشی و ترشی

١٣- وێنەگری و کۆلّێن

١٤- پێشەوا ی ئایین

١٥- بەخێوکردنی کرمی ئاوریشم

١٦- چەند لاپەرەیەک لە دێرێکی موکری

داخەکەم چەن پەرتووکێکی تر کە لە حەڵەب و ڕەواندز چاپکراون خۆشیان نەماوە و ناویشیانم لەبیر نەمابوون؛ بۆ لێیان نەدواوم.

بێجگە لەوانەی سەرەوە ١١ جۆرە پەرتووکی خەڵکیشی چاپکردووە. ٢١ یادگاری نرخداری چاپ نەکراویش ماون؛ داخی گرانم [دەستی] ڕۆژگار یاریکاری نەکردووم کە بە چاپکردنیان بەختیاربم.

گیوی موکریانی

## پێشەکی

سۆپاسێکی زۆر بۆ پەروەردگارێکی وابێ کە لەسەر هەموو شاهەنشا و ئافەریدەیێکی فەرماندەیێکی بێ پرسیارە. هونەرمەندێکی وا بەرزە کە وریایی و تێگەیشتنی خستۆتە نێو کەللەی ئادەمیزادانەوە؛ تا بەهۆی تێکۆشان و زانیاری ببنە نموونەی دەسەلات و توانای پەروەردگار.

بۆ نموونەی پێشەوەرێتی و هونەرمەندێتی یەزدان ئەوەندە بەسە کە لەناو سێ پەردەی تاریک و تنووکدا، لە تنۆکە ئاوێکی کیماوی، چ دوڕڕێکی یەکتا و چ گەوهەرێکی هەتیوی بێ هاوتای لە مانگ و ڕۆژ جوانتری، لەتیشکی ڕووناکی زانایی خۆی هێناوەتە دی، وە بەهەزاران جوورە خشڵی جوانی و نازداری و خوو و ڕەوشتی چاک و گەورەیی و ئازادیی و جوامێری و... ڕازاندۆتەوە.

بەندەی بێ دەسەلات کە لەمێژە بۆ گرد کردنەوەی شوێنەواری مێژوویی کوردان بەناو هەموو گۆشە و قوژبنێکی گیتی و بەتایبەتی کوردستانێدا گەڕاوم، بەهەموو هێز و توانایەکی خۆمەوە بەدڵ و گیان لەپەلو پۆو کۆشەوە دا بووم تا بەپشتیوانی خودای تاک و تەنها لە سەرەتای ڕۆژێکەوە کە مێژوو نووسراوەتەوە، تا ئەمڕۆ ئەوەی کە وەدەستم کەوتووە، کردوومەتە کۆمەڵەیێکی چەند هەزار لاپەڕەیی و ناویم ناوە «گەوهەرییەگانە».

بەڵام کە لەلایەن ئەرکی چاپییەوە سەرنجم دایە، وا دەرکەوت کە بەیەکجار چاپکردنی ئەو کۆمەڵە گەورەیە، ئەرکێکی گەورە و قورسی هەیە و پێداویستی پوول و دراوێکی زۆرە و ئەویش لەم ڕۆژەیدا کە ئێمە لە ڕەواندزێ لە پەلوپۆ کەوتووین و پەرێشانین، هەڵناسووڕێ. جا لە ڕووی ناچارییەوە پارچە پارچە بڵاوی دەکەمەوە؛ بەو چەشنە هەموو کەسێکیش دەتوانێ بیکڕێ و هیچ کەسبش لە خوێندنەوەیدا دڵگیر نابێت.

ئەو پارچەیەم کردە دووبەند: یەکەمینیان باسی چلۆنی پادشا و فەرمانڕەوایانی دۆستێک دەگرێتەوە کە لە «دیار بەکر» و «ئەرگیش» و «تبلیس» وجزیرە و مووسڵدا دەستەڵاتدار بوون. بەندی دووەمین لەبابەت ژیان و فەرمانداریی پادشایانی «هەزبانی» دەدوێ کە لە «ئاردەوێڵ» و «مەراغە» و هەموو پارچەکانی تری «ئاوربایەگانی»دا فەرمانڕەواییان کردوەو ناویشم نا «پێشکەوتن»ی ڕەگەزی کوردان و فەرمانڕەوایی دوو بنەماڵە و ئازادییان.

داماو حوسێن حوزنی موکریانی

# بەندی یێکەم

## دەوڵەتی دوشتێک - باز[1]

## لەساڵی ٣٥٦ - ٤٨٩دا

گەلێک مێژوونووسانی کوردستان کە دەستیان (قەڵەم) دەگرێت، لە پێشی هەموو
چتێکدا گەوهەری و پێش دەستیان و دەسکە گوڵی تەرازووی گۆتنیان سەلاحەدین و
بنەماڵەی ئەیووبییانە. هەرچەندە عەدالەت و سەخاوەتی سەلاحەدین ڕۆژهەلات و
ڕۆژئاوای پڕ کردووە، ئەو قارەمانە دادوەر و پڕشان و شکۆبە نەک تەنها بەتەنێ مایەی
سەربڵندی کوردانەو بەس بەڵکو هەموو موسوڵمانێک شانازی پێوە دەکات. بەڵکو
سەرەڕای ئەوەش گەلێک پادشا و شاهەنشاهی خاوەند سوپا و قۆشەن و تەخت و تاج و
دراوی پڕ شان و شکۆی دیکەش لە کوردان هەڵکەوتوون و مێژیی نوسان کەمیان لێدواون
و لەبەرئەوەی کە کورد بوون، جێگا و پایەی ئەوانیان بەهێند نەگرتوون. منیش جارێ
لێرەدا بەکورتی هێندێک لە سەردەم و چاخی شاهەنشاهیتیان دەدوێم؛ تاکو لە
خوێندەوارانی خۆشەویستی کورد ئاشکرا بێت کە «شەرەفنامە» و «ئیبن خەلدوون» و
«ناسخ التواريخ»ی ئێران وە چەند کتێبێکی تری مێژوویی لەسەر ئەوە ڕێککەوتون چەند
شاهەنشاهێکی کە لەژێر عینوانی «دەوری سەڵتەنەت»دا بڵاو دەکرێنەوە، هەموویان
خاوەندی سکەبوون و خوتبەیان بەناوی خۆیان خوێندۆتەوە، وە لە ژێردەستی هیچ
بێگانەیەکیدا نەبوون. ئەمەش هێندێکە لە بەرگی یەکەمی مێژووی «گەوهەری یەگانە» کە
دێرێکی کوردانە وە لە دانراوەکانی خێوی زاری کرمانجییە. بەندی یەکەمین باسی
حوسێنی کوڕی دوشتێک دەکات کە لە ئەرکیش (ئەردیش - ئەرجیش) و «دیاربەکرێ» و
«جزیرە»یدا فەرمانڕەوایی فەرمووە.

---

(١) ئەو نوسخەیە ئەم بابەتەی لە ڕوو نووسراوەتەوە، چاپی گیو موکریانییە -ف-

## چلۆنی حوسێن و ناوی و ژیانی

حوسێن کوڕی دوشتێک، لەقەبی سولتان شوجاع و ناوبانگی «باز» بوو. دەڵێن لەبەر تەڕدەستی و چالاکی و زۆر هەڵمەت بردنی بۆ سەر دوژمنان هێندێک بە«با» و هێندێکیش بە«باز»یان ناو دەبرد.

حوسێن پیاوێکی زۆر ئازا و بەسەلیقە و ڕەزا شیرین و گەلپەروەر و دادخواز وبەحەمیەت و سەخی و دڵفراوان و بەجەرگ و خووڕەوشت بەرز و ڕووخۆش و بەسام و دلێر و پاڵەوان و تیژبیر و خێرخواز و بەبەخشیش و تێگەیشتوو و زانا بوو. هەرکەسێکی لە هەر لایێکەوە پەنای بۆ ببردبایە، پەناشی دەدا و کۆمەکیشی دەکرد. دەستی هەژار و دەستکورتانی دەگرت، لە هەر شوێنێکیەوە هەر لێقەوماوێکی چووبا بەلای، بەناز و نیعمەت و دڵێکی پڕ شادی و خۆشییەوە ڕەوانەی دەکردەوە و بەبێ خەم و پەرۆش بەهەموو جۆرە دڵخوازێکی خۆی دەگەیاند. لە هەر لێقەومانێکیدا پیاوانی گەورە و بەهێزی لەسەر وەخڕ دەبوون، بەگیان و دڵ بۆی دەکۆشان، دەنگی پیاوەتی و ئازایی و بانگی بەخشیش و جوانمێری لەنێو هەموو کوردستاندا بڵاوبۆوە. لە لای هەموو کەسێک خۆشەویست بوو، دۆست و دوژمن حەزیان لێ دەکرد. لە جێگایان و وڵاتاندا بەچاکە و پیاوەتیان هەڵدەگۆت.

حوسێنی کوڕی دوشتێک لە عەشیرەتی «هەمموودی» لە ساڵی ٣٢٤ لە دیاربەکر لە دایک بووە.

دوشتێکی بابی، گەورەی عەشیرەت بوو، ئامۆزای دوشتێک دەستی بەسەر عەشیرەتی «هەمموودی»دا کێشا دوشتێک بەرامبەریی نەکرد، چووە نێو شاری دیاربەکر و بەمەئمووریەتێکی چکۆلە بەسەری دەبرد. لە ساڵی ٣٢٨ دا بەکۆمەگی هێندێک لە سەرۆکی عەشیرەتان، دوشتێکیان بردەوە نێو خۆیان و «ئاودەل»ی ئامۆزایان گرت و عەزلیان کرد.

حوسێن تاکو عومری دەگاتە دوازدە ساڵان لەکن مامۆستای بەتایبەتی دەخوێند، دوو ساڵیش لە دیاربەکرێدا بەتەحسیلی عیلم مەشغووڵ بوو.

لە ساڵی ٣٣٩ دا هێندێک لە عەشیرەتان سەریان لە دوشتێک بلندکرد. حوسێن لەبەرئەوە خوێندنی بەردا و ڕووی کردە نێو عەشایری خۆی لە حدوودی جزیرەدا. ڕۆژێکی هەتا ئێوارە شەڕێکی وایکرد کە هەموو تیرەیەکی تێدا واقمان. مندالێکی وا بەو

چکۆلەییەی ئەوەندە ئازا و ڕەشید و بێ ترس بێت. لەبەر هەڵمەت و ئازایی حوسێن، دوژمن شکستەی تێدەکەوێت و بەگەلێک تالان و خۆشی و شادییەوە گەڕانەوە.

لەوێوە شوهرەتی بنچینە گیربوو؛ ڕۆژ بەڕۆژ ناوی بڵندبوو. لە هەموولاییێکەوە پۆل بەپۆل لێ قەوماوان پەنایان بۆ دەبرد. دوشتێکی بابی لە تەربییەت و ڕێگای چاک نیشاندانیدا قسووری نەکرد.

حوسێن بۆ دەوروپشتی خۆی دەستی درێژکرد و هەمووی خستە بن ئەمر و فەرمانییەوە. هەموو نزیکان گەورەیی و حوسێنیان قبووڵ دەکرد. چاکە و پیاوەتی و سەخاوەتی، دڵی عالەمی جەلب کردبوو. لە ساڵی ٣٤٥ دا هێندێک لە جزیرەی خستە ژێر ئەمریەوە. لە ساڵی ٣٤٦ دا چووە سەر «سعیرد» و «بتلیس»؛ لە پاش گەلێک شەڕوشۆڕ گرتی. لەو سەفەرەیدا ناویان نا «با».

لەبەر زوو بەپەلەچوون و شەڕکردن و قەڵا و شاران گرتنی وەکو «با» چوون و بەوێنەی «باز» تیژووهاتن لە دوژمن، پێیان گوت «باز».

هەر لەو ساڵیدا ناوی ئەمیرییشی لە سەرخۆی دانا. لەشکر و قشونێکی کە لە دەستیدا بوون، کردنیە ڕەسمی. ٢ هەزار سوار و پیادەی لەکن بوو. هەر ٣٠٠ سواری خستە بن حوکمی سەر کۆمارێکەوە؛ ناوی نا «سەرۆک». تەواوی سوار و پیادەکانی خستە ژێر فەرمانی «خودێبەند»ەی برای گەورەیەوە.

لە ساڵی ٣٤٨ دا دوشتێک بابی حوسێن وەفات دەکا. بەشێوەیەکی چاک لە شاری سعیرددا دەیشارنەوە.

ئەمیر حوسێن باز تا ساڵی ٣٥٦ بێ موقابەلە و شەڕ و کێشە لەگەڵ ڕێکخستنی ڕەعیەت و ئومووری حوکمداری خەریک بوو. لە جێگایانی دوورەوە قووەتی بۆ پەیدابوو؛ گەلێک سەرۆکانی کوردستانی موکریان و بەبەیان بۆ هات. هەمووی بەئیحترام و نەوازشەوە ڕادەگرتن. ئەرازییێکی کە لە دەستی دابوو، ڕۆژ لەگەڵ ڕۆژ دەستی بەئاوەدانی کرد.

چەند عەشیرەتێکی ڕەوەندی کە لە ژێر ئەمریدا بوون، هەمووی لە گوند و شاراندا دامەزراند و تیجارەت و کڕیار و فرۆتن و چاندن و خانووبەرەیان دەست پێکرد.

ئەمیرباز لە سعیردا قەڵای قایم و بەرزی بۆ لەشکری بینا نا، بەهەموو پێویستییێکی قۆشەنی قایم کرد. لە بتلیس لەسەر چیای شیمالی شەرقی شارەوە قەڵاییێکی زۆر چاکی

دامەزراند، لە دەووری شار دیوارێکی پان و بڵندی ڕێکخست و دوو دەروازەی بۆ کردەوە. لەسەر هاتن و چوونی ڕووبارێکی بەناو شاردا ڕادەبرد.

لەساڵی ٣٥٠ دا چەند قەڵایەکی لە دەوروپشتی بتلیس خستە دەست. «ملازگرت» و «موکس»ی لە ساڵی ٣٥٢ کەوتە دەست، هەریێک پیاوێکی سەرۆکی کوردانی لەسەر دانا.

لە ساڵی ٣٥٣ دا هێندێک گوندی عیسایی ئاین کە لە کەناری ڕۆژئاوای دەریاچەی وان بوون، چووە سەریان و گرتیانی. لە ژێر دامێنی چیای «سیپان» کە لە ڕۆژئاوای گۆلی وان واقیعە لە کەناری دەریاچە لەشکربەزی کرد کە بچێتە سەر ئەرگیش (ئەرجیش)؛ لەبەرئەوە کە لەشکرێکی زۆری ئەمیری ئەرگیش لە شاردا بوو.

ئەمیرباز نەیدەویست بەشەڕ و کوژتار بچێتە سەریان؛ ئەمری دا لەو جێگا لەشکرەدا، شارێکیان دامەزراند بەناوی باز. بەیەکبوونی سەرۆک و گەورەو سوپاهی، بەحوسێنیان گوت «شاباز». ناوی ئەو شارەیان نا کردەوەی شاباز. ئەو شارە لە دەوری ئەیووبییاندا مەلیکی عادیل برای سوڵتان سەلاحەدین کە گرتی ناوی نا عادیل کەوباز. ئەمڕۆکە بەعادیل جەواز دەناسرێت.

لە موددەتی دوو ساڵاندا شاری شاباز ئەوەندە زلبوو کە لە دەوروپشتیدا شارێکی وا پەیدا نەدەبوو؛ دوکان و بازاڕ و خانووبەرە و ئاوەدانییەکی زۆریان دروست کرد و بوو بەمەرکەزێکی کڕین و فرۆتن. چەند کەشتییێکی چاکیان خستە دەریاچەوە. ماڵی کڕیاریان لەوان و ئێران و موکریان و هەکارییەوە دێنا شاباز، چتمەکیان تاکو لازستان و گورجستان دەچوو.

لە ساڵی ٣٥٥ دا ئەمیری ئەرگیش بەلەشکرێکی زۆرەوە هاتە سەر شاری شاباز. لە چوار سەعاتە ڕێگاییێکی دووری شار هەڵیدا.

حوسێن شاباز لەشکری سەروبەر کرد و لە ١١ی شەوالدا لە شارێ دەرکەوت و لە بەرامبەری دوژمن ڕاوەستا. دەستەسوارێکی لە دامێنی شەرقی سیپانەوە ناردە سەر ڕێگای ئەرگیشیان لە دوژمن گرێدا.

دوژمن لەوە بێ خەبەربوو کە ڕێگای لێ گیراوە و پشتیوانی لە مەرکەزەوە بۆ نایەت. ئەو ڕۆژە هەردووک لا بۆ لێکدان ئامادەبوون. ئەگەر دوژمن بەگەیشتنی شاباز بەلەنگازی بووایە، مومکین بوو موەفەق بێت؛ چونکو سوارەکانی شاباز هێشتا نەگەیشتبوونە جێگای

دڵخواز. شاباز هەرکە گەیشتێ لە شەڕ سستی کرد تاکو پشتی دوژمن لە هاتوچوون گرێ دەدرێ. ئەو شەوەش تیپێکی پیادەی بۆ کۆمەگی سوارەکان نارد. سوارەکان کە یارمەتییان بۆ هات بوونە دوو دەستە: دەستەیەک لەگەڵ هێندێک پیادە لەژێر فەرمانی «مەردان» ئەمیرێکی جزیرەدا چوونە سەر ئەرگیش. هێندێکیشیان لەسەر ڕێگای هاتوچواندا جێگاگیربوون.

کە بەیانییان بەسەر داهات هەردووک لایان بۆ خوێنڕژتنی یەکتری شاڵاویان هێنا. تاکو ڕۆژئاوا بوون شەڕ و کوژتارێکی وا کرا کە باوک کوڕی خۆی نەدەناسییەوە. دوژمن لە هێز کەوت و تەواو تاریکی پەیدا نەببوو، ئەمیری ئەرگیش بەدیل گیرا و سپا ڕووی لە هەڵاتن کرد. دەنگی هەڵات هەڵات گوێی عالەمی پڕ کرد. لە هەرلایێکەوە تێیان ڕۆهاتن؛ گەلێک پیاویان بەئەسیر گرتن و گەلێک ئەشیایان بەتاڵان هێنا دەست. هەموو سوپاهی شاباز لە تاڵان و ماڵی دوژمن تێربوون و بەشادی و خۆشی و بەماڵێکی زۆر و گەلێک دیلەوە گەڕانەوە شاری شاباز. سێ شەو و سێ ڕۆژان لەنێو شاردا شادمانی و چراخان کرا.

شاباز هەموو لەشکرەکەی بەخەڵات و دیاری و ئافەرین و بەخشیش دڵخۆشی کردن. ڕۆژی چوارەم کە لە شادی بەشکردنی تاڵان و ماڵی دوژمن ئاسوودە بوون، شاباز ئەمری دایە ٢ هەزار سوار و پیادە بۆ کۆمەگی ئەوانەی کە چوونە ئەرگیش بکەونە ڕێگا. لە ژێر فەرمانی ئەمیر خوابەندەی برایدا بەڕێیکردن؛ بۆ خۆشی تا جێگای هەڵاتنی دوژمنیان لەگەڵ چوو. ئەمیر خوابەندە ڕوو بەئەرگیش بزووت.

شاباز ئەمری دا تەواوی لەشکر و سوپاهی لە شاری شاباز دەرکەون و بچنە ئەو مەیدانەی کە شەڕی لێکرابوو. هەموو لەوێ خیوەت و خەرگایان هەڵدا.

ئەمیر خوابەندە کە گەیشتە نزیک ئەرگیش، تەماشای کرد «ئەمیر مەردان» جزیرەی شاری دەورە داوە و هەموو ڕێگاییێکی لە هاتوچوویان گرێداوە؛ دەستبەجێ ئەمری دا قاقەزێکیان بۆ ڕیش سپی و کەیخودایانی شار نووسی کە: «ئەمیری ئێوە لەکن شا ئیخسیرە و هەموو لەشکرەکەتان بەدیل گیراوە. ئێوەش لەناو شاردا دەورە بدرێن و ئەزیەت بکێشن چاک نییە؛ لە هیچ مەترسن و هەمووتان لای ئێمە موحتەرەم و خۆشەویستن و شابازیش بەدادو عەدالەتە، حەز بەزەرەر و زیانتان ناکا و لە ڕێگای دۆستایەتی و میهرەبانییەوە پێتان دەڵێم کە شەڕ مەکەن و دەروازەی شاری بکەنەوە. ئەوەندە بزانن ئەگەر ١٠ ساڵ لە دەورەی ئەرگیش دابنیشین، هێشتا بەجێهێشتنی مومکین نییە؛ هەتا وەدەستی نەخەین ناگەڕێینەوە...».

ئەهالی جوابیان داوە: «ئێمە بۆ خۆمان حوکمدارێکمان لەنێو خۆماندا قەرار داوە و هیچ ئێوە ناناسین...».

ئەو جوابەیان بۆ شاباز نارد و هەموو گفتوگۆیەکیان عەرزکرد. حەزرەتی شاباز فەرمووی: «لە گرتنی هەراسان مەبن، لە ئەزیەتدانی ئەهالیشدا خۆ بپارێزن؛ هەتا بەکەیفی خۆیان بێزار نەبن لینگ مەدەنە سەریان».

میر خوابەندە لەهەر چوار کەناری دیواری قەڵای شارەوە خێوەت و دەستگای هەڵدا و دانیشت. شاباز کە تەماشای کرد گرتنی ئەرگیش دوور دەکێشیت، لە جێگای لەشکرگاهی ئاوێکی بینا نا و ناوی نا «هەڵات». هەموو پیاوان و سەرکۆماران و سەرۆکان، ماڵ و منداڵی خۆیان هێنا ئەوێ. ئەوانیش بەئاسوودەیی و عەدالەتگوستەری و کەیفخۆشی ڕایان دەبوارد. ئەو شارە ئەمڕۆکە بە«خەلات» ناو دەبرێت کە کەوتۆتە نێوان شاباز و ئەرگیشەوە.

موددەی ٥ مانگێک لەگەڵ گرتنی ئەرگیش و ئاوەدانی «هەڵات» خەریک بوون. لە ساڵی ٣٥٦ ی هیجریدا ئەهالی ئەرگیش زۆر وەتەنگهاتن؛ تەماشایان کرد لە جێگایەکەوە کۆمەگیان نەکردن. هەموو سەرۆک و سەردارانی شار لە شارەوە چوونە خزمەت ئەمیر خوابەندە. ئەویش بەلوتف بەخێرهاتنی کردن.

لە ٢٢ی ڕەبیعدا بەشادی و خۆشی چوونە نێو شارەوە. خەبەری گرتنی شاریان ناردە خزمەت شاباز، لەناو هەردووک لایاندا شادمانی و خۆشی دەست پێکرا. لە ئەرگیشدا دەستکرا بەتەرکیباتی لەشکر و ڕێکخستنی ئومووری شار.

شاباز لە جەمادی١ دا واریدی شار بوو؛ دەرکی داد و سەخاوەتی بەسەر ئەهالیدا کردەوە. هەموو ئەهالی یەک بەیەک بۆ بەخێرهاتن کردنی چوونە خزمەتی. لە پاش چەند ڕۆژێک دارودیواری قەڵای دەرەوەی شار کە لەبەر دەست لێدانی وێران ببوو، چاکیان کردەوە و لە نێوەڕاستی شاردا خانووێکی شاهانەیان بۆ حوکمدار دروست کرد. لەشکر و قشوون دامەزران و سەرۆکانی لەناو خانووی ئەمیری پێشوودا دانیشتن.

شاباز لە ساڵی ٣٥٨ دا بەر بەدیاربەکر بزووت. شاری ئامەد و میافارقینی گرت و هەموو قەڵا و جیگایانی قایمی ئەو دەوروپشتەی خستە دەست و چوونە سەر ڕەها؛ ئەویشی خستە ژێر پەنجەوە. سەڵتەنەت و حوکمداری خۆی دامەزراند و هەموو سنووری خۆی ڕیکخست.

ئومەرا و سەرۆکانی حەسنکیف و جەزیرە و بۆتان و سروج و نسێبین ڕەعیەتی شابازیان قبووڵ کرد. میرانی هەکاری دۆستایەتییان لەگەڵ پەیدا کرد و بنچینەی ڕێککەوتنیان

دامەزراند و دیاربەکری کردە پایتەخت.

حوسێنی برای لە ئەردیش دانا. بەلوتف و ئیحسان و ئازادی دڵی عەرەبانی بادیە و سووریای گرتبوو. لەبەر زۆرداریی و نەترسانی و ئازایی لەلایەن خەلیفەی بەغداوە بە«ئەبو شوجاع» یان نێوبرد. لەسەر مینبەران ناوی خەلیفە و بازیان خوێندەوە. لە ساڵی ٣٦٠ دا دوو پارچە دراوی بەناوی خۆی کوڵی و ناوی نا «شوجاعی».

سوڵتانی میسر موعزودین بیللا لە ساڵی ٣٦٢ دا دیارییێکی زۆر چاکی بەقازیی خۆیدا بۆ نارد. پیرۆزی پادشاهی دوشتێکی لێ کرد و ناوی نا «مەلیک شوجاع».

هەرچەندە بەو ناوانە دڵخۆش نەبوو، بەئازایی و دەستوبردی خۆی پشت توندبوو؛ بەڵان ناوبانگیشی زۆری کۆمەگی کردبوو، هێز و قووەتی پەیدا کردن چاکی دەستگرت. لە هەرلایێکەوە لەسەری خڕبوونەوە. گەلێک چاوی لە زیادکردنی موڵک بوو؛ بۆ فرەیی زۆر دەکۆشا.

کوڕانی بوویە کە «بەغدا»یان گرت. لە تەئریخی ٣٦٤ دا چووە سەر ماردین، گرتی و لەشکرێکی زۆری بردە سەر مووسڵ. بەختیاری کوڕی بوویە دەورەی مووسڵی دابوو.

مەلیک شوجاع لەگەڵ بەختیار شەڕێکی خوێناوییان کەوتە نێوانی؛ شەڕ کەوتە گەڕەکی غەربی شیمالییەوە.

تەعلەبی حەمدانی داوای مامەڵەتی لێ کرد. لەبەر زۆری دوژمن گەڕانەوەی بەمەسڵەحەت زانی؛ بەسەر قەڵا و جێگایانی کوردستاندا گەڕاوە. هێندێکی لە هەکاری گرت و چوونە سەر «کاوا»ش کە بە«داردەمشت» ناسراوە. لە ئەحواڵی مێژیدا لە جنووبی دەریاچەی واندا هەڵکەوتووە. گرتی و چووە سەر قەڵای وان. لە پاش ٣ مانگ دەورەدانی، گرتی. ئەوە بۆ کوردان بوو بەبڵندیەکی تەواو؛ چونکو لە دەست ئەرمەنییاندا بوو، ئەوانیشیان لە نێوانێ وەدەرنا. لە پاش ڕێکخستنی حکوومەت، سەعیدودەولەی برای کردە حاکم لە قەڵای واندا و گەڕانەوە و چوونە ئەردیش.

تەماشای چلۆنی گەڕانی شاری کرد. پێویستیەکی کە بەرەعیەت و دەوڵەت لازم بوو، بۆی جێبەجێ کردن. حوسێنی برای ناونا شەرەفوددەولە. موددەتێکی بۆ ئاسوودەگی لەوێدا دانیشت.

لە ساڵی ٣٦٦ دا گەڕاوە دیاربەکر. خاکی کوردستانی لەژێر پەنجەی هێندێک سەرکێشانی حەمدانی و کوڕی بوویەو ئەرمەن دەرخست و هەمووی خستە ژێر فەرمانی

پادشایەتی خۆیەوە. بۆ بڵندی و یەکبوونیان گەلێک کۆشا.

لە ساڵی (٣٦٧)دا، عەزەولدەولەی بوویەیی لەشکرێکی زۆری ناردە سەر کوردستان لەژێر فەرمانی «ئەبووەفا» ناوێکی ئەمیری کورداندا. تەعلەب حەمدانی لە دەستی هەڵات. منداڵانی بەختیاریشی لەگەڵ خۆی هێنابوو، پەنا بۆ ئەمیری نوسێبین دەبەن کە لە تەرەف مەلیک شوجاع بازەوە داندرابوو.

کە شاباز ئەمەی بیست، بەلەشکرێکی قورسەوە چووە سەر نوسێبین تاکو خاکی خۆی لە فیتنە بپارێزێ. تەعلەب لە خۆی ترسا بوو لەگەڵ هێندێک لە ئومەرایانی عەرەب لەوێوە بەدزی خۆیان دەگەیەننە میافاروقرین. لەوێش خۆ ناگرن هەڵدێن دەچنە «ئەرزنەی ڕۆم».

«ئەبووەفا» کە دەگاتە نزیک خاکی شاباز قاقەزێکی لێ نووسی کە: «هێندێک هەڵاتوانی فیتنەخواز ڕوویان لە خاکی تۆ کردووە؛ تکاتان لێ دەکەین کە بۆ لابردنی ئەوانە بەگورجی کۆمەگیمان بکەن».

شاباز لەگەڵ عەزەدولدەولە نامەنووسی دەکەن و بەدۆستایەتی ڕێک دەکەون.

لە کەناری فوراتەوە بۆ ڕەقە و بیرەجک و عێنتاب و سۆرک و خاکی ڕۆمەوە کۆمەگی ئەبووەفای کرد.

ئەبووەفا هەتا چوونە ئەرزەڕۆم کەوتنە سەر تەعلەبی حەمدانی و دەستیان نەکەوت و گەڕانەوە.

شاباز بۆ نوسێبینی میهمانی بۆ ئەبووەفا دروست کرد و نزیک چوار ڕۆژان ئیحترامێکی چاکی گرت و گەڕانەوە بۆ مووسڵ.

گەڕانەوەی ئەبووەفا بوو بەسەبەبی دۆستایەتییێکی تەواو لەگەڵ عەزەدولدەولە. لە پاش چەند جاران نووسین و هاتوچۆکردن لە نێوانیاندا شاباز ئەبووەفا و کوڕی عەزەدولدەولەی بەگریو هێنانە دیاربەکر؛ بۆ خۆشی چووە دیتنی عەزەدولدەولە.

لە مووسڵدا هەموو ئومەرا و وزەرایانی عەزدولدەولە و ئەهالی شاری مووسڵ بۆ پێشوازی شاباز چوونە دەرێ و عەزدولدەولە لە بۆ خۆشی لە پاشان دەرکەوت. بەخۆشی و شادمانییێکی تەواو هێنایانە نێو شارەوە. کە عەزدولدەولە چاوی بەشانوبازو و وریایی ئەو پادشا گەورە هیمەتە کەوت، گەلێک ئەندێشە و ترسی کەوتە دڵەوە. دڵی لێ پیس کرد، بەچاوێکی زۆر ناحەز و دوژمنایەتییەوە تەماشای نێونێوچاوانی دەکرد.

شاباز کە لە وریایی و تێگەیشتندا هەموو کەس ئافەرینیان لێ دەکرد زۆر زوو

تێگەیشت. هەموو چتێکی بەتەجرەبە دەخوارد و دەست و پێوەندی خۆی تێگەیاندبوو.

عەزدولددەولەی بەپەنهانی ئومەرا و سەرۆکانی خۆی ڕاسپاردن کە بۆتان هەڵکەوت بیکوژن. بەڵان مەیدانی فێڵی کەم بوو.

شاباز کە شەوی بەسەرداهات چاوی لە نۆکەرانی خۆی داگرت و بەگورجی خۆیان سازکرد. بەسێ تەپڵە و نەقارە لە مووسڵ دەرکەوتن. چوونەسەر ژەنگار (شنگاڵ) و گرتیان و خۆیان تێدا دامەزراند و زوو پیاوانی نارده نوسێبین و ڕەها و ئەو نزیکانە هەتا لەشکر خڕکەنەوە. عەزدولددەولە کە ئەوەی بیست، گەلێکی ترسی لێ پەیدابوو.

شاباز قاقەزی مامڵەتی بۆ نارد و گوتی: «بەشەرتی ژەنگار بدا بەمن لەگەڵ دەوروپشتی دەستی لێ هەڵدەگرم». عەزدولددەولە دەستی لە ژەنگار بەردا، گریوەکانی بدرێتەوە. باز ناردی بەچاکی و خزمەت و پیاوەتی ئەبووەفا و کوڕی عەزدولددەولەی بۆ مووسڵ بەڕێ کردنەوە.

مەرجی مامڵەتیان لە ساڵی ٣٦٨ ی مانگی موحەڕەم تا چوار ساڵان بوو؛ لەسەر ئەمە هەردووک لایان پێک شاد بوون.

شاباز کە ئەو مامڵەتەی کرد، لەگەڵ کوردستانی ئاوربایەگان و دەوڵەتی هدوبان و ئەمیری هەولێرێ بناغەی دۆستایەتی ڕێکخست.

شا ئیبراهیمی کوڕی مەرزەبان پاشای ئاوربایەگان گرێی یێکەتی لەگەڵ گرێدا.

شاباز کە لە هەر چوار کەناری خۆی ئەمین بوو، لەگەڵ ئاوایی خاک و کیشوەری خەریک بوو. قەڵای دیاربەکری دروست کرد و دیوارێکی بەهەر چوار دەورەی شاردا کێشا بە«بورگ» (برج)ان توندی کرد، لە «فیک»دا، کوتادژ (قەڵا)یەک هەبوو لە بنچینەوە تازەی کردەوە.

دژی ماردین چەند جێگایێکی لێ ڕووخابوو؛ دروستی کردەوە. لە دیاربەکرێدا مزگەوتێکی زۆرچاکی بەدوو منارەوە دامەزراند و ناوی نا شوجاعی. قەڵای «میافارقەین»ی لەسەردا دروست کرد. تا موددەتی سێ ساڵان لەگەڵ ئاوەدانی و دروستکردن خەریک بوو. لە چیای جزیرەدا گەلێکی دژ و جێگایانی توندی دامەزراند. بۆ گرتنی مووسڵ و خاکی عیراق ئامادەیی دەکرد و لەشکر و قۆشەنی ساز دەکرد و چاوەڕوانی تەواوبوونی وەختی مامڵەتی بوو. ڕۆژ بەڕۆژ قووەت و لەشکری پێویستی دەنارده نوسێبین و ژەنگار و خاپوور. لە ساڵی ٣٧٢ دا بەتەواوی وەخت خەلاس بوو.

عەزدولددەولە مرد. شاباز ئەمەی بەدەرفەت زانی، ناردی لە هەموو لایێکەوە لەشکری بەراوکرد و ژەنگاری کردە لەشکربەز.

سەمساموەدەولەی کوڕی عەزدولددەولە کە ئەمەی بیست، گەلێکی ترس لێ پەیدابوو. بەئەبی سەعد بارامدا لەشکرێکی زۆر قورسی ناردە سەر شاباز.

لە سنووری ژەنگاردا هەردووک لا بەرامبەری یەکتری لەشکریان ڕاگرت. بەئەوەل هەڵمەت سەعد بارام شکاو ڕووی لە هەڵاتن کرد. لەشکری باز کەوتنە سەریان تا نزیکی مووسڵیان کردن. بارام خۆی کوتا نێو شارەوە. لەشکری شاباز لە دوو سەعاتێکی مووسڵدا هەڵیدا، بۆ ماندوو حەسانەوەی سوپاهی.

ئەهالی مووسڵ بەتکاکردن دەرکەوتنە دەرەوە و لەبەر شاباز پاڕانەوە کە مۆڵەتیان بدا بەمەرجی سێ مانگان شاری تەسلیم کەن، هەردووک لا لەسەر ئەوە ڕاوەستان. سەمساموەدەولە کە ئەو شکانەی بیست، سوپاهێکی بێژماری بەراو کرد و لەژێر فەرمانی ئەبوقاسم سەعیدی کوڕی حاجبدا لە خاکی سۆرانەوەی ناردیە سەر خاکی باز. لە هەولێرەوە بەچیایاندا هێندێک ئومەرایانی کوردستانیان هەڵخەڵەتاند. لە هەکارییەوە بۆ سەر وان خشان.

شا کە ئەوەی بیست، ئەمیر عەلی کوڕی پشتووی خێوی دژی فیک، لەسەر لەشکری مووسڵ دانا و بۆ خۆی چووە شاری «کاراش» (داردەهیشت). لە مانگی جەمادی یەکدا لە جێگایەکی کە بە«بیاجلایا» دەناسرێ، ڕێگای بەسەعیدی کوڕی حاجیب گرت و لە پاش گەلێک لە دەیلەمیان کوژتن و تالان و ماڵێکی زۆر، لەشکرێکی زۆری بەدیل گرت.

سەعید هەڵات و بەهەزار دەردەسەری خۆی ڕزگارکرد. لە گەلێک جێگایاندا بەشەو دەکەوتەڕێ، هەتا خۆی گەیاندەوە مووسڵ. شاباز ئەو ئێخسیرانەی ناردنە ئەردیش و بۆ خۆیان گەڕانەوە دیاربەکر. بەمەشی هێندەی دیکە ناوبانگی پەیدا کرد.

ئەهالی مووسڵ بەدڵ حەزیان دەکرد کە شار بکەوێتە دەست کوردانی شاباز. لە مێژبوو بەئاواتەوە بوون لە دەست زوڵمی ئومەرایانی دەیلەم ڕزگار بن.

باز کە هاتە دیاربەکر، لە مانگی شەعباندا بوو، ڕەمەزانی بەئاسوودەیی بەسەربرد. ڕۆژی چوارەمی جێژن بۆ ژەنگار چوو. قاقەزی لە ئەهالی نووسی و دڵخۆشی دانەوە و گوتی: «هەرچەند حکوومەتی بوویەش کوردن و لە ئێمەن، بەڵان لەشکر و ئومەرای سوپاهی، گەلێکیان لە تورکانی دەیلەمن. ئێمە هەر میللەتێکین، هەر من لە تورکمانان

چاکترم بۆ ئێوە...» و گەلێکی پەند دا دان.

هەمـوو ئەهالی لەبەرئەمـە بەهەمـوو گـەورە و سـەرۆکـانیـانەوە بەربوونە بیـر و ئەندێشەکردنەوە. ئەمەیان بەمەسڵەحەت زانی کە پادشای خۆیان بێت، نەوەک بیانییێک. بەکۆمەڵە دەستوبردیان کرد و دەیلەمییانیان هەموو دەرکردن و جوابیان نارد بۆ شاباز. شاباز بەلەشکر و هێزەوە لە ١٠ی مانگی سەفەری ساڵی ٣٧٣ دا بەشادی و خۆشییەوە چووە نێو شاری مووسڵ و هەموو دەوروپشتی قایم کرد و حکوومەتی تێدا ڕێکخست و خۆی وەخرکرد کە بچێتە سەر بەغدا و دەیلەمییان لەوێش دەرخا. ناردیە کوردستان، لە هەمـوو کـەناری دەوڵەتییـەوە لەشکری بەراوکـرد و بەچاکی مـووسـڵی ڕێکوپێک کـرد. گەلێکی داد و بەخشین و پیاوەتی نیشانی ئەهالی دا. دەزگای دادخوازی لەسەر هەمووان کـردەوە. پەردەی بەر دەرگـای بۆ هەمـوو ئەهالی هەڵدرابووەوە. فـەقیـر و بێـدەست و کەوتووانی بەبەخشیش دایین تێرکردبوون. میهرەبانی و دڵخۆشی دانەوە و زمانی خۆشی دڵی عـالەمی جـەلب کـردبوو. مـزگـەوت و عـیـبـادەتخـانایێکی زۆری ئاواکـردنەوە.لە مەجلیسیدا عولەما و زانا و پێشکەوتوو و سەرۆکی ئەهالی تێدا دادەنیشتن.

لە ساڵی ٣٧٤ دا بەر بەبەغدا خشا. لە نزیک تکریت سەمسامودەولە لەشکرێکی زلی لە ژێر فەرمانی زیار شەهرا کوبەدا نارده بەرامبەری شاباز. لە پاش گەلێک کوژتار زیار هەڵات و تەواوی گرانباری و ئەسبابی شەڕیان بەجێهێشت و خۆی کوتا تکریتەوە. لەشکری کوردان تالانێکی زۆریان دەست کەوت و لەشکرێکی بێژماریان لە زیار بەدیل گرت و کەوتنە سەریان و دەورەی تگریتیان دا.

خەلیفە لە بەغداوە هێندێک زانایانی بۆ ئیسلاحی هەردووک لایان نارده خزمەت شا. شاباز لەبەر فەرمایشی خەلیفە بەمە ڕازی بوو کە کوڕی بوویە دەست لە مووسڵ بەردات. ئەوەیان کردە مەرج و سنووری موڵکیان کردە نزیک تگریت.

کە زیار دووچاری ئەو شکستەیە بوو، زۆری لێ دڵگیربوو. یەکێکی لە لەشکریانی خۆی باتینی (باطنی) کە لە فێڵکردندا زۆر بەکار بوو، ناردیە مووسڵ کە بەجۆرێکی دەستی کەوێت باز بکوژێت. ئەویش لە تگریت دەرکەوت.

کە باز بۆ ڕاوکردن لە شار دەرچووبوو، لە یەک دوو سەعاتێکی مووسڵدا چادریان بۆ هەڵدابوو، ئەو باتینییە پەنای[پێ] برد. هەرچۆنێک بوو شەوێ لەنێو چادردا شێرێکی داهێنایێ، لە ترسی گرتنی هەمان بەلێدانی شێرەکە لە چادر دەرکەوت. [پێی وابوو] کە

کوشتی؛ بەڵان شێرەکە لە لینگی باز کەوتبوو. زوو خۆی گەیاندە ئەو پیاوە. پاسەوان پێیان زانی و ئەو پیاوەیان گرت و پارچە پارچەیان کرد.

باز برینی ئەوەندە کاریگەر نەبوو کە لە کار بکەوێت؛ بەڵان شەش مانگ بەدەرمان کردنیەوە خەریک بوو، تا خوا شیفای دا و چاک بووەوە.

لە ساڵی ٣٧٧ دا شەرەفوددەولەی بوویە -کە حوکمداری بەغدا بوو- لەژێر ئەمری ئەبونەسر خواشادە لەشکرێکی زۆری ناردە سەریان، هەموو عەرەبی بەنی عوقەیل و بەنی نومەیر بوون.

باز بۆیان دەرکەوت. لە پاش شەڕ و کوشتارێکی زۆر پەرێشانی کردن و هەڵاتن. خواشادە قاقەزێکی لە شەرەفوددەولە نووسی کە چلۆنی ئێمە و سەربهوردمان پەرێشانی و شکان بوو.

شەرەفوددەولە لەشکرێکی قورسی لە عەرەبی دیکە بۆ خڕکردەوە، لە ئینتیهای ساڵی ٣٧٨ دا هاتە سەر خاکی مووسڵ. شا «تەلیعەتووەولەی» برای ناردە پێش دوژمن، لە پاش کوشتارێکی زۆر تەلیعەت شەهید کرا؛ بەڵان سەردارانی کوردان شاردیانەوە. لەسەر شەڕکردن ڕاوەستان تاکو دوژمنیان شکاند و بەشادی و تاڵانێکی زۆرەوە گەڕانەوە مووسڵ.

لە ساڵی ٣٧٩ دا هێندێک فیتنە کەوتە نێو کوڕانی دەیلەمەوە و شەرەفوددەولە مرد. چەند کوڕێکی حەمدان لە سووریادا بەسەریان دەبرد، هاتن و گەلێکیان لەشکر لە عەرەبی عوقەیلی و نومەیر گرد کردەوە کە بێنە سەر مووسڵ.

بەخت یاری نەکردن و هەڵاتن و پەنایان بۆ محەمەدی کوڕی موسەیەب، ئەمیری بەنی عوقەیل برد تا کۆمەگیان بکات.

ئەهالی مووسڵ بەپەنهانی لەگەڵ ئەبوتاهیری حەمدانی ڕێک کەوتن و محەمەد ئیبنی موسەیەب، شێخی عەشیرەتی عوقەیل پێکەوە مەرجیان کرد کە مووسڵ لە باز وەرگرنەوە. مووسڵ و دەوروپشتی بۆ کوڕی حەمدان بێ و نوسێبین و جزیرە بۆ کوڕی موسەیەب بێ. لەسەر ئەوە هەردووک لایان لەگەڵ مووسڵ ڕێک کەوتن. کوڕی حەمدان لە ڕۆژهەڵاتەوە چووە سەر مووسڵ.

شاباز بۆیان دەرکەوت؛ ئەهالی لە ژوورەوە دەستیان بەسەرکێشی کرد. لەشکری کوردان لەگەڵ عەرەبان بەشەڕ هاتن. گەلێکیان لە کوڕی حەمدان کوژت. بۆ تەرەفی ڕۆژئاوای شار هەڵاتن، لەشکری کوردان کەوتنە سەریان، مووسڵ دەروازەی ڕۆژئاوایان لە کوڕی

موسەیەبی عوقەیل کردەوە و لە پشتەوە شیریان لە کوردان نا.

موددەی ١٠ ڕۆژان کورد کەوتنە نێوانی ئەهالی شارێ و کوڕی موسەیەب و کوڕی حەمدانەوە، لەو شەڕەدا باز لە مەیدانی کوشتارێدا ئەسپی سەرسمی برد و لەسەر زین هەڵدێرا. لە ٢٠ جەمادی ٢ی ٣٨٠ھ دا کۆچی دوایی فەرموو.

لەشکری کوردان کە تەماشایان کرد بێ پادشا مانەوە و نەیانزانی چ بەسەر شاباز هات، کەوتبوونە نێوانی ئاورەوە. نە ڕێگای گەڕانەوەی شار و نە چوونی چیایان هەبوو. بەناچاری شکستەی تێکەوت و مووسڵیان بەردا و گەڕانەوە دیاربەکر.

عەلی خوشکەزای باز کە ئەمیری کوردانی پشێوی بوو، لە فنیک دوو فرسەخێک لە جزیرە دوور دادەنیشتن، لەو شەڕەدا ئەمیری نوسێبین و ژەنگاربوو، نەیهێشت ئەو قووەتە بڵاوبێتەوە، هەمووی خستنە ژێر فەرمانی خۆیەوە.

لەشکری حەمدانی کە بەوە سەرکەوتن، لە نێو کوژراواندا لاشەی شابازیان دۆزییەوە و بردیانە مووسڵ و لە خانووی حکوومەتدا بەمردوویی بەداریاندا کرد. چەند ڕۆژێک بەدارەوە ما. بەڵان ئەهالی مووسڵ گوتیان درۆیە ئەوە مەلیک شوجاعباز نییە، پیاوێکی وا ئازا... بەڵام ئاگادار نەبوون لەمە کە قەزاوقەدەر کومەگی... کردبوو، نەکو هەرگیز... لە پاش چەند ڕۆژان ئەهالی لاشەکەیان بەئیحترامەوە لە دارەکە کردەوە و بردیان ناژتیان.

## عەلی کوڕی باز لە ساڵی ٣٨١ تا ٤٠٣ ھ

کە مەلیک شوجاعباز وەفاتی فەرموو، مەلیک عەلی دووبارە بەناوی دوشتێک بناغەی حوکمداری خۆی دامەزراندەوە و تەواوی قووەت و لەشکری خاڵی خستنە ژێر فەرمانەوە، هەموو ئومەرا و سەردارانیشی لەسەر وەخربوون، پیاوێکی ئازا و کاربەێن و ڕەشید و ڕاست و بەمیهرەبان بوو، تەواوی کوردانێکی ئەو خاکەی کە لەژێر دەوڵەتی شوجاع دوشتێک بازدا بوون، بێ نیگەرانی پشتیان گرت. لە هەموو لایێکەوە بۆی هاتنە خزمەتی و دیاری و پێشکەشییان هێنا.

لە مانگی شەوالدا کوڕانی حەمدانی بەلەشکرێکی زۆر و بێ حیسابەوە بەتاڵان و کوژتار و... کەوتنە نێو کوردستانەوە. هەر جێگەیێکی گەیشتنێ لە بنچینەیان دەرهێنا. زوڵم و جەور و دڕندەیی و شپرزەییان لە قانوونی بەشەریەتدا تێپەڕاند. لە ژێر حوکمداری عەبدوڵڵای کوڕی حەمدانیدا هیچ نەما کە بەسەر ڕەعیەت و بێدەست و ژن و منداڵان نەیکەن. ئەوەی ئەوان بەمیللەتی مەزلوومیان کرد، فەڕەنگ و چەلیپان بەسەر

موسڵمانانیاندا نەهێنابوو.

ئەمیر عەلی لە میافارقینەوە لەشکری بەراو کردبوو هێندێک چلۆنی نێوانی ڕێکدەخست. لە یەکی مانگی زیلقەعدەدا ئەمیر عەلی بەقووەتێکی زیادەوە چوونە پێش دوژمن. لە پاش کوشتار و پەرێشانی دوژمن، عەبدوڵڵای کوڕی حەمدانی بەدەستی کوردان ئێخسیر کرا. ئەو سەرکەوتنە بۆ میر عەلی سەربەرزیێکی تەواوی بەخشی، گەلێکی تالان و ئەسباب دەست کەوت و دوژمنی لەبەر یەک لەتوکوت کردن.

لە دوای ئەو سەرکەوتنە بلندی و بەرزییە، بەئیحترامەوە عەبدوڵڵای کوڕی حەمدانی بەردا و ناردیەوە مووسڵ.

ئەبوتاهیری حەمدانی گەلێک لە عەبدوڵڵای برای توندبوو کە چۆن گیران. عەبدوڵڵا پالەوانی و ئازایەتی میر عەلی بۆ گێڕاوە و پێی گوت چاکتر وایە لەگەڵ میر عەلی دوشتێک مامڵەت بکرێت. عەبدوڵڵا بۆ ئەوە کۆشا.

ئەبوتاهیر لە شەڕکردندا چی بوو، هەموو پێویستییێکی شەڕی حازر کرد. لە ١١ی سەفەری ساڵی ٣٨١ دا لەشکریان کردە دوو قۆڵ و بۆ چوونە سەر خاکی کوردستان ئامادەبوون.

میر عەلی بۆ بەرامبەرییان لە دیاربەکر دەرکەوت و لە نزیک ژەنگار گەیشتە لەشکری دووبرایانی کوڕی حەمدانی. هەردوولا لەشکریان ڕاگرت و لێکیان دا، گەلێک لە کوڕانی حەمدانی کوژران و عەبدوڵڵا بەدیل گیرا و تاهیر بۆ سووریا هەڵات. تەواوی لەشکریان لە دەست میر عەلیدا ئێخسیر کران، ماڵ و ئالات و چتمەکی لەشکر و دانەوێڵەییێکی زۆر کەوتە ژێر دەستی میر عەلییەوە و عەبدوڵڵاشی ناردە دیاربەکر و بەئەزیەت و ناسازییێکی زۆر توند خستیە بەندیخانەوە.

هەر بەو سەرکەوتنە ڕانەوەستا و بەر بەمووسڵ چوون. لە ساڵی بێژراودا -٨ ڕەبیعی یەک- چوونە نێو مووسڵەوە. لەوێدا دستی بەداد و عەدل و سەخا و کەرەم کرد و ناوی خۆی نا پادشا و جاڕی دەوڵەت و ئیستیقلال و ئازادی و سککەی بەناوی خۆی لێدا.

لە مانگی جەمادی یەکدا محەمەدی کوڕی موسەیەب چوونە سەر نوسێبین. میر عەلی لەشکری هەناردە سەری، شەڕێکی شێر ئاسایان لەگەڵ عەردبان کرد. بێجگە لە محەمەد عوقەیلی نەبێ ڕزگار بوو، پیاوێکی بەساغی لە دەست کوردان دەرنەچوون و هەموویان کوشتن. میر عەلی شا کە چلۆنی دەوڵەتی لە مووسڵدا ڕێکخست، ئەردەشێری کوڕی

هورمز کە یەکێک بوو لە ئومەرایانی لەشکری، بەتایبەتی لەسەر مووسڵی دانا و گەڕانەوە دیاربەکر.

پادشای میسر چەند مەلاییێکی بەدیاری و چتی چاکەوە ناردە خزمەت عەلی شا بۆ تکاکردنی بەردانی عەبدوڵڵای کوڕی حەمدانی. عەلی شا بۆ دڵخۆشی پاشای میسر، عەبدوڵڵای بەردا، بەو مەرجەی کە لە خاکی کوردستانێدا نەمینێ و نەچێتەوە عێراقیش و لەگەڵ عولەمایەکانی ناردیە حەلەب.

موقەلید کوڕی عوقەیلی شێخی عەشیرەتی عەرەب لە تەرەف نوسێبینەوە بەلەشکرێکی زۆرەوە و بەکۆمەگی بەهائوودەولەی بوویە چوونە سەر عەلی شا. وەکو محەمەد بەندە خۆی نەگرت و شکا و بۆ کۆمەگی ناردیە کن بەهائووددەولە. بەڵان لە دەوروپشتی خاپوور و نوسێبین و ئەو جێگایانە لە ڕاوڕووتکردن ڕانەدەوەستان و لە شێوەی ڕێگریدا لە کەناری فوراتدا دەژیان.

عەلی شا لە تەرەف خەلیفەی عەباسییانەوە فەخرووددەولەیان ناوبرد. لە ساڵی ٣٩٢ دا هەر بەوجۆرە بەداد و ڕەشیدی و ئازایی دەژیان. تا لەساڵی ٣٩٤ دا لەگەڵ کوڕانی بوویە ڕێک کەوتن و خوتبەیان لەسەر مینبەران بەناوی خەلیفەی قادر عەباسی و بەناوی فەخرووددەولە ئەمیر عەلی شا خوێندراوە.

لە ساڵی ٤٠٣ دا شەرەفوددەولەی کوڕی بوویە گەلێکی حەز لە فەخرووددەولە دەکرد و هێندێک عەرەبی بەنوئەسەد و ئەمیرێکی عەرەبی بەقرواش مەشهوور لە سنووراندا ڕاوڕووتیان دەکرد. بەکۆمەگی شەرەفوددەولەی بوویە و فەخرووددەولەی پادشای دیاربەکر چوونە سەر ئەو عەرەبانە و لە نیوەشەودا شەوی جومعەی ١١ی سەفەر، فەخرووددەولە لە چادردا کوژرا؛ کەس نەیزانی کێ بوو. لەشکری کوردان کشانەوە و مووسڵیان بەردا و گەڕانەوە دیاربەکر.

ئەحمەدی کوڕی مەڕوانی برای ئەمیر شاعەلی وەلیعەهد بوو، بەگورجی لە ئەوەڵی ڕەبیعی دووەمدا، دەستی بەسەر خاکی خۆیاندا کێشا و گەلێک دڵی ئەهالی و سەردار و سەرکۆمارانی ڕاگرتبوو، هیچ کەسێک بەبەراوەژووی ئەو نەبزووتنەوە. زۆرچاک لەسەر تەخت دانیشت.

## ئەحمەدی نەسروددەولە لە ساڵی ٤٣٠ تا ٤٥٣ ھ

کە عەلی فەخروددەولەی برای شەھید کرا - ھەروەک لە پێشدا گوتمان - ئەحمەد نەسروددەولە لە دیاربەکرێدا وەلیعەھد بوو؛ دەستی بەسەر ھەموو موڵک و دەوڵەت و خاکی عەلی کێشا و ئاڵای بێکەتای بەرزکرد، سککە و خوتبەی بەناوی خۆی و قادری خەلیفەی عەباسی لێدا و خوێندیەوە. دەرگای داد و ڕەعیەتپەروەری لەسەر ئەھالی کردەوە. بەچاکە و نەوازش دڵی ھەموو ژێردەستان و ئومەرایانی کێشابوونە لای خۆی و خۆشی پێ خۆشەویست کرد. زۆر ئازا و بەتەگبیر و تێگەیشتوو بوو، پیاوانی سوپاھی زۆر خۆشدەویستن. لەگەڵ خولەفای عەباسییان و کوڕانی بوویە ئاشتی و دۆستایەتییەکی زۆری ھێنا پێشەوە. ھەموو دۆست و دوژمنێکی بەخۆشی دەلاواندەوە، وای نەدەکرد کە ھیچ ھاودەراوسێیەکی دەنگی لێ دەرکەوێت، زۆری حەز لە حیشمەت و جێگا و سەڵتەنەت دەکرد. دەڵێن ھەمیشە ٣٠٠ جاریەی نایاب و جوانی لە سەرای حکوومەتیدا ھەبوو. لەگەڵ کەیف و شادی و بەخشیش و پیاوەتی خەریک بوو. زۆر خۆی لە خوێن ڕژاندن دەپاراست. خزمەتی دینی زۆر کرد. مزگەوتانی ئاوەدان دەکرد و مەلا و عولەمایانی لە مەجلیس دادەنا و چاکە و دەستگیری دەکردن. لە ساڵی ٤١٠ دا سەفیرێکی دەوڵەتی کوردستان، دوشتێک نارده ئەستەنبوول کن دەوڵەتی ڕۆم و سەفیرێکیشی نارده میسر کن سوڵتانی میسر و سەفیرێکیشی نارده بەغدا کن خەلیفەی عەباسییان. ئەمیر سلێمانی کوڕی کردە وەلیعەھدی خۆی لەسەر جزیرە و بۆتانی دانا و بۆ خۆشی لە میافارقیندا کۆشک و باڵەخانە و دیوانی دروست کردبوو. گەلێک جاران دەچووە دیاربەکر و نزیکی مانگێکی لێ دادەنیشت و دەچووە وان و ئەردیش و خەلات و دەگەڕاوە.

لە ساڵی ٤٠٨ دا خەلیفە قادر، بەنەسروددەولەی لەقەب لێنا.

لە ساڵی ٤٢٩ فیتنەی تورکمانانی غەز کەوتە نێو ئاسیاوە و بەسەر کوردستانی ئاوربایەگاندا ھاتن و دەوڵەتی ھەزبانییان پەرێشان کرد و مەراغە کە پایتەختی کوردستانی ھەزبانی بوو وێرانیان کرد، لەژێر فەرمانی گوگناش و مەنسوورا ڕوویان لە کوردستانی ھەکاری کرد و گەلێکیان کورد کوژت و زۆریان ئەتک و سووکی بەسەر نامووسی ڕوو داپۆشراواندا ھێنا.

کوردەکانی ھەکاری ھەموو ماڵ و خانوویان بەردا و ڕوویان کردە چیایان و خۆیان لە دژ (قەڵا)یاندا قایم کرد.

ئەحمەدشا نەسروددەولە بەیەکێک لە وەزەرەیانیدا قاقەزێکی لە ئۆرتوغرولّی سەلجووقی نووسییە. بەغدا، ڕەزاڵەت و وەحشەتی تورکمانانی پێ ڕاگەیاند، لەوێدا دەڵێ: لەو تەعەروزاتەی کە تورکمانان کردوویانە دەستیان لێ هەڵناگرم. لە پاش ناردنی ئەوە بەهەموو کوردەواری ڕاگەیاند و خۆیان خڕکردەوە و هەڵمەتیان بردە سەر تورکمانانی غەز. ۱۷۰۰ کەسیان لێ کوژتن و ۷ ئومەرا و ۱۰۰ سەرکۆماری تورکمانانیان بەدیل گرت. تەواوی چتمەک و چەک و جلیان لێ تالان کردن. کۆمەڵەی تورکمانانیان بڵاوکردەوە. وڵاغی سواری و بارەبەریان پێ نەهێشتن و هەموویان لێ گرتن.

هێندێک لەغەزی دیکە لەسەر بڵاوبووەکان وەخڕبوون و خۆیان خزاندەوە زۆزان. لە ساڵی ٤۳۳ دا گوندی بازبدی حەسەنیەیان لە ڕۆژهەڵاتی جزیرە و بۆتانەوە تالان کرد و گوندانیان سووتاند.

میر سلێمانی کوڕی نەسروددەولە کە حاکمی خاکی جزیر و بۆتان و چیای زۆزان بوو، لەگەڵ مەنسووری ئەمیری غەز کەوتە سەروبەندی مامڵەتەوە کە بەئاسوودەکی لە خاکی کوردستان دەرکەون.

ئەمیر مەنسوور قایل بوو بەمەرجی ئەم زستانە لەوێ دانیشن و لە بەهارێدا ڕوو بکەنە شام و بڕۆن.

کە مامڵەتی میر سلێمان لەگەڵ غەزیان ڕێک کەوت، میوانێکی زۆر گەورەی دامەزراندبوو. سەرۆک و ئومەرایانی غەز لەگەڵ سەرداری گەورەیان مەنسوور کە هەمووی هێنانە نێو ژوورەوە، میر سلێمان بەلەشکری خۆی چواردەوری گرتن و دەست و پێی هەموانی گرێدان و خستنیە نێو زیندانەوە. غەزەکانی دیکەش -کە لەناو کوردستاندا بوون- هەموویان بەرەو شام و مووسڵ هەڵاتن و میر سلێمان وە دوویان کەوت و کوژتارێکی لە ژمارە بەدەری لێکردن و شیری تێنان، هەتا لە هەموو خاکی خۆی دوورخستنەوە. لە پاشان ئومەراکانیشی لە سنووری خۆی وەدەرخستن و بەریدان، بەڵان گەلێکی تالان و ماڵی لێگرتن.

کوردانی بشنۆیی لە خاکی خۆیاندا دیسان دەستیان بەکوژتنیان کردن و بۆ سەر مووسڵیان لێ خوڕین و گەلێکیان ماڵ و چەک و ئەسپ و چوارپێیان لێ گرتن.

لە ساڵی ٤۳٦ دا نەسروددەولە دوشتێک ئەمری بەعیسکانی ئەمیری کوڕی حەمید کە حاکمی «عقرە» (ئاکرێ) بوو کرد کە بۆ سەر مووسڵ بخشێت و قەراوشی عەرەب لە مووسڵ دەرکات.

قەراوش کە تەماشای کرد ناتوانێ بەرامبەری ئەمیر عیسکان بکا، بەپەنهانی چەند پیاوێکی چاپلووسی ناردە کن ئەمیر حەسەنی مووشکی هەزبانی خێوی قەڵای هەولێر کە لەگەڵ ئەمیر عیسکان بەشەڕ وەرە، ئاکرێ و جزیرە و زاخۆت بۆ دەخەمە سەر هەولێر. بەدەسیسە و فیتنە بڵندی کرد هەتا هێزی حکوومەتی دوشتێکی پێ بشکێنێ؛ چونکو زۆری ترس هەبوو، ئەو دوو ئەمیرە کوردانەی بەگژ یەکدا کردن.

لەودەمەدا مەلیک عەزیزی بوویە لە دەست مەلیک مالیچار و کوڕانی بوویە پەنای بۆ نەسروددەولەی دوشتێک برد. بەوەش ئەمەندەی دیکە دەوڵەتی دوشتێک قووەتی پەیدا کرد و پیاوی لەشکری زیادکرد و گەلێکیان کۆمەگی ناردە کن ئەمیر عیسکان.

قەراوش کە ئەوەی زانی زیادتری کۆمەگی ئەمیر حەسەنی مووشکی کرد؛ بەڵان بەسەر قەراوش داهات و هەموو عەرەبێکی لێ دڵگیربوو و لە دەوروپشتی کشانەوە و لە هەموو لاییێکەوە سەرکێشیان لێ کرد.

زەعیموددەولە برای قەراوش لەگەڵ برازای قوڕەیشی کوڕی بەدرانی کوڕی موقەلید لێیان بوو بەشەڕ و کوشتار و قوڕەیش سەرکەوت و زەعیموددەولە هەڵات و پەنای بۆ ئەمیر سلێمانی دوشتێک برد.

سنەسرودەولە لە مێژبوو لە کەلێن دەگەڕا کە تۆڵەی خۆیان لە قەراوش بکەنەوە و زوو ئەمری بەئەمیر سلێمانی کوڕی و ئەمیر عیسکانی ئاکرێ دا کە لەشکرێکی زۆر خڕکەنەوە و بچنە سەر مووسڵ گورج بەلەشکرێکی قورسەوە هەستا و چوونە سەر مووسڵ.

قەراوش بۆیان دەرکەوت. فرسەخێک لە دووری شار بەگژ یەکدا چوون. گەلێک لە عەرەبان بەکوژت چوون و قەراوش لە دەست ئەمیر سلێماندا دیل بوو و تەسلیم بەزەعیموددەولەیان کرد.

زەعیموددەولە کە تەماشای کرد دوژمنی -کە کوردن- قووەتیان پەیدا کردووە، ترسا کە مووسڵی لەدەست دەرکەوێت؛ بەگورجی مەملەکەتی داوە بەقەراوش و بەریدا و ناردیەوە مووسڵ.

کورد کە ئەوەیان زانی، ئەمیر سلێمان زۆری پێی دڵگیربوون، بەڵان تەواوی ئەسیرانیان لەگەڵ خۆیان برد و گەڕانەوە خاکی دوشتێک و گەلێکیان ماڵ و چەک و تاڵان دەست کەوت.

لەپێشدا باسکرا کە مەلیک عەزیزی کوڕی بوویە پەنای بۆ نەسروددەولە برد، گەلێکیان

ئیحترام گرت و سەرایێکی تایبەتیان بۆ چۆڵکرد و هەموو خزمەتێکی لە دەوڵەتی کوردانەوە درایێ. مەلیک عەزیز پارچە یاقووتێکی زۆر گەورە و بەقیمەتی پێ بوو، نەسروددەولە بە ۱۰۰ هەزار دیناری لێ کڕیبوو؛ لەساڵی ٤٥١ دا بەدیاری ناردیە کن سوڵتان توغرول بەگی سەلجووقی.

ئەو سوڵتانە جوابی لێ نارد: بەچ جۆرێکی دەتوانم سوپاسی بەجێبێنم، ئەوەندە دەڵێم تا من لە بەغدا سوڵتان بم، هەر کۆمەگێکم لێ بخوازێت مەرجی لەگەڵ دەکەم کە کورتایەتی نەنوێنم».

نەسرود دەولە لەساڵی ٣٥٤ دا و لە مانگی زیلحەجەدا مرد.

## سلێمان نەسرەتوددەولەی کوڕی نەسرووددەولە لە ساڵی ٤٥٣ تا ٤٧٥

کە شا ئەحمەد نەسرووددەولە مرد، ئەمیر سلێمان لەسەر تەختی باوکی دانیشت و دابودەستووری باوکی گرت؛ بەلاّن پایتەختی بردە میافارقین و دیاربەکری دا بەسەعیدی برای. زۆر بەچاکی حوکمداریان دەکرد و بۆ لابردنی دوژمن دەکۆشا. لە ساڵی ٤٦٠ دا سەعیدی کوڕی نەسرەتوددەولە لە دیاربەکردا وەفات دەفەرمووێت. نەسرەتوددەولە ئەویشی خستە ژێر حوکمی خۆیان و هەموو ئوموورێکی ڕێکخست و لە ساڵی ٥٧٤ دا کۆچی دوایی فەرموو. لە زەمانی ئەودا هیچ واقیعەیەک نەقەوماوە.

## مەنسووردەولەی کوڕی نەسرووددەولە لە ساڵی ٤٦٥ تا ٤٧٨

کە سەعیدی کوڕی نەسرووددەولە مرد، بەئەمری سلێمان نەسرەتوددەولە لەسەر دیاربەکر دانیشت. کە نەسرەتودەولە مرد میراتی هەردوو برایانی گرت و سککەی بەناوی خۆی لێدا و خوتبەی بەناوی خەلیفەی فاتیمییەی میسر خوێندەوە. ئەو خەبەرە کە بەخەلیفەی بەغدا گەیشت، زۆر پێی عاجز بوو.

لە ساڵی ٤٧٧هـ دا خەلیفەی عەبباسی ئەمری بەفەخرووددەولەی نەسر کوڕی جەهد تەعلەبی کە وەزیری خەلیفە بوو لەمێژبوو لە کوڕانی دوشتێک دڵگیربوو، لەبەر دەستدرێژی و لینگدانیان بۆ سەر تەعلەبی ئەمیری مووسڵ، ئەویش لەو بنەماڵەیە بوو. هەمان کە خەلیفە ئەمری پێدا لەشکرێکی قورس هەڵگرێ و بچێتە سەر دەوڵەتی دوشتێک لە دیاربەکر و جزیرەدا و بیگرێت.

مەنسوور دوشتێک ئەوەی بیست، داوای کۆمەگی لە هێندێک دراوسێ و ئومەرایانی دەوروپشتی سنووری کرد.

شەرەفوددەولەی عوقەیلی خێوی مووسڵ بۆ کۆمەگی ئامادە بوو؛ بەلەشکرێکی گەورەوە لەپێش کوڕی جوهیر ڕاوەستان، لە پاش کوشتار و شەڕکردن مەنسورود دەولەی دوشتێک لە دەست کوڕی جوهیر هەلات و دەوڵەتی دوشتێک کەوتە دەست کوڕی جوهیر. لە ساڵی (٤٧٨)ی زیلحیجەدا مەنسوروددەولە هەلات و چووە جزیرە. کە لە دەست کوڕی جەهیر دەرباز بوو، لە هێندێک قەلایان و جێگایاندا خۆی قایمکرد و هێندێک قووەتی گرد کردەوە و چەند قەلاییێکی لە جزیرە و بۆتان و هەکاریدا لە دەستداما.

لە ساڵی ٤٨٩ دا هێندێک لەشکری خێوی مووسڵ بەقورسی لە قەلای جزیرەدا دەوریان دا، لە پاش دەورەدانی دیواریان کونکرد و چوونە ژوورەوە. مەنسووردەولە کەوتە دەست تورکمان برا پگرمشی سەلجووقی. لە ساڵی ٤٨٩ دا و لە مانگی موحەڕەمدا لە ماڵە جوولەکەیەک گرتیان و لە بەندیان کرد.

٢٨ مانگ بەلێدان شەهیدیان کرد و چوار کوڕی لە پاش بەجێما. بەلان دەوڵەتیان ئینقرازی کرد و دوایی هات. ١٣٣ ساڵ بەحوکمداریان ڕابوارد و سککە و خوتبە بەناوی خۆیان بوو.

(بەیاریی خوا بەندی یێکەم تەواو بوو)

## بەندی دووەم

## دەوڵەتی هەزبانی لە ئاوربایەگاندا

## لە ساڵی ٣١٠ - ٥١١ هـ .

کە ئاوربایەگان کەوتە ژێردەستی عەباسییەکانەوە، عایلەی فەڕوخشا لە حوکمداری دەستیان کورت بوو، کەوتنە ژێر ئەمری عەباسییانەوە. ئیبراهیمی کوڕی محەمەدی کوڕی بیژەنی کوڕی ڕۆستەمی کوڕی فەزلوون، تازەمانی مەهدی کەوتە سەروکاری حکوومەت و ڕەشیدی کوڕی کردە والی ئاوربایەگان.

لە ساڵی ١٦٤دا ڕەشید ئیبراهیمی کردە نەدیم، لە حوکمداری عەزلکرد. کە ڕەشید بوو بەخەلیفە، ئیبراهیمی لەگەڵ خۆی بردە بەغدا و کردیە هەمەکارەی خۆی. لە پاش دوو ساڵان خستیە وەزارەتەوە. لەوێشدا زۆر بڵندبوو، هەموو ئومووڕێکی هارونە ڕەشیدی خستە ژێر پەنجەوە.

کە ڕەشید مرد، ئیبراهیم لە بەغداوە بۆ ئاوربایەگان هەڵات و لە قەڵای «چران» لە کۆنە «لاگیان» (لاجان)دا خۆی گرتەوە و کچێکی ئەمیری موتاوی هێنا و لەو کچە کوڕێکی بوو ناوی لێنا «دەیسەم» ئەو کوڕە بەتەربیەتێکی شازادانە بەخێوکرا، بەهەموو جۆرە ئاداب و حوکمدارێک مەشقی پێ دەکرا. لە ساڵی ٢٨٨هـ دا یووسف ساج لە شارەزوورەوە بەر بەئاوربایەگان هجوومی کرد.

دەیسەم لەنێو هەموو کوردستاندا ناوی کردبوو؛ هەموو کەسێک بۆ تەدبیر دەهاتنە کنی و ئومەرا و حوکمدارانی نزیکی مەشوەرتیان پێ دەکرد. یووسف ساج موحتاج بوو لەگەڵ دەیسەم ڕێککەوێت. پیاوی ناردە کنی و لەگەڵ خۆی ڕێکخست.

ئەو ساڵەشی گەلێ بەبەلا و ناخۆشی بوو. چاو قووڵکە و مردن ئەوەندە بوو، لاشەی پیاوان سەگ نەی دەخوارد.

دەیسەم بەگەلێک شرووتان جوابی داوە. یووسف بەزۆری کرد و مومکین نەبوو بەبێ دەیسەم ڕوو لەو جێگایانە بکا. لە ساڵی ٢٩٦ دا لەگەڵ دەیسەم لە موباحەسەدا بوو،

هەتا لەسەر ئەوە کە هەموو ئوموور لەشکریی لە دەست دەیسەمدابێ، ڕێککەوتن و بەکۆمەڵە ڕوویان کردە ئاوربایەگان.

دەیسەم لەگەڵ کوردانی موخابەرە کرد هەر لە لایەگیانەوە تاکو دەریای قەزوێن تەواوی کوردستانی ئاوربایەگان لەگەڵ دەیسەم ڕێک کەوتن. دەیسەم بێ ئەزیەت ئاوربایەگانی خستە ژێر حوکمەوە تاساڵی ٣٠٥ھ لەگەڵ یووسف بەیێکەتی حوکمداری ئاوربایەگان بوون و لەو موددەتەدا تەواوی ئەهالی کردە تەرەفداری خۆی. هەرچیەکی بوو هەر دەیسەم بوو.

لە ساڵی ٣٠٤دا یووسف لە دەست کەوت و کەس نەدەچووە کنی. لە خەلافەتی موقتەدیردا «موونیس» ناوێکی نۆکەری یووسف ساج دەسیسەیەکی دامەزراند، بەتەشویقی موقتەدیری خەلیفەی بەغدا ڕۆحی هەموو ئەهالی ئاوربایەگانی بۆلای خۆی کێشابوو.

کوردستانی ئاوربایەگان ڕووی لە پشێوی کرد و جوولانەوە. لە ساڵی ٣٠٥دا «سبک»ی پیاوی یووسف ساج زۆری لە موونیس کرد ئەو جێگایەی خستەدەست خۆی. کوردستان ئەوەندەی دیکە ڕووی لە تێکچوون کرد؛ تا ساڵی ٣١٠ھ کوردستان وەکو گێژەلووکەی لێهات. هەر لەو ساڵەدا دەیسەم فیکری خۆی خڕکردەوە و بەهێزی خۆی تەکانی دا گۆی هونەری لە هەموان ڕفاند و بەگورجی ئەوانی هەموو دەربەدەر کردن و خۆی خستە مەیدانەوە؛ سەری هەموو سەرڕەقانی نەرمکرد و دەستی هەموو دەست درێژانی بڕی.

## ئیستیقلالی کوردستانی ئاوربایەگان

دەیسەم ئاڵای یێکەتای لە کوردستاندا بەرزکرد. یووسف لەنێو گیانیدا دەژیا. هەموو ئوموور هەر ئەوبوو. یووسف لە خۆی گەیشتبوو، بەجارێکی دەستی لە هەموو ئوموورێکی بەردا؛ هەرچۆنێکی دەیسەم ڕازی بوایە، یووسف دەمی نەدەکردەوە. دەیسەم گۆشە و قولینچێکێکی کوردستان نەما نەیگرێت و لەشکری بەقووەت و پیاوانی دلاوەری لەسەر دادەنێت. دونیای ئەمین کردەوە و هەموو ئەهالی هێناوە ژێر حوکمی خۆیەوە. لە ساڵی (٣١٦ھ)دا یووسف مرد. دەیسەم بێ ڕەقیب و بەرامبەری بێ هاواڵ ماوە. دەستی بەتەشکیلاتی لەشکر و مەئموران کرد، هەر کەسێکی لە خۆی نزیک و لەسەر مەزهەب و میللەتی خۆی بوو دایدەنا. بەجارێک بەغدای نەناسی و بەتەنها ئاڵای کوردستانی بلندکرد. ئەردەوێڵ (ئاردوبیل)ی کردە پایتەخت و دەستی کرد بەڕێکوپێکی لەشکر و

مەملکەتداری و ڕەعیەتپەروەری. دەستی عەدالەتی کردەوە و دەرگای زوڵم و تەعەددای داخست. هەرکەسێکی بۆنی زوڵمی لێ بهاتبایە بەجەزای خۆی دەگەیاند. هەر چوار کەناری ئەردەوێڵی کردە قەڵا و دیوار و خەندەقێکی قووڵی لە دەرەوەی دیوارەکەی کۆڵی و پڕی کرد لە ئاو. هەر چتێکی کە بۆ لەشکر لازم بوو، ڕێکی خست. هەموو سەردار و سوپەهدار و مەرزەبانانی لە کوردان دانا؛ چونکو لەپێشدا هێندێک لە بێگانان تێکەڵ بەلەشکری ببوو، هەمووی دەرکردن بێجگەلە هێندێک دەیلەمی نەهێشتەوە. لە هەر جێگاییێکی کە کەمێک ترسدار بوو قەڵای لێ دروست کرد و گەورەیەکی بەلەشکرەوە ناردە سەری. بۆ تەماشاکردن و ڕێکخستنی شار و قەڵا و ڕەعیەت و لەشکری بەمووددەتێکی کەم بەنەفەسی خۆی هەموو ئاوربایەگان گەڕا و ناوی خۆی نا «شا». لەو سەفەرەدا نۆکەرێکی خۆی کە بە«وشمگیری کوڕی زیاد» مەشوور بوو، بەدزییەوە زۆر کەسی خستە دەست کە لە هەقی دەیسەم شادا پیسیەکی بکەن و فەسادێکی بەرپاکەن، بەبەهانەی ئەمەوە کە دەیسەم شا ئەشعەری مەزهەب و وشمگیر و ئەوانەی کە لەگەڵی ڕێککەوتن خاریجی مەزهەب بوون؛ تەعەسووبی ئاینی و فیتنەی مەزهەبییان خستە پێشەوە.

دەیسەم شا بەزوویی گەڕاوە و ئەو ئاورەی کوژاندەوە و وشمگیر لە دەیسەم شا ڕزگار بوو و چووە ڕاجیس و گەلێکی زەویوزاری خستەدەست و تەپڵی حوکمداری خۆی لە ڕاجیس لێدا.

ئەو بزووتنەوەی وشمگیر بوو بەئاگاداریێکی چاک بۆ دەیسەم شا.

لەوەش گەیشت کە مەیدان نەدات بەو جۆرە کەسانە، حاکم و قازی و سەرهەنگ مەرزەبانی لە هاوفیکرانی خۆی دانانە سەرکار و بەداد و ڕەعیەتپەروەری دەستی بەحوکمداری کرد.

لە ساڵی ٣٢٦هـ دا «سبکرە»ی بێژراوی پیاوی یووسف ساج دووبارە هەوای شۆڕشی کەوتە مێشکیەوە و ناوی خاریجی «باتینی» کردە ئاڵەت، گەلێکی کورد لەسەر گردبوونەوە و تەماعێکی زۆری لە ڕێگای دینەوە خستنە پێش. بەدزییەوە قووەتێکی زۆری پەیدا کرد؛ تا فرسەتی دەست کەوت، لەگەڵ ئەو هێزە پەلاماری بۆ گەلێک قەڵا و جێگایانی دەیسەم شا برد. لەشکری ئەو جێگایانەشی لەگەڵ کەوت. بەبێ ئەزیەت زۆر جێگایانی گرت.

دەیسەم شا کە بۆ مامڵەت کۆشا فایدەی نەبەخشی، چونکو حەزی نەدەکرد کورد لەگەڵ

کورد بەشەڕ بدا. ئەوجارە کە بەناچاری لەشکرێکی زۆری خڕکردەوە کە بچێتە پێش «سبکرەی». لەناکاو لەشکری سبکرەی دەورەی ئەردەوێلی دا دەیسەم شا پیادەی لە دەروازەی ڕۆژهەڵاتەوە بۆ دەرخست و پشتی سبکرەی گرت. لە پاش کوژتار و خوێن ڕشتنێکی زۆر، سبکرەی هەڵات و ڕووی کردە موکران (موقران - موکریان) و پەنای بردە بەر ئەمیری دەوالە (میاندواو). ئەویش پەنایدا و لەشکرێکی تەواوی بۆ گردکردەوە و پێکەوە چوونەسەر دەیسەم شا. لە پاش گەلێک کوژتار دەیسەم توانای ڕاوەستانی نەما؛ چونکو تەواوی کوردەواری کەوتنە لای دوژمنیەوە بەناچاری هەڵات و چوو بۆ ڕاجیس (تاران) و پەنای بردەبەر وشمگیر کە لە پێشدا باسکرا کە حوکمداری ڕاجیس بوو. ئەویش پەنایدا و گەلێکی دڵخۆشی داوە. بۆ کۆمەگی بەشەرتێک لێی قبووڵ کرد کە لەژێر فەرمانی وشمگیردا بکرێت، دەیسەم شا لەبەر ژیانی هاتووی لی قبووڵ کرد و لەگەڵ وشمگیر شەرتنامەیان مۆرکرد، کە هەر ساڵەی ١٠ هەزار دینار بداتە ڕاجیس و ئەویش لە هەموو وەختێکیدا لەشکری بداتێ و کۆمەگی بکا. لەسەر ئەوە لەشکرێکی زۆری دا بەدەیسەم شا.

سبکرەی کە بیستی دەیسەم بەقووەتەوە گەڕاوەو شەرتنامەی لەگەڵ وشمگیر مۆرکردووە، بێجگە لە هەڵاتن چارەیێکی نەما؛ ڕووی خۆی کردە «وان و ئەرگیش» و لەو چیایانەدا هێندێک ئەرمەنی عاسی ببوون، دەستیان کرد بەڕاووڕووتی ئەرمەنییان و لەگەڵ دەست و پێوەندی خۆی ڕوویان کردە زۆزان. دەستەی ئەرمەنییان لێیان وەخۆکەوتن و دەستیان کرد بەکوژتاریان. لە پاش گەلێک یەکترکوژتن گەلێک پیاوانی سبکرەی و هاوالانی مردن و چەند نۆکەرێکی پەرێشانی لە دەستدا ماو لە ڕەزالەتێکی زۆر پیس خۆی گەیاندە کن قەڵای ترم «تەرگەوەڕ». کە «سان»ی کوڕی سبکرەی لە تەرەف دەیسەم شاوە حاکمی ئەوێ بوو. ئەویش خاوەندی لێکرد و لەگەڵ قووەتێکی زۆر چوونە سەر قەڵای ترم.

میللەتی کوردان کە زانییان دەیسەم شا گەڕاوە سەرتەخت، لە سبکرەی وەخڕبوون؛ لینگیدیان دانێ و شکاندیانن.

سان و سبکرەی خۆیان لە پێش ڕانەگرتن و هەر بەکوژتار هەڵیانبڕین، هەتا لە خاکی ئاوربایەگانیان بەر بەعیراق ئاواکردن. سان پەنای بۆ ناسرودەولەی حەمدانی مووسڵ برد و هێندێک پیاوانیشی چوونە بەغدا و پەنایان بۆ خەلیفە برد.

ناسرودەولەی حوسێنی کوڕی سەعیدی ئامۆزای لەشکرێکی زۆری دایە سام و سبکرەی و بەقووەتێکی زۆرەوە چوونە سەر دەیسەم شا. کە لە مەیدانی شەڕدا لێکیان دا

نەیانتوانی لەبەردەم دەیسەم شا ڕاوەستن و بەشکاوی و پەرێشانی گەڕانەوە مووسڵ. دەیسەم شا لەسەر پەیمانی وشمگیر پابەندە ماوە و حوکمداریی هەموو ئاوربایەگانی لە دەستدا بوو، لەشکر و قووەت و گەورەیی ڕۆژ بەڕۆژ لە زیادی بوو.

یەکێک لە وزەرایانی دەیسەم شا کە ناوی «عەلی کوڕی جەعفەر» بوو، لە دەیسەم شا دڵگیربوو، هەڵات و چووە قەڵای ترم و پەنای بردە بەر محەمەدی کوڕی موسافیر کە یەکێک بوو لە ئومەرایانی دەیسەم شا و لە بنەماڵەی میرانی کوردان بوو. لە تەرەف دەیسەم شاوە ئەمیری حکوومەتی کوردان و ئەرمەنییان بوو؛ لەو خاکێدا و لەو دەمیدا.

«هۆزان» و «مەرزەبان» کە هەردووکیان کوڕی محەمەد بوون لە باوکیان عاسی بوون و تەواوی خاک و سەڵتەنەت و ئەمارەتیان خستە دەست و باوکیان لە قەڵای ترمدا لە بەندی کرد. ئەو دوو برایە لە هەموولاییێکەوە دەستیان بەسەرکێشی کردبوو. هەرچێکو عەلی کوڕی جەعفەر بوو پەنای بردە بەر مەرزەبان و دەستی بەفەسادی و تەشویشات کرد و مەرزەبانی خستە سەر هەوەسی سەڵتەنەتی ئاوربایەگان و بەهەزار فێڵان تێی گەیاند.

## سەرکێشی مەرزەبان لە دەیسەم شا

مەرزەبان چونکو جاهیل بوو بەغرووری جحێڵی تەفرەی خوارد و بەقسەی عەلی کەوتە سەما و دەستی بەقووەت وەخڕکردن کرد. عەلی تەشکیلاتی بۆ کرد و وەزارەت و ئیدارەی بۆ تەرتیب دا.

هۆی دووری عەلی لە دەیسەم شا و ئیتفاقی لەگەڵ مەرزەبان ئەمە بوو کە دەیسەم شا لەسەر قەولی ئەشعەری بوو، عەلی و مەرزەبان موخالیف بوون؛ عەلی «باطنی» (باتینی) مەزەب و مەرزەبان شیعەبوون. لەسەر دەیسەم ڕێک کەوتن و دەستیان بەبەیانات و ئینزار و تەشویقی خەڵق کرد و ئومەرا و گەورەی لەشکری دەیسەمیان بەلوتف و تەمەع جەلب و بەئەفسانە و درۆ هەڵیانخەڵەتاندن و دەستیان بەخۆ وەخڕکردن کرد و زۆر کەسیان لە سەرۆک و گەورە و سەردارانی دەیسەمیان هێنا دەست. دەقیقەیەک لە فەسادێ و ڕێکخستنی نیفاق غافڵ نەبوون و قاقەز و چەپەریان لەسەر یەک و بەدزییەوە دەناردە نێوەڕاستی کوردستان. دایمە لە جاسووس و پیاوناردنیان کۆتاهییان نەدەکرد، تا فەسادێکی تەواویان خستە ناو لەشکری دەیسەمەوە. کە هەموولایەکیان پڕکرد لە تەشویقاتی فەسادێ و ئەمنیەتییان لە لەشکر و سوپا و ئومەرایان حاسڵ کرد. بانگی شەڕ و کوژتاریان لێدا.

مەرزەبان بەنەفسی خۆی چووە نێو کوردستانەوە و دەستی بەتەشویقات کرد و خەڵقی مایل بەخۆی دەکرد. کوڕێک بوو چاپلووس و عەییار و خۆشڕوو، زوو ئینسانی ئیقناع دەکرد. دەری کوردستانی نەهێشت نەگەڕێ.

دەیسەم کە تەماشای کرد کەسێکی لە پشتەوە نەما و هەموو کەوتنە لای مەرزەبانەوە و زانی بێ فایدە خوێن دەڕژێ، هەردووک تەرەف کوردن و کوردان دەکوژرێن، بەناچاری هەستا لەگەڵ وەزیرەکانی و کەسانێکی لەگەڵ چوون، ڕوویان کردە ئەرمەنستان و پەنایان بۆ «سەجاجیق»ی کوڕی «دێرانی» برد. ئەویش پێشوازی کردن و پیاوەتییەکی تەواوی کرد و زۆر خزمەتی کردن. مەرزەبان کە زانی دەیسەم شا هەڵاتووە، دەستی بەسەر هەموو کوردستانی ئاوربایەگانێدا گرت و دەستی بەتەشکیلات و زۆری و جەور کرد.

کوردەواری لە کارێکی کە کردبوویان، زۆر پەشێمان بوونەوە. ئیختلافاتی مەزهەب پەیدا بوو. هەرچێکو مەرزەبان بەنەفسی خۆی بووە خاریجی و ئەوانیش ئەشعەری بوون.

تەفرەقە دەستی پێکرا، زۆری پێنەچوو عەلی کوڕی جەعفەریش ئەو حاڵەتەی پێ چاک نەبوو. تەماشای کرد نە ئیدارە و نە قەواعید و نە زاکوون و نە ریعایەت و نە گەورەیی و چکۆلەیی نییە. زانی بێفایدەیە و لەم موڵکە زایع دەبێت. لە ژێرەوە دەستوبردێکی کرد و چەند کەسێکی لە وەزیران و گەورە و ئومەرایانی هەڵگرت و بەری خۆی داوە لای دەیسەم شا و پشتی لە مەرزەبان کرد. تەواوی ماڵ و منداڵ و کەسوکاریان هەڵگرت؛ ئەوەندەی لەشکر و نەفەری دەیلەمی بوو کوژتیان و ئەوی مانەوە ئیتاعەی دەیسەم شایان پێکردن.

دەیسەم شا کە ئەو خەبەرەی بیست، لە هەموو لاییکەوە گەورە و پیاوانی خڕکردەوە و هجوومی کردە سەر ئاوربایەگان. بەبێ دەسایس و تەشویقات ئەوانەی کە لای مەرزەبان بوون هەڵاتن و خۆیان خستە لای دەیسەم شا.

عەلی کوڕی جەعفەر وەزیری، ئاشتی هێنا پێش و تەورێزی تەسلیم کرد. لە تەورێزەوە بەرەو «ئاردوبیل» چوون.

عەلی هەڵات و چووە لای مەرزەبان و دەستی بەتەدارەکی جەنگی کرد. تا ئەو لەگەڵ مەرزەبان خەریکی ئەمەبوون، دەیسەم شا کەوتەوە ئەردەوێڵ.

ساڵێکی نەکێشا مەرزەبان و عەلی دەورەی ئەردەوێڵیان دا. دەیسەم شا کەوتەوە دەغدەغە، بەناچاری ماڵ و منداڵی خۆی هەڵگرت و چوو لە ترم دانیشت و دەستی لە حوکمداری هەڵگرت. موددەتی حوکمداریی ئەو ٢١ ساڵ بوو.

## دەوڵەتی موسافیر لە ساڵی ٣٣١ تا ٥١٠ ﻫ

دەوڵەتی موسافیر لە ئاوربایەگاندا قەراری گرت؛ حکوومەتێکی کوردیان تەشکیل کرد. بابوباپیریان وەکو محەمەد وەکو موسافیر لەنێو کورداندا لە ماڵە میرانی کوردەواری کە لەنێوانی ئەردەوێل و ئەستەرە بوون، بەچەند پشتێک لەگەڵ بنەماڵەی دەیسەم شا دەگەیشتنە یەک کە ئەمڕۆکە بە«تاڵشی» مەشهوورن.

دەوڵەتی موسافیر بەنێوی باپیری مەرزەبان دەکرێت.

**مەرزەبانی یێکەم پادشای دەوڵەتی موسافیر لە ساڵی ٣٣١ - ٣٤٦ﻫ.**

مەرزەبان کوڕی محەمەدی کوڕی موسافیر لە قەڵای ترم لە ساڵی ٣١٤ دا لە دایک بووە. لە ساڵی ٣٣١ دا لەسەرتەخت دانیشت.

لە ساڵی ٣٣٢ دا تایفەیێک لە عرووسی قافقاز (قاوقاز)ەوە هجوومیان کردە سەر ئاوربایەگان و شاری «هەرزع»یان گرت و زۆر کەسیان کوژت و قەتڵ و عامیان کردن و هیچیان نەهێشتن، ژن و منداڵ و پیاویان کوشتن و هەموو دوکان و ماڵیان خاپوور کردن.

مەرزەبان لەشکرێکی زۆر و زەوەندی لێ دەنگدان و چوونە سەریان. لە پاش کوشتارێکی زۆر دەریان کردن و شاریان لێ خاوێن کردنەوە، بەڵان عرووسان زۆریان زەرەر لە کوردان دا. خوداش زوو یارمەتی مەرزەبانی دا و موەفەق بوو.

کە حادیسەی عرووس تەواو بوو، هێندێک ئەحواڵی کوردستان کەوتە قەلقەلەوە. مەرزەبان لە حەرەکەی دەیسەم شا ترسا و قاقەزی لە سەجاجیقی ئەرمەنییەوە نووسی بۆ تەسلیم کردنی دەیسەم شا کە نەوەکو دیسان لەو کێشەکێشەدا تەماعی سەڵتەنەت بکاتەوە. سەجاجیق بۆ ڕاگرتنی جێگای، پادشایەکی وا کە بەمیوانی لە پەنایدا دانیشتبوو گرتی و بەدەست بەستراوی تەسلیمی دوژمنی کرد.

لە ساڵی ٣٣٣ دا مەرزەبان دەیسەم شای لە بەندێ کرد و لە کەمالی ئیستراحەدا دەستی بەسەر کێشا. مەرزەبان بەتەواوی و بێ کیشەکێش حوکمداری کرد، تا ساڵی ٣٤٦ موددەتی حوکمداری ئەو ساڵ بوو. لە دوایی زستانێدا کۆچی دوایی کرد و کوڕی لە پاش بەجێما: جەستان، ئیبراهیم، ناسر.

## دەوڵەتی هەزبانی - حوکمداری هەسوودان

هەسوودان کوڕی محەمەدی کوڕی موسافیر لە زەمانێ کە مەرزەبان بوو بەپادشای هەمەدانێ و برای کردە وەلیعەهدی خۆی، لە ساڵی ناوبراودا جەستانی کوڕی مەرزەبانی کردە وەلیعەهدی هەسوودان؛ بەڵام بەدزییەوە وەسیەتی کرد لەلای وەزیران و وکەلایان و تەنبیهی کردن کە من مردم جەستانی کوڕم پادشایە و وەلیعەهدی ئەو ئیبراهیم و ناسر بن؛ لە پاش ئەوان هەسوودان بکەنە پادشا.

مەرزەبان کە لە ساڵی ٣٤٦ دا مرد، وەزیرەکانی لەسەر وەسیەتی مەرزەبان جەستانیان کردە پادشا.

جەستان دەستی بەتەرتیبات و ئیدارەکرد و ئەردەوێلی کردە پایتەخت.

هەسوودان فیراری کرد و چووە مەراغە و ئیعلانی حکوومەتێکی کوردی موستەقیللی کرد. هەسوودان بۆ خۆی بوو بەپادشایێکی موستەقیل لە مەراغە.

جەستان کە ئیستیلای حکوومەتی ئەردەوێلی کرد، لە ساڵی ٣٤٦ دا دەیسەم شای دەرخست و کوژتی کە نەوەکو تەماع لە حوکمداری بکا. بەڵان بەکوژتنی دەیسەم شا ئاسوودە دانەنیشت؛ کوڕێک بوو مایل بەکەیف و زەوق و ئاگای لە ئومووری حوکمداری نەما. بەتەواوی بەزەوق و ئاهەنگی ڕادەبوارد. ئەو حاڵە تا ساڵی ٣٤٩ دەوام دەکا. لە ساڵی ناوبراودا پیاوێک لە ئەولادی موکتەفی بیللای عەباسی پەیدابوو، دەستی کرد بەئیدیعایان و تەشویقاتی دینی و ڕەزای خودا و پێغەمبەر و ئیجرای شەریعەت و ئیزهاری حەق و عەدالەت و فەرمایشاتی خودا و پێغەمبەرانی کردە ئالەت و پەردەی تەزویری گرتەوە.

## دەرکەوتنی فیتنەی خەلافەت و ئاوری فەسادی

ئەو پیاوە هەروەکو ئەجدادی، پەردەی داو و حیلەی گرتەوە. بانگی خودا گەورەیی و پێغەمبەر بەحەقی بەگوێی کوردانی سادە و دڵی مسکێنی بێ بیردا دا و نیدای حەق و شەریعەت پەرستی کردە زنجیرێکی درۆ و دەلەسە. حەڵقە حەڵقە بەنێوی ئیسلامییەت و دیانەت دانا و دانەی تەسبیح و داوی بەرماڵی بۆ گرتنی بێ هۆش و هەژاران داناوە و دەستی بەهەڵخەڵەتاندن کرد. دڵی خەڵقی بەناوی خەلافەت و دیانەت جەلب کرد، خستیە گوێیانەوە کە خودا منی بۆ هیدایەتی ئێوە ناردووە و غەیری من خودا پیاوی چاکی خەڵق

نەکردووە. ئەولادی پێغەمبەرم و جەددم منی کردە وەکیل. خولاسە ڕێگای فێڵ و ئەفسوونێکی کە بەدەرس لە مامۆستایان وەرگرتبوو، بۆ غەش و ئیخداعناسی، بەشەرتی زیادی لە وانیشی بەکار برد؛ تا گەلێک پیاوانی ئیخداع کردن و بەموستەجیر بیللا خۆی مەشهوور کرد و جەمعیەتێکی زۆری خستە ژێر داوی مەکر و حیلەوە.

«نەعیم» ئەمیری موقران لە کێو و ئەرازی مابەینی ورمێ و وانی دایە؛ ئەو زاتەش بەدەسایسی وی هەڵخەڵەتا و شەرت و شرووتیان لەسەر تەعەهوداتی ئاتی کرد و ئیتفاقیان کرد کە: من کۆمەگیت دەکەم و لەشکرت بۆ وەخڕ دەکەمەوە ئاوربایەگان بگرین بەمولکی بۆ من بمێنێتەوە، منیش کۆمەگیت دەکەم بچۆ سەر بەغدا و ببە بەخەلیفە؛ کە بوویە خەلیفە، ئاوربایەگان بۆ من بێت. موستەجیر بەوە ڕازی بوو.

نەعیم لە هەموولاییێکەوە لەشکری بۆ دەنگدا و ئەسپابی شەڕیان ئامادەکرد و ڕوویان لە ئاوربایەگان کرد و لە کێوانی موقران بەربە ورمێ و خۆی و سەلماس هاتنەخوارێ. لەولاشەوە جەستانی کوڕی مەرزەبان و ئیبراهیمی برای بەلەشکرێکی زۆرەوە بۆیان هاتن و بەرامبەری لەشکری نەعیمیان کرد لە دەشتی سەلماسیدا لێکیان دا. لە پاش شەڕ و کوژتارێکی زۆر نەعیم بێ هێزبوو، هەڵات و بەپەرێشانی بەری خۆیدا کێوان.

هەسوودان ئەو حاڵەتەی بەفرسەت زانی و خۆی ئامادەکرد و غاریدا سەر برازاکانی ئیبراهیم و گرتنی.

ناسر خۆی خستە موقران و دڵخۆشی بۆ موستەقبەل و پێشوویان، خەڵقی خستە ژێر چەک و سیلاحەوە. لەشکرێکی چاکی خڕکردەوە و هاتە سەر ئەردەوێڵ. لەشکری ناسر لە وەختی موحاسەرەدا داوای دراویان کرد. بەزمان و حیلە ڕایگرتن تا لەگەڵ جەستانی برای بوونە یەک و بەیێکدەستی چوونە بەرامبەری مامیان. زۆرکەس کوژران و تالان کران و جێگایان ویران و کاوڵ بوون و لە هەردووک لایان زەرەر کەوت و دیسان نەیانتوانی بەرامبەری مامیان بکەن. تالیب بەسوڵح بوون و کەوتنە ژێر ئیتاعەی هەسوودانەوە. مامیان قبوڵی کردن و تەواوی زەوی و سەڵتەنەت و گەنجینە و لەشکرەکەیانی خستنەژێر حوکمی خۆیەوە و ئەوانیشی هەر یەکەی خستە سەر وەزیفەیەک تا بەتەواوی ئەمینی کردن. لە دوایێ هێنانیە ژێر چنگی خۆیانەوە و بەدایکەوە لە بەندی کردن و هەموو ئاوربایەگانی خستەژێر دەستیەوە و ئیسماعیلی کوڕی خۆی کردە وەلیعەهدی خۆی و ئەغلەب قەڵا و جێگایانی مەحکەمی دایێ.

ئیبراهیمی کوڕی مەرزەبان بۆ ڕزگاری براکانی چووە مەراغە و لەشکری کێشا. هەسوودان کە بیستی، جەستان و ناسر و دایکیانی کوژت. بەلەز ئەمری دا بە«جەستانی کوڕی سەر مەزن» بۆ لەشکر و سوپا خڕکردنەوە و بۆ کوژتاری ئیبراهیم موهەییا بوو. لەشکری بۆ تەواو بوو، چووە سەر ئیبراهیم لە مەراغەدا.

ئیبراهیم کە وایزانی هەلاّت و چووە ئەرمەنستان. لە سالّی ٣٤٩ دا کوڕی سەرمەزن، مەراغەی گرت و ئیستردادی کرد و چووە سەر ئەرمەنستان تێکوپێکی دا و تەختوتاراجی لێ وێران کردن. ئەو حکوومەتەی لەنێوانی لابرد، ئەو زەوی و شارانەی هەموو خستە سەر مەراغە و بەمەراغەی گرێدان.

لەو چاخ و وەختەدا خەبەری مردنی ئیسماعیلی وەلیعەهدی هەسوودان هات و بەگوێی ئیبراهیم گەیشت، دەستی کرد بەقووەت وەخڕکردن و لینگی دا سەر ئەردەوێلّ و گرتی.

هەسوودان هەلاّت و ڕووی لە دەیلەم کرد. ئیبراهیم تا حدوودی وەدوکەت و تەواوی ئەملاکی مامی زەوت کرد و تالاّن و مالّێکی زۆری دەست کەوت و گەڕاوە قەلاّی ترم.

«قاسمی کوڕی مەنسەلی» بەسوپەهداری لە تەرەف هەسوودانەوە هاتە سەر ئەردەوێلّ و دیسان گەڕاندیانەوە. قاسم لەشکری زۆر بوو، چووە سەر ئیبراهیم و کوژتارێکی زۆریان کرد. ئیبراهیم نەیتوانی بەرامبەریی بکات و هەلاّت و چووە ڕەی (تاران) پەنای بۆ ڕوکنوددەولەی بوویە برد. ڕوکنوددەولەی بوویە قبوولّی کرد و ئوستاز ئەبولفەزلی کوڕی عەمیدی لەگەلّ نارد و بەکۆمەگی سوپا و قشوونی دایێ و بەجەبەخانەوە هاتن تا هەموو ئاوربایەگانی گرت و هەموویان کەوتنە ژێردەستی ئیبراهیمی کوڕی مەرزەبان.

## حوکمداریی ئیبراهیمی کوڕی مەرزەبان

ئیبراهیم بەکۆمەکی ڕوکنوددەولە تەواوی ئاوربایەگانی خستە ژێر حوکمەوە. جەستانی کوڕی سەرمەزنیش ئیتاعەتی کرد و کوردستانی ئاوربایەگان بەجارێک سەریان بۆ دانەواند و بەپادشای خۆیان قبوولّ کرد.

کوڕی عەمید قاقەزی بۆ ڕوکنوددەولە نووسی کە هەموو ئاوربایەگانمان کردە یەک وجوود و بۆ من ڕیعایەتێکی چاک دەکەن. ئەمر دەکەی ئاوربایەگان بۆ من بێت و سککە و خوتبە بەنێوی تۆ بێت و لە ژێر ئیدارەی ئێوەدا حکوومەت بەئەمارەت بخەمە ژێر حوکمی خۆمەوە ئەمن ببمە ئەمیریان.

ڕوکنوددەولە حاشای کرد و لە جوابیدا دەنووسێ: «کەسێکی پەنا بۆ من بێنێ و تەلّەبی

کۆمەگیم لێ بکات، خیانەتی لەگەڵ ناکەم؛ زوو بگەڕێوە» لە پاش ئیستراحەتی مەملەکەت، کوڕی عەمید گەڕاوە. ئاوربایەگان بەموستەقیللی لە دەست کورداندا ماوە و حکوومەتی کوردی دەوامی کرد. ئەحواڵی ئیبراهیم تا ساڵی ۳۸۰ بەبێ دەنگی ڕابرد. تەئریخێکی کە لەوێوە تا دەوری هەسووزانی کوڕی کلاس باس بکا. وە دەستمان نەکەوتووە. بەڵان ئەوەندە دەزانرێت کە هەسووزان بوو بەپادشا و لەسەر حوکمداریی باقی ما.

## حوکمداریی هەسووزانی کوڕی کلاسی کوڕی ڕاوێدی

لە پاش برایی کوڕی مەرزەبان ڕاوێدی کوڕی بوو بەحوکمدار. لە پاش ئەو کلاسی کوڕی ڕاوێدی بوو بەحوکمدار. چلۆنی ئەحواڵی ئەو حوکمدارەمان بەچاکی لێ ئاشکرا نەبووە. لە وەختی نووسینەوەی ئەم کتێبەدا تەئریخێکی کە بەموفەسەلی باسی ئەوانە بکا دەستگیرمان نەبوو. لە ساڵی ۳۸۰ تا ٤٨٠ھ بەچاکی وەدەستمان نەکەوت. بەڵام ئەوەندەی کە لێمان دیار بوویێت، هەسووزانی دووەم کە لە ساڵی ٤١٥ دا بۆتە حوکمداری کوردستان، هەروەکو پێشووانی، بەئەمری حوکمداری ڕابوارد و لە ساڵی ٤٢٠ دا خێڵێکی عەشایری تورکمانان لینگیان دایە سەر ئاوربایەگان.

## هاتنی تورکمانانی غەز بۆ کوردستان

غەز قەبیلەیەک بوون لە تورکمانانی بوخارا و کەوتنە ژێر فەرمانی سوڵتان مەحموودی سەبەکتەگین و بڵاوبوونەوە و دەستیان بەتاڵان و کوشتاری ئەهالی ئاسیا کرد و تێیدا دەم شیرن بوون. گەلێکیان بۆ لای ئەسپەهان چوون.

لە ساڵی ٤٢٠دا ئەمیری ئەوێیان کوژت. ئەو ئاجووجانە هێندێکیان بۆ چیای یەکجار چوون لەکن خوارەزم و هێندێکیان بۆ ئاوربایەگان جویێ بوونەوە لە ژێر فەرمانی چوار ئەمیراندا: «تۆقا، گوگتاش، مەنسوور، دانا» بەتاڵانکردن و کوشتار چوونە تەورێز. لە پاشان چوونە مەراغەی پایتەختی کوردستانی هەزبانی.

لە ساڵی ٤٢٩دا لەوێوە ڕوویان کردە کوردستانی دوشتێک لە جزیرە و دیاربەکر.

«بوستانی» لە «دائیرەتولمەعاریف»دا دەبێژێت: زۆر لە تایفەی کوردانی ئەو جێگایانە کۆمەگیان کردن، لەو وەختیدا پادشای ئاوربایەگان هەسووزانی کوڕی کلاسی کوڕی ڕاوێدی بوو. هەسووزان بەهەموو ئیکرامێک پێشوازی کردن و هەموو ئەهالی و گەورە و ئەعیان ئیستقبالیان کردن و موساهەلە و تەوازوع و ئیکرامیان بۆ نواندن؛ فایدە بەخش

نەبوون. بەتەهدید و ترس و شەڕ و لوتف و مەرحەمەت دیسان بەکار نەهات. چونکە قەومێکی غەدرئاوەری کێویی و موتەوەحیش بوون؛ مەنفەعەت و دەوڵەت و پوول و ماڵ و موڵک و ئەرازی کوردستانیان دیت، حشمەت و دەبدەبە و سەروەتیان چاوپێکەوت؛ هەرچەندە کوردەواری ڕێگای نەرمیان نیشاندابان، تەماعیان لێ زیاتر دەبوون. هەرچەندی کوردان جەبائەت و بێدەستی و لاوازییان بۆ کردبان، ئەوان چاکتر قووەتیان نیشان دەدا. لەشکری تورک لە شارستان و دێهاتاندا دەستیان بەڕەزالەت و تالان و کوشتار و دەستدرێژی کرد و بۆ پێشەوە نزیکیان کرد. تا ساڵی ٤٢٩ داخیل بەمەراغە بوون.

لە کوردستانی ئاوربایەگاندا تەشویشات و فیتنە و فەسادیان لە عەقڵ و شەرەفی بەشەری بەدەرکرد. ئەوەی ئیسلامییەت پێی ناخۆشە و ئەوەی بەشەر ئیکراهی دەکا و حەیوان پێی ڕازی نییە، ئەو میللەتە موتەوەحیشە ئەدایان دەکرد. نە چاک و نە خراپ، نە ژن و نە منداڵ نەمان کە دەستی زوڵم و ئەزیەتی ئەو زاڵمانەیان نەگاتێ. نە ناموس و نە ماڵ ما. کە داخیل بەمەراغە بوون قەتڵ و عامیان کرد. لەپێشدا هەتکی ژن و کچی باکیرەیان دەکرد، لە پاشانیش دەیانکوژتن. نەقدیە و حەیوانات و ماڵ و پوولیان تالان کرد. مزگەوت و عیماراتیان سووتاند.

کوردەواری کە وایانزانی بەدزییەوە وەخڕبوون و بەیەک دڵی ئیتفاقیان کرد. بەگەل وەخڕبوون و کۆمەکران و دەستیان بەبیر و ئەندێشە کرد. یەک دەست بۆ یەک سوێندیان خوارد. بەهەموو جۆرێک بۆ دەرخستنی ئەو فیتنەیە ئیتفاقیان کرد.

هەسووزانیش لەگەڵ «ئەبولهەیجای کوڕی ڕەبیبوددەولە» ئیتفاقیان کرد و ئەوانیش لەگەڵ ڕەعیەت و تەبەعەی خۆیان ڕێک کەوتن. خولاسە هەموو ڕەعیەت و ئەمیر و گەوران یەک دەست و یەک دڵ بوون و بۆ دەفعی ئەو ئەشرار و بێدینانە.

ئەهالی کە ئەمەیان کرد، تورکان زانیان و جڵەوی هەڵاتن و فیراریان گرتە دەست و بەرەو ڕەی (تاران) چوون و تەرکی کوردستانیان کرد. ئەهالی لە هەموولایێکەوە تێیان خوڕین و دەستیان بەکوژتاریان کرد.

هەسووزان لە تەورێزەوە قیامی لێ کردن. ئەوانەی کە ئیقامەتیان کردبوو، خۆیان خستبووە ژێر عادەتی کوردیشەوە خەلاس نەبوون و کوژتیانن؛ هەتا کوردستانیان لەو فەسادانە پاک کردەوە. لە ساڵی ٤٣٢ تا ساڵی ٤٣٩ لە هەموو خاکێکی کوردەواریدا کوشتار بوو. لە ساڵی ٤٣٢ دا زەویانی کوردستانیان پاک کردەوە. کوردستان لە پاش ئەو شەڕەش تا ١٤ ساڵان بەڕەحەتی و سەربەستی لە ژێر فەرمانی هەسووزاندا ڕاببوارد.

## - ئیستیلای دەوڵەتی سەلجووقیان لە ئاوربایەگاندا -

بنەماڵەی سەلجووقیان، تورکێکن کە لە نێوانی چین و تورکستان بەرەوەندی دەژیان. ئەوان تورکمانانی تەتەر و خەتا و غەز بوون، کەوا خڕبوونەوە.

سەلجووقی عەشیرەتێکن لە غەز. بۆیەیان پێ دەڵێن سەلجووقی کەسێکی کە پێشرەوی کرد ناوی سەلجووق بوو. ئەو بنچینەی حوکمداری بۆ دامەزراندن؛ لەبەرئەمە بەو ناوەیان دەناسن.

سەلجووقی لە وڵاتی خۆیدا هێندێکی سەرکێشی کرد لە پاشان هەڵات و چووە جوندی نشاپوور لەسەر جەیحوون. لەوێ موسڵمان بوو. ئەو دەورووپشتەی خستە دەست. کەسانێکی کەنەیاری بوون لایبردن و بەئاسوودەگی بوو بە بەگێکی چکۆڵە و لەوێدا مرد.

ئورتوغرووڵی کوڕی مکایلی کوڕی سەلجووق لەگەڵ مەسعوود [سەبوکتەگین] بەشەڕ هات و بەسەریدا زاڵبوو. خوڕاسان و نیشاپووری لێ گرت و کردیە پایتەخت. لە ساڵی ٣٢٩دا ناویان نا مەلیک موعەزەم.

مەسعوود لەشکری خڕکردەوە و لە گەڵیان بەشەڕ هات و تێشکا و سەلجووقی سەرکەوتن و لەوێوە ڕوویان لە خاکی ئێران کرد. ئاوربایەگان و خووزستان و کوردستان و ئەوانەیان گرت.

لە ساڵی ٤٤٦دا ئەرتوغرووڵی سەلجووقی ڕووی لە ئاوربایەگان کرد و تەمای تەورێزی هەبوو. هەسووزانی کوڕی کلاسی کوڕی ڕاوێدی پادشا بوو؛ پایتەختی تەورێز بوو. پێشوازی لە ئورتوغرووڵێ کرد و بەهەموو سوپاسێکەوە ئیتاعەی کرد و خوتبەی بەناوی وی خوێندەوە، سەردارێکی خۆی بەگرێو لە لای ئورتوغرووڵ دانا.

لەو تەئریخەدا کوردستانی ئاوربایەگان کەوتە ژێر ئینتدابی سەلجووقیانەوە، تەواو بەموستەقیللی نەما و لەژێر ئیدارەی ئەواندا دەژیا. لە ساڵی ٤٥٧ یا ٤٥٨دا هەسووزان وەفات دەفەرمووێ، ئیبراهیمی کوڕی لەسەر ئومووری حوکمدارای دانا.

## ئیبراهیمی کوڕی هەسووزانی دووەم

کە باوکی مرد لەسەر عەهدی ئەو وئیدارەی سەلجووقیان دەوامی کرد و بەئەمری حکوومەت ڕاگەیشت. ئەحواڵی ئەو بەبێدەنگی ڕابرد. لە ساڵی ٤٩٠دا ئیبراهیم وەفات دەکا.

## ئەحمەدێلی کوڕی ئیبراهیم کوڕی هەسووزان

ئەمیر ئەحمەدێلی کوڕی ئیبراهیم ساحێبی مەراغە و بەعزێ لەقەتەعاتی ئاوربایەگان بوو. لە پاش باوکی بوو بەپادشا و پایتەختی بردە مەراغە، تا ساڵی ٥١٠ بەرەحەتی و سەربەستی ڕایبوارد. پیاوێک بوو بەشەهامەت و ساحیب ئیقتدار و سابیت قەدەم و ڕەشید و موددەبیر و بەحەمیەت و وەتەنپەروەر و میللەتخواز و بەئەخلاق و عادیل و بۆ پێشکەوتنی کوردان دەکۆشا. لە تەعمیرات و ئاوەدانی و تەرتیباتدا ساعی بوو.

لە ساڵی ٥١٠ دا تەفتەگین ساحێبی دیمەشق بۆ زیارەتی سوڵتان دێتە بەغدا. ئومەرا و پادشایانی کوردەواری بۆ دیدەنی هاتبوونە بەغدا و لەسەرای سوڵتان محەمەدی سەلجووقیدا میوان بوون. هەرچێکو سوڵتان محەمەد بوو لە ئەمیر ئەحمەدێل دەترسا؛ چونکە ڕۆژ بەڕۆژ لە تەرەقی و پێشکەوتندا بوو. ئەندێشە و فیکری لێ دەکرد و بەهانەی بۆ پەیدا نەدەبوو؛ لە زاهیریشدا دەرەقەتی نەدەهات. خولاسە لە دڵدا هەراسی لێ هەڵگیرابوو، تا ئەو ڕۆژە بەبەهانەی هاتنی ئاقابەگ و دەعوەتی ئەمیر عەدالەتپەنا و تەواوی ئەمیرانی کوردستانی کرد و بەدزییەوە دەستووری دا بەهێندێک لە نۆکەران و دەسایسێکیان چاکرد و بەقەراراتی هاتوو دامەزرا کە ئەمیری موعەزەم بکوژێت. یاقووت ساحێبی «معجم البلدان» دەبێژێت: «ڕۆژی زیافەت هەموو میرانی کوردستان لە مەجلیسدا دانیشتبوون و ئەمیر ئەحمەدێل لە تەنیشت ئاقا بەگ بوو. لەناکاو پیاوێکی پەرێشان دەستی ڕاستی بەپەڕۆ بەسترابوو، وەکو بریندار بێت وابوو، هاوار و گریان وزاری دەست پێکرد و بەزەلیلی دەپاڕاوە و دادوبێداد و ئەمانێکی بوو کە ئەو هەموو مەجلیسە تەحەیوری کرد و دەڵێ: «ئامان دەخیلوبم بمگەنێ»، ئەمیر ئەحمەدێلی سافدڵ و بەمەرحەمەت دڵی پێ سووتا و غافڵ لە حیلە و درۆ شەفەقەتی کرد و لە جێگای خۆی تەکانیدا و چوو دەستی بگریت. ئەو زاڵمە لە خودا نەترسە، خەنجەرێکی ڕووتی لە دەستدا بوو، شاڵاوی بردە سەر میری کوردان و خەنجەرێکی حەواڵەی سینگی میری کرد. میر گرتی و خەنجەرەکەی لە دەست دەرخست و بەزەوی دادا و خەنجەرێکی لە زگی ئەو حەرام زادەیە دا و ورگی دڕی، یەکێکی دیکە لنگی دا سەرمیر، ئەویشی خست و خەنجەرێکی گەیاندێ و ئەویشی کوژت. هیشتا لەسەر ئەو بلندە نەبووە یەکێکی دیکەش هەڵاتە سەری؛ ئەویشی کوشت. ئەم حەرەکەیە لە ئەهالی مەجلیس زۆر خۆش هات و ئافەرینییان لە تەڕدەستی و ڕەشادەتی ئەمیر کرد و دەنگی «چاکت کرد چاکت کرد» لە میرانی کوردان پەیدابوو.

ئاقـا بەگ لەم حـادیسـەیە ترسی لێ پەیدا بوو، وەیزانی کـە ئەو داوە بۆوی داندراوە و سوڵتان بۆ کوژتنی ئاقا بەگ ئەو فێڵەی خستە پێشەوە.

ئاقا بـەگ لەم فـیکرەدا بوو دی کـە سولـّتـان بەدزییـەوە ئیشـارەی کردە کوژتنی ئەمـیری کـوردان. یەک دەفـعـە هجـووم کـرا سـەر ئەمـیـری وەتەنپـەروەر. لە پـاش چەند کـەسـێک برینداری و کوشتن، ئەمیر بەدەستی موناف‍یقانی بەدنییەت شەهید کرا و ئومەرای کوردان یەک دەفعە تێکچڕژان و قەستی سوڵتانیان کرد و وەبەر نەکەوت.

لە پاش چەند کەسی کوشتن، ئاقا بەگ لێی مەعلووم بوو کە ئەوە بۆ کوردانی بەدبەختە؛ شەرتی بێ... و بێ غـیرەتانە کە بەئاشکرایی ناتوانن کار بکەن و کەس بکوژن، میهـمانی خۆیان سەر دەبڕن.

لە پاش ئەمیر ئەحمەدێل، حکوومەتی کوردانی هەزبانی دەوامی بوو تا سـاڵی ٦٥٤. ئەو وەختـەی کە هۆلاکۆ خان ئاوربایەگانی وەکو باقی شـارەکـانی ئاسـیـا گرت، ئەودەمی پادشـای کوردانی هەزبانی لە مـەراغـەدا و کـچێکی ئەو عـائیلەیە بوو. ئومـەرای مـەغـۆل ئیستیلای ئاوربایەگانیان کرد و مەراغە بوو بەپایتەختی ئێلخانییان.

حـوکـمـدارانی کـوردانی ئاوربایەگـان بەرایی و دوایی ئەوان لە تـەئریخی مـوفـەسـەڵی ئاوربایەگانماندا بەدووورودرێژی بەیاریدەی یەزدانی پاک باسی دەکرێت.

(بەپشتیوانی خودا تەواو بوو)

سەرچاوەکان:


١- شەرەفنامی. ئەمیر شەرەفخانی بتلیسی. بەفارسی.
٢- مرآت العبد (تەئریخی عموودی)، سەعید پاشای دیاربەکری، بەتورکی.
٣- معجم البلدان، یاقووت حەمەوی. بەعەرەبی.
٤- دائره المعارف، بێترۆس بوستانی. بەعەرەبی.
٥- تەئریخی ئیبن خەلەکان، قازی عەبدولرەحمانی هەولێری.
٦- تەئریخی هەکاری و بۆتان و بادینان. بەزمانی فارسی. کردەوەی عەبدولڕەحیم هەکاری- دەستنووسە.
٧- تەئریخی موفەسەلی ئازەر بایجانی کوردستان. بە پێنووسی میرزا ئیبراهیم قازی سابلاغی. بەزمانی فارسی. دەستنووسە.

# تاریخی حوکمدارانی بابان

لە کوردستانی شارەزوور و ئەردەڵاندا

لە ساڵی ٦٣٦ی هجرییەوە هەتا ساڵی ١٢٧٤هـ

**س . ح . موکریانی ١٩٣٠**

لە منەوە وێنەیی بەدبەختی یادگاری چارەڕەشی

بمێنێتەوە بەغەم و دەرد و داخەوە لە ڕۆژی ڕەشی

# بابان

له کوردستانی

شاره‌زور و ئه‌رده‌لاندا

له سالی ٦٣٦ ی هجره‌وه

هه‌تا سالی ١٢٧٤ هـ

## پێشدەستی

لەبەر ئەوەی کە لە پێشەنگی بەرگی یەکەمی «ئاوڕێکی پاشەوە»دا بەدوور و درێژی لە مێژوو مایەی ناو و جێگا و زەوی شارەزوور زۆر قسە هاژۆترا، بەپێویستم نەزانی لەم جزمەدا دووبارەی بکەمەوە. بەڵام بۆ ئەوەی خوێندەوارانی ئەم جزمە نەزان نەبن، هێندەیان عەرز دەکەم کە. ئەم خاکە پیرۆزی و پڕ مەینەتەی پشت و پەنای کوردانەی فریادڕەسە لە ساڵانی دوو هەزار و دووسەد و هەشتا و شەش پێش میلادی عیساوە لە دەستی جەوری هەمورابی کە بەسەر کوردستاندا درێژ ببوو، کوردێکی لەو جەورە هەڵدەهاتن لە خاکی کێوانی ئەکباتان و زاغرۆسدا خۆیان پەنهان دەکرد، کۆببوونەوە و شارێکی گەورەیان ئاوا کرد و ناویان نا «شارەزوور». هەر خاکێکی کەوتبووە ژێر پەنجەی ئەو کوردانەوە بەشارەزوور ناسران.

کوردەکان لەو خاکەدا گردبوونەوە و موددەتی پەنجا و پێنج ساڵ دەوامی کرد هەتا هەمورابییان گرت و کوژتیان و ئەو ڕۆژەیان نێو نا نەورۆژ.

ئەو خاکە ڕۆژ بەڕۆژ ئاوەدان بوو و تەرەقی کرد، هەتا زەمانی ئەسکەندەر. ئەو شارە لە تەرەف ئەسکەندەرەوە بەئاو، قوم کرا و وێران بوو. کە ئەو جێگایە ئەمرۆکە بەدەریاچەی زرێبار (خولمبار) دەناسرێ.

خاکی شارەزوور لە ڕۆژی ناولێنانییەوە هەتا دەوری ئیسلامی عیبارەت بوو لە ئەکباتانەوە شەرقەن و زاخۆ غەربەن و دەریاچەی ورمێ شیمالەن و خاکی بابیل و خاکی ئیلام جنوبەن. بەڵام لە پاش ئیسلامییەت لە قرمیسینە[و] هەتا زێی گەورە و لە جەبەل حەمرینەوە هەتا خاکی موکری، لە دەوری عەباسیەکاندا هێندێک جار خوزستانیش و ئەلوەند و دینەوەر بەشارەزوور دەژمێردران؛ ئەو حاڵە هەتا دەوری چەنگیز دەوامی کرد. هەروەکو لە بەرگی یەکەم و دوویەمی ئەم کتێبەدا باسکران و درێژەی قسەمان پێ دابوو.

لە پاش دەستەڵاتی چەنگیزەکان خاکی شارەزوور بوو بە پێنج پارچە و هەر پارچەیەک چۆمێکی گەورەی کوردستانی کردە تخووب. هەروەکو لە خاپوورەوە هەتا سەر زێی گەورە بە«بادینان» و لە زێی گەورە هەتا زێی گچکە بە«سۆران»، لە زێی گچکەوە هەتا دیالە

بە«بابان»، لە ڕۆژهەڵاتی دیالەوە هەتا هەمەدان بە«ئەردەڵان» وە لە شیمالی زێی گچکەوە هەتا جا خەتوو بە«موکریان» دەناسران.

شارەزوور کە لە پاش ئیسلامێ تخووبی ڕۆژئاوای زێی گەورە بوو، بوو بە چوار پارچە؛ هەریەک کەوتە دەست منداڵێکی نێرینەی بابا ئەردەڵانی کە دامەزرێنەری بنەماڵەی بابان و ئەردەڵان و سۆران و موکریانە؛ هەروەکو لەم کتێبە بەدوورودرێژی لێیان دەدوێم.

قەڵا و شارەزوور کە لە دەست بنەماڵەی باباندا بوو، ئەمانەی ژێرەوە عەرز دەکرێن: «زەڵم» شەمیران، هاوارسیمان، ڕاودان، گوڵعەنبەر، نەوی، مێشیلە، مەهران، تەنوورە، هەولێر، خەفتیزەکان، کلووس، نشکاش، سروچک، سینە، حەسەن ئاوا، قزیلجە، قەرەداغ، شاربازێڕ، دینەوەر، دەرتەنگ، قرمیسین.

## بەندی یەکەم

## حوکمدارانی ئەردەڵان لە شارەزووردا

ساڵی ٤٩٨ حکوومەتی کوردی دوشتیک لە دەست کوڕی جهێردا وەرگەڕا و مەنسوورشاه بەدەست تورکمانەوە بەکوژت چوو. چوار کوڕی لە پاش بەجێما. یەکێکیان کە ناوی فەیروز بوو پەنای بردە لای سەرخابی کوڕی بەدری حەسنەوەی کە پادشای شارەزوور و دینەوەر بوو.

موددەتێک لەنێو عەشیرەتەکانی گۆراندا بەسەرکردەیی ڕایبوارد. ئەو فەیروزە موددەتێکی دوور لە خزمەت ئەو پادشایانە بەسەری برد.

لە پاش ئینقرازی حکوومەتی حەسنەوەی [کە] ساڵی ٦٣٠دا ناوی خۆی نا قوباد ساسان. فەیروزی کوڕی مەنسووری دوشتیک کە لە پێشداش هەوای حوکمداری بنەماڵەی خۆی لە دەماغدا بوو دەجووڵاوە و بەقوباد ساسان ناوبانگی کرد. لەنێو کوردی گۆرانەوە ڕوو بەشارەزوور چوو، بەپەنهانی خەڵکی لەسەرخۆی گردکردەوە و لە چیاکاندا قووەتێکی زۆری پەیداکرد. لە نزیک «گوڵ عەنبەر، هەڵەبجە و خولمبارەوە» ڕوو بەکێو و چیاکان خشا و کەوتە چیایانی ئاوربایەگانەوە.

موزەفەرەدین گوکبەری خێوی هەولێر کە ئەوەی زانییەوە، لەشکرێکی قورسی ناردە سەری و لە نزیک قەڵای «نەوی» لەشکری هەولێر شکا.

ئەو زاتە ڕۆژ بەڕۆژ هێزی پەیداکرد و لە شەرقی شارەزووردا چەند قەڵایەکی خستە دەست. لە ئاوربایەگانەوە لەگەڵ تاتاران ڕێککەوت.

ساڵی ٦٣٦ قوباد لەگەڵ ئەمیر شەرەفەدین جەلالی خێوی هەولێر شەڕێکی کرد و شکا و بەناچاری خۆی گەیاندە نێو گۆران. هەر بەوجۆرە قوباد لە دەسیسە و شەڕ و هجووم ڕانەدەوەستا. تاکو ساڵی ٦٥٦ هەلاکۆ داخیل بەعێراق بوو.

یەشمووت میرزا کوڕی هەلاکۆ لە کرمانشا تەمای عیراقی کرد. قوباد هەستا چوو لەگەڵ یەشمووت خۆی ڕێکخست. حکوومەتی ئێلغازی قوبادیان بەئەمیری شارەزوور قبووڵ کرد.

یەشمووت لەسەر ئەو قەرارە دەستی لە شارەزوور هەڵگرت.

قوباد لە تەرەف هەلاکۆ خانەوە بە«بابا» ناونرا؛ یەعنی بابی گەورە. یەشمووت لەقەبی لەسەر زیاد کرد و پێی گوت بابا ئەردەڵان؛ یەعنی بابە گەورەیکی کە پێی دەڵێن نێر. ئەوجا بەقوبادیان دەگوت بابا ئەردەڵان و ئەو لەقەبەی بۆ بوو بەناو؛ و بەحوکمداری شارەزوور ناونرا. بابا ئەردەڵان لەگەڵ ڕێکخستن و دامەزراندنی حکوومەتەکەی خەریک بوو.

بابا ئەردەڵان لە عەقڵ و تەدبیر و کاربینی و مەشوەرەتدا زۆر تێگەیشتوو بوو. لە زرنگی و ئازاییدا یەکە پیاوێک بوو دڵی کوردەکانی گرت. بەبەخشین و ئازایی ناوبانگی دەرکرد. کەم کەمە لەشکر و گەنجینە و ماڵی زیادکردن. تەواوی شارەزوور پارچەیەک لە قرمیسینی خستەژێر حوکمەوە. لەگەڵ ئێلغازیەکان ئیدارەیەکی چاکی دەکرد. لە ساڵی ٦٧٥دا قوباد مرد. کلۆڵ کە کوڕە گەورەی بوو لە جێگایدا بەحوکمداری دانیشت.

## حوکمداری کلۆڵ کوڕی قوباد بابا ئەردەڵان

کە قوباد مرد، کلۆڵی کوڕە گەورەی بەحوکمداری قەراری گرت و لە دامەزراندنی میللەت و ئیدارەیدا بوو. براکانی نەختێک تەمای سەرکێشیان کرد. کلۆڵ بەتەدبیر و چاکە، زوو فریایان کەوت، پێشی پێ گرتن. مەیدانی بزووتنی پێ وەتەنگهێنان و بێ دەنگی کردن، بەبەخشش نەیهێشت بکەونە کێشەوە؛ بەنەسیحەت دایمەزراندنەوە. کلۆڵ بەبێ شەڕ و ئەزیەت ٢٥ ساڵ بەحوکمداری بەسەری برد و مەملەکەتی بەئاسوودەگی ئیدارە کرد، ساڵی ٦٩٩ مرد.

## حوکمداری خدر کوڕی کلۆڵ

کە کلۆڵ مرد، خدر لەسەر حوکمداریی شارەزوور قەرارگیربوو و دامەزرا و دەستی کرد بەئوموری حوکمداری و لەگەڵ لەشکر ڕێکخستن خەریک بوو. مەملەکەتی ڕوو لە ئاوەدانی کرد و بەرەبەرە لە هەموو لایێکەوە ئاسایش و ڕەعیەتپەروەری دەست پێکرد.

هەتا ساڵی حەوت سەد و بیست دەوامی کرد؛ کە مرد ئیلیاس کوڕی خدر بوو بەحوکمدار. لە پاش ئەو خدر کوڕی ئیلیاس کوڕی خدر لەسەر تەختی حوکمڕانی دانیشت.

لە دوای ئەو حەسەن کوڕی ئیلیاس کەوتە سەر حوکمڕانی شارەزوور. لە پاش ئەو بابلۆی کوڕی حەسەن شەحنەتی شارەزووری دەست کەوت و مرد. لە دوای بابلۆ کوڕی ئەو کە

مونزیر بوو کرا بەحوکمداری شارەزوور.

شەرەفنامە و مێژوونووسەکانی دیکەش هەر بەوجۆرە ناوی ئەو پێنج حوکمڕانەی کوردانیان نووسیوەتەوە. کەسێک سەربهورد و وەقایعی ئەوانەی شەرح نەکردووە؛ ئێمەش هەرچەندە لە تەواریخاندا گەڕاین چتێکمان لە سەربهوردی ئەو حوکمدارانە دەست نەکەوت کە لەم کتێبەدا لێی بدوێم؛ هەروەکو مێژوونووسەکانی دیکە بەکورتی باسمان کردن. بەڵام لە شەرەفنامە و «ناسخ التواریخ»دا ئەوەندە نووسراوە کە ئەو پێنج حوکمدارانەی کوردان، سەد و پەنجا ساڵ بەحوکمداری و بەشەوکەتەوە ڕایانبواردوە و لە هێندێک تەواریخانیشدا بە سەد و پێنج ساڵ قەیدکراون.

هەر مێژوونووسێک کە هاتۆتە باسی ئەو پێنج حوکمدارانە بەمەوهومی و بێ دەنگی و بەبێ دیقەت باسیان کردوون؛ هەرچەندە زاندراوە کە بەڕاستی سەد و پەنجا ساڵ لە کوردستانی شارەزووردا حوکمداربوون و خاوەند لەشکر و سوپاه و ڕەعیەت و بەیداغ و ئیدارە و سەرکردە و ئالەتی شەڕ و کوژتار بوونیان بێ شوبهەیە، وە لەگەڵ حکوومەتی مەغۆل و ئیلخانی و هی دیکەشدا عیلاقەدار بوون.

## حوکمداری مەئموونی کوڕی مونزیر کوڕی بابلو

مەئموون کە مونزیری بابی مرد، بوو بەحوکمداری شارەزوور و بەبێ شەڕ و کێشە و ئەزیەت لە ڕێکخستنی مەملەکەت و دامەزراندنی میللەت و ئومووری ڕەعیەتپەروەری خەریک بوو. بەئیستیقلالییەت و ئازادی لەشکر و سوپاهێکی ڕێککەوتووی بەهەموو ئالەت و چەک و پێویستەوەی دانا و بۆ ئاسوودەگی مەملەکەت و تێک [نە]چوونی ئاسایش، پاسەوان و سوپاهیانی بەکاربرد. مەئموون بەدەوڵەت و حەشم و لەشکر زۆری لەنێو کوردستاندا ناوبانگی کرد، بەپیاوەتی و ئازایی و سەخاوەت و بەخشش لە ڕابردووەکانی زیاتر شوهرەتگیر بوو.

ساڵێ کە ئەمیر تەیموور و گورەکانی ڕووی لە خاکی کوردستان و شارەزوور کرد، مەئموون لەگەڵی کەوتە موخابەرەوە. بەموسالەمەت و سوڵح قەراریان دا. بەتەدبیر و فیکر پێشی بەئەمیر تەیموور گرت و نەیهێشت سێڵاوی غەزەبی تەیموور بەسەر کوردستانی شارەزووردا بێتەخوارێ و مەیدانی نەدا شۆڕش و خراپی بکەوێتە خاکییەوە. لە پاش سوڵح لەگەڵیان، ئەمیر تەیموور فەرمانی ئیستیقلالییەتی شارەزووری بۆ مەئموون نووسی و تەسدیقی کرد.

مەئموون هەتا ساڵانی هەشت سەد و حەفتا و یەک بەئازادی لە کوردستاندا حوکمڕانی کرد. کە مرد سێ کوڕی لە پاش بەجێما: یێک بێگە بەگ، دووەم سورخاب، سێیەم مەحموود.

مەئموون لە زەمانی خۆیدا هەموو موڵکەکانی بەسەر کوڕەکانی دابەشکرد. بێگەبەگ - کە کوڕە گەورەی بوو- لەسەر قەڵایانی: (زەڵم، تەفسوو، شەمیران، هاوار، سیمان، راودان، گوڵعەنبەر حوکمداری کرد.

قەڵایانی : لۆی، مشیلە، مهروان، مەریوان، تەنوورە، کلۆس، نەشگاشی خستبووە ژێر فەرمانی ئەمیر سورخابی برایەوە و باقی خاکەکانی دیکەی بەسەر کوڕە گچکەکەی کە مەحموود بێگ بوو بەش کرد.

## حوکمداری بێگە بەگ کوڕی مەئموون بەگ

بێگەبەگ لە زەمانی بابیدا وەکیل و وەلیعەهد بوو. کە بابی مرد لە جێگای بابیدا بەئوموری حوکمداری شارەزوور دامەزرا و قەڵای زەڵمی کردە پایتەخت و براکانی بەرێکی لەگەڵی پێکهاتن و سورخابی مامی دیسان بەخۆشی کەوتە ژێر ئەمری برازایەوە. بەیەکدڵی و یەکدەستی لەگەڵ حوکمداریی خەریک بوون و بەبێ کێشە براکان و مامی هەر یەکەی لەسەر خاکێ کە لەژێر ئەمریاندا بوو، بەئەمارەت لەژێرحوکمی بێگە بەگدا رایاندەبوارد و لە رەعیەتپەروەری و ئاوایی کردنی شار و مەملەکەتان دەکۆشا. بەتیجارەت و چاندن و کێلان، میللەتەکەیان هەوادار کردبوو.

بەخۆشی موددەتی چل و دوو ساڵ حکوومەتی بێگەبەگ بەئیستیقلالی ڕاییوارد.

کە مرد دوو کوڕی لە پاش بەجێمان؛ یێک ئەمیر ئیسماعیل، دووەم مەئموون.

لەو زەمانەدا شارەزوور لە عیلم و سەنعەت گەلێکی تەرەقی کرد و دێهات و شار و قەڵاکانی زۆر بەنفووس و دەوڵەمەندبوون.

## حوکمداری مەئموونی دووەم کوڕی بێگە بەگ

کە بێگەبەگ مرد، مەئموون کە کوڕە گەورەی بوو لەسەر مەسنەدی حوکمداری دامەزرا و دەستی بەئوموری مەملەکەتداری و ڕەعیەتپەروەری کرد. لەگەڵ کاروباری حکوومەت خەریک بوو.

لەولاوە سلێمانی قانوونی سوڵتانی ڕۆم دەستی بەکوردستان گرتن کرد و لە هەولێر زستانێک ڕایبوارد.

مەئموون بەهێندی نەگرت و ئەهەمییەتی پێ نەدا و بەهیچ کلۆجێک وجوودی نەزانی. سوڵتان سلێمان لەو موددەتەدا کە لە هەولێر ماوە، چاوی لە شارەزوور بڕیبوو؛ بەڵام چونکە قووەتی لە دەستدا نەبوو، لە دڵی خۆیدا ڕاگرت و لە هەولێرەوە چووە بەغدا و گەڕاوە ئەستەمبووڵ. سوڵتان سلێمان کە گەیشتە ئەستەمبووڵ قاقەزی بۆ هەموو ئومەراکانی کوردستان نووسی کە لەژێرفەرماندەی سوڵتان حوسێنی ئەمیری ئامێدیدا بچنە سەر شارەزوور.

سوڵتان حوسێن لە ئومەرایانی کوردی شیمالی و بادینان گێڕاوە ولەشکرێکی قورسی لە کوردستان کۆکردەوە و ڕوو بەشارەزوور کەوتە ڕێگا.

مەئموون بەگ لەولاوە لەشکری خۆی وەخڕ کرد و پێشی پێ گرتن. لە دوای شەڕ و کوژتارێکی بێ ژمار، مەئموون بەگ لە قەڵای زەڵمدا خۆی قایم کرد و چووە پێش سوڵتان حوسێن. لە مەیدانی کوژتاردا دوو برای کورد بۆ بێگانە شیر و خەنجەری تیژ و بڕندەیان تێکنا. لەسەر کیسەی دوژمن هەردوولای کورد گەلێکیان لە یەکتر کوژت.

سوڵتان حوسێن کە تەماشای کرد دەرەقەتی نایێ، فێڵبازیی خستە پێشەوە و داوای مامڵەتی کرد و قاقەزێکی پەندئامێزی بەناوی دینەوە بۆ مەئموون بێگ نووسی کە ئیتاعە نەکردنی خەلیفەی ئیسلام، بۆ ئیمان ڕەخنە و سووکی دەبەخشێ. بەو دەسیسەیە مەئموون بێگ خەڵەتاندرا و بەوەی کە سوڵتان حوسێن ئەمیرێکی خۆشەویستی کورد بوو، باوەڕی پێ هات و لەگەڵی ڕێککەوت.

لە پاش ئیتفاقکردن و شرووت دانان، مەئموون دەرگای قەڵای کردەوە و سوڵتان حوسێنی میوانداری کرد و چەند ڕۆژێک بەئاسوودەگی ڕایبوارد. سوڵتان حوسێن ڕووی لە مەئموون کرد و پێی گوت ئەمڕۆکە بۆ تۆ واچاکە سوار بی و بچیە ئەستەمبووڵ و من دەرعوهدە دەبم بەکەیف وشادمانی بگەڕێتەوە سەرئەمارەتی خۆت. بەهەر فێڵێک بوو مەئموون بەگ خەڵەتاندرا، لەگەڵ ئیسماعیل بەگی برای هەستان چوونە ئەستەمبووڵ.

لە بەختی ئەوان وای تەسادوف کرد لەودەمەدا حکوومەتی عوسمانی لە دەست حکوومەتی سەفەویدا شکستەیان تێکەوتبوو. لەشکری ئێران ڕوو بەئەرزەڕۆم ڕۆیشتبوون و عێراقی عەرەب کەوتبووە تەهلوکەوە.

عوسمانییەکان لە خودایان دەویست یەک لە ئەمیرانی کورد ببێتە هەواداریان. لەبەرئەوە سلێمان قانوونی مەئموون بەگی نوازش کرد و بەخەڵاتکردن دڵخۆشی داوە، وە لیوای حیللەی بەبەرەی و مولکیەت پێ بەخشی و فەرمانی بۆ نوویسی و لیوای حیللە کە لە ئەترافی بەغدایە بەموڵکی درا بەمەئموون بەگ و لیوای «سرووچک» (کەرکووک) بۆ ئیسماعیل بەگ قەرار درا و هەردوو برا بەدڵێکی شادەوە گەڕانەوە سەر لیواکانی بێژرا و دەستیان بەئومووری حکوومەت کرد.

ئەگەر لەودەمانەدا کە مەئموون بەگ گەیشتە ئەستەمبووڵ وەزعییەتی عوسمانییەکان لە دەست ئێراندا دووچار بەشکستە نەبووایە، ئەو دوو ئەمیرەی کوردان بەساغی لە دەست سوڵتان سلێمان ڕزگار نەدەبوون و هەردووک دەکوژران؛ بەڵام بەخت چارەیان هاواڵ بوو کە عوسمانیی موحتاجی ئەو دوو ئەمیرانە نەبوون.

## حوکمداری سورخاب بەگ

ئەمیر سەرخاب کە مامی مەئموون بوو، وەختێ چاوی بەبرازاکانی کەوت کە لەگەڵ مامڵەتیان چوونە ئەستەمبووڵ، وایزانی جارێکی تر لە دەست سلێمانی قانوونیدا ڕزگاربوونیان نابێ. بەناچاری لەگەڵ شاە تەهماسب سەفەویدا دەستی بەموخابەرە کرد و لە تەکیا ڕێککەوت و گرێی ئیتفاق و دۆستایەتیان بەست.

سەرخاب لە شارانی نەوی، مێشیلە، مەریوان، تەنوورە، کلوس، نەشگاش لەشکری کۆکردەوە و چووە سەر خاکی برازاکانی و ئەوانیشی گرت و خستنیە ژێر فەرمانی خۆیەوە. لە پاش دامەزراندنی ئومووری حکوومەتیی و لەشکریی و نوازشی ئەهالی، دەستە لەشکرێکی هەڵگرت و چووە سەر محەمەد بەگ کە برای خۆی بوو بەئەزیەت خستیە دەست و مەملەکەتی ئەویشی خستە سەر خاکی خۆی و بەچاکی تەپڵی ئازادی و سەربەخۆیی لێدا.

ئەمیر سورخاب ڕۆژ بەڕۆژ قووەت و هێزی پەیدا دەکرد و ئەتا دەچوو لەگەڵ شا تەهماسپدا دۆستی و خۆشەویستی زیاد دەکرد.

خاکی شارەزوور لەودەمەدا ڕووی لە ئاوایی و تەرەقی کردبوو، لەشکر و سوپاهێکی ڕێککەوتووی لەژێر چەکدا هەمیشە ئامادەبوو. لە چاندن و کڕین و فرۆتندا گەلێک پێشکەوت بوو.

حکوومەتی عوسمانی گەلێک دەسایس و فێڵ و حیله و چاووڕاویان کرد کە بیخەنە دەست، نەیانتوانی و نەکەوتە داو و فێڵەوە. لە نەتیجەدا ناچاربوو بناغەی دۆستایەتی و ئیتحادی لەگەڵ دامەزراند و حکوومەتیی بۆ تەسدیق کرد.

لە ساڵی ٩٦٥دا ئەلقاس میرزا برای شاە تەهماسب لە پێشدا پەنای بۆ حکوومەتی عوسمانی بردبوو کە سلێمان قانوونی یارمەتی بدات بۆ چوونەوە ئێران و بوونە پادشا. بەو ئومێدە چەند موددەتێک بەبێ کاری و نەگەیشتنە دڵخواز دەسووڕاوە؛ لە دواییدا سلێمان قانوونی تکانامەیەکی بۆ ئەمیر سورخاب نوویسی کە ببێتە نێوبژی لە نێوان ئەلقاس میرزا و شاە تەهماسبدا؛ بەجۆرێک بکۆشێت کە تەهماسب، ئەلقاس میرزا بەبێ ئەزیەت و سەرزەنشتێ پێ بەخشێت و لە گوناهی خۆش بێ.

ئەمیر سورخاب لەو بابەتەوە دەستی بەموخابەرەکردن کرد و پیاوی لەنێوانیاندا هاتوچوو. هەتا بەجارێک ئەمنیەتی لە شاتەهماسب وەرگرت کە لە گوناهی ئەلقاس میرزا بهوردووە، بەچاکی دڵی پاک کردۆتەوە.

لەولاوە ئەمیر سەرخاب پیاوێکی ئەمینداری خۆی لەگەڵ ئەلقاس میرزا خست و ناردیە ئێران. کە گەیشتە خزمەت شاە تەهماسب، لە دوای چەند ڕۆژێک شاە تەهماسب بەرئاوەژووی وەعدەکەی کرد و ئەلقاس میرزای گرت و بەزنجیر و پاڵەهەندەوە ناردیە قەڵای قەهقەهە و حەپسی کرد.

لەولاوە ئەمیر سەرخاب کە لەوە ئاگاداربوو زۆر وەتەنگهات و دڵگیربوو، وە لە بزووتنەوەی تەهماسب ڕقی هەستا و دەستی بەلەشکر کۆکردنەوە کرد کە پەلاماری ئێران بدات.

لەولاوە تەهماسب لە بزووتنەوەی ئەمیر سەرخاب هوشیار کراوە و زۆر زوو فریاکەوت و چەند پیاوێکی زانا و کارپەزێری خستە نێوانێ کە مەیدان بەشۆڕش نەدرێ. بۆئەوە پیاوەکان چوونە لای ئەمیر سورخاب و بەهەر کلۆجێک بوو پێکهاتن و لەسەر ئەوە ئیتفاقیان کرد کە ساڵی لە گەنجینەی تەهماسب دە هەزار تومەن زێڕ بدرێتە ئەمیر سەرخاب و بەو دەستوورە ڕێککەوتن.

لەپاش ئەو موعاهەدەیە حکوومەتی شارەزوور بەبێ دەسایس دەژیا. هەرچەند لە پێشدا ئەمیر سورخاب بۆ پشتیوانی یارمەتی لەگەڵ ئێران نوازش و منەتدارێکی هەبوو، لەبەر ڕۆژێکی تەنگ چاوپۆشی لە گەلێک چت دەکرد. لە پاش موعاهەدە ئەوانیشی فرێدا و لە

هەمـوو دەسیـسـەیەک بێبـاک بوو؛ بانـگی سەربەخـۆیی و جاری ئازادی بەگـوێی دۆست و دوژمندا کێشا.

ئەمیر سەرخاب ئەگەرچی بۆ بەرابەری و هەڵمەتدانی سەر دوژمن هەمیشە لە نمایشدا بوو و خـۆی دەنواند، بەڵام لە ڕەوشـتـیـدا شـەڕ و فـیـتـنە و شـۆڕش نەبوو؛ هەمـوو دەمـێک حـەزی لـە ئاسـوودەگی و بێ ئەزیەت و دڵ نەڕەنجی دەکـرد. بەوجـۆرە مـوددەتی شـێـست و حەوت سـاڵ بەئیـسـتـیـقلالیـەتی تەواو ڕایبوارد و بەحـوکـمداری کـوردسـتـانی شـارەزووری بەسەربرد و بەئامورزشی خودا شادبوو.

یازدە کوڕی لە پاش بەجێما: حوسێن، ئەسکەندەر، سوڵتان، عەلی، یەعقووب، بارام، بسات، زولفوقار، ئاسلمش، تەهـ سوار، سارۆ، قاسم).

## حوکمداریی ئەمیر محەمەد کوڕی مەئموون

ئەمـیر مـحـەمـەد کە بـاب و مـامی مردن، بەلەز لەشکرێکی ڕێکخست و چووە سەر حیللە و گرتی و گەڕاوە سەر سرووچک و خـسـتـیـە ژێر پەنجەوە. حکوومـەتێکی ڕێککەوتووی لەو دوو پارچە خـاکـەدا دامـەزراند و لەگەڵ ئومـووری ڕێککەوتنی دەکـۆشـا و زۆر بەتالووکەوە قووەت و هێزی پەیداکرد و لەشکر و پێویستی ساز کرد و بۆ پێشکەوتن تەقەلای دا کە لە خاکی خۆیدا کار و ئیشی ڕێکخست و دەستی بەڕەعیەتنەوازی و دادخواهی کرد، میللەت و سوپاهی بەدان و بەخشـینی شـادکردن. ئەوجـا لەشکرێکی شـەڕکەر و دلێری هەڵگرت و چووە سەر خـاک و زەوی مـامی کـە شـارانی قەرەداغ، شـاربازێڕ، ئالان، مـەهران، دلجـۆران بوون. لە پاش کەمێک شەڕ و ئەزیەت میللەتەکەی بەمەرج و قـسەی پیـاوان ئاسوودە کرد و ئەو شارانەی گرت و خستییە سەرخاکی کە لەژێر پەنجەی دابوو. کە ئەو خاکە پیرۆزەی کوردستانی بەئەمنییەت و ئاسوودەگی ڕێکخست، قاقەزێکی لە سلێمان قانوونی نوویسی کە خاکی میراتی باب و باپیر و مام و برایانم بەزۆری باسک و قۆڵی خۆم خستەوە ژێر حوکمی خۆم. پێویستە بەحوکمدارێکی کوردستان و شارەزوورم بناسن و ئیستیقلالییەتی تەواوم بۆ تەسدیق بکەن.

سوڵتان سلێمانی قانوونی لەو ئەمیرە تازە پێگەیشتووی وریا و زەبەردەستە ترسی لێ پەیدابوو و کەوتە ئەندێشەوە؛ ناردیە سەر سەدری ئەعزەم ڕۆستەم پاشا و میـری میران عوسمان پاشا تاکو لەشکر کۆبکەنەوە و پێویستی چوون و تێشووی ڕێگا سازکەن و بۆ پەلاماردانە سەر میر محەمەد بکەونە ڕێگا و وەڵامیشی دا بەهەموو میر و حوکمدارەکانی

کوردستانی شیمالی کە بەلەشکری کوردانەوە بچنە کۆمەگی و یارمەتی میری میرانی بەغدا و بەهەر کلۆجێک بێت، خاکی شارەزوور لەژێر پەنجەی میر محەمەد دەرخرێ و بکرێتە خاکێکی بەتایبەتی عوسمانی و لەژێر گەڕان و چاوەدێری بەغدایا بەخێو بکرێ. لەسەر ئەو ئەمرە لە هەمووولاییێکەوە لەشکر بۆچوونە سەر میر محەمەد کۆبوونەوە و بەهێز و تەوانایەکی تەواوەوە چوونەسەر قەلاّی زەلّم کە پایتەختی ئەمارەتی میر محەمەد بوو.

میر محەمەد کە لەوە ئاگاداربوو، لەشکری خۆی کردە چەند قۆلێک و پێشی بەدوژمن گرت و شەڕ و کوژتار و خوێنڕێژی، دەست پێکرا. موددەتی دوو ساڵ لە تخووبی شارەزووردا جەنگ و جیدال و شەڕ و کوژتار بوو. هەرچەندە دوژمن کۆشا و تەقەلای دا دەرقەتی میر محەمەد نەهات و نەیتوانی بستێک لە تخووب دەربازبێ.

میر محەمەد بەپەنهانی لەگەڵ شاە تەهماسبی سەفەوی ئیتفاقێکی دۆستانە و موعاهەدەیەکی سوێندخواردنی گرێدا کە لە شەڕی ئەمین بێت. شاهی بێژراو لە هەموو پێویستییەکدا یاریدەی دەدا و بەپەنهانی هێزی دەدایێ.

میر محەمەد لەو موددەتی شەڕوشۆڕەدا بەمەرگی خۆی مرد. سەرکردەکانی سوپاە نەیانهێشت ڕۆستەم پاشا لە مردنی میری کوردان ئاگادار بێ. بەمەرگە بەرابەریان دەکرد وە مردنی میر محەمەدیان شاردەوە. ڕۆستەم پاشا لە پاش دوو ساڵ شەڕوکێشە ناچاربوو دەستی لە شارەزوور گرتن بەردا و کشایەوە پاشێ؛ بەلەز لەشکری ڕوو بەبەغدا سووڕاندەوە و لە ڕێگا بەمەرگ گورفتار بوو. کە خەبەری مردنی ڕۆستەم پاشا بەئەستەمبووڵ ڕاگەیشت، باڵتەچی محەمەد پاشایان بۆ گرتنی شارەزوور تەعیین کرد و سەلاحییەتێکی تەواویان پێدا.

باڵتەچی بەڕق وتوندیەوە لەشکرێکی قورسی هەڵگرت و ڕوو بەشارەزوور خشا. لەودەمەشدا شارەزوور بێ گەورە و سەردار مابۆوە. باڵتەچی شیری غەزەبی لە کوردان نا، بەکوژتار و ئاوەدانی وێرانکردن و زگی منداڵ و ژن هەڵدڕین دەستی بەگرتنی کوردستانی شارەزوور و ئەردەلاّن کرد. ساڵی نۆسەد و شێست و نۆی هیجری هەموو خاکی شارەزوور و ئەردەلاّنی بەوێرانکردن خستە ژێر حوکمەوە. کوردستان دووچار بەلەقەیەکی گەورە بوو و گەلێک پیاوانی ناوداری بەقەنارەدا کران.

هەروەکو لە پێشدا گوترا سورخاب بەگ بەتەنێ حکوومەتێکی تەشکیل کردبوولە دەوری حوکمڕانی حیللە و سرووچکدا بۆ خۆیان بەئازادی دەژیان و لەگەڵ حکوومەتی ئێراندا

ڕێک کەوتبوون. باڵتەچی شارەزووری گرت، نەیتوانی دەست باوێژێتە ئەو خاکەوە، گەلێک تەقەلای دا و کۆشا، نەشیا بیگرێت.

## حوکمداری سوڵتان عەلی کوڕی سورخاب

ئەمیر سولتان عەلی کە سورخابی بابی مرد لەسەر حکوومەتی خۆی قەراری گرت و دەستی بەحوکمداری کرد. زۆر نەژیا و گەلێک دەوامی نەکرد. سێ ساڵ بەبێ کێشە بەئوموری ڕەعیەتپەروەری ڕایبوارد و مرد و دوو کوڕی لە پاش بەجێمان: یەک تەیموورخان، دووەم هەڵۆ.

## حوکمداری ئەمیر بسات کوڕی سورخاب

کە سولتان عەلی مرد، ئەمیر بسات لەسەر تەختی حوکمداریی دانیشت و دەستی بەکار و پیشەی حکوومەت کرد. تەیموورخان و هەڵۆ هەردووک پەنایان بۆ حکوومەتی ئێران برد و چوونە لای مونتەشا سولتان ئەستاجلوو کە سەرداری سوپاهی ئێران بوو. ئەویش مەسەلەی بەشا ئیسماعیلی دووەمی سەفەوی ڕاگەیاند؛ بەڵام کاروبار نەکەوتە کۆشەوە، هەروەها ماوە. هەرچەند مونتەشا سولتان کۆشا بۆ ئەو دوو ئەمیرانە هیچی بۆ نەکرا. بەڵام ئەمیر بسات هەر لەگەڵ حوکمداری و ئیشوکاری مەملەکەتداری خەریک بوو، بۆ ڕیکخستنی ڕەعیەت و شار و دێهاتانی خاکی خۆی بەگەرم لە جووڵانەوە دابوو و دڵداری دەکرد.

تەیموورخان و هەڵۆ لە ئێراندا هەرچەند کۆششیان کرد نەیانتوانی ببزوونەوە؛ بەڵام لە هاودەنگ زیادکردن دەکۆشان. بەوجۆرە هەتا شا ئیسماعیلی دووەم مرد بەپەنهانی هاواڵ و هاودەنگیی بۆ خۆی پەیدا دەکرد و لەگەڵ گەلێک ئومەرا و کاربەدەستانی ئێران ببوون بەیەکدڵ و ڕێککەوتوو. وە بۆ کوردستانیش وەلامی هەر لە هاتوچووندا بوون. پشتیوان و یارمەتی لێیان دەویست.

بەو چەشنە لە تەقەلادا و ئیش دابوو، کە شا ئیسماعیلی دووەم مرد؛ بەگورجی لەشکرێکی جوان و شایستەی پێکەوەنا و دەستی بەسەرکێشی کرد و لە هەمووولایێکەوە پەلاماری ئاوایی و شار و دێهاتانی دا و ڕووی لە خاکی مامی کرد و لەشکری بۆ پێشەوە ئاژۆت.

ئەمیر بسات لەولاوە کە زانی تەیموورخان و هەڵۆی برازایانی ڕوو بەخاکی کەوتنە ڕێگا،

لەشکری خۆی دەنگدا و چووە پێشیان. هەردوولا مام و برازا بۆ یەکتر کوژتن خەنجەریان تیژکرد و شیری بێدادیان تێکنا و دەستیان بەکوژتارکرد. لە نەتیجەدا تەیموورخان بەزۆری بازووی گەلێکی زەوی و خاک لە مامی گرت و لینگی دایە سەر چەند نوقتەیەکی عەسکەریی عوسمانیان کە لە خاکی شارەزووردا بوون و کوژتنی و تالان و ئەسیرێکی زۆری لێگرتن. بەوە کاروباری تەیموورخان ڕۆژ بەڕۆژ ڕوو لە بەرزی و چاکیی بوو. بەو تەرزە چەند جارێک پەلاماری دوژمنی دا و عوسمانیەکانی بەزۆریی شیر لە شارەزوور دەرکردن و ماڵ و ئەسپاب و ئالەت و چەکێکی بێ ژماری لێ وەدەست خستن و خاکی خۆی لە دوژمن پاک کردەوە.

تەیموورخان لە پاش ئەوە کە پشتی عوسمانییەکانی لە شارەزوور شکاند و لەشکر و ماڵی فرەکرد و هێزی پەیدا کرد، دووجاری دیکە پەلاماری مامی خۆیدا کە ئەمیر بسات بوو، شکاندی و هەموو هێز و داراییەکی کە هەیبوو لێی گرت و هیچی لە دەستدا نەهێشت.

لەودەمەدا پەیدابوونی تەیموورخان لە کوردستاندا بوو بەمایەی لەقەیەکی گەورەدان لە پەراسووی حکوومەتی عوسمانی، وەشکستەی ئەمیر بسات بوو بەشکانی عوسمانی؛ چونکە ئەمیر بسات لەسەر کیسەی ئەوان دەکۆشا نەک بۆ میللەتی خۆی. عوسمانییەکان ئەمیر بساتیان بۆ خۆیان دەژمارد و ڕۆژ بەڕۆژ بەوەوە لە شارەزووردا بنچینەیان دادەمەزراند و هێز و تەوانای خۆی دەخستە کوردستانەوە و بەهەموو جۆرێک دەستدرێژیان دەکردە سەر موڵکی کوردەکان، هەروەکو پێشڕەوی [قەمڕان (؟)] بوو. بەڵام ئەمیر تەیموورخان ڕێگای ئەو ئومێدەی لێ بڕین و تەماعی لەو خاکە پیرۆزە و جوانەی کوردستانی شارەزووردا لێی گرێدان.

## حوکمداری ئەمیر تەیموورخان کوڕی سوڵتان عەلی

ئەمیر تەیموورخان کە خاکی باب و باپیری خستەوە ژێر حوکمی خۆیەوە، بەداد و ڕەعیەتپەروەری ناوبانگی کرد و لەگەڵ حکوومەتداری و سوپا کۆکردنەوە خەریک بوو وە بەهەموو ئاواییەکی خاکی خۆیدا دادخواهی ڕاخست، کە بەشانوشەوکەتی دۆستانی بەبەخشین و دوژمنانی بەهەڕەشە ڕاگرت.

ساڵی ۹۸۸ھ سوڵتان موڕادی سالیس حوکمداری عوسمانی لە ئەمیر تەیموورخان کەوتە ئەندێشە و ترسەوە، لە ئەستەمبووڵەوە لەشکریکی قورسی ڕێکخست و بۆ مووسڵی نارد

که بچنه سەر ئەمیر تەیموورخان. لەشکری عوسمانی لە مووسڵەوە ڕوو بەهەولێر لە دەژلە پەڕیەوە.

لەولاوە ئەمیر تەیموورخان سوپاهێکی گورجوگۆڵی کوردستانی هەڵگرت و چووە پێش دوژمن. لە پاش کوژتاری دوو شەو و دوو ڕۆژان، کوردەکان بەسەر دوژمندا زۆرداربوون و لە ڕاست و چەپییەوە پەلاماری ڕیزی عەسکەری دوژمنیان دا و تێکیان پێچان و بەشکانێکی پیس هەڵیانقەند و ڕڤاندیانن.

لەو ڕۆژەدا عوسمانیەکان هێندە بەپەلە هەڵاتن ئاگایان لەمە نەبوو کە دەمەدەمی بەهارە و زێی دەژلە لافاوی دێتەخوارێ و ئەمبەرەوبەری چۆمی پڕ ئاو کردووە و بواردان نابێ و لە زێی گەورە پەڕینەوە هیچ نەدیتراوە. بەناچاری گەلێکیان بەسواریی ملیان لەو دەریا و ئاوە نا کە گۆیا دەپەڕنەوە، هەموو بەئاودا ڕۆیینە خوارێ و بەشی زۆریان کوژران و بەدیل گیران.

کوردەکان بەکەیف وشادمانی و تالانێکی زۆرەوە گەڕانەوە هەولێر و لەشکری عوسمانی ئەوەندەی ڕزگاربوو، بەپەرێشانی بەر بەمووسڵ هەڵاتن.

که سوڵتان مورادیان لەوە ئاگادار کرد، زۆری پێ تێکچوو و نەتیجەی ئەوەی بەفاڵێکی چاک نەکەوتە بەرچاو. نفووسی خۆی و دەستەڵاتی لە عیراق و عارەب و ئاوربایەگاندا بەشپرزەیی کشانەوە پاشێ و کەوتە بیردەوە و هێز و بەرزی تەیموورخانی لە بەرابەر خۆی و سەفەری ئێراندا بەدیوارێکی ئەستوور و پان و پڕ لە چەکی لە لادا زل و قورس و هەڵماساو بوو. بزووتنی تەیموورخان لەپێش عەسکەریدا و شکانی عەسکەری عوسمانی بەمەیدان فرەکردن بۆ دوژمن و سەرمەشقی شەڕی ئێران لەگەڵ عوسمانی زانی. لەبەرئەوانە کە هەموو ڕاست و دروست بوون سوڵتان موراد ناچار ما کە خۆشەویستی و نوازشی بکاتە بەرهەڵستی ئاشووب و جەنگ و جیدال.

بۆ بەدڵخواز گەیشتن، گرتی قاقەزێکی پەند ئامێزی بۆ ئەمیر تەیموورخان نوویسی کە ئەوا خۆت نواند و شانوشەوکەتی تۆ شایانی حوکمداری و گەورەیی و پیاوەتییە، ئەوا خەلاتێکی میری میرانی و فەرمانی حوکمداری شارەزوورم بۆ ناردی و تکای قبووڵ دەکرێت.

سوڵتان موراد فەرمانێکی میری میران و حوکمداری بەتوغرای دەوڵەتیی بۆ نوویسی و ئالا و تەپڵی لەگەڵ شیرێکی بەگەوهەر ڕازاوەی بۆ نارد و بەتەیموورخان پاشا ناوی برد.

که ناردراوەکان بەدیاریی و خەڵات و ڕوتبە و نیشان و فەرمانەوە گەیشتنە لای تەیموورخان، بەئیحترامەوە قبووڵ کران.

که ئەمیر تەیموورخان ناردراوانی سوڵتان موڕادی قبووڵکرد، قاقەزێکی لە جوابدا نوویسیەوە کە بەشەرتی ئەمە ئەو ڕوتبە و خەڵاتە قبووڵ دەکا، چوار کوڕی خۆی هەریەک لەسەر پارچە خاکێک بەمیریان بناسێت و دەستەڵاتی کەسیان بەسەرا نەبێ و تەیموورخان حوکمدارێکی سەربەخۆی سوێندخۆر بێ لەگەڵ عوسمانیان و لە ئومووری مەملەکەتداریدا ئازاد و موستەقیل خۆی ڕابگرێت و لە وەختی پێویستدا هەردوو لا یاریدەی یەکتری بدەن وە ئەگەر تەیموورخان لێی قەوما، حکوومەتی عوسمانی چ بەدراو و چ بەعەسکەر کۆمەگی بکات.

بەوجۆرە گەلێک لە نێوانیاندا نووسراو و پیاو هاتوچۆیان کرد، لە دواییدا سوڵتان موراد مەنشوورێکی بەدڵخوازی تەیموورخان نوویسی و بۆی نارد و تخووبی خاکی تەیموورخانیان دیارکرد و خاکی هەر چوار کوڕەکانی دامەزراند و ئەوانیشی لە دەستوورێک گرێدا کە لەژێر فرمانی ئەودابن؛ تاکو دوژمن نەیانکاتە ئالەتی دەست و هیچ دەسیسەیەک لە نێوانیاندا کار نەکات و خاکی کوڕەکانی بەم جۆرە دابەشکردن:

١- سنە و حەسەن ئاوا و قزیلجە، بۆ سوڵتان عەلی

٢- میهرەوان و مەریوان بۆ میر موراد ومیر بۆداغ.

٣- شاربازێڕ و دینەوەر، بۆ بەدرخان

تاکو ئەو قەرارە درا لەشکرێکی بردەسەر دینەوەر و بەزۆر لە دەست قزڵباشانی دەرخست و هێنایە ژێر حوکمی خۆیەوە و ئەویشی دا بەبەدرخانی کوڕی. بەو چەشنە کوڕەکانی لەسەر ئەو جێگایانە دامەزراند و جێگای خۆشی -کە شار و قەڵای زەڵم بوو- لە ڕێکخستن و ئاواکردنی دەکۆشا.

لەودەمەوە خاکی شارەزوور کرایە دوو بەش، دوو ناوی لەسەر داندرا؛ یەکێک بوو بەبابان و دووەم بوو بەئەردەڵان. هەروەکو لە پێشدا باسکرا ئەو دوو نێوانە ناوی قوبادی باپیرە گەورەیان بوو. ئەمیر تەیموورخان پاشا ئەو نێوەی باپیرەی لەتکرد (بابا - ئەردەڵان) ناوی بابا درایە خاکی ئەو سێ کوڕانەی کە میر بۆداغ و میر موراد و میر بەدرخان بن؛ شارەکانی سوڵتان عەلیش کە سنە و حەسناوا و قزیلجە بوون، بەئەردەڵان، ناوی لێنان و لە قانوونێکی زۆرچاک گرێی دان کە نەتوانن ببزوونەوە.

تەیموورخان پاشا بەڕاستی زۆر بیرتیژ و چاو لە بڵندی و ڕوو لە بەرزبوونی هەبوو؛ گەلێک وردبینی و دوور ئەندێشی دەکرد. چونکە لە ئێراندا سەفەویەکان دەم بەدەم هێزیان پەیدا دەکرد، لەولاشەوە عوسمانییەکان بۆ مەسڵەحەتی کار و ئیشی پارازتنی خۆیان ، تخووبیان پڕ لە موهیمات دەکرد ، لەبەر ئەوانە تەیموورخان پاشا بۆ خاکی خۆپارازتن، ناچاربوو کە مەملەکەتی بکاتە دووبەش: یەکی بۆ پێشهەڵستی ئێران و دووەمی بۆ بەرابەریی عوسمانی. وای بەچاک زانی کە ئەو دوو پارچەیە هەریەک لەگەڵ یەک لەو دوو حکوومەتە زەبەر دەستانە بخاتە عالەمێکی سیاسییەوە و ڕابیتەیەکی خسووسی پێ دابمەزرێنێ؛ تاکو هەریەک بەواسیتەی یەکەوە بتوانن بژین و دووچار بەشکستە و نەبوون نەبن.

ئەو ئەندێشەی تەیموورخان پاشا ، خاکی شارەزووری بەدوو ناونا کە یەکێک بابان و دووەمی ئەردەڵان، کردە دووپارچە و لە نەتیجەدا ئەردەڵانییەکان هەمیشە سیاسەتی خۆیان لەگەڵ ئێران و بابانییەکان لەگەڵ عوسمانییەکان ڕادەگرت و لە وەختی تەنگی و لێقەوماندا یەکتریان بەخێو دەکرد و بۆ کۆمەگی و یارمەتی دەستی یەکتریان دەگرت.

هەروەکو لە هاتوودا دەکەوێتە بەرچاو، بەڕاستی تەیموورخان پاشا بەفیکر و زرنگی خۆی بناغەیەکی دامەزراند کە ئەو بنەماڵە بەگەورەیی و شەرەفەوە چەند عەسر ژیاون و ئیدارەی خۆیان کرد و حکوومەتیان پایەداربوو. ڕاگیراوی ئەو بنەماڵەیە لە سایەی تەدبیر و فیکر بلندی تەیموورخان پاشاوە بوو کە زەمانێکی دووروودرێژ ژیان و ڕاوەستاوبوون.

هەردەمێک دوژمن ڕووی لە یەک لەو خاکانە بکردبایە ئەوی دیکە لە حکوومەتی دراوسێ داوای کۆمەگی دەکرد و براکەی خۆی لە شەڕی دوژمن ئەمین دەکرد. ئەو فیکرەش ببوو بەمایەی دەستدرێژنەکردنی دوژمن [و] بێ دەسەلاتی ئێران و عوسمانی بەسەریاندا، وە بەجوێکردنەوەی ئەو ناوانە لەژێر پەردەیەکی کە هەریەک حوکمدارێکی سەربەخۆن، لە دەسایس پارازراو، لە شەڕ و فیتنە و کوژتاری یەکتر، خۆیان دوور ڕاگرتبوو. قسەی بەدبینی نەیدەتوانی بەگژ یەکیاندا بکا و هەڕەشە و دڵخۆشی دانەوەی دوژمنەکانیشیان نەیدەخستنە سەر هەوا و بەرزبوون و کەوتن.

مێژوونووسی بەناوبانگی عوسمانی لە کتێبی «ابو الفاروق» بەرگی چوارەمیدا دەڵێت: دەورەی تەیموورخان پاشا لە کوردستاندا نەگبەتیەکی گەورەبوو بۆ حکوومەتی عوسمانی لە شارەزوور و عێراق و ئاوربایەگاندا و دەستی سیاسەتی عوسمانی کورت کردبووەوە و

نەدەشیا لەشکریان بنێرێتە سەر و ڕۆژ بەڕۆژ سیاسەتی عوسمانی لەو خاکانەدا پاشەوپاش دەکشاوە. بەجارێک قەتعی ئومێد لەو سێ خاکە کرا و بەدەسیسەی تەیموورخان پاشا، ئومەراکانی کورد و هەوادارەکانی عوسمانی لە ئێراندا ڕوویان وەرگێڕاوە؛ نە ئێران دەیتوانی حوکمیان بەسەردا بکات و نە عوسمانی پێی دەکرا لەشکرکێشیان بکا و بچێتە سەریان.

سوڵتان لەسەر ئەو ئازایی و زرنگیەتی لە تەجاوزات و دەستدرێژی تەیموورخان پاشا دەترسا لە شەڕ و فیتنە و بزووتنەوەی ئەمین نەبوو؛ بۆ بێدەنگ کردنی ئەمری بەوەزیری بەغدا کرد لە خەزێنەی خەرجوباجی بەغدا ساڵی سەد هەزار قورۆش پارە بدرێتە تەیموورخان پاشا.

مێژوونویسەکانی عوسمانی لەوە گەلێک دواون و ئیعترازیان لە سوڵتان موراد گرتووە کە ئەو پارەیەی دەیدا بەتەیموورخان پاشا، حەقی بێدەنگی و نەبزووتنەوە بوو؛ بەڵام بەو پارەیەش تەیموورخان زیاتر کەوتە بەرز نۆڕینەوە.

تەیموورخان پاشا لە هەر چوار کەناری خاکی خۆی تخووبی مەملەکەتییەوە لەگەڵ قایمکردن و فرەکردنی سنووری دەکۆشا؛ سوپاهێکی ڕێکخست و چووە سەر خاکی لوڕستانی گچکە و لە پاش شەڕ و پەلاماردان چەند ناحیەیەکی لێ گرتن و خستنیە سەر خاکی خۆی. عەلی بەگ شازادەی لوڕستان (شاوێردی) بەفێڵ و دەسیسە لەشکرێکی قورسی هەڵگرت و چووە گولعەنبەر و لە جێگایانی سەخت و دژواردا خۆی پەنهان کرد و ڕێگا تەنگ و باریکەکانی گرێدا و لە نێوانی دۆڵ و گەلێیکی کە کەوتبووە نێو دوو شاخ و کێوی بڵند و گەورە، بۆی دامەزرا و هەموو ڕێگاکانیشی گرت.

تەیموورخان پاشا لە لوڕستانەوە بەکەیفوشادی گەڕاوە و بەبێ باکی لەنێو خاکی خۆیدا جڵەوی ئەسپی شۆڕکردەوە و ئاگای لە دەسیسە و فێڵی شاوێردی نەبوو. لەسەر تەپۆڵکەی ئەو شاخە بەرزانە سەرەوژێر بەدەشتی شارەزووردا چووە خوارێ، لەپڕێکا شاوێردی لە پێشەوە و دەستە لەشکرەکانیشی لە هەموو بەرزی و دۆڵێکدا لێیان بڵندبوون و لە جێگایەکی زۆر تەنگ و بێ دەسەڵاتدا سەر و ژووریان لێگرتن و پەلاماریان دانێ.

تەیموورخان پاشا بەناچاری ڕوویان تێکردن؛ بەڵام چارە چی بوو؟ دەست بەکوژتار کرا و دۆڵ و شێو و دەرە پڕ لە لاشە بوو. لە دوای گەلێک شەڕ و تەقەلا، تەیموورخان پاشا لە دەست شاوێردیدا بەدیل گیرا، شاوێردی تۆڵەی لێ ئەستاندەوە و گەلێکی کوژتار لێکردن

و تالانێکی بێ ژماری لێ وەدەست خستن. تەیموورخان پاشا و چەند ئەسیرێکی دیکەی هەڵگرت و گەڕاوە و چووە لورستان. باقی ماوەی لەشکری تەیموورخان پاشا هەرچیەکی گیانی خۆی پێ ڕزگارکرا بەشپرزەیی و پەرێشانی خۆی لە مەیدانی مردن ڕزگارکرد و هەڵات.

لە پاش گەڕانەوەی شاوێردی، گەورە ئومەرایانی کوردستان کەوتنە نێوانێ، بەتەدبیر و پاڕانەوە، بەهەڕەشە و گەفکردن تەیموورخان پاشایان لە دەست شاوێردی ڕزگارکرد و گێڕایانەوە سەر حوکمداری خۆی.

تەیموورخان پاشا کە لەو ئەسارەتە ڕزگاربوو، چەندێک خۆی کۆکردەوە و تۆزی بەدنامی ئەو کەوتنەی لەسەر شان وقولّی تەکاند و بەتەدبیر و چاکە گومی کردەوە و سوپاهێکی شەڕکەری ڕێکخست و هەستا چووە سەر قەڵای زێڕین کەمەر، کە هی سیامەنسوورەکان بوو.

کوردەکانی سیامەنسووری لە مێژبوو بەدەسیسە خەڵەتابوون و ڕۆژ بەڕۆژ قووەتی دەخزاندە قەڵای زێڕین کەمەرەوە، لە ڕۆژی کەلێن دەگەڕان کە هەڵمەتێک ببەنە سەر خاکی تەیموورخان. ئەگەرچی خاکی زێڕین کەمەر لەژێر ئیدارەی قزڵباشاندا بوو، بەڵام بەپەنهانی لەگەڵیان ڕێک نەکەوتبوون.

تەیموورخان پاشا هەمیشە لەوە ترسی هەبوو کە ڕۆژێک دەبێ لە خاکی زێڕین کەمەرەوە زللەیەک بخوا؛ جا ئەوە ناچاری کرد کە لەشکرێک بباتە سەر ئەو خاکە و بیگرێت.

تەیموورخان پاشا کە لەشکری خۆی لە سنوور پەڕاندەوە، ڕوو بەزێڕین کەمەر خشا. لەولاوە ئەمیر یار سوڵتان خاوەندی سیامەنسوور، دەستی بەلەشکر کۆکردنەوە کرد کە پێش بەتەیموورخان بگرێت نەپرژا. کە تەیموورخان دەستی بەگرتنی خاک و زەوی کرد، ئەمیر یار سوڵتان لە قەڵای زێڕین کەمەردا خۆی قایم کرد و هەموو ڕەعیەت و لەشکری لەوێ خزاند و بۆ بەرابەری ڕاوەستا، تەیموورخان پاشا جگە لە قەڵای زێڕین کەمەر هەموو دەوروپشتی گرت و خستییە دەستەوە و چووە سەر قەڵای زێڕین کەمەر، ئەمیر یار سوڵتان بۆی دەرکەوتە دەرێ و شەڕ و کوژتار دەست پێکرا. موددەتی سێ مانگ شەڕوشۆڕ دەوامی کرد. لە ئەواخیری ساڵی نۆسەد و نوهەد و هەشت تەیموورخان پاشا لە مەیدانی شەڕدا بەدەست ئەمیر یار سوڵتان بەکوژت چوو؛ لەشکری بێ سەردار ڕووی لە هەڵاتن کرد.

## حوكمداری ئەمیر هەڵۆخان کوڕی سوڵتان عەلی کوڕی سورخاب

کە تەیموورخـان پاشـا کـوژرا، ئەمـیـر هەڵـۆخـانی برای لەسـەر حـکوومـەت قـەراری گـرت و ڕەعـیـەت و سوپای خـسـتـەژێر حوکمی خۆیەوە و قـاقـەزێکی لە سولـتـان موراد نوویسی و بەیانـی ئیـرادەتمەندی تێـداکـرد و لەگـەڵ حـکوومـەتی قـزڵبـاش مـەوەددەت و دۆسـتـایەتی دامەزراند. لەگەڵ هەردوو حکوومـەتان ڕێککەوت و تەپڵی ئازادی و سەربەخۆی لە خاکی شـارەزووردا لێـدا و لەسـەر سوننەتی براکـەشی، برازاکـانـی لە جێگای خۆیان دانانەوە و کردنیە ئەمـیر و ژێردەسـتی خۆی. ئەوانیش ئیـتـاعـەتیـان کـرد. لێـرەدا بەجـارێک بابان و ئەرەدڵان لێـک جـوێبـوونەوە. ئەردەڵانی لەگـەڵ ئێـرانیـان ئیـتـفـاقـیـان کـرد و بـابان لەگـەڵ سوڵتانی عوسمانی ڕێک کەوتن هەروەکو دێتەگۆتن.

## بەندی دووەم

### حوکمدارانی بابان لە شارەزووردا

هەروەکو لە پێشدا لە سەربهوردی بابا ئەردەڵاندا گوترا، بابا ئەردەڵان شارەزووری خستە دەست خۆی و یەکێک لە کوڕەکانی نارد کە لەسەر قەڵایانی نەوی، مێشیلە، تەنوورە، نشگا، میهرەوان دانیشێت و دەست بەئەمارەت بکات. قەڵای مێشیلەی دا بەئەمیر ئەبداڵی کوڕە گەورەی خۆی.

ئەمیر ئەبدال لەوێدا بەفەرمانڕەوایی ڕایبوارد و لەژێر حوکمی باوکیدا بوو، ئەو ئەمیرە بچووکە لە هەموو شەڕوشۆڕ و فیتنەیەک خۆی دەپارازت و لە خۆ بەخێوکردن بوو. هەتا بەمەرگی خۆی مرد. کوڕی گەورەی -کە پیر بۆداق بوو- کردیە جێگانشینی خۆی و بەئەمیر بۆداق ناوی دەرکرد.

### حوکمداری ئەمیر بۆداق کوڕی میر ئەبداڵ

ئەمیر بۆداق کە بابی مرد لەسەر ئەمارەت دانیشت و خاکی بابی خستە دەست خۆی؛ چونکە بابی لە هەموو شەڕوشۆڕێک دووربوو، موڵک و ماڵ و دراو و ئالەت و پێویستییەکی زۆری خستبووە سەریەک. ئەسپ و ماڵات و ئەسپابێکی بێ ژماری پێکەوە نابوو. ئەوانە بوون بەپشتگرتنی میر بۆداق و دەست فرەیی و شەوکەت زیادکردنی.

کە میر بۆداق کەوتە سەر حوکمداری، بەجارێک ناوی حوکمداری خۆی گۆڕی و لە هەموو جێگایەکدا بەبابان ناوبانگی پەیدا کرد و بەڕاستی بابان لەم زاتە کە ئێمە لە سەربهوردی دەدوێین ئینتشاری کرد و دامەزرێنەری ئەو ناوە میر بۆداقە؛ ئەگەرچی لە پاش ئەو تەیموورخان پاشا دەکۆشا کە ناوی بابان لەسەر خاکی یەکێک لە ئەولادەکانی دانێ و بەبابان ناوبانگیان پێ بکا، بەڵام میر و حوکمدارانی بابان لەو ئەمیرە گەورەوە دەست بەدامەزراندن دەکات.

لە گۆڕینی ئەم نێوەدا دڵخوازی ئەوەبوو لە مام و خزمەکانی ڕزگار بێت و نەکەوێتە ژێر حوکمیانەوە. لەبەرئەوە هەمیشە لەنێو ئومەراکانی خۆیدا بەمەجلیسی دەگوت کە بابان

ئەردەڵانی باپیرە گەورەیان ناوی قوباد بووە؛ مادامە لەو بنەچەکەین دەبێ بابان یاخود بابا قوبادیمان ناوببرێ. بابا قوباد لە گوتندا درێژە، بابان چاکترە بەکارببرێت. لەسەر قەراری پیربۆداق بنەماڵەی بابان لەوەوە پەسند کرا و مێژوونوویسەکانیش بنەماڵەی بابان لە پیربۆداقەوە دەست پێ دەکەن؛ ئەگەرچی تیرەیەکی ئەردەڵانییەکانیش ئەو نێوەیان لەسەر خۆیان دانابوو، هەروەکو لە پێشدا بێژرا.

ئەمیر بۆداق بەسەخاوەت و کەرەم و ئازایی و بەخشش ناوبانگی کرد و کەم کەمە بۆ بەرزبوون و سەرکەوتن خۆی بزاوت و دەستە و دائیرەیەکی قورسی دامەزراند. بەلوتف و داین لە هەرلایێکەوە پیاوێکی ئازا و ناودار هەبوو بردیە لای خۆی و سەربەرزی کرد و هەر عولەما و پیاوچاکێک لە کوردستاندا بوو کردیە جیرەخۆر و هەواداری خۆی. دەم بەدەم هێزی پەیدا کرد و دەستە و پێوەندی زۆربوون، لەشکر و سوپاهێکی رێککەوتووی ساز کرد و جیرەی بۆ برینەوە. کە سوپاهی گەیشتە ئارەزوو و دڵخوازی، هەستا بەقووەتێکەوە چووە سەر ئومەرایانی زەرزا و بەشەر و کوژتار مەحالی لاجانی لە زەرزا ئەستاند و لەولاوە بەسەر کۆنە لاجاندا گەڕاوە و لەژێر پەنجەی سۆرانی دەرخست. بەوە ناوونیشانێکی پەیدا کرد و هێز و توانای پێ زیادبوو. لەوێوە چووە سەر «سیوی» (شیوی - شنۆ) و لە سۆرانی ڕزگار کرد و هەر بەو هێزەوە چووە سەر سندووز، ئەویشی لە دەست قزڵباشان دەرخست و قەڵای مارانی ئاوەدان کردەوە و گەڕاوە قەڵای مێشیلە، دەستی بەخۆ ڕێکخستن کرد.

بەلوتف و کەرەم و پیاوەتی، عەشیرەتی موکری و بانەشی خستە ژێر فەرمانی خۆیەوە. کە لەوانە ئاسوودە بوو، لەشکریکی ناردە سەر عەشیرەتی کوردی مەشیا و ئەوانیشی ژێر فەرمان کرد و لەسەر هەر یەکێک لەوانەی کردە میر سنجاغێک و ئەمیرێکی لە تەرەف خۆیەوە لەسەر دانان و لە ژێر ئیدارەیەکی چاکدا ڕایگرتن. کە لەوەش ئەمین بوو، لەشکرێکی قورسی ناردە سەر شارباژێڕ، لە دەست ئامۆزاکانی دەرخست و خستییە ژێر حوکمی خۆیەوە. لەوەوە حکوومەتێکی جوانی ڕێکخست و بۆ هەر میر سنجاغێک تەپڵێک و ئاڵایەکی بابانی بۆ ناردن و داد و عەدالەتی لەو خاکەدا پان کرد، وە لەشکر و سوپاهی خستە ژێر ئینتزامەوە و بۆ هەر میر سنجاغێک میقدارێک لەشکر و هەر لەشکرەی ئاڵای خۆی و تەپڵی بەتایبەتی بۆ قەراردان.

لە پاش ئەوە کە ئەو هەموو ئیشە موهیمانەی ڕێکخست، دووبارە ناردی قەڵای مارانی زۆرچاک قایم کرد، دیوار و کۆنگەرە و بورج و بارووتی بڵند و سەختی لە دەورەدا دروست

کرد و لەشکری هەڵگرت و چووە سەر قەڵای کەرکووک بەزۆری بازوو گرتی و کردیە ئەمیر سنجاغێکی بابان.

ئەمیر پیر بۆداق هەموو بزووتنێکی وەکو پادشایانی دونیاگیر وابوو، لە گەلێک کار و پیشە و جووڵانەوەیەکدا چتێکی بێ وێنەی بەبیرتیژی خۆی دەکردە دەستوور کە لە هیچ حوکمدارەکانی دیکەدا پەیدا نەدەبوو؛ وە بۆ هەریەک لە مەئموورەکانی خۆی دەستوورێکی دامەزراندبوو، وە بۆ هەر میر سنجاغێک ڕەوشتێک و قاعیدەیەکی دانابوو کە بەئوموری مەملەکەتداری خەریک بن، وە هەریەک تیپە لەشکرێکی بۆ ئاسایش و بەخێوکردنی ڕەعیەت دابوونێ.

لەشکری پیادە و سواری ڕۆژی دەبوایە دووجار مەشقی تیرەندازی و شیروەشێنی و نێزەبازی و ئەسپ ئاژۆتن و بازدان بکەن. بۆ فێرکردنی ئەوانە پیاوانی زانا و تێگەیشتوو کردبوونە مامۆستای نیشاندانیان.

کە دوو ساڵ لە گرتنی کەرکووک بەسەرچوو، میر بۆداق لەشکرێکی ئازا و شەڕکەری هەڵگرت و چووە سەر قەڵا و شاری «شاه قولی» ئاوا (شەقڵاوە) ئەمیر سەیدی کوڕی میر شا عەلی سۆران لە وەکیلی برایەوە، فەرمانڕەوایی شاقولی ئاوای دەکرد؛ کە زانی حوکمداری بابان ڕووی لەو کردەوە، هێزی شەڕکردن و تەوانای بەرابەری ئەوی نەبوو؛ بەناچاری دەستی لە شاقولی ئاوا بەردا و کشاوە چووە حەریر.

میر بۆداق بەبێ شەڕوکێشە گەیشتە شاقولی ئاوا و گرتی و لەگەڵ ڕێکی و دامەزراندنی ئوموری حکوومەتی خەریک بوو. دەستەیەکی سوارەی خۆی تێدا بەجێهێشت و هەستا ڕکێفکوت چووە سەر شاری حەریر. ئەمیر عیسای کوڕی میر شاعەلی -کە حوکمداری سۆران بوو- بەناچاری پایتەختی ئەمارەتی چۆڵ کرد و بەریدا و هەڵات و پەنای بۆ کێوە بڵندەکان و لێڕەوارە پڕ دارە سەختەکان برد.

میر بۆداق بەبێ ئەزیەت چووە حەریر و شار و دیوان و سەرای حوکمدارانی سۆرانی گرت و خستییە دەست خۆی. چەند ڕۆژێک بەدامەزراندنی ئوموری ئەمنییەت و ئاسایش دان بەئەهالی و نوازش و دڵخۆشی دانەوەی میللەت و ڕەعیەت کۆشا و لەشکری ساز کرد و کەوتە کێوان و لێڕەوارانەوە؛ لە پشت میر عیساوە ئەحواڵی دەپشکنی.

ئەمیر عیسا کە تەماشای کرد لە شەڕ و کوژتار و بەرابەرکردنی زیاتر چارە نەماوە، بەتوندی جڵەوی ئەسپی سوڕاندەوە بەلەشکرێکی لە دەستیدا بوو، پێشی بەئەمیر بۆداق گرت.

دوو حوکمداری کورد بۆ کوژتنی یەکتر شیر و خەنجەریان تیژکرد و بەرابەر بەیەکتری ڕاوەستان. شەڕ و کوژتار گەرم بوو، لە هەردوو لاو لاشەی کورد کەوتنە نێو دۆڵ و شێو و گەلییانەوە. سێ شەو و سێ ڕۆژ دەستیان لە یەک بەرنەدا، هەتا لە مەیدانی خوێناویدا میر عیسا کەوتە بەر شیری برندەی میر بۆداقەوە و کوژرا.

کە لەشکری سۆران خۆیان بەبێ خاوەند و سەردار چاوپێکەوت، هەڵات و کەوتنە کێوان لە بەدیل چوونیان بەچاکتر زانی. هەرکەسێکی خۆشبەز و ئازابوو، دامێنی کێوی گرت و لە خوێنڕێژی ڕزگاربوو.

ئەمیر بۆداق کە حوکمداریی سۆرانی کوژت، کەمێک کەوتە دوو شکستەی لەشکر و تاڵان و ئەسپابێکی زۆری دەست خست و گەلێکی بەزیندوویی بەدیل گرتن و بەشادی و کەیف گەڕاوە هەریر، هەموو ئومورر و کاری مەملەکەت و شاری ڕێکخست و ئەمیر سنجاغێکی خۆی لەسەر دانا و هێندەی پێویستی لەشکری لە حەریر بەجێهێشت و بۆ خۆی سواربوو ڕوو بەپایتەختی بابان گەڕاوە دوایی.

ئەمیر بۆداق کە ئەو هەموو خاکانەی کردە مەملەکەتی خۆی و دایمەزراندن، بەچاکە و داد و کەرەم و ئازایی و تەدبیر و زرنگی خۆی میللەتی خستەژێر گەڕان و ئیدارەیەکی واوە. لەو خاکەدا نەیار نەمان؛ دڵی هەمووانی بەخۆیەوە بەستبوو، هەریەک بەچەشنە ڕەوشت و کارێک نوازش و دڵپەزێرای دەکردن، بەپیاوەتی و زبانخۆشی، بەتوندی و هەڕەشە و ترساندن، بەئینعام دان و بەخشش دڵی هەمووانی ڕادەگرت.

ئەمیر شەرەفخانی بتلیسی لەشەرەفنامەیدا دەڵێت: میر پیر بۆداق بابان هێندێک چتی ئیجاد کردبوو، چەشنە ئومووورانی ڕێکدەخست کە نە لەوەپێش و نە لەوەپاش هیچ ئەمیرێکی کوردستان بیری لێ نەکردبۆو وەکو:

ئەگەر تەمای ژنهێنانی بۆ نۆکەرێک یا ئەمیر سنجاغێکی ژێردەستی خۆی بکردبا و بیخواستبا کە ژن بۆ مەئموورێکی خۆشەویست و کاربینی بێنێت، بۆ خۆی دەچووە خوازبێنی کردنی؛ بەناوی خۆیەوە داخوازی کچەکە دەبوو. وەکو بۆی بگوێزێتەوە هەموو پێویست و کەلوپەل و چتمەکی بۆ ڕێک دەخست و شایی و هەڵپەڕین و خەنەبەندان و شیرینی خواردن و دەزگیرانی هەموو بەناوی خۆیەوە دەکرا. تەماشای شەرەفی خاوەند کچ و پیاوەکەی ژێردەستی خۆی دەکرد، بەگوێرەی ئەوە خەرجی دەکرد و جلک وبەرگی بۆ دەدا بەدروون، وە دیاری و جیاز و تەدارەکی بەوجۆرە تەدارەک دەکرد. کە دەبوو بەشایی و

وەختی مارەکردنی دەهات لە نۆکەر یا مەئموورەکەی -کە دڵخوازبوو- مارەی دەبڕا و بۆی دەگوازتەوە. هەتا ئەو ڕۆژەی مارە دەکرا، هەمووکەس و باوکی کچ و کچەکەش هەر وایان دەزانی بۆ ئەمیر بۆداق دەبێ.

میر ڕۆستەمی برای میر بۆداق لەگەڵ چەند کەسێکی بێ سەروبەر ڕێک کەوتبوو کە هێزێک پەیداکەن و میر بۆداق بکوژن، لە ناحیەی زەرزا بروزیان ئەستاند و لە خۆکۆکردنەوە خەریکبوون و بەدەسایس و قووەت پەیداکردن دەکۆشان و لەوەدا هاودەنگی زۆر کردبوون.

میر بۆداق لە بزووتنەوەی میر ڕۆستەم ئاگادار کرا. بەبێ دەنگی چەند سوارەیەکی هەڵگرت و بەبەهانەی ڕاوەوە ڕوو بەناحیەی زەرزا ڕۆیشت. میر ڕۆستەم و هەواڵەکانی دەردەست کرد و یەک بەیەک کوژتنی و ئەو تۆبەی فەسادییەی بڕیەوە. پیاوێکی زرنگ و ئەمینی لەسەر ناحیەی زەرزا دانا، لە پاش ڕێکخستنەوەی ئەو ناحیەیە گەڕاوە پایتەختی خۆی.

میر بۆداق کە لەو سەفەرە گەڕاوە، بیستیەوە کە میر سەیدێ ئەمیری سۆران -کە لەپێشدا لیی دواین -لە شاقولی ئاواوە ڕوو بەلێرەواران و کێوەکان هەڵاتبوو. لە بزووتنەوەی میر ڕۆستەم کەلێنی دەستخست و لە خۆکۆکردنەوە و هێز پەیداکردن خەریک بوو. دەستوپێوەندێکی زۆری لەسەرخۆی کۆکردۆتەوە. لەنێو لێرەوار و چیاکانی پشت حەریردا دەستی بەتەریدە و ڕێگرتن و دەست درێژی کردووە.

میر بۆداق لەشکرێکی ڕێککەوتووی هەڵگرت و چووە حەریر کە پێش بەئەمیر سەیدێ بگرێت و دەردەستی کات. چەند ڕۆژێک بەتەدبیرەوە لە حەریردا دانیشت؛ ڕۆژێک بەهەوای ڕاوکردن سواربوو و ڕووی لە کێوەکان کرد و دەستی بەسووڕاندنەوە و پشکنین کرد، کە میر سەیدێ دەست بخا و بیگرێت.

میر سەیدێ لەوە ئاگادار کرا کە میر بۆداق لە دووی ئەو لە کێواندا دەسووڕێتەوە؛ خۆی ساز کرد و چووە جێگایەکی کە بە«خروبیان» دەناسرا. لە جێگای سەخت و توند دامەزرا و ڕێگا باریکەیەکی لە نێوانی دوو کێوی بڵندا بەنێو دۆڵێکدا دەکشا و زۆر سەخت بوو. میر سەیدێ پیاوانی ئازای لە دەربەند و گەلی ئەو ڕێگایەدا دانا. هەردوولای کێوەکانیان گرت و تێدا پەنهان بوون؛ بەچاوە نۆڕی کەلێن و چوونی میر بۆداق دانیشتن. میر بۆداق بەبێ باکی و ترس دەگەڕا، کە گەیشتە ئەو دەربەند و تەنگایەوە، لە نێوەڕاستی دۆڵەکەدا

-كە جێگای هەڵاتنی نەدەبوو- پیاوەكانی میر سەیدێ لە پاش و پێشەوە و لە دامێنی كێوەكەدا لێی بڵندبوون و دەستیان بەكوژتاریان كرد؛ خستیانە نێوانی پەلاماردانی. لەو هەموو نۆكەرانەی میر بۆداق یەكێك ڕزگار نەبوو؛ هەموو كوژران و میر بۆداقیش ئێخەی لە دەست دوژمن دەرنەخست، كوژرا.

كە میر بۆداق كوژرا، میر سەیدێ لەگەڵ گرتنەوەی خاكی سۆران و حوكمداری خۆی و دەركردن و گرتنی بابان خەریك بوو. هەروەكو لە جزمێكی دیكەی ئەم كتێبە و بەندی خۆیدا لە باسی حوكمدارانی سۆراندا دێتەگوتن، بەدرێژی دەبێژرێت.

میر بۆداق بەڕاستی پیاوێكی ئازا و ڕەشید و دڵپاك و ڕەعیەتپەروەر و وەتەنخوا و تێگەیشتوو و زرنگ بوو. لە بەخشش و دادخواهی و میللەت نەوازیدا بێ وێنەبوو. لە ئاواكردنی شار و دێهات و پێشكەوتنی عیلم و سەرخستنی كڕین و فرۆتن و چاندن و جووتدا بەكۆشەوە بوو. لەنێو كوردستاندا بەچاكە و پێداهەڵگوتن ناوبانگی كردبوو. حوكمدارێكی سەربەخۆ و ئازاد و موستەقیل بوو؛ سككە و خوتبەی بەناوی خۆی بوو. لە خاكی خۆیدا ئالاّ و نیشانەی حوكمداری بابان لەوەوە دامەزرا و بناغەیەكی چاكی دامەزراند.

شایەر و بوێژانی خۆش هەڵبەستی قسەجوان لە هەموولایێكەوە داستان و سەربهوردی میر بۆداقیان هەڵبەستبوو. دەنگبێژ و گۆیندەكانی خۆشخوان لە دیواندا بۆ پیاوە گەورەكان بەئاوازێكی گەلێك جوان پیاندا هەڵدەگوت. تەواوی ژیان و كۆشیش و بەخشین و ئازایی و ڕەشیدی، پیاوەتی و مەملەكەت گێڕی میر بۆداقیان كردبوو بەداستان و دەم بەدەم بۆ یەكتریان دەخوێندەوە و لە شاراندا ئەو داستانانە دەنووسرانەوە و لەبەر دەكرانەوە. داستانی كوژتنی بەتایبەتی هێندە بەدڵسۆزەوە و بەئاخ وداخ و جگەرسووتانەوە ڕێكخرابوو، لە هەر دیوان و جێگایەكدا بخوێندرایایەتەوە هەركەسێكی گوێی لێ بوایە هیچ نەدەبوو، دڵی نەسووتێ و چاوی پڕ فرمێسك نەبێ و نەگری و ئاخی بۆ نەكێشێت.

## حوكمداری میر بۆداقی دووەم كوڕی میر ڕۆستەم

كە میر بۆداقی گەورە كوژرا، وەجاخ كوێربوو؛ منداڵی نێرینەی لە پاش بەجێ نەما. سەركردە و كاربەدەستانی حكوومەت و كەیخودا و ڕیش سپی و هاتە ڕووی میللەت بەكۆمەڵە ڕێككەوتن و میر بۆداقی كوڕی میر ڕۆستەمیان كردە حوكمداری بابان. هێندێك لە ئاغایانی خاوەند عەشیرەت و گەورەی ئێلات سەریان بۆ میر بۆداقی چكۆڵە

دانەنواند و بەگۆشەگیری و خۆ تێکەڵ نەکردن، بێدەنگ بوون.

میر بۆداقی دووەم کە لە جێگای مامی دانیشت و دەستی بەحوکمداریی بابان کرد و لەگەڵ دامەزراندنی لەشکر و ڕەعیەت خەریک بوو.

ئەوکەسانەی لەگەڵی ڕێک نەکەوتبوون و بەحوکمداریی بابانیان نە دەناسی، و ڕۆژ بەڕۆژ لە خۆکۆکردنەوە و یەکگیری دەکۆشان. میر بۆداق هەرچەندە تەقەلای دا نەیتوانی نوازشیان بکات و دڵیان بێنێتە دەست. موددەتی دوو ساڵان لەگەڵیان خەریک بوو؛ ڕاینەگرتن و نەبوونە هەواداری. بەخۆشی و هەڕەشە هەرچەندەی کرد دەرەقەتیان نەهات. ئومووری حوکمداری هەموو دەمێک لە دەست ئەو پیاوانەدا لە نەبوون و چووندا بوو؛ ئەو دەرد و داخە لێی بوو بەنەخۆشی و کوژتی.

میر بۆداقی دووەم لەو تەقەلایەدا بوو، چەند کەسێکی بەگ و خزمی دیسان کە هەبوون لەو قابیلەتەدا نەبوون. هەرکەس بەڕەنگی خاوەند دێهات لە دێیەکدا دانیشت و دەستی لە کار کێشاوە؛ بەوەش زیاتر میر بۆداق لەکار کەوت و تەنها ماوە؛ ئەوەی لێی بوو بەکەسەل. برایەکی گچکەشی لە دێهاتی ماوەتدا پارچە زەویەکی لە دێهات خستە دەست و لەگەڵ چاندن خەریک بوو. لە پاش میر بۆداقی دووەم لەو بنەماڵە گەورەیەدا پیاوێکی قابیل نەبوو کەبتوانێ ئومووری حوکمداری بخاتە دەست خۆی، حکوومەت کەوتە دەست نۆکەرانی میر بۆداقی گەوردوە و ڕشتەی فەرمانڕەوایی لە دەست بنەماڵەدا نەما.

# بەندی سێیەم

## حوکمداریی بنەماڵەی نۆکەران [کە] بەبابان ناوبانگ گیربوون

هەروەکو بێژرا، میر بۆداقی گەورە مرد پشێوی کەوتە نێوانی چەند کەسێک و حوکمداریی میر بۆداقی دووەمیان قبوڵ نەکرد. کە میر بۆداقی گچکەش مرد، سەری کار لە دەست بابان دەرکەوت و گەیشتە دەست نۆکەرانەوە؛ ئەوانیش هەر لەسەر نێوی بابان حکوومەتەکەیان دامەزراندەوە و ئالا و نیشانەی حوکمداریی بابانیان قبوڵ کرد و دەستیان بەحوکمداری کرد؛ وە هەروەکو لە هەردوولا یەک بەیەک دێتە گۆتن. وە میر و بەگەکانی بنەماڵەی بابان، سوورەتی ڕەعیەتیی و جووت بەندەیی و ئاغادێییان وەرگرت، هەریەک کە مابوون کەوتنە دێیەکەوە و پارچە زەوییەکیان دەستخست و لەگەڵ ئاغایەتی خۆیان خەریک بوون.

## پیر نەزەری کوڕی پیر پەیرام

پیر نەزەر یەکێک بوو لە سەرکردە و میر سنجاغەکانی پیر بۆداقی گەورە. پیاوێکی زرنگ و وریا و ئازا و کاربین و سەخی بوو؛ بەبەخشش و کەرەم و دادخواهی هەموو ئەهالی کوردستان حەزیان لێ دەکرد و خۆشیان دەویست. بەتێگەیشتن و زانینی خۆی دڵی کوردەکانی کردبوو بەهەواداری خۆی و هەموو میللەت بۆ ڕێککەوتنی ئومووری پیر نەزەر دەکۆشان و لەسەری کۆبوونەوە؛ بەگیان و بەدڵ بۆی تێوەچوون وە تەقەلایان بۆ دەدا. پیر نەزەر لە زەمانی پیر بۆداقی گەورەدا چونکە گەلێک ئیشوکاری گران و سەختی کە لە دەستدا دەبوو تێیدا سەرکەوتبوو، لە نێو کورداندا ناوونیشانەیەکی چاکی پەیداکردبوو. لە سایەی ئەوەوە هەموو کۆشین و کردەوەیەکی بەئاسانی بۆی ساز دەبوو.

کە پیر نەزەر کەوتەسەر ئومووری کاربینی و خۆنواندن، ڕەعیەت لەسەری کۆبوونەوە و لەشکر و سوپاه و ئەسپابی پێویستی بۆ ڕێکخرا و ئامادەی حوکمداری بوو.

کە پیر بۆداقی دووەم مرد ئالای سەربەخۆبی هەڵدا و دەستی بەگرتنی خاکی بابان کرد و خستیە ژێر حوکمی خۆیەوە و هێواش هێواش دەستی بەئاوەدانکردن و ڕێکوپێکی کرد.

که بەچاکی هەموو خاکەکەی دامەزراندەوە، هەستا لەشکرێکی شەرکەری هەڵگرت و چووە سەر شاری کفری (سەلاحیە) و بەشەڕ و کوژتار گرتی و خستیە ژێر حوکمی خۆیەوە و لەسەر ڕەوشتی حوکمداریی بابان، میر سنجاغێکی لەسەر دانا. بەو قووەتەوە بەنێو خاکی خۆیدا گەڕاوە.

هەرکەسێک کەمێک بۆنی نەیاری لێهاتبوو، وە یا بۆ سەرکێشی و شۆڕش تەقەلای دابوو، بەلوتف و خۆشی ڕامی کردن و ئاسوودەی کردنەوە و گەڕاوە پایتەختی. وە لە بنەماڵەی بابان هەرکەسێکی مابوون، لە دێهاتدا دانیشتبوون بۆ ئەمەی نەبزوونەوە، لە هێزی خستن و بێ دەسەلاتی کردن.

پیر نەزەر بەڕاستی پیاوێکی بەکۆشەوە بوو، حەزی لە فرەکردنی مەملەکەت و ڕەعیەت و کڕین و فرۆتن دەکرد و بۆ ئاوەدانی و پێشخستنی خاکی بابان زۆر کۆشا و بۆ ئاسوودەگی و دامەزراندنی ئەهالی گەلێک تەقەلای دا؛ بەڵام مەرگی بێ ئامان نەیهێشت بەئارەزووی خۆی بگاتە دڵخوازی. ئەگەر چی بەتەواوی هەموو خاکەکەی پیر بۆداقی گەورەی وەدەست خست و کردیە حکوومەتێکی ئازاد، بەڵام گەلێک نارەزووی مابوو موەفەق نەبوو و مرد.

لە پاش مردنی پیر نەزەر خاکی بابان لە ژێر چاوەدێری دوو ئەمیراندا ڕادەگیرا.

## حوکمداریی میر سلێمان و میر ئیبراهیم

لە دەوری پیر بۆداقی گەورەدا میر سلێمان و میر ئیبراهیم، هەریەک لە جێگایەکدا میر سنجاغیک بوون و لە دەوری میر بۆداقی دووەم و پیر نەزەردا لەسەر وەزیفەی خۆیاندا مابوونەوە و شانوشەوکەتیان بەزیادەوە پەیداکردبوو. هەریەک لەوان خاوەند لەشکر و هێزێکی تەواوبوون و ئالەت و چەکیان زۆربوو، لەنێو میللەتدا قسە ڕەوا و دەست درێژبوون.

که پیر نەزەر مرد ئەو دوو ئەمیرانە پێکەوە ڕێککەوتن و لەشکر و هێزێکی هەیانبوو کردیانە یەک و بوونە یەک تەن و یەک بەدەن؛ وەکو گیانێکی لە دوو پێستدا بێ کۆشان و تەقەلایان دا و هەموو خاکی بابان و شارەزووریان خستە دەست خۆیان و بەیەکەتی حوکمداریەکی جوانیان پێکەوە دامەزراند. مەیدانی شۆڕش و بزووتنیان بۆ کەس بەتاڵ نەکرد کە ببنە مایەی تێکدانی ئەو حکوومەتە. دیوان و لەشکر و دەزگای میرەکانی ڕابردوو، هەرچۆنێکی هەبوو، بەبێ شێواندن دەستیان بەسەردا کێشا و هاوێژتیانە ژێر پەنجەیانەوە. ئاڵا و نیشانە و ڕەوشتی حوکمداری و ناوی بابانیان ڕاگرت و بەخێویان

کرد؛ هەر بەو دەستوورە دەستیان بەفەرمانڕەوایی و حوکمڕانی کرد.

ئەو دوو ئەمیرە کوردە دیسان هەر بەناوی بابانەوە -وەکو برایەکی ڕاست- دەستی خۆشەویستییان پێکەوە گرت. میر سلێمان برا گەورە و میر ئیبراهیم خۆی بەبرا بچووک دانا. لە شکڵی جەمهوریەتدا موددەتی چەند ساڵان پێکەوە حوکم فەرمانی کوردستان و بابان و شارەزووریان بەتەواوی کرد. دڵگیری و نا ئەمینی و ڕەنجیدەیەک بەهیچ کلۆجێک ڕووینەدا، بەدڵێکی پاک و بێ قرێژەوە زۆرباش تێوەچوون و تەقەلایان دەدا و گەلێک بەئاسوودەگی دەژیان.

ناحەز و نەکێش و قسەچین و دووڕووان کەم کەمە کەوتنە نێوانیانەوە و قسەیان هێنا و برد. تۆی نەیاری خراپیان لە بەیندا چاندن. خۆشەویستی بەدوژمنی گۆڕاوە. برایەتی کرا بەنەیاری و یەکەتی بەکوژتار وەرگەڕا. گەرمیی ساردبووەوە، کار کەوتە شیر و خەنجەر، نەتیجە گەیشتە جێگایەکی وا هەردوولا بۆ کوژتارێ لەشکرکێشیان کرد و بەگژ یەکدا چوون و کوژتارگەرم بوو؛ خوێن ڕژا، چەندێک شەڕ و کوژتار دەوامی کرد. لە دواییدا ئەمیر ئیبراهیم بەدەست میر سلێمان بەکوژت چوو.

موددەتی نۆ ساڵ حوکمداریەکی برایانە، بەخوێن ڕژتن و کوژتن نەتیجە بەخش بوو.

حاجی شێخ کوڕی میر ئیبراهیم لە مەیدانی شەڕدا خۆی ڕزگارکرد و هەڵات و چووە ئێران و پەنای بۆ شاه تەهماسبی سەفەوی برد (لە پاشان لێی دەدوێین). لە ئەمیر ئیبراهیم سێ کوڕ بەجێمان: یێکەم میر حاجی شێخ؛ دووەم میر ئەمیر؛ سێیەم میر سلێمان میر حاجی شێخ چووە ئێران و براکانی دیکەی لە کوردستان مانەوە.

## حوکمداری میر سلێمان

کە میر ئیبراهیم لە مەیدانی شەڕدا کوژرا، میر سلێمان بەتەواوی لەشکرەکەی میر ئیبراهیمیشی خستە ژێر پەنجەوە. بەو هێزەوە چووە سەرخاکێ کە کەوتبووە دەست میر ئیبراهیمەوە و هەمووی گرت و هاوێژتیە سەر بەشەکەی خۆی. ئەوجا هەموو خاکی بابانی بەبێ ئەزیەت و هاواڵی وەدەست خست و ئومووری حوکمداری پێکهێنا و لەشکر و سوپاه و گەنجینەی کۆکردنەوە. مەملەکەتداری و فەرمانڕەوایی بەدادخواهییەوە لە کوردستاندا دامەزراند. ئاسوودەگی و ئەمانی خستە نێو خاکی بابان و شارەزوورەوە. دەستی بەمیللەت نەوازی و ڕەعیەتپەروەری و لەشکر لاواندنەوە کرد.

له دەوری میر سلێماندا کوردستان ببووە بەهەشتی بەرین، کار و کاسبی، کڕین و فرۆتن و کێڵان و چاندن و بازرگانی سەرکەوت.

میر سلێمان بەئاسوودەگیەکی تەواو پازدە ساڵان حوکم فەرمابوو. نۆ ساڵ بەیارمەتی و هاواڵی میر ئیبراهیم و شەش ساڵ بەتەنهایی ڕایبوارد و زۆر بەسەربەرزی و خۆشی گوزەرانی کرد و مرد. چوار کوڕی له پاش بەجێمان:

یەکەم میر حوسێن؛ دووەم میر ڕۆستەم؛ سێیەم میر محەمەد؛ چوارەم میر سلێمان.

## حوکمداری میر حاجی شێخ کوڕی میر ئیبراهیم

هەروەکو بێژرا که میر ئیبراهیم بەدەست میر سلێمانی هاواڵیەوە بەکوژت چوو، میر حاجی شێخ چووە ئێران و پەنای بۆ شاه تەهماسبی سەفەوی برد و داوای یارمەتی و کۆمەگی کرد. شاه بەهێندی نەگرت و جوابیشی نەدا که نایکا و بەداپۆشراوی تەفرەی دەدا.

که میری بێژراو تەماشای کرد له قەزوێندا دانیشتن بێ سوودە، ناچار سواربوو ڕوو بەکوردستان گەڕاوە دواوە. دەستەسوارێکی ڕێکخست و چووە سەر شارانی بنلێن و دیاله و کەلای کورد، میر عیزەدینی برای میر سلێمان -که له تەرەف برایەوە فەرمانڕەوای ئەو جێگایانه بوو- لەشکری کۆکردەوە و چووە پێشی. هەردوولا دەستیان بەکوژتارکرد، له پاش گەلێک خوێن ڕژتن میر عیزەدین له دەست حاجی شێخدا بەکوژت چوو.

میر حاجی شێخ لەو خاکانەدا ئەمارەتی خۆی دامەزراند و دەستی بەتەشکیلات و خەریکی هێز پەیداکردن و خۆ کۆکردنەوە بوو. هەموو کوردەکانی ژێردەستی له فەرمانڕەوایی و دادخواهی مەمنوون بوون، هەتا میر سلێمان مرد، گەلێک ناوبانگی پەیداکردبوو.

که میر سلێمان مرد، حاجی شێخ سوپاهێکی شەڕکەری هەڵگرت و چووە سەر خاکی شارەزوور و بابان که لەژێر دەستی میر سلێماندا بوو. میر حوسێن و میر محەمەد و میر ڕۆستەمی کوڕانی میر سلێمان، نەشیان بەرابەری بکەن و خاکی باوکیان بەردا و ڕوو بەئێران پەنایان بردە بەر شاه تەهماسبی سەفەوی.

میر حاجی شێخ که چووە سەر خاکی میر سلێمان، بەبێ ئەزیەت هەمووی بۆ سازکرا که بیگرێت؛ چونکه له پێشدا لەگەڵ هەموو گەورە و ڕەئیسەکانی ئەو خاکه بەقاقەز نوویسین ڕێک کەوتبوو و هەمووی کردبوونەوە هەوادار و دۆستی خۆی. لەبەرئەمە بەبێ موشکیلات

کە لەشکری برد، ئەهالی بۆ پێشوازی سازبوون و خاکی بابانیان بەتەواوی خستەژێر پەنجەوە.

کە هەموو خاکی بابانی کەوتە دەست و گەنجینە و ئالەت و پێویستیەکی زۆری پەیداکرد و سوپاهێکی زۆر ڕێککەوتووی ڕیزکردن و تەپڵ و بانگی سەربەخۆیی و ئازادی بەگوێی هەمووواندا دادا. هەر سەر ڕەقێکی لە بەرابەری بوو، لایبردن و بزۆزەکانی بەخۆشی و زۆر ڕام کردن. ڕەعیەت و میللەتی بەزبان و کردەوەی چاکە نوازشکرد و خۆی بەحوکمدارێکی موستەقیللی کوردستان ناونا.

لە پێشدا باسمان کرد کە میر حوسێنی کوڕی میر سلێمان پەنای بۆ شاە تەهماسب برد کە یاریدەی بدات. شاهی بێزراو لە حاجی شێخ لە ئەندێشەدابوو و دەترسا کە تەما لە خاکی ئێرانیش بکا، بۆ ئەوە نەهێڵێت جێ بەخۆ فرەکات، ئەمری دا بەچراغ سوڵتانی والی دینەوەر کە بەسوپاهی شەڕکەرەوە یاریدەی میر حوسێن بدات. ئەویش لەشکرێکی باشی هەڵگرت کە ڕوو بەخاکی حاجی شێخ ببزوێتەوە.

حاجی شێخ بەتەڕدەستی چووە پێشێ و بەسەری دادان و گەلێکی لێ کوژتن و تالآن و ئەسیرێکی زۆری لێ گرتن. میر حوسێن و براکانی چراغ سوڵتان بەهەزار ئەزیەت لەو مەیدانە خوێناوییەدا خۆیان ڕزگار کرد و هەڵاتن. میر حاجی شێخ بەشادی و خۆشییەوە گەڕاوە خاکی خۆی.

شاە تەهماسب کە لەوە ئاگاداربوو، ڕقی هەستا و ئەمری دا گوگچە سوڵتان قاجاڕی والی هەمەدان کە بەهەموو هێزی خۆیەوە هەستێت و ئومەرا و لەشکری ئەو دەوروپشتەش هەڵگرێت و بچێتە هاوار چراغ سوڵتان و میر حوسێن.

ئەو سەرداره گەورەیە بەلەشکرێکی قورسەوە ڕوو بەکرمان و دینەوەر چوو. لەسەر ڕێگاشیدا لەشکری کۆکردەوە و گەیشتە دینەوەر. لەوێشەوە لەشکری خڕکردەوە و بەموهیماتەوە ڕوو بەخاکی بابان چوونی ئارەزووبوو.

میر حاجی شێخ لەوە ئاگادارکرا. لەشکری خۆی هەڵگرت و چووە سنووری دینەوەر. لەناکاو لینگی دا سەر گوگچە سوڵتان و دەستی بەکوژتارکردن. لە هەر چوار کەناری لەشکربەزیبەوە پەلاماری دوژمنیان دا و هەڵمەتیان بردەسەریان.

لەشکری گوگچە بەشپرزەیی و نیوە شەڕێک و تەواو هەڵاتنێکی دەست پێ کرد و شکان، لە پاش گەلێک لاشە و ماڵ و ئەسپاب بەجێهێشتن، کەمێکی گیانیان لە دەست

لەشکری جەنگاوەرانی میر حاجی شێخ ڕزگارکرد و لە نێوانی دەربازبوون.

میر حاجی شێخ بەماڵ و ئەسپاب و تالانێکی بێ ژمار و دیل گرتنێکی زۆر گەڕانەوە. لەو دوو سەرکەوتنەدا لەشکرەکانی زۆر شادمان و بەهەوەسبوون و لە شەڕ و کوژتار چێرەبوون. ئەو دوو جارانە میر حاجی شێخ لە هەموو کوردستان و ئێران و ڕۆمدا ناوبانگی شێران و پاڵەوانانەی کرد و دڵی دوژمنی خستە کرپەوە. شاه تەهماسب زیاتر هەراسان و بێزار و تەنگاوبوو.

کە جاری دووەم لە شکستەی گوگچە سوڵتان شاهی ئێرانیان ئاگادارکرد، دڵتەنگ و پڕ غەزەب بوو؛ ئەو شکانەی بەفاڵێکی خراپ زانی و دەست لێ هەڵگرتنیشی لەلای چاک نەبوو؛ چونکە نەتیجەی بێ دەنگبوون دەبووە مایەی دوژمن زیادکردن و بزاوتی بزۆزان و هێز پەیداکردن و وەتەما خستنی میر حاجی شێخ. لەبەرئەوە جاری سێیەم لەشکر ناردنە سەری، ناچاربوو.

شاهی بێزراو لەشکرێکی قورسی لە ژێر فەرمانی عەبدوڵلاخان ئێستاجلۆی سەردار لەشکری ڕێکخست. هەموو پێویست و ئەسپابی سەفەری بۆ ساز کرد.

بابی موئەلیف و موئەریخی مەشهوور شەرەفخانی بدلیسی کە مێژوونوویسی کوردان و نوویسەری شەرەفنامەیە، لەگەڵ ئەو لەشکرەدا خستیە ژێر فەرمانی سەرداری ناو گوتراو.

ئەو لەشکرە قورسە لە ڕێگای موکریانەوە بەلاجاندا لە کێوە بەرزەکانی قەندیلەوە، بەناحیەی باڵەکاندا بەڕیگای گەلاڵەدا -کە ڕێگایەکی سەخت و بڵند و تەنگ بوو-. بەنێو لێڕەوارە پڕ دارەکاندا بزووتن.

شەرەفخان لە تەئریخەکەیدا دەڵێت: لە ڕێگایەکەوە ڕۆیشتن گەلێک جاران پیاو بەئەزیەت دەیتوانی خۆی ڕزگارکات؛ ئەویش لەسەر پەسندکردن و شارەزایی میر حوسێن و براکانی بوو.

میر حاجی شێخ لەولاوە لەشکری خۆی هەڵگرت و چووە پێشیان، لە نزیک جێگایەک کە بە«گەلاڵە» دەناسرێ، ڕێگا تەنگەکانی لێگرتن و هەڵمەتی بردە سەریان. لەشکری ستاجلۆی بۆ بەرابەری ئامادەبوون، هەردوولا دەستیان بەکوژتاری یەکترکرد. پاڵەوانانی بابان بەدەستوبردتر بوون. دوژمنیان وەتەنگهێنا و لە هەمولایێکەوە کۆیان کردنەوە و کوژتیانن. لە پاش چەند سەعاتێک شەڕ و شیربازی لەشکری وەستاجلۆی خۆی نەگرت و پشتی دا و ڕووی لە هەڵاتن کرد.

خودانی شەرەفنامە لە باوکیەوە دەیگێڕێتەوە کە بۆی گوتووە و دەڵێ: لەشکری ئێستاجلوو وەها پەرێشان و شپرزەبوون لە هەڵاتندا کەوای بەریان و کەوش و پێڵاویان لێیان بوو بەبار و فڕێیان دەدا و هەڵدەهاتن؛ هەتا کراسی بەریان لەسەر گیانیان گرانبوو و بەڕووتی و پێخواسی و بێ بەرگی لەنێو لێڕەوانرادا بەچیا بەرزەکاندا سەردەکەوتن و لە ترسی گیانیان لەو چیا بەرزانە کە بەرەو ژوور دەچوون، وایان دەزانی بەدەشتدا دەڕۆن. کە لەشکری ئێران شکا، سوارە و پیاوەکانی میر حاجی شێخ کەوتنە سەریان و شیر و خەنجەریان تێنان و کوژتاریان لێ کردن و لەو لەشکرە قورسە، زۆرکەمیان ڕزگاربوون؛ ئەوانیش بەپەرێشانی و پێخواسی ڕووتی، گیانیان لەو مەیدانە خوێناویەدا دەرپەڕاند و دەردەچوون. بەو حاڵەوە چوونەلای شاوتەهماسب و سەربهووردیان بۆ گێڕاوە.

شاهی گوتراو ئەوەی لە نەزانین و ناشارەزایی و بێ تەدبیری میر حوسێن و براکانی ئەژمارد و هەرسێکی گرتن و خستنیە بەندەوە.

میر حاجی شێخ لەو کوژتارەدا هەزار ئەسیر وماڵێکی زۆری دەست کەوت و سی پیاوی کوژرا و دوو هەزار کەس لە لەشکری ئێرانی کوژتبوو. هەرچەندە ئەسپاب و ئالات و چەک و چادر و دانەوێڵەیەکی بەلەشکری ئێستا جلووی بوو لەگەڵ بەرگ و جلکی پیاوەکانیش کە هەڵاتبوون، کەوتە دەست. بەشادی و خۆشییەوە گەڕانەوە. هەموو لەشکر و پیاوەکانی میر حاجی شێخ لە تالانگرتن و کەلوپەل وەدەستخستن تێربوون و بەکەیف و ڕەزمەوە چوونەوە ماڵی خۆیان.

کە شاتەهماسب ئەو سێ برایەی گرت، موددەتێک لە بەندا بوون؛ بەتکای هێندێکان بەردران. لە پاشان کەلێنیان دەست کەوت و هەڵاتن و چوونە خاکی ڕۆم و پەنایان بردە لای سوڵتان سلێمان.

سوڵتانی ڕۆم بەجیرەیەکی چاک ناردنیە خاکی ڕۆم ئێلی و کردنی بەمیر سنجاغ. نزیک شەش ساڵان بەو ئیشە ڕایانبوارد. لەگەڵ سوڵتان حوسێن میری ئامێدییان موخابەرە کرد کە تکایان بۆ بکا تاکو بگەڕێنەوە کوردستان.

لەسەرئەوە میری ئامێدی کەوتە موخابەرەکردن و تکا لە سوڵتانی ڕۆم، هەتا گەڕانەوە ئەستەمبووڵ و لەوێوە چوونە ئامێدی.

کە میر حوسێن و براکانی گەڕانەوە ئەستەمبووڵ، سوڵتان سلێمان فەرمانی حوکمداری کوردستانی بابانی بۆ نوویسین و ئەمری دا بەسوڵتان حوسێن و هەموو ئومەراکانی

کوردستان کە لەوەختی لزوومدا لەشکر بۆ میر حوسێن کۆکەنەوە و بچنەسەر میر حاجی شێخ و دەریکەن و بەزۆر میر حوسێن بکەنە حوکمدار.

حوکمدارەکانی کوردستان بەلەشکرەوە بۆ یاریدەدانی میر حوسێن ئامادەبوون و لەشکریان هەڵگرت و ڕوو بەخاکی بابان خشان.

میر حاجی شێخ بەهێز و قووەتیەوە چووە پێشیان، لە پاش گەلێک شەڕکردن میر حاجی شێخ بەسەریاندا زاڵبوو و هەمووی شکاندن و بەکەیفەوە گەڕاوە خاکی خۆی. میر حوسێن و براکانی بەشپرزەیی چوونەوە ئەستەمبووڵ و ناردرانەوە بۆ ڕۆم ئیلی.

ساڵی نۆسەد و چل و یەک سوڵتان سلێمانی قانوونی بۆ گرتنی بەغدا لە هەولێرەوە کەوتە ڕێگا و دەستی بەموخابەرەکرد و لەگەڵ میر حاجی شێخ بناغەی خۆشەویستی دامەزراند، ئیتفاقیان دەست پێکرد. سوڵتانی ڕۆم بەبهانەیەک دیتنی میر حاجی شێخی خواست.

میر حاجی شێخ سەربەخۆ و بێ پرسیاری کەسێک کەوتە تەدارەکی چووینە بەغدا. هێندێک تێگەیشتوو و زانایانی میللەت ئەوەیان بەچاک نەزانی و بۆ نەچوونیان پێ گوت. ئەویش گوێدێری نەدەکردن و دەزگای خۆی هەڵگرت و کەوتە ڕێگا.

لە ناحیەی مەرگە لە جێگایەک دابەزی کە چێشتان بخوا، لەگەڵ نوێژی نیوەڕۆ خەریک بوو. کۆمەڵێک کورد پەلاماریان دایێ و لە نوێژدا کوژتیان. ئەمیر بەگی برای بۆ بەرابەری ئامادەبوو، ئەویشیان کوژت و چەند پیاوێکی هاوفیکریان بوون کوژران.

میر حاجی شێخ دوو کوڕی لە پاش بەجێما: یێکەم میر بۆداق، دووەم میر سارم.

## حوکمداری میر بۆداق کوڕی میر حاجی شێخ

کە میر حاجی شێخ کوژرا بەئیتفاقی هەموو گەورەکانی کوردان میر بۆداقی کوڕە گەورەیان کردە حوکمداری بابان و هەموو لەشکر و گەنجینەی باوکیان خستە ژێر فەرمانیەوە.

لە بەغدا واقیعەی میر حاجی شێخ بەسوڵتانی ڕۆم گەیشت و سەربهوردیان پێگوت. سوڵتانی هوشیار پێشدەستی کرد، بۆئەوەی قامکی تێوەردانی بکەوێتە کوردستانی بابانەوە، گرتی فەرمانێکی توغرای بەناوی میر بۆداقی حوکمداری بابانەوە نوویسی و حوکمداریی تەسدیق کرد و قاقەزێکی تایبەتی بۆ کوردەکان نوویسی کە ئێوە موسڵمانن و تابیعی شەریعەتن و دەبێ سەر لە فەرمانی خەلیفەی ئیسلام نەپێچنەوە و بەهەموو

جۆرێک ئیتاعەی بکەن و ئیتاعەی میر بۆداق کردنتان لەسەر لازمە و دەبێ بەحوکمدارێکی خۆشەویستی خۆتانی بزانن.

لەوەدا سوڵتانی ڕۆم چاپلووسیێکی زۆر پڕی نواند و بەنچەیکی خستە نێو کوردەکانی شارەزوورەوە و بۆ دەسیسەی پاشەڕۆژ کارسازیی دەکرد. کە میر بۆداق بوو بەجێگانشینی باوکی، دەستی بەدامەزراندنی مەملەکەت و ڕێکخستنی لەشکر و ئاسوودەگی ڕەعیەت کرد. بەهەموو تەرزێک ئومووری حکوومەتی بابانی پێکهێنا و خاکی بابانی بەچاکی کردە پارچە حکوومەتێکی زۆرچاک و لە ئاواکردنی شار و بازێڕ و فرەکردنی کڕین و فرۆتن و گەورەکردنی فەرمانڕەوایی تەقەلای دەدا. بەخۆشی و نوازش هەموو میللەتی کردە موتیع و مونقادی خۆی.

میر بۆداق بەبێ مونازەعە و شەڕ و ئەزیەت شازدە ساڵ لەسەر خاکی بابان و شارەزوور حوکمداریی کرد.

میر حوسێنی کوڕی میر سلێمان -کە لەپێشدا باسیان کردا- پەنایان بۆ ڕۆم بردبوو، بەتکای سوڵتان حوسێنی میری ئامێدی و بەقاقەزی سوڵتانی ڕۆم، بۆ خاکی بەبە گەڕانەوەیان لە تەرەف میر بۆداقەوە قبووڵ کرابوو. لە نەتیجەدا دەسایسی دوژمن دەستبەرداریان نەبوو؛ خستنیە سەر هەوا و هەوەسی حوکمداری. هەستان بەپەنهانی ڕوو بەئامێدی هەڵاتن و پەنایان بۆ میری ئامێدی برد.

حوکمداری بادینان عەریزەیەکی دوورودرێژی بۆ ئەستەمبووڵ نارد کە میر حوسێن دەیەویست حکوومەتی شارەزوور لەژێر ئیدارەی سوڵتاندا بخاتە ژێر حوکمی خۆیەوە، بەبەگلەگی یا میر سنجاغێکی ڕۆمی لەسەر دانیشێت، بەشەرتی یارمەتی گرتنی لە تەرەف سوڵتانەوە بێت.

خونکاری ڕۆم چتێکی لێ خواسترا کە هەمیشە ئارەزوو و دڵخوازی ئەوە بووە. دەزبەجێ فەرمانی بەتوغرا بۆ میر حوسێن نوویسی کە بەحوکمداری بابان نەسب و میر بۆداق عەزل کرا و قاقەزی لە هەموو ئومەرا و بەگەکانی کوردستان نوویسی کە بەهەموو تەرزێک لەشکرکێشی پێویست بێت و هەرچییەکی میر حوسێن بخوازێت، کۆمەگی بکەن و بیبەنە سەرتەختی شارەزوور و دایبنێن و بەزۆریی خاکی بابانی بۆ بگرن.

سوڵتان حوسێن حاکمی بادینان و گەلێک لە ئومەرایانی کوردستان لەشکرێکی قورسیان بۆ ڕێکخست و هەستان چوونە سەر شارەزوور.

میر بۆداق بۆ ئەمەی خوێنرێژی نەکرێت، هەستا ڕوو بەئێران ڕۆیشت و پەنای بۆ شاتەهماسب ی سەفەوی برد و بەئیحترام و ئیکرامەوە قەبووڵ کرا. میر حوسێن بەبێ ئەزیەت چووە شارەزوور و بەپشتیوانی حاکمی بادینان و ئومەرایانی کورد، دەستی بەفەرمانڕەوایی کرد.

لەو مەسەلەیە شەش مانگ بەسەرچوو؛ ڕۆستەم پاشای وەزیری ئەعزەمی ڕۆم لەگەڵ میر بۆداقا دەستی بەموخابەرەکردن کرد و دڵخۆشی داوە و دەرعەهدە بوو کە حوکمداری بابانی بداتەوە. لە نەتیجەی موخابەرەدا میر بۆداق ئەمنیەتی پەیداکرد و ڕۆیشتە ئەستەمبووڵ و بەشەرت و قەراری ئەمە کە لە ژێر ئیدارەی ڕۆمدا بێ، حکوومەتی بابانی پێ بەخشراوە و خەلاتکرا و فەرمانی دووبارەی بۆ نووسراوە. میر بۆداق کە فەرمانی درایێ، هەستا ڕوو بەخاکی بابان گەڕاوە دوایێ.

لەولاوە میر حوسێن کە لەوە ئاگاداربوو، کەوتە تەقەلاوە. کە میر بۆداق گەیشتە جێگایەکی کە بە«ڕابیەی بۆداق» دەناسرا، میر حوسێن و براکانی بە هەشت هەزار سوار و پیادەوە پێشوازی میر بۆداقی کرد. شەڕ و کوژتار گەرمەی تێ نەکەوتبوو دە کەس نەکوژرا بوو، میر حوسێن و براکانی ڕوویان لە هەلاتن کرد و بەری خۆیان دایە دەرگای سوڵتان.

میر بۆداق بەشاد و خۆشی لەشکریانی نوازشکرد و بڵاوەکانی گردکردنەوە و هەموو ئەمین و ئاسوودە خاتری کردن و بەکەیفەوە چوونەوە شارەزوور و دەستیان بەئوموووری حوکمداریی کردەوە.

کە میر حوسێن هەلات و چووە ئەستەمبووڵ، سەربهوردیان بەسوڵتان گوت و هێندێ لە پاشا و پێشکاران تکایان کرد کە کاروباری میر حوسێن ڕاست بکەن.

سوڵتانی ڕۆم فەرمانی نوویسی کە میر حوسێن و میر بۆداق پێکەوە حوکمداری بابان بن و هیچ کامێکیان لە ئەمری سوڵتان دەرنەچن.

میر حوسێن بەتالووکە فەرمانەکەی هەڵگرت و ڕووی لە شارەزوور کرد و لە هەموولاییێکەوە لەشکری کۆکردەوە و بەقووەتێکی قورسەوە چووە سەر میر بۆداق. لە نێوانی هەردووکان شەڕ و کوژتار ڕوویدا لە مەیدانی شەڕدا میر حوسێن و ڕۆستەم بەگی برای لە دەست میر بۆداق بەکوژت چوون و بەتەواوی ماڵ و ئەسپابیان بەتالان گیرا و باقی لەشکرێکی لەگەڵ بوو بەپەرێشانی و شپرزەیی لە مەیدانی شەڕ ڕزگار بوون. میر بۆداق بەکەیف و شادمانییەوە گەڕاوە خاکی خۆی.

که خەبەری کوژتنی میر حوسێن بەسوڵتانی ڕۆم ڕاگەیاندرا، کەوتە غەزەبەوە و ڕقی هەستا و ئەمری دا کە هەموو ئومەرا و سەردارانی کوردستان و سوپاه و عەسکەری ڕۆم - کە لەو نزیکانە بوون -بەهەموو هێزێکەوە بچنە سەر میر بۆداق و تەئدیبی بکەن. ئەو لەشکرە قورسە بەجارێک ڕوو بەکوردستانی بابان خشا.

میر بۆداق کەوایزانی تەوانای بەرابەری نەبوو، لەبەر چەند جار شەڕکردنی نەدەشیا شەڕ بکات؛ بەناچاری چوونە لای حاکمی بادینان و هەستا ڕوو بەئامێدی ڕۆیشت.

سوڵتان حوسێن چلۆنەتی میر بۆداقی بۆ ئەستەمبوڵ نوویسی و تکای کرد لە گوناهی ببوورێت و لە کردەوە و کۆششی چاو بقوچێنێت و حوکمداری بابانی بداتەوە و ئەمریش بدات کە لەشکرەکەی چوونە شارەزوور بگەڕێنەوە، سوڵتان لە گوناهی بۆداق گوزەشتی کرد؛ بەڵام لەبری خاکی بابان ئەیالەتی عەینتابی بەسنجاغی دایێ، بەشە خاکی بۆداقی دا بەوەلی بەگ ناو پیاوێکی نەناسراو.

میر بۆداق بەناچاری دەستی لە زێدی باب و باپیری هەڵگرت و چووە عەینتاب و بەمیر سنجاغی دەستی بەفەرمانڕەوایی کرد و شارەزوور کەوتە ژێردەستی نەیارانەوە.

میر بۆداق موددەتێک لە عەینتاب ماوە، لەوەدەمەدا شازادە بایەزید و سەلیم لە قۆنیەدا لێک دڵگیربوون و بەگژیەکدا چوون. ئاوری شەڕ و فیتنەی ئەوان میری کوردان بۆداقی تێدا سووتا؛ چونکە دوژمن لە هیچەوە بەهانەی دەگرت. ئەوە ببوو بەوەسیلە گۆیا ئەو دوو شازادانە کە لە قۆنیە گریبانگیری یەکتربوون لە عەینتاب میر بۆداق سەبەب بوو و لەگەڵیان ڕێککەوتووە و ئاوری فیتنەی خستۆتە نێوانیانەوە.

لەسەر ئەوە سلێمان قانوونی میر بۆداقی خواستە شاری کۆتاهیە. بەو بهانەیەی کە گوترا، بەداریدا کرد و خنکاندی و سەرەکەشی بەڕمەوە کرا و لەپێش بارەگای سوڵتاندا چەقاندرا. دوو شازادەی لەگەڵ یەک شەڕ بکەن، میرێکی گەورەی کوردان بکوژرێت.

کە میر بۆداق کوژرا چوار کوڕی لە پاش بەجێما: میر حاجی شێخ، میر حوسێن، میر محەمەد، میر سەیفەدین.

میر حاجی شێخ لەگەڵ بایەزید سوڵتان هەڵاتن و پەنایان بۆ شاتەهماسبی سەفەوی برد! لە ئێران حەپس کران و لە پاشان کوژران. میر محەمەد لە تەرەف سوڵتانی ڕۆمەوە کرا بەمیر سنجاغی شاری «کستانە». میر سەیفەدین بەمەرگی خۆی مرد، بەوجۆرە ئەو بنەماڵە پووچکرانەوە.

## حوکمداری میر خدر کوڕی میر حوسێن کوڕی میر سلێمان

که میر بوداق ناردرا سەر سنجاغی عەینتاب و وەلی بەگ کرا بەحاکمی بابان، میر خدر بەواسیتە و تکا بوو بەشەریکی وەلی بەگ و پێکەوە حوکمدارییان دەکرد. لە پاشان بەفەرمانی سوڵتان ناحیەی مەرگە و شاربازێڕ و ئەترافانی درا بەخدر و وەلی بەگ لەسەر باقی خاکی شارەزوور دامەزرا. لە دواییدا میر خدر بەدەسیسە وەلی بەگی لەنێوبرد و هەموو شارەزووری خستە دەست خۆی. هەتا ساڵی ٩٩١ شارەزوور لە دەست میر خدر دابوو.

## حوکمداری ئەمیرە بەگی کوڕی شێخ حەیدەری موکری

ئەمیرە بەگ لە ساڵی ٩٩١هـ دا هەروەکو خاکی هەولێر و مووسڵی خستە ژێر حوکمی خۆیەوە، حکوومەتی بابان دیسان کەوتە سەر موکریان. ئەمیرەبەگ کە خاکی بابانی گرت، موددەتێک میر خدری بابانی ڕاگرت و نەیشکاند و ئیدارەی دەکرد. لە پاشان میر خدر کەوتە خۆ ڕزگارکردن. ئەمیرەبەگ لەوە ئاگاداربوو، خۆشییان لێ بوو بەشەڕ و کوژتار، موددەتێک بەناخۆشی ڕایانبوارد. میر خدر بەمەرگی خۆی مرد و شەڕ و کوژتاریش تەواوبوو؛ بنەماڵەی بابانیش دواییان هات.

حکوومەتی بابان خرا سەر موکریان و لەوددەمەدا ئەمیرەبەگ بەسەر خاکی تەورێز و مەراغە و دێ خۆرگان و ورمێ و موکریان و مووسڵ و هەولێر و بابان و شارەزووردا حوکمڕان بوو. خاکی بابان هەتا ساڵی هەزاری هیجری لەژێر حوکمی ئەمیرەبەگ حوکمداری موکریدا بوو. خاکی بابان لەوساوە بێ گەورە ماوە، عەشیرەتەکە بۆ خۆیان لەگەڵ ئیدارەی خۆیاندا خەریک بوون و چوار هەزار سوارەی بەچەکیان بۆ شەڕ و پاسی میللەت ڕاگرتبوو.

شەرەفنامە دەڵێت: بەهیچ کلۆجێک ئیتاعەتی کەسیان نەدەکرد و بۆ خۆیان حوکمداریان دەکرد. هەر ئاغایەک لە ئاغایانی دێهات، گەورەی ناحیەیەکی دەرعەهدە کردبوو. دیسان دەڵێت: هیچ حکوومەتێک بەزۆر نەیتوانیوە دراوێکی سووریان لێ وەرگرێت. بابان بەوجۆرە مانەوە، وەکو کۆمەڵە عەشیرەتەکان بۆ خۆیان ئیدارەیەکی یەکەتیان دەکرد و لە کەس نەدەترسان. هەروەکو بەتەفسیل لە بەندی داهاتوودا نیشان دەدرێ.

## بەندی چوارەم

### سوننی و شیعەیی (١٠٥٥ - ٩٩٠)

هەرچەندە لە هەموو کوردستاندا شیری تیژی ئەو دوو نێوە لە ساڵی ٩٢٢وە بەگەرمی کوردەکانی لە مەیدانی خوێناویدا گەوزاند و دوو کورد بەدوو نێوانەوە بۆ دوژمن یەکتریان دەکوژت؛ بەڵام لە خاکی شارەزووردا چونکو حوکمدارێکی سەربەخۆ لە بنەماڵەی بابان نەمابوو، میللەتی بێ سەردار چاکتر بوون بەئالەتی دەست و بۆ خۆ بەکوژدان ئامادەتربوون. پیاوێکی گەورەی بیرتیژ نەبوو ببێتە دیوارێکی قایم، ڕێگا بەدوژمنانی بگرێت. جا لەبەرئەوە هەموو ڕۆژێک کوردستانی شارەزوور دووچار بەتاڵان و کوژتار دەبوو. ئێران بەناوی شیعەتییەوە سێڵاوی بەڵای بەسەر کورداندا داژۆت و خونکاری ڕۆم بەئالەتی سونییەتەوە کوردەکانی تووشی شەڕ و موسیبەت دەکرد.

لە هەردوولاوە کوژتاری یەکتریان بەغەزا دەزانی و هەردوو حکوومەت تەمای گرتنی خاکی یەکتریان بکردبا، چاوڕاوی ئەو دەوئاڵەوە بڕندە کوردی لەبەر پێیاندا دەچواند و کوردستانی تێدا وێران دەکرا.

وەکو لە بەندی ڕابردوودا باسکرا، شارەزوور و خاکی بابان بێ گەورە و سەردار ماوە؛ موددەتێک لەژێر فەرمانی حوکمدارەکانی موکریان دابوو. ساڵی هەزار و سی و شەش حافز پاشای سەرداری عەسکەریی ڕۆم لە ئەستەمبووڵەوە بۆ گرتنی بەغدا کەوتە ڕێگا. لە مانگی شەوالدا گەیشتە مووسڵ. میر و بەگ و ڕوئەسایانی کوردستان خەڵەتاندران، بەناوی جیهادی ئەعزەمەوە لەگەڵ قزڵباش شەڕکردن غەزایە و لەسەر هەموو موسڵمانێکی سوننی واجیبە بەماڵ و گیان لەو ڕێگایەدا تێوەچێ. لە تەرەف مەلا و ڕۆحانییەکانی کوردستانەوە چاو و ڕاوکرا.

شێخ شەمسەدینی نەقشبەندی -بەشێخی ورمێ ناوبانگی کردبوو- پیاوێکی گەورە و بەدین و خاوەند قسە و فەرمانڕەوای کوردان بوو. کەوتە نێو کوردستانەوە و میللەتی خستەسەر هەوەسی جیهاد.

ئومەرا و گەورەکانی کوردستان بەلەشکر و هێزەوە ڕوو بەمووسڵ چوون کە لەگەڵ سەرداری ڕۆمێ بچنە قزلّباش کوژتن و خاکی پاکی دارولسەلام لە دەست قزلّباش ڕزگارکەن.

کە بەو قووەتەوە گەیشتنە مووسڵ، حافز پاشا گەلێک شادمان بوو بۆچی دەبێ شادمان نەبێ؟ بەبێ ئەزیەت و مەسرەف لەشکرێکی جەنگاوەری مفتەی دەست کەوت. یەکەیەکە گەورەکانی بانگهێشتن کرد و پێی دەگوتن مەرقەدی ئیمامی ئەعزەم و حەزرەتی غەوس و جونەید و شێخ مەعرووفی کەرخی لە دەست قزلّباشاندا کراوە بەتەویلە و ئێمە دەبێ لەسەر خۆمانی فەرزکەین بۆ هێنانە دەستیان گیان فیداکەین.

ئەگەرچی وانەبوو و لە تەرەف قزلّباشانەوە بێ ئیحترامی بەسەر ئەو مەرقەدانەدا نەهاتبوو، بەڵام ئەو قسەیە دەسیسەیەکی بەکاربوو لە تەرەف سەردار و عەسکەرێکی خەلیفەوە ڕوو بەڕووی موسڵمانێکی دەروون سافی کورد بێتە گوتن.

چتێکی موهیم کە بەملیۆن لیرە ساز نەدەکرا، بەقسەیەکی زۆر کورت دەست بکەوێ بۆچی دەبێ نەیگوتبا؟ حافز پاشا لەوەدا سێ قووەتی پەیداکرد؛ یەک: لەشکری کەمبوو بەکوردەکان فرە کرا؛ دووەم: کورد ماڵ نەبوون و هەمیشە جێگای ئەندێشە بوون و کەوتنەدەست؛ سێیەم: پارە نەبوو؛ بەئومەراکانی کورد بۆ جیهاد لە ڕێگای دیندا یارمەتی کرا، دراو بەموعاوەنەت کۆکراوە و ئەرزاق لە کوردستانەوە جەلب کران.

حافز پاشا بەو قووەتەوە لە مووسڵ بزووت و ڕوو بەبەغدا کەوتە ڕێگا. کە نزیک بەغدا بوو، بەئومەرا و لەشکری کورد شاری بەغدای وەتەنگهێنا و خستییە موحاسەرەوە. کوردەکان پاڵەوانانە کۆشان و زۆر بەگەرمی شاریان دەورە دا و لە هەموولاییێکەوە دەستیان بەهەڵمەت بردنی قەڵا و پەلاماردانی دوژمن کرد.

ڕۆمییەکان لە نێوانی خۆیاندا شۆرشیان تێکەوت. خوسرەوپاشا ئاغای یەنیچەری کە تەماشای کرد کورد بەجیدی تێوەچوون و بەغیرەت کێشی شەڕ دەکەن، زۆرچاک تێگەیشت بەغدا بەدەست کوردانەوە دەکرێتەوە. ناوبانگ بۆ کوردە و ئەوان هیچ ئیستفادەیەک ناکەن. خانەدانی یەنیچەریەکانی خستە سەر هەوەسی سەرکێشیی شەڕنەکردن، تاکو کورد لەوەدا پایەدار نەبن.

یەنیچەریەکان ئاڵای سەرکێشیان هەڵدا و چوونە لای حافز پاشا و بەجوێندان بەرابەریان کرد. لەو ئەسنایەدا ناردراوی شاهی ئێران لە مەجلیسدا بوو. لەبەرچاوی ئەو سووکییان کرد و لە سەرداریيان خست و پیاوێکی دیکەیان خستە سەر کار و گوتیان: ئێمە شەڕ

ناکەین و حافز پاشایان گرت و چادرەکەیان دڕاند و پەتیان لە ملی پاشا خست و هەتا مەقامی ئیمامی ئەعزەمیان بەکێشەکێشی لەسەر ڕوان ڕاکێشا.

ئەودەمەی یەنیچەری لەو سەرکێشیە دابوون، کوردەکان لە دەوری قەلا بەرابەر بەدوژمن شەڕیان دەکرد و لە هیچ ئاگادار نەبوون؛ بەڵام لەشکری ئێران لەوە خەبەردار کرابوو؛ بەگەرمی بۆ کوژتار دەکۆشان. لەوەدا گەلێک کورد لە نێوانیدا چوو. لە ئاخیردا بەناچاری دەورەی قەلایان بەردا و گەڕانەوە دوایی؛ چونکە کۆمەگیان بۆ نەچوو و بەچەک و دانەوێڵە یاریدە نەدران.

لەولاوە شاعەباسی سەفەوی لە هەمەدانەوە، بەلەشکرێکی گرانەوە بەسەر کوردستاندا ڕوو بەبەغدا ڕکێفکوت بوو. هەرچەندە ئاوایی کوردانی کە سوننی بوون و کەوتبووە پێشی وێرانی کرد و شیری بێ درێغی لە میللەت نا وەکو سێلاوێکی خوێناوی کوردستانی داگرت. کە گەیشتە شارەزوور هیچ ڕەحمی بەمیللەتدا نەهات و ورد و درشت و نێر و مێ و هەرچییەکی کەوتە بەر شیری شیعەوە ئەنجرا و کەتوپەت کرا قەلای مەریوان و زەڵم و گوڵعەنبەر ڕوخاندران و سووتان، لەوێوە ڕوو بەبەغدا بزووت و هەرچەندە عەشایری کوردی کەوتە دەست بەناوی ئەمەوە سوننیە و کوژتنی لازمە، کوژران خان و دێهاتان سووتان و کرانە خۆڵەمێش.

یەنیچەری هەر لەسەر سەرکێشی خۆیان دەوامیان کرد و ڕوو بەمووسڵ گەڕانەوەیان قەرار دا. لەو نێوانەدا داو و تەڵە بۆ کوژتاری کوردەکان بوو.

شا عەباس هەروەکو گوترا ڕوو بەبەغدا ڕۆیشت و کوردەکان هەواداری غەزاو تەرەفداری ڕۆمی بوون، بەپەرێشانی و شپرزەیی ڕوو بەچیاکانی کوردستان هەڵاتن و یەنیچەری ڕوو بەمووسڵ و دیاربەکر هەتا گەیشتنە حەلەب خۆیان نەگرتەوە و فیراریان کرد.

کە شاعەباس گەیشتە بەغدا، هەرچەندە کوردی سوننی تێدابوو کوژتنی. تەنها کوردێکی ڕزگاربوو، هەڵات و ماڵ و ئەسپابی بەردا و ڕۆیشت.

کوردستانی شارەزوور دووچار بەفەلاکەت و ئەزیەتێک بوو نەبێتەوە. دۆڵ و دەر و کێوەکانی شارەزوور بەخوێن ڕەنگاوڕەنگ کرابوو. نە ئێران ڕەحمی پێدەکردن و نە ڕۆمی جگەرسۆز بێ بەزەییان پێدابێ.

موددەتی سێ سالان کوردستانی شارەزوور و ئێران، بەڵکو کوردستانی شیمالیش لەژێر تیغی بڕندەی سوننییەت و شیعییەتدا دەکوژرا و لە حاڵەتێکی پەرێشاندا لە کێو و چیا

سەختەکاندا خۆیان دەپارازت و بەرابەر بەشاعەباس ڕادەوەستان و قوربانیان دەدا.
ساڵی ١٠٣٩ یەنیچەریەکان خوسرەو پاشا ئاغای خۆیان کردە سەدری ئەعزەم و سەرداری سوپاه و خوسرەو پاشا بۆ بەغدا گرتن و تۆڵە ئەستاندنەوە سوپاهێکی ڕێکخست و لە ئەستەمبووڵەوە دەرکەوت و لە مانگی ڕەبیعی یەکی ئەوساڵەدا گەیشتە مووسڵ. وەخت زستان و باران و تەڕ و تووشی بوو؛ لە مووسڵدا مانەوەی قەرار دا.
میر و بەگ و ڕوئەسایانی کوردستان دیسان بۆ تۆڵەکردنەوە و غەزا لەگەڵ قزڵباشاندا کۆبوونەوە و بەلەشکرێکی قورسەوە ڕۆیشتنە مووسڵ و چوونەلای خوسرەو پاشا کە گۆیا موجاهیدن و بۆ یارمەتی خەلافەتی ئیسلامی هاتوون. ئەو گەورە و ڕوئەسایانی کورد هەر ئەوانە بوون کە یاریدە و کۆمەگی حافز پاشایان کردبوو و لەپێشدا لەگەڵی چووبوونە بەغدا.
خوسرەو پاشا بەبهانەی ئەوە کە لە سەفەری بەغدایدا ئیحترامی نەگیرا و کوردەکان بەهێندیان نەگرتبوو و ئیتاعەتیان نەدەکرد، ڕوو بەڕووی گەورەکانی کورد ترشی نواند و خۆی توندکرد و بەبێ ئەهەمیەتی تەماشای کردن.
گەورەی کوردەکان لە خوسرەو پاشا کەوتنە ئەندێشە و کەدەرەوە، بەبێدەنگی لە مەجلیسی دەرکەوتن و لە جێگایەکی تایبەتیدا کۆمەڵەیان بەست و لەسەر ئەمە قەراریان دا کە بەبێ سوود و ئومێد بۆ پیاوێکی وا خۆ نەخەنە تەڵەوە و گیانی خۆیان نەکەنە قوربانیەکی وەها کە بەبێ مایە دڵ ڕەنج و خەمناکی کردن.
لەپاش ئەم قەرارە بەپەنهانی لە ئۆردوگا دەرکەوتن و بەئاشکرایی بەیداغی ئێرانیان هەڵدا و بانگی دوژمنایەتی لەگەڵ ڕۆم و فەرمانبەرداری شاعەباسی سەفەویان بەگوێی خوسرەو پاشادا دا. هەر ئەو کۆمەڵە بڵاوەی نەکرد و لە هەموولایێکەوە هێزیان پەیداکرد و ڕوو بەچیا بڵندەکان سەرکەوتن و لەشکرێکی قورسیان کۆکردەوە و قاسیدێکی توندڕەوی خۆشبەزبان نارده ئێران و قاقەزێکی زۆرجوانیان بۆ شا نوویسی و خستیانە سەر هەوەسی بزووتنەوە.
مایەی ئەوەندە ڕووترشیە هەموو ئۆمەراکانی کوردی لە خوسرەو پاشا جوێ کردەوە. خوسرەو پاشا بەدەستی خۆی کوردەکانی لە دەست دا و کردنیە دوژمن و بوو بەسەبەبی ئەمەش کە دەست لە چوونە بەغدا بەردات و بچێتە سەر خاکی کوردستان. لە مەجلیسدا گوتبووی نەچوونە سەر خاکی خان و بەگی کوردە سەرکێشەکان مەملەکەت نە سووتاندن و نە کوژانیان و چوونە بەغدا کاری عاقلان نییە.

ئەگەرچی کورد لەپێشدا دوژمن نەبوون و هەموو هێز و پشتیوانی بوون و بەئارەزووی خۆیان و دڵپاکییانەوە بۆ کۆمەگی کردنی کەمەریان گرێدابوو، چوونەلای و بەیانی گیان فیدایی خۆیان بۆ کرد؛ بەڵام ئەو کوردەکانی کردە هەواداری شاه و دوژمنی خۆی!.

خوسرەو پاشا قەراری لەسەر ئەمەدا کە بچێتە سەر شارەزوور و مەملەکەتی خانە سەرکێشەکان تالان کات و بیسووتێنی و وێرانی کات و میللەتەکەش قەتڵوعام کات و لە پاشان بگەڕێتەوە سەر بەغدا. لەسەر ئەو قەرارە عەسکەری دەنگدا و ڕوو بەکوردستان ئاژۆتی.

لە ئەوەڵی بەهاردا خوسرەو پاشا بەشار و بازێڕ سووتاندن و دێهات وێرانکردن و تالان و کوژتارکردن ڕووبە شارەزوور کەوتەڕێ، کە گەیشتە پردی سوور، «ئاڵتون کۆپری» زێی گچکە هەستابوو، لوورەی دەکرد. لە کوندە و مەشکە پردیان دروستکرد. لەگەڵ پەڕینەوە دانەوێڵە و گرانبار و حەیوانات و عەسکەر خەریک بوون، گەلێک حەیوانات و عەسکەر و بار و ولاغ بەئاودا چوون و خنکان. هەتا بانگی شێـــوان هەر لە پەڕینەوەدا بوون. زۆرکەمیان بۆ ڕزگار بوو؛ گەلێکیان لەبەری دیکە مانەوە، تا بۆ سبەینێ بپەڕنەوە، لە کەنار چۆمی دابەزین و مانەوە.

شەوێ کوردەکان لە هەردوولای چۆمەوە شەوەیخوونیان بردنێ و ماڵ و ئەسپابێکی زۆریان برد و عەسکەرێکی بێ ژمارەدیشیان کوژت، جبەچی باشی حەمزە ئاغایان لە کەناری چۆمی سەربڕی و سبەینێ سەر و لاشەیان دۆزیەوە و ماڵ و ئەسپاب و جبەخانەیەکی ئێواریێ پەڕاندبوویانەوە و لە دەست کوردەکان پارێزرابوون، نیوەشەو چۆم زیادی کردبوو، ئەوانیشی بردبوو. هەر لەوشەوەدا لە ئەستەمبووڵ کۆشک و بەرەی خوسرەو پاشا ئاوری تێبەربوو، بەماڵ و منداڵەوە ببوون بەخۆڵ و هەموو سووتابوون.

کوردەکانی شارەزوور بۆ دەفعی بەڵا بەرابەری خوسرەو پاشایان کرد و لەپێشی ڕانەوەستان، بەڵکو هێندێکیش پێشوازیان کرد. خوسرەو پاشا بەبێ ئەزیەت و شەڕوکێشە بەشارەزووردا ڕۆیشت هەتا گەیشتە قەڵای گوڵعەنبەر کە لەیەکە قەڵا سەختەکانی شارەزوور بوو. ئەو قەڵایە – هەروەکو باسکرا – لە تەرەف شاعەباسەوە وێران کرابوو، دیوار و بورجەکانی ڕوخاندرابوو.

خوسرەو پاشا بۆ ئەمەی بیکاتە لەشکرگابەز و بۆ هەڵمەت دانە سەر ئێران بیکاتە ناوچەی عەسکەر، دەستی بەدیوار و بورج و کونگەرە دروستکردنەوەی کرد و دەستە

لەشکرێکی پازدە هەزار کەسیشی ناردە سەر قەڵای مەریوان (کە لەمەپاش لە چلۆنی گرتنی دەدوێین) قووەتێکی کافیشی ناردە سەر قەڵای حەسەن ئاوا کە مەرکەزی خانی ئەردەڵانی بوو، کۆشک و عیمارەتێکی زۆر بەدەزگا و عەجایب و غەرایبی تێدا دروستکرا بوو.

خوسرەو پاشا بۆ وێرانکردنی ئەو کۆشکە و سووتاندنی، ئەمری دا و عەسکەرەکەشی بۆیی نارد کە وێرانی کەن.

مورادبەگ موئەریخی بەناوبانگی تورک لە کتێبی «ابو الفاروق» بەرگی پێنجەم لاپەڕەی ٣٢٦ و لە ژێر عینوانی «عەجم غایلەسی»دا بەم جۆرە باسی کۆشک و سەرای ئەحمەدخان دەکات و دەڵێت: زینات و سەنعەتکاریەکی لە سەرای قەڵاکەی حەسەناوادا بەکار برابوو، جایی تەحەییور و تەعەجوب بوو. باخسووس ڕەسمەکانی کە لە دیوار و دەرکەکانیدا دروست کرابوو، جالیبی دیقەت بوو. لە ڕەغمی مەمالیکی دیکەی ئیسلام کە خۆیان لێ دەپارازت، کوردستان و عەجەمستان گەلێک ڕەغبەتیان خستبووە سەر ڕەسم و شکڵ و وێنە، بەتایبەتی وێنەی ژنی ڕووت و منداڵی جوان و شکڵی دەعبایانی کێوی مەرغووبتر بوون.

هێندێک لە مێژوونوسەکانی دیکە زۆر بەئەهەمیەتەوە بەو کۆشک و سەرایەی حەسەناوا هەڵدەڵێن و لە کتێبە قیمەتدارەکانیاندا دەڵێن سەرای ئەحمەدخان هەموو بەشکڵ و ڕەسمی نایاب و بەرەنگی جوان و قیمەتدار ڕازاندرابۆوە. بەدراوێکی زۆر و بەفەننێکی میعماری و ئوسوولێکی زۆر بەدیع و گرانبەها و بەمەسرەفێکی بێ ژمار هاتبووە وجوود.

خوسرەو پاشای بێژراو بەبێ تەئەنی و ئینساف ئەو کۆشکە نایابەی بەعەسکەرەکانی ڕۆم خراپ کرد و ئاوری تێبەردا و کردیە خۆڵەمێش. ئەو بزووتنەوەی خوسرەو پاشا دەماری کوردەکانی زیاتر گوشی و خوێنی گەرمی ئەو میللەتەی چاکتر خستە جۆشەوە.

لەوە موهیمتر و عەجایبتر سەربهوردی سەردار محەمەدخانی غەزۆییە، کە بەبێ گوناه و سووچ، پارچە پارچە دەکرێت. محەمەدخان حوکمداری غەزۆ سەردارێکی گەورەی کوردستانی شیمالی بوو. بەهەموو لەشکری کوردستانی شیمالەوە لەگەڵ خوسرەو پاشا کەوتبوو کە لە شەڕی قزلباشدا یارمەتی بدات.

خوسرەو پاشا بەلەشکرەکەیەوە خستبوویە ژێر حیمایەتی قلیجیزادە ناو پیاوێکی

تورکەوە و بۆ پێشەوە کردبوویە پێشمەرگەی لەشکری ڕۆمیان. لە هەموو جێگایەکدا پێشداربوو، دوژمن شکێن و عەجەمرفێن بوو، بەعیبارەتێکی دیکە، وەزیفەی محەمەدخان ڕێگا پاککردنەوە و دوژمن لەپێش لابردنی بوو، خوسرەو پاشاش لە دواوە دەچووە سەر جێگای خاوێن و بێ شەڕوشۆڕ.

محەمەدخان لەپێش عەسکەرەوە هەمیشە بەدوو سێ مەنزڵ شەڕی دەکرد و مەردانە دەکۆشا و شەعشەعەی ئازایەتی کەوتبووە نێو ڕۆم و عەجەمەوە. ناوبانگی پاڵەوانەتی گوێی دۆست و دوژمنی پڕکردبوو.

خوسرەو پاشا لەو ناوبانگە و خۆناسین دانی محەمەدخان ڕقی بوۆە و ناردیە دوای و خواستییە لای خۆی و بەبهانەگرتن لێی توندبوو و هەڕەشەی لێکرد و لەنێو خەڵکدا شکاندی. خانی غەیبوری پاڵەوانی حەمیەتمەند، هەڵگرتنی قسەی ئاغایەکی یەنیچەری لەلای زۆر سووکایەتی بوو، دەستی دایە شیر و لە کالانی دەرخست و دایهێنایە سەر خوسرەو پاشا. لەوەدەمەدا حاجی ئیواد سلێمان کە لە هەیئەی خوسرەو پاشا بوو، بەناوبژی کەوتە پێشەوە و دەستی بۆ شیرەکە ڕاگرت، شیری ئاوداری تیژ سێ قامکی حاجی ئیوادی کەپەلکرد لە کولەکەی نێوەڕاستی چادر کەوت و قەڵمی کرد و چادریان بەسەردا کەوت.

خوسرەو پاشا چونکو لە کەنار چادرەوە بوو، زۆر بەچالاکی لە ژێری دەرپەڕی و هاواری لە عەسکەر کرد، لەنێو چادردا نەیانهێشت محەمەدخان دەست بزێوی بکا، لەتوپەتیان کرد.

نۆکەرەکانی محەمەدخان بەشیر و خەنجەر کەوتنە نێو عەسکەرەوە و لە پاش عەسکەر کوژتنێکی زۆر، ئەوانیش کوژران و پەلپەل کران.

ئەو مەسەلەیە بوو بەمایەی شەڕوشۆڕ و تێکچوونی ئومەراکانی کورد و سەرکێشیان بەجارێک کەوتنە ڕێگا و دەستیان لە مەیدانی شەڕی دوژمن بەردا. خوسرەو پاشا کەوتە تەقەلاوە؛ هەرچەندە ڕجاکار و ناوبژیان خستە نێوانی چارە نەبوو. ناردی قلیچیزادەی گرت و بەسێدارەی داکرد و خنکاندی کە گۆیا ئەو فەسادیی کردووە کە محەمەدخان بکوژرێت؛ لە تۆڵەی ئەو فیتنەیە بەجەزای خۆی گەیشت.

بەو فێڵەی کە قلیچزادە بێ گوناه کوژرا، کوردەکانیش نەرم بوونەوە و گەڕانەوە لەشکرگا، خوسرەو پاشا بەخەڵاتکردن و بەخشش و ئینعامێکی زۆر نوازشی کردن و دڵی ئەستاندنەوە.

لەولاوە شا عەباس کەلێنی لەو شۆڕشە دەستخست و لەشکرێکی قورسی کێشا هەمەدانەوە کە بەسەر عەسکەری ڕۆمیاندا بدات. بەپەنهانی عەیارانی دەنارده نێو عەسکەرەوە، بەشەو سەری زابتان و زگی پیاوە گەورەکانیان دەدڕی و عەسکەریان دەکوژت.

بەو بزووتنەوەی عەیاران، خوسرەو پاشا و عەسکەرەکەیان بەجارێک هەراسان کردبوو. شەو نەبوو چادر و ئەنبار و قۆرخانە ئاوری تێبەر نەدەن.

خوسرەو پاشای ڕۆم، محەمەد ناوی بەبلۆکێک عەسکەرەوە نارده سەر عەیارەکان و جێگاکەیانی دۆزیەوە و دەورەدران و دەستیان کرد بەکوژتار، لەو عەسکەرە چوارێکی ڕزگار نەبوو و کوژرا؛ لە نەتیجەدا ئەحمەد هۆزە و هاوالانی کە عەیاربوون گیران و کوژران.

دەستە عەسکەرێکی خوسرەو پاشا کە لە گوڵ ئەنبارەوە ناردرابووە سەر قەلای مەریوان، لەشکری حەلەب و شام و ئەدەنە و سیواس و یەنیچەری ڕۆم ئیلی، هەریەک بەبیگلەربێگی خۆیانەوە پازدە هەزار کەس ناردرابوونە سەر قەلای بێژراو. ئەو لەشکرە بەبێ شەڕ و ئەزیەت، چوونە نێو قەلاوە و زۆر بەئاسانی گرتیان و خستیانە ژێر حوکمیانەوە.

زەینەلخان کە لە تەرەف شاهی ئێرانەوە بەسەردار سوپاهی ناودرابوو فریانەکەوت کە لە پێش ڕۆمیاندا بگاتە مەریوان و یارمەتی ئەوێ بکا. بەچل هەزار سوپاهەوە گەیشتە نزیک مەریوان. کە زانی قەلا کەوتۆتە دەست دوژمنەوە، بۆ شەڕ و پەلاماردانی ڕۆمی لەشکرەکەی ڕاگرت و ئاڕایشی دا.

ڕۆمییەکان لەشکری کوردەکانیان کردە پێشمەرگە و ناردیانە سەر لەشکری ئێران و بۆشیان بوونە دومبال. هەردوو سوپا لە بەرابەر یەکتر ڕیزبوون و دەستیان بەشەڕ و کوژتار کرد. لە نزیک قەلای مەریوان لە مانگی نیسانی سالی ١٠٣٩دا کوژتار و خوێنرێژی دەست پێکرا و لە موددەتی دوو شەو و دوو ڕۆژان کوردەکانی تەرەفداری ڕۆم لەشکری ئێرانیان شکاند و پەرێشانیان کردن. چەند قەلا و دە فیل و هەزار کەللەی سەری پیاو و دوو هەزار ئەسیریان بەدیاری بۆ خوسرەو پاشا نارد. ئەویش لەسەر ڕەوشتی خۆیان هەموو ئەسیرەکانی کوژت. هەرچەند ئەسیرەکان پاڕانەوە بەزەییان پێیاندا نەهات. تەئریخی «نەعجا» و «ابو الفاروق» ئەو کوژتارە زۆر بەئەسەف و وەحشەت ئەنگێزی دەنووسنەوە.

له مانگی حوزەیرانی ئەو ساڵەدا هەمەدان بەدەست کوردەکان گیرا و خرایە ژێر پەنجەی ڕۆمیانەوە.

کە خوسرەو پاشا گەیشتە سەر حازروبازر، ئەمری دا ئاوریان لە شار و بازێر و باغوباغچەی هەمەدان بەردا و تالانکرا و ڕوخاندرا، بەڕەوشتی جەنگیزیی و خووی خۆیان میللەتی بێ گوناه شیری تێنرا و باغ و بێستانی جوان و ڕەنگینی سووتاندرا. خانووبەرە و کۆشکی نەقشکراو و ڕەنگاوڕەنگ و ڕازاوەی وێران و خراپ کران.

کە شارێکی ڕەنگین دووچار بەو زللەیە کرا خوسرەو پاشا بەشار و دێهاتی کوردستاندا جڵەوی بەر بەبەغدا سووڕاند، لە کوردی لوڕ و کەلهوڕ و گۆران و گەڵباغی -کە ئاواییەکانیان کەوتبووە سەر ڕێگا- لە میللەتەکەی ئەوێ دەست کەوت کوژرا و هەرچەند دێهات و ئاوایی هەبوو سووتاندرا و خراپبوو،وەماڵ و ئەسپابیان بەتالان برا.

باباخان حوکمداری لوڕستان، بۆ ئەمە پێش بەو سێلاوە خوێن خوارە بگرێت، لەشکری هەڵگرت و چوو ڕێگای پێ گرتن و شیری تێنان. تەواوی ئەو قوڵ و ئەو ئۆردوەی کە سی و شەش هەزار عەسکەری شەڕکەری ڕۆمی بوون، مەحووکرانەوە و کوژران. لە دوای ئەو خوسرەو پاشا بەلەشکرێکی پێبوو، گەیشتە پێشەوە ودەستیان بەشەڕکرد. لە دوای گەلێک کوژتار، باباخان بەدیل گیرا. خوسرەو پاشا لە خووڕەوشتی باباخانێ خۆشی هات و حەزی لە قسە و گفتوگۆکانی کرد و لە کوژتنی بهورد و کردیە نەدیمێکی خۆی.

لەشکری ڕۆم لە مانگی ئەیلوولدا گەیشتە بەغدا. لە تشرینی دووەمدا دەستی بەدەورەدانی بەغدا و وەتەنگهێنانی کرد. میر جەمال و میر فەتاح کە هەریەک میرێکی گەورەی کوردان بوون و لە تەرەف شاهی ئێرانەوە فەرماندەی سوپاه و حاکمی بەغدابوون، بۆ بەرابەری ڕۆمیان ڕاوەستان و دەستیان بەنەهێشتنی نزیکبوونەوەی ڕۆمیان کرد. لە دەوری قەڵا نغوومیان لێدا و پڕ باروتیان کردن، کە ڕۆمی نزیک دەبوونەوە لە پڕێکا ئاوریان دەکردن. بەو تەرزە گەلێک عەسکەر و چەند پاشایەکی گەورەی ڕومیانیان کوژت و زەرەرێکی زۆریان لێدان.

چەند ڕۆژێک لەسەریەک بەوجۆرە خوسرەو پاشا تەمای هەڵمەتدانی قەڵای دەکرد و لە تەرەف ئەو دوو ئەمیرە کوردانەوە بەتەرزی بێژراو بەرابەریان دەکردن و لە هەموولایێکەوە عەسکەری ڕۆمی وەتەنگهاتن.

خوسرەو پاشا بەدڵگیری و شکاوی عەسکەرەکەی هەڵگرت و ڕوو بەچادری خۆی گەڕاوە

و له داخان هەموو دونیای لێ وەتەنگهاتبوو؛ بەتووڕەیی و نیوچاوگرژی چووە چادرەکەی. هەرچەندی دەکرد ئاوری ڕقی نەدەکوژاوە و ناردیە دوای باباخانی حاکمی لوڕستان -کە لەپێشدا لێی دواین- خواستیە پێش خۆی و پێی گوت: تۆ هەم کوردی و هەم شیعەی. لەلای چەند کەسێکت وەسیەت کردووە ئەگەر شەهیدکرای بدبەنە کەربەلا بتنێژن. بەو بهانەیە ڕقی ئەو دوو ئەمیرە کوردانەی لەسەر بەغدابوون، بەباباخانی ڕژت و دەزبەجێ لەبەر چادرەکەی بەسێدارەیدا کرد و کوژتنی. ئەو ڕۆژە (٨) هەشتی مانگی سەفەری سالی ١٠٤٠ بوو کە ئەو پیاوە گەورە کوردە بەبێ گوناه خنکاندرا و کرا بەقوربانی بهانەیەکی جەنگیزانە.

خوسرەو پاشا بەوەش کەفوکولی نەنیشتەوە؛ تەمای دەستهاوێژتنی کوردەکانی شارەزووری کرد کە لە گەڵیا شەڕیان بۆ دەکرد. کوردەکان نەیانهێشت خۆ ببزێویت، پۆل بەپۆل و دەستە بەدەستە لە لەشکرگا دەرکەوتن، هەتا بوونە قووەتێکی وا کە خوسرەو پاشا نەتوانێ دەزدرێژیان بۆ بکات. ئەو کۆمەڵە ڕوو بەکوردستان گەڕانەوە.

لەولاشەوە عەسکەرەکەش تەوانایی بەرابەرکردنی میر فەتاح و میر جەمالیان نەبوو؛ لە دەورەدان سست بوون و لە شەڕکردن دەستیان کێشاوە.

خوسرەو پاشا لە دوای گەڕانەوەی کوردەکان، بەپەرێشانی و شپرزەییەکی زۆر پیس ڕوو بەمووسڵ و لەوێشەوە ڕوو بەماردین هەڵاتن؛ بەهەزار ئەزیەت زۆرکەمیان گەیشتنە ماردین. لە ڕێگادا کوردە دڵ برینداری جگەرسووتاوەکان ڕێگایان پێ دەگرتن، بەکوژتن و بەڕووتکردن تۆڵەیان لێ دەستاندن. لەوەدا گەلێک تەلەفات بەڕۆم درا.

وەختێکی خوسرەو پاشا لە هەمەدانەوە ڕوو بەبەغدا ڕۆیشت - وەکو باسکرا - پێنج پاشا (کە ئەمانە بوون عومەر، ئەبدال، بەکر، مستەفا، ئیبراهیم پاشان) بەقووەتێکی قورسەوە لەسەر شارەزوور دانابوون. لەوێدا بەدامەزراندنی عەسکەر و دانەوێڵە و زەخیرە وەخرکردن و تالانکردنی میللەتی کورد خەریک بوون کە لە وەختی لزوومدا بینە کۆمەگیدەری خوسرەو پاشا و لە زەخیرە ناردن بۆ عەسکەر بکۆشن.

کە خوسرەو پاشا لە بەغداوە بەشکاوی ڕوو بەماردین هەڵات، ئەحمەدخانی خاوەندی قەڵا و کۆشکی حەسەناوا کە بەدرێژی باسکرا، لەناکاو بەلەشکر و هێزێکی قورسی کورد لینگی دا سەر شارەزوور و پەلاماری ڕۆمیانی دا و شیری بێ دریغی تێنان و دەستی بەکوژتاریان کرد و ماڵ و ئەسپاب و چەک و موهیماتێکی بێ ژماری لێ گرتن. ئەو پێنج

پاشا ناوداره سەر عەسکەرانە، بەهەزار فێڵ و حیلە بەتەنها سوارە توانیان خۆ لە پەنچەی ئەحمەدخان رزگارکەن؛ هەرچەند عەسکەر و چادر و ئەسپابیان بۆ ئەحمەدخان بەجێ هێشت، بەسەڵتە سوارە خۆیان گەیاندە خوسرەو پاشا گیانیان بەساغی دەرباز نەکرد؛ خوسرەو پاشاش لە داخان هەر پێنجی بەسێدارەدا کردن و خنکاندنی.

ئەحمەدخان کەوتە دووی شکستەی دوژمن و تۆپ و موهیمات و جبەخانە و ئەسپابێکی بێ ژماری دەست کەوت و هەموو خاکی شارەزووری لە دوژمن خاوێن کردەوە؛ گەڕاوە سەر قەڵای گوڵعەنبەر، چەند ڕۆمیەکی تێدابوو کوژتنی و قەڵاشی خستەوە دەست. شارەزوور لە ئەوەڵی ساڵی هەزار و چلدا کەوتە ژێر حوکمی ئەحمەدخانەوە.

ئەحمەدخان بەداد و ڕەعیەتپەروەری، میللەتێکی لە دەست جەوری ڕۆمیان پەڕاگەندە ببوون، کۆی کردنەوە و خاک و ئاواییەکی سووتاو و وێران کرابوون، دروستی کردنەوە، ئەهالی بەئاسوودەگی و خۆشی دامەزراندنەوە. وردە وردە کوردستان لە سایەی حەمییەت و میللەتخواهی ئەو گەورە کوردەوە ئاوەدان کراوە؛ جووت و کار و پیشە دەست پێکرا، کڕین و فرۆتن کەوتەوە ئیش. ئەگەر ئەو پیاوە فریا نەکەوتبایە، گرانی و قاتی و نەخۆشی لە دوژمن زیاتر میللەتی قڕکردبوو؛ هەموو لە پەرێشانیدا دەمردن.

ئەحمەدخان لە لایێکەوە لەگەڵ ڕێکی وپێکی مەملەکەت و سوپا، لە لایێکەوە لەگەڵ ئاواکردن و دێهات دروستکردنەوە و ڕەعییەت کۆکردنەوە خەریک بوو، لە لایێکی دیکەشەوە بەگەرمی بناغەی دۆستایەتی و خۆشەویستی لەگەڵ سەفەوییەکان دادەنا. بەو تەرزە هەمیشە لە کۆشش و تەقەلادا بوو، هەتا پێنج ساڵان کوردستانی لە ئەوەڵ چاکتر دامەزراندەوە، وە بەئیستیقلالیەتێکی تەواو حاکمیەتی کرد.

ساڵی کووچەک ئەحمەد پاشا ئەمیری مەفرەزەی دیاربەکر - کە ڕۆمی بوو - بەپەنهانی لەگەڵ ئەحمەدخاندا دەستی بەموخابەرەکرد و کەم کەمە ناخۆشی نێوانی بەخۆشی وەرگەڕاند و بناغەی ئاشناییان دامەزراند.

شاسەفی سەفەوی - کە لەوە ئاگاداربوو- ڕقی هەستا و لەشکرێکی گرانی لەژێر فەرماندەی سەردار سوپا ڕۆستەم خاندا ساز کرد بۆ ناردنە سەر ئەحمەدخان و سەر نزمکردنی، خەریکی ئامادەیی بوو، پێویستی ڕێکدەخست.

کە ئەحمەدخان ئەوەی زانیەوە ڕۆستەم خانی دەچێتە سەر، قاقەزی لە ئەحمەد پاشا نوویسی و داوای یارمەتی لێکرد. ئەویش هەتا لە سەرداری ڕۆمی گێڕاوە و بەئەستەمبووڵ

ڕاگەیاندرا موددەتێکی بەسەرچوو. لە ئاخیردا جوابی دراوە کە: وەختی ئەوە نەهاتووە کە دڵی شای ئێران بۆ حوکمدارێکی کورد بشکێندرێ.

ڕۆستەم خان بەقووەتێکی چل هەزار کەسییەوە ڕوو بەکوردستان بزووت و کەوتەڕێ، نزیک بەخاکی ئەحمەدخان بووەوە.

ئەحمەدخان لەشکری کوردەکانی هەڵگرت و چووە پێشەوە. لە مانگی زیلحیجەی ئەو ساڵەدا گەیشتە دوژمن و سوپاکەی ڕیزکرد. هەردوولا دەستیان بەکوژتاری یەکترکرد. لە نەتیجەدا لەشکری ڕۆستەم خان شکا. لەشکری ئەحمەدخان کەوتە دووی شکستەی دوژمنیان، ماڵ و ئەسپابێکی زۆریان کەوتە دەست؛ هەتا چەند زنجیرە فیل لە ڕۆستەم خان بەدیل گیران. ماڵ و نەقدیە و چەک و چتی گرانبەهای بێ ژمار کەوتە دەست لەشکریانی ئەحمەدخان. بەشادی و خۆشی گەڕانەوە پاشێ.

کووچەک ئەحمەد پاشا کە لەوە ئاگاداربوو، سەربهوردی لە خۆی بەرەوژوورتر دا و ئەمری وەرگرت کە کەلێن دەستکەوتەوە و دەستەیەک عەسکەری هەڵگرت و ڕوو بەشارەزوور کەوتە ڕێگا و قاقەزێکی لە ئەحمەدخان نوویسی ئەوا بەعەسکەرێکی قورسەوە بەهاوارتەوە هاتم و خۆڕابگرە «یەعنی لەوە ئاگادار نییە کە ئەحمەدخان دوژمنی شکاندوە» هەروەکو ڕەوشتی خۆیان خۆی بەنەزانیی نیشان دا و کەوتە ڕێگا.

ئەحمەدخان لەوە گەیشت کە ڕۆمی بەفێڵن و لە وەختی تەنگیدا دەستی کەس ناگرن؛ کە بۆ خۆیان لێیان قەوما زۆر زوو هاوار لە دراوسێیەکانیان دەکەن. ئەحمەدخان ئەمەشی زۆرچاک زانیبوو کە کووچەک پاشا بۆ دەست بەسەر شارەزوور کێشاندا چوونە ئێرانی کردۆتە بەهانەوە ئەگەر لەگەڵ ئێرانیش شەڕ بکات، شارەزووری بەزۆر دەکاتە لەشکر و ڕێگای هاتوچوون. کەوابوو بەهەموو جۆرێک سەرکەوتنی ڕۆمی لەو شەڕەدا بۆ کورد چاک نییە و ئامادەی وێرانی کوردستانە. ئەحمەدخان زانینی خۆی پەنهان کرد و بەئاشکرا ڕێگای ڕابواردنی دا بەئەحمەد پاشا.

ئەحمەد پاشا بەعەسکەرەکەیەوە بەشارەزووردا ڕۆیشت هەتا گەیشتە قەڵای مەریوان، بەڵام ئەحمەدخان لە کۆمەگیدا بێ دەنگی ئیختیار کرد و لە دانەوێڵە و تێشووداندا نەزانین و خۆ تێنەگەیاندنی کردە دەستوور. ئەحمەد پاشا عەسکەرەکەی ڕوو بەهەمەدان ئاژۆت. لەولاوە ڕۆستەم خان لەشکرێکی قورسی هەڵگرت و لە نزیک هەمەدان بەرابەر بەعەسکەری ڕۆمی ڕاوەستا. ڕۆستەم خان زانیبوویەوە کە کوردەکان گۆشەگیرن، لە شەڕ

چیرِبوو؛ لە هەموولاییێکەوە دەستی بەپەلاماردانی عەسکەرکرد و لە مانگی ڕەبیعی یەکی ساڵی ١٠٤٦ شەڕ دەستپێکرا.

ئەحمەد پاشا ئەمری شەڕی دا. عەسکەر هەرچەندە کۆششیان کرد چارەیان لە هەڵاتن زیاتر دەست نەکەوت، چونکو لە هەموو بزووتنەوەیەکدا بەگەلە دەکوژران و بەدیل دەگیران. پاشا و عەسکەرەکەی لە شەڕکردن هەراسان بوون؛ ئەمری ڕوو بەشارەزوور گەڕانەوەی دا. عەسکەر ڕێگای هەڵاتنی لێ گیرابوو، هەرچەندە تەقەڵایان دا لە مەیدانی کوژتار ڕزگار نەبوون. لەشکری ئێران شیری بێ دریغی تێنابوون و لەتوپەتی کردن. لە نەتیجەدا ئەحمەد پاشا بەدەستێکەوە شیر و بەدەستی دیکەوە ئاڵا، ڕوو بەلەشکری ئێران هەڵمەتی برد و دەستی بەشەڕکرد. هەتا کوژرا لە مەیداندا پیاوانە شەڕی کرد. لە نەتیجەدا هەم سەرعەسکەر و هەم هەموو لەشکرەکەی ڕۆمی لە دەست ڕۆستەم خاندا نابوودبوون و هەموو ئالەتەکان کەوتە دەستیان و بەشادی گەڕانەوە هەمەدان.

ئەحمەدخان هێندێک ئەنبار و ئەسپابی ڕۆمیانی لەو شەڕەدا دەست کەوت و لە هەموو کوردستاندا لەشکری خڕکردەوە. لە ڕۆم و لە ئێران کەوتە ترسەوە کە لە ناکاو هەڵمەتی بەرنەسەری، بۆ خۆپارازتن لەشکری بڵاونەکردەوە.

ئەحمەدخان لە پاش سەربهوردی کووچەک پاشا دەستی بۆ دۆستایەتی ڕێکەوتنەوە لەگەڵ ئێران کرد [درێژ] و نێوانی خۆشکردەوە. هەمیشە پیاویان لە هاتوچووندا بوو، تخووبی شارەزوور دامەزراوە. ئەوجا لەگەڵ ئێران بوو بەسوێند خۆر.

ساڵی ١٠٤٨ سوڵتان موراد رابیع بۆ گرتنی بەغدا لە ئەستەمبووڵەوە دەرکەوت. لە مانگی شەعباندا لە ڕێی مووسڵەوە گەیشتە بەغدا و دەورەی دا. فەتاح خان حوکمداری بەغدا -کە لە تەرەف ئێرانەوە تەعیین کرابوو- (لە پێشدا لێی دواین ). بۆ بەرابەری سوڵتان موراد خۆی ڕاگرت و بەچاکی شەڕی کرد و لە هەموو دەمێکدا ڕوو بەهەڵمەتدانی سوڵتان پەلاماری دەبرد و دەیگێڕانەوە دوایی. لە نەتیجەدا سوڵتان موراد کە گەڕاوە ڕوو بەمووسڵ و دیاربەکر جڵەوی سووڕاندەوە. کوردەکانی شارەزوور نە کەم و نە زیاد خۆیان تێنەگەیاند و بەهێندیان نەگرت و نە چوونە لای و نە پرسیاریان لێکرد.

ئەحمەدخانی حوکمداری شارەزوور لە ڕێگایاندا لە بری خزمەتکردنیان، تاڵانی لە ڕۆم دەگرت و دەیشکاندن.

مورادی رابیع لەوە کە کوردەکان بەبەراوەژووی ئومێدکردنی بزووتنەوە، غەزەبناک و ڕقی هەستاوبوو، لە داخان ڕقی خۆی بەگەورە شێخێکی کوردان ڕشت و تۆڵەی لێ کردەوە و

بەبهـانە و فـێڵـەوە خنكاندی، لە بری خـەڵات سێـدارەبوو. مـوراد بێگ [لە] تەئریخی «ابوالفاروق» لە بەرگی پێنجەمدا بەم جۆرە ئەحوالی ئەو شێخە گەورەی كوردە و خزمەت و موكافاتی دەگێڕێتەوە و دەڵێت: شێخێكی كورد كە بەشێخی ورمێ ناوبانگی كردبوو و پوستنشینی نەقشبەندی بوو، بەنفووز و قسەڕەوا و بەقەدر و قیمەت و موقتەدیر بوو. سوڵتان موراد كە لەپێشدا سەفەری ئیرەوان و قافقاسی كرد، ئەو شێخە بەقووەتێكی تەواوی موریدەكانیەوە گەلێك زۆر خزمەتی كرد و لە ڕێگای ڕۆمیاندا شەڕی كرد و مـەملەكـەتی گـرتبـوون. لە سـایەی ئازایی و ڕاسـتی و دینپـەروەری خـۆیەوە ببـوو بەخۆشەویستێكی چاكی سوڵتان موراد. لە سەفەری بەغدای سوڵتان مورادا ئەو شێخە كـوردە بەهێـزێكی تەواوەوە بۆ پێشـوازیكردن هەتا حـەلەب چوو، بەیانی ئیـخـلاس و ڕاسـتكۆشینی لەلای سوڵتان كـردبوو. لە شـەڕ و كـوژتار و دەورەدانی بەغدایا بەدڵێكی خاوێن كـۆشینی چاكـەوە شەڕی كردبوو. هەتا گـەڕانەوە دیاربەكر لەگەڵیدا بوو. سـوڵـتان موراد لە بری خەڵات و بەخشیش و ئینعام و موكافات كە باتی ئەو هەموو خزمەتەی شێخ تۆڵەی بۆ بكرابایە، بەئەسەفەوە! خزمەتەكەی شێخ سێدارە و خنكاندن نەتیجە بەخشبوونی ڕەوابوو؟

سوڵـتـان موراد بەدەسیسـەی ئەمە كـە گۆیا كچی ئەمـیر فەخرەدین مەعـان ئوغـڵی كە ئەمیری دورزییەكان بوو، لە پێشدا لە دەست كووچەك ئەحمەد پاشا هەڵاتبوو، لە بەرگی نێـرینەدا لـە لای شێـخی ورمێ خۆی پەنهـان كـردبوو و شـێخ ڕایگرتبـوو. گـۆیا. شـێخ لە ئەسراری كـیمـیـا و زێر دروسـتكردن ئاشنا بوو، ئەو عـیلمـەی بەسولـتـان نیشـان نەدابوو. هەرچەند پادشا گـەلێك لەگـەڵی خـەریك ببـوو، لێی شـاردبووەوە و فـێـری نەكـردبوو. لە بەغدا كە گەڕابوونەوە گۆیا لە ڕێگایدا بەهەر جۆرێك سوڵتان وەعدەی لە شێخ وەرگرتبوو كە گەیشـتنەوە دیاربەكر، بەهەمـوو تەرزێك حەقایقی زێر دروستكردن و عـیلمی كـیمیـا و ڕەمڵ نیشـان بدا، وەعدەی بەجێ نەهێناوە. ئەو بهانانە لە شێخ شەمسـەدین دۆزرانەوە و بوو بەمایەی خنكاندنی. سوڵتان لەسەر ئەوە ئیعدامی كرد.

دیسـان موراد بێگ لە بەرگی پێنجەمی كـتێبی «ابو الفـاروق» لاپەڕەی ٣٧٦ دا دەڵێت: ئەوانەی كە بێژران سەبەبی ئیعدامی شێخ نەبوون؛ بەڵام دەسیسە بوون. ئەسڵی سەبەب نفوز و ئیقتیدار و قسەڕەوایی شێخ بوو كە بەئیعدامكردنی دا؛ چونكو هەمـوو كوردسـتان بەچاو لێ داگرتنێكی شێخ، بەجارێك هەستان و تێكچوون و كەوتنە شۆرشیان بەبێ شك و شوبهە بوو.

ئەو شەوەی دەورەی ماڵی شێخ درا و گیرا و بەداری خنکاندا هەڵواسرا، قازیی ڕومئیلی خواجە سەعدەدین زادە محەمەد ئەفەندی لە شێخ میوان بوو، لەو کێشە و گرتنەدا ترسا و لە داخان گیانی دەرچوو و مرد.

کوژتنی شێخ شەمسەدین گەلێک لە کوردەکان گران هات و تەئسیرێکی زۆری بەخشی. کوردستان کەوتە جۆشەوە و لە هەموولاییێکەوە دەست بەسەرکێشی کرا و بوو بەبەڵایەکی بێ دەرمان و ئاشووبێکی لە تەوانای ڕۆمیان بەدەر.

کوردستان چاغێکی زۆر بەپەشێوی و تێکچوونی ڕاییوارد و جارێک ئێران بەناوی شیعەیەتی و جارێک ڕۆمی بەناوی سوونیەتی دەستی داوێتە کوردستانەوە و هێندێک جاریش کوردەکان هۆشیان دەهاتەوە بەریان نە دەبوونە ئالەتی هیچ کامێکیان و سەربەخۆ دەژیان. هەتا خودا فەقێ ئەحمەدی دارەشمانەی لە بنەماڵەی بابان نارد و جاری سێیەم خاکی شارەزووری لە دەسایس ڕزگارکردەوە و خستیە ژێر فەرمانی خۆیەوە. لە بەندی پێنجەمی ئەم جزمەدا بەدرێژی دێتە گۆتن.

# بەندی پێنجەم

## دامەزرانەوەی بنەماڵەی حوکمدارانی بابان

## جاری سێیەم لە شارەزوور ١٢٧٤ - ١٠٥٥

هەروەکو لە بەندانی ڕابردوودا بێژرا، ئۆمەراکانی بابان لە پاش پیر بۆداقی گەورە کەوتنە دێهاتی پژدەر و ماوەتەوە. لە حوکمداریەوە بوون بەئاغادێ و کوێخا و پیاوی فەقیر و بێدەسەلاتیشیان لێ پەیدابوو؛ هەروەکو لە گەلێک بنەماڵەی حوکمدارانی دیکەش ڕوویداوە.

لە ساڵی ١٠٥٥دا یەک لەو بنەماڵە گەورەی دوودەمانە نەجیبە کەوتە نێو مەدرەسە و مزگەوتانەوە و بەخوێندن خەریک بوو. لە پاش ئەوە کە عومری بەسی گەیشت و بوو بەفەقێ، لە مەدرەسە دەرکەوت و هەوای حوکمداری و ئاغایەتی و ڕەعیەتپەروەری کەوتە سەریەوە. بەبەخشش و پیاوەتی ئیشتهاری کرد؛ چەند نۆکەرێکی ڕاگرت. چونکو لە دارەشمانە پێگەیشت بە«فەقێ ئەحمەدی دارەشمانە» ناوبانگی کرد.

فەقێ ئەحمەد ڕۆژ بەڕۆژ هێزی پەیداکرد و دەست و پێوەندی زیادکردن و چەند ئاوەدانێکی خستەژێر دەستەوە؛ بانگی بنەماڵەی بابان و زیندووبوونەوەی بەکوردستاندا بڵاوکردەوە. لەو ساڵەدا دەستی بەبنچینەی حوکمداری بابان کرد. ئەحمەدخانی حوکمداری حەسەن ئاوا - کە لەسەر شارەزوور فەرمانڕەوایی دەکرد - بەلەشکرەوە چووە سەر فەقێ ئەحمەد و لە ماوەت بەگژیەکدا چوون. ئەحمەدخان شکا و فەقێ ئەحمەد سەرکەوت و ماوەتی خستە دەست خۆی.

لە پاش ئەو شەڕە ساڵی ١٠٥٦ فەقێ ئەحمەد هەموو عەشیرەتی پژدەر و شاری مەرگە و قەزای شارباژێری لە ئەحمەدخان ئەستاند و خستییە دەست خۆیەوە و دەستی بەدامەزراندنی ڕەعییەت و لەشکر کۆکردنەوە کرد. کەم کەمە دەوروپشتی خۆی قایم کرد، ڕۆژ بەڕۆژ هێزی پەیداکرد، لە هەمووولاییێکەوە میللەتی پەراگەندە و پەرێشانی لەسەر کۆبوونەوە و چوو قەڵاچوالانی کردە پایتەختی خۆی، ئومووری حوکمداری و فەرمانڕەوایی تێدا دامەزراند.

فەقێ ئەحمەد هەتا ساڵی ١٠٦٠ تەواوی خاکی شارەزوور و ئەترافی گرت و زۆر بەچاکی حکوومەتی بابانی ژیاندەوە، لەشکر و ئاڵا و تەپڵی حوکمداری سەربەخۆی رێکخست. لەسەر مینبەر خوتبەی بەناوی خۆی خوێندەوە، حکوومەتێکی کوردیی زۆرچاکی دامەزراند، هەتا ساڵی ١٠٧٤ بەئیدارەکردن و رەعیەتپەروەری و نفووز زیادی و ئومووری حکوومەت پێکهێنان رایبوارد و مرد، لە قەڵاچوالان ناژترا.

## حوکمداریی سلێمان کوڕی فەقێ ئەحمەد (١٠٨٦ - ١٠٧٤)

کە فەقێ ئەحمەد مرد، میر سلێمان بەگ کە کوڕە گەورەی بوو لە جێگای دانیشت. خاکی شارەزووری بەتەواوی هاوێژتە ژێر حوکمیەوە. جگە لە عەشیرەتی زەنگنە هەموو فەرمانبەرداری بوون؛ بەڵام عەشیرەتی بێژرا و بۆ خۆیان لەسەر خۆیان فەرمانڕەوا بوون و ئومەرای خۆیان لەسەر حاکم بوو، نەدەکەوتنە ژێر گەڕی کەسێکەوە.

میر سلێمان لە دەوری بابیدا ناودار بوو، بەهونەر و ئازایی و پاڵەوانی ناسرابوو، لە بابی زیاتر بۆ هێز و تەواناى دەکۆشا. ساڵی ١٠٧٦ لەشکرێکی گرانی هەڵگرت و چووە سەرخاکی ئەردەڵان و شاری سنە و ئەترافی گرت و چووە سەر موکریان و شاری سابڵاغیشی خستەژێر حوکمی خۆیەوە و لە قەڵاچوالانی گرێدان و هەریەک لەوانە میر سنجاغێکی خۆی لەسەر دانان.

میر سلێمان بەدەستوورێکی جوان بۆ پشتیوان زیادکردن و لەشکر ئینتزام پێدان، خانگ بەگی کوڕی و میر بەکرەسوور بەگی کوڕە گەورەی و خالیدی برابچووکی خۆی کردنە میر سنجاغ و هەریەک لەوانی لەسەر پارچە مەملەکەتێکی دانان و لەشکرێکی رێککەوتووی بەهەموو پێویستێکەوە بۆ قەراردان کە هەریەک لەوانە بۆ فرەکردنی خاکی خۆیان و گەورەبوونی شانیان بکۆشن.

لە ساڵی ١٠٨٠ حکوومەتی رۆمیی عوسمانی لەگەڵ حکوومەتی عرووس ئیعلانی حەربیان کرد. سوڵتانی رۆم بەناوی دین و جیهادی ئەعزەمەوە پیاوی نارده لای سلێمان و داوای یارمەتی و کۆمەگی لێکرد. تەئریخی جەودەت دەڵێت: «حکوومەتی عوسمانی لە سلێمان پاشای بابانی ئیستمداد کرد، ئەویش بەئۆردوێکی موجەهەزەوە بەهاواری سوڵتانەوە چوو».

میر سلێمان لەشکرێکی قورسی لە کوردستان کۆکردەوە، بەناوی جیهادەوە و بەدڵێکی

پاکی دینداری و خوداپەرستیەوە ڕوو بەمەیدانی شەڕ لە کوردستان ماڵاوایی خواست و کەوتە ڕێگا، جەبهەیەکی موهیمی لە مەیدانی شەڕدا خستە عوهدەوە. ئەگەر میر سلێمان لەو ساتانەدا نەگەیشتبایە پێش دوژمن، لەشکر و ئۆردووی ڕۆمی دووچار بەڕۆژێکی وا تاریکیبوون بەپەرێشانی و شپرزەیی لە پێشدەستی دوژمن ڕزگار نەدەبوون. بەڵام لەو وەختە تەنگەدا فریای ڕۆمیان کەوت و بەشەو هەڵمەتی بردەسەر عرووس و دوژمنی لەبەریەک بڵاوکردەوە. بەدەرەجەیەکی شپرزەکردن کە لە بری ڕوو بەخاکی خۆیان دەربازبن، دەستەدەستە خۆیان داویتە نێو لەشکری کوردەکانەوە و بەدیل دەگیران و دەکوژران. بەو جۆرە هەموو لەشکری ڕووس پەرێشان و شپرزە کرد.

تەئریخی جەودەت: کە «موژدەی ئەو فەتحەی کوردەکان بەپادشای ڕۆم ڕاگەیاندرا، لە تەرەف پادشاوە شیرێکی مورەسەع و کەوڵێکی گرانبەهای بۆ میر سلێمان نارد و ناوی نا پاشا و میری میرانی لەگەڵ فەرمانی بۆ نارد». بەڕاستی میر سلێمان پیاوانە و قەهرەمانانە دوژمنێکی زەبەردەستی وەکو ڕووسی بۆ ڕۆمی شکاند و ڕۆمیەکانی لە ئەسارەت و پەرێشانی ڕزگارکرد، ئالەت و ئەسپاب و جبەخانەیەکی قورسی بۆ گرتن. بەو سەرکەوتنە میر سلێمان ناوبانگی پاڵەوانی و ئازایەتی بەدونیادا بڵاوکردەوە.

بەڵام ئەو شوهرەتە لەبەرچاوی ڕۆمیاندا زۆر بەئەهەمیەت گیرا و بەگەورەیان ئەژمارد. ئەو فەتح و زەفەرە بۆ میر سلێمان لەوەدەمەدا لە جێگایەکی وا کە دوور لە خاکی خۆی و لەنێو نەیار و بێگانەدا بوو، بەخاڵێکی چاک نەتیجەبەخش نەبوو. حکوومەتی عوسمانی کەوتە تەسەوراتەوە. یێکەم لەمەدا ئەندێشەیان کرد کە لە دەست عرووسدا شکابوون، میرێکی کوردان ڕزگاری کردن نەک مەئموورێکی تورک، ئەوە لە نەزەر دوژمندا ئەهەمیەتی دەبەخشی. دووەم میر سلێمان بەو ناوبانگە و بەفەتح و زەفەر و نیشانەوە کە گەڕاوە کوردستان، دەبێتە بارێکی گران لە سەریان و لە عرووسەکان زیاتر دەستدرێژی بکات.

حکوومەتی عوسمانی لەسەر ئەمە قەراری دا کە ئەو پیاوە بەساغی گەڕانەوەی بۆ کوردستان لە ڕەوشتیان دوور و بەرئاوەژووی خۆیانە. لە بری منەتداری بەهەر وەسیلەیەک بێت کوژتن و لەناوبردنی تەتبیق بکرێ، چاکتر و نزیکتری دەستووریانە.

میر سلێمان کە بەفەتح و زەفەرەوە لە شەڕ و کوژتاری عرووس دەستبەرداربوو، بەکەیفوشادمانی گەڕاوە و گەیشتە ئەدرنە، کە شارێکی گەورەی عوسمانیان بوو. ئۆردوو بەچاوی قوماندانی و سەر عەسکەری پێشوازیان کرد و بەئیحترامەوە گەیاندیانە نێو

شارەوە. موددەتێک بۆ ماندوو حەساندنەوە گۆیا ڕایانگرت؛ هەتا کەلێن دەستخرا و شەوێ لە خەودا کوژرا. لەشکر و پیاوەکانی هەرچییەکی لە پێشدا ڕوو بەوەتەن گەڕابوونەوە ڕزگاربوون. ئەوی مابوون، هەموو بێ سەر و شوێن کران.

جەنازەی میر سلێمان لە ساڵی ١٠٨٦دا لە گۆڕستانی سوڵتان سەلیم ناژترا. مەدحی سلێمان پاشای کوڕی خالید پاشای کوڕی سلێمان پاشای گەورە کە بەمیر سلێمان غازی ناوبانگی کردبوو، لە تەرەف مەلا ئیلیاسی سزینە ساڵی ١١٢٣ گوتراوە کە چووە ئێران و شکاندی:

منم جادار کیخسرو خراجت گیر خاقانم
عجم را ضبط سیف آرم سلیمان ابن سلیمانم
زنوک رمح خون ریزم فلک آلوده میگردد
که گیو و بیژن و قارون ندارند تاب می دانم
ز بانگ طبل و کوس من که شیران درگریز آیند
هز براز جنگ من عاجز، که من شاه هز برانم
دبقیصر پنجه می بازم بەایران تیغ می رانم
فرنگستان بەجوش سلم و تور آرم که تورانم
کسی از بطن مادر می نیارد سر مگر بیرون
سمعنا گر نگوید سرزند برتیغ برانم
فریدون وار می گردم، منوچهر طرح می رانم
کسی را کی رسد دستش بەفرق طاق ایوانم
ز سحی بادپای من زمین در لرزەمی آید
اگر عمرم شود باقی که در فکر خراسانم
سپاهان برسر راهست مگر تختش کنم او را
از آن حبشش کنم بخش که بندەی شاه مردانم
زهر اطراف اعدایم که جمله در امان آیند
زروی حق امان دارم که من هم کوه آمانم

شاه سوڵتان حوسێنی سەفەوی کە پادشای ئێران بوو لە ساڵی ١١٣٣دا کە سلێمان بەگی غازی ڕوو بەهەمەدان گرتن چوو، ئەم قاقەزەی بەشیعر بۆ ناردبوو:

زنم آتش بەکوردستان کە دود از هند بر خیزد
کشم تیغ حسینی را امان از روم برخیزد

مەلا ئیلیاس لە تەرەف میر سلێمان بەگی غازیەوە بەو دوو شیعرانە جوابی سوڵتان حوسێنی شاهی ئێرانیان نوویسیەوە و بۆیان نارد:

زنم آتش بەایران از سپاهان دود برخیزد
ز بیم تیغ خون ریزم صدای الحذر خیزد
شدم حارس بەاین سرحد پناه این بروبومم
کشم تیغ سلیمانی پناه قیصر رومم

ئەگەرچی لە بەیازی خەتدا ئەو شیعرانە لە تەرەف مەلا ئیلیاسەوە بەناوی سلێمان پاشای دووەمەوە قەیدکرا بوو، بەڵام ئەو تەئریخە لەگەڵ خانگ خان پاشا موناسەبەتی زیاترە.

## حوکمداری ئەمیر بەکرەسوور کوڕی سلێمان پاشای یێکەم (١٠٨٦-١١٢٧)

سلێمان لە زەمانی خۆیدا بەکرەسووری کوڕی خۆی لەسەر چەند پارچە خاکێکی شارەزوور دانابوو حوکمداری تێدا دەکرد و بەدەبدەبەیەکی چاکی ڕادەبوارد. کە باوکی لە ئەدرنە کوژرا، بۆ خۆی لە کوردستاندا ئاڵای سەربەخۆیی هەڵکرد و بەئازایی و ڕەشیدی گۆی هونەری لە مەیدانی پیاوەتیدا بردەوە و بەڕەعییەتپەروەری و جەنگاوەری ناسرابوو. هەتا ساڵانی هەزار سەد و بیست و حەوت بەدڵێکی ساز لە ئوموری حوکمداریدا ڕایدەبوارد.

لەو ساڵەدا حکوومەتی سەفەوی لە ئێراندا دووچار بەشکستە ببوو. حکوومەتی عوسمانی لە گرتنی ئێران کەوتبووە تەما. شاتەهماسبی سەفەوی بۆ پێش بەفیتنەگرتن لە قەزوینەوە ڕووی لە تەورێز کرد. دەوڵەتی عوسمانی ئیبراهیم پاشا حاکمی ئەرزەڕۆم بۆ گورجستان و عارف ئەحمەد پاشا بۆ ئێران و عەبدوڵڵا پاشای کۆپرلی ئۆغلی حاکمی وان بۆ تەورێز و حەسەن پاشای والی بەغدا بۆ کرمانشان مەئموورکران. هەریەک بەعەسکەرێکی قورسەوە بەگرتنی ئەو خاکە بزووتن.

میر بەکرەسووری حوکمداری بابان چونکە خۆی بەحاکمێکی سەربەخۆ دەزانی، لە چوونی حەسەن پاشادا کەنارەگیریی کرد. حەسەن پاشا میرەکانی زەنگنە و باجەلانی خواستە لای خۆی و بەناوی کیش و ئاینی سوونیەتی و شیعەتییەوە نوازشی کردن و دڵخۆشی دانەوە

که بۆ چوونە سەر قزڵباش کە بەشەرع بۆ سەر ئەوانە لەسەر ئەهلی سوونەت و جەماعەت واجیبە، خەڵەتاندنی.

میر بەکرەسوور لەوەدا بەتەنها ماوە. کە حەسەن پاشا گەیشتە کرمانشان ئەهالی کوردستان و خانک پاشای براشی سەرزەنشتی میر بەکرەسووریان کرد، ئەویش بەناچاری لەشکرێکی هەڵگرت و بۆ یاریدەدانی حەسەن پاشا ڕوو بەکرماشان ڕۆیشت و بەهێز و تەوانای پاڵەوانی کوردان کرمانشانیان گرت و خستیانە ژێر حوکمەوە.

لەولاشەوە خانک پاشا بەلەشکرێکی گرانی بابانەوە چووە شاری سنە و خاکی ئەردەڵان؛ بەزۆری بازوو گرتی و خستییە ژێر حوکمەوە و ڕووی لە سابڵاغی موکری کرد، ئەویشی خستە دەست و بەلەشکرەوە بۆ یارمەتی حەسەن پاشا چووە کرمانشان.

حەسەن پاشا والی بەغدا کە کرمانشان بەدەستی حوکمدار و میرەکانی کوردستان گیرا و خرایە ژێر حوکمەوە، بەبهانەی ئەوە کە ئەمیر بەکرەسوور لە چوون درەنگیی نواندووە، بەخیانەتیان ژمارد و بەهەواداری سەفەوییەکانی قزڵباشیان لە قەڵەم دا و خوێنی ئەو ئەمیرە کوردەیان بەحەڵاڵ دانا. لە پاش ڕێکخستنی ئوموری کرمانشان ئەمیر بەکرەسووریان لەنێو مەنزڵی خۆیدا کوژت.

لە بری چاکە لەگەڵ کردن و موکافات، بەکوژتن جەزایان داوە. لەوە ئومەرا و گەورەکانی کوردستان زۆر موتەئەسیر بوون، بەڵام دین و ئاین سکووتی پێکردن. جەنازەکەی ئەمیر بەکریان بردە قەڵاچوالان و لەوێ ناژتیان.

ئەمیر بەکرەسوور لە کوردستاندا گەلێک خزمەتی چاکی کردن و ئاساری خەیریەی زۆر بەجێهێشت. لە شاری کۆیێ مزگەوتێکی گەورە و مەدرەسەیەکی بۆ تەحسیلی عیلم دامەزراند، ئەمڕۆکەش ئەو ئاسارە هەرماوە. لە قەڵاچوالان مەدرەسە و مزگەوت و مەوقووفەجاتی دانا و لە گەلێک شار و قەڵایاندا بینای پەرستگاهی دروستکردن و بەدادخواهی و ڕەعیەت نەوازی و میللەتپەرستی ناوبانگی کردبوو. عولەما و خوێندەوار و شاعیرانی چاکی لە خۆکۆکردنەوە و بەجیرە و شکارتە و دڵنەوازیکردن، لە دیوانانداجێگای بەرزی بۆ دادەنان. لە جووتبەندەبی و ڕەنجبەری زۆر حەز دەکرد.

## حوکمداری خانک پاشای کوڕی سلێمان پاشای یێکەم ١١٥٤ - ١١٢٧

خانک پاشا لە دەوری میر بەکری برایدا بەسەردار سوپاهی ڕایدەبوارد و هەموو کار و ئیشی حکوومەتیی لە دەستدا بوو. بەڕەشیدی و ئازایی و جوامێری ناسرابوو. کە بەکرەسووری برای کوژرا بەخواستنی حەسەن پاشای والی بەغدا لە تەرەف سوڵتان ئەحمەد پاشای عوسمانی بەمیری میران و پاشا ناونرا و لەسەر کوردستانی بابان، شارەزوور، ئەردەڵان، سابلاغ موکری، بانە، بەحوکمداری دانیشت و لەگەڵ ئومووری مەملەکەت خەریک بوو. زۆر بەچاکی ئومووری مەملەکەتی ڕێکخست و سوپاه و ڕەعیەتی خستە ژێر فەرمانییەوە.

خانک پاشا بەگرتنی سنە و خاکی ئەردەڵان و موکری، ناوبانگی کرد، شان و شەوکەتی زیاد کرد، ئەستێرەی بەختی تروسکاوە ڕووی لە بڵندبوون و بەرزی نواندن. بەسەخاوەت و پیاوەتی و ئازایی و دلاوەری دۆست و دوژمن بوونە هەواداری. بەبەخششدان، دڵی چاک و خراپی گرت. ڕەعییەت و سپاهی و ژێردەستانی بەبوونی شاد و بەخزمەتی سەربەرزبوونیان دەخواست. کاروباری خانک پاشا ڕۆژ بەڕۆژ بۆ پێشەوە دەچوو.

خانک پاشا لە تەشویشاتی ئێران و لەشکرکێشیی عوسمانییان ئیستفادەی کرد و ئومەراکانی کوردستانی دەم بەدەم دەخستە ژێر فەرمانی خۆیەوە. لەگەڵ میرانی زەنگنە و پاشایانی باجەلان ڕێککەوت و گرێی یەکەتی بەست. ئەحمەدخانی بیگلەربەگی ئەردەڵان کە لە دەستی هەڵات و ڕووی لە دیاربەکر کرد، بەمیر سنجاغی نوازشی کردەوە و بردیە سنە و لە تەرەف خۆیەوە کردیە میر سنجاغی ئەردەڵان. ئومەرایانی کەلهوڕ و گۆران و گوڵباغی دڵخۆشی دانەوە و هەریەکی بەمیر دانان و بەلەشکریانەوە کەوتنە ژێر ڕکێفیەوە.

خانک پاشا لەوە خەریک بوو بۆ خۆی لە سنەدا دانیشت و لە وەختی کوژتنی ئەمیر بەکرەسووری برایدا، حەسەن پاشای والی بەغدا مرد. کرمانشان و ئەترافی بێ سەردار بوون و کەلێنی دەست کەوت و ئەو دەوروپشتەشی خستە دەست خۆی، لەشکرێکی قورسی ساز کرد و بۆ گرتنی هەمەدان ئامادەی کرد. پیاوانی پێشڕەوی لەشکر هەتا دەوروپشتی هەمەدانیان کردبوو بەڕاڕەوەی تالان و بردن.

خانک پاشا کە تەمای لە هەمەدان کرد، قاقەزێکی لە فەرەیدوون خانی موکری نوویسی - کە لەودەمەدا حاکمی هەمەدان بوو - دڵخۆشی داوە کە هەمەدان بەدەستەوە بدات. فەرەیدوون خان شار بەدەستەوەدانی بۆ نەدەکرا، بەڵام بەناوی شەڕکردنەوە لەشکری

هەڵگرت و لە شار دەرکەوت و ڕۆیشت و خۆی گەیاندە سوپاهی خانک پاشا و بەعیزەت و شادمانی پێشوازی کراو ئیحترامی گیرا.

خانک پاشا لە خۆکۆکردنەوە و چوونە سەر هەمەدان خەریک بوو، بەلەشکرێکی گرانی کوردستانەوە و بەکۆمەگی و یارمەتی میران و سەردارانی کوردان، هەستا چووە سەر هەمەدان و دەورەی دا. ئەهالی هەمەدان بەئومێدی ئەمە کە لە تەرەف حکوومەتی سەفەوییەوە کۆمەگیان دەگاتێ، سێ مانگ بەرابەر لەشکری کوردان خۆڕاگیری و شەڕیان کرد، لە دواییدا کە نائومێد بوون، قەڵایان بەدەستەوەدا و لەشکری کوردستان چوونە نێو شارەوە.

کە هەمەدان بە دەست کوردان گیرا و کەوتە دەست خانک پاشا، لەوێدا حکوومەتی دامەزراند و خستیە ژێر ئینتزامەوە و ئوموری ڕێکخست و بۆ هەموو دایرەیەک مەئموورانی بۆ دانا و ئەترافی شاری بەلەشکر قایم کرد و دەورەی شاری کردە لەشکربەز.

حکوومەتی عوسمانی لەولاوە - هەروەکو باسکرا - دەستی بەگرتنی خاکی ئێران کردبوو. لە جێگای حەسەن پاشای والی بەغدا، ئەحمەد پاشای کوڕی حەسەن پاشایان کردە والی و سەرعەسکەر. موددەتی سێ ساڵ هەمەدان لەژێر حوکمی خانک پاشادا بوو، ساڵی هەزار و سەد و سی و پێنج عەبدوڕەحمان پاشا ناو بەحاکمیەتی هەمەدان تەعیین کرا و ناردرا. خانک پاشا بەئیحترامەوە قبوڵی کرد و ئوموری بۆ دامەزراند و قووەتی لەشکری خۆی گەڕاندەوە کرمانشان و بۆ خۆشی چووە سنە.

ساڵی هەزار و سەد سی و شەش ئەحمەد پاشای والی بەغدا لە تەرەف حکوومەتی عوسمانییەوە بەسەرداری تەعیین کرا، لەگەڵ هەنگێک سوپا بۆ هەمەدان کەوتە ڕێگا و داوای کۆمەگی لە خانک پاشا کرد کە بچنە سەر شاسوڵتان حوسێنی سەفەوی و خاکێ کە ئەفغان لە ئێرانی گرتووە بیگێڕنەوە ژێر حوکمی عوسمانیەوە. ئەحمەد پاشای والی بەغدا و سارۆ مستەفا پاشای حاکمی مووسڵ کە گەیشتنە تخووبی خانک پاشا، فەرمانی سوڵتانی عوسمانییان تەقدیم کرد کە بەمیری میران و بەگلەربەگی کوردستان لەقەب کرا و خەڵاتێکی لایق و نیشانەیەکی شایستەی بۆ ناردبوو، دایە خزمەتی و تەکلیفی چوونە سەر سەفەوی و ئەفغانیان لێکرد.

خانک پاشا بەناوی ئیسلامییەت و کێشەی سونییەتەوە یارمەتی دانی ئەوانی قبوڵ کرد؛ هەرچەندە لە فیتنەی عوسمانییش ئەمین نەبوو و لە پاشەڕۆژ ترسیشی هەبوو، لەگەڵ

ئەو زانینەش لەشکرێکی قورسی لە کوردستان هەڵگرت و هەموو میر و بەگی کوردانی لەگەڵ خۆی خست و هەستان و ڕوویان کردە هەمەدان. لەوێشەوە سوپاهی عوسمانی کەم تا کورت کە لەگەڵ عەبدوڕەحمان پاشای والی هەمەدان بوون، هەڵیانگرت و چوونە سەر زیرئاباد و یەزدیگورد و فەرەهان. ئێلچیان ناردە لای ئەشرەفی ئەفغانی کە سوڵتانی سەفەوی تەسلیم کات و دەست لە سەرکێشی بەردات.

ئەشرەف کە ئەوەی زانی، ناردی سەری شاسوڵتان حوسێنی بڕی وَ دایە ئێلیچیەکان و بۆ خانک پاشا و و ئەحمەد پاشای نارد و بەشیر و خەنجەر جوابی دانەوە.

پاشاکان ڕقیان هەستا ڕوو بەشاری یەزد لەشکریان کێشا و هەردوو لەشکر لە یەزد بەرابەر بەیەکتربوون. لە دوای کوژتار، کورد و ڕۆم شکان و ئەفغان سەرکەوتن و خانک پاشا بەلەشکری شکستە گەڕانەوە هەمەدان. لەو شەڕەدا گەلێک کورد و میرەکانی بوون بەفیدای ئەحمەد پاشای عوسمانی.

ساڵی هەزار و سەد و سی و حەوت عوسمانییەکان لەگەڵ ئەفغانەکان بناغەی مامڵەتیان بەم جۆرە دامەزراند کە ویلایەتی خوزستان و لوڕستان و فەیلی و کزاز و زنجان و سوڵتانیە و ئەردەوێڵ و ڕۆمیان و شەرقی عیراق و دارولمەرزەبان بۆ ئەفغان بمێنێتەوە. خانک پاشا لەو مامڵەتەی ئەوان ئیستفادەی ئەمەی کرد کە خاکی کرمانشان و دینەوەر و زەهاو و سنە و بانە و سابلاغی موکری خستە سەر مەملەکەتی خۆی و تخووبی بەو دوو حکوومەتە دامەزراند و کردیە موڵکی خۆی، لەگەڵ مەملەکەتداریی دەکۆشا.

ساڵی ١١٤٠ھ هەزار و سەد و چلی هیجری نادرشای هەوشاری لە کێوانی لوڕستانەوە ڕوو بەکرماشان لەشکری هاژووت. حوسێن قوڵیخانی زەنگنە لەسەر تخووبدا سەردارێکی کوردان بوو، کەوتە لەشکرگاهی نادرەوە بەسەرداری سوپاه و بە پێنج هەزار سوارەوە ناردرا سەر کرمانشان کە بیگرێت. حوسێن قوڵیخان لە بروگۆردەوە بەکێوانی فەیلیدا ڕۆیشت، لەولاوە هێندێک لە کوردی ئۆزبەگی و کەلهوڕ موخابەرەیان لەگەڵ کرد و خواستیانە نێوخۆیانەوە، چونکو سەرەڕێگای هاتوچووانی ڕۆمیان بوو بۆ بەغدا و هەمەدان، ئەوانیش لەوە بێزار ببوون، ئەنبار و دانەوێڵە و چەکی ڕۆمیان گەلێک لەوێ بوو، هەموویان گرت، حوسێن قوڵیخان بەبێ شەڕ چووە نێو قەڵاوە. چونکە بۆخۆشی یەکێک بوو لە کوردی زەنگنە و سەردارێک بوو لە کرمانشاندا، بەواسیتەی خزم و کەسیانەوە بەبێ ئەزیەت چووە نێو کرمانشانەوە. لە گەورە و سەرکردەکانی کوردی زەنگنە

و کەلهوڕ حکوومەتێکی جوان و ئیدارەیەکی شایستەی دامەزراند، قەڵا کۆنەکەی وێرانکرد و لەوە قایمتر و پانتر قەڵایەکی تازەی دروست کردەوە.

خانک پاشا کە لەوە ئاگاداربوو لەشکرێکی گرانی ساز کرد و داوای یارمەتی لە تەیموور پاشای کوردی مللی حاکمی وان کرد.

تەیموور پاشا بەگەلێک ئومەرا و سەردارانی کوردی وان و پاشایانەوە، بەلەز بۆ یارمەتی فریای خانک پاشا کەوتن، بە سێ هەزار لەشکری کوردانەوە بۆ پێش نادرشا گرتن چوونە دەشتی مەلایر، کە جێگایەکی پانوبەرین بوو. لەولاوە نادرشا لە هەمەدان دەرکەوت، لەو دەشتەدا پێشی بەپاشا و لەشکرانی کوردان گرت و لە هەردوولاوە شەڕ و کوژتار دەست پێکرا. چۆمێک کەوتبووە نێوانی هەردووکان، ئەمبەرەوبەر بەگوللەی تفەنگ و تۆپ و خومارە یەکتریان داگرت، لەشکری نادر لەلای ڕاستیەوە لە چۆمی پەڕینەوە، شەڕبوو بەشیر و خەنجەربازی؛ لە نەتیجەدا کوردەکان دەشتیان بەردا و ڕوویان لە دامێنی کێو کرد.

سەلیم بەگی بابان لەو ڕۆژەدا گیروداری پاڵەوانانەی کرد و لەنێو دۆست و دوژمندا ناوبانگی شەڕ و کوژتاری نواند و پێشی بەلەشکری دوژمن گرت و کوژتارێکی زۆری لێکردن و گەلێکی بەزیندوویی دیل و ماڵ و چەکێکی بێ ژماری لێ بەتاڵان گرتن و لەشکری نادرشای بەپاشدا کشاندەوە تاکو لە چۆمی پەڕاندەوە.

بەڵام لەو شەڕەدا گەلێک لە پاشایانی ڕۆم کە لە تەرەف هەمەدان و ئەو دەوروپشتانە بوون، لەگەڵ لەشکری پاشای حاکمی هەشتەر و لە دەست نادردا ئەسیربوون. عەبدوڕەحمان پاشای والی هەمەدان لەولاوە هەڵات و ڕوو بەسنە گەڕاوە. کوردەکانی ئەردەڵان و بابان دەستێکیان بەسەر و پۆتراکیاندا هێنا و گەڕانەوە، بارێکی پێیان بوو لێیان ئەستاندن و ڕوو بەبەغدا ڕەوانەبان کردنەوە. لەو مەسەلەیەدا ئەحمەد پاشای والی بەغدا زۆر دڵگیربوو.

لەپاش ئەو شەڕ و کوژتارە و سەرکەوتنەی سەلیم بەگی بابان، نادرشا ناچاربوو لەگەڵ خانک پاشا دەستی بەناردراو و قاقەز نوویسین کرد و خۆشی و دۆستایەتی کەوتە نێوانیان. نادرشا لەوێوە کە لەگەڵ خانک پاشا ئیتفاقیان گرێدا و لە شەڕی کوردەکان ئەمین بوو، ڕوو بەتەورێز سوپاهی ئاژۆت.

خانک پاشا کە تەماشای کرد نادرشا ڕوو بەتەورێز دەچێت، لەشکرێکی ڕێکخست لەژێر فەرمانی عەلی ڕەزاخانی موکریدا ناردیە تخووبی میاندواو کە لە نێوانی پارخاکانی

مەقدەم و دەهدەمدا هەڵکەوتبوو.
تەیموور پاشای مللی کە بۆ یارمەتی خانک پاشا لە وانەوە چووبووە شارەزوور، بۆ یاریدەدەری عەلی ڕەزاخان هەستان چوونە میاندواو و دەستیان بەقەڵابەندی کرد.
نادرشا لە جێگایەکی کە بەسەفاخانەوە دەناسرێ ئۆردووبەزی کردبوو کە زانییەوە قووەتی خانک پاشا لە میاندواودا کۆبوونەوە، وەختی ئێوارە بنەی لە سەفاخان بەجێهێشت و بەدەستە لەشکرەوە ڕوو بەمیاندواو کشا.
ڕۆژی دووی موحەڕەم نزیک نیوەڕۆ لەسەر چۆمێ کە لەشکری عەلی ڕەزاخان و تەیموور پاشای لێبوو دابەزی، لەمبەرەو بەری چۆمەوە دەست بەتفەنگ و تۆپ کرا. هەتا شەو بەسەرداهات شەڕ دەوامی کرد، کە تاریکی شەو ڕووی زەوی ڕەشکرد، تەیموور پاشا لە ڕێی مەراغەوە ڕوو بەوان هەڵات و عەلی ڕەزا خانیش بەناچاری ڕوو بەکێوەکانی شارەزوور کشاوە دوایی. لەو ڕۆژەوە دەهدەم و سابلاغی موکری لەژێر حوکمی خانک پاشا دەرکەوت و بوو بەخاکی نادرشا و مەئمووری لەسەر داندرا.
لەولاوە ئەحمەد پاشای والی بەغدا کە لەو ئەحواڵە ئاگاداربوو، لە گەڕانەوەی نادرشا ترسا. جوابی لە خانک پاشا نارد کە بۆ تخووب قایمکردن چی دەوێت تاکو یاریدە بدرێت و بۆ بەخێوکردنی تخووبی عێراق لەشکری لە هەموو لایێکەوە دامەزراند و لە خاکی کوردستاندا دەست بەرێکی وپێکی و قایمەتی کرا. ئەحمەد پاشا کوردی باجەلان بەحاکمیەتی زەهاو داندرا و لەشکرێکی چاکی خرایە فەرمانیەوە.
خانک پاشا لە ترسی نادرشا لەشکری کۆکردەوە و دەستی بەڕێکخستن کرد کە نەبادا دوژمن لە کەلێن دایە هەڵمەتی بباتە سەری. تا ساڵی هەزار و سەد و چل و سێی هیجری لە ئالەت و چەک و لەشکر کۆکردنەوە دابوو. بەدڵخۆشی دانەوە و نوازشی ئەهالی و ڕەعیەتی دەکۆشا. خالید پاشای براشی کردە سەرعەسکەر و بۆ ئینتزامدان بەمیللەت و سوپاە و مەملەکەت کردیە سەردار و کاربەدەستی.
لەو ساڵەدا تەهماسب شای سەفەوی لە ئێرەوانەوە ڕوو بەتەورێز کشا و لە هەمەدان خۆی گرتەوە. لەشکری کوردی ئەردەڵان و بابان لەژێر فەرماندەی خانک پاشادا چوونەسەری. لە دێیەکی کە بە«گۆڕخان» ناوبانگی کردبوو، دەست بەشەڕکرا. شاتەهماسب شکا و نزیک پێنج هەزار سوار و پیادە و سوپاهی کوژرا، تۆپ و تفەنگ و چەک و ئەسپابێکی زۆر کەوتە دەست کوردانەوە. شا و چەند کەسێکی دی بەهەزار مەرارەت

گیانیان ڕزگارکرد. کوردەکانی هەمەدان و کرمانشایان خستەوە دەست خۆیان و گەڕانەوە.

ئەحمەد پاشای والی بەغدا بەوە کەیف خۆش بوو، لەولاوە بەلەشکرەوە چووە هەمەدان و حاکمی خۆیان لەسەر دانا و تخووبیان وەکو پێشووی دەوری ئەفغان دامەزراندەوە و لەگەڵ ڕێکخستن خەریک بوون.

خانک پاشا عەلی ڕەزاخانی موکری ناردە سەر سابلاغ و دەهدەم و گرتی و خستیە دەست و گەلێ تالان و ئەسپابی دەست کەوت. دیسان خانک پاشا دەستی بەدامەزراندنەوەی مەملەکەت و زیادکردنی سوپاه و لەشکر کرد.

ساڵی هەزار و سەد و چل و چوار نادرشا بەقووەتێکی زۆرەوە بۆ گرتنی بەغدا بەسەر کوردستاندا چونی قەرار دا. لە مانگی جەمادی دووەمدا لە کێوانی لوڕستانەوە ڕوو بەکرمانشان ڕۆیشت و گرتی. لەولاوە خانک پاشا خۆی کەنارەگیرکرد؛ بەڵام ئەحمەد پاشای باجەلانی تەقوییە کرد کە لە زەهاودا بەرابەری بکا.

ئەحمەد پاشای والی بەغدا کە بیستیەوە نادرشا ڕوو بەکەرکووک و بەغدا خێوەتی لە دەشتی ماهیدەشتدا هەڵداوە، لەشکر و هیمەتێکی زۆری لەگەڵ چەند پاشایەک بۆ زەهاو نارد کە پێشی پێ بگرن؛ چونکە کلیلی بەغدا و کەرکووک زەهاوبوو. بەئالەت و موهیمات قایمیان کرد و قەڵا و جێگا سەختەکانیان بەتۆپ و ئالاتی شەڕ پڕکرد و لە عەسکەریان کردە سەنگەر و مەتەرێز.

نادرشا بەخەیاڵی شەو نخوون، شارەزایانی هەڵگرت و لە کێوی گاوروان سەرکەوت و نزیک ڕۆژئاوا ڕوو بەدوژمنیان سەرو ژێر بوون. ئەو کێوە بڵندانە و شیو و گەلی و دۆڵە تەنگ و ڕێگا باریکەکانیان بڕی و ڕۆیشتنە خوارەوە، بەشەو و ڕۆژێک گەیشتە سەر ئەحمەد پاشای کوردی باجەلان؛ ڕکێفکوت چووە سەر زەهاو. لەگەڵ سپێدەی بەیانی دەوری ئەحمەد پاشای دا. ڕۆژی بیست و چواری مانگی بێژراو دەورەدران. لە پاش کەمێک شەڕ و کوژتار، ئەحمەد پاشای باجەلان و گەلیک لە سەرکردەکانی کورد و پاشایانی ڕۆم لە دەست نادردا گرفتاربوون و بەدیل گیران.

نادرشا گەلێک تالانی دەست کەوت و گرتی، لە جێگای بڵند و سەختی دەوروپشتی زەهاو، چەند بورج و بارووی قایمیان دروستکرد. سوار و پیادەیەکی زۆری بەدێهاتی کوردستاندا بڵاوکردنەوە و دەستیان کرد بەدانەوێڵە و چەوری و مەڕ و ماڵ و تێشوویەکی بێ ژماری کۆکردەوە لە زەهاو ئەنباری کرد و لە ڕێگای قەڵای عەلی بەگەوە ڕوو

بەکەرکووک لەشکری ئاژۆت. چونکە ناشارەزابوون، سوار و پیادەیەکی لەگەڵ بار و بنە لە چۆمی دیالەدا بەئاوداچوون.

نادرشا بەسوپاهەوە گەیشتە خورماتوو؛ لەشکربەزی کرد. دەستەسوارەی بۆ دەوروپشتی کەرکووک بڵاوکردنەوە، لە هەموو ئاوایی و دێهاتێکدا دەستیان بەدیل و تاڵانگرتن کرد و بەجارێک ئەو دەوروپشتە ژێر پێ کرا و وێرانبوو. لە عەشیرەتی بەیات دە هەزار ماڵی کۆچدا و ڕەوانەی خوراسانی کردن. نادرشا حەوت هەزار کەس لەشکری ناردە سەر قەڵای کەرکووک کە بیگرن و بۆ خۆشی ڕوو بەداشکۆرپی باری کرد. لە ڕێگای قەرەتەپەوە ڕوو بەبەغدا ڕۆیشت. لەولاوە لوتف عەلی بەگ نایبی تەورێز بە شەش هەزار نەفەر لەشکری کوردی ئاوربایەگان و موکری و ئەردەڵان گەیشتە لەشکری نادر.

خانک پاشای بابانیش دەستەیەک سوارەی بۆ نارد و بینای یەکیەتی لەگەڵ دامەزراند. سەلیم بەگی براشی بەو لەشکرەوە ناردە یارمەتی و کۆمەگی کردنیان. لە قەرەتەپە قاقەزی خانک پاشایان داین، بەئیحترام و ئیکرامەوە بەخێرهاتنی کردن و بەخەڵات و بەخشش دڵخۆشی سەلیم بەگی داوە.

ڕۆژی دووەم نادرشا کە ڕوو بەبەغدا ڕۆیشت، محەمەد پاشای کورد حاکمی کۆیی بۆ یاریدەدانی ئەحمەد پاشای والی بەغدا کە چووبوونە بەغدا بەچەند پاشایانی ڕۆمەوە دە هەزار عەسکەری کۆی و ڕۆمیان هەڵگرت و چوونە پێش نادرشا، لە جێگایەکی بە«ئینگێجە» ناودەبرێ پێشیان بەنادرشا گرت و هەردوولا دەستیان بەشەڕ و کوژتار کرد، لە پاشان محەمەد پاشا و لەشکر ڕوو بەبەغدا فیراریان کرد، نادرشا هەمووی بەدیل گرتن.

نادرشا بەشەڕ و کوژتار ڕووی لە بەغدا کرد. ڕۆژی سێ شەممەی دووی مانگی ڕەمەزان گەیشتە کەنار بەغدا و لە نزیک مزگەوتی براتی، ئەحمەد پاشا سێ هەزار لەشکری لەژێر فەرمانی ئەحمەد پاشای والی ئورفە و قەرە مستەفا پاشا ناردنە پێشەوە.

نادرشا سوارە کوردەکانی قەڵاچوالانی لەژێر فەرماندەی سەلیم بەگی باباندا ناردە بەرابەری ڕۆمیان. سوارەکانی کورد بەهەڵمەتی شێرانە پەلاماری ڕومیان دا و لەسەر بان و بن دیوارانی شارەوە بەتۆپ و تفەنگ و خومپارە، کوردەکانیان ئاورباران کرد. لەو شەڕەدا کوردەکان گەلێک بەکوژتن چوون، ڕۆمی لە کەلێندا بوون و کوردیش لە دەشتدا ڕاوەستابوون و شەڕیان دەکرد. بەناچاری نادرشا تورکمانی گوگەڵانی بۆ یارمەتی کوردەکان نارد، دیسان گەلێکیان لێ کوژرا و هەڵاتن. بەڵام کوردەکان بەگوللە و شیر بەرابەری

ڕۆمیان کرد و سینگی گۆشتنیان کردبوو بەسەنگەری گولله و تۆپ و تفەنگ. سوارەی ئەفغانی چوونە کۆمەگیان، بەڵام زوو ڕۆمی لە جێگای خۆیانی هەڵکەندن و گێڕایانەوە پاش.

لەوەدا لەشکری نادر شکا و کوردەکان بەهەزار کێشە ئەوەی ڕزگاربوون خۆیان گەیاندە لەشکرگا؛ بەڵام نادرشا لە هەر چوار کەنارەوە بەغدای دەورەدا و خستیە تەنگانیەوە. هەتا مانگی سەفەری ساڵی هەزار و سەد چل و پێنج دەوامی کرد.

بەڵام لەولاوە تۆپاڵ عوسمان پاشای وەزیر بە سەد هەزار لەشکرەوە گەیشتە کەرکووک. ئەحمەد پاشای والی بەغدا نادرشای وەتەنگهێنا.

لە ئەواخیری مانگی بێژراودا نادرشا لەشکرەکەی لە برسان و تینووان مرد و کوژرا و پەرێشان بوون. بۆ خۆشی ڕوو بەهەمەدان هەڵات.

کە نادر شا هەڵات و لەشکرەکەی مەحوو بووەوە، سەلیم بەگی بابان بەهەر کلۆجێک بوو، چەند کەسێکی کە لەگەڵی ڕزگارببوون هەڵاتن و خۆیان گەیاندە کوردستان. لە دوو هەزار کوردی ئەردەڵان و پێنج سەد کوردی موکریان یەکی لێ ڕزگار نەبوون و هەموویان کوژران و بەدیل گیران. عوسمان پاشای تۆپاڵ قاقەزێکی بەهەڕەشە بۆ نادرشا نارد کە لە وەختی خۆیدا دەگوتری.

هەروەکو بێژرا کە نادر هەڵات، سەلیم بەگی بابان گەڕایەوە کوردستان. ئەحمەد پاشای والی بەغدا لە مێژبوو داخ لە دڵی خانک پاشا بوو. ئەویش دەترسا چونکە پیاوێکی ناودار و حوکمدارێکی پاڵەوان بوو، لە شەڕی تەهماسبی سەفەوی و گرتنی هەمەدان و مامڵەتکردنی لەگەڵ نادرشا لە دەشتی مەلایەردا و یارمەتی جاری دوایی بەنادرشا و گەلێک بزووتنەوەی دیکەشی لێ بەدڵ گرتبوو. هاتنی عوسمان پاشای تۆپاڵی بەکەلێن ژمارد و شکستەی نادری بەغەنیمەت زانی. بەفێڵ خانک پاشای خواستە بەغدا کە هێندێک مەسایل هەن لێی دەدوێن، خانک پاشا لەوە دردۆنگ بوو، وای بەچاک زانی کە خالید پاشا بنێرێتە لای تۆپاڵ پاشا و بەخێرهاتنی بکات و بناغەی مەوەددەت دامەزرێنێتەوە.

کە خالید پاشای خستەڕێ و گەیشتە کەرکووک، تۆپاڵ پاشا گەلێکی حورمەت گرت و نوازش و ئیکرامێکی بێ ژماری نیشان دا و بۆ حوکمداری بابان نامزەدی کرد، بەڵام پێی نەگوت و لە دڵیدا ڕایگرت و ناردیە دووی خانک پاشاش کە بۆ نادرشا و مەسەلەی

تخووب مەشوەرەتێک بکەن. بەهەزار درۆ و فێڵ خانک پاشا خەڵەتاندرا و لە ڕێ دەرخرا، خانک پاشا بۆ بەخێرهاتن کردنی تۆپاڵ پاشا بە هەزار سوارەی کوردەوە چووە کەرکووک و سەلیم بەگی کردە وەکیلی خۆی و لە قەڵاچوالانی دانا. کە خانک پاشا گەیشتە کەرکووک، عوسمان پاشا لە پاش میوانداری و ئیحترام گرتنی بەخۆشی خۆی ناردیە بەغدا، ئەحمەد پاشا چتێکی لە خەودا چاوی پێ نەدەکەوت، بەئاشکەرا دیتی، شەوێ لە خەودا خنکاندی و سبەینەی پازدەی ڕەبیع جەنازەکەی ناردەوە کوردستان.

## حوکمداری خالید پاشا برای سلێمان پاشای یێکەم (١١٥٥ - ١١٤٥)

هەروەکو لەپێشدا گوترا، تۆپاڵ عوسمان پاشای سەدری ئەعزەمی ڕۆم بە سەد هەزار لەشکرەوە لە ئەستەمبووڵ دەرکەوت و پازدەی سەفەری ساڵی هەزار سەد و چل و پێنج گەیشتە کەرکووک و لە دیاربەکر و مووسڵەوە گەلێک لەشکر و ئومەرای کوردیشی لەگەڵ خۆی خست. مووسڵ و هەولێری پڕ لەشکر کرد و بەتۆپ و چەک قایمکردن و دەوروپشتی کردنە سەنگەر و مەتەرێز، بەزبانێکی دینی بەسەر ئومەرا و گەورەکانی کوردا هات کە نادرشا شیعەیە و لە بەرابەر خەلیفەی ئیسلام شیری کێشاوە و شەڕ لەگەڵ کردنی غەزایە و لەسەر هەر موسڵمانێکی ڕاست فەرزە کە لە ڕێگای دینی پاکدا بکۆشێت؛ ئەگەر مرد و کوژرا دەچێتە بەهەشت و ئەگەر ما و سەرکەوت غازییە و گوناهی دەڕوا. بەو قسەپەندانە هەمووی هێنانە جۆش و خرۆش. میر خانک پاشای حوکمداری گەورە و بەشانی بابانی بەو پەتە بەکوژتنی فتوا درا کە لەگەڵ نادرشای شیعە ڕێککەوتووە. ئەگەر ئەو دەسیسەیە نەبوایە خانک پاشایەکی وا زەبەردەستی بەهێز چۆن دەچووە لای و بەدەست ئەحمەد پاشاوە بەکوژت دەچوو. ئەو هەموو ئومەرا و حوکمدارانەی کورد دەکەوتنە دووی.

کە خانک پاشا شەهید کرا، تۆپاڵ پاشا خالید پاشای بابانی بەپاشا نەسب و خەڵاتی حوکمداری شارەزوور و بابانی بەسەر شان دادا و فەرمانی سوڵتانی بۆ جەلب کرد. لە کەرکووکدا هەموو ئومەرایانی کوردستانی شیمالی کە لەگەڵ بوون کۆی کردنەوە، بەفەرمانب سوڵتان، خانگ پاشای بابان لەگەڵ دوژمنی دەوڵەتی عەلییە ئیشتراکی کردبوو، فەتوای کوژتنی درا و خالید پاشای براشی بەپاشایەتی و ئەمیر و ئومەرایی کوردستان و حوکمداری بابان و شارەزوور سەربڵند و فەرموڕایی( ؟) بۆ خوێندنەوە و شیرینی خورایەوە. هەموو ئومەراکانی کوردستان بەوە مەمنوون بوون.

بەڕاستی ئەو چاوڕاوەی عوسمان پاشا و خەڵاتکردنەوەی خالید پاشا و دڵدانەوە و

نوازشی کوردەکان بووە شادی و کەیفی ئومەرایانی کورد و برینی خانک پاشای سارێژکردن و شکستەی نادرشا، ئەو چاووڕاوە دینداربیە کوردەکانی خستە سەر هەوەسی ئەمە کە لە هەموولایەکەوە پەلاماری لەشکری نادرشا بدەن و لە ئاوی دەژلە دووری بخەنەوە و ڕێگای هاتوچوونی پێوەتەنک بێنن.

کوردەکان بەناوی دینەوە دەستیان بەهەڵمەتدانی نادرشا کرد و وەتەنگیان هێنا و لە نەجەف و کەربەلا و کازمەین و ئەترافی بەغدایان دەرکرد و بەشکستەیی هەتا نزیک هەمەدانیان ئاژۆت. میرزا مەهدی خان خاوەندی مێژووی نادر، بەدوورودرێژی دەڵێت: کوردەکان بوونە مایەی شکانی شەوکەتی نادرشا؛ دەنا بەسرە و نەجەف و کەربەلا و بەغدا لە دەست ڕۆمیاندا نەمابوو و هەموو گیرا بوون و تەمای گرتنی مووسڵیشیان دەکرد. بەڵام کورد لە هەموو قوڵێکەوە، دوو هەزار و چوار هەزار لەشکر لەژێر ئیدارەی ئەمیرێکی کورداندا دەستیان بەهەڵمەتدانی لەشکری نادرشا دەکرد، لە بەرابەر ئەوانە ڕاوەستان نەدەبوو، لە هەڵاتن زیاتر چارە نەمابوو.

تۆپاڵ پاشا بەبەخشش و خەڵات کوردەکانی شارەزووری دڵخۆشی دەداوە و ڕۆژ بەرۆژ لە شارەزووردا بناغەی قایم کرد و تەشکیلاتی عەسکەریی لێ دامەزراند. لە لایەکی دیکەشەوە عولەمایانی خستبووە نێو کوردستانەوە و بەناوی سوونیەتی و شیعەیەتی، دڵی کوردەکانی لە نادرشا ڕەش دەکرد و بۆ شەڕکردن چڕی دەکردن.

هەرچەند بەئاشکرا کوردەکان لەگەڵی ڕێککەوتبوون، بەڵام لە بنەوە داخی خانک پاشای حوکمداری خۆبانیان لە تۆپاڵ پاشا لە دڵ گرتبوو، ناچاری بێدەنگی بوون.

بۆ ڕۆژێکی کەلێن سەلیم بەگی ئامۆزای خۆی لە قەڵاچوالاندا هێشتەوە کە ڕۆژێک دەست کەوێت و بەدڵخواز بگەن. خالید پاشای بابان، ئەو پیاوە لە قەڵاچوالاندا هێزداربێ و لە دەست دەرنەچێت، ئەگەر نادرشا گەڕاوە، سەلیم بەگ ببێتە تەرەفداری نادر و خۆی حوکمداری خۆیان لە ڕۆمیەکان بستێننەوە. سەلیم بەگ بۆ ئەوە ڕۆژ بەڕۆژ لە کۆشەوە و خۆ کۆکردنەوەدا بوو، ڕۆژ بەڕۆژ میللەتەکەی بەمە نوازش دەدا نەبنە هەواری ڕۆمی و لەگەڵ میللەتی خۆیان خەریک بن.

تۆپاڵ عوسمان پاشا لە نادرشا دەترسا، خالید پاشای حاکمی بابانی کردە سەر عەسکەر ئەمیش پاشای لەگەڵ خست و بیست هەزار سوپاهی کوردانیان هەڵگرت و چوونە سەر چۆمی دیالە ئۆردوو بەزیان دەست پێکرد. خالید پاشا کە گەیشتە سەر چۆمی دیالە کە هەشت فرسەخی کەرکووک بوو. جێگا سەختەکانی کردە سەنگەر و سوپاهی تێدا

دامەزراند. لە پاش چەندێک پۆلا پاشا و محەمەد پاشا بەلەشکرەوە چوونە یارمەتی خالید پاشا.

خالید پاشا نزیک مانگێک لە دیالە خەریکی ڕێکخستنی ئۆردو و جێگایان بوو، هەمووی دامەزراندن. عوسمان پاشای تۆپاڵ لەبەر دوو چت خالید پاشای خواستەوە کەرکووک، یەکێک لەبەرئەوە بوو نەبادا لەگەڵ دوژمن ڕێککەوێت و کوردستانی بەدەستەوە بدات، دووەم بۆ ئەوە کە لە کەرکووکدا چاوڕاوی پێ بکا و قووەتی پێ بخاتە دەست و لە ڕۆژی پێویستدا بەکاری ببات و خۆی پێ ڕزگار بکات، لەلای خۆی دانینی بەچاکتر زانی.

عوسمان پاشا کە خالید پاشای گێڕاوە ئەمیش پاشای ڕائەسپارد کە بەپەنهانی بزووتنەوەی نادرشا و کۆشش و کردەوەی کوردەکانی شارەزوور و ئەردەڵان بپشکنێ؛ ئەگەر نادرشا لە هەمەدانەوە ڕوو بەئاوربایەگان ڕۆیشت بەلەز لەشکر ببەنە سەر کرمانشان. ئەو سێ پاشایانە شەو و ڕۆژ لەو پشکنینە خەریک بوون.

نادرشا لە بیست و دوو ڕەبیعی دووەمی ساڵی هەزار سەد چل و پێنج لە هەمەدانەوە کە زانییەوە خانک پاشای بابان لەبەرئەوەی کە یارمەتی نادری کردووە و ئەحمەد پاشاش ئەمری بەکوژتنی داوە و خالید پاشای براشی کردە حوکمداری بابان، گرتی و قاقەزێکی دوورودرێژی بۆ سەلیم بەگی بابان نوویسی کە تۆڵەی مامۆزات لەسەر منە کە بیئەستێنمەوە؛ دڵگیر مەبن؛ ئەوا لەقەبی خانی و خەڵاتی حوکمداریی کوردستانم بۆ ناردن. لەو بابەتەوە قاقەزێکی چاکی بۆ نارد و دڵخۆشی داوە کە پیاوەتی و ئازایی لەلای خۆت ئیسپات کردبوو، بەوەش لە گرەو دابوو.

سەلیم خان بەگ کە قاقەزی نادرشای وەرگرت، بەپەنهانی یەکیەتی لەتەکدا کرد وقەراریشی دا کە خالید پاشا لە جێگای خۆیدا بەحوکمداری ڕاگیراو بێتەوە و سەلیم خان بەگیش خزمەتی بکات. بەوجۆرە بەپەنهانی لەگەڵ نادرشا موخابەرەی هەبوو و خالید پاشاش لە کەرکووکدا هاودەنگ و هاواڵی تۆپاڵ شا بوو. بۆ کار ڕێکخستن و کەلێن وەدەستهێنان لە هەردوولاوە ئیستفادەیان دەکرد.

نادرشا لە سەلیم خان بەگ ئەمنیەتی پەیداکرد و واشی زانی بەواسیتەی ئەوەوە لە شەڕی کوردستان و خالید پاشاش ئەمین دەبێ. کە لەوە ترسی نەما و دڵی ئاسوودە بوو. چونکە هەروەک باسکرا نادرشا لە شەڕی دەشتی مەلایەر و جەنگ و جیدالی دەورەی بەغدا لە سەلیم خان بەگ و کوردەکان چاوترساو ببوو. کە ئەو ترسەی بەگرەو و مەرج و

خەڵات و دیاری ناردن بۆ سەلیم خان بەگ لە لاییەکەوە دانا، لە ڕۆمییەکان ئەندێشەی نەدەکرد و لێیان نەدەترسا. گەلێک جاران لە گەلێک شەڕاندا لە دەست کورد و ئومەرا و پاشایانی کورد شکستەی خواردبوو. هەرکەسێکی مێژووی نادرشا بخوێنێتەوە تێدەگا کە شکستەی تەهماسب شا لە ئێرەوان و شکستەی نادرشا لە قارس و ئێرەوان و تەورێز، شکستەی نادرشا لە خوراسان و لورستان، شکستەی نادرشا لە هەمەدان و مەلایەر و بەغدا، هەموو لە دەست کوردان خواردووە؛ خاسمە کوردەکانی بابان دیوارێکی سەخت بوون لەپێش نادرشادا بۆ گەیشتنە ڕۆمی.

نادرشا بەو قاقەزەی ناردیە قەڵاچوالان، هەم برینی باسی خانک پاشای کولاندەوە و هەم بۆ تۆڵە ئەستاندنەوە پێیدا هەڵگوتن و هوشیاری کردنەوە و هەم کوردەکان لەگەڵی ڕێککەوتنیان بەکەلێن زانی بۆ مەحووکردنەوەی ڕۆمیان لە شارەزووردا.

نادرشا کە لە کوردەکان ئاسوودە خاتربوو، لەشکری ڕوو بەدیالە سوار کرد و ڕێگای هەشت ڕۆژی بەدوو شەو و دوو ڕۆژان بڕی، گەیشتە سەر ڕۆمیان. مەمیش پاشا و هاوالانی کە زانیانەوە نادرشایان گەیشتە سەر، لە هەڵاتن زیاتر چارەیەکی دیکەیان نەدۆزیەوە، هەموو ئەسپاب و ئالەت و دانەوێڵە و چادریان بەردا و ڕوو بەکەرکووک تەکانیان دا و ڕۆیشتن. لەشکری نادرشا تا پێنج سەعات ڕێگا، کەوتنە سەریان و گەلێکیان بەزیندوویی بەدیل گرتن. کوردەکانی - کە لەگەڵ ڕۆمیان بوون - سواری ئەسپی خۆیان بوون و هەریەکە بۆ ماڵی خۆیان هەڵاتن، بەڵام گەلێکیان لێ بەکوژت چوو.

لەولاوە تۆپاڵ پاشا کە لە شکاوی مەمیش پاشا و کوردەکان ئاگاداربوو، ناردیە دووی خالید پاشای بابان کە بنێرێتە دووی سەلیم بەگ کە قووەتی کوردەکان کۆبکاتەوە و بچێتە سەر نادرشا و پێشی پێ بگرێت.

خالید پاشا لە ڕێککەوتنی سەلیم بەگ ئاگاداربوو، قسەی تۆپاڵ پاشای خستە پشت گوێ؛ بەڵام بۆ قایمکردنی قەڵای کەرکووک و سەنگەر دروستکردن تەقەڵایان دا، دەوروپشتی شاریان قایم کرد.

عوسمان پاشا جوابی لە قۆچ پاشای حاکمی کۆی نارد کە بچێتە هەولێر و شاری هەولێر قایم کا و لەشکرێکی جەنگاوەری تێدا دانێت.

تۆپاڵ پاشا کەوتە ترسەوە بەخالید پاشای گوت کە لە ژێر فەرماندەی خۆیدا لەشکر دەرخاتە دەرەوە، خالید پاشا چاوەنۆڕی لەشکری شارەزوور کردنی پێ گوت و مەمیش

پاشا و پاشاکانی دیکە ناردنە پێشەوەی نیشان دا.

تۆپاڵ پاشا بەمەغروورانە بزووتەوە، لەشکری کوردەکانی شیمال و سۆران و بادینان و شارەزووری لەگەڵ هێندێک ڕۆمیان لە دەری شار دامەزراندنی نیشاندان و باقی ڕۆمی و ئەستەمبوولی و غەیرەشی لەنێو قەڵادا دانان و دەورەی قەڵای کردە خەندەق و پڕ لە ئاوی کرد و کونگەرە و بورجەکانی قەڵای پڕ لە لەشکری ڕۆمی کردن. چادر و دەزگاشی لە دەرێی قەڵاوە بۆ کوردەکان و ئومەرا و پاشایانی کورد هەڵدا و کردنیە سوپەری تیری دوژمن.

نادرشا کە زانیەوە کوردەکانی شارەزوور لە سوپاهی ڕۆمیدا ئامادەی شەڕبوون، لە جێگایەکی جەمشا لە هەشت سەعاتی زەهاوەوە واقیعە، سواربوو لەشکری ڕوو بەکەرکووک ئاژۆت، لە هەموو سەرە ڕێگایەکدا بەکورد کوژتن و ئاوایی سووتاندن و بەدیل گرتن و تالانکردنی کوردان خشا. لە پازدەی جەمادی یەکدا بازارچەی لەیلان کە سێ سەعات لە قەڵای کەرکووک دوورە، ئەو جێگایەی کردە لەشکربەز.

عوسمان پاشا لەولاوە کۆمەڵێک عەسکەری لەگەڵ لەشکری کوردان کردە پێشمەرگە بۆ بەرابەری نادرشای ناردن. لەشکرەکانی دیکەی کە لە دەرێی شاربوون کردنیە تیپ و دەستە بۆ شەڕکردنی ڕاگرتن و بورج و قەڵای کەرکووکیشی قایم کرد.

ڕۆژی دووەم نادرشا لەشکرەکەی خۆی کردە سێ دەستە، ئەوانی ئازا و ڕەشید بوون لەگەڵ خۆی هەڵگرتن و ئەوانیشی کردە سێ قۆڵ و باقی دیکەشی بەدێهات و ئەترافی کەرکووکدا بڵاوکردنەوە کە دەست بەتالانکردن و کوژتار و ئاوەدانی سووتاندن و دیل گرتن بکەن.

نادرشا بەدەستە لەشکرێکی لەگەڵ خۆی هەڵگرتبوو بۆ سەر قەڵای کەرکووک ڕکێفکوت ڕۆیشت. لە جیگایەکی کە بەعەلەمداران دەناسرێت بەرابەر بەقەڵای کەرکووک ڕاوەستا لەولاوە لەشکری کورد و ڕۆمی چوونە پێشەوە، هەردوو لەشکر بەتۆپ و تفەنگ و بەشیر و خەنجەر هەڵمەتیان دایە سەریەک و وەکو ئاورێکی سۆزان ڕوویان لە یەکتر کرد. کوژتار و خوێن ڕژتن دەستپێکرا.

ڕۆمی کە تەماشای کرد شریقەی تۆپ و نالەی تفەنگ دەنگی داوە و هاوار و چریکەی شەڕکەر مەیدانی پڕکرد، لە هەڵاتن زیاتر ڕێگای ڕزگاربوونیان نەدۆزیەوە و جێگای خۆشاردنەوەشیان دەست نەدەکەوت، هەمووی پشتیان دا و هەڵاتن. نزیک دوو هەزار

کەس لە ڕۆمی و کورد کوژران، ئەوانی لە شیر و تفەنگ ڕزگاربوون سەریان لێ شێوا و [بۆ] چوونە کەرکووک نەوێران. ڕوو بەئەرزەڕۆم هەڵاتن و کوردەکانی لە دەرەوەی قەڵابوون لە خاکی خۆیاندا شارەزابوون هەریەک لە لایێکەوە خۆیان شاردەوە و چوونە ماڵی خۆیان و سەرکردە و پاشایانی ڕۆمی خۆیان خزاندە قەڵاوە و دەروازەیان گرێدا.

نادرشا چادر و ئەسپاب و ماڵ و دانەوێڵە و تالانێکی بێ ژماری دەست کەوت و ئەسیر و حەیوانێکی زۆری خستە چنگ و ناردنیە لەشکربەزی خۆی. گرتی قاقەزێکی لە پاشاکانی ڕۆمی نوویسی و بۆی ناردن، لەوێدا گوتبووی: نان و خواردنی پادشای خۆتان بەگیان نەکەوێ دوژمنتان دەورەی داون، کوژتارێکی زۆری لێکردن و گەلێکی لێ بەدیل گرتن و ماڵ و چەک و ئەسپابێکی بێ ژماری بەتالان برد. بۆچی دەرگاتان لەسەر خۆتان گرێداوە و بۆچی پیاوانە مزی خۆتان نۆشی گیان ناکەن؟ بۆ تۆڵەکردنەوە لێیان دەرکەون و پەلاماریان بدەن و لە خاکی نیعمەتپەروەری خۆتانیان دەرکەن.

ئەو قاقەزەی کە نوویسی دایە دەست ئەسیرێک و بۆ عوسمان پاشای ناردە نێو قەڵاوە. موددەتێک چاوەنۆری کرد و ڕاوەستا، کەسێک جوابی نەداوە، سواربوو ڕوو بەلەشکرگای خۆی گەڕاوە. سبەینێ زوو دیسان لەشکری هەڵگرت و چووە سەر قەڵا و داوای پیاوانی شەڕکەری کرد و کەسێک جوابی نەداوە. دیسان گەڕاوە چووە قەرارگا، ڕۆژی سێیەم هەروەها لە تەرەف عوسمان پاشا جوابی نەدراوە. بەو جۆرە سێ ڕۆژ لەسەریەک هەموو سبەینێیەک دەچووە بەردەمی قەڵای کەرکووک و سەرزەنشتی عوسمان پاشای دەکرد و بانگی دەکردن. سەرداری لەشکری بۆچی لە قەڵادا خۆتان پەستاوتووە. کە جوابی دەست نەکەوت گەڕاوە دواوە.

ئەو هەموو سەرزەنشتی نادرشا تۆڵەی قاقەزێک بوو کە تۆپاڵ پاشا لە وەختی هەڵاتنی نادرشادا بەگەف بۆی ناردبوو، ئەحمەد پاشای والی بەغداش بەشیعر هەڕەشەی لێ کردبوو.

نادرشاش کەوتە سەر هەوای گرتنی قەڵای سوورداش. بۆئەوە لەشکرێکی ساز کرد و ناردی، سوورداش قەڵایەک بوو دوو مەنزڵ لە دووری کەرکووک لەسەر کێوێکی زۆر بڵند و قایم دروستکرا بوو.

میرزا مەهدی خانی نوویسەری مێژووی نادرشا دەڵێت: جێگا و ئەساسی کوردی «بنە و بڵباس» بوو لە دانەوێڵە و تێشووی و ماڵوموڵک و پڕ لە دەوڵەت و تەوانای زیاد لە

قیاس بوو. ئێل و عەشیرەت و میللەتی ئەو دەوروپشتە بۆ خۆ لەسەر ئێشی و ئەزیەت پاراستن لەو قەڵایە خزابوون، پڕببوو لە کوردی شارەزوور و بابان و دەوروپشتی. لەشکر و ئالەت وئەسپابێکی زۆریشی تێدا قایم کرابوو.

نادرشا لە ڕێگای ئاقلـر بەندەوە لەشکری هەڵگرت و چووە سەر قەڵای سووورداش دەورەی دا، کوردەکان بۆ بەرابەری کردنی سازبوون، نادرشا لە هەر چوار کەنارەوە دەستی بەتۆپ و خومپارە و تفەنگ هاوێژی کرد و قەڵای وەتەنگهێنا و دەستە لەشکرێکی ناردە دێهاتی ئەتراف و دەستیان بەتاڵان و کوژتاری کوردان کرد. لە پاش سێ شەو و سێ ڕۆژ شەڕ و کوژتار، نادرشا بەگوللەی تۆپ لایەکی دیواری قەڵای ڕوخاند و هەڵمەتی دایە ژوورەوە و شەڕ و کوژتار کەوتە نێو قەڵاوە، هەرچەندە کورد بەژن و منداڵ و پیاوەوە لەو قەڵایە دابوون، یان کوژران و یاخود بەدیل گیران و یەکێکی لێ ڕزگار نەبوون و لە زیندوو زیاتربوون. ماڵ و دانەوێڵە و ئالەت و ئەسپابێکی زۆری کورد بەتاڵان چوو. نفووسێکی زۆری کوژرا و ژن و منداڵێکی بێ ژمار زگ دڕان و بەدیل گیران. نادرشا کە قەڵای سووورداشی گرت و قەتلوعامی کرد، ڕوو بەخاکی کوردستان و شارەزوور جڵەوی سووڕاند و دانەوێڵە و تێشووی بۆ جەمشا نارد کە ئەنبار کرێت.

کوردەکانی ئەردەڵان و کرماشانی لەگەڵ ئومەراکانی شارەزوور و تەوابیعی هەرچەندە دانەوێڵە و حەیوانات و چەوری هەبوو دیسان کۆیان کردەوە، بەیەک سم و وڵاغی میللەتی کورد هەموویان کێشا و بردیانە ئەنبارێ کە لە جەمشا بوو. دووبارە مەئموورانیان دانا کە هەرچیەکی دەست کەوێت لە دانەوێڵە بۆ جەمشاهی لێخوڕن. لەوەشدا بەڵایەکی گەورە و زەرەرێکی بێ ژمار بەسەر کوردستاندا هات، بەموددەتێکی کەم لە گەنم و جۆ و نیسک و ماش و برنج و هەموو دانەوێڵەیەک و بزن و مەڕ و وڵاغ و هەموو چوارپێیەک لە کوردستاندا نەما؛ هەموو کۆکرانەوە و ناردرانە جەمشا کە ئەنبار بوو.

لە پاش ئەوە بنە و پێشباری لەشکری نادرشا چووە قەرەتەپە. کوردەکانی شارەزوور کە تەماشایان کرد نادرشا بنەی بۆ قەرەتەپە چوو، دانەوێڵە و ئەنباریش بۆ دیالە دەچێتە جەمشا وایانزانی کە نادرشا ڕوو لە هەڵاتن دەکا و لە ئێراندا چتێک ڕوویداوە؛ بۆیە هەموو قووەتەکەی بەگەرمی لە جەمشا کۆ دەکاتەوە، ئەوەیان بەتۆپاڵ پاشا ڕاگەیاند، ئەویش گوتی: بەبێ درۆ نادرشا بێ هێز بووە و نەشێت شەڕ بکا، شارەزوور تاڵان دەکا و هەڵدێ و دەڕوا.

لەسەر ئەو فیکرەی عوسمان پاشا لەشکرێکی خستە ژێر فەرمانی مەمیش پاشا و

ناردی کە بکەوێتە سەر نادرشا و لە دەستی دەرنەکات، مەمیش پاشا دوازدە هەزار پیاوی ئازا و شەڕکەری هەڵگرت و کەوتەڕێگا.

لەشکربەزی نادر کە قەرەتەپە بوو، ئەویش لە ئاغتەپە کە لە دەربەند بە«ئاغتەپەی دەربەند» (دەربەندی بازیان) ناوبانگی هەیە لە حەوت فرسەخی سووورداش هەڵکەوتبوو کە جێگایەکی سەخت و لەنێوان دوو کێو دابوو، جگە لە ڕێگایەک بۆچوونی نەدەبوو.

مەمیش پاشا لەو جێگا سەختەدا دەستی بەسەنگەر دروستکردن کرد و لەشکری تێدا دامەزراند بۆ بەرابەری نادرشا ئامادەبوو. نادرشا لەولاوە کە زانییەوە لە سووورداش لەشکری سازکرد و سواربوو لە ڕێگایەکی کە مەمیش پاشا ڕێی پێ نەدەبرد و ڕێگا باریکەی ڕاوکەران بوو، کەوتە ڕێگا. ڕۆژی شەممەی یەکەمی جەمادی یەک وەختی ئێوارە لە ڕێگای«بازین» (بازیان) ەوە ڕوو بەدەربەند ڕکێفکوت ڕۆیشت، نزیکەی سپێدەی بەیانی خۆیان گەیاندە نێو لەشکری مەمیش پاشاوە.

تۆپاڵ پاشا، وەختێکی مەمیش پاشای نارد کە بچێتە سەر نادرشا و شەڕی لەگەڵ بکات، کەوتە بیریەوە کە نادرشا دەشکێت و ناوونیشان بۆ مەمیش پاشا دەبێت، ئەویش بێ ناو دەمێنێتەوە. هەستا سواری تەختی ڕەوان بوو و لەگەڵ لەشکرێکی زۆرچوو و گەیشتە مەمیش پاشا و لە ڕێکخستنی سوپاه و عەسکەر و سەنگەر خەریک بوون، هەتا لە ناکاو ڕێیان گەیشتە سەری و شەڕ و کوژتاری تێخستن.

کە هەردوو لەشکر شەڕ و کوژتاریان دەست پێکرد تاکو نیوەڕۆ لە سوپاهی ڕۆمێ دە هەزار کەس بەکوژت چوو. سەر عەسکەری ڕۆم تۆپاڵ پاشا کە وای دیت هەڵاتنی بەپیاوەتی زانی و ڕوو بەکەرکووک هەڵات. «ئەڵلایار» ناو کوردێکی گەرایلی لە ڕێگا پێگەیشت سەری بڕی و کەللەکەی بەنێزەوە کرد و بردیە پێش نادرشا.

کە سەرکردە کوژرا، هەموو لەشکرەکە چاویان بەکەللەسەرەکە کەوت، هەرچیەکی مابوون خۆیان تەسلیم کرد. نزیک نیوەڕۆی ئەو ڕۆژە نادرشا بەسەر هەموو قووەتەکەی عوسمان پاشا و مەمیش پاشادا زاڵ بوو. بژاردیان دە هەزار کەس کوژرا و سێ هەزار بریندار و ساغ بەدیل گیران، لەوانە پێنج هەزاری کوردی شارەزوور و هیدیکەی کوردی شیمالی و ڕۆم بوون. نادرشا لەو شەڕەدا تالانێکی بێ ژمار و زۆری دەست کەوت و بەشاد و کەیفەوە گەڕاوە قەرەتەپە. لە پاش دوو ڕۆژ لەشکرێکی قورسی ناردە سەر حیللە و نەجەف و کەربەلا و بەغدا کە بیگرن.

کە ئەو موزەفەریەتە بۆ نادرشا ڕوویدا ناردیە دووی خالید پاشای حاکمی بابان و

بەعیزەت و ئیکرامەوە پێشوازی کرد و بەخەلات دڵخۆشی داوە و بەخانی لەقەبی کرد و حکوومەتی بابان و شارەزووی پێ بەخشیەوە و وەعدەشی دایێ کە لە هەموو دەمێکدا یاریدەی بدات و بۆ کۆمەگی کردنی ئامادە بێت.

لە قەرەتەپەوە ڕوو بەخورماتوو لەشکرباری کرد. خالیدخان پاشاشی لەگەڵ خۆی برد کە نوازشی بکات و ئەمینی کاتەوە، کە گەیشتە خورماتوو نادرشا حوکمی دا لە خاکی شارەزوور و کوردستانی باباندا، چ ئاواییەک وێران کرابێ چاکی کەنەوە و چ ماڵێک ئەستێندرابێ تۆڵەی بۆ بکەنەوە. لە چەک و ئەسپابێکی تالانیان کە لە ڕۆمێ دەست کەوتبوو، میقدارێکی زیادو دوازدە تۆپ و ماڵێکی زۆری دا بەخالیدخان پاشا و بەسەرفرازی و شادمانی ناردیەوە قەڵاچوالان.

خالیدخان پاشا کە لەکن نادرشا گەڕاوە دەستی بەئاواکردنی دێهات و کۆکردنەوەی میللەت و دامەزراندنەوەی ڕەعیەت کرد و بۆ ڕێکخستنی مەملەکەت و شار کۆششی کرد. ئەوانەی دەربەدەر ببوون بەراوی کردن و خستنیەوە سەر ئیش وکار و پیشە و جووت و چاندن و کڕین و فرۆتن و دادبستاد. کەم کەمە مەملەکەتی شارەزوور [ڕووی] لە ئاوابوون کرد و جێگایانی کوردستانی کە ژێر پێی ببوون و لە ژێر سمی سوارانی نادر شادا کوترابوون و خراپ و وێران کرابوون، وردە وردە ڕووی لە ژیانەوە کردەوە. ئەگەرچی سێلاوی دوو دەریا لەشکری ڕۆم و ئێران پایەماڵی کردبوو، بووژاوە.

خالیدخان پاشا کە بەدامەزراندنی لەشکر و کۆکردنەوەی ئەهالی تێکۆشا، چەک و پێویستی ئامادەکرد و قورخانە و ئالەتی فەراهەم دێنا، دەوروپشتی کەوتبوونە ئەندێشەوە. ئەحمەد پاشای والی بەغدا لەوە زۆر ترسی لێ پەیدابوو، دەستی بەدەست درێژی بۆ شارەزوور کرد و تەشویشاتی خستە ئاوەدانیەکانی تخووبەوە.

ئەحمەد پاشا بەتەمای گرتنی کوردستان لەشکری کۆکردەوە کە بچێتە سەر حوکمداری بابان. لەبەر پشێوی سنووری لوڕستان ناچاری ئەمەبوو کە هێندێک خێرخواهان ڕەوانەکات لەگەڵ خالیدخان پاشادا بناغەی دۆستایەتی دامەزرێنن و بەهەڕەشە و خواهیش بیخەنەوە دەست خۆیان. بەنێوبژی هێندێ کەسان خالیدخان پاشا و ئەحمەد پاشا پێکەوە ڕێک کەوتنەوە و بەدۆستی ڕابواردنیان قەرار دا، هەردوولا لەشکرێکی بۆ سنووریان ئاژۆتبوو گێڕایانەوە دوایی، شۆڕش و فیتنەی نێوانی لابرا و مامڵەتکردنیان لە شەڕ چاکتر زانی. بەو جۆرە خالیدخان پاشا لەسەر حوکمداریی بابان جێگیربوو و بەداد و ڕەعیەتپەروەری فەرمانڕەوایی دەکرد.

## هاتنی سێیەمینی نادرشا بۆ شارەزوور

مێژوونووسەکان لەسەر ئەوەن کە حکوومەتی ئەستەمبووڵ فەتوایەکی دەرخست و ناردیە مووسڵ کە شەڕکردن لەگەڵ نادرشا، جیهادی ئەعزەمە و کوژتنی لەشکریانی بۆ ئەهالی سوننەت و جەماعەت غەزایە. بەو مینواله دوورودرێژ فتوایەک لە شیخولئیسلامەوە بەئیرادەی خەلیفە بۆ ئەهلی مووسڵ ناردرا بوو. ئەو فتوایە بەنادرشا ڕاگەیاندرا و بەلەشکرێکی قورسەوە لە ئێران دەرکەوت و گەیشتە خاکی ئەردەڵان.

ساڵی ١١٥٦ بیست و چواری ڕەبیعی یەک نادرشا بەقووەتێکی زۆرەوە گەیشتە چوار فرسەخی شاری سنە، خیوەت و خەرگای هەڵدا و لە هەمەدانەوە دەستە لەشکرێکیشی بەڕێگای کرماشاندا بۆ سەر بەغدا ڕەوانە کردبوو. خالیدخان پاشا و سەلیم بەگی ئامۆزای لەگەڵ وەزیرانی دەوڵەت و کەیخودای میللەتی کورد هەستان و چوونە پێشوازی نادرشا؛ لە سنە گەیشتنە پێشەوە. نادرشا هەموو سەردارانی نارده پێشوازییان و بەشان و شەرەفەوە چوونە پێشیان و بەکەیفوشادی گەیاندیاننە لەشکرگا، نادرشا بەخەڵات و نوازش و دەڵخۆشی کردن و ئیحترامی گرتن.

لەولاوە ئەحمەد پاشای والی بەغدا کە لەوە ئاگاداربوو و زانیەوە حوکمداری بابان چووەلای نادرشا، گەلێک دڵگیر و ڕەنجیدە بوو. کە لە چووینی لەشکری نادرشا هوشیاربووەوە کە لە ڕێگای کرماشانەوە تەمای چوونە سەر بەغدایان کردووە، بەهەڵبەستراوی ئەم قاقەزەی بۆ نادرشا نارد کە دەڵێت:

ترا چون لقب ساربانی گریست
تمنای شاهنشهی بهر چیست

کسی درنجابت بود او شبان
نباید زدن دم ز گردن کشان

چوپان کار زادەای بدرگ نابکار
تو کی بودەای شاه ایران دیار

خیالت کە خندکار عبدالیست
یا شاه سلطان یا والیست

مکن یاد این مرز و این بوم را
زقرآن گواه غلغلەی روم را

چو خـــواهی بدانی حکایات را
الف لام بخـــوان تلک آیات را

اگـــر لشکرم را شـــمـــاره کنی
ببـــاید نظر بر ســـتـــاره کنی

فـرستم بەخون کـار سالی پیام
بیـاید برم لشـکر مـصـر و شـام

چنانت بتـازم کـه ای تـورک تاز
ز داســـتـــان هایت بگـویند باز

کە نادرشا ئەو قـاقـەزەی ئەحمـەد پاشای وەرگرت، غـەزەبناک و دڵگـیربوو، ئەمـری دا بەمیرزا مەهدی خانی وەقایع نیگار کە بەهەڵبەستراوی پێی هەڵکاڵێتەوە. بەم جۆرە بۆی نوویسی و بۆی ناردەوە:

مـرا خـوانده است احـمـد خـیـره سر
چوبـان زادەام او أعـــــــرابی پـدر
تمامی عـــبـــاد ازره مـــعـــدلت
تفـــاوت ندارند بەجـــز مـــعـــرفت
نـظرچون نمـایـد خـــــداونـد کـل
اگـــر خـــار باشـــد نماید بەگـــول
شـــبـــانی ز دنیـــا اگـــر بود عـــیب
چرا کـــرد مـــوسی برای شـــعـــیب
اگـــر شـــاه بودم اگـــر پاســـبـــان
کـــه باجی ندادم بەشـــاهنشـــهـــان
زنامـــه نمودی ســـپـــهـــداریت
فـــزونی لشـکر ز بســـیـــاریت
فـــزونی لشـکر نمودی شـــمـــار
بەثـل ســـتـــاره بچـــرخی دوار
اگـــر لشـکرت را شـــمـــاره کنم
ببـــاید نظر بر ســـتـــاره کنم

چو صبح سعادت نماید طلوع
ستاره ز بزمش نماید رجوع
چو خورشید تیغ شجاعت کشید
ستاره بەبزم عدم سر کشید
نشستی بەعلقە بەافسانەای
بیرون آراگر مرد مردانەای
چنانت بتازم کە ای زن جلب
نە ایستی تو در مصر و شام و حلب

***

نادرشا لە سنە چەند ڕۆژێک دانیشت، هەتا لە هەموو کوردستانەوە لەشکری لەسەر کۆبووەوە. لە پاشان خالیدخان پاشا ئارەزووی کرد کە لە ڕێگای قەڵاچوالانەوە بچنە سەر بەغدا. لەسەر ئەو ئارەزووە لەشکر لە ڕێگای خانەقینەوە کەوتە ڕێگا، نادرشا لەگەڵ ئومەراکانی کوردستان بۆ میوانی چوونە قەڵاچوالان.

نادرشا و خالیدخان پاشا چوار ڕۆژ لە قەڵاچوالان مانەوە و ڕوو بەکەرکووک ڕۆیشتن. لە ناحیەی لەیلان لەشکربەزیان کرد.

ئەهالی کەرکووک قەڵایان داخست، نادرشا پازدەی جەمادی یەک دەورەی شاری دا بەتۆپ و خومپارە ئاوربارانی دەست پێکرد. لە پاش شەش ڕۆژ ئاوربارانی، ئەهالی وەتەنگ هاتن. ڕۆژی بیست و یەکیی مانگ ئەمانیان خواست.

کە کەرکووک گیرا لەشکرێکی ناردە سەر هەولێر، لە دوای گەلێک شەڕ و دەورەدان بەمامڵەت هەولێریش تەسلیم بوو.

مەئموورەکانی عوسمانی کە لە مووسڵ کۆبوونەوە، هاواریان لە کوردی کۆی و حەریر و بادینان کرد. قۆچ پاشای کورد حاکمی کۆی و حەریر بەلەشکری کوردەوە بۆ یارمەتیدانی چووە مووسڵ و بەناوی جیهادەوە لە کوردانی ئامێدی و دهۆک و زاخۆ و دیاربەکر لەشکرێکی قورسی بۆ کۆکراوە.

نادرشا لە کەرکووک بوو بەپەنهانی سەلیم بەگی بابانی نامزەدی حوکمداری کرد. خالیدخان پاشا کە لەوە ئاگاداربوو بەبهانەی چوونەسەر هەولێر هەستا و ڕوو بەئورفە پەنای بۆ عوسمانیی برد. لە مانگی ڕەجەبدا گەیشتە ئورفە.

ساڵی ١١٥٧ حەوتی مانگی ڕەبیعی یەک گەڕاوە مووسڵ و لە مانگی شەوالدا لە مووسڵ مرد و جەنازەکەیان بردەوە قەڵاچوالان. چوار کوڕی هەبوو: سلێمان، محەمەد، ئەحمەد، مەحموود.

## حوکمداری سەلیم خان بەگی بابان (١١٥٦ - ١١٧١)

هەروەکو گوترا لە کەرکووکەوە نامزەدی حوکمداریی بوو. نادرشا کە لە کەرکووکەوە ڕوو بەهەولێر سواربوو، چوونی خالیدخان پاشای بۆ ئورفە زانییەوە؛ بەشیر و خەنجەرێکی گەوهەربەند سەلیم خان بەگی خەڵات کرد و بەناوی «خان» فەرمانی حوکمداریی بۆ نووسی.

نادرشا و سەلیم خان بەلەشکرەوە شەوێک لە هەولێر مانەوە، بۆ سبەینێ ڕوو بەمووسڵ لەسەر زێی گەورە ئامبازی قۆچ پاشا بوون. شەڕ و کوژتار گەرم بوو، قۆچ پاشا زۆر بەدلێرانە بەرابەری کرد، بەڵام قووەتی نادرشا زۆرتر بوو، قۆچ پاشا لە کەلێنی شەودا ڕوو بەمووسڵ کشاوە. نادرشا هەتا نزیک مەرقەدی یوونسی پێغەمبەر کەوتە دوای و قاقەزێکی بەهەڕەشە بۆ نووسی. ئەهالی مووسڵ، کەیخودا و ڕیش سپی و عولەمایانی نارده لای و بەمامڵەت دەستی هەڵگرت و ڕوو بەکەرکووک لەشکری کێشاوە دوایی. لە مانگی ڕەمەزاندا لە قەرەتەپەوە سوپاهی دامەزراند و بۆ خۆشی بۆ زیارەتی عەتەبات ڕۆیشت.

هەولێر و کەرکووک و کۆی کەوتەژێر ئیدارەی سەلیم خانی بابانەوە و لە قەڵاچوالانی گرێدا.

لە پێشدا گوترا کە ئەحمەدخانی سوبحان وێردیخانی بەگلەربەگی ئەردەڵان چووبووە دیاربەکر، بەئومێدی گەڕانەوە گەلێک چاوەڕێ بوو. وەعدەیەکی وای لە تورک دەست نەکەوت بگەڕێتەوە؛ هەتاکو ڕۆمیەکان گەورەبوونی سەلیم خان و دەستوبردی کوردەکانیان چاوپێکەوت، بەهانە لەمە چاکتریان نەدۆزیەوە کە ئەحمەدخان بخاتە سەر هەواداری حکوومەتخواهی ئەردەڵان و شارەزوور.

بەناوی ئاینەوە گەلێک بەیاناتی خەلیفەی بۆ ناردرا، ئەحمەدخان ئەو بەیانانەی بۆ هەموو ئومەراکانی کورد نارد و داوای یارمەتی لێکردن. لە عەشیرەتی بلباس و بابان - کە لە شیعەیەتی دڵگیربوون - نزیک هەشت هەزار کورد لە دیاربەکر لەسەر ئەحمەدخان کۆبوونەوە.

لە مووسڵەوە بۆ سەر شارەزوور کەوتنەڕێ. سەلیم خان کە ئەوەی بیستەوە قەڵا و شارەکانی قایم کرد و قاقەزێکی بۆ شازادە نەسروڵڵا میرزا نوویسی و لە سەربهوردی ئاگاداری کرد. ماڵ و منداڵ و گەنجینەشی بەموهیماتەوە ناردە قەڵای سووورداش، بۆ خۆشی لەشکری هەڵگرت و ڕوو بەئەحمەدخان و مووسڵ چوو.

ئەحمەدخان لە سەلیم خانی نوویسی کە دەست لێ بەردانی نییە و نەبێتە مایەی خوێنرێژی و کوژتاری کوردان.

ساڵی (١١٥٨)ی مانگی ڕەجەب لە نزیک مووسڵ دوو لەشکری کورد ئەمبازی یەکتربوون، لە دوای سێ شەو و سێ ڕۆژ کوژتار، ئەحمەدخان شکا. سەلیم خان لەنێو دیلەکاندا زابتێکی عوسمانی دەستکەوتبوو، بۆ نەسروڵڵا میرزای بەدیاری نارد. بەشادی و خۆشیەوە لە دوازدەی شەعباندا گەڕاوە قەڵاچوالان.

سەلیم خان هەژدە ساڵ حوکمداری بابان و شارەزووری کرد، لەبەر لوتف و پیاوەتی ئەو، لەتێکی زل لە عەشیرەتی زەنگنە لە ماهیدەشتەوە چووە شارەزوور ئیسکان کرا. ساڵی ١١٦٤ هەزار و سەد و شێست و چوار قۆچ پاشای کۆی و عوسمان پاشای بابان کوژران. ساڵی ١١٧١ بەدەسیسەی وەزیری بەغدا سەلیم خان بەکوژت چوو.

## حوکمداری سلێمان پاشای دووەم کوڕی خالید خان پاشا ١١٧١ - ١١٧٧

کە سەلیم خان کوژرا بەتەدبیر و هێزی خۆی و گەورەکانی کورد، بوو بەحوکمدار. ساڵی ١١٧٢ چووە سەر کۆی و لە دەست سۆرانی دەرخست و چووە سەر حەریر و گرتییەوە. ئەحمەد پاشای برا بچووکی لەسەر دانا و محەمەد پاشای برا بچووکەکەی دیکەشی کردە سەرداری سوپاهی خۆی.

ساڵی ١١٣٧ ڕوو بەئەردەڵان لەشکری برد و چەند خاکێکی خستە دەست و لەگەڵ حوکمداری زەند، بناغەی خۆشیی دامەزراند.

ساڵی ١١٧٥ محەمەد پاشای کوڕی خانک خان پاشا بەلەشکرێکی قورسەوە بۆ گرتنی بابان ڕوو بەقەڵاچوالان ڕۆیی. سلێمان پاشایش پێشی پێگرت و لە دوای شەڕ و کوژتار محەمەد پاشای بێژراو بەدیل گیرا و لەشکرەکەشی شکاندرا و محەمەد پاشاش خنکاندرا.

ساڵی ١١٧٦ محەمەد پاشای کوڕی خالید پاشا- کە سوپاهداربوو - بەئارەزووی حوکمداریی لەژێر حوکمی سلێمان دەرچوو و بەلەشکرەوە چووە سەر قەڵاچوالان. سلێمان

پاشا چووه بەرابەری و لە «تاران» دەست بەشەڕ کرا. سلێمان پاشا شکا و هەڵات، محەمەد پاشا گەلێکی تالان و دیل دەستخست.

ساڵی ۱۱۷۷ محەمەد پاشا هێزی زیادبوو لینگی دا سەر سلێمان پاشا، لە مەیدانی شەردا سلێمان گیرا و کوژرا و لەشکرەکەی بلاوکراوە.

## حوکمداریی محەمەد پاشا کوڕی خالیدخان پاشا وە شەڕو کوژتاری لەگەڵ براکانیا ۱۱۷۷ - ۱۱۳۹

کە سلێمان پاشای کوژت، بەزۆریی خۆی لەسەر تەختی حوکمداریی بابان دانیشت و ئەحمەد پاشای براشی کردە حاکمی کۆی و حەریر. زۆری پێنەچوو برایەتیان بوو بەدوژمنایەتی و شۆڕش و فەسادیان کەوتە نێوی. ئەو حاڵە گەلێکی بەدەوام بوو، عولەما و گەورەکانی کورد نێوبژیان کردن و پێکیان هێنانەوە.

بەڵام محەمەد پاشا لە ئەحمەد پاشا دڵپیس بوو بەهەر فێلێک بوو ئەحمەد پاشا بەمیوانداری خواستە قەلاچوالان و گرتی و لە بەندی کرد.

مەحموود پاشا کە برا بچووکترینیان و هەواداری ئەحمەد پاشا بوو، کەلێنی دەستخست و هەڵات و چووە بەغدا و پەنای بۆ وەزیر عومەر پاشا برد.

عومەر پاشا ڕۆژێکی وای لە خوا دەخواست، چەند پارچە خاکێکی بەبڕە (مقطوع) دایە مەحموود پاشا و بەئیحترامێکی قورسەوە دلخۆشی داوە.

محەمەد پاشا لەوە ئەندێشەی پەیدا کرد، قاقەزێکی لە کەریمخانی کوردی زەند، پاشای ئێران نوویسی و بەناوی کوردایەتییەوە داوای یارمەتی لێ کرد و بۆ هەموو کوردستان خستنە ژێر حوکمەوە و هەواداری کرد.

ئەگەرچی ئەوەش ئارەزووی کەریمخان بوو بۆ یەکبوونی هەموو کوردستان دەکۆشا، بەڵام قاقەزی محەمەد پاشا زیاتر خستییە سەر هەوەس و بۆ چوونە یارمەتی محەمەد پاشا دەستی بەتەدارەک گرتن کرد.

عومەر پاشای وەزیر کە زانییەوە، هاواری لە کەریمخان کردووە، دەزبەجێ سوپاهێکی باشی بۆ مەحموود پاشا فەراهەم هێنا و ناوی حوکمداری بابانی پێوە هەڵواسی و ئامادەی چوونە شارەزووری کرد.

ساڵی ۱۱۸۷ چاوقوڵگە کەوتە بەغداوە و گەلێکی کوژتن و لە دوژمن زیاتر تەلەفیاتی

دا و ڕوو بەکوردستانیش چوو؛ بەڵام محەمەدپاشا بەلەز میللەتەکەی بۆ جێگا فێنک و کوێستانان نارد و پێشی بەو بەڵایە گرت.

ساڵی (١١٨٨) مەحموود پاشا بەهەواداری حوکمداریەوە لەشکری ڕوو بەشارەزوور ئاژۆت. محەمەد پاشا بەبێ شەڕ قەڵاچوالانی بەردا و ڕوو بەسنە پەنای بۆ حوکمداری ئەردەڵان برد و سەربهووردی بەکەریمخانی زەند ڕاگەیاند.

مەحموود پاشا لەو ساڵەدا بەبێ شەڕ چووە پایتەختی خۆیان و لەسەر کورسی حوکمداریی بابان جێگیر بوو، ئەحمەد پاشای براگەورەشی لە بەندیی ڕزگارکرد و بەدڵخوازی خۆی تەختی حکوومەتی پێشکەش بەکاکی کردەوە.

ساڵی ١١٨٩ محەمەد پاشا کە گەیشتبووە سنە بەیارمەتی کەریمخانی زەندەوە سوپاهی کۆکردەوە و چووە سەر ئەحمەد پاشا و نزیک سێ سەعات لە قەڵاچوالانەوە ئەحمەد پاشا پێشی پێ گرت.

هەرچەندە بەسوپا محەمەد پاشا هێزی زیاتر بوو، بەڵام بەخت هاواڵی ئەحمەد پاشای کرد. لە دوای شەڕێکی قورس، محەمەد پاشا شکا و لەشکری پەرێشان و بۆ خۆشی دەربەدەر بوو. بەگەلێک ئەزیەت خۆی گەیاندەوە سنە. کەریمخانی زەند لەوە ئاگادار کرا، بۆ تۆڵە ئەستاندنەوەی محەمەد پاشا و گەیشتنە ئارەزوویێکی کە دڵخوازی بوو چل هەزار لەشکری بە سێ قۆڵدا بۆ سەر بەسرە و بەغدا و شارەزوور ساز کرد.

عومەر پاشا لە پێشدا ئەحوالی چوونی محەمەد پاشا و حوکمداریی ئەحمەد پاشا و یارمەتی کەریمخانی زەندی بەئەستەمبووڵ ڕاگەیاند بوو. حکوومەتی ڕۆم شاعیری بەناوبانگ «وەهبی ئەفەندی» بەسەفارەت ناردبووە شیراز لە کەریمخان لوتف و میهرەبانی چاوپێکەوتبوو، بەوەعدێکی سارد و بێ بنە بەڕێ کرابوەوە.

لەشکری زەند قۆڵێکی لەژێر فەرماندەی کەلب عەلیخان ڕوو بەکوردستان بۆ یارمەتی محەمەد پاشا کەوتە ڕێگا و قۆڵێک ڕوو بەبەغدا بەتاڵانکردن و کوژتار ڕۆیشت.

خالید بەگی بابان حاکمی مەندەلی بۆ پێشگرتنیان چوو، لە مەیداندا کوژرا و دەوروپشتی بەغدا تاڵان کرا قۆڵی سێیەم بۆ سەر بەسرە و بەکوژتار جڵەوکوت بوون.

ساڵی ١١٩٠ لە بەسرەوە هەتا شارەزوور بوو بەمەیدانی تاڵان و برەو. ئەحمەد پاشای بابان کە لە سنەوە بزووتنی کەلب عەلیخانی زەند و محەمەد پاشای برای خۆی زانیەوە و تێگەیشت بەرابەری ئەوانە نابێ بەناچاری قەڵاچوالانی بەردا و هێز و سوپا و گەنجینەی

برده کەرکووک. سوپاهی زەند بەکوردستان گرتن و ئەهالی وەتەنگهێنان شالاویان برد و دەستیان بەمەملەکەت گرتن کرد. کەلب عەلیخان گەلێک دەستدرێژی نواندنی کرد.

هەروەکو جلدی یەکەمینی مێژووی جەودەت باس دەکا، ئەو هەموو فیتنە و شەڕ و کوژتارە کە کرا میللەتی کوردی بەگژ یەکتردا کرد و حوکمدارەکانی بابانی کردە دوژمنی یەکتر و برا لەگەڵ برادا خوێنڕێژبوون، مایەی هەموویان عومەر پاشای بەد ئەندێش بوونی بێ شوبهەیە؛ چونکە حەزی لە ئاسودەگی نەدەکرد.

ساڵی ١١٩١ محەمەد پاشای بابان کە وردبووەوە کەلب عەلیخان بەجارێک کوردستانی وێرانکرد و تەمای چاک نییە، بەپەنهانی هێزێکی سازدا و پێشی دەست بەدرێژکردنی گرت و لەسەر ئەوە نێوانیان تێکچوو و بەشەڕهاتن. لە پاش کوژتار محەمەد پاشا شکا، کەلب عەلیخان بەرق هەستاوی بەنێو کوردستاندا ڕوو بەئێران گەڕاوە و هەرچییەکی دەستکەوت کوژتی و تالانی کرد و لە کوردستان دەرچوو.

محەمەد پاشا لە دوای چوونی کەلب عەلیخان بەیارمەتی کوردەکان چووە قەلاچوالان و لەگەڵ میللەت و سوپاه و خۆکۆکردنەوە خەریک بوو.

هەر لەوساڵەدا کەریمخان کە لە سەربهوردی محەمەد پاشا و کەلب عەلیخان ئاگاداربوو، لەژێر فەرماندەی خوسرەوخاندا سوپاهێکی قورسی نارده سەر محەمەد پاشای بابان، لە نەتیجەی کوژتارێکی زۆر خوسرەوخان شکا و بەشپرزەیی ڕوو بەئێران هەلات. محەمەد پاشا لە پاش تالان و دیلێکی زۆر وەدەستخستن بەشادمانی گەڕاوە قەلاچوالان.

ساڵی ١١٩١ ئەحمەد پاشا کە لە کەرکووک بوو، سوپاهێکی باشی هەڵگرت و چووە سەر قەلاچوالان. محەمەد پاشا بۆ بەرابەری برای خۆی لەشکری هەڵگرت و چووە پێشی و شەڕ گەرم بوو. خوێنی مەزلووم ڕژا، لە ئاخریدا ئەحمەد پاشا سەرکەوت. محەمەد پاشا لەشکری پەرشوبلاو بوو، بەهەزار ئەزیەت گیانی بەسەلامەتی خۆی و چەند سەرکردەیەکی دەرچوواندن و ڕزگاربوون و خۆیان گەیاندە سنە و پەنایان بۆ کەریمخانی زەند برد.

ئەحمەد پاشا سەرکەوت و ماڵ و ئەسپابێکی بێ ژماری دەست خست و بەشادمانی ڕوو بەقەلاچوالان چوو و لەسەر تەختی حوکمداریی بابان دانیشتەوە.

## حوکمداری ئەحمەد پاشا کوڕی خالیدخان پاشا (١١٩٢ - ١١٩٤)

ئەحمەد پاشا کە چووە سەر تەختی حوکمداریی بابان بەنوازش و دڵخۆشی دانەوەی ئەهالی و سوپاهی، دەستی بەحوکمڕانی کردەوە.

ساڵی ١١٩٣ محەمەد پاشای بابان بەیارمەتی کەریمخانی زەند لەشکری ئەردەڵان و ئێرانی هەڵگرت و چووە سەر ئەحمەد پاشای برای. لەولاوە جێگا بڵند و سەختەکانی کەوتبوونە سەر ڕێگا گرتنی و سوپاهی تێدا دامەزراندن.

محەمەد پاشا بەبێباکی ڕوو بەقەڵاچوالان لەشکری ئاژۆت هەتا گەیشتە دەربەندێکی تەنگەوە. لە پڕێکا ئەحمەد پاشا دەورەی دا و شیری کوژتاری تێنان. لە مەیدانی شەڕدا محەمەد پاشای ئەسیر کرد، دەزبەجێ هەردوو چاوی کوڵی و کوێری کرد و ناردیە قەڵاچوالان و لەشکرەکەی پەرێشان کرا.

ئەحمەد پاشا بەشادمانی و بەبێ ڕەقابەت دەستی بەحوکمداری کرد و بناغەی مەوەددەتی لەگەڵ کەریمخاندا دامەزراند؛ چونکە کەریمخانی کورد، لە پادشا ناودارەکانی کورد بوو، ئەحمەد پاشا حەزی دەکرد بۆ ئیتفاقێکی عموومی کوردستان لە ژێر ئیدارەی پادشایەکی وادا بکۆشێ، بەڵام عومر وەفای نەکرد.

ئەحمەد پاشا بەکەماڵی ئازادی و سەربەخۆیی حوکمڕانیی کرد. خاکی درنە باجەلان، شارەزوور، کەرکووک، کۆی، حەریر، لەژێر حوکمیدا بوو.

ساڵی ١١٩٤ ئەحمەد پاشا لە «سێگرمە» بەدەنەکەیان بردە قەڵاچوالان. دوو کوڕی ناودار و گرانبەهای لەدوای بەجێما. یەکێک ئیبراهیم ، دووەم خالید پاشا، کە هەریەک لە جێگای خۆیاندا باسیان دەکرێ.

## حوکمداری مەحموود پاشا کوڕی خالید خان پاشا ١١٩٤ - ١١٩٨

کە ئەحمەد پاشا مرد، برا بچووکی کە مەحموود پاشابوو، لەسەر تەختی حوکمڕانی دانیشت و لەگەڵ ئەمەشدا دەیزانی عومەر پاشا فیتنە ئەنگێز و بەدخواهی کوردی ئیدارەی دەکرد و بەپەنهانی ئیتفاقی لەگەڵ کەریمخانی زەند گرێدا.

لەو ساڵەدا حکوومەتی عوسمانی بۆ کوژاندنەوەی ئاوری فیتنە، مستەفا ناوێکی بەسەلاحییەتەوە ناردە بەغدا، ئەگەر عومەر پاشا سەرپێچی بکات بیکوژێت. عومەر پاشا بەبێ کێشە دەستی لە وەزارەتی بەغدا بەردا.

مەحموود پاشا بۆ ئیتفاقی نێوانی، عوسمان پاشای کوڕی خۆی بەوەڵام نارده بەغدا و قاقەزێکی بۆ تازەکردنەوەی مەوەددەت بۆ وەزیری تازە نارد.

والی بەغدا بەدەسیسەی خەزێنەدار عەلی بەگ حەزی دەکرد ئیبراهیم پاشای کوڕی ئەحمەد پاشا بکەنە حوکمداری کوردستان. عوسمان پاشا سەربهوردی بۆ بابی نوویسی و بۆ خۆشی لە چوونەلای وەزیر کورتی نواند.

عەلی بەگی خەزێنەدار، وەزیری هەواداری ئەمە کرد لەشکر بباتە سەر مەحموود پاشا. بەڵام لەبەر بێ هێزی ئەوەیان پەنهان ڕاگرت و بەو واسیتەیە کەم کەمە ساردی کەوتە نێوانی وەزیری بەغدا و مەحموود پاشاوە.

وەزیری بەغدا لەشکرێکی کۆکردەوە. لە پاش چەندجار خەیاڵاتی کە بۆ خۆشی بچێت، لەشکرەکەی نارده سەر مەحموود پاشا و بەکەم شەڕێک شکا و پەرێشان کرا و گەڕاوە بەغدا جاری دووەم دیسان چووە سەر مەحموود پاشا و بەشپرزەیی گەڕاوە. مەحموود پاشا بەو دووجار سەرکەوتنە، گەلێک تاڵانی دەست کەوت و ناوبانگی کرد.

وەزیری بەغدا لەو فێڵە زیاتر چارەی نەبوو کە بنێرێتە دووی محەمەد پاشای بابان و بەکوێریش بیکاتە ئالەتی فیتنە و شەڕ. عومەر پاشاش بوو بەهاودەنگی.

ساڵی ١١٩٥ عومەر پاشای کۆنە وەزیر و محەمەد پاشای بابان، گەلێک هاواڵیان پەیداکرد و بەقووەتێکی تەواوەوە بۆ سەر قەڵاچوالان ڕۆیشتن. مەحموود پاشا بەسیاهەوە پێشی پێگرتن. لە دوای گەلێک کووتار، عومەر پاشا و محەمەد پاشا بەدەستکەوتن. مەحموود پاشاش هەردووکی کوژتن و ئاوری فیتنەی کوژاندەوە.

ساڵی ١١٩٦ مەحموود پاشا لەگەڵ ئوموور خەریک بوو، لە تەک ئەمیره دراوسێکانی کورددا بناغەی خۆشیی دامەزراند و بۆ گەورەبوون تێکۆشا.

ساڵی ١١٩٧ وەزیری بەغدا لەشکرێکی بۆ ئیبراهیم پاشای بابان ساز کرد و بۆ خۆشی لەگەڵ کەوت و ڕوو بەشارەزوور چوون. لە نزیک کەرکووک مەحموود پاشا پێیان ڕاگەیشت و دەستیان بەئاورباراني یەکترکرد. لە دوای کەمێک شەڕ، وەزیر بەشکاوی بۆ بەغدا گەڕاوە. هەر لە نیوەی ئەو ساڵەدا جارێکی تریش عەلی بەگی خەزێنەداری لەگەڵ ئیبراهیم پاشا خست و ناردیە سەر شارەزوور. مەحموود پاشا نەیهێشتن نزیک بەتخووبی بن، شکاندنی و پەرێشانی کردن و بەهەزار ئەزیەت عەلی بەگ و ئیبراهیم پاشا بەساغی خۆیان گەیاندەوە بەغدا.

ساڵی ١١٩٨ مەحموود پاشا بۆ تەئدیب و خستنە دەستی لەشکرێکی بردەسەر موکریان و لە ڕێگای بلّباسەوە ڕوو بەلاجان چوو. حوکمداری موکریان بەتۆپ و تفەنگەوە، جێگا سەخت و تەنگەکانی قایم کرد و لە کەلێندا دانیشت.

مەحموود پاشا بەبێ ئەندێشە لەشکری ئاژۆت، لە تەنگەی چۆمی نواوەدا کە داخیل بەلاجان دەبێ لە تەرەف لەشکری موکریانەوە دەورەدران و ئاوربارینیان دەستپێکرد. ئەو ڕۆژە هەتا ئێوارە شەڕ و کوژتار کرا. لە تاریکیی شەودا مەحموود پاشا و لەشکرێکی کە مابوون ڕوو بەچیا بەرزەکانی قەندیل هەڵاتن.

موکریانییەکان لە پێشدا ئەوێشیان گرتبوو، سەرەوژێر پێیان دادان و کوژتاریان لێکردن. شەوی دووشەممەی مانگی ڕەبیعی یەکی ئەو ساڵە، مەحموود پاشا لە دەست موکریانیاندا بەکوژت چوو. لەشکری بابانی کە مابوون بەهەر فێڵێک بوو جەنازەکەی مەحموود پاشایان دزیەوە و ڕوو بەقەڵاچوالان هەڵاتن و هەموو ئەسپاب و ماڵیان بەدیل گیرا. مەحموود پاشا دوو کوڕی ناوداری لە پاش بەجێما یەکێک عوسمان پاشا و دووەم عەبدوڕەحمان پاشا؛ سەربهوردی هەریەکیان بەجوی لە جێگای خۆیدا دەبێژرێن...

## حوکمداری ئیبراهیم پاشا (١١٩٨-١٢١٨)

ئیبراهیم پاشای کوڕی ئەحمەد پاشای کوڕی خالیدخان پاشای بابان - هەروەکو گوترا - هەر لە بەغدا دادەنیشت؛ وەزیرەکان بۆ ڕۆژێک ڕایانگرتبوو.

لە مانگی سەفەری ئەو ساڵەدا کە زانیەوە مەحموود پاشا ڕوو بەموکریان لەشکری بردووە، کەلێنی دەستخست و ڕوو بەقەڵاچوالان ڕۆیشت و بەقاقەز و چاوڕاو بەشەڕ و نەسیحەت، نزیکی قەڵاچوالان بوو. لەودەمەدا دەنگی کوژتنی مەحموود پاشاش پەیدابوو؛ بەماملّەت ئەهالی بردیانە نێو قەڵاوە و لەسەر تەختی حوکمداریی دانیشت.

ئیبراهیم پاشا چونکە پیاوێکی مەعاریفپەروەر و مەدەنی بوو، لە هەموولایێکەوە عولەمای بەناوبانگی لە خۆی گرد کردبوونەوە و مەدرەسە و مزگەوتی چاکی بۆ دروستکردن.

ساڵی ١١٩٩ ئیبراهیم پاشا قەڵاچوالانی پێ تەنگ بوو. لە دەشتی شارەزووردا لە پانایی گۆشەیەکی دەشتی سەرچناردا بناغەی شارێکی زۆر گەورەی دامەزراند و ناوی نا «سلێمانی». هەموو دایرە و مەدرەسە و ماڵەکانی قەڵاچوالانی بردە ئەوێ و دەستی

بەڕێکخستنی شار و دامەزراندنی عولەما و ئەهالی کرد، سێ ساڵ لەگەڵ دروستکردنی شار خەریک بوو.

ساڵی ١٢٠١ سلێمان بەگی شاوێززادەی کورد کە لە بنەماڵە گەورەکان بوو، لینگی دابووە سەر بەسرە و گرتی. سلێمان پاشای نۆکەرباب کە وەزیری بەغدابوو، لە نەتیجە ئەندێشەی کرد و کۆمەگی لە ئیبراهیم پاشای بابان و فەتاح پاشای درنە و باجەلان خواست.

سلێمان پاشا لە ژێر فەرماندەی خالید ئاغا و ئەحمەد ئاغا و کەیخوداوە لەشکری ناردە سەر سلێمان بەگ و بەشکاوی و پەرێشانی گەڕابوونەوە. سلێمان بەگ ڕۆژ بەڕۆژ ڕووی لە گەورەبوون کردبوو.

ئیبراهیم پاشا و فەتاح پاشا بەقووەتێکی قورسەوەی کوردی بابان و کۆی و حەریر و درنە و باجەلان گەیشتنە بەغدا. سلێمان پاشای وەزیر لەو قووەتە ئەندێشەی پەیداکرد و ئەو قووەتەی بەفێڵ، بەبهانەگرتن لەشکرەکەی کوردستانی خستە ژێر فەرمانی خۆیەوە و بۆ بەسرەی ڕەوانەکردن و ئیبراهیم پاشاشی عەزل کرد و عوسمان پاشای کوڕی محەمەد پاشای بابانی کردە حوکمدار و فەتاح پاشاشی لێخست.

عەبدولقادری پاشای ئامۆزای ئەوی کردە حوکمداری درنە و باجەلان و لەگەڵ خۆی هەڵگرت و چوونە سەر سلێمان بەگی شاوێز، بەهەر فێڵێک بوو لەگەڵ سلێمان بەگ ڕێککەوتن و گەڕانەوە بەغدا.

مستەفا ئاغای کوڕی ئەحمەدئاغای کەیخودا دڵگیر ببوو، بەپەنهانی گرتن ئیتفاقی سەرکێشیی لەگەڵ عوسمان پاشای بابان گرێدا و دەستی بەسەرکێشی کرد؛ لە نەتیجەدا سلێمان بەگ ناچاربوو ئەرازی و ئەملاکی مستەفا ئاغا و سلێمان بەگی بەزیادەوە پێدانەوە.

مستەفائاغا چوو لە قەرە ئەورەمان دانیشت. عوسمان پاشاش لە پاش گەڕانەوەی لە بەسرە ڕوو بەشارەزوور ڕۆیشت و لەگەڵ ئومووری حوکمداریی ڕێکخستن لە سلێمانی دانیشت.

سلێمان پاشای وەزیر لە دوای چەندێک زانیەوە کە عوسمان پاشا و مستەفا ئاغا و سلێمان بەگ پێکەوە ڕێک کەوتوون، ناردی عوسمان پاشای بابانی گرت و خستیە بەندەوە و ئەزیەتی دا، عوسمان پاشا لە داخان نەخۆش کەوت. لە بەندیان دەرخست و

ناردرایەماڵەوە. عوسمان پاشا نەخۆشیەکەی درێژبوو، دەرد و داخی پێ کێشا و لە ساڵی ١٢٠٤دا بەو داخەوە مرد.

لەو ساڵەدا ئیبراهیم پاشا کرا بەحوکمدار سلێمان پاشای کوڵمە لە ئیبراهیم پاشا دوودڵ بوو؛ بۆ بەرهەڵستی ناردی ئاوڕەحمان پاشای کوڕی مەحموود پاشای بردە بەغدا و بۆ حوکمداریی ئاوزەدی کرد.

ساڵی ١٢٠٤ی مانگی ڕەمەزان، ئاوڕەحمان پاشا کرا بەحوکمدار و ئیبراهیم پاشا عەزل کرا و ئاوڕەحمان پاشا ناردرایە سلێمانی و دەستی بەفەرمانڕەوایی کرد، هەتا ساڵی ١٢١٢ ئیبراهیم پاشا بەگۆشەگیریی لە بەغدا و ئاوڕەحمان پاشا بەحوکمداریی لە سلێمانی ڕایانبوارد.

ساڵی ١٢١٢ سلێمان پاشا ناخۆشی خستە نێوانی ئاوڕەحمان پاشا و ئیبراهیم پاشاوە. بەبهانەیەک ئاوڕەحمان پاشای خواستە بەغدا و عەزلی کرد. ئیبراهیم پاشا ناردرا سلێمانی، ئاوڕەحمان پاشا و سەلیم بەگ لە بەغدا حەپس کران و ئەزیەت دران.

ساڵی ١٢١٣ لە سلێمانی چاوقوڵکەی پیس پەیدابوو، میللەتی کوردی گەلێک پێ مردن و ماڵی گەلێک کوێربوونەوە و نەمان.

ساڵی ١٢١٦ محەمەد پاشای کوڕی خالید پاشا کرا بەحاکمی کۆی و حەریر و ناردرا و چوو دەستی بەحوکمداریی کرد.

ساڵی ١٢١٨ ئیبراهیم پاشا بەدڵگیری چووە مووسڵ. لەو ساڵەدا لەوێ وەفاتی کرد و لە تەرەف وەزیری بەغداوە حکوومەتی بابان درا بەئاوڕەحمان پاشا.

## حوکمداری ئاوڕەحمان پاشا

ئاوڕەحمان پاشا کە لە بەندیخانە ڕزگاربوو. دەستی بەهێز پەیداکردن کرد و ڕۆژ بەڕۆژ لە خۆ ڕزگارکردندا بوو. داخی وەزیر و محەمەد پاشای کۆی لە دڵ گرتبوو، لە کەلێن دەگەڕا.

ساڵی ١٢٢٠ ئاوڕەحمان پاشا لەشکرێکی ڕازاندەوە و پاشایانی کۆی و حەریری خواستن و بەیارمەتی محەمەد پاشای حاکمی کۆیەوە چوونەسەر محەمەد بەگ ناو، لە خاپوور شۆڕشی دەست پێ کردبوو شکاندیان و بەسەرکەوتن و بەکەیفەوە گەڕانەوە. محەمەد پاشای کۆی بەتەمای چوونەوە بوو. ئاوڕەحمان پاشا کەلێن لە دەستدانی لە ئازایی بەدوورزانی؛ بۆیە هەتا چوونە کەرکووک لەگەڵ خۆی برد.

که گەیشتە دەشتی «فرقە» محەمەد پاشای بەسێدارەدا کرد و خنکاندی و سەربهوردی بەعەلی پاشای وەزیری بەغدا ڕاگەیاند و ڕوو بەشاری سلێمانی کەوتە ڕێگا.

عەلی پاشا لەوە زۆر دڵگیر و ڕق هەستاو بوو؛ خالید پاشای کوڕی ئەحمەد پاشای بابان کە لە ئامێدی بوو بردیە بەغدا و ناوی حوکمداری بابانی لێنا و سلێمان پاشای کوڕی ئیبراهیم پاشاشی کردە حاکمی کۆی و حەریر و بۆ چوونە سەر خاکی خۆیان لەشکر و تەدارەکی بۆ گرتن.

ئاوڕەحمان پاشا ئەوەی زانیەوە بەلەشکرەوە ڕوو بەبەغدا خشا و دەستی بەتاڵانگرتنی دەورپشتی بەغدا کرد و عەلی پاشای وەتەنگهێنا.

خالید پاشا و سلێمان پاشای بابان بۆ بەرابەری ئاوڕەحمان پاشا لە بەغدا دەرکەوتن و ئاوڕەحمان پاشایان شکاند و کەوتنە دووی.

ئاوڕەحمان پاشا لە دەربەندی بازیان خۆی گرتەوە و بۆ شەڕ پێشی پێ گرتن.

عەلی پاشا بەسوپاهێکی قورسەوە چووە یارمەتی خالید پاشا، لە دەربەندی بازیان بەشیر و خەنجەر و بەتۆپ و تفەنگ شەڕ و کوژتار کرا. ئاوڕەحمان پاشا نەشیا خۆڕاگرێ، بە پێنج هەزار ماڵە عەشایری کوردەوە ڕوو بەخاکی ئەردەڵان هەڵاتن و پەنایان بۆ ئەمانوڵڵاخان برد. بەئیحترامەوە پێشوازی کرا و سەربهوردی بەفەتالی شای قاجاڕ ڕاگەیاند.

ساڵی هەزار و سەد و بیست مانگی ڕەجەب، سلێمان پاشا بۆ کۆی و حەریر و خالید پاشا بۆ شارەزوور لەسەر تەختی حوکمداریی دانیشتن.

عەلی پاشای وەزیر ئەحمەد چەلەبی بەوەڵام ساز کرد و دیاری و چتێکی زۆری بۆ شاهی ئێران پێدا نارد و ڕەوانەی تارانی کرد کە پەنای ئاوڕەحمان پاشا نەدرێ.

لەولاوە فەتالی شاش کە چوونی ئاوڕەحمان پاشای بۆ سنە بیستەوە، میرزا سادقخانی وەقایع نیگاری ناردە بەغدا کە نێوانی ئاوڕەحمان پاشا و وەزیر ڕێکخاتەوە و حوکمداریی شارەزوور بدرێتەوە ئاوڕەحمان پاشا.

وەقایع نیگار کە گەیشتە بەغدا ئیحترامی نەگیرا و حوکمداری شارەزووریش بەخالید پاشا درابوو، بەدڵگیری ڕوو بەتاران گەڕاوە و شاهی ئێرانیشی لەوە ڕەنجیدە کرد.

ساڵی فەتالی شا بۆ ئیتفاق کردن ئاوڕەحمان پاشای بۆ تاران میوانداری کرد و بەرەبەرە شاهانە پێشوازیان کرد. مانگی ڕەبیع گەیشتنە تاران و بەخەنجەر و شیری کاڵان

زێڕ و گەوهەربەند و بەکەولێکی سمۆره و شالێکی تورمەی گرانبەهای خەلات کرا، حکوومەتی کوردستانی شارەزووری بەئیستقلالیکی تەواو بۆ تەسدیق کرد و بەلەشکرێکی قورسەوەی بەرێ کردەوە کە بەزۆر بچێتەوە سەر تەختی حوکمداری.

ئاوڕەحمان پاشا لەگەڵ ئەمانوڵلاخانی ئەردەلانێ ڕوو بەگرتنی شارەزوور گەڕانەوە. شازادە محەمەد عەلی میرزا و ئیبراهیم خانی کوردی دەلۆ و محەمەدخانی کوردی شامبیاتی بەسوپاهی خۆیانەوە بۆ سەر بەغدا لە تاران دەرکەوتن. مانگی جەمادی یەک گەیشتنە کرمانشان.

عەلی پاشا کە لەوە ئاگادار کرا سی هەزار سوار و پیادەی ساز کرد و پازدە هەزاری خستە ژێر فەرمانی خالید پاشا و سلێمان پاشای بابان و سلێمان پاشای کەهیا کە خوشکەزای خۆی بوو، ڕوو بەئاوڕەحمان پاشای بەرێکردن و پازدە هەزاریشی لەژێر فەرماندەی فەتاح پاشای حاکمی باجەلاندا نارده زەهاو، خۆشی هەتا «تاقی گەڕڕا» ڕانەوەستا.

ئاوڕەحمان پاشا و ئەمانوڵلاخان بۆ گرتنی شارەزوور لە سنە دەرکەوتن و ڕوویان لە کەرکووک کرد. لە جێگایەکی پێی دەڵێن جەمشا، سلێمان پاشا و خالید پاشا پێشیان پێگرتن و شەڕ گەرمەی نەکەوتێ، ئاوڕەحمان پاشا شکا و ڕوو بەسنە هەلات و گەلێکی لێ بەکوژت چوو.

کە مزگێنی ئەوە بەعەلی پاشا ڕاگەیەندرا لە زەهاوەوە بەتالان و کوژتار چووە تاقی گەڕڕا.

نەورۆزخانی ئێشیک ئاغاسی بەسوپاهی خۆیەوە بۆ یارمەتی شازادە چووە هەمەدان. لەگەڵ شازادە چوونە کەرەند. عەلی پاشا لە تاقی گەڕڕا سواربوو گەڕاوە زەهاو و چووە سەر چۆمی سیروان دابەزی.

نەورۆزخان و محەمەد عەلیخانی شامبیاتی بە دە هەزار سوارەی کوردی «مەدانلوو جیهان بەگلوو»ەوە بەتالانکردن ڕوویان لە زەوی بەغدا کرد. فەتاح پاشای باجەلان کەمێک لە بەرابەریدا کۆشا و ڕوو بە عەلی پاشا هەلات، ئەوانیش لە زەهاوەوە هەتا بەعقووبە و مەندەلی کوژتار و تالانیان کرد.

فەرەجوڵلاخانی نەستەقچی پاشا و محەمەد وەلیخانی هەوشاری سفیارخانی کورد بەچی هەوشاری بەسوارەی کوردەکانی هەوشارەوە بۆ یارمەتی ئاوڕەحمان پاشا کەوتنە ڕێگا.

خالید خان پاشا و سلێمان پاشای بابان و سلێمان کەهیا بەسوپاهەوە ڕوو بەسنە ڕۆیشتن لە کەنار دەریاچەی مەریوان ڕووبەڕووی ئاوڕەحمان پاشا بوون و ئەمبازی یەکتربوونیان یەک بوو.

ئەمانوڵڵاخان و فەرەجوڵڵاخان بەلەشکری کوردستانی ئەردەڵانەوە لە ڕاستی مەیداندا ڕاوەستان. کوردەکانی هوزارە و هەوشار لای چەپیان گرت، ئاوڕەحمان پاشا بەکوردی بابان و شارەزوور و کەلهوڕ و زەنگنە و جاف و گۆرانەوە لە ناوچەدا دڵی مەیدانیان دەست خست و ڕیزبوون. خالید پاشا و سلێمان پاشا بەلەشکری کوردی کۆی و حەریر و کەرکووکەوە بەرەو ڕووی ئەردەڵانیەکان، نۆکەر و غولامی گورجی و عارەب لەگەڵ سلێمان پاشای کەهیا ڕوو بەهەوشارییەکان و عەسکەری ڕۆم ڕوو بەئاوڕەحمان پاشا ئامادەی شەڕبوون و بەتۆپ و تفەنگ یەکتریان ئاورباران کرد.

لە نەتیجەدا لەشکری خالید پاشا و وەزیری بەغدا شکا. سلێمان پاشای کەهیا لەو شەڕەدا بەدیل گیرا و لە پاش ساڵێک ڕزگاربوو. عەلی پاشا ڕوو بەکەرکووک و بەغدا هەڵات و لەشکری ئاوڕەحمان پاشا بەکوژتار و تاڵان ڕوو بەدەوری بەغدا ڕۆیشت.

عەلی پاشا پەنای بۆ شێخ جەعفەری نەجەفی برد کە پیاوێکی مەلا و موجتەهیدی شیعەبوو. بەڕجای ئەو لەشکری ئاوڕەحمان پاشا دەستیان لە شەڕ و کوژتار بەردا و گەڕانەوە. ئاوڕەحمان پاشا لەسەر حوکمداریی شارەزوور دانیشت.

سلێمان پاشای بابان گەڕاوە کۆی و خالید پاشا چووە بەغدا. لە ئەواخیری ئەو ساڵەدا شێخ جەعفەری نەجەفی بۆ ڕزگاریی سلێمان پاشای کەهیا چووە تاران و لەولاوە فەیزی ئەفەندی لە تەرەف سەدری ئەعزەمی عوسمانی و حاجی یووسف پاشاوە بۆ ئەوە چووە تاران و کەهیایان ڕزگارکرد و بۆ ڕێکخستنەوەی نێوانی ئاوڕەحمان پاشا و عەلی پاشا، میرزا سادقخانی وەقایع نیگار لە تارانەوە چووە بەغدا لە تەرەف ئێران و حکوومەتی عوسمانییەوە حکوومەتی شارەزوور بۆ ئەوڕەحمان پاشا تەسدیق کرا.

ساڵی مەدەد ئاغای گورجی ڕۆژی سێ شەممەی سێزدەی ڕەجەب، سبەینێ زوو چووە ژووری عەلی پاشای وەزیر و لەسەر بەرماڵی نوێژ کوژتی.

لەو ساڵەدا یووسف خواجەی کوڕی محەمەدەمین خواجەی ساحێبقڕانی بەدەخشانی، کاری پەرێشان ببوو. لە بەدەخشانەوە ڕوو بەمیسر و مەککە و سووریا ڕۆیشتبوو، پەنای بۆ ئاوڕەحمان پاشا برد. زۆر بەئیحترامەوە ڕایگرت، پیاوێکی زانابوو، ئەم شیعرەی لەسەر مۆری کۆڵی بوو:

ای خواجە چون بەفردوسی برین شد زیناجهان
جانشین أوست یوسف، خواجەی صاحبقران

حکوومـەتی شارەزوور و ئەهالی بەغـدا بەوەزارەتی سلێـمان کـەهیا قـەراریان دا لە مانگی موحەڕەمی ١٢٢٣دا وەزارەتی تەسدیق کرا.

ئاوڕەحمان پاشا بەهەموو جۆرێک بۆ کاروباری ڕێکخستن دەکۆشا و دوو ساڵی تەواو لەگەڵ هێز پەیداکردن خەریک بوو. ساڵی ١٢٢٣ ئاوڕەحمان پاشا کە قەڵای زەڵمی لە مانگی سەفەردا گرت، سێ تۆپی گەورەی دەرخست و ئەم شیعرانەی لە گومبەزەکە بەنوویسراوی چاوپێکەوت:

خان از بەی عیش و کامرانی
چون جزم شدەش جهان ستانی
در فصل بهار و ماه شوال
شد قلعەی زلم فتح خانی
در سال هزار و بیست و شش را
آمد بەحصول این امانی
(تحریراً في ٢٨ شوال ١٠٢٦)

لەو ساڵەدا ئاوڕەحمان پاشا لەشکری بردە سەر سلێمان پاشای حاکمی کۆی. لە پاش شەڕکردن دەرەقەتی نەهات و گەڕاوە.

لەو ساڵەدا مانگی ڕەبیعی دوو، سلێمان پاشای کەهیا بۆ خۆی و سلێمان پاشای بابان بەلەشکرەوە چوونەسەر ئاوڕەحمان پاشا کە دەریپەڕێنن و سلێمان پاشای بابان بکەنە حوکمدار. لە پاش گەلێک شەڕ و چەند کوژتار و کەشاکەش، لە مانگی ڕەمەزاندا ئاوڕەحمان پاشا هەموو خاکی خۆی خستەوە دەست و سلێمان پاشای حاکمی کۆییش ڕوو بەکەرکووک فیراری کرد؛ کۆی کەوتە دەست ئاوڕەحمان پاشا.

لە ساڵی مانگی ڕەبیعی یەک، بەسەر عەسکەری سلێمان پاشای بابان لەشکری وەزیری بەغدا چووە سەر دەوروپشتی ماردین و بەشکاوی ڕوو بە بەغدا گەڕاوە. ئاوڕەحمان پاشا بەو شکستەیە دڵ قەوی بوو، لەشکری کۆکردەوە و ئامادەی چوونە سەر بەغدا بوو.

لە ساڵی سەفەردا ئاوڕەحمان پاشا ڕوو بەبەغدا دەستی بەگرتنی مەملەکەت و شار و دێهات کرد. لە حەوتی ڕەمەزاندا گەیشتە کەنار بەغدا و لە گەڕەکی ئەعزەمیە لەگەڵ وەزیری بەغدا شەڕی کرد و سلێمان پاشای بابانی بەدیل گرت. ئەهالی بەغدا هەواداری

ئاوڕەحمان پاشا بوون، سلێمان کەهیا ڕوو بەدەشتێ هەڵات و لە تەرەفی عارەبی ڕفاعییەوە گیرا و کوژرا.

ئاوڕەحمان پاشا چووە نێو شارەوە و بەغدای گرت و ئومووری تێدا دامەزراند. فەیزوڵڵا کەهیا و خەزینەدار و ئیسماعیل ئاغای کوژتن. سلێمان پاشای بابان و مووسا بەگزادە عەبدوڵڵا بەگ و مەحموود بەگی کوڕی خۆی - کە هەواداری کەهیا بوون - زنجیربەندی کردن. لە مانگی زیلقەعدە دا ناردنی بۆ کوردستان و لە شاری کۆی حەپسی کردن. لە پاش گرتنی بەغدا خەزینەدار عەبدوڵڵائاغای کردە وەزیری بەغدا.

ڕەئیسولکیتابی عوسمانی کە ناوی حاتی ئەفەندی بوو، لە ئەستەمبووڵەوە بۆ فیتنە پەیداکردنی نێوانی حوکمدار و پاشایانی کوردستان و بەغدا ناردرابوو. لەودەمەدا لە بەغدا بوو عەبدوڵڵائاغای وەزیری تازە بەنەیاری ئاوڕەحمان پاشا بزووت و لە نێواندا شۆڕشی پەیدا کرد. بەناچاری ئاوڕەحمان پاشا هاواری لە ئێران کرد کە یاریدەی بدەن.

حاتی ئەفەندی بەپەنهانی ئەحمەد چەلەبی بەوەڵام بۆ تاران ناردنێ ساز کرد و دیاریەکی زۆری بۆ فەتالی شا ڕێک خست و بەرێکرد.

نێوانی ئاوڕەحمان پاشا و عەبدوڵڵائاغا تێکدرا، لەنێو شارا شەڕ و کوژتار دەست پێکرا، گەڕەکی کەرخ کەوتبووە دەست عەبدوڵڵائاغا و ڕەسافە لەژێر حوکمی ئاوڕەحمان پاشادا بوو. بەچاووڕاوی حاتی ئەفەندی، ئەهالی بەغدا بوون بەهەواداری عەبدوڵڵائاغا، لەنێو کووچە و کۆلانی ڕەسافەدا کوژتار دامەزرا.

ئاوڕەحمان پاشا بەناچاری لە شار دەرکەوتبوو، لە نزیک گەڕەکی ئەعزەمیە لە پڕ تاویدا و لە ئەسپ بەربووەوە. ئەهالی گرتیان و بردیانە لای حاتی ئەفەندی بەندی کرد.

بەپەنهانی دیسان هێزی پەیداکردەوە، لە پاش شەش ڕۆژ حەپس دەرکەوت و شەرقی شیمالی شاری خستەوە دەست. عەبدوڵڵا و ئاوڕەحمان پاشا لە بەغدا هەرکەس بۆ هێز زیادکردن دەکۆشان. لەودەمەدا حاتی ئەفەندیش ئاوری فیتنەی دەکوژاندەوە.

ئەحمەد چەلەبی بیستی زیلحیجە گەیشتێ فەرمانی وەزارەتی بۆ عەبدوڵڵائاغای گورجی و حوکمداری شارەزوور و کۆی بۆ ئاوڕەحمان پاشای هێنا، لەسەر ئەوە ئاوڕەحمان پاشا ڕوو بەشارەزوور گەڕاوە.

ساڵی ١٢٢٦ مانگی ڕەبیعی یەک، حکوومەتی عوسمانی بۆ نەهێشتنی ئیتفاقی دەوڵەتی ئێران لەگەڵ ئاوڕەحمان پاشای بابان، سەید عەبدولوەهاب ئەفەندی و حیرەت

ئەفەندی و شاکر ئەفەندی بەسەفارەت ناردرانە تاران؛ بەڵام بەبێ گەیشتنە ئارەزوو گەڕانەوە تەورێز و چوونە لای نایبوسەڵتەنە و بۆ یارمەتی نەدانی کوردان کەوتنە بیرەوە.

لە یازدەی جەمادی دوودا ئاورەحمان پاشا بەیارمەتی گەورەکانی کورد، سلێمان پاشا و مووسا بەگزادە عەبدوڵلابەگ و کوڕی خۆی مەحموودبەگی عەفووکردن و لە حەپسی کۆی دەریخستن.

خالید پاشای کردە حاکمی زەهاو و مەحموودبەگی کوڕی خۆی کردە حوکمرانی کۆی و حەریر. ئەحمەدبەگی ناردە سەر قەڵای سەردەشت، بۆ نیگەهداری تخووبی سوپاهێکی دایێ و بۆ خۆشی لەگەڵ ڕێکیی ئوموور خەریک بوو.

وێنەی سەرکردەیەکی
ئاورحمان پاشا
سەرکۆماری جاف میرەبەگ

## شەڕی شازادەی محەمەد عەلی میرزای قاجار لەگەڵ ئاوڕەحمان پاشا

هەر لەو ساڵەدا بەواسیتەی سەفیری عوسمانییەوە، نایبوسەڵتەنە خەڵەتاندرا و فەتالی شا خرا سەر ئارەزووی شکاندنی بابان و دەست بەتەدارەکی سوپاھ و بەھانە کرا.

مانگی ڕەجەب فەتالی شا ئەمری دا بەمحەمەد عەلی میرزا کە بچێتە سەر ئاوڕەحمان پاشا و لەولاوە نایبوسەڵتەنە لە تەورێزەوە لەشکری ساز کرد. ئەحمەدخانی کوردی مەقدەم بەگلەربەگی مەراغە و بوداقخانی کوردی موکری حاکمی سابڵاغ، بەسوپاھی کوردی موکریان و بلّباسەوە لە ڕێگا و کێوانی بلّباس ڕوو بە شارەزوور ڕۆیشتن. نەورۆزخان عزەدین لووی قاجار ڕووبە سسەردەشت کەوتە ڕیگا. نەسروڵلاخانی کوردی قەرە گوێز و فەرەجوڵلاخانی کوردی هەوشار و محەمەد حەسەن خان کوردی وڵدان و محەمەدخانی کوردی دوڵلو لەگەڵ سوپاھی عەشیرەتە کوردەکانیان بۆ لای شازادە محەمەد عەلی میرزا چوون.

ئاوڕەحمان پاشا لە هەمووﻻییێکەوە بۆ بەرابەری خۆی ساز کرد و لەشکری ئامادەی شەڕکرد؛ لە پڕێکا سلێمان پاشا لە بازیانەوە بۆ کەرکووک و بەغدا فیراری کرد.

مانگی شەعبان خالید پاشای بابان و کوڕێکی ئاوڕەحمان پاشا لەگەڵ شازادە ئیتفاقیان

کرد و ڕێگایان بەردا. شازادە بەیارمەتی خالید پاشاوە گەیشتە زەهاو، لەوێشەوە چووە سەر چۆمی سیروان کە بچێتە سەر شارەزوور، لەولاشەوە ئەحمەد بەگ سەردەشتی بەردا و ڕوو بەشارەزوور کشاوە.

ئاوڕەحمان پاشا کە لەو دوولایەی بەقووەتەوە ئاگادارکرا، شەڕیان نەکرد و شەڕیان بەچاک نەزانی و هێز و نەقدینە و سوپاهی هەڵگرت و لە سلێمانی دەرکەوت و چووە شاری کۆی و دەستی بەسەنگەر و خۆ توندکردن کرد. لەودەمەشدا یووسف خواجەی بەدەخشانی چووە بەغدا.

کە ئەوە بەشازادە گەیشتەوە، خالید پاشای کردە حوکمداری شارەزوور و ناردیە سلێمانی. لە یەکی ڕەمەزاندا گەیشتە سلێمانی.

لە پازدەی ڕەمەزاندا شازادە و سوپاهی کوردان ڕوو بەکۆی کەوتنە ڕێگا، لە نزیک کۆیێ شەڕ و کوژتار دەست پێ کرا. شازادە گەلێک کوژتاری لێکرا و پەرێشان بوو. بەماملەت شازادە گەڕاوە و ئاوڕەحمان پاشا لە کۆی ماوە.

کە شازادە ڕوو بەئێران گەڕاوە، ئاوڕەحمان پاشا لە کۆی و حەریر لەشکری کۆکردەوە و پێویستیی ساز کرد. لە مانگی زیلحیجەدا پەلاماری خالید پاشای دا. بەگرتنی ئاوایی چووە بازیان. خالید پاشا لە زەهاوەوە ڕوو بەبەغدا هەڵات و بۆی دەرچوو.

ئاوڕەحمان پاشا بەدەبدەبەوە چووە سلێمانی و دەستی بەحوکمداری کردەوە و کەرکووک و کفری و باجەلان و زەهاو و کۆیێ و حەریر و سەردەشتی بەمونتەزەمی خستە دەست خۆی و ئوموورى تێدا دامەزراندەوە و خەریکی هێزبوو.

حەزرەتی مەولانا خالید لە ڕەمەزانی ئەو ساڵەدا لە هیندستانەوە گەڕاوە سلێمانی و دەستی بەنەشری تەریقەت کرد.

حکوومەتی عوسمانی چونکە لە شان و شەوکەتی ئاوڕەحمان پاشا دەترسان و لە شەڕی ئەمین نەبوون، وەلامیان بەعەبدوڵلا پاشای والی بەغدا دا بەقووەتێکی قورسەوە بچنە سەری و دەریپەڕێنن و خالید پاشا بکەنە حوکمداری بابان.

ئاوڕەحمان پاشا بەهەموو جۆرێک خەریکی هێزبوو، لەگەڵ ئێران ڕێککەوتەوە و سوپاه و ئالەتی سازدا و هەموو تخووبەکانی بەسوپا توند کرد.

ساڵی ١٢٢٧ مانگی جەمادی دوو عەبدوڵلا پاشای وەزیری بەغدا و خالید پاشا و سلێمان پاشای بابان، بەسوپاهی کورد و گورجی و ڕۆم و عەرەبەوە ڕوو بەشارەزوور لە بەغدا دەرکەوتن. لە ئەوەڵی ڕەجەبدا دووچار بەئاوڕەحمان پاشا بوون.

ئاوڕەحمان پاشا بەلەشکرەوە چووە پێشیان. لە کفری و دەلوو عەباس شەڕێکی خوێناوی کرا. خالید بەگی برای ئاوڕەحمان پاشا و ئیسماعیل بەگی گەورەی عەشیرەتی کوردی «بەیات» و گەلێک لەشکر کوژران و زۆریشی بەدیل چوون. ئاوڕەحمان پاشا و کوڕانی وەڵدبەگی جاف و چەند کەسێکی دیکە ڕوو بەکرمانشان هەڵاتن.

خالید پاشا بەزۆریی خۆی چووە سلێمانی. لە ئاخری ڕەجەبدا لەسەر تەخت دانیشتەوە و سلێمان پاشاشی کردە حاکمی کۆیێ و حەریر و عەبدوڵلاپاشاش چووە بەغدا. ئیسماعیل خانی حاکمی ئەردەوێڵی بۆ لای فەتالی شا نارد، بەبێ گەیشتنە ئارەزوو گەڕاوە.

لەولاوە حکوومەتی عوسمانی لەگەڵ عرووسدا مامڵەتی کرد و ناوی حکوومەتی ئێران نەبرابوو. ئەوە بوو بەمایەی یارمەتی ئاوڕەحمان پاشا.

فەتالی شا لەشکرێکی باشی کۆکردەوە و لەژێر فەرمانی فەرەجوڵلاخانی هەوشاری و تەهیرودەولە قاسمخانی قاجارِ قۆنلوو و سوپەهدار یووسف خانی گورجی دا ناردنی بۆ کرمانشان.

شازادە محەمەد عەلی میرزا بۆ ئەمە کە کوژتار نەبێ مەهدیخانی کوردی کەلهوڕی ناردە بەغدا کە بەبێ شەڕ ئاوڕەحمان پاشا بگەڕێتەوە شارەزوور. بۆ خۆی و ئاوڕەحمان پاشا لەشکریان بردە زەهاو. مەهدیخان بەدڵخواز نەگەیشتنەوە گەڕاوە.

لە پازدەی شەعبان لەشکر کرا بە سێ لەت. یەکێک لە ڕێگای قەرەتەپەوە، دووەم لە ڕێگای قزلڕوباتەوە بەتاڵان و کوژتار چوونە خوارێ. شازادە و ئاوڕەحمان پاشاش لە زهاوەوە چوونە سەر چۆمی خانەقین.

لەشکر ئەو خاکانەیان هەتا بەغدا وێرانکرد و عەبدوڵلا پاشا بەناچاری شێخ محەمەد جەعفەری نەجەفی بۆ پاڕانەوە ناردە لای شازادە و دیاریەکی زۆریشی بۆ نارد. بەوجۆرە ئاوڕەحمان پاشا دیسان چۆوە سلێمانی، لە بیستی ڕەمەزاندا لەسەرتەختی حوکمداریی دانیشتەوە. خالید پاشاش بەهەڵاتن ڕۆیشتە بەغدا.

ئاوڕەحمان پاشا دەستی بەدامەزراندنەوە کرد، لەولاوە حکوومەتی عوسمانی کەوتنە ئەندێشەوە و بۆ لابردنی ئاوڕەحمان پاشا تەقەلایان دا.

ساڵی ١٢٢٨ ئەسعەد پاشای کەهیا داوای یارمەتی لە ئاوڕەحمان پاشا کرد، بەیارمەتی ئەوان و عەشایری دەوروپشت لەگەڵ عەبدوڵلا پاشای وەزیری بەغدا شەڕیان کرد. عەبدوڵلا پاشا کوژرا و ئەسعەد پاشا بەوەزارەتی بەغدا تەعیین کرا.

لەو ساڵەدا جەلالەدین ئەفەندی بۆ تێکدانی نێوانی ئاوڕەحمان پاشا و حکوومەتی ئێران

له ئەستەمبوولەوە چووە تاران. لە پاش گەلێک گفتوگۆ قەرار لەسەر ئەمە درا ساڵێ دە هەزار تومان لە تەرەف ئاوڕەحمان پاشاوە بەحکوومەتی عوسمانی بدرێ، لە بری ماڵ و ئەسپابێکی لە شەڕ و تالانکردندا کەوتبووە دەست کوردەکان.

ئاوڕەحمان پاشا ئەوەی قبوڵ نەکرد و جوابی هەردوولای دانەوە. لەسەر ئەوە نێوانی کوردەکان و ئەسعەد پاشای وەزیری تازە تێکچوو؛ بەڵام بەتەدبیری هەمووان بەمە قەراریان دا کە ئاوڕەحمان پاشا نە هەواداری عوسمانی و نە لەگەڵ ئێران ڕابیتەی سڕبیان بمێنێت؛ ئاوڕەحمان پاشا ئازادبێ لەگەڵ هەر کامێکیانا ئیتفاق بکات بتوانێ، بەشەرتی موسالەمەت.

ئاوڕەحمان پاشا بەو موعاهەدەیە لە هەموو چتێک ئاسوودە بوو، لە فیتنەی ئەم و ئەو ڕزگاربوو، بەکەیف و شادی لەگەڵ حوکمداریی خەریک بوو.

لەو ساڵەدا حەزرەتی مەولانا خالیدی نەقشبەندی لە بەغدا دوو ساڵ بوو ئیرشادی دەکرد، لە مانگی زیلحیجەدا چووە سلێمانی.

ساڵی ١٢٣١ بۆداقخانی حاکمی موکریان چوو بۆوە سەر عەشیرەتی بلّباس شەڕی کردبوو، قەبیلەیەکی قورس لە بلّباس پەنایان بۆ ئاوڕەحمان پاشا برد. لە نزیک سووورداش و قەمچوغە دامەزراندران.

ساڵی ١٢٣٤ داود پاشای گورجی لەگەڵ ئەسعەد پاشا بەشەڕهات و داوای یارمەتی لە ئاوڕەحمان پاشا کرد و یاریدەی نەدرا.

ساڵی ١٢٣٤ ئاوڕەحمان پاشا بەئامرزشی خودا شادبوو. چوار کوڕی لە پاش بەجێما: سلێمان پاشا، مەحموود پاشا، عەزیز بەگ، عوسمان بەگ. هەر لە زەمانی خۆیدا مەحموود پاشای کرد بەجێنوشین.

## حوکمداری مەحموود پاشا (١٢٣٤ - ١٢٥٣)

مەحموود پاشا لە پاش بابی لەگەڵ ئێران بناغەی خۆشەویستیی دامەزراند و بەئوموری حوکمداریی خەریک بوو. دڵی چاک و خراپی ڕاگرت و عولەما و مەشایخی کردنە هەوادار.

لەو ساڵەدا مەولانا خالید چووە بەغدا و بوو بەسەبەبی نێوان خۆشیی مەحموود پاشا و داود پاشای وەزیری بەغدا. ئەگەرچی مەحەبەت و خۆشەویستییان دوو ساڵێک چاک بوو

بەڵام شکستەی ڕۆم لەلای وان و بتلیس و مووش و بایەزید و قارس و ئەردیش لە دەست حوسێن خانی کورد سەردار و ئەمیری وان، بوو بەمایەی فیتنە و هەڵمەتدانی شازادە محەمەد عەلی میرزا بۆ سەر مەحموود پاشا.

ساڵی ١٢٣٦ بەئیتیفاقی مەحموود پاشا کە قەراردرابوو محەمەد ئاغا کەهیا بەهەزار سوارە و پیادەوە بۆ یارمەتی چووە شارەزوور، لەولاوە مەحموود پاشا بەسێ هەزار پیاوی شەڕکەرەوە لە کەنار چۆمی سیروان گەیشتە کەهیا.

لەولاوە شازادە محەمەد عەلی میرزا بەپازدە هەزار لەشکرو دە تۆپەوە لە زیلحیجەدا لە کرماشان دەرکەوت.

حەسەن خانی والی فەیلی بە سێ هەزار شەڕکەرەوە گەیشتێ، لە نزیک خاکی شارەزوور لەشکربەز کرا.

مەحموود پاشا و محەمەد کەهیا لە یاسین تەپەدا سەنگەریان کرد و پازدە تۆپیان دابەست و ئامادەی شەڕبوون؛ ئەگەر چی مەحموود پاشا لەو شەڕە پەشیمان بوو، بەپەنهانی وەڵامی بۆ لای شازادە نارد؛ بەڵام کار لە کار ترازابوو.

ڕۆژی پازدەیی زیلحیجە هەردوولا بەتۆپ و تفەنگ شەڕیان کرد، لە هەردوولا گەلێک کوژرا. مەحموود پاشا شکا و ڕوو بەکەرکووک هەڵات و ماڵ و ئەسپابێکی بێ ژمار کەوتە دەست شازادەوە و بەبێ شەڕ چووە سلێمانی.

عەبدوڵڵا پاشای کوڕی سلێمان پاشای کوڕی ئیبراهیم پاشای بابان - کە لە پێشدا پەنای بۆ شازادە بردبوو - کرا بەحوکمداری بابان.

شازادە لە مانگی موحەڕەم لە سلێمانی بوو، لە مانگی سەفەردا ڕوو بەگرتنی بەغدا کەوتە ڕێگا، لە دەللو عەباس بوو شێخ موسای نەجەفی لە تەرەف داود پاشاوە ناردرا، لەبەر نەخۆشی لە پێ کەوتبوو و گەڕاوە کرمانشان و لە تاقی گەڕرا بەو نەخۆشییە مرد. لەو مانگەدا چاو قوڵکە و گرانەتا پەیدابوو؛ کوردستانی هیلاک کرد. مەحموود پاشا لە ترسی نەخۆشی لە کەرکووک ماوە و عەبدوڵڵا پاشاش لە سلێمانی دانیشت.

لە ئەواخیری ئەو ساڵەدا، شازادە حوسێن میرزا بۆ شارەزوور خستنە دەست، لەشکری بردە سەر محالی مەندەلی و زربات و پایەماڵی کرد و ڕوو بەشارەزوور گەڕاوە. عەبدوڵڵا پاشای بابان تەمای شەڕی هەبوو؛ بەڵام نەخۆشی تاعوون کەوتە لەشکری شازادەوە و زۆری کوژتن و بەناچاری چووەوە کرمانشان.

ساڵی ١٢٣٧ کە نەخۆشی تەواوبوو. ساغی کەوتە کوردستان، مەحموود پاشا لەشکری کۆکردەوە و تەمای چوونە سلێمانی کرد. لەوددەمەدا لەلای عەباس میرزای نایبوسەڵتەنەوە محەمەد حوسێن خانی ئێشیک ئاغاسی لە تەورێزەوە گەیشتە کەرکووک. قاقەزێکی بۆ مەحموود پاشا برد کە ئیتفاقیان لە نێواندا دامەزرێتەوە.

مەحموود پاشا لەگەڵیان پێکهات و عوسمان بەگی برابچووکی خۆی، لەگەڵ محەمەد حوسێن خانی نارده تەورێز و ئیتفاقنامەیان مۆرکرد و حکوومەتی ئێران بەحوکمداری مەحموود پاشا ئیقراری کرد و دوو فەوج سەربازی تەورێز و مەراغەی لەگەڵ ئیبراهیم خانی کوردی باکۆیدا سازکرد و بەخەڵات و دیاری و ئیتفاقنامەوە لەگەڵ عوسمان بەگی خستن و ناردنی.

عەبدوڵڵا پاشای کوڕی سلێمان پاشا کە لەوە ئاگاداربوو، قاقەزی لە داود پاشا نوویسی و ئیتفاقی لەگەڵ کرد. خەڵات و ئیتفاقنامەی بۆ چوو.

مەحموود پاشا عوسمان بەگی بەڕێکرد و چووە سەر کۆیێ و حەریر و هەولێر و لەشکری کۆکردەوە و ڕوو بەسلێمانی لە بزووتندا بوو. عوسمان بەگ و ئیبراهیم خانی گەیشتێ، لە نێوانی کۆیێ و سلێمانیدا خەڵاتی وەرگرت. عەبدوڵڵا پاشا کە ئەوەی زانیەوە، پەنای بۆ ئێران برد و سلێمانی بەردا.

داود پاشا لەولاوە لەشکرێکی لەژێر فەرماندەی محەمەد پاشای حاکمی کۆییدا نارده سەر هەولێر، ژن و منداڵی مەحموود پاشایان بۆ مووسڵ سوارکرد کە بیانباتە بەغدا. مەحموود پاشا لە سلێمانیەوە چووە سەر هەولێر و ژن و منداڵی برای لەوێ بوون، ڕزگاری کردن و شاری گرت و چووە سەر مووسڵ و دەورەی دا. ئەهالی مووسڵ دایک و ژن و منداڵیان داوە و گەڕاوە و چووە سەر کۆیێ و محەمەد پاشای دەورەدا و شەڕ و کوژتار گەرم بوو.

محەمەد پاشا پیاوانە بەرابەری کرد و چل و پێنج ڕۆژ شەڕ کرا. لە نەتیجەدا بەشەرتی محەمەد پاشا بەساغی ڕوو بەبەغدا ئیزن بدرێ، قەڵای بەدەستەوە دا و بۆ خۆشی چووە بەغدا.

مەحموود پاشا کۆیەی گرت و عوسمان پاشای برای لەسەر دانا. چارده تۆپیان لەو شەڕەدا دەستکەوتبوو لە کۆیەی بەجێ هێشت و چووە سلێمانی.

لەو ساڵە و لە مانگی زیلقیعدە مەحموود پاشا بۆ تازەکردنەوەی دۆستایەتی و مەرج

دانان چووه تەورێز و لەگەڵ نایبوسەڵتەنە عەباس میرزادا ڕێک کەوتن و لە ئەواخیری زیلحیجەدا گەڕاوە و لە سلێمانی دەستی بەحوکمداریی کردەوە.

لە ساڵی ١٢٣٨ داود پاشای وەزیری بەغدا شێخ مووسای نەجەفی ناردە تاران کە مەندەلی پێ بدرێتەوە و لە لایەکیشەوە لەشکرێکی لەژێر فەرماندەی مەسرەف ئەفەندیدا ناردە سەر مەندەلی.

مەهدیخانی کەلهوڕ کە لەسەر ئەو قەڵایە بوو، هاواری لە مەحموود پاشای بابان کرد کە فریای کەوێت. هەتا مەحموود پاشا وەخۆ کەوت، مەسرەف ئەفەندی مەندەلی گرت و مەهدیخانی بەدیل برد.

لە بیستی مانگی ڕەمەزاندا مەحموود پاشا گەیشتە مەندەلی و دەستی بەشەڕکرد. نزیک حەوت سەد ڕۆمی گرت و کوژتنی و قەڵای مەندەلیشی ئەستاندەوە. لەولاشەوە شازادە محەمەد حوسێن میرزا بە پێنج هەزار لەشکرەوە گەیشتێ. لە بیست و پێنجی شەوالدا واریدی مەندەلی بوو؛ بەیانی منەتداری بۆ مەحموود پاشا کرد.

داود پاشا ناچاربوو بەمامڵەت و بەتکای ئەم و ئەو مەندەلی پێدراوە و مەحموود پاشا بۆ سلێمانی و شازادەش بۆ کرمانشان گەڕانەوە.

لەبەر تەشویشاتی ئێران و عرووس و شەڕوشۆڕی ڕۆمی و عرووس، نە عەبدوڵڵا پاشای بابان پەرژا سەر ئەمە بێتەسەر شارەزوور، نە مەحموود پاشا لە جێگای خۆی بزووتەوە. عەبدوڵڵا پاشا لە کرمانشان دانیشت و مەحموود پاشاش بەئومووری حوکمداری ڕایدەبوارد.

ساڵی ١٢٤٥ لەبەر فیتنە و شەڕی نێوانی شازادە محەمەد میرزا کە ببوو بەحاکمی «نەهاوەند» و شازادە محەمەد تەقی میرزای حیسامو‌سەڵتەنە کە حاکمی لوڕستان بوو، پریشکی ئاوری فیتنەیان وەشارەزوور کەوت.

مەحموود پاشا هەرچەندە کۆشا، پێشی پێ نەگیرا. حیسامو‌سەڵتەنە لە عەشیرەتی کوردی باجەلان داوای یارمەتی کرد، ئەوانیش لەشکریان بۆ کۆکردەوە، بەڵام گەلێکی بەکوژت چوون.

جلدی یەکەمی مێژووی قاجاری لاپەڕە ٢٤٣ دەڵێت: شا موراد‌بەگ ناو، کە کوردێکی قەبیلەی ڕواندز بوو لەبەر ئازادی و ڕەشیدی خۆی بەسەر میری ڕواندزدا زاڵ ببوو. بەفەرمانی نایبوسەڵتەنە عەباس میرزای قاجارِ حکوومەتی کۆیێ و حەریری درابوویێ.

ساڵی س١٢٤٧ لە نێوانی کەرکووک و واندا سەرکێشیی دەستی پێکرد پەلاماری

مـحالی لاجان و سابلاغی موکری دا. له ئەواخیری زیلحیجەدا خوسرەوخانی والی سنەی چووە سەر. لە دەشتی لاجان خوسرەوخان شکا.

لەوە وا دەردەکـەوێت کـۆیێ و حـەریر مـوددەتێکی زۆربوو لە دەست باباندا نەمـابوو. خاسمە لەو ساڵەدا میر محەمەدبەگی حوکمداری ڕواندز بەلەشکرێکی قورسەوە لە دەورەی مـووسڵ شـەڕی دەکـرد و عـەشیـرەتی کوردی یەزیدی تەئدیب دەکـرد. (هەروەکـو لە جزمی سۆراندا لێی دەدوێین)

ساڵی کە فەتالی شای قاجاڕ مرد، شازادە مـحەمەد حوسێن میـرزا تەمـای سەربڵندیی هەبوو. عەبدوڵلا پاشای بابان لە کرمانشان بوو بەحوکمداری شارەزووری دانا و دووسەد و پەنجا سەرباز و چوار تۆپی لەگەڵ خست و ناردیە سەر سلێمانی، مەحموود پاشا بەبێ شەڕ ڕوو بەکـرمـانـشـان لە شـارەزوور دەرکـەوت و عـەبدوڵلا پاشاش چووە سلێـمـانی و دەسـتی بەحوکمداریی کرد و خاکی زەهاو و درنە کەوتە دەست شازادەوە.

لەو ساڵەدا و لە مـانگی ڕەمەزان، بەهرام میـرزا لە تەرەف پادشای تـازەی ئێران محـەمەد شـای قاجاڕەوە کرا بەحاکـمی کـرمـانـشـان و لە ڕێگای سابلاغ و سنەوە چووە کرمـانشـان. لەشکر کـوردی سنە لەژێر ئیدارەی مـیرزا هیـدایەتوڵلای کـوردسـتـانیدا ناردرا کـە سیـروان بگرێت. سلێمان خان بەلەشکری عەشیرەتی کوردی گۆرانەوە چووە سەر زەهاو.

نورودەهر میرزا کە لە تەرەف حیشمەتودەولەوە کرابوو بەحاکمی زەهاو، نەشیا بەرابەریی بکا و هەڵات. سلێمان خانی گۆران بوو بەحاکمی زەهاو.

مـحەمەدخانی سـەرتیـپ ئیرەوانی کە لەگـەڵ عـەبدوڵلا پاشـای بابان چووبووە شـارەزوور بەدووسەد و پەنجا سەرباز و چوار تۆپەکەیەوە چووە کن بەهرام مـیـرزا. کە بەهرام مـیـرزا گەیشـتـە کەنار سیـروان، عـەبدوڵلا پاشـای بابان بەچوار هەزار سوارەی بابانەوە چووەلای بەهرام مـیـرزا و ئیـتـفـاقی لە تەکدا کرد و فـەرمـانی حوکـمداری و موعـاهەدەی کـە لەگـەڵ محەمەد حوسێن میرزای هەبوو، تازەی کردەوە.

عـەبدوڵلا پاشا لە دوای چەندێک گەڕاوە شارەزوور و بەهرام مـیـرزاش ڕوو بەکـرمـانشـان ڕۆیشـت. لەو سـاڵەدا کـۆیێ و حـەریر و هەولێـر لە دەست بابان دەرچوو و کـەوتە دەست ئەمـیری مەنسـوور میر مـحـەمەد میری ڕواندز. عـەبدوڵلا پاشـا و سلێـمـان پاشا نەشـیـان بەرابەریی بکەن.

ساڵی ١٢٥٣ ڕانیە و قەمچوغـە کەوتە دەست مـیری ڕواندزەوە و سلێمان پاشا مرد و ئەحمەد پاشا لە جێگەیدا کرا بەحوکمدار.

شایەری بەناوبانگ «نالی» ئەم سوکواریەی لەوددەمەدا هەڵبەستووە و تەئریخی دانانی سلێمان پاشا و حوکمداریی ئەحمەد پاشایە:

تا فەلەک دەورەی نەدا سەد کەوکەبی ئاوانەبوو
کەوکەبی میهری موبارەک تەڵعەتی پەیدا نەبوو
تا نەگریا ئاسمان و تەم ولاتی دانەگرت
گوڵ چەمەن پەیدا نەبوو، هەم بۆی غونچە وانەبوو
تا چەمەن سەیرانە جەم ئەسڵی درەختی لانەدا
فەرعی تازە و جەزم و بەرزی و بڵندی بالا نەبوو
تا سلێمانان نەبوونە سەدری تەختی ئاخیرەت
ئەحمەدی موختاری ئێمە، شاهی تەخت ئارا نەبوو
گەر قیاسی کەی کە هەشت بێتو نەتیجەی بێتەجێ
حەمدولیللا شا کە عالی جابوو خالی جا نەبوو
شاهی جەم جا نالیا (تەئریخی جەم) (١٢٥٤) تەئریخیە
تا نەڵێن لەم عەسرەدا ئەسکەندەری جەم جا نەبوو

لەبەرئەمە سەنەدێکی شایستەمان لەوە دەست نەکەوتووە بزانین عەبدوڵلا پاشا چۆن بوو بەحوکمدار و سلێمان پاشا کەی حاکمی شارەزوور بوو، هەر هێندەمان توانی باسیان بکەین.

شێخ ڕەزای تاڵەبانی شاعیری غەڕای کوردی بەناوبانگ لە غەزەلێکی میللیدا دەڵێ:

لە بیرم دێ سلێمانی کە دارولمولکی بابان بوو
نە مەحکوومی عەجەم نە سوخرەکێشی ئالی عوسمان بوو

پێویست نییە تەواوی غەزەلەکە بیێژرێ؛ چونکە هەموو کوردێک لەبەریەتی و دەیزانێ، بەڵام هەر لەو غەزەلەدا وا ئاگادارمان دەکا کە عەبدوڵلا پاشا یەک دوو شەڕی لە دەوری بەغدادا کردووە و بەغداشی گرتووە، لە دووەمین شیعرەکەشیا دەڵێ:

کە عەبدوڵلا پاشا چوو لەشکری سنەی شڕکرد
ڕەزا ئەو ساڵە عومری پێنج و شەش تیفلی دەبستانی بوو

ئەو شەڕە لە جلدی دووەمی تەئریخی قاجاڕی لاپەڕە ٣٨٠ دا بەم جۆرە باس دەکا:

ساڵی ١٢٥٥ عەبدوڵلا پاشای حوکمداری شارەزوور بەلەشکری شارەزوورەوە چووە سەر زەوی کرمانشان و گەلێک خاکی گرتن و سووڕاوە سەر سنە. لەو چاغەدا ڕەزا قولیخانی

والی سنه له محەمەد شای قاجارِ حوکمداری تازەی ئێران کۆمەگی خواست. محەمەد شا وەڵامی دایێ کە لەشکری کوردستان و کرمانشان لەگەڵ مەحموود پاشای بابان هەڵگرێت و بچێتە سەر عەبدوڵلا پاشا و پەرێشانی کات و مەحموود پاشا بکاتە حوکمداری شارەزوور.

ڕەزا قولیخان و مەحموود پاشا لەشکر و موهیماتێکی زۆریان کۆکردەوە؛ هەشت تۆپ و جبەخانە و پێویستییان هەڵگرت و کەوتنە ڕێگا.

عەبدوڵلا پاشا کە ئەوەی زانیەوە لەشکرێکی شەڕکەر و زرنگ و ئازای ڕێکخست و چووە پێشیان. بەهەشت تۆپەوە پێشوازیکردن، بەجۆرێکی وا چوو کە هیچ کەس لێی ئاگادار نەبوو، زۆر بەلەز هەڵمەتی بردنێ و لەنێو دۆڵێکدا کەلێنی گرت هەتا گەیشتنە پێشی. لە ناکاو پەلاماری لەشکری والی سنەی دا و بەگوللە و تۆپ و تفەنگ ئاورباران کردن.

لەشکری والی باروبنە و جبەخانە و گەرانەیان هەموو بەجێهێشت و ڕوویان لە هەڵاتن کرد. مەحموود پاشا و والی و چەند سوارەیەک بەچەند فێڵێک خۆیان ڕزگار کرد، ماڵ و ئەسپاب و جبەخانە و دیلێکی زۆر کەوتە دەست عەبدوڵلا پاشا و بەشادمانی گەڕاوە سلێمانی.

ساڵی ١٢٥٩ ئەحمەد پاشای بابان لە شۆڕشی نێوان سۆران کەلێنی دەستکەوت و خاکی کۆیێ و ڕانیەی خستەوە ژێر فەرمانی حوکمداریان.

ساڵی هەزار و دووسەد و شێست و شەش ڕەسووڵ پاشای سۆران تەمای پەلاماردانی حاکمی بابانی هەبوو. ئەحمەد پاشا بۆ پێش بەفیتنەگرتن، پیاوانی زانای ناردە لای ڕەسووڵ پاشا، لە دوای گەلێک هاتوچوون نێوانیان چاک بوو و بناغەی دۆستیی و میهرەبانیان دامەزراند.

هەر لەو ساڵەدا زۆری پێ نەچوو ئەحمەد پاشا هێندێک عولەمای بۆ خوازگێنی «فاتمەخان»ی خوشکی ڕەسووڵ پاشا ناردە ڕواندز کە: بیدا بەحوسێن بەگی ئامۆزای ئەحمەد پاشا.

بۆ نێوان گرێدان و خزمایەتی، ڕەسووڵ پاشا خوشکی خۆی دایە حوسێن بەگ و بەدەبدەبەی شاهانە بووک گوێزرایەوە و لەو دوو توخمە پاکە مستەفا زیهنی پاشا و حەمدی بەگ دوو گەوهەری نادیدە پەیدابوون. حەمدی بەگ لە بەغدا بوو بەموفەتیشی عەدلیە.

ئەحمەد پاشا لەبەرئەو خزمایەتیە دەستی لە خاکی دێرە و حەریر بەردا و پێشکەش بەڕەسووڵ پاشای کرد. خزمایەتی و دۆستایەتی ئەو دوو بنەماڵە گەورەیە گەلێک ڕاگیراوبوو، هەتا ساڵانی هەزار و دووسەد و حەفتا دوو ئەحمەد پاشا حوکمدارییێکی ئازاد و سەربەخۆی کردووە و لەگەڵ سۆران موتەفیق بووە.

لەو ساڵەدا ڕەسووڵ پاشا کەوتە دەست ڕۆمیان و چووە بەغدا و ڕواندز و خاکی سۆران پێکوتی ڕۆمیان بوو.

ئەحمەد پاشا کەوتە ترسەوە و هەمیشە لە خۆکۆکردنەوە و جبەخانە و سوپا ڕێکخستن خەریک بوو.

ساڵی هەزار و دووسەد و حەفتا و چوار نەجیب پاشای والی بەغدا، بەئەمری عەبدولمەجیدخانی سوڵتانی عوسمانی، لەشکر و موهیماتی هەڵگرت و چووە سەر خاکی بابان. کەرکووک و هەولێری گرت و ڕوو بەشاری کۆیێ ڕۆیشت.

ئەحمەد پاشا بەسوپاهی کوردانەوە گەیشتە کۆیێ و قەڵا و شاری قایم کرد و بیست هەزار سوارە و پیادەو بیست دانە تۆپی پێبوو. لە هەموولایەکەوە سەنگەر و مەتەرێزی دروستکردن.

نەجیب پاشا کە نزیک کۆیێ بوو، لەشکری ئەحمەد پاشای چاوپێکەوت لە چوون پەشیمان بوو. ئالەتی فێڵ و دەسیسەی بەکاربرد کە هەمیشە بەوە کاریان بۆ چووبووە سەر. بەیان نامانی پڕ لە ئایەت و حەدیس و باس لە خەلیفە و دین و شەریعەت کردنی بەناو کوردەکاندا بڵاوکردەوە و چەند قاقەزێکی بۆ مەلا و شێخەکانی کۆیێ و نێو لەشکریان نوسی کە شەڕ لەگەڵ ئەمیرولمؤمنین جایز نییە و ئەوانیشی خەڵەتاند.

ئەوەڵ کەسێکی بەو ژەهرە گرفتاربوو بینباشی (بریندار ئاغا)ی سەردار سوپاهی ئەحمەد پاشابوو. عولەماکانی کۆیێش خەڵەتاندرابوون. بریندار ئاغا هەموو سوپاهەکەی کردە هاودەنگی خۆی کە لەگەڵ سوپاهی خەلیفەدا شەڕکردن کوفرە. قەراری دا سبەینێ بەبهانەی جیرە (معاش) خواستن سەرکێشیی بکەن و بچنە نێو عەسکەری ڕۆمیان.

سبەینێ زوو بریندار ئاغا دەچێتە لای عەزیز مەسرەفی بابان و داوای جیرە دەکا بۆ سوپاهی. مەسرەف دەچێتە لای ئەحمەد پاشا و سەربهوردی تێدەگەیێنێ و پێی دەڵێ کە بە بەیاننامەی ڕۆمییەکان خەڵەتاون و بهانەمان پێ دەگرن و بەچاکی پێش پێگرتن لە توندی چاترە. ئەحمەد پاشا بەتوندی و تیژی بەرابەریی کرد و ئەمری شەڕی دا کە سوپاهی

ڕێزبوون و شەیپووری شەڕ لێدرا، بریندار ئاغا و سەرکردەکان ئەمری تەسلیم بوونیان دا. بەجارێک شەش هەزار کەس پەڕینەوە و تەسلیم بوون.

جگە لە ئەحمەد پاشا و عەبدوڵڵا پاشا و مەحموود پاشا، لەگەڵ چەند سەرکردەیەک نەبێ ڕزگاربوون، هەر لەوێوە چوونە ئەستەمبووڵ و حکوومەتی بابانیش دوایی هات و خاکی شارەزوور کەوتە ژێر حوکمی ڕۆمیانەوە.

ئەحمەد پاشاش بەگەلێک وەزایفی وەکو والییەتی بەسەری بردوە و لە ئەستەمبووڵ دانیشتووە.

شێخ ڕەزا لە دوامینی غەزەلێکی مەشهوور بە «ڕۆژی یەکشەممە کە مەشهوورە بەڕۆژی ئازار» ئەم چەند شیعرەشی بەئەحمەد پاشا هەڵگوتووە کە لە ئەستەمبووڵ بوو:

ئەمە دوو ڕۆژە کە سەر گەشتە و حەیران دەگەڕێم
کێم هەیە غەیری وەلی نیعمەتی فەرخوندە شیعار
یەعنی هەم نامی نەبی حەزرەتی ئەحمەد پاشا
فەخری دین کانی کەرەم بەحری حەیا کۆهی ویقار
کەفی زەڕ بەخشی کەوا مەنبەعی دوڕ و گەوهەرە
وەکو بەحرێکە نە ساحیلی هەبێت و نە کەنار
تەبعی جەواد و کەریمی وەکو قائانی دەڵێت
«زەڕ بەقەنتار هەمی بەخشد» و وشتر بەقەنتار
تاوەکو دەورە بکات و بگەڕێ چەرخی فەلەک
تاوەکو دێت و دەچێ بێت و بچێ لەیل و نەهار
بەمورادی بگەڕێ شەمس و قەمەر چەرخی فەلەک
زەفەر و فەتحی قەرین بەختی مەعین تالیعی یار

شێخ ڕەزا دیسان لە قەسیدەیەکی فارسی لەدواییدا بەم چەند شیعرە مەدحی ئەحمەد پاشا دەکات:

بیدار «رضا» هرزه مگو زانکه بدآید
برطبع ولی نعمت فرخنده سیربر
احمد لقب آن حاتم جم جاه کە باشد
صد رتبه ز جمشید بەاصل و بەگوهربر

طهمورس و هوشنگ و کیومرز و سیامک
جمشید کند فخر برین چار پدر بر
نسبت نتوان کرد بدین جملەی معدود
آباء کرامش کە نیاید بەشمربر

## مەکتەب و خوێندن و علوومی عەسکەری و فەننی حەرب

ئوسوولی میللەتپەروەری و نیشتمانخواهی
بنچینە و دانانی فیکری ئازادی و ڕزگاربوون لە سلێمانی

ئەگەرچی لە کتێبی «مێژووی سلێمانی» کە تەئریخێکی دوورودرێژی شاری سلێمانییە لە ڕۆژی دامەزراندنیەوە هەتا ئەمڕۆکە، چلۆنی مەکتەب و میللەت هوشیارکردنەوە و خزمەت و هەموو سەربهورد و وەقایعانی بەتەواوی تێدا بێژراوە و بەم نزیکانەش پەرت ئەکرێت؛ بەڵام وام ئارەزوو کرد خوێندەوارە خۆشەویستەکانی ئەم کتێبە ئاگادارکەم لە «پەراو» (خزمەت) و هیمەت و حەمیەتی بنەماڵەیەکی گەورەی کورد کە بۆ کوردستان عموومی و بۆ سلێمانی بەتایبەتی نواندوویانە.

هەرچەند لەبەر چاوان بنەماڵەی بابان پووچ بۆوە، بەڵام لە سایەی غیرەتی بەکۆشەوەکان تۆوێکی وایان بەواسیتەی مەکتەب و خوێندنەوە چاند کە بیری میللەتیی و وەتەنخواهی و خەیاڵی ئازادی لە شاگردەکانی ئەو مەکتەبە هاتەڕوو، لە خاکی کوردستاندا لەنێو هەموو مێشکێکدا نەمام کرا و ڕواندرا.

هەروەکو لەپێشدا بێژرا ئەحمەد پاشا کە گەیشتە ئەستەمبووڵ چەند پیاوێکی گەورەی لەگەڵ چوو؛ یەکێک لەوانە سلێمان بەگی قەواس بوو.

ئەو پیاوە گەورەیە تێکۆشا کە لە سلێمانیدا مەکتەب بکرێتەوە و ئەحمەد پاشای بابانیش یارمەتی کرد. بەتەقەلا و کۆششی ئەو میللەتپەروەرەوە، ساڵی هەزار و دووسەد و هەشتا و پێنجی هیجری لە سلێمانی مەکتەبی ڕوشدیەی ملکیە بەچوار «صنف» (ڕیز) کراوە. منداڵانی کورد چوار ساڵ لەو مەکتەبە ئەیان خوێند؛ لە پاشان ئەچوونە بەغدا و دوو ساڵیش لە مەکتەبی ئەعدادی بەغدا تەحسیل ئەکرا و ئیکمالی سنفی موخەڕەج ئەبوون. ئەوجا دەناردرانە مەکتەبی ئەعدادی عەسکەریی ئەستەمبووڵ، دەست بەعلووم و فەن و ئوسووڵی عەسکەری ئەکرا و تێیدا دەکۆشرا. لەو مەکتەبە بەزابتی سوارە و پیادە و تۆپچی

و بیتری دەرئەچوون و ڕوتبەی گەورەیان دەست ئەکەوت.

لە سایەی ئەو مەکتەبە گەلێک پیاوی گەورە و ناودار و حەمیەتمەندی کوردان پێگەیاندران. لە ساڵی هەزار و سێ سەد و پازدەی هیجری سەعید پاشای ڕەئیسی شوورای دەوڵەت کە کوڕی سلێمان بەگی قەواس بوو، کۆشش و غیرەتی فەرموو مەکتەبێکی ڕوشدیەی عەسکەری بەچوار سنف لە سلێمانی کراوە. شاگردی ئەو مەکتەبە لە پاش چوار ساڵ دەڕۆیشتە بەغدا و سێ ساڵ دەیخوێند و لەسەر ئارەزووی یان بەزابتی پیادە و یا سوارە و یاخود تۆپچی دەرئەکەوت.

ئەگەر بیویستایە دەچوو بۆ ئەستەمبوڵ و ٣ سێ ساڵی تریش لە مەکتەبدا دەیخوێند و بەتەبیب یاخود بەبیتر دەرئەچوو.

شاگردەکانی کورد هەمیشە لە نمرەدا بەرزتر و لە شاگردەکانی نەکورد چاکتر و زرنگتربوون و زووتر سەرئەکەوتن. ئەهالی سلێمانی بەدە پازدە ساڵێک چاویان بەچاکە و خێری ئەو مەکتەبە کەوت زۆرچاک تێوەچوون بۆ بەرزی و پێشکەوتنی مەکتەب.

ساڵی هەزار و سێ سەد و بیست و پێنج ئەهالی سلێمانی بۆ مەکتەبی ڕوشدیەی عەسکەریی عالیە و لە مەکتەبی بەغدا چاکتر دەستیان بەموراجەعەت و تەقەلا دا. حکوومەتی عوسمانی بەناچاری ئارەزووی میللەتی بەجێهێنا و مەدرەسەیەکی زۆرچاک دامەزراندرا. ئەو مەکتەبە شاگردی زۆرچاکی پێگەیاند و بەشەهادەتنامەی ئەو مەکتەبە، شاگرد لە هەموو مەکتەبە عالیەکانی مەمالیکی سائیرەدا قبوڵ ئەکرا.

کوردەکان لە سایەی ئەو مەکتەبە چاکانەی سلێمانییەوە، زابتی عەسکەریی چاک و قوماندانانی ناودار و مودیر و قایمقام و موتەسەریفانی غەییور و مودیری ماڵ و موحاسیبیان لێ پێگەیاندرا. لە خاکی عوسمانیدا زیاترین سەردارە گەورەکانی ئۆردوو سەدری ئەعزەم و سەفیرەکانی تورک شاگردە کوردەکانی ئەو مەکتەبە بوون. گەلێک جێگای بڵند و زلیان دەسدەخست؛ چونکە زەکاوەت و قابیلیەت پێشی دەخستن. زرنگی و ئازاییان گرەوی پێ دەبردنەوە. موهیمترین وەزایفی حکوومەتی عوسمانی لەژێر دەستیاندا بوو، کاری زل و گەورەی حکوومەت بەشاگردە کوردە پێگەیشتووی ئەو مەکتەبە جێبەجێ دەکرا.

هەرچەندە حکوومەتی بابان نابووت و پووچ کراوە، بەڵام بەعیلم و مەعاریف و تەحسیل، کوردەکان زۆر ئیستفادەیان لە مەکتەبی سلێمانی کرد و ناوی بابانیان

بەچاکترین بیر ژیاندەوە و خاکی شارەزووریان کردە لانکی فنوون و زانستی.

فیکری میللەت و نیشتمانخواهی لەو شاگردە پێگەیشتووانە زیندووکراوە کە لە سلێمانی خوێندیان و چوون مەکتەبەکانی بەغدا و ئەستەمبوولیان دیت و بوونە مەئموور و گەڕانەوە سلێمانی.

ئەمڕۆکەش ئەوانەی لە تورکیا و عێراق و سوریا وەزیفەی گەورەیان لە دەستدایە، دەتوانم بڵێم ئەغلەبی ئەو شاگردە کوردانەن کە مەکتەبی سلێمانی پێگەیاندبوون.

بەیارمەتی خودا جزمی یەکەمی بەرگی سێیەم تەواوبوو، دەست بەجزمی دووەمی بەرگی سێیەم دەکەین کە باس لە حوکمدارانی سۆران ئەکا.

وێنەی جەنگاوەرێکی کورد
(حەوسەد ساڵ لەمە پێش)

## وەرگیراو - مأخذ

- شەرەفنامە. تەئریخی کوردان ، بەرگی یەک، فارسی، چاپکراو.
- تەئریخی نادر. بەرگی یەک، فارسی، چاپکراو.
- تەئریخی قاجارِیە. بەرگی یەک و دوو، فارسی، چاپکراو.
- تەئریخی نەعیە. بەرگی یەک، تورکی، چاپکراو.
- تەئریخی ابو الفاروق. بەرگی سێیەم و چوارەم و پێنجەم. تورکی چاپکراو.
- تەئریخی جەودەت. بەرگی سێیەم لە لاپەڕەی ١١٨-١٢٩.
- داود کتابی (طب) لە حاشیەی ئەو بەخەت و بەزبانی تورکی لە سالّی ١١١٠ -١٢٢٧ بەکورتی تەئریخی وەقایع و مردن و ژیانی حوکمدارەکانی بابان نوویسراوە، لە سلێمانی لە کتێبخانەی شێخ ڕەسوولّی پلاوخۆر ودرگیراوە.
- بەیازێکی خەت، بەدەستخەتی ئەحمەدبەگی زەنگنە لە سالّی هەزار و سەد و بیست و سێ وە هەتا سالّی هەزار و دووسەد و بیست و پێنج بەکورتی تەئریخچەیەکی بابان کە لە زەمانی خۆیدا بووە و بیستوویەتی، ئەو بەیازە ئێستا لەلای خۆمن.
- کۆنە بەیازێکی دەستخەتی مەلا ئیلیاسی شایەری سلێمان پاشای یەکەمی بابان و بەیازێکی دەستخەتی مەلا مستەفا شایەری خانک خان پاشای بابان لە لای خۆمن، باسی گەلێک وەقایعیان ئەکات و گەلێک شیعری تێدان و ئیستیناد بەشیعری نالی و شێخ ڕەزا و قسە و گوتەی هێندێک زانایان.

***

مێژووی

# کورد و نادر شاه

لە خاکی ئێرانا

کردەوەی

**خێوی زار کرمانجی حوسێن حوزنی موکریانی**

مزی چاپ بوخاوەندی کردەوەیە هەر دانەیک بە ٥٠ فلسە

رواندز لە مەزرکەی زار کرمانجی دامەزرا ١٩٣٤

پەرتی زار کرمانجی ١٩

میژوی

# کوردو نادرشاه

له خاکی ایرانا

*(*)*

کرده وه ی

خیوی زار کرمانجی

حسین حزني موکریاني

*(*)*

مزی چاپ بوخاوه ندی کرده وه یه

هه ردانه یك به ٥٠ فلسة

*(*)*

رواندز له مه زرکه ی زار کرمانجي دا مه زرا ١٩٣٤

به رتي زار کرمانجی ١٩

## پێشەکی

لەبەر ئەوە کە سەربھووردی نادر شا و پشتیوانی کورد لە تەکیا و کردەوە و ئەندێشەی ئەو لەتەک کورد و ڕەوشت و دەستووری کورد گوێزینەوەی لەم جێگا بۆ ئەو جێگا و هێنان و بردن و بزاوتنیان لە وڵاتی خۆیان بۆ خاکی بیانی، لە گەلێک کەس نادیار و لەبەرچاویان داپۆشراو و بزربووە، مێژوونوسێکی چاپلووس و قسە ڕێکخەری وەک میرزا مەهدی - کە تەئریخی نادری نویسیوەتەوە - لەبەر نێواخنی و پێیدا هەڵگوتن و قسە ڕێکخستن، ڕاستیەکەی گوم و سەرگوزەشتەکانی بەپەردەی ڕیایی داپۆشیوە، ژیان و کردەوەکانی نادر و کۆمەگیدەرەکان نادیار ماونەوە. جا بۆیێ تێکۆشام ئەم پەڕاوییە پچووکەی مێژووی کورد و نادر شا بخەمە ڕوو.

بۆ وەدەستخستنی مێژووی ڕاستەقینەکەی، جلدی دووەمی سەرجان مالکوم ئینگلیزی و ساکیسی ئینگلیزی و شەحنەی نادری و تەئریخی نادر و «ناسخ التواريخ»ی فارسی و تەئریخی جەودەت و «ابو الفاروق»ی تورکی و ئاساری دیکەم تەماشاکردن و ناچاربووم لە هەموولایەک بۆ وەدەستخستنی ڕاستیەکەی تەقەلا بدەم.

بەهیمەت و غیرەتی برادەرە خۆشەویستەکانم گەیشتمە دڵخواز و ئەم پەڕاوییەم نوبسیەوە و هێنامە ڕوو تاکو هەوەسدار و خاوەند ئارەزووەکانی کورد کە خۆشیان لە مێژوو خوێندنەوە دێت، ئاگادار بکرێن لەوەی کە: کورد بۆ نادر شا چۆن ببوون بەپشتوپەنا و ئەویش بەچ جۆرێک پاداشی دانەوە. ئەم چەند لاپەڕەیەم بەناوی «کورد و نادر شا» وە چاپ کرد.

پێشکەش بەزانا و تێگەیشتوو و مێژووناسی خاوەند هیممەت و هونەرمەند و گەورەی کوردەکان دەکەم. ئومێد وایە بەخوێندنەوەی دڵخۆش و بەلێوردبوونەوەی شادمان و بەهەوەسێکی جوانەوە پەسندی بفەرموون و چاو لە عەیب و کەچی و خوار و خێچی بپۆشن.

س. ح. حوزنی موکریانی

## ١- سەربەهووردێکی بچووکی نادر شا

بنەماڵەی نادر شا لە خاکی هەوشاری موکریدا کە نزیک «ساینقەلا»یە، پێگەیشتووە. لە چاخی پادشاهی شا ئیسماعیلی سەفەویدا ئەو بنەماڵە باریان کرد و چوونە خاکی خوراسان و لە «ئەبیوەرد» دامەزران، کە لە شیمالی شاری مەشهەدە. لەوێ کەوتنە نێو خێڵی کوردی «شادی»یەوە و چوونە «دەستجورد و دەرەجەز» دانیشتن.

نادر شا ساڵی ١١١٠ی ڕۆژی شەممەی ٢٨ی موحەرەم لە قەڵای دەستجورد و دەرەجەز لە دایک بووە. بەناوی باپیرییەوە ناونرا «نەدر قولی». لە پچووکییەوە هەتا تەمەنی ١٥ ساڵەگی، گەلێک کۆشەوەی لێ بیندرا کە وەک گەوران چووبێ، لە پاش ئەوە ڕۆژ بەڕۆژ گەورەیی و سەرداری و فەرمانڕەوایی لێ دیار دەکرا و هەرچیەکی بکردبایە ڕوو لە بەرزی و سەرکەوتن بوو.

میرزا مەهدیخان خاوەندی تەئریخی نادری لە لاپەڕە ١٦ی پەڕاوییەکەیا دەڵێت «لە دەمی جوانبەهاری و گوڵزاری زندەگانی و کامەرانیدا، بابا عەلی بەگی کۆسە ئەحمەد لوویی هەوشاری، هەمیشە لەگەڵ تورکمانان شەڕ و کوژتاری دەکرد. لەودەمەدا نادر شا کەوتە ڕیزەی پیاوانی شەڕکەرەوە و هەر کەسێکی خۆشی نەویستبا پووچی دەکردەوە. لە پاشان کچی بابا عەلی بەگی مارە کرد و کوڕێکی لەو بوو و مرد. کچی دووەمینی مارە کرد، دوو کوڕێ لێ بوو».

نادر شا لە سایەی غیرەت و کۆششی کوردەکانی دەرەجز و کەلات و تورکمانی ئەو جێگایانە، بەسەر گەلێک ئیل و خێڵی ئەو خاکەدا زاڵبوو؛ لەوەوە هەوای کیشوەرگیریی و بڵندبوونی کەوتە مێشکەوە.

میرزا مەهدی لە تەئریخەکەیا ئەو سەرکەوتنەی نادر شا بەمجۆرە دەنویسێت و دەڵێت: «چونکە چاویان پێکەوت و دیتیان کە ساقی چەرخی مینایی لە ساغەری مانگ و ڕۆژدا خوێناوی خەم دەڕژێنێتە نێو جامی ئێرانەوە، حەریفی توونگی تورفەی زەمانە لەبەر مەستی خۆی کاسەی لەسەری حەریفاندا دەشکاند، جەردە و ڕێگەی فیتنەخوازی دەهر، دەستی تەتاولی درێژ کردبوو و ڕێگای ئاسوودەگی لە دوور و نزیکان بەستبوو، ئەوەش لە هیممەت و غیرەتی نادر شا نەدەوەشاوە.

بەئیلهامی خودای بێ نیاز و بەربەری بەخت و چارەی فەرخوندەیی و بەیارمەتی و عەزم بڵندی و هیممەتی ئەرجومەندی تەوایفی ئەکراد و دانیشتووی دەرەجز و کەلات، ئەو خاکانەی هێنایە ژێردەست و لەگەڵ خۆیا ڕامیکردن».

میرزا مەهدی زۆر درێژ لەوانە دواوە و دەڵێت: دوو تایفە بوونە مایەی گەورەبوونی نادر شا، یەکەمیان کوردەکانی دەرەجز و ئەبیوەرد، کە گەورەترینی عەشایری خوراسانن؛ دووەم هەوشاری.

## ٢- کوردی چەمشکەزەک و شاھ تەهماسبی سەفەوی و محەمەد حوسێن بەگی کوڕی سام بەگ

مەلیک مەحموود هاواری لە کوردەکانی چەمشکەزەک کرد کە بۆ بەرابەری نادر شا یارمەتی بکەن. کوردەکان لەولاوە گوتیان ئێمە گۆشەگیرین و تێکەڵ بەشەڕوشۆڕ نابین.

مەلیک مەحموود لە ڕەشیدی و ئازایی ئەو کوردانەی کە لە قەڵا و شاخ و کێوەکانی خوراسانا بوون، گەلێک دەترسا؛ لە خۆشیڕا نەدەدی کە بڕواتە سەریان. بەڵام ٦٠٠٠ شەش هەزار پیاوانی شەڕکەری هەڵگرت و لە ڕێگای «ڕادەگان»ەوە ڕوو بەخەبوشان چوو. کوردەکان پیاوێکی ئیلچییان ناردە لای و پێیان گوت کە بزووتنەوەیەکی وا دەبێتە مایەی سەرکێشی و دڵگیریی کوردەکان و شەڕ و کوژتار و خوێنرێژی پەیدا دەبێ و شۆڕش و تێکچووین دەکەوێتە نێوانێ. واچاکە بەبێ شەڕ بگەڕێتەوە.

مەلیک مەحموود ناردراوەکەی کوردەکانی گرت و گوێ و کەپووی بڕی و بۆ کوردەکانی ناردەوە. ئەو ئیشەی مەلیک مەحموود بوو بەمایە و هەوێنی شەڕ و کوژتار لە خاکی خوراسانا.

هەموو کوردی ئەو خاکە جەمیان و کۆبوونەوە و هەرچییێکی پێویستی شەڕبوو ڕێکیان خست و ئامادەی جەنگ و کوژتار بوون و هەڵمەتیان بردە سەر مەلیک مەحموود. لە پاش گەلێک خوێنڕێژی و کوژتار، مەلیک مەحموود سەرکەوت و کوردەکان ڕوو بەچیا و کێوە بەرزەکانی خاکی خۆیان هەڵاتن.

مەلیک مەحموود بەبێ ئەزیەت شاری خەبوشانی گرت و بۆچوونە سەر قەڵا و ئاواییەکانی دەرەوەش ئامادەیی کرد. بەهەوای ئەوە کە هەموو کوردی ئەو خاکە بگرێت و بیانێرێتە «مەشهەد». لەشکری هەڵگرت و چووە سەر قەڵای «زێڕان» کە دوو فرسەنگ لە خەبوشان دوورە. بەرقەوە دەورەی دا و وەتەنگی هێنا.

کوردەکان داوای کۆمەگییان لە نادر شا کرد. لەولاوە نادر شا گەیشتە پێش و لە بار و جەبەخانەی مەلیک مەحموودی دا و هەمووی تاڵان کرد و گەلێکی لێ کوژتن. کوردەکانی

زێران لە قەڵا دەرکەوتن و هەڵمەتیان بردە سەر لەشکری مەلیک مەحموود و تەنگیان پێهەڵچنی و لە جێگای خۆی هەڵقەندرا. زۆر بەشپرزەیی لە سەنگەرێکی زۆر دوور لە مەیدانی شەڕا خۆی گرتەوە و کەوتە سوپەرەوە و مەتەرێزی گرت. لەوەدەمەشا نادر شا گەیشتە پێش، ئەو ڕۆژە هەتا ئێوارە کورد و نادر شا کوژتاریان لە مەلیک مەحموود کرد. کە شەو بەسەرداهات مەلیک مەحموود گرانەبار و جەبەخانە و خێوەت و خەرگای بەجێهێشت و بەچەند کەسێکی لە دەستیا مابوو، لە تاریکی شەوا گریبانی لە مردن ڕزگار کرد.

لەولاوە محەمەد حوسێنخانی چەمشکەزەک لینگی دایە سەر سەعید سوڵتانی تورکمان و شکاندی و گەلێک تالانی لێگرت و سەعید سوڵتان هەڵات و پەنای بۆ نادر شا برد.

لەوەدەمەدا ڕەزا قولیخان ناو سەردار سوپاهێک لە لایەن شا تەهماسبی سەفەوییەوە ناردرایە خەبوشان. شا تەهماسب کە گەیشتە خاکی خوراسان، تێگەیشتبوو کە کوردەکان لە تەک نادرا تێکەڵن و یارمەتی دەکەن. ڕەزا قولیخانی ناردە کن کوردەکان کە لەوە دەست بەردەن و لەگەڵ شا تەهماسبدا ڕێککەون.

ڕەزا قولیخان کە گەیشتە خەبوشان قسەکانی شای بەگەورەکانی کورد گوت و چاوڕاوی دەست پێکردن. «شاوێردی بەگ»ی کوردی شێخوان کەوتە ئەندێشەی ئەوەوە و دڵی نەرم بوو کە لەگەڵ شا ڕێک کەوێت. لەسەر ئەوە قاقەزێکی بۆ نادر شا نارد کە دەست لە دەورەدانی مەشهەد بەردات؛ چونکە لەوەدەمەی کە مەلیک مەحموود لە دەست کوردا شکا و هەڵات و ڕوو بەمەشهەد ڕۆیی، کورد و نادر شا دەستیان لێ بەرنەدا و هەتا بردیان لە مەشهەدیان پەستاوت و لەنێو شارا وەتەنگیان هێنا.

نادر شا کە ئەو نوسراوەی پێگەیشت دەستی لە شەڕ بەردا و کشاوە و چاوەنۆڕی کرد. لەولاوە ڕەزا قولیخان لەشکرێکی لە کوردەکان کۆکردەوە و لەگەڵ گەورەکانی کوردا ڕوو بەمەشهەد لە خەبوشان دەرکەوت کە گەیشتنە پێش، خەڵکی مەشهەد دەروازەی شاریان بۆ کردەوە کە بڕواتە نێو شارەوە.

مەلیک مەحموود زۆرچاک ڕەزا قولیخانی دەناسی و لە ڕەوشتی ئاگاداربوو. بەدەستە لەشکرێکەوە لە مەشهەد بەدەرکەوت و لە کەلێنا دانیشت، هەرکە ڕەزا نزیک بووەوە مەلیک مەحموود خۆی گەیاندەوە نێو شار و گرتیەوە و تێیدا دانیشتەوە.

نادر شاش لەنێو فرسەنگێکی شار، لەشکربەزی کردبوو. لە کردەوەی خەڵک و مەلیک

مەحموود و ڕەزا وردبووەوە، گۆشەگیر دانیشت و لە ڕقان دەنگی نەکرد. کە لە دوامینی ئیش تێگەیشت ڕوو بەئەبیوەرد جلەوی سووڕاند و گەڕاوە. ڕەزا قولی خان کە لە شەڕکردن بێدەست و تەوانای بەرامبەری نەبوو، بەر بەخەبوشان ڕۆیشتەوە.

ڕەزا قولی خان ٣ مانگ لە خەبوشانا دانیشت و لەگەڵ لەشکر کۆکردنەوە خەریک بوو. لە پاشان دیسان هەوای کەوتە سەر کە بڕواتە سەر مەشهەد. کوردەکانی هەڵگرت و کەوتە ڕێگا. مەلیک مەحموود بۆی دەرکەوت و بەشەڕ و کوژتار شکاندی و بەشپرزەیی ڕوو بەخەبوشان ڕفاندی.

سمەلیک مەحموود بەو سەرکەوتنە هەوای لێ پەیدابوو، گرتنی خاکی دیکەی کەوتە کەللەوە. مەلیک ئیسحاقی برازای خۆی نارده سەر کوردەکانی بەیات و بۆ خۆشی گرتنی (نیشاپوور)ی خستەپێش.

کوردەکانی نەیشاپوور داوای یارمەتییان لە کوردەکانی کەلات کرد. ئەوانیش لە کوردی ئەبیوەردو دەرەجز و خەبوشان، کۆمەڵەیەکی چاکیان کۆکردنەوە و بەلەز لینگیان دا سەر مەلیک ئیسحاق و بەکەم شەڕێک گەلێکیان لێ کوژت و پەرشوبڵاویان کرد.

مەلیک ئیسحاق کە لە دەست کوردەکانا وەتەنگهێنرا و هەڵات چووە نێو باخێکەوە کە دەورەی دیوار بوو. لەوێدا خۆی قایم کرد. کوردەکان دەورەیان گرت.

ئەو سەربهوردە کە بەمەلیک مەحموود ڕاگەیاندرا، بەلەز لە مەشهەد دەرکەوت کە بگاتە برازای. کوردەکان و نادر شا چوون پێشیان پێگرت. لەشکری کورد و مەلیک مەحموود شیری خوێنرێژیان تێکنا و تەنگەیان بەمەلیک مەحموود هەڵچنی و سووڕاندیان، بەڵام لەو شەڕەدا کورد زۆریان لێ کوژران و بریندارکران و ئیبراهیم خانی برای نادر شاش بریندار بوو. کورد لەبەر بێباکی و ڕەشیدی و هەڵمەتبردن دەکوژران. هەوای تاڵانکردن و گەڕانەوە. کوردی لە دوامینا بڵاوکرد.

میرزا مەهدی لە تەئریخەکەیا لە لاپەڕە ٢٧ دەڵێت: «چونکە کوردەکان سەرکردەیەکی کامڵ ڕایان نەبوو، بەتاڵان و ئەسپابێکی کەوتبووە دەستیان، سەربەخۆ ڕێگای جێگای خۆیان گرتە پێش و ڕۆیشتن».

مەلیک مەحموود لەوە کەلێنی دەستخست و سەرکەوت و چووە سەر نەیشاپوور و دەورەی دا. خەڵکەکە بەماملەت شاریان بەدەستەوەدا، فەتح عەلیخانی بەیات لە لایەن مەلیک مەحموودەوە کرا بەحاکمی نەیشاپوور؛ هەروەکو لەوە پێشیش هەر حاکم بوو. لە

دوای دامەزراندنەوەی ئەو خاکە مەلیک مەحموود گەڕایەوە مەشھەد. لە ڕێگادا لەگەڵ نادر شا بەشەڕ هات.

مەلیک ئیسحاق لە دوای سەرکەوتنی مامی، بەلەشکرەوە چووە سەر خاکی «بوقمیج». خەڵکەکەی هاواریان لە نادر شا کرد و ئەویش لەگەڵ دەستە لەشکرێکی کورد، چووە سەر مەلیک ئیسحاق.

مەلیک مەحموود کە لەوە ئاگاداربوو، چوو پێشی بەنادر شا گرت و لە دوای شەڕ و کوژتار دووسەد کەسی کورد لە لەشکری نادر شا کوژرا و هی ماوی هەڵاتن. نادر شا بەدوو پیاویەوە لە مەیدانی مەرگ خۆی لە دەست مەلیک مەحموود ڕزگارکرد و ڕوو بەکەلات هەڵات. مەلیک مەحموود بەوە دڵڕەق و هەوادار بوو، ڕوو بەخەبوشان ئاژووتی و بەزۆر خەبوشانی گرت.

لە هەموو لایەکەوە کورد کۆبوونەوە و نادر شایان پێش خۆیان دا و چوونە سەر مەلیک مەحموود و لە خەبوشانیان دەرپەڕاند و شکاندیان. لەو شۆڕش و کوژتارەدا شا تەهماسب لە هیچی نەبوو محەمەدخانی تورکمانی کردە سەرداری خوراسان و ناردیە پێشەوە. فەتح عەلیخانی بەیات لەگەڵ مەلیک مەحموود دڵگیر بوو و لەژێر فەرمانی دەرکەوت؛ ئەویش چووە سەری و کوژتی و مەلیک ئیسحاقی کردە حاکم و ئومووری بۆ دامەزراند.

نادر شا دەستە لەشکرێکی ڕێککەوتووی هەڵگرت و چووە سەر مەشهەد. «پیر محەمەد» ناو کە لە لایەن مەلیک مەحموودەوە کرابوو بەحاکم بەلەشکرەوە بۆ نادر شا دەرکەوت. لە دوای کوژتار و خوێنڕژتنێکی قورس پیر محەمەد تەنگەتاو کرا و شکاندرا و ڕوو بەمەشهەد ئاژۆترا. نادر شا بەو هێزەی کە هەیبوو ڕوو بەمەشهەد چوو. مەلیک مەحموود لە «کوهی سەنگین» پێشی پێگرت و لەولاوە مەلیک ئیسحاقیش لە نیشاپوورەوە چووە کۆمەگی مامی. نادر شا بەلەشکرێکی خوێنڕێژی کوردەوە لینگیدایە سەریان، مەلیک مەحموودیان تێکەوەپێچا و شکاندیان و تۆپ و جەبەخانە و هەموو خەرگا و بار و بارخانەی کەوتە دەست کوردەکان.

مەلیک مەحموود بەشپرزەیی هەڵات و چووە نێو کەلاوە. مەلیک مەحموود شۆڕشێکی خستبووە نێو تورکمانی ئەو خاکەوە و هەموو بێزار ببوون، ناردی داوای کۆمەگی لێکردن. نادر شا کە لەوە ئاگادار بوو، چووە سەر تورکمانەکانی «نەساو» و هەمووی سەر نەرم کردن و لەشکرێکی لێگرتن و گەڕایەوە سەر مەلیک مەحموود و کەلای مەشهەدی دەورەدا.

مەلیک مەحموود بۆی دەرکەوت، نادر شا بەفێڵ هەڵات لە شار دوورکەوتەوە، لەپڕێکا بۆی گەڕاوە و مەلیک مەحموودی شکاند و کوژتاری لێ کرد و هەتا لە شاری مەشهەدی پەستاوتەوە و ڕفاندی.

## ٣- کوردی چەمشکە زەک و شاە تەهماسبی سەفەوی

شاە تەهماسب لە ئاوربایگانەوە روو بەخوراسان لەشکری ئاژووت. مەلیک مەحموود بۆ کاری سەڵتەنەت پێک جێکردن، چووە پێشی و لە مەشهەد دەرکەوت؛ هەتا «ئەسفەراین» بەرکێف کوت ڕۆیشت.

لەوددەمەدا شاە تەهماسب لە (بەستام)دا بەزیبوو، کە لەوە ئاگادار بوو، بەلەز فەتحعەلی خانی قاجارِ کە سپەهدار بوو، ناردیە ناو کوردەکانی جەمشکە زەک کە کۆمەگی بکەن. کوردی دڵپاک کە هەر کەسێک پەنایان بۆ ببا پشتیوانی دەکەن و یارمەتی کەوتوو و بێ دەستیان لەکن سەرفرازی و پیاوەتییە، لەسەر ئەوە هەموو کورد کۆبوونەوە.

نەجفعەلی بەگی کوردی شادی، جەعفەر قولی بەگی کوردی شادی، شاوێردی بەگی کوردی شیخوان، محەمەد حوسێن بەگی کوردی سام بەگی چەمشکەزەک و گەورە و سەرهات و کاربەدەستەکانی کوردی زەعفەران و قەرەچور، کۆمەڵەیان بەست؛ بەلەشکرەوە چوونە کۆمەگی شا تەهماسب. مەلیک مەحموود کە لەوە ئاگادار بوو، بەناچار ڕووبە مەشهەد گەڕاوە.

کوردەکان بەکەیف و خۆشی و نەوازش، پادشاهی گەڕۆک و حوکمداری بێ جێ و ڕێ و سوڵتان بێ تەخت و تاج و بێ پایتەخت و بێ سوپاە و بێ هێزی سەفەوییان بردە خەبوشان، دەست بەسینە لە پێشی ڕاوەستان و کەمەری خزمەتیان بۆ گرێدا.

فەتح عەلیخانی قاجارِ کە وردبۆوە ڕۆژ بەرۆژ کورد لە دەوروپشتی شا تەهماسب کۆدەبنەوە، زۆری لێ گران دەهات و بۆ بەرەی کاری خۆی ئەوەی بەچاکە بەراورد نەدەکردەوە و دوامینی بۆ خۆی بەپیس دەزانی کەوتە ئەندێشە و دەسیسەوە کە بەفێڵ و خراپی نێوانی کوردەکان و شا تەهماسب تێکدات و کوردەکان لەبەریەک بڵاوکاتەوە؛ تووی نەیاری و دڕکی دوژمنایەتییان بخاتە نێوانەوە تاکو هەریەک بۆ لایەک بڵاوەیان تێکەێت و ئەوەی لە دڵی خۆیدایە، بەجێ بێنێت و لە ئیش و کاری حوکمڕانیدا دەستدرێژ بێت. ئەویش لەبەرئەوە بوو کە پیاوی وریا و ئیشگوزار و ئازا لەنێو کوردەکانا هەبوو، دەترسا کە ڕەشتەی کار لە دەست فەتح عەلیخان دەرخرێت.

فەتح عەلیخان بۆ گەیشتنە ئارەزووی خۆی کە بلاوی کورد بێت ئەم شۆڕشەی بەرپا کرد: نەجەف عەلی بەگی کوردی شادی کە سەردارێکی ناوداری کوردان بوو کردیە مەئموور کە لەشکرێکی گرانی کورد هەلگرێت و بڕواتە سەر مەشهەد و بیگرێت و ئوموورى تێدا دامەزرێنێت؛ هەتا شا تەهماسب دەگاتە پێشەوە.

ئەوەش لە تێگەیشتن و زانین دوور بوو کە پیاوێکی ئازای وەکو مەلیک مەحموود بەهەموو جەبەخانە و لەشکریەوە لە مەشهەد بێت و نەجەف عەلیخان بڕوات بیگرێت و پیاوێکی وا گەورە بشکێنێت. لەوەدا مەبەسی فەتح عەلیخان ئەوەبوو کە ڕقی شا تەهماسب هەستێنێ و نەجەف عەلی بەگ ڕەخنەدار کات، ئەوەی بۆ کردە بەهانە.

نەجەف عەلی بەگ سەری ئیعتزاری بەرداوە و گوتی: ئەوە کارێک نییە لە دەست من بێت، چونکە دوژمنی نێو قەلا لە ئێمە بەهێزترە.

شا تەهماسب لە فروفێلی فەتح عەلیخان ئاگادار ببوو کە مەبەسی تێکدانی ئەو هێزەیە، بەلام لە دوامینا دەسیسەی فەتح عەلیخان کاریگەر بوو، شا تەهماسبی فریو دا و بۆ گەیشتنە دلخوازی خۆی کە تێکدانی ئەو هێزە و تەفروتوونای کوردەکان بوو، نەجەف عەلی بەگیان بەخاین دانا و شای گەڕۆک ئەو پیاوە گەورە کوردەی کوژت.

میرزا مەهدی لە تەئریخی نادر لاپەڕە ٣٣یدا بەمجۆرە ئاشکرای کردووە و دەلێت: «نەجەف عەلی بەگی شادی کە سەری ئیعتزاری هێنا پێش، شا تەهماسب بەتیغی تەدبیری فەتح عەلیخان لە گەردەنی دا».

کوردەکان بەوە کەوتنە شۆڕش و پشێوییەوە و هەموو کۆبوونەوە و دیوانیان گرت و قەراریان دا و بەکۆمەلە ڕۆیین دیواریان کونکرد و ڕۆیینە سەر «یام تەپە» کە فرسەنگێک لە خەبوشان دوورە جەمیان و چەند کەسێکیان نارده کن نەدر قولی (نادر شا) کە بڕواتە نێویان. بەوە هەموو کوردی خوراسان و لەشکری ئوستراباد پەشێو بوو و دەستیان بەتالان و کوژتاری دەستە و دایەرەی شا تەهماسب کرد.

نادر شا لە «میاپ» بوو کە گەورەکانی کوردی گەیشتن و هەردوولا پێکەوە گرێی یەکەتییان بەست، نادر و کوردەکان بۆ یەکتریان سوێندخوارد و پەیمانیان بەست و کچی سام بەگی سەردار و وەکیلی هەموو کوردەکانی چەمشکەزەکیان بۆ نادر شا نامزەد کرد و بوو بەدەزگیرانی. دووبارە دەستی دۆستی و خزمایەتییان دا بەیەک و گووشیان.

لە دوای ئەوە نادر شا و چەند کەسێک سواربوون و کەوتنە ڕێگا و وەلامیان دا

بەمحەمەد حوسێن بەگی کوڕی سام بەگ و بەشاوێردی بەگی شێخوان کە دەست لە شۆڕش و کوژتار بەردەن هەتا نادر شا دەگاتێ. «موعیرولمەمالیک»ی نارده کن شا تەهماسب و فەتح عەلیخان کە پێیان بڵێت ئەو جۆره بزووتنەوەیە شایستەی شانی ئەوان نییە و لەودەم و چاخەدا چتێکی وێنەچووه دەیکەن؛ واچاکە خۆڕاگرن و کەلێن لە دەست نەدەن هەتاکو نادر شا و کوردەکان دەچنە لایان.

ئەگەرچی فەتح عەلیخان ئەو شۆڕش و تێکدانەی بۆ پایەداری و دامەزراندنی ئارەزوو و دڵخوازی خۆی بەرپا کرد، بەڵام بەر ئاوەژوو ڕوویدا و پەرایییەک بوو بۆ نادر شای کرد و خۆی تێدا چوواند، هەروەکو دێنە گوتن و لێی دەدوێین.

کە وەڵامیان بۆ ناردن، سبەینە کوردەکان و نادر شا پێکەوە ڕوو بەخەبوشان کەوتنە ڕێگا و ڕۆیینە نێو شارەوه و چاویان بەشا تەهماسب کەوت و تێیان گەیاند و ڕێککەوتن و ئاوری شۆڕش کوژاندرایەوه.

محەمەد حوسێن بەگ کوڕی سام بەگ کرا بەحاکمی خەبوشان و ناویان نا محەمەد حوسێن خان. بەوجۆره کاروبار ڕووی لە چاکی کرد.

ساڵی ۱۱۳۵ و ۲۲ مانگی موحەڕەم لە خەبوشان دەست بەدامەزراندنی حکوومەتی سەفەوی کرا. نادر شایان ناونا تەهماسب قولی. بۆ ڕۆیینە سەر مەشهەد لەشکر کۆکرایەوه، چونکە ئەوه بەئارەزووی کوردەکان بوو، هەموویان بۆ تەهماسب بوونە سوپا و بەچەک و ماڵی خۆیانەوه چوونە سەر مەلیک مەحموودی سیستانی و دەورەی مەشهەدیان دا و مەلیک مەحموودیان تەنگەتاو کرد و لە هەموو لایێکەوه تێی ڕوو هاتن.

فەتح عەلیخانی قاجاڕ لەو یێکەتی و دەست پێکگرتنەی کورد و شا تەهماسب و نادر شا دڵگیر بوو، مەیدانی فڕوفێڵی پێ تەنگ ببوو و بەبەهانەی چوونە بەستام و لەشکر کۆکردنەوه و هێز وەدەستخستن تەمای دەرچوونی هەبوو. بەڵام کوردەکان لە ماکیانا هەستی تۆڵە کە ڕیشەگیر و چەسپاوه، ئەو کەلێنەیان لە دەست نەدا و بەلەزیان کرد و داو و تەڵەیەکی وایان دامەزراند کە فەتح عەلیخان و ئەو قاجاڕانەی کە لە تەکیا بوون، گیران و خرانە بن زنجیر و پاڵەهەن و فەرنقەوه. کوردەکان بەپەنهانی فەتح عەلیخانیان کوژت و کەللەسەریان بردە بەردەمی شاه تەهماسب.

لە پاش ئەوه هەموو ئومووری حکوومەت و لەشکر و سوپاداری و ڕەعیەت خرایە ژێر چاوەدێری نادر شاوه، کەلب عەلی بەگی کوڕی بابا عەلی بەگ بوو بە«ئێشیک ئاقاسی

دیوانی». شاوێردی بەگی شێخوان کرا بەحاکمی سەبزەوار و «تفەنگچی باشی». لە دوای ئەوە بەزۆری بازووی کوردەکان شاری مەشهەد گیرا و مەلیک مەحموود ناچار بوو پەنا بۆ مەرقەدی ئیمام ڕەزا ببا. کە مەلیک مەحموود چووە سەر مەرقەد و پەنای برد و لە حوجرەیەکدا گۆشەگیر دانیشت، هەموو پێویستی حوکمداری و فەرمانڕەوایی کەوتە دەست کوردەکان و لە دواییدا ئەوانیش ئەو دەستڕۆیشتن و بەرزبوونەوەیان دا بەنادر شا و کردیانە گەورە و سەرداری خۆیان. نادر شا لە پاش ئەوە ناردی ماڵ و منداڵەکەی لە ئەبیوەردەوە بردە مەشهەد و لەوێ بناغەی دامەزراند و شازادە ڕەزا قولی میرزای کوڕی خۆی کردە فەرمانڕەوای «سەرحەدات».

کە شاری مەشهەد گیرا و دامەزراندرا، شا تەهماسبیش چووە خەبوشان و داوای ئەو کچەی کرد کە درابوو بەنادر شا و دەزگیرانی بوو. کوردەکان کەوتنە ئەندێشە و فیکری ئەوەوە ئاوری شۆڕش هەڵنایسێتەوە. لەوەدەمەشدا، کە نادر شا ماڵ و منداڵی بردە مەشهەد، قاقەزێکیشی نوبسی کە دەزگیرانی خۆی دەگوێزێتەوە. کوردەکان بۆ ئەوەی پێش بەو فیتنەیە بگیرێت ئەوەیان بەنهانی بەخێوکرد و ناردنی کچەکەیان بۆ خستە پاشان. بۆ ئەو تەدبیرە هەموو گەورە و ناودارەکانی کورد لە خەبوشان گردبوونەوە و شاوێردی بەگی شێخوانیان خواستە خەبوشان کە پێش بەو کارە بگرن.

لەوەدەمەدا نادر شا قاقەزێکی بۆ محەمەد حوسێنخانی کوردی چەمشکەزەک نوبسی کە ئەو کارە بەتیغ نەبێ نابڕەوە. نادر شا لە دوای ئەو قاقەزە بەلەشکرەوە لە مەشهەد دەرکەوت و ڕوو بەخەبوشان ئاژۆتی.

محەمەد حوسێنخان ناچار قاقەزەکەی نادر شای نیشان بەتەهماسب دا. ئەویش لە شەوا هەموو چەک و پێویستی و لەشکر و خەزێنەی بەجێهێشت و بەپەنهانی تەنها سوارە خۆی گەیاندە خەبوشان و پەنای بۆ کوردەکان برد و هاواری کرد کە نادر شا دەیکوژێت، کوردەکان بەخێوی کەن و لە شەڕی نادر شای بپارێزن.

نادر شا سبەینە گەیشتە لەشکربەزی تەهماسب و لە هەڵاتنی ئاگادار بوو، هەموو ماڵ و گەنجینە و پێویستی تەهماسبی بارکرد و ناردیەوە خەبوشان و هی مابووەوە باری کرد و بردی و گەڕاوە مەشهەد و دووبارە ڕوو بەخەبوشان چوو و لە «یوسفاوە» ناو جێگایەک لە ڕۆژئاوای خەبوشان دابەزی و ڕێگای هاتوچوونی لە کوردەکان گرێدا.

شا تەهماسب قاقەزی بەهەموو لایەکدا بڵاوکردەوە و هاواری لە خەڵکەکە کرد و نادر

شای بەخاینی خۆی دانا و داوای کۆمەگی کرد و بۆ کوردەکانی دەرەوەشی نوسی کە نەبنە هەواداری نادر شا کە ڕووی لێ وەرگێڕان. بەو جۆرە بەهەموو لایەکا بۆ سەرکردەی لەشکر و گەورەکان قاقەزی بلاوکردەوە. نادر شا بۆ ئەوەی پێش بەو قسە و هەڵبەستانە بگرێ بۆ خۆی گەڕاوە مەشهەد.

لە هەموو لایەکەوە کورد و خەڵکی خوراسان لە دەورەی شا کۆبوونەوە. نادر شاه کە لەوە ئاگادار بوو، هەستا چوو سەرە ڕێگای بەوانە گرت و گەلێک کوژتاری لێکردن و هەردوولا تێکچرژان و شەڕ گەرمەی تێکەوت. لە دوامینی شەڕا لە یەکە گەورە و سەرهاتووی کوردەکانی شادی و لە سەردار و کاربەدەستانی کوردی چەمشکەزەک جەعفەرقولی بەگ بەگوللەی زەنبوورەک کوژرا و کوردێکی زۆریش کوژران و بەدیل گیران.

ڕۆژی دووەم کوردەکانی قەرەچوڕ کە لەنێو کوردی خوراسانا بەشیر و خەنجەر وەشاندن و شەڕکردن ناوبانگیان هەبوو و میرزا مەهدیخان لە تەئریخی نادردا زۆریان پێ هەڵدەڵێت، ئەوشەڕکەر و ئازایانە بەلەز فریای تەهماسب کەوتن.

نادر شا وەختی نیوەڕۆ چووە پێشیان، ئەو پاڵەوانانە وەکو شێری جەنگی پەلاماری لەشکری نادریان دا و تەنگەتاویان کرد و لەشکرەکەیان وەتەنگ هێنا. نادر ناچار بوو پیاوانی زانا و تێگەیشتووی خستە پێش و پێکیان هێنان و نادر گەڕاوە مەشهەد. ئەو شەڕە لە ساڵی «١١٣٨»دا بوو و کوردێکی زۆریش لە هەردوولا کوژران و بوون بەگاوگەردوونی دوو کەسی خاوەند هەوا و هەوەس. لەشکری نادر شاش هەر کورد بوون و لەشکری شا تەهماسبیش هەروەها کورد بوون. کوردەکان بەدەستی خۆبەخۆیی تووشی کوژتار کران.

هەتا ئەودەمە بناغەی پادشاهی تەهماسب لە مازندەران بوو، ناردی بردیە خەبوشان و لەژێر فەرمانی محەمەد عەلیخانی قوللەر ئاقاسیدا ئەو بنەیەی بارکرد و گەیاندیە نزیک «جاجورم». ڕەحیم خانی جاجورم چوو بەسەری دادا و هەموو بنەیەکەی تالان کرد و گرتی. محەمەدخان بەهەزار ئەزیەت خۆی پێ ڕزگار کرا و هەڵات و چووە کن شا تەهماسب و بوو بەهەلایساندنی پشێوی.

کە زستانی ئەو ساڵە بەسەرچوو، لە دوای نەورۆز کوردەکان سوپاهێکیان بۆ تەهماسب کۆکردەوە و چوونە سەر مەشهەد. نادر شا پێشوازیی کردن و بەشادمانی بردنیە نێو شارەوە. لە دوای چەندێک ناردیان بنەی حوکمدارییان لە ڕەحیم خان ئەستاندەوە و بردیانە خەبوشان و دایاننا.

سالّی ۱۱۳۹ شوکر بەگی کوردی دەرەجز لەشکرێکی کۆکردەوە و ناردیە کن عەشایری «مەڕوو» کە یاریدەی بدەن. ئەوانیش لەمەر و سەرکێشیان کرد. نادر شا ئیبراهیم خانی زەهیرودەولەی برای خۆی ناردە سەر کوردەکانی دەرەجز، ئەوانیش بۆ شەڕکردن پێشیان پێگرت و دەستیان بەکوژتار کرد و ئیبراهیم خان تەنگەتاو کرا. لە لایێکەوە کەلانتەری نێو شار و لە لایێکی دیکەوە محەمەد حوسێن خانی زەعفەران و شاوێردی خانی شێخوان کۆمەڵەیان بەست و بۆ پشتیوانی و یارمەتی شوکر بەگ، پیاوانی ئازا و ڕەشیدیان نارد و ئیبراهیم خان تەنگەتاو کرا.

لەولاوە شا تەهماسب، نادر شای بەلەشکرەوە ناردە کۆمەگی ئیبراهیم خان. لەوددەمەدا کوردەکان هێندێکیان ژن و منداڵ و باری خۆیان هەڵگرتبوو و ڕوو بەخەبوشان دەڕۆیشتن و لەبارکردنا بوون، لە ناکاو نادر شایان گەیشتە سەر و بەماڵ و منداڵەوە هەمووی کوژتن و کەلوپەل و «پێڕۆ» (حەیوانات) یانی بەتالان گرت و ڕوو بەدەرەجز ڕۆیشت.

کوردەکان ڕۆیشتنە پێش و دەستیان بەشەڕ و کوژتار کرد، لە دوای خوێنڕژتنێکی قورس، کورد تەنگەتاو کرا و شکاندرا و نادر شا سەرکەوت. کورد هەموو ڕوو بەخەبوشان هەڵاتن و سەردار سوپا و گەورەی کوردەکان سلێمان بەگ لە شەڕا کەوتە دەست نادر شا و هەردوو چاوی کوڵی و کوێری کرد. نادر شا بەوەش دەستی هەڵنەگرت و بەلەز هەستا و ڕۆیشتە سەر خەبوشان و دەورەی دا. لە دواییدا کوردەکان بەمامڵەت لەگەڵیا پێکهاتن، نادریش ڕوو بەمەشهەد گەڕاوە.

مایەی ئەو هەموو کوژتارەی نێوانی کورد و نادر شا، شا تەهماسب بوو هەروەکو لە پێشا بێژرا: کۆمەڵەی کورد لەسەر نادر گردبوونەوە و بۆ تەهماسب جێگای ترس و ئەندێشە بوو. جا لەبەرئەوە بەپەنهانی کوردەکانی دەبزاوت کە بەگژ نادر شادا بچن و ئەو یێکەتییە تێک بدەن؛ چونکە بنەماڵەی سەفەوی هەوای خەلافەتی ئیسلامیەت و شاهنشاهی لەسەردابوو، نەیدەویست کەسێک بەرهەڵستی بێت. لەبەر ناوی خەلافەت زۆرچاک کوردە دینپەروەرەکانی پێ هەڵدەخەڵەتان. لەگەڵ ئەوەشا شا تەهماسب زۆری تەقەلا دا کە نادر شا بەکوردەکان بەکوژدات. بەڵام کوردەکان هەرچەند لایەنی شا تەهماسب بوون و بەپادشای خۆیان دەزانی، لەگەڵ ئەوەشا کوژتنی نادر شایان لەکن ناپیاویی بوو، ئومێدێکی زۆریان بەنادر شا هەبوو.

## ٤- كوردی چەمشکەزەک و نادر شا

میرزا مەهدی خان لە تەئریخەکەیدا دەڵێت: «نادر شا لەوە گەیشت و لێی ئاشکرا بوو کە تەهماسب بۆ فیتنە ئەنگێزی و شۆڕش پەیداکردن «بەیرام عەلیخانی» کوردی «بەیات»ی نازیر و سەرکاری خۆی ناردبۆوە نێو کوردەکان، نەیرەنگ و نەقشەی بڵاوی و پەرشی پەرت دەکرد. ئەویش بەمە تێگەیشت کە ئەوە ئیشی تەهماسبە. ئەوە بوو بە ٣ جار کە کوردەکان سەرکێشیان کرد و گێچەڵیان هەڵایساند. نادر شا بەچاکە و نەوازش ڕامی کردنەوە» (تەئریخی نادر. لاپەڕە ٤٠).

شا تەهماسب و دەست و پێوەندی کە بەچاکی لە دڵی کوردەکان گەیشتن، لەگەڵ نادر شادا خراپە ناکەن؛ چونکە هی خۆیان و لە خۆیانە. نادریش لەوان ناکا چونکە پشتوپەنای کە هەبێ کوردەکانن، شا لە دڵخوازێکی کە بۆ لابردنی نادر شای هەبوو، نائومێد بوو.

ئەگەر چی تەختی شاهیی تەهماسب وەکو بڵقی ئاو بەئارەزووی با هەردەم بۆ لایەک دەسووڕاند و تاجی حوکمداریی بێ جێگا هەر جارە لەسەر کەسێک دەگەڕا، ئەوجارەش چەرخەی چەرخی گەڕۆکیان ڕوو بەنیشاپوور گەڕاند.

نادر شا ئەوجا گرێی یێکەتی و پێکهاتنی لەتەک کوردەکانا گرێدا و بناغەی دۆستیی و یەکدەستی دامەزراند. محەمەد حوسێنخانی حاکمی خەبوشان و کوڕی شاوێردی خان و سەرکردە و سەرهات و گەورەکانی کوردی شادی و قەرەچوڕی هەڵگرتن و بۆ دیدەنی تەهماسب چوونە نیشابوور. لە دوای دیتن گەڕانەوە مەشهەد و ناردیان دەزگیرانەکەی نادر شایان لە خەبوشانەوە بردە مەشهەد و مارەیان کرد.

نادر شا لەوەدەمەوە ئومێدی سەرکەوتن و کیشوەگیری و سوپا دەست خستن و پێویست پەیداکردنی توندبوو. بەو دۆستایەتی و خزمایەتی و پێکهاتنەی لەگەڵ کوردەکانا کردی شادمان بوو و زانی بەوە دەتوانی بگاتە ئارەزووی فەرمانڕەوایی. جا ئەوجا لەسەر خۆی واجب کرد، کە تێبکۆشێت، پێویستی ئەو دڵخوازە پێک بێنێت و بۆ چوونە پێش تەقەلا بدات؛ چونکە کوردەکان بۆ سەرکەوتنی نادر پشتیوانێکی بەهێزبوون و لە پێش سەرکەوتن و چوونە بەرەژوور بەرهەڵستێکی سەخت بوون.

کوردەکان ڕووی خۆشیان لە هەر کەس کردبێ، زوو بەئارەزوو گەیاندراوە و پشتیان لە هەر کەس کردبێ خستوویانە؛ نادر شا زۆرچاک لەوە گەیشتبوو، بۆیە هەر تەقەڵای دا و بەڕاو و تەگبیر و چاکە بیانخاتە دەست، تا بەنوازش و پاڕانەوە و شۆڕشی نێوانی لابرد و

بنچینەی ئومێد - کە کوردبوون - هاوردیە دەست.

نادر شا لە سایەی کوردەکانی چەمشکەزەکەوە هەر لەو ساڵەدا هەموو پێویستێکی فەرمانڕەوایی ڕێکخست و بەپشتیوانی کوردە ناودار و قارەمانەکانەوە مەلیک مەحموود و خزم و براکانی و ئەفغانەکانی بەجارێک کردنە ژێردەست و هێنانیە بن پەنجەی خۆیەوە.

ساڵی ١١٤٠ نادر شا خاکی خوراسانی خاوێن کرد و لە گرێ و بژاری پاککردەوە لەشکرێکی زرنگی سازکرد کە بچێتە سەر ئەسفەهان و لینگداتە هیرات و جێگایانی دیکە.

شا تەهماسب بەپەنهانی قاقەزی بەهەموولادا بڵاوکرد و بۆ هەموو گەورەکانی نوویسی کە نادر خاینی موڵک و میللەتە و کەس بەقسەی فریو نەخوات. بەو جۆرە کەمێکی لە کوردەکانی خەڵەتاندبوو. خەبوشان نزیک ببوو وەکو جاری بەرایی تێک بچێتەوە، محەمەد حوسێن خان و سەرکردەکانی شادی زوو فریای کەوتن ودایانپۆشییەوە.

لە دوای چەندێک شاوێردی خانی شێخوان لەبەر هێندێک ئەندێشە ترسا و ڕوو بەعێراق هەڵات. نادر شا لەوە زۆر دڵگیر بوو و گەلێکی لێ گران هات. دووبارە بەدەسیسەی تەهماسب هەڵاتنی پیاوێکی وا گەورەی کورد بوو بەمایەی شۆڕش و تێکچوونی کوردەکان.

محەمەد حوسێن خان ئەو شۆڕشەی هاندا. کوردەکان بەجارێک سەرکێش بوون و لە ڕێزە دەرکەوتن. نادر شا وەڵامی نارد کە کوردی قەرەچوڕ و شادی بەلەشکریانەوە لە لەشکرگای پادشا ئامادە بن.

محەمەد حوسێن خان حاکمی جەمشکەزەک کوردەکانی بزاوت و هانی دان لە سملقان کوردێکی قورسیان خڕکردەوە.

نادر شا لەشکرێکی لەژێر فەرمانی زەهیرودەولەدا ناردە سەریان، کوردەکان پێشیان پێگرت. لە دوای شەڕ و کوژتار تەنگەیان بەئیبراهیم خان هەڵچنی و هەڵیانسووراند. ئەگەرچی کوردەکان لە پێشا ڕوو لە شکان بوون، بەڵام لە شەڕا پێیان چەقاند و ڕاوەستان و دڵیان توند ڕاگرت، دلێرانە بەرامبەر بەئیبراهیم خان شەڕیان کرد هەتا ئیبراهیم خانیان شکاند. نزیک ١٠٠٠ کەسیان لێ کوژتن و پەرشوبڵاویان کردنەوە.

ئیبراهیم خان زۆر بەشپرزە و پەرێشانی خۆی ڕزگار کرد و چوو لە قەڵای «یوزباشی»دا سەنگەری بەست و ٤ شەو لەوێدا خۆی ڕاگرت. ڕەحیم خان و ئەوانی دیکە ڕوو بەخاکی

خۆیان هەڵاتن. تاڵانێکی قورس کەوتە دەست کوردەکان،

نادر شا لەوەدەمەدا چوو بووە سەر تورکمانان، کە گەڕایەوە، ناردیە دووی گەورەکانی کورد و بەمیهرەبانی و چاکە هێنانییەوە سەر ڕێگا و ئاشتی کردنەوە و گەڕایەوە مەشهەد .

## سەفیەدین کرانی

ساڵی ١١٣٧ سەفیەدین کوردی بەختیاری لە لینگی «کرانی» هەستا چووە «خەلیلاوە»ی بەختیاری، لەنێو قەبیلەی کوردەکانا ناوبانگی کرد کە کوڕی سوڵتان حوسێنی سەفەوییە؛ باوکی لە دەست ئەشرەف ئەفغانیدا بەکوژت چوو و گوتی کە ناوی پێشووی «ئەبولمەعسوم میرزا» بووە و لە ترسانا ناوی خۆی گۆڕیوە.

ئەو پیاوە کە گوتی شازادەیە، محەمەد حوسێنخانی حاکمی بەختیاری ئەوەی بەفاڵێکی چاک گرتەوە و بۆ ئەمە کە هێزی قورس بکات، گەلێکی چاو ڕاو بۆکرد، سەرهات و سەرخێلی کوردەکانی لوڕ و بەختیاری بۆ بانگ کرد و خستنیە سەر هەوا و هەوەسی کۆمەگی کردنی.

سەفی میرزا قاقەزی بەهەموو لایەکا بڵاوکردەوە و گەلێک کەسی لەسەر خۆی وەخڕ کرد و هێزێکی چاکی پەیداکرد و لەسەر مینبەران خوتبە بەناوی شا تەهماسب و سەفی میرزا دەخوێندرایەوە.

کوردەکانی شووشتەر و کۆهکێلویە و سەرکردە و گەورەکانی عەشایری زۆر لەسەرجما. ڕۆژ بەڕۆژ لەو خاکە تین و هێزی بۆ پەیدابوو و تەختی حوکمڕانی دامەزراند. لەبەرئەوە کە پادشاگەردانی و شۆڕش لە خاکی سەفەویدا پەیدا ببوو، کەسێک نەبوو کە پێشی پێ بگرێت و بەرامبەری ڕاوەستێت؛ بەڵام چونکە لەو پیاوەدا جەوهەری پادشاهی نەبوو، کەلێنێکی وا گەورەی لە دەستدا و لەو چەند موددەتەدا پارچە خاکێکی لە خاکی محەمەد حوسێن خان بەولاوەی نەخستە دەست خۆی.

لەودەمەدا ئەشرەفی ئەفغانی لە کرمان و ئەسفەهان حوکمڕان بوو. شاتەهماسب لە قەزوین دەرخرا بوو، لە مازندەران بەگەڕۆکی ڕایدەبوارد. ئاوربایەگان و هەمەدان لە دەست کورد و عوسمانیدا بوون و خوراسان لەژێر پەنجەی کوردی جەمشکەزەک و مەلیک مەحموددا لە دان و ئەستاندندا بوو. مەیدان بۆ ئەو پیاوە زۆر چۆڵ و فرەهبوو؛ بەڵام بۆ خۆی بێ جەوهەر بوو هیچی پێنەکرا.

ساڵی ١١٤٢ نادر شا و شا تەهماسب قاقەزێکیان بۆ محەمەد حوسێنخانی بەختیاری

نوبسی کە ئەو پیاوە درۆزنە لە بنەماڵەی سەفەوی نییە و بەلەز پووچی کەرەوە. زۆر بەتالووکە تاجوتەختی سەفیەدین لەناوبرا و پووچ کرایەوە.

نادر شا کە لەگەڵ کوردەکان رێککەوت، لەشکرێکی قورسی پێکەوەنا و رۆژ بەرۆژ بڵندبوو و دەستی بەکیشوەگێری کرد. بەکەم چاخێ هەموو خاکی ئێرانی خستە دەست و چووە سەر هیرات و خاکی ئەفغانستان و لەبەریەکی بڵاوکردنەوە.

بەپشتیوانی کوردەکانی جەمشکەزەک، لە نەدر قولییەوە بوو بۆ تەهماسب قولی و نادر شا، کە ناوبانگی زرنگی و ئازایی وەها بڵاوبۆوە، دوژمن کەوتە ترس و لەرزەوە. نادر شا لەو سایەوە پێیکرا کە حکوومەتێکی زلی عوسمانی وەتەنگ بێنێت و رووس داچڵەکێنێت.

کوردەکانی شادی و زەعفەران و قەرەچوڕ لە هەموو شەڕ و شۆڕش و جیهانگیریدا رەشید و دوژمن بەزێن بوون و بەجەنگاوەری خۆیان نواندبوو. شارە گەورەکان و قەڵا سەخت و جێگا توندەکان بەزۆری بازووی وان دەگیرا و بەپشتیوانی ئەوانەوە دوژمن دەردەپەڕاندرا و دەربەدەر دەکرا. میرزا مەهدی لە لاپەڕە ١١٩ی تەئریخەکەیا دەڵێت:

«لە دەورەی قەڵای بەغدا کە ئەحمەد پاشا و قەرە مستەفا پاشا بۆ بەرامبەری نادر شا ناردرابوون، فەوج فەوج لەشکری خۆیان ریزکرد و رەنگی شەڕ و جەدالیان رژت.

لە لایەن نادر شاوە کوردەکانی قەرەچوڕ کرانە مەئموور کە دەست بەشیر و خەنجەر خۆ بخەنە نێو ناوچەی سوپاهی رۆمییانەوە. ئەو پاڵەوانە جەنگییانە بەنووکی تیژی رم لەزەتی هەنگوینی ژیانیان لە زاردا تاڵکردن».

ئەگەر بەچاکی لە مێژووەکان وردبینەوە و هەر لاپەرەیەکی تەئریخی نادر شا تەماشا بکەین پڕن لە ئازایی و رەشیدی میللەتی حەقناسی کورد. بەڕاستی بناغەی حکوومەتی سەفەوی و هەوشار، کوردان دایانمەزراند و لە سایەی کۆششی ئەوانەوە بینا کران.

ساڵی ١١٤٧ خانی خوارزم حوسێن وەکیل یەمووتی بە٣ هەزار سوارەی تورکمانەوە لینگیان دا سەر خاکی «ئالاغ و سملقان» کە جێگای کوردەکانی چەمشکەزەک بوو. ئەوانیش لەو دەمەدا خەریکی جووت و دروێنە و چاندن بوون، لەناکاو تورکمان بەسەریانی دادا.

حاکمانی کورد کە لەوە ئاگاداربوون، چوونە سەریان و گەلێکیان لێ کوژتن و ژمارەیەکی زۆریان بەدیل گرت و تورکمانیان بڵاوکردەوە. نادر شا کە ئەوەی بیستەوە، هەموو گەورە و

حاکمانی خەڵات کردن. (تەئریخی نادری لاپەڕە ١٤٧).

ساڵی ١١٥٤ محەمەد حوسێن خانی چەمشکەزەک - کە بەگلەر بەگی خەبوشان بوو- لەگەڵ ئەڵلاوێردی بەگ و محەمەد قاسم خان و خان و بەگەکانی کوردەکان، لەشکرێکی کوردیان کۆکردەوە و چوونە سەر «دەروێش» ناوی بەڵخی.

ئەو دەروێشە بەنێو ڕەوەند و گەڕۆکاندا چووە «بەڵخ» و لەسەر قەبری «شامەردان» کە نزیک «بەڵخ»ە دانیشت و داوای مەهدییەت و ساحێب زەمانی کرد؛ موعجیزە و کەراماتێکی زۆری دەنواند، لە ئەهالی بەڵخ گەلێک کەسی لە دەوروپشتی کۆبووەوە. عیسمەتوڵلا ناو پیاوێکی کردە سوڵتانی بەڵخ، هەموو تورکستان باوەڕیان پێ کرد. ئۆزبەگییە و نیازخانی والی بەجارێک خۆیان نا مستیەوە. ئاوی دەستنوێژیان بەمتەفەرک دەبرد. هەردەمێ والی کە دەچووە لای ڕوو بەخاک و دەمەوڕوو دەکەوت و کەوشەکەی ماچ دەکرد. دەروێشی گوتراو دەم بەدەم هێزی پەیداکرد و ڕوو بەبەرزی دەڕۆیشت.

نادر شا چەند جار لەشکری ناردە سەر دەروێش، بەشکاوی و پەرێشانی دەگەڕاوە، جارێک والی لەشکری کردە سەر دەروێش و لە ترسی نادر شا چوو بەگژیا و لە دوامینا شکاندرا، لەو شەڕەدا گەورەی بەڵخ و سەرکردە و کاربەدەستیان لێ کوژران. «ئۆزبەگییە» بەجارێک بوون بەهەواداری و لەشکریان بۆ کۆکردەوە و شەڕیان بۆ دەروێش کرد و هەرکەسێکی خوراسانی یا پیاوی نادر شا یا قزڵباش و ڕەعیەتێکی ئەو خاکەیان دەستکەوتبایە دەیانکوژت.

نادر شا لەوە هەراسان و بێچارە ماوە. محەمەد حوسێنخانی چەمشکەزەکی ناردە سەر دەروێش. هەروەکو لەپێشا گوترا محەمەد حوسێن خان ڕۆیی و دەورە بەڵخی دا، دەروێش و سوپاهەکەی لە ئەرک کۆبوونەوە و بۆ بەرابەری کردن ئامادەبوون.

کوردەکانی شادی و زەعفەران وەکو پڵنگ لە ئۆزبەگییەکانیان دا و دەستیان کرد بەکوژتاریان. ڕۆژی یەکەمینی شەڕ، عیسمەتوڵلا ناوی ناوزەدەی سەڵتەنەت کەوتە دەست کورد و کوژرا. ڕۆژی جومعەی ١٢ موحەڕەم کوردەکان ئۆزبەگییەکانیان تەنگەتاو کرد و لە هەموو لایێکەوە ڕەپێچەکیان دان و هەرچی کوژران و هەرچی ماوە بەدیل گیران. دەروێش وەکو جاران گۆشەیەکی تەکیەی شامەردانی گرت و دانیشتەوە.

خواجە نیعمەتوڵلای موتەوەللی ئەو قەبرە دەروێشی گرت و دەستبەستە دایە دەست محەمەد حوسێن خان؛ ئەویش بەزنجیرکراوی بۆ نادر شای بەدیاریی نارد. هەوادارەکانی

دەروێش هەموو پەرش وبڵاو کران و مایە شۆڕشەکانی گشت گرتن و بەدڵێکی شادەوە لە مانگی جەمادی دووەمدا گەڕاوە خەبوشان. (تەئریخی نادر - لاپەڕە ٢٧٧).

لەوەپێش محەمەد حوسێن خان کوڕێکی خۆی کردبوو بەنایب و لەسەر خاکی ئوسترابادی دانابوو. قاجارە نەزانەکان لە دەستی وەڕەز ببوون، لە تورکمانی یەمووت هەواداریان پەیداکرد و دەستیان دا جەردەیی و ڕێگری. لە دوامینا هێزیان قورسکرد و بەگژ کوڕی محەمەد حوسێن خانا چوون؛ ئەویش نەشیا بەرامبەریی بکات و ناچار هەڵات و ڕوو بە«بەهبودخان» چاپش سەرداری ئەترەک، چوو کە کۆمەگی بکات.

ساڵی ١١٥٨ محەمەد حوسێن خان بۆ نادر شای نوسی کە قاجارەکان دەستیان بەسەرکێشی کردووە و تەمای هەستان و دەستدرێژیان هەیە. ئەو قاقەزەی محەمەد حوسێن خان لە ماهیدەشت (کرماشان) مانگی زیلحیجەی ئەو ساڵەدا بەنادر شا گەیشت. نادر شاش فەرمانی دا بەمحەمەد حوسێن خان کە بەلەشکرێکی قورسی کوردەوە بڕواتە سەریان و لەبەر یەکیان بڵاوکات.

بەگەیشتنی فەرمانی نادر شا دەزبەجێ محەمەد حوسێن خان بە سوپاهێکی ڕێککەوتووی کوردی سازکرد و چووە سەر ئوستراباد و بەشەڕ و کوژتار پەلاماری قاجارانی دا و شکاندی و ئوسترابادی خستەوە دەست.

ساڵی ١١٥١ نادر شا لە هیندستان بوو، وەڵامی پێدرا کە عەلی مەردانخانی فەیلی، کە لەوەپێش لە لایەن نادر شاوە بەئێلچیەتی ناردرابووە ئەستەمبوڵ، لە گەڕانەوەدا گەیشتە سیواس و مرد.

نادر شا کە لەوە ئاگادار بوو دەزبەجێ قاقەزێکی دیکەی نوسی و حاجی خانی کوردی چەمشکەزەک کە چەرخەچی باشی سوارەبوو، بەسەفارەت ناردیە ئەستەمبوڵ حاجی خان کە چووە دیاری ڕۆم بەکەیف و شادمانی و گەورەیی پێشوازی کرا و جوابی درا و ڕوو بەئێران گەڕایەوە. نەزیف ئەفەندی و حەنیف ئەفەندی لە لایەن سوڵتانی ڕۆمەوە بەسەفارەت لەگەڵیان خست و ناردیانە ئێران. ساڵی ١١٥٤ حاجی خان لە مازندەران گەیشتەوە لەشکرگاهی نادر (تەئریخی نادر - لاپەڕە ٢٢٢).

ساڵی ١١٥٦ نادر شا کە لە ئاوربایەگان بوو بەڕێگای کرماشانا چووە سەر بەغدا. قوجەخانی کوردی شێخانی چەمشکەزەک کە سەردار سوپاه بوو، لە ڕێگەی «حوێزە» و «فەیلی»یەوە بۆ گرتنی بەسرا لەشکری ئاژۆت. بەگلەر بەگییەکانی حوێزە و فەیلی و

سەبزەوار و شووشتەر و دیزفوول و ئەعرابی ئەو جێگایانە هەریەک لەشکری خۆیان هەڵگرتن و بەیێکەتی ڕوو بەبەسرا ڕۆیشتن و لە شەتی دیجلە پەڕینەوە و خەریکی گرتنی بەسرا بوون. بەکۆشش و تەقەلادان لە مانگی جەمادی دووەمی ئەو ساڵەدا هەموو خاکی بەسرایان گرت و دەورەی «قەڵای قورنە»شیان دا و خەڵکەکەیان تەنگەتاو کرد.

نادر شا لەولاوە چووە سەر شارەزوور و گرتی، هەر وەکو کە لە هاتوودا لێی دەدوین، وە بەزۆر شارە زووی خستە دەست و چووە سەر بەغدا و بەمامڵەتکردن لەتەک حکوومەتی عوسمانیدا پێکهات.

قۆجەخانی کە ئێمە لەم بەندەدا مەبەسمانە، ساڵی ١١٥٧ دەستی لە دەورەدانی قورنە بەردا و لە مانگی زیلحیجەدا گەڕاوە و گەیشتەوە لەشکرگاهی نادر شا کە لە خاکی ئەردەڵان و لە دەوری شاری «سنە» بوو.

## ٥- کوردی لوڕستان و نادر شا

نادر شا کە بەزۆری باسکی پاڵەوانانی کوردی چەمشکەزەک حکوومەتێکی تازەی بەناوی «هەوشار» (ئەفشار)ەوە دامەزراند، تاران و ئەسفەهان و شیراز و کرمانی گرت و خستنیە ژێر پەنجەی فەرمانڕەوایی خۆیەوە، ئەوجا جڵەوی ڕوو بەخاکی کوردستانی بەختیاری سووڕاند.

ساڵی ١١٤٢ی مانگی شەعبان گەیشتە کێوی کیلویە، کوژتارێکی قورسی لە کوردی بەختیاری و فەیلی کرد و گەلێکی بەدیلگرتن و چەند هەزار ماڵی لەو دوو عاشیرەتە بارکرد و ناردنیە خاکی خوراسان. نادر شا لە دوای ئەوە ڕوو بەبروجەرد چوو. ئەحمەدخانی کوڕی قاسمخانی بەختیاری، کە حاکمی بەختیارییەکان بوو، لەتەک خۆیا بردی ئەحمەدخان لە هەموو سەفەرەکانی نادر شا بۆ ئاوربایەگان و خوراسان و هیرات و گەڕانەوەی بۆ ئەسفەهان لەگەڵا بوو.

کە نادر شا بەختیاری و فەیلی سەرکوت کرد، لەشکرێکی لێگرتن. «کەریمخانی زەند» یەکێک بوو لەوانەی کە بەسوپاهی لەگەڵ عەشیرەتەکانیا کەوتە لەشکری نادر شاوە.

ساڵی ١١٤٤ نادر پاشا گەڕاوە ئەسفەهان، شاە شا تەهماسبی لە پادشاهی خلمت و ئیسماعیل میرزای کوڕی وی کردە پاشا لە دوای ئەوە ئەحمەدخانی کردەوە بەحاکمی بەختیاری و خەڵاتی کرد و ناردییەوە سەر خاکی نیشتمانی.

ئەحمەدخان کە گەڕاوە گەیشتەوە خەلیئاوا دەستی بەفەرمانڕەوایی کردەوە، یەکێک لە

بەختیارییەکان کە دەستی درێژبوو، سەری بۆ نەنواند و ملکەچ نەدەبوو. ئەحمەدخان بانگی کردە کن خۆی. ئەو پیاوە گەلێک قسەی ناشایستە و ناحەزی بەئەحمەدخان گوت و ئەویش فەرمانی دا کە دارکاری بکەن و لەژێر داردا مرد. خزم و کەسی ئەو پیاوە لەشکرکێشیان کرد و چوونە سەر ئەحمەدخان و لە دوای شەڕ و کوژتارێکی قورس، بەسەر ئەحمەدخانا زاڵبوون و کوژتیان و باریان کرد و چوونە «کەرسیرات».

نادر شا کە لەو سەربهوردە دڵگیرە ئاگادار بوو، فەرمانی دا بەباباخانی چاپش کە سەرکردەی لورستان بوو، کە بڕواتە سەریان و تۆڵەی ئەحمەد خانیان لێ بکاتەوە.

باباخان لەشکری هەڵگرت و چووە پێشیان، ڕۆژی ٢٩ی مانگی ڕەبیعی دووەم شەڕیان کرد. نادر شاش لەولاوە بەلەشکرەوە گەیشتە سەریان، کوردەکان ناچار سەرکێوە بڵندەکانیان کردە سەنگەر و بۆ بەرابەری ئامادەبوون. ٢١ ڕۆژ شەڕ و کوژتاریان کرد و لە دوامینا تەنگە بەکوردەکان هەڵچنرا و شکاندران و خوێنڕێژەکانی ئەحمەدخان لە دەست نادر شا گرفتار بوون و کوژران و ٣ هەزار ماڵە کوردی حەوت لینگ بارکران و بۆ خوراسان بەڕێکران، حکوومەتی بەختیاری و لوڕستان درا بەفەتحخانی کوڕی قاسمخان. ١٩ی مانگی جەمادی دووەم نادر شا لە لوڕستانەوە ڕوو بەکرماشان کەوتەڕێ.

کوردی زەند کە لە خاکی سێلاوخوڕ و سەرابەند دانیشتبوون، نادر شا ڕقی لێیان هەستا و ٣٠٠ ماڵیان لێ بارکران و ناردنیە خوراسان. لە لایەن باباخانی چاپش گەلێک لە سەرهات و گەورە کەیخودایانی زەند کوژران و لەناو چواندران.

لە لایەن نادر شاوە ١٠٠ هەزار تومان دراو داندرا کە ئەو عەشایری کوردانەی کەوتبوونە بەر ڕقی نادر شا باربکرێن؛ بەڵام چونکە چوونە بەغدا و شارەزووری لە پێش بوو، ئەو دراوەی بۆ گەڕانەوە دانا. کە نادر شا چووە سەر بەغدا شکاندرا و بەهەڵاتن گەڕاوە و نەپەرژا ئەو عەشایرانە بازوێت. ئەو عەشیرەتانەش هەریەک گەڕانەوە خاکی خۆیان و دەستیان بەسەرکێشی کردەوە.

ئەبو فەتحخانی حاکمی لوڕستان هەموو کوردەکانی لەسەر خۆی کۆکردەوە و دەستی هێز پەیداکردنی نواند و هەتا دەگاتە خاکی فارس، کێشایە ژێر فەرمانیەوە و لەگەڵ بەخێوکردنی ئەو خاکە خەریک بوو. نادر شا لە پاش چووینی دووەمینی بۆ سەر بەغدا، کە گەڕاوە لەشکرێکی قورسی بردە سەر ئەبو فەتحخان. مەیدانی کوژتار گەرم بوو، تەنگەیان بە ئەبو فەتحخان هەڵچنی و دەورەی شوشتەریان دا. لە پاش گەلێک کوژتار، شوشتەر

کەوتە دەست و سووتاندنی و ویرانی کرد. ئەبو فەتح زۆر بەشپرزەیی گیرا. مانگی ڕەجەبی ساڵی ١١٤٥ لەسەر فەرمانی نادر شا سەربڕا و خاکی لوڕستان و بەختیاری درا بەکوردەکانی چەمشکەزەکی خوراسان.

هەر کوردێکی لە دەست نادر شا دەربەدەر ببوو، چووە کن محەمەدخانی بلووج. ئەویش لەو کوردە بڵاوانە لەشکرێکی ڕێکخست و لە کێوی کیلویە لە نادر شا سەربڵند بوو و لە خاکی شیرازا حکوومەتێکی دامەزراند (تەئریخی نادر - لاپەڕە ١٣٧).

ساڵی ١١٤٦ نادر شا ئەمری دا کە هێندێک لە بەختیارییە سەرکێشەکان بارکەن و بیانبەنە خوراسان ئەو کوردە بەختیاریانەیان کۆ کردنەوە و بەماڵ و منداڵەوە باریان کردن. لە نیوەی ڕێگادا هەموو بەجارێک هەڵاتن و ڕوو بەچیا و کێوە سەختەکانی خۆیان بۆی دەرچوون.

باباخانی چاپشی حاکمی لوڕستان لەشکری ئاژوتە سەریان و لە پاش گەلێک خوێنڕژتن هێندێک کوژران و هێندێک دەردەست بوون و بەدیل گیران. ئەوەی مابوونەوە باریان کردن و بردیانە خوراسان و لە خاکی «جام» لە لای بەختیارییەکانی دیکەی براویان دانان.

## عەلی مورادخان بەختیاری

لەپێشا لێی دواین، کە کوردەکانی لوڕ و بەختیارییان دەبردە خاکی خوراسان و لە جام دایاندەمەزراندن، زۆری پێنەچوو کەمکەمە و پۆل پۆل گرێبانیان لەو گیرۆدەیە ڕزگار دەکرد و بۆ خاکی خۆیان هەڵدەهاتنەوە. بەو جۆرە گەلێکیان لە پەنجەی دیلی دەرپەڕین و لە کێوە بەرزەکانا کۆبوونەوە و سەریان بڵند کرد و گەردەنیان لە فەرمان وەرچەرخاند.

ئەو کۆمەڵە زلە کۆبوونەوە و لە ژێر فەرمانی عەلی مورادخانی گەورەی بەختیاریدا ئالای سەربەخۆبیان هەڵدا و عەلی مورادخان لە هەڵاتووەکان و لە کوردەکانی نزیک و دووری خۆی هێزێکی جوانی پەیدا کرد و لەگەڵ پێویست ڕێکخستن دەکۆشا.

نادر شا دەستە سوپا و قۆشەنێکی ناردە سەر عەلی مورادخان. لە دوای کەم شەڕێک ئەو ئۆردووە بەشپرزەیی گەڕاوە دوایی. جاری دووەمین باباخانی چاپش هەموو گەورە و خەوانین و سەرکردە و سەردارانی کۆکردەوە و لەگەڵ فەوجێک سەرباز و لەشکری شوشتەر و کێوی کیلویە چوونە سەر عەلی مورادخان و نەشیان بەسەریا زاڵبن و بەپەرێشانی گەڕانەوە.

ساڵی ١١٤٨ سوڵتان عەلی بەگ و نەجەف قولی بەگ کە هەردووکیان گەورەی کوردی

چەمشکەزەکێ بوون، لە لەشکری ڕێککەوتوو، فەوجێکی سەرباز و لەشکری کێوی کیلویە و شوشتەریان هەڵگرت و چوونە سەر عەلی مورادخان؛ لە دامێنی کێوی «سالم» لەشکربەزیان کرد. عەلی مورادخان قەڵای «کوە»ی کردە سەنگەر و بۆ بەرامبەریان ئامادە بوو.

لەشکری نادر شا لە هەر چوار کەنارەوە دەورەیاندا و شەڕ و کوژتاریان دەست پێکرد. بەختیاری لەسەردا بۆ لەشکری نادر شا چوونە خوارێ و تا نیوەی کێو ڕۆیشتن و دوژمنیان تەنگاو کرد و شکاندیانن و سوڵتان عەلی و نەجەف قولی هەڵاتن.

عەلی مورادخانیش دەورەی لەشکری شوشتەر و کێوی کیلویەی گرت و تەنگەتاوی کردن. لە دوای کوژتار ئەوانیش هەڵچنران و ڕوو بەخاکی خۆیان هەڵاتن. گرانەبار و جەبەخانەیەکی قورس کەوتە دەست عەلی مورادخان و تاڵانێکی زۆر کەوتە دەست سوپاهەکەی.

لەودەمەدا نادر شا لە ئێرەوان خەریکی شەڕی ڕۆمیان بوو و نەدەپەرژا بڕواتە سەر عەلی مورادخان و سەری نەرمکا. ئەوە چاکتر بوو بەمایەی هێز پەیداکردن و پەرە ئاوێژتنی عەلی مورادخان و لەشکر و پێویست ڕێکخستن. بەو کەم چاخە سوپای شەڕکەر و ئامادەی گەیشتە ٥ هەزار کەس.

عەلی مورادخان لە چیای «بروک» کە سەختتر و بڵندتر و گەورەترینی کێوەکانی بەختیاری بوو، قەڵایەکی زۆر سەخت و توندی دروست کرد و بەجەبەخانە و سوپا و تۆپ و چەرخە دایمەزراند. (تەئریخی نادری - لاپەڕە ١٦٧).

نادر شا کە لە ئیرەوانەوە گەیشتە قەزوین، لەشکرێکی سوارەی لە کوردی خوراسان ڕێکخست، وە لەشکری فەیلی و ئەردەلان و هەمەدانیشی لەگەڵ خستن و ناردنیە سەر عەلی مورادخان و هێندێک لە جزایرچیە بەتایبەتییەکانی خۆشی لەگەڵ خستن و بەڕێگای شوشتەرا ناردنی و لە دەشتی گورگانیش چەند فەوج لە مارودەشت و گرووە لەگەڵ لەشکری کۆهی کیلویە و لەشکرێکی زلیشی لە ئەسفەهانەوە بۆ هەزار چەمەنی بەختیاری ڕەوانە کرد. ئەو لەشکرانە هەریەک لە ڕێگای خۆیانەوە ڕوو بەعەلی مورادخان بزووتن و لە هەموولایەوە دەورەیاندا کە نەهێڵن لەو هێزە یەکێکیان لێ ڕزگار بێت.

نادر شاش لەولاوە گرانەبار و ئەسپاب و جەبەخانە و پێویستی بۆ تەنگایی لە مەنزڵی «چرپاس» دانا و نەسروڵڵا میرزاشی کردە بنەگدار و بۆ خۆشی بەهێزێکەوە ڕوو بەکێوی بەختیاری ڕکێفکوت ئاژووتی.

ڕۆژی ٨ی جەمادی دووەمی ساڵی ١١٤٩ نادر شا گەیشتە دامێنی کێوی بەختیاری کە یەکەمین دەستە شەڕکەرێکی عەلی مورادخانی تێدا دانیشتبوو و سەنگەریان گرتبوو و شەڕیان دەکرد.

نادر شا فەرمانی دا بەدەستە جەنگاوەری کوردی چەمشکەزەک و پیادەی ئەفغانی کە پەلاماری بەختیارییەکان بدەن. بەختیارییەکان شێرانە هەڵمەتیان برد و زۆر بەئازایی لینگیان دایە سەر کوردەکانی نادر و تێکیان پێچان. لە دوای گەلێک کوژتار بەختیاری ناچاربوون کە سەنگەر بگوێزنەوە. کوردەکانی چەمشکەزەک لە تاریکی شەوا چوونە سەر قەڵای «بروک» کە جێگای عەلی مورادخان بوو لە هەموو لایێکەوە وەتەنگیان هێنا.

عەلی مورادخان بەدەستە لەشکرێکی لە لای بوو لە ئاوی بروک پەڕیەوە، ئەو چۆمە دەچووە دزفوول. کە پەڕیەوە پردێک لەسەر ئەو چۆمە بوو ڕووخاندی، لەودەمەدا لەشکرێکی نادر شا کە لە هەزار چەمەنەوە ناردرابوو، گەیشتە سەر عەلی مورادخان. هەردوو لا بۆ شەڕ ئامادەبوون و دەستیان بەیەکتر کوژتن کرد و نزیک ٦٠٠ کەس لە عەلی مورادخان کوژرا. سبەینێ لەگەڵ بەیانی و سپێدەدا نادر شا گەیشتە سەرپردی بروک و فەرمانی دا و دەست بەدروستکردنەوەی پرد کرا و لەشکری نادر پاشا لە چۆمێ پەڕیەوە. کوردەکانی بەختیاری وەکو باڵندە لە شاخ و کێوە بەرزەکان سەرکەوتن و بۆی دەرچوون و لە چنگی نادر شا ڕزگاربوون.

نادر شا دەستە بەدەستە و فەوج بەلەشکر و سەربازەکانی خستە نێو شاخ و کێو و دۆڵ و شیوەکانی چیا بلندەکانەوە تاکو لە هەڵاتووەکان بگەڕێن و بیانگرن. نزیک ٣ هەزارماڵیان بەدیل گرتن و گەلێکیشیان کوژتن. بەجارێک ئەو میللەتە شپرزە کران و پەرێشان و نەبوو بوون.

عەلی موراد لە کێوی «گۆرگنش» کە لەگەڵ کێوی لورستانی فەیلی دەبێتەوە بەیەک، خۆی دامەزراند و سەنگەری گرت. لەشکری نادر شا دەورەیدا و تەنگەتاویان کرد. لە دوای شەڕ و خوێنڕێژی عەلی مورادخان بەدیل گیرا و بەماڵ و منداڵییەوە بردیانە کن نادر شا. نادر شا کەپوو و گوێ و لێو و پێ و هەردوو دەستی عەلی مورادخانی بڕی و هەردوو چاوی هەڵکۆڵی و لە دوای دوو ڕۆژ کوژتی. پاشماوەی لەشکری عەلی مورادخان ناچاربوون هاواریان لەو خان و بەگ و سەرکردە و گەورەکانی بەختیاری کرد کە لەکن نادر شا بوون، ئەوانیش بەگەلە کۆمەڵە تکایان کرد و هەموو بەخشران. بەڵام هەموویان بارکردن و بردیاننە خاکی «جام» و دایانمەزراندن و لەکن ئەوانی دیکەیان دانان کەلەوە پێش لەوێ

داندرابوون. نادر شا نزیک مانگێک لەو کێو و شاخانەی بەختیاری سوورا و ڕوو بەئەسفەهان گەڕاوە و ٩ی مانگی ڕەجەب گەیشتەوە ئەسفەهان.

### ٦- کوردی موکریان و نادر شاه

کوردەکانی موکریان لەوەپێش سەربەخۆ دەژیان و حکوومەتێکی ئازادیان هەبوو، فەرەیدونخانی حاکمی موکری لە لایەن سوڵتان حوسێنی سەفەوی کرا بەوالی هەمەدان.

ساڵی ١١٣٣ فەرەیدونخان لەتەک عوسمانییاندا ڕێککەوت و بەبۆنەی سونیەتییەوە لە سەفەوییەکان پچڕاوە و لەگەڵ حکوومەتی ڕۆما پێکهات و گەڕاوە سەر خاکی خۆی و دووبارە لە موکریان دانیشت. چونکە بەختی سەفەوی وەرگەڕا بوو، کوردی موکریانیش ناچاربوون کە بکەونە ژێر ئیدارەی عوسمانییانەوە.

لە لایەن حکوومەتی ڕۆمەوە عەلی ڕەزاخانی موکری کرا بەفەرمانڕەوای موکریان و لەگەڵ ڕۆمیانا بناغەی دوستیی دامەزراند.

ساڵی ١١٤٢ نادر شا لە دوای گرتنی هەمەدان و سنە ڕوو بەئاوربایەگان ئاژۆتی، عەلی ڕەزاخان لەشکرێکی قورسی کۆکردەوە کە پێش بەنادر شا بگرێ.

لە لایەن حکوومەتی ڕۆمەوە تەیموور پاشای کوردی میللی کە حاکمی وان بوو، بەهاواری عەلی ڕەزاخانیانەوە نارد تەیموور پاشا بەلەشکرەوە گەیشتە کۆمەگی عەلی ڕەزاخان لە قەڵای میاندواو لەشکری هەردوولا بۆ پێش بەنادر گرتن ئامادەبوون.

نادر شا لە ڕێگای بانە و سەقزەوە ڕوو بە«سەفاخانە» چوو. سەفاخانەی هەوشیار کە نیشتمانی باپیری نادرشا بوو، کردیە لەشکربەز و بنە و گرانەباری بەجێهێشت. بۆ خۆی و لەشکرێکی لە دەستیا بوو ڕوو بەعەلی ڕەزاخان ڕۆیشت. بەری خۆی دا میاندواو کە لە نێوانی مەقدەم دەهدەمدا هەڵکەوتووە. لەسەر چۆمی «جەخەتوو» ڕووی بەڕووی عەلی ڕەزاخان و تەیموور پاشا لەشکری ڕیز کرد. هەردوو لا بۆ خوێنڕژتن ڕوویان تێک کرد. شەڕ لەپێشا بەتۆپ و تفەنگ بوو لە پاشان شیر و خەنجەر و قەرەبینا کەوتەکار. ئەگەرچی موکریانییەکان لەپێشا زۆر دلێرانە و پاڵەوانانە شەڕیان دەکرد، بەڵام لە پاشان وەتەنگ هێنران و شکاندران.

نادر شا کوردەکانی موکری و میللی تێکەوە پێچا و ڕوو بەمەراغە هەڵیبرین گەلێک کوردی موکری کەوتە دەست نادر شا، زۆریان کوژران و بەدیل گیران. تۆپ و جەبەخانە و ماڵێکی زۆری ئەوان کەوتە دەست نادر شاوە.

عەلی ڕەزاخان و تەیموور پاشا لە مەراغە خۆیان نەگرت و چوونە «دێخورگان». نادر شا چووە مەراغە و گرتی و گەڕایەوە سەر سابلاخ و ئەویشی گرت. خاکی دەهدەم و مەقدەم و مەراغە و سابلاخ کەوتە دەست نادر شا.

عەلی ڕەزاخان کە گەیشتە دێخورگان دەستی بەقاقەز نوبسین کرد و بناغەی یێکەتی لەگەڵ نادر شا دامەزراند و گەڕایەوە سەر خاکی موکری و بەفەرمانڕەوای موکری داندراوە.

نادر شا ڕوو بەتەورێزی ئاژۆت و لە سەهۆلان لەشکربەزی کرد. تەیموور پاشاش چووە تەورێز. نادر شا. بەگژ تەیموور پاشادا چوو کوژتارێکی قورسیان لێک کرد. لەو شەڕەدا پاشا و عەسکەرێکی زۆر بەدیل کەوتە دەست نادر شا. جاری دووەم لە کێوی «خواجە میرخان» نادر شا و تەیموور پاشا شەڕێکی قورسیان کرد و ژن و منداڵێکی زۆر بەدیل چوون. تەیموور پاشا تەنگەتاو کرا و هەڵات و ڕوو بە«سۆفییان» بۆی دەرچوو. لەوێش ڕانەوەستا و بۆ «خووی» ڕۆیشت.

نادر شا کە تەیموور پاشای شکاند و چووە سەر تەورێز و گرتی، لە دوای دامەزراندنی شار، چەند پاشا و گەورەیەکی کە بەدیلی گرتبوون بەریدان و خەڵاتی کردن و ناردنیەوە خاکی خۆیان (ت. ن. ل ٧٦).

نادر شا لەو دەمەدا کە لە تەورێز شەڕی دەکرد، خوراسان تووشی شۆڕش و پشێوی ببوو؛ لەبەرئەوە «بێستوون بەگ»ی هەوشاری کردە حاکمی تەورێز و بۆ خۆی بەناچاری ڕوو بەخوراسان و هیرات چوو.

ساڵی ١١٤٣ شا تەهماسب لەشکرێکی قورسی ڕێکخست و ڕوو بەئاوربایەگان چوو کە ئێرەوان بگرێ؛ لە ڕێگای هەمەدانەوە مانگی جەمادی دووەم گەیشتە ئاوربایەگان. کە چووە تەورێز بێستوونخانی حاکمی تەورێزی لێخست و محەمەد قولیخانی کردە حاکم. لە دوای ئەوە بەری خۆیدایە ئێرەوان و دوای کەم شەڕێک شا تەهماسب شکا و ڕوو بەسەلماس هەڵات و گەڕاوە تەورێز. لەوێش خۆی نەگرت و ڕوو بەهەمەدان و ئەسفەهان بۆی دەرچوو (ت. ن. ل ١٠٢).

لەولاوە سونعی پاشای عوسمانی لە ئاوی ئاراس پەڕیەوە و بە ٣ مانگ سەلماس و مەراغە و تەورێزی گرت. کوردەکانی موکری لەژێر فەرمانی عەلی ڕەزاخان پێشوازیی ڕۆمیانیان کرد و کەوتنە بن ئیدارەی ڕۆمییانەوە. دیسان عەلی ڕەزاخانیش بەحاکمی داندراوە.

نادر شـا له پاش چوونه هیـرات و خـوراسـان کـه گـەڕایەوه ئەسـفـەهان، دەزبەجێ شـا تەهماسبی له شایەتی خست؛ له دوای ئەوه بەسەر هەمەدان و کرماشان و شارەزووردا چووه سەر بەغدا هەروەکو له هاتوودا دێته گوتن، لەوەپاش گەڕایەوه کرماشان.

له سـالّی ١١٤٤ ئەیالەتی تەورێز له لایەن نادر شاوه درا بەلوتف عـەلی بەگ. لەولاوه تەیموور پاشای کـوردی مـیللی بەلەشکری کـورد و عـەسکەری ڕۆمـەوه چووه سـەر تەورێز. خەلّکی تەورێز دەستیان بەپێشوازیکردن کرد و بەجارێک شاریان چۆڵ کرد. هەرچەنده لوتف عـەلی بەگ تەقەلای دا و کـۆششی کـرد، نەشیا پێش بەوانه بگرێت. هەتا ئێـواره لەگەڵ کوردەکانی خوراسان هەولّیان دا چارەیان نەکرد؛ ناچاربوون له تەورێز دەرکەوتن و ڕوو بەمـەراغـه هەلاتن و لەوێش ڕێگایان نەدان کـه بڕۆنه نێـو شـارەوه. لوتف عـەلی له مەراغەوه ڕوو بە«خەلّخالّ» هەلات.

تەیموور پاشا لەولاوه گەیشتە پێش و تەورێزی گـرت و لەگـەڵ کـوردەکـانی مـەقـدەم و دەهدەم و مـوکـریدا ڕێککەوت؛ بەلام زۆری بەسـەر نەبرد و له تـەورێز دەرکـەوت. چونکه لەودەمەدا پۆلاد پاشا له دیاله شکا و تۆپاڵ عوسمان پاشاش له شارەزوور کوژرا. تەیموور پاشا که لەوه ئاگادار بوو تەورێزی بەردا و گەڕاوه ئێرەوان.

لوتف عەلی بەگ که زانییەوه تەیموور پاشا له تەورێز دەرکەوتووه، هەستا چووه تەورێز و گرتییەوه و مەراغەشی خستە دەست. سالّی ١١٤٥ تەورێز و کوردستانی ئاوربایەگان کەوته دەست نادر شا.

نادر شا له هەمەدانەوه ڕووی له ئاوربایەگان کرد و فەرمانی دا که پاپا عـاشوورخانی سالّی ١١٤٦ خاکمی ورمێ و ٣ هەزار مالّه کوردی هەوشار - که له دەورووپشتی ورمێ (ارومیه) دانیشتبوون، باریان کات و بیانباتەوه نیشتمانەکەی پێشوویان که ساینقەلای هەوشاری خاکی موکری بوو، ڕایانبگرێت هەتا نادر شا دەگاته ئەوێ و چاوی پێ بکەوێت و ڕەوانەی خوراسانیان بکات.

عـاشوورخان هەمـوو کـوردەکـانی هەوشاری سازکردن و له سـاینقەلا ڕایگرتن. نادر شا هەمووانی دی و دلّخۆشی دانەوه و خەرج و دراوێکی زۆری پێدان و بەئاسوودەگی ناردنیه خوراسان و دایمەزراندن. چونکه عەشیرەتی خۆی بوون زۆری ڕێزلێنان و سەرفرازی کردن.

نادر شا له دوای ئەوه له ساینقەلاوه چووه مەراغه، لەوێ بوو که عەلی ڕەزاخانی موکری وعەبدوڕەزاق خانی کوردی مەقدەم چوونه لای و بەخەلات و نەوازش و بەخشش دلّخۆشی دانەوه و هەموو سەرکرده و گەورەکانی ئاوربایەگانی یەک بەیەک خەلات کردن و بەلەشکر

و قوشەنیان لە دەهدەم دانیشتن و چاوەنۆڕی مامڵەت بوون لەتەک عوسمانیاندا. نادر شا ئەمری دانێ یان سوڵح یان شەڕیان لەگەڵ دەکەن، ئەوانیش بەچاوەنۆڕیی دانیشتن و نادر شاش بۆ گرتنی تاڵش ڕوو بەئەردەوێل ڕۆیی.

ساڵی ١١٤٧ نادر شا لە قەفقاز شەڕی دەکرد، خێڵی کوردی بلّباس لە «ترکەش»ەوە دەستیان بەسەرکێشی کرد و پەلاماری موکریانیان دا و خاکی محال و سوندز و دەهدەم و شنۆیان گرت و خستیانە ژێردەستی خۆیانەوە، بۆ ورمێشیان دەستدرێژ کرد و هەڕەشەیان لە ورمێ و تەوریز کرد.

ساڵی ١١٤٨ ئیبراهیم خانی زەهیرودەولەی برای نادر شا کە سپەهـ سالار و سەرداری هەموو ئاوربایەگان بوو، لەگەڵ شازادە نەسروڵلا میرزای کوڕی نادر شادا لەشکریان هەڵگرت و چوونەسەر بلّباسان و لە دوای شەڕ و کوژتار، گەلێک لە بلّباسان کوژران و لە دوامینا تەنگەیان پێ هەڵچنرا و شکاندران و نزیک ١٠٠٠ کەسیان لێ کوژرا و هەڵاتن و چوونە ترکەش و سەنگەریان گرت و بۆ بەرابەریی ئامادەبوون. لەو شەڕەدا دوو پیاوی گەورە لە بلّباس کوژران و نزیک ١٠٠٠ ماڵیان پووچ کرایەوە.

## کوردی شارەزوور و نادر شا

ساڵی ١١٤٠ نادر شا لە کێوەکانی لوڕستانەوە چووە سەر کرماشان. حوسێن قولیخانی زەنگەنە، کە سەردارێکی کورد و گەورەی سوپای نادر شا بوو، بە٥ هەزار کەسەوە چووە سەر کرماشان و گرتی و گەلێک جەبەخانەی ڕۆمییانی تالان کرد. قەڵا کۆنەکەی کرماشانی ڕووخاند و لەو قایمتری دروستکردەوە.

خانەک پاشای بابان کە لەوە ئاگادار بوو هاواری لە تەیموور پاشای میللی کرد کە کۆمەگی بکات. ئەویش بە٣ هەزار کەسەوە فریای کەوت، لە دەشتی مەلایر بۆ پێش بەنادر شا گرتن سەنگەریان دروستکرد.

نادر شا لە هەمەدانەوە ڕوو بەمەلایر چوو و لەو دەشتەدا هەردوولا کوژتاریان لێک کرد. بەگوللەی تۆپ و تفەنگ یەکتریان ئاور باران کرد. گەلێک پاشا و حاکمی هەشتەر و لە دەست نادر شا گرفتاربوون. عەبدوڕەحمان پاشای والی هەمەدان بۆ سنە هەڵات.

سەلیم بەگی بابان پێشی بەنادر شا گرت و گەلێکی کوژتار لێ کرد. نادر لەبەرئەوە لەگەڵ خانەک پاشای بابان ڕێک کەوت و ڕوو بەئاوربایەگان ڕۆیشت؛ هەروەکو لە باسی موکریانا گوترا.

ئەحمەد پاشای والی بەغدا لەوە کەوتە ئەندێشەوە و قاقەزی بۆ خانەک پاشا نویسی کە هەموو سنوورەکان بەسەختی بگرێ و ئەحمەد پاشای باجەلانی کردە حاکمی زەهاو و لەشکر و پێویست و جەبەخانەی بۆ نارد.

ساڵی ١١٤٣ شا تەهماسب کە لە ئێرەوان و تەورێزەوە بەشکاوی ڕوو بەهەمەدان چوو، خانەک پاشا لە «گورگان» پێشی پێگرت و شکاندی و چەک و تفەنگ و ماڵێکی زۆری لێ بەتاڵان گرت.

ساڵی ١١٤٤ نادر شا بەشارەزوورا گرتنی بەغدای خستە پێش و مانگی جەمادی دووەم لە کێوەکانی لوڕستانەوە ڕوو بەکرماشان چوو و گرتیەوە. خانەک پاشا ئەگەرچی گۆشەگیریی نیشاندا بەڵام کۆمەگی ئەحمەد پاشای باجەلانی کرد و لە زەهاو ئامادەبوون.

ئەحمەد پاشای والی بەغدا کە بهیستیەوە نادر شا لە ماهیدەشت خیوەتی هەڵداوە و تەمای چوونە سەر شارەزوور و کەرکووکی هەیە، هێندێک لەشکر و چەند پاشایەکی ناردنە زەهاو و جێگا سەختەکانیان بەتۆپ و سەنگەر دامەزراند.

نادر شا بەئومێدی شەوەیخون لە کێوی «گاوروان» سەرکەوت و بۆ ڕۆژاوا ڕوو بەدوژمنی سەرەوژێر چووە خوارێ و بەشەو و ڕۆژێک ئەو ڕێگا دوور و سەخت و بڵندەیان تێکەوە پێچا و ڕکێفکوت هەڵمەتی بردە سەر زەهاو و لەگەڵ سپێدەی بەیانی گەیشتە سەر ئەحمەد پاشای باجەلان. ڕۆژی ٢٤ی جەمادی دووەم دەورەی کوردەکانی باجەلانی دا. لە دوای شەڕ گەلێک لە پاشایانی ڕۆم و ئەحمەد پاشای کوردی باجەلان و کوردەکانی دیکە بەدیل چوون.

نادر شا گەلێک تاڵانی بەدەستکەوت و سوارە و پیادەکانی بەدێهاتی کوردستانا بڵاوکردەوە، دەستیان بەدانەوێڵە و مەڕ و چەور کۆکردنەوە کرد و لە ڕێگای «قەڵای عەلی بەگ»ەوە ڕوو بەکەرکووک ئاژۆتی و لە خورماتوو لەشکربەزی کرد و دەوروپشتی کەرکووکی تاڵانکرد. ئەو خاکە بەجارێک پێ پەست کرا و. لە خێڵی بەیات ١٠ هەزار ماڵی بارکرد و ناردنیە خاکی خوراسان. نادر شا ٧ هەزار شەڕکەریشی ناردە سەر کەرکووک و بۆ خۆشی لە ڕێگای قەرەتەپەوە ڕوو بەبەغدا لەشکری ئاژۆت.

لە قەرەتەپە قاقەزی خانەک پاشای بابانی پێگەیشت کە بەسەلیمی برای خۆیا ناردبووی؛ لە لایەن نادر شاوە سەلیم بەگ نوازش کرا. ڕۆژی دووەم نادر شا بۆ بەغدا دەچوو، لەولاوە محەمەد پاشای کورد حاکمی «کۆی» لە لایەن ئەحمەد پاشای بەغداوە

ناردرابووە پێش نادر شا و لە ئینگیچە ڕووبەڕووی بەکتربوون و دەستیان هاوێژتە شەڕ و کوژتار. لەشکری ئەحمەد پاشا تەنگەتاو کرا و ڕوو بەبەغدا شکا و هەڵات. کوردێکی زۆر لەو شەڕەدا کوژرا و گەلێکیشی بەدیل گیران. نادر شا بەوهێز و توانایەوە ڕۆیشت، ڕۆژی سێشەمەی ٢ی مانگی ڕەمەزان گەیشتە کەنار بەغدا.

ئەحمەد پاشای بەغدا ٣٠٠٠ شەڕکەری لەژێر فەرماندەی ئەحمەد پاشای والی ئورفە و قەرە مستەفا پاشادا ناردنیە پێشەوە.

نادر شا فەرمانی دا بەسەلیم بەگی بابان کە بەدەستەسوارەی قەڵاچوالانەوە هەڵمەت بباتە سەر قەرە مستەفا. ئەویش شێرانە هەڵمەتی برد، بەڵام لە دیوارانی قەڵا و بورجی شارەوە بەتۆپ و تفەنگ و خومپارە ئاورباران کران و گەلێک لە کوردی قەڵاچوالان بەکوژت چوون.

نادر شا تورکمانی گوگەلانی ناردە پێشەوە و سوارە ئەفغانیش بەکۆمەگیانەوە چوون و سەرلەنوێ شەڕ گەرم کرا. لەو شەڕ و کوژتارەدا تەنگە بەنادر شا هەڵچنرا و شکاندرا. کوردەکان زۆر بەشپرزەیی لەو مەیدانەدا خۆیان ڕزگار کرد.

دەورەدانی بەغدا و شەڕ و کوژتار هەتا مانگی سەفەر و ساڵی ١١٤٥ ڕاگیرابوو. بەڵام لەودەمەدا تۆپاڵ عوسمان پاشای سەرعەسکەر بەسەد هەزار شەڕکەرەوە گەیشتە کەرکووک. لەوەدا ئەحمەد پاشای والی بەغدا نادر شای تەنگەتاو کرد، لە مانگی سەفەرا لەشکری نادر شا برسی و تینوو مایەوە و پەرێشان بوو، ناچار ڕوو بەهەمەدان هەڵات و گەڕاوە.

سەلیم بەگی بابان بەئیزاو (ئەزیەت) خۆی و چەند کەسێکی ڕزگاربوون و هەڵاتن و چوونەوە کوردستان. لە ٢ هەزار کوردی ئەردەلان و ٥٠٠ کوردی موکریان پیاوێکیان بەساغی نەگەڕاوە و هەموو کوژران و مردن و بەدیلچوون و پەرێشان کران. هەر بەو جۆرە لەشکری نادر شا کە دوو بەشی لە کورد پێکهاتبوو، هەمووی ڕزگار نەبوون.

کە نادر شا هەڵات تۆپاڵ عوسمان پاشا گەیشتە کەرکووک ئەحمەد پاشای والی بەغدا لە خانەک پاشای بابان ڕەنجیدە بوو، لەوە کەلێنی دەستکەوت و خانەک پاشای خواستە بەغدا. ئەویش باوەڕی نەدەکرد، خالید پاشای ناردە خۆشهاتنی تۆپاڵ عوسمان پاشا و بۆ خۆشی خەڵەتاندرا و چووە کەرکووک، سەلیم بەگی کردە جێگانشینی. خانەکە پاشا کە گەیشتە کەرکووک بەخۆشی ونوازش ڕاگیرا و ناردرایە بەغدا. بەشەو لە خەوا خەفە کرا و کوژرا. سبەینەی ١٥ ڕەبیع جەنازەکەی ناردراوە کوردستان و خالید پاشاشیان کردە فەرمانڕەوای شارەزوور.

تۆپاڵ عوسمان پاشا بەبەخشش و هەڕەشەو دڵخۆشی دانەوەی شیعەتی و سونەتی هانی کوردەکانی دا و بۆ شەڕی چڕکردن. خالید پاشای بابان و مەمش پاشای بە ٢٠ هەزار کەسەوە ناردە چۆمی دیالە و جێگا سەختەکانیان کردە سەنگەر. پۆلاد پاشا و محەمەد پاشاش چوونە یارمەتی و کۆمەگی کردنیان. لە پاش مانگێک و لەسەر خواستنی تۆپاڵ عوسمان، خالید پاشا لە دیالەوە چووە کەرکووک.

ساڵی ١١٤٥ نادر شا قاقەزی بۆ هەموو گەورەکانی شارەزوور و سەلیم بەگ نوبسی و باوەڕی پێکردن و بۆ خۆشی بەلەشکرەوە چووە سەر دیالە. ڕێگای ٨ ڕۆژانی بە٢ شەو و ٢ ڕۆژان پێچاوە و گەیشتە سەر مەمش پاشا. ئەوانیش لە هەڵاتن بەولاوە چارەیەکیان نەدۆزیەوە، هەموو گرانەبار و جەبەخانەیەکی کە هەیانبوو بەجێیان هێشت و هەڵاتن. لەشکری نادر شا ٥ سەعات ڕێگایان ئاژۆت و ماڵ و چەک و دیلێکی زۆریان لێگرتن.

تۆپاڵ عوسمان پاشا دەوروپشتی قەڵای کەرکووکی سەختکرد و بەخالید پاشای گوت کە سەلیم بەگ بخوازێتە کەرکووک و بەلەشکرەوە ئامادەبێ؛ ئەویش ئەوەندە بەهێندی نەگرت. تۆپاڵ عوسمان فەرمانی دا بەمحەمەد پاشای حاکمی کۆی (قوچ پاشا) کە بڕواتە هەولێر و لەشکرێکی قورس لە کوردان تێدابێت و قەڵای توندکات.

تۆپاڵ عوسمان پاشا لەشکری کوردی شیمال و شارەزوور و سۆران و بادینانی ناردە دەرەوەی قەڵای کەرکووک و لە سەنگەردا دایمەزراندن.

نادر شا لەولاوە ڕوو بەکەرکووک بزووت و هەرچیەکی هاتەپێشێ پایەماڵی کرد و ١٥ی جەماد گەیشتە بازارچەی لەیلان کە ٣ سەعات لە کەرکووک دوورە؛ ئەوێی کردە لەشکربەز. تۆپاڵ عوسمان لە قەڵادا خۆی پەستاوت. نادر شا لەشکرەکەی کردە ٣ بەش: دەستەیەکی لەگەڵ خۆیا هەڵگرت و چووە سەر قەڵای کەرکووک، دەستەیەکیشی بەدێهاتا بڵاوکردەوە کە تاڵان بگرن، دەستەیەکیشی لەسەر گرانەبار دانا.

نادر شا لە «عەلەمداران» ڕوو بەقەڵای کەرکووک وەستا و دەستی بەشەڕ و کوژتار کرد. لەشکری دەرەوەی قەڵا لە دەست نادر پاشا شپرزە کرا و شکاندرا و هەڵاتن. چادر و تۆپ و جەبەخانەیەکی قورسی کەوتە دەست نادر پاشا. ئەو هەموو کوژتارە لە لەشکری تۆپاڵ عوسمان پاشا کرا کەسێک نەچوو بەهاواریەوە. نادر شا ٢ ڕۆژ دەورەی قەڵای دا و شەڕکەرێکی نەدی، قاقەزێکی زۆر سووکی بۆ پادشاکان ناردە نێو قەڵاوە، ئەوەش نەیبزاوتن. ڕۆژی سێیەم هەروەها کەسێک وەڵامی نەداوە.

نادر شا لەشکرێکی ناردە سەر قەڵای «سووورداش» کە لە دەست بلباسدا بوو. میرزا مەهدی لە مێژووەکەیا دەڵێت: جێگای ئەساسی کوردی «بنە و بلباس» بوو، دانەوێڵە و تێشو و ماڵ و موڵک و دەوڵەتێکی پڕ لە قیاس و تەواناى تێدابوو. ئێل و عەشیرەت و گەلی ئەو دەوروپشتە، بۆ ئەوەی خۆیان لە شۆڕش بپارێزن چووبوونە نێو ئەو قەڵایەوە؛ چونکە جێگایەکی زۆر سەخت بوو.

نادر شا لە ڕێگای «ئاقلەربەند»ەوە چووە سەر سووورداش و دەورەی دا. کوردەکان بۆ شەڕ پێشیان پێگرت. نادر شا کوردەکانی وەتەنگهێنا و دەورەی دان و لە قەڵای پەستاوتن و دێهاتی ئەو دەوروپشتەشی تاڵان کرد. لە دوای ۳ ڕۆژان شەڕ و کوژتار و قەڵا دەورەدان، لایەکی قەڵای ڕووخاند و لەشکری ناردە نێو قەڵاوە و هەموو دانیشتوو و خەڵکی قەڵای بەژن و منداڵەوە کوژتن و هەرچیەکی تێدابوو بەتاڵان بردنی.

نادر شا کە قەڵای سووورداشی گرت ڕوو بەخاکی شارەزوور لەشکری ئاژۆت و دانەوێڵە و تێشوویێکی زۆری کۆکردەوە و ناردیە لەشکربەزی «جەمشا». لە پاش ئەوە لەشکر و بنەی نادر شا چوو لە قەرەتەپە داندرا، بەتۆپاڵ عوسمان پاشایان گوت کە نادر شا هەڵدێت؛ چونکە هەموو هێزەکەی لە جەمشا داناوە.

تۆپاڵ عوسمان ئەوەی بەڕاست زانی و لەشکرێکی دا بەمەمش پاشا کە بڕواتە سەر نادر شا و نەهێڵێ بەبێ شەڕ لە شارەزوور دەرکەوێ.

مەمش پاشا چووە «دەربەندی بازیان» - کە حەوت فرسەنگ لە سووورداش دوورە - لەشکربەزی کرد و سەنگەر و مەتەریزی دروستکرد و تێیدا دانیشت.

نادر شا لە سووورداشەوە لەشکرێکی هەڵگرت و لە پیادە ڕێگایەکی کە مەمش پاشا گومانی پێنەدەبرد، ئاژۆتی.

ڕۆژی شەممە یێکەمینی مانگی جەمادی یەکەم لە ڕێگای «بازین» (بازیان)ەوە هەڵمەتی بردە سەر دەربەند و نزیک سپێدە بەسەرلەشکری مەمش پاشای دادا و دەستی بەکوژتار کرد.

لەولاوە تۆپاڵ عوسمان پاشا کە مەمش پاشای ناردە سەر نادر شا پەشیمان بووەوە و گوتی ئەو سەرکەوتنە زلە بەدەست خۆمەوە [بێ و نابێ] مەمش بیکات، بۆ ئەو بەدنامییە. سواری تەختی ڕەوان بوو، ڕوو بەدەربەند لە کەرکووک دەرکەوت، ئاگای لە نادر شا بڕابوو. گەیشتە نێو لەشکری مەمش و خەریکی لەشکر ڕێکخستن و سەنگەر

دروستکردن بوو. لەناکاو نادر شایان گەیشتە سەرێ و دەستی بەتالان و کوژتار کرد. بەکەم چاخێک ١٠ هەزار کەسی لە ڕۆمییان کوژت.

تۆپاڵ عوسمان پاشا کە وایزانی، هەڵاتنی بەشەرەف زانی و ڕێگای کەرکووکی گرتەپێش و بۆی دەرچوو. لە ڕێگادا «ئەڵلایار» ناو کوردێک پێی گەیشت و کەللەسەرەکەی بۆ نادر شا بەدیاریی برد. هەتا نیوەڕۆی ئەو ڕۆژە نادر شا هەموو هێزەکەی تۆپاڵ عوسمان پاشای بڵاو کرد و گرتنی و تالانی کردن و خستنیە ژێر پەنجەوە. لەوانە ٥ هەزار کوردی ژووروو (شیمال) بوون. نادر شا لە دوای ئەو سەرکەوتنە خالید پاشای بابانی کردەوە بەحاکمی شارەزوور، لەشکرێکی قورسی ناردە سەر حیللە و کەربەلا و نەجەف کە بیگرن و بۆ خۆشی چووە خورماتوو، لە دواجار گەڕاوە خاکی ئێران.

ساڵی ١١٥٦ نادر شا بەلەشکرێکی زلەوە، جاری سێیەم بۆچوونە سەر شارەزوور و بەغدا سوپاهێکی ڕێکخست. چونکە فتوایەکی زۆر خراپ لە ئەستەمبووڵەوە ناردرابووە مووسڵ، نادر شاش لەوە ڕقی هەستا و بەجارێک گرتنی شارەزوور و بەغدای خستە پێشەوە.

٤ی مانگی ڕەبیعی یەک نادر شا بەلەشکرەوە گەیشتە شاری «سنە» و دەستە لەشکرێکی ناردە سەر بەغدا. خالیدخان پاشا و سەلیم بەگی بابان چوونە پێشوازی و لە سنە گەیشتنە نادر شا. زۆر بەخۆشی نوازش کران. هەموو گەورەکانی کوردی لەسەر کۆبووەوە.

ئەحمەد پاشای والی بەغدا کە لەوە ئاگاداربوو، قاقەزێکی بەهەڕەشەی بۆ نادر شا نارد.

خالیدخان تکای کرد کە نادر شا لە قەڵاچوالانەوە بڕواتە سەر بەغدا. لەشکری نادر شا لە خانەقینەوە ڕوو بەبەغدا ڕۆیشتن. نادر شا و ئومەرا و گەورەکانی کوردیش بەمیوانداری چوونە قەڵاچوالان و چوار ڕۆژ لەوێ میوانداری کرا. لە پاشا سواربوون و لە نزیک کەرکووک، لەیلانی کردە لەشکربەز.

خەڵکی کەرکووک قەڵایان گرێدا و بۆ شەڕ ئامادەبوون. نادر شا ٦ ڕۆژ قەڵای ئاورباران کرد و وەتەنگی هێنا. ڕۆژی ٢١ ڕەبیعی یەک خەڵکەکە ئامانیان خواست و نادر بەکەیفەوە برایە نێو قەڵاوە. ڕۆژی دووەم لەشکرێکی ناردە سەر هەولێر، لە پاش گەلێک شەڕ و کوژتار قەڵای هەولێریش گیرا.

هەڵاتووەکانی ڕۆم هەموو پەنایان بردبوو بۆ مووسڵ و هاواریان لە کوردەکانی کۆی و

هەربر کرد کە بەکۆمەگیانەوە بچن. قۆچ محەمەد پاشای حاکمی کۆی لەشکری کوردی هەڵگرت و چووە مووسڵ. لە کوردی بادینانیش کۆمەگیان خواست؛ ئەوانیش فریایان کەوتن و هێزێکی تەواوی کورد لە مووسڵ کۆبوونەوە.

لەودەمەدا خالیدخان پاشای بابان بەبەهانەی چوونە سەر هەولێر هەڵات و چووە ئورفە. سەلیم بەگی بابان کرایە فەرمانڕەوای بابان، خەڵاتکرا و ناویان نا «سەلیمخان».

نادر شا بەلەشکرەوە لە کەرکووک دەرکەوت سەلیمخان لەتەکیا چووە هەولێر و شەوێک لە هەولێر مانەوە و بۆ سبەینێ چوونەسەر مووسڵ. لەسەر زێی گەورە لەشکری نادر شا و قۆچ محەمەد پاشا ئامبازی یەکتربوون. لە دوای گەلێک شەڕ و کوژتار قۆچ پاشا هەڵات و لە تاریکی شەوا ڕوو بەمووسڵ گەڕاوە. نادر شا سبەینێ چووە مووسڵ و لە نزیک گۆڕی یوونس پێغەمبەر لەشکربەزی کرد.

خەڵکی مووسڵ بەگەورە و کەیخودایەوە چوونە لای. و بەمامڵەت دەستی لە شەڕ و کوژتار بەردا و گەڕاوە «قەرەتەپە». لە مانگی ڕەمەزاندا و بۆ زیارەتی عەتەبات چووە کەربەلا و نەجەف. هەولێر و کۆی و کەرکووک کەوتە ژێر فەرمانی سەلیمخانی بابانەوە. ئەوەش دوایی هات.

لەوەپێش ئەحمەدخانی کوڕی سوبحان وێردیخانی بەگلەربەگی ئەردەلان هەڵات و چووە دیاربەکر و لەوێ مایەوە. لەودەمەدا بۆ فەرمانڕەوایی ئەردەلان و شارەزوور ڕۆمییەکان هانیان دا و خستیانە هەوەسی چوونە سەر سەلیمخان.

ئەحمەدخان بەناوی خەلافەتی ئیسلامیەتەوە داوای کۆمەگی لە کوردەکان کرد. بەکەم چاخێک ٨ هەزار کورد لە دیاربەکر بۆ ئەحمەدخان کۆبوونەوە. لە بابان و بلّباس ئەوەی هەڵاتبوون چوونە لای. لە دیاربەکرەوە بۆ مووسڵ و لەوێشەوە بۆ سەر شارەزووریان لێخوڕی.

سەلیمخانی بابان لەشکری هەڵگرت و چووە پێش ئەحمەدخان و لە نزیک مووسڵ پێشی پێگرت. ساڵی ١١٥٨ دوو برا کورد دەستیان بەکوژتاری یەکتر کرد. لە مانگی ڕەجەبدا ٣ شەوان خوێنی یەکتریان ڕژت. لە دواییدا ئەحمەدخان شکا و سەلیمخان سەرکەوت. لەو شەڕەدا زابتێکی ڕۆم کەوتە دەست سەلیمخانەوە و بەدیاریی بۆ نەسروڵلا میرزای کوڕی نادر شای نارد. سەلیمخان لە ١٢ی مانگی شەعبانی ئەو ساڵەدا گەڕایەوە قەڵاچوالان. سەلیمخان هەر ١٨ ساڵ فەرمانڕەوایی بابانی کرد.

## ٨- کوردی تاڵش و نادر شا

کوردەکانی تاڵش لە دەوری پشێوی سەفەوییەکان و سەرکێشی ئەفغان لە خاکی ئێرانا گۆشەگیر بوون و هەر هێندەیان پێکرا کە سەربەخۆ خۆیان بەخێو کەن.

مووساخانی سەرداری تاڵش کە حاکمی ئوستراباد بوو، هەموو کوردەکانی تاڵشی لەژێر فەرمانی خۆیا کۆکردەبوو وە و زۆرچاک بەخێوی دەکردن. حکوومەتی عوسمانی کە خاکی قەفقازی گرت، مووساخان لە تەکیانا ڕێککەوت و لەسەر حکوومەتی خاکی خۆی دامەزراوە.

ئەیالەتی شێروان و داغستان درا بەسورخابخانی لەگزیە. کورد و لەگزییەکان زۆر بەشپرزەیی ڕایاندەبوارد؛ بەڵام چونکە هەردوولا سوننی بوون و حکوومەتی عوسمانیش هەروەها، ئەوەیان بەخواهی و ناخواهی پەسند کردبوو و ناچار ڕایاندەبوارد.

ساڵی١١٤٦ نادر شا لە ئاوربایەگانەوە تەمای چوونە سەر قەفقازی هەبوو، ئومێدێکی قورسی [بە] کۆمەگی و یارمەتی کوردەکان بوو، هەروەکو هەموو کوردێک کۆمەگیان کردبوو. بەو ئومێدە مانگی ڕەبیعی دووەم چووە ئەردەوێل و لەتەک مووساخانی تاڵشیدا موخابەرەی کرد. مووساخان بۆ کۆمەگی کردن و یارمەتی پەیمانی دا. نادر شاش ئەیالەتی شێروان و داغستانی بەمووسا بەگ بەخشی.

کوردەکانی تاڵش بەبێ شەڕ و کوژتار و ئیزاو کەوتنە ژێر فەرمانی نادر شاوە. بۆچوونە سەر خاکی شێروان و گەنجە و تفلیس لەشکریان بۆ کۆکردەوە.

نادر شا بەلەشکری کوردەکانی تاڵشەوە پەلاماری شێروانی دا و گرتی و چووە سەر تفلیس و ئێرەوان و گەنجە و گرتنی. بەدڵێکی خۆشەوە ئەیالەتی مووساخانی خاوێن کردەوە و بەبێ دڕک و زەحمەت بۆی دامەزراندرا. کوردەکانیش لەو چووینەدا بەدڵێکی خاوێن کۆمەگی نادر شایان کرد. (تەئریخی نادری - لاپەڕە ١٣٨).

## ٩- کوردی زەنگەنە و نادر شا و حوسێن قولیخانی زەنگەنە

ساڵی ١١٢٠ حوسێن قولیخان کەوتە ڕیزەی ئومەرایانی سەفەوییەوە و لەکن شا سوڵتان حوسێنی سەفەوی زۆر بەڕێز بوو و گەلێک بەخۆشەویستی و دەستدرێژی ڕاگیرا و ڕۆژ بەڕۆژ پایەی بڵند دەبوو.

ساڵی ١١٢٢ شۆڕش کەوتە ئێرانەوە. توشمال (تایفە)ی غلیجایی و ئەفغان کە

سەرکێش بوون، کەوتنە خاکی سەفەوییەکانەوە. حوسێن قولیخان لەگەڵ وەلیعەهد تەهماسب میرزایا چووە قەزوێن کە لەشکر کۆبکەنەوە و بۆ پێش بەپشێوی گرتن، ئەفغانەکان سەر نەرم کەن. تەهماسب کە لە ئیسفەهان دەرکەوت، ئەفغانەکان زۆریان هێنا و شار و حکوومەتیان گرت و خستیانە ژێر پەنجەی خۆیانەوە. تەهماسب میرزا کە چووە قەزوین تێگەیشت کە شا سوڵتان حوسێن کوژراوە و لەناوچووە؛ خۆی بەپادشا ناونا و لەسەر تەختی پادشاهی دانیشت و لەشکر و هێزی کۆکردەوە و حوسێن قولیخانی کردە سەردار سوپا.

ساڵی ١١٢٧ عەلی پاشای سەرعەسکەری رۆم لە گەنجەوە ڕوو بەئەردەوێل لەشکری برد. لەولاوە ئەفغانەکان لە کردەوە و تێکۆشانی شا تەهماسب گەیشتن و لەشکرێکیان ناردە سەر. تەهماسب و حوسێن قولیخان ڕوویان لە ئاوربایەگان کرد و چوونە ئەردەوێل و لەوێ جێگیربوون و دانیشتن.

کە زانیانەوە عەلی پاشا ڕوو بەئەردەوێل دەچێت، تەهماسب و حوسێن قولیخان لە ئەردەوێل دەرکەوتن و بەری خۆیان کردە خاکی ڕەی و ڕوو بەتاران ڕۆیشتن. لە ڕێگادا حوسێن قولیخان بەگژ قزلباشی سەلمانابادی چوو و لە نزیک تاران شکاندی. لەوێوە ڕوو بەمازندەران و ئوستراباد ڕۆیین.

حوسێن قولیخان کە کۆمەگی شاه تەهماسبی دەکرد، وای بەچاک زانی کە فەتح عەلیخانی قاجار بکا بەحاکمی «سەمنان» و بەهێزێکەوە ناردیە سەر تاران کە بەگژ ئەفغانا بچێت. فەتح عەلیخان لە دوای چووین سستی کرد و گەڕاوە پاش.

حوسێن قولیخان بەو دەستوور و ئیزاوە بەرای شا تەهماسبی دەکرد و بەڕاستی و دروستی لەگەڵیا بوو و چاکە و باشی نیشان دەدا و کۆمەگی دەکرد. لە هیچ ئیزاو و شپرزەیەکی کە ڕووی دەدا بەجێی نەدەهێشت و هێزی بۆ پەیدا دەکرد و پشتیوانی و تەوانایی بۆ ڕێکدەخست و هەتا گەیشتە دەورەی نادری، هەموو ئیش و هێز و گەورەیی و پادشاهی تەهماسب، حوسێن قولیخان بوو. هەموو لاپەڕەکانی مێژووی ئەو چاغەی ئێران شوکر و سوپاس و ستایشی حوسێن قولیخانی زەنگەنە دەکەن.

ساڵی ١١٣٩ لە لایەن نادر شا و شا تەهماسبەوە حوسێن قولیخان کرا بەسەردار سوپای گەیلانان و ناردرا. ئەو خاکە لە دەست «ڕووس» دابوو؛ حوسێن قولیخان بەزۆری بازوو ئەو خاکەی لە ڕووس پاککردەوە و هەتا تخووبی خاکی ئاوربایەگانی خستە ژێر

فەرمانی خۆیەوە. چەند سەرکێشێکی کەتیابوون ڕامی کردن و حوککام و گەورەی ئەو خاکەی هەموو هێناوە دەست و سەری پێ نواندن و بەجارێک ئاسوودەگی خستە نێویانەوە. (تەئریخی نادری. لاپەڕە ٥٠).

سالّی (١١٤١) ئەشرەف عێلجای ئەفغان کە حوکمڕانی ئەسفەهان بوو، بەلەشکرەوە چوو بۆ سەر خوڕاسان کە تەهماسب لەوێ بوو؛ لە لایەن نادر شاوە شکاندرا. نادر شا فەرمانی دا بەحوسێن قولیخانی زەنگەنە کە بەلەشکری گەیلان و ئەو خاکەوە بگاتە نێوانی قەزوێن و تاران و فریای تەهماسب بکەوێ و بەگژ ئەشرەفدا بچێت.

قولیخان بەلەشکرەوە ڕوو بەساباڵاغێ بۆ تاران ڕۆیشت و لە ساباڵاغ ئەفغانی شکاند و چووە سەر قەزوین. لە دەرەوەی شار سێدالخان (سیدال)ی سەرکردەی ئەفغان کە حاکمی قەزوین بوو پێشی بەحوسێن قولیخان گرت و لە دوای شەڕ و کوژتار سێدالخان پووچ و پەرشوبڵاو کرایەوە. سێدالّخان هەڵات و ڕوو بەئەسفەهان بوّی دەرچوو. کوڕی سێدالّخان لە ئەرگی قەزوین قەڵابەندیی کرد. حوسێن قولیخان لە پاش کەمێک دەورەدان گرتی و قەزوینی لە ئەفغان پاککردەوە و بەنادر شای ڕاگەیاند و ئاغورخانی کردە حاکم و لەسەری دانا.

نادر شا زۆر منەتدار بوو و ڕەزا قولیخانی شاملووی کردە فەرمانڕەوای قەزوین. حوسێن قولیخانیش بەلەشکرەوە چووە سەر فەراهان و گوڵبایەگان کە لەوێ لەشکری ڕۆم هەبوو. بەزۆر و شەڕ و کوژتار ئەو خاکەی لە ڕۆمیان پاککردەوە. نزیک ٤٠ ڕۆژ لەوێ ڕایبوارد و فەرمانڕەوایی کرد.

سالّی ١١٤٢ی مانگی شەعبان نادر شا چووە خاکی لوڕستان و لە بروجەرد دابەزی بوو. کە حوسێن قولیخان گەیشتە لەشکربەزی نادر، لە لایەن نادر شاوە نوازشکرا و ئەیالەتی کرماشانی پێدرا و بەپێنج هەزار کەس شەڕ کەر و ئازاوە چوون سەر کرماشان وگرتی و ئومووری فەرمانڕەوایی تێدا دامەزراند. دیواری قەڵاکەی کون ببوو، ڕووخاندی و دیوارێکی تازەی بۆ دروستکردەوە.

چاخێ کە خەڵاتی ئەیالەتی کرماشانی لەبەرکرد. ٥ هەزار سوارە و پیادەی هەڵگرت و لە بروجەرد دەرکەوت. ڕێگای ڕاستی نەگرت و لە کێوەکانی فەیلییەوە چووە خوارێ و هەتا دوو فرسەنگی کرماشان ڕانەوەستا. حەسەن پاشا کە ڕۆمییەکان کردبوویانە والی ئەو خاکە، چووە پێش. لە دوای کەمێک شەڕ تەنگەی پێ هەڵچنرا و شکاندرا. خێڵی

ئۆزبەگییە و کەلهوڕ نەختێک سەرکێش بوون، بەڵام ئەوانیش ڕامکران. حەسەن پاشا جەبەخانە و تۆپ و بنەی بەجێهێشت و هەڵات. حوسێن قولیخان چووە نێو شارەوە. حوسێن قولیخان هەتا ساڵی ١١٦٠ هەر لەسەر کرماشان بوو، زۆر دڵپاک و ئازا و گەلێک پەراشی هەبوو.

## عەبدولباقیخانی کوڕی حوسێن قولیخان زەنگەنە

عەبدولباقیخانی کوڕی حوسێن قولیخان لە تەمەنی بیست ساڵیدا کەوتە ڕیزی ئومەرا و گەورەی سوپاهی نادر شاوە. لەبەر ئازایی و زرنگی خۆی، ڕۆژ بەڕۆژ ڕوو بەرەو ژوور دەچوو و هەمیشە لە بارەگاهی نادر شادا مدەبیر و یەکە زانای بەتایبەتی و ئەمینداری هەموو ئوموور و ئیشێکی شاهی و خۆشەویستی هەموو سەردار و گەورەیەک بوو.

ساڵی ١١٤٧ نادر شا کە دەورەی «گەنجە»یدا عەلی پاشای والی ئەو جێگایە وەتەنگ هێنرا، ناچار بوو کە چەند کەسێکی گەورەی شار بەئێلچی و تکاکاری ڕەوانەی لای نادر شا بکا تاکو بەمامڵەت پێکبێن. ئەو گەورە و کەیخودایانە کە چوونە کن نادر شا و بەخۆشی برانە پێشگای و فەرمانی ئامانی ئەوانەی دا بەعەبدولباقیخانی زەنگەنە و لە تەکیانا ناردیە گەنجە. عەبدولباقیخان کە چووە گەنجە عەلی پاشای بەدەستووری گەوران نوازشکرد و بەزبانخۆشی دڵنیای کرد و هێنایە سەر باوەڕی. لە ١٧ مانگی سەفەری ئەو ساڵەدا چەند کەسێکی دیلگیراوی ئێرانی و هەموو جەبەخانە و تۆپ و چەکی دایە دەست عەبدولباقیخان و پەیمانیان بەست کە لەگەڵیا بچێتە لای نادر شا.

عەلی پاشا لەتەک عەبدولباقی خانا هەستا چووە پێش دەمی نادر شا. لە دوای خەڵات و نوازش دڵنیا کرا. عەلی پاشا دیاری و پێشکەشێکی کە بردبووی، نواندی و بەرەهبەری و پشتیوانی عەبدولباقیخان ناردرایە قارس و بەخۆشی بەرێیان کرد و پاسەوان و پیاویان لەگەڵ خست و بردیان لە قەڵای قارس دایاننا و گەڕانەوە.

نادر شا لە دوای گرتنی تفلیس قاقەزێکی لە سوڵتانی ڕۆمەوە بۆی چوو و تێیدا نویسرابوو کە عەلی پاشای سەر لەشکر ناردرایە لاتان تاکو بناغەی دۆستیی و ئاشناتی دامەزرێنێت.

نادر شا ئەو دیدەنیەی واگوزاری عەبدولباقیخانێ کرد و بۆ دیتنی سەر لەشکر، عەبدولباقیخان داندرا کە قسەی لەگەڵا بکات و لەتەکیا پێک بێت و هەرچۆنێک بێ، سوودی نیشتمانەکەی بەجێ بێنێت.

عەبدولباقی خان لە گەنجە دانیشت و چاوەنۆڕی هاتنی ئەو سەر لەشکرەی کرد، لە مانگی ڕۆژووی ئەو ساڵەدا سەر لەشکر گەیشتە گەنجە. لە پاش پێکهاتن و پەیمان گرێدان، عەبدولباقی سەرلەشکری هەڵگرت و بردیە پێشگاهی نادر شا کە ئەودەمە لە دەشتی موغاندا لەشکربەزی کردبوو. تەئریخی نادر لاپەڕە ١٥٩ دەڵێت:

لەودەمەدا هەموو ئومەرا و گەورە و سەرکردەی سوپا و عولەما و خوێندەوار و تێگەیشتووی ئێران و کاربەدەست و زانا و فەرمانڕەواکان لەو دەشتەدا کۆببوونەوە.

نادر شا لە دەشتی موغان بۆبێ هەموو خەڵکی ئێرانی کۆکردبوونەوە، کە لەسەر تەختی پادشاهی دانیشت. لەو کۆمەڵەدا ڕەوشتی یێکەتی و دۆستایەتی و دەست پێکەوە گرتنی حکوومەتی ئێران و عوسمانی کە هەردوولا حکوومەتی ئیسلامن، دەرمیان کرا. بۆئەوەی ٥ بەند (مادە)یان دانا کە لە خوارەوە دەگوترێ. ئەو بەندانەیان کردە بناغەی پێکهاتن و یێکەتی و برایەتی:

١) مەزهەبی جەعفەری بەمەزهەبی پێنجەمین بناسرێ.

٢) لە مەککەی موعەزەمە بۆ ئەو مەزهەبە ڕوکنێک دابندرێ تاکو بەئاینی جەعفەری نوێژی پێ بکەن.

٣) وەکو ئەمیر حەجی میسر ئەمیر حەجێک لە لایەن حکوومەتی ئێرانەوە بنێرنە حیجاز.

٤) هەردوو حکوومەت یەخسیر و دیلەکان بەبێ فرۆتن بەردەن.

٥) وەکیل و سەفیری هەریەک لەو دوو حکوومەتانە لە پایتەختی یەکتردا دانیشن.

(درێژەی ئەو ڕێککەوتنە لە تەئریخی نادر لاپەڕە (١٦٣) دایە).

نادر شا زنجیرێک فیل و دیاریی گرانبەهای ئامادەکرد کە لەگەڵ سولحنامەکەدا بۆ سوڵتانی بنێرێ. بۆ پێکهێنانی ئەو ڕێککەوتن و پێکهاتنە، عەبدولباقیخانیان پەسندکرد و دیاری و پێشکەش و پەیماننامەکەیان دا دەست عەبدولباقیخان. مەلا عەلی ئەکبەر مەلا باشی و میرزا ئەبولقاسمی کاشییان کردە هاواڵ و لەگەڵیان خست و قاقەزێکی چوونە سەرتەختی ئێرانیان بۆ سوڵتان نویسی و ئەویشیان پێدان.

عەلی پاشای والی مووسڵ کە بۆ پێکهاتن هاتبوو لەگەڵیان کەوت و ڕوو بەئەستەمبووڵ کەوتنەڕێ. لە لایەن حکوومەتی عوسمانییەوە بەخۆشی و شادی پێشوازییان کرا و بەدەبدەبە و کەیفەوە بردیاننە ئەستەمبووڵ و بەنوازش برانە پێشگای سوڵتان و دیاری و پێشکەشەکانیان لەگەڵ پەیماننامەکە خرایە پێش دەمی سوڵتان. بەندەکانی سولحنامەکە

جگە لە دووانی هەمـوو پەسند بوون. ئەو دوو بەندە کـاری عـولەمـای ئیـسلامـە و لەوان دەپرسرا و وەڵامدرانەوە. ٣ بەند لە سوڵحنامەکەیان پەسند کرد، دیاری و پێشکەشێکی زۆر قـورس سـازکران. مسـتـەفـا پاشـای وەزیر و عـەبدوڵڵا ئەفـەندی ئەنەدۆڵی و خـەلیل ئەفەندی قـازیی ئەدرنە بەسەفـیر داندران و لەگـەڵ دیاری و پێشکەشەکـان بۆ ئێـران ناردن ئامادەبوون و لەگەڵ عەبدولباقیخـان خران و لە ڕێگای بەغدا و ئەسفەهانەوە ڕوو بەکرمان ڕۆیشتن.

سـاڵی ١١٥١ پەنجـا ڕۆژ پاش نەورۆز کـە ١٩ی مـوحـەڕەم بوو، لە نادراوا گـەیشـتـنە پێـشگاهی نادر شـا. عــەبدولبـاقی قـاقـەز و دیاری و مـیـوانەکـانی پێـشکەشکردن. بەکەیفخۆشی میوانداری کران و زۆر بەڕێز جێگایان بۆ ڕێکخستن (تەئریخی نادری لاپەڕە ١٨١).

نادر شا هەر لەو ساڵەدا چووە سەر هیندستان و شـاری «دەهلەو»ی گرت. محەمەد شای هیند کە لە دەهلەو دادەنیشت بەلەشکرەوە چووە نێـو لەشکرگای نادر شاوە و چادری هەڵدا و سەراپەردەی حەرەمی ئەو پادشایە لەنێو لەشکربەزی ئێراندا هەڵدرا.

میرزا مەهدی لە تەئریخەکەی لاپەڕە ١٩٤دا دەڵێت: عەبدولباقیـخانی کوردی زەنگەنە کە لە ئەعـازیمی ئومەرایانی نادر شا بوو، بوو بەمەئموور کە لە ڕکابی ئەو پادشاهەی بێ جـێگـایەدا هەمـوو دەمـێک ئامـادەی حزوور بێت و بۆ پێـویستی مـیـوانداری و ڕەوشـتی خزمەتگوزاری بپرژێتە سەر جێبەجێ هێنانی دڵنەوازی و کەیف خۆشی. پیاوێکی گەورەی وەکـو عـەبدولبـاقـیـخـان لە لایەن نادر شـاوە کرایە مـەئمـوور و پادشـاهێـکی وا گـەورەی هیندستانی درا دەستی.

نادر شـا لە پاش ئەوە ڕۆژی دووشـەمـەی یێکەمـینی مـانگی زیلحـیـجـە ڕوو بەدەهلەو لەشکری ئاژۆت، ڕۆژی حەوتی مانگ لە کەنار شار دابەزی و لەشکربەزی کرد.

عەبدولباقی لە پێشگاهی محەمەد شادا کەمەری گرێدابوو و بەنوازش و چاکە دڵی ئەو پادشاهەی خۆش کردبوو. محـەمەد شـا بەتێڕادیتنی عەبدولبـاقی داوای کرد کە بەنادر شا بڵـێت لێی بگەڕێن بگەڕێتـەوە نێـو شاری دەهلەو تاکو تـەدارەکی مـیـوانداری بۆ نادر شـا بگرێت. ڕۆژی هەشـتـەمی مـانگ مـحـەمـەد شا عـەبدولبـاقـیـخـانی هەڵگرت و چوونە نێـو شـارەوە و دەسـتـیـان بەپێـویست سـازکـردنی مـیـوانداری کـرد. ڕۆژی نۆیەم نادر شـا چووە دەهلەو (درێژەی لە لاپەڕەی ١٩٥ تەئریخی نـادر دایە)، ئەوەندەمـان لەو پیـاوە زانیـوە کـە گـوترا.

## ١٠- تەیموور پاشای میللی

تەیموور پاشا لە سەرهاتووی کوردەکانی میللییە. لە زۆر دەمانەوە لەتەک حکوومەتی عوسمانیا شەڕوشۆڕی هەبوو و تەقەڵای ئەدا و تێدەکۆشا کە بەسەر خاکی ئەوا زاڵ نەبن. بەهێزی ئێلەکەی و پشتیوانی کوردەکانەوە بوو بەسەرداریکی گەورە و بەناوبانگ. لە پاشان حکوومەتی عوسمانی ناچاری ئەوەی کرد کە بیکاتە میری میرانی کوردستان، لە پاش ئەوە بەڕوتبەی وزارەت کرا بەوالی و حاکمی وڵاتی وان.

لە شۆڕشی سەفەوییەکان و پشێوی ئێران و سەرکەوتنی ئەفغان و دامەزراندنی حوکمێکی تازەی «غێلجای»دا تەیموور پاشا لەتەک میر و حاکم و بەگ و گەورەکانی کوردی ئاوربایەگانا دەستی بەنویسراو ناردن کرد و لەگەڵیان پێکهات و دڵی گرتن.

لەسەر ئەوە تەیموور پاشا هەستا چووە سەر خاکی ئاوربایەگان (خوی سەلماس، ورمێ، تەوریز، مەراغەی گرتن و بەپشتیوانی کوردەکانەوە زۆر زەوی دەستخست. لە تەک عەلی ڕەزاخانی موکریدا بەلەشکری کوردی موکرییەوە چووە میاندواو کە پێش بەنادر شا بگرێ.

تەیموور پاشا لە جەنگاوەری نادر شا و فرۆفێڵی ڕۆم ناشارەزا بوو، لەگەڵ عەلی ڕەزاخانا بەدڵگەرمی بۆ شەڕکردن ئامادە ببوون؛ هەر هێندەیان زانی نادر شا وەکو بەڵا کەوتە سەریان.

ساڵی ١١٤٠ نادر شا لە هەمەدانەوە بۆ گرتنی ئاوربایەگان ڕووی لە «سنە» کرد. مانگی موحەڕەم، عەلی ڕەزاخانی موکری و تەیموور پاشا بەلەشکرەوە چوونە نێوان دەهدەم و مەقدەم کە «میاندواو» بێت. لەودەمەدا نادر شا گەیشتە سەفاخانەی هەوشار کە خاکی موکرییە. بنە و گرانەباری لەوێ دانا و بۆ خۆی و لەشکری بەپرتاو چوونە میاندواو و لە کەنار چۆمی چەختەتوو لەشکربەزی کرد و ڕوو بەڕووی تەیموور پاشا و عەلی ڕەزاخان ڕاوەستا.

تەیموور پاشا بەپشتیوانی عەلی ڕەزاخان و کوردەکان و بەئومێدی پاشا و تۆپچی و چەرخەچییەکانی ڕۆمەوە بەدڵگەرمی بۆ پێشەوە ئاژۆتی و ڕیزی بەلەشکر گرت و مەردانە چووە مەیدانی شەڕ و کوژتارەوە. ئەگەرچی لە یەکەمین هەڵمەتا تەنگەی بەلەشکری نادر شا هەڵچنی و تێکەوەی پێچا، بەڵام پاشا و لەشکرو چەرخەچییەکانی ڕۆم پشتیان لە شەڕکرد و ڕوو بەمەراغە هەڵاتن و گیانیان لە مردن ڕزگار کرد.

تەیموور پاشا و عەلی ڕەزاخان و لەشکری کوردستان سینگیان بەگوللەوە ناو زۆر

ئازایانە شەڕیان کرد و لە کوژتار نەپرینگانەوە. کە تاریکی شەو بەسەرداهات بەهەر بۆنەیەک بووبێ خۆیان لەو مەیدانە خوێناوییەدا دەرباز کرد. تەیموور پاشا و عەلی ڕەزاخان و چەند سوپاهێکی کورد ڕوویان لە مەراغە کرد. کوردەکانی موکری یەکە و دوو تاکولووک بۆی دەرچوون و لە ئاوایی و دێهاتەکانی خۆیانا گەیشتنە نێو ماڵ و منداڵەکەیان و دانیشتن.

عەلی ڕەزاخان کە گەیشتە مەراغە، کوردەکانی کە لەکن نادر شا بوون کردە تکاکار و بۆ خۆشی یەکسەر قاقەزی بۆ نادر شا نویسی و بەو بۆنەیە پێکهاتن و گەڕاوە کن نادر شا و کراوە بەحاکمی موکریان. بەڵام تەیموور پاشا چووە «دێ خورگان» و سەنگەر و مەتەرێزی بەرامبەری دروست کرد و دانیشت.

نادر شا لە دوای هەڵاتنی تەیموور پاشا. بەلەشکرەوە چووە سەر مەراغە و گرتی و ڕوو بەدێخورگان لەشکری ئاژۆتە سەر تەیموور پاشا. ڕۆژێک هەتا ئێوارە تەیموور پاشا لەگەڵ نادر شایا شەڕی کرد و بەتۆپ و تفەنگ کوژتاریان لە یەکتر کرد. تەیموور پاشا وەتەنگ هات و لە تاریکی شەوا پەنای بۆ کێوی «سورخاو» برد کە نزیکی شاری تەورێزە. نادر شا لەشکرەکەی کردە دوو بەش و لینگی دا سەر کێوی سورخاو و تەورێز.

تەیموور پاشا کە لە پاشا و لەشکری ڕۆم و جەنگاوەریی نادر شا و سەرکردەکانی وردبووەوە، لە هەڵاتن بەولاوە چارەیەکی نەدۆزییەوە. مستەفا پاشای والی تەورێز و پاشاکانی دیکەی کۆکردنەوە و لە نیوەشەوا تەورێزیان جێهێشت و ڕوویان لە «سەفەویان» کرد، بۆی دەرچوون. لە ڕۆمییەکان هێند لە تەورێز مابوونەوە، کە تێگەیشتن تەیموور پاشا هەڵاتووە ئەوانیش هەریەک بەجۆرێک لە شار دەرکەوتن و هەڵاتن. ڕۆژی ٢٢ موحەڕەم تەورێز بەجارێک کەوتە دەست نادر شاوە.

نادر شا کە تەورێزی گرت لە خۆ سازکردنی چوونە سەر خاکی قەفقازدا بوو و بۆ گرتنی ئێرەوان و قارس ئامادەیی دەکرد. لەودەمەدا وەڵامی پێدرا کە لە هیرات و ئەفغانستانەوە دوژمن لینگی داوەتە سەر خاکی خوراسان. نادر شا ناچاربوو بۆ خوراسان چوو و لوتف عەلی بەگی کردە بەگلەر بەگ و حاکمی تەورێز (تەئریخی نادر، لاپەڕە ٧٨).

تەیموور پاشا لەودەمەدا دوو کەلێنی دەستکەوت: یەکێک چوونی نادر شا بۆ خوراسان و دوورکەوتنەوەی لە ئاوربایەگان؛ دووەمین لێکەوتنی سوڵتان ئەحمەد لە پادشاهی و چوونی سوڵتان مەحموود بۆ سەر تەختی سەڵتەنەتی عوسمانی. لەبەر ئەوانە تەیموور پاشا

دەربەجێ لەشکری لە کوردی میللی و خێڵی کوردی ئەو خاکە کۆکردەوە و تیپێک لەشکری ڕۆمیشی هەڵگرت و چووە تەورێز و لوتف عەلیخانی دەرپەڕاند و تەورێزی گرت.

لوتف عەلیخان ڕوو بەمەراغە هەڵات. عەبدوڕەزاقخانی مەقدەمی حاکمی مەراغە ڕێگای نەدا کە بڕواتە نێو شارەوە، ئەویش بەناچاری ڕووی کردە «خەڵخاڵ». تەیموور پاشا دیسان خاکی ئاوربایەگانی خستە ژێر فەرمانییەوە (تەئریخی نادر - لاپەڕە ١٢٤).

ساڵی ١١٤٥ نادر شا چووە سەر شارەزوور و تۆپاڵ عوسمان پاشای سەر عەسکەری ڕۆمی کوژت و لە دواییدا چوونە بەغدا و نەجەف و کەربەلا و گەڕاوە و لەشکرێکی قورسی ناردە سەر تەیموور پاشا؛ بۆ خۆشی گەیشتە «بانە» کە خاکی موکرییە. تەیموور پاشا کە گەڕانەوەی نادر شای بهیست و تێگەیشت کە چوویتە بانە، ناچار بەبێ شەڕ تەورێزی بەردا و ڕوو بەئێرەوان گەڕاوە. تەئریخی نادری لاپەڕەی ١٣٠ دەڵێت: لوتف عەلی بەگ لە دوای تەیموور پاشا چووە تەورێز، لە پاشان نادر پێڕاگەیشت.

ساڵی ١١٤٨ نادر شا چووە سەر خاکی قەفقاز. تەیموور پاشا بە ٦ هەزار سوپاهی کوردی «وان» و میللییەوە چووە تفلیس و لە قەڵای «لوری» بەگژ نادر شادا چوو و شکاندی و تەیموور پاشا چووە تفلیس و لەشکرێکی دەورەدراو لە تەنگانیدابوون ڕزگاری کردن و بۆ لەشکرە دەورەدراوەکەی گەنجەش دانەوێڵە و پێویست و کۆمەگی نارد و بەهێزەوە گەڕاوە قارس.

نادر شا کە لە دەست تەیموور پاشا ڕزگار بوو، پێیان گوت کە دەستە لەشکرێکی ڕۆم لە قەڵای «قازان چای» و لە کێوی «یقای قولوو» بەپاسەوانی دانیشتوون. بەلەز پیادەی خستە پێشەوە و بەبەفر و ڕەچەشکاندن بۆ چوونە سەریان کەوتنەڕێ.

دۆڵ و شیوەکان پڕ لە بەفر و کرێوە لووس ببوون و زستانیش زۆر سارد و سەخت و بەمژ و تەم بوو. لەبەر بەفر زۆری ڕێگایان لێ ونبوو و سەرەدەریان نەدەکرد، لە ڕێگایەکی کە چووبوون بەنائومێدی گەڕانەوە و ڕوویان لە قارس کرد.

تەیموور پاشا دەرو ژووری شار و قەڵای بەلەشکر و تۆپ و جەبەخانە توندکرد، دیوار و کونگەرەی شار و قەڵای لە لەشکر پڕ کرد. بە ١٢٠ هەزار سوارەی کورد و عەسکەر لە شار دەرکەوت و چووە پێش نادر شا. هەردوو لا بۆ بەرامبەری یەکتر لەشکریان ڕیز کرد و بەتۆپ و تفەنگ یەکتریان ئاورباران و بەرشیلنگان دا. ئەو ڕۆژە هەتا ئێواری خوێن ڕێژرا و لاشە کەوت و کوژتارێکی قورس لە هەردوولا کرا. ئەوە ڕۆژێکی سەخت و نەگبەت

[بوو]، هەردوولا دژی وایان چاوپێنەکەوتبوو. ئەو شەڕە بەشەڕی «موراد تەپە» ناوبانگی هەیە.

سەربهورد نویسەرانی ئێران دەڵێن: «نادر شا و میرزا مەهدی خاوەند تەئریخ - کە نویسەری بەتایبەتی بوو - لە دووری شەڕ لەسەر بەردێک دانیشتبوون و تەماشای شەڕ و کوژتاریان دەکرد. نادر شا بەهەناسە ساردییەوە بەمیرزا مەهدی گوت: ئەمە چ ڕۆژێکە؟ ئەم هەوایە و بەفر و بەستەڵەکە و زستانە سەختە و شەڕوشۆڕە چۆن دەبینن؟» میرزا مەهدی بەم شیعرە وەڵامی داوە:

هوا مخالف وهمد سگ و نشیمن سنگ

بەجای نالەی بربت صدای توپ و تفنگ

ئەو شەڕ و کوژتارە ٣ ڕۆژ لەسەر یەک بەرپابوو؛ نادر شا تەنگەتاو کرابوو، زستانێکی زۆر سارد و بەفرێکی زۆر کەوتبوو، هەردوولا بەجارێک لە دەستوپێ کەوتبوون. نادر شا ناچاری ڕۆیشتنەوە بوو و دەستی بەگەڕانەوە کرد. ئەو خاکەی بەجارێک تاڵانکرد و ڕوو بەئێرەوان ڕۆیشت.

تەیموور پاشا لە دوای ئەوە کە نادر شای تەنگەتاو کرد و بۆ گەڕانەوەی ناچار کرد، ئەویش چووە قارس و دەستی بەهێز پەیداکردن کرد و هەر لە ئارپە «چای»ەوە هەتا ئەرزەڕۆم بەئالەت و لەشکر توندکرد و بۆ خۆشی لەبەر ساردوسڕی لە قەڵای قارس دانیشت و چاوەنۆڕی بەهاری دەکرد.

نادر شا کە لە قارس گەڕاوە، ئێرەوان و تفلیس و گەنجە و ئەو خاکانەی بەجارێ گرت و پاشا و مەئموورەکانی عوسمانیشی گرتن؛ و هێندێکی کوژتن و هێندێکی بەدیل بەخێوکران و گەلێکیشی بەماملەت پێدانەوە.

هەروەکو لە باسی زەنگەکان لێی دواین سەرما و بەفر و سەختی پێشی بەدلێری و ئازایی نادر نەگرت و تەنگی و ئیزاو لە کردەوە و ئارەزووی ڕانەگرت، دووبارە لەشکری هەڵگرت و لە مانگی ڕەبیعی دووەمدا چووە سەر قارس و لەشکری ئاژۆتە سەر تەیموور پاشا.

سلەودەمەدا لە لایەن سوڵتانی ڕۆمەوە فەرمانی مامڵەتیی درا و سوڵحنامە بەئەحمەد پاشادا ناردرا و گەیشتە ئەرزەڕۆم. پاشایانی ئەو دەوروپشتەش قاقەزیان بۆ نادر شا نویسی و شەڕی نادر شایان لەسەر قارس کلاکرد. نادر شا بەماملەت پەیمانگیر بوو و بۆ کوژاندنەوەی شۆڕشی داغستان لەشکرەکەی ڕوو بەداغستان و لەگزییە کێشاوە.

## مایەی تێکچوونی حکوومەتی نادر شا

نادر شا کە تەمەنی گەیشتە دوامینی، حکوومەتەکەی نزیکی کەوتن بوو. لەگەڵ خەڵکەکە نامیهرەبانی دەست پێکرد و دڵڕەقی نواند و دەستی جەوری درێژ کرد.

نادر شا کە خاکی هیندستانی گرت دەوڵەت و سامانی ئەو خاکەی دەستکەوت و خەرج و باجی سێ ساڵانی پێبەخشین، بەڵام لە دوایی لێی ئەستاندنەوە. هەموو سەرمایە و دراووچتی گرانبەهای هیندستانی بۆ «کەلات» بارکرد. کەلات کە پایتەختی بوو لە خوراسان، ڕۆژ بەڕۆژ گەنجینە و دارایی لە کەلات کۆکردەوە و بەبۆنەی کۆکردنەوەی ئەو سامانە دڵی هەموو خەڵکی ڕەنجاند و ئەزیەت و جەوری فرە بوو.

نادر شا بەوە کە لەگەڵ موسڵمانی سوننی بەمیهرەبان بوو و سەربەستی و ئازادی پێدا بوون، شیعەکان لێی دڵگیر ببوون و بەبەدی ناویان دەبرد، ئەوەشی لە عولەما و موجتەهیدەکانی شیعە دەزانی.

بۆ ئەزیەتدان ئەوە گەلێکی دلێری کرد و هانی دا کە جەور و ئەزیەت ڕەوا بینێت، ئەو کەسانەی کە هێشتا هەر ڕەگی شیعەتیان دەبزووت، نادر شایان دردۆنگ کردبوو کە باوەڕیان پێ نەکات. لەسەر ئەوە نادر شا باوەڕی بەهەموو خەڵکی ئێران نەمابوو و ئەفغانییەکان و تورکمانەکانی لەو داخانە هێنا بووە ڕوو. ئومەرایانی ئەو دوو تیرەیەی پێش خستبوون. ئەو ئومەرایانەش بەپشتیوانی ئەوەوە بەهەموو کلۆجێک دەستدرێژیان بەسەر خەڵکی ئێرانا دەکرد.

ئەوانە بوونە مایەی تێکدانی ئاسایش و دڵگیری خەڵکی ئێران لە نادر شا. هەموو هێزدار و خاوەند دەستەکان ناچاری سەرکێشی و بڵندبوون ببوون.

خەڵکی فارس، شێروان، مازندەران، لێکڕا بەجارێک سەریان لە فەرمانی نادر شا پێچاوە و ئاوازی سەرکێشیان بڵند کرد.

ئەو سەرکێشیە ڕق و دڵگیری نادر شای هاندا و بۆ جەورکردن و هێزداری کرد، خەڵکەکە لە ترسی خوێنڕێژی و گرمە و ناڵەی ڕقی نادر شا ماڵ و خانوبەرەیان بەردا و ڕوو بەچیا و کێوەکان هەڵاتن و لەنێو ئەشکەوتانا سەرکێشیان کرد و بوون بەجەردە و ڕێگر و تەریدە.

مێژوونوسەکان دەڵێن: نادر شا کە بۆ چوونەسەر عەلی قولیخانی برازای لەشکرکێشی کرد، لەودەمەدا لە سیستان تەپلی سەربەخۆیی لێ دەدا. نادر شا ڕقی هەستا و فەرمانی

دا کە چەند شیعەیەکی کە لەنێو لەشکری دابوون بکوژرێن؛ بەبێ لێکدانەوە ئەو فەرمانەی دا. نادر شا لەودەمەدا زۆر تێکچوو بوو و خوێن بەری چاوی گرتبوو و لە دیتن و لێکدانەوە و هەڵبژاردن کەوتبوو.

ئومەرایانی نادر شا لەوە گەیشتن کە هەموو دەکوژرێن، کوژتنی نادر شایان خستە پێش و ژیانی خۆیان لە مردنی ئەوا دیت. لەبەرئەوە چوار سەردار لەشکر، ددانیان بەجەرگ داهێنا و دڵی خۆیان توندکرد و بۆ کوژتنی نادر شا چوونە پێشەوە.

محەمەد عەلیخانی هەوشاری و ساڵح بەگ سەرتیپی فەوجی خاس، شەو بەبهانەی کاری پەنهانییەوە چوونە چادری نادر شا. پاسەوانەکان دەیانناسین و ڕێگایان دان. ئەو چوار سەرکردانە کە چوونە چادرەوە، نادر شایان وشیارکرد. نادر شا دوو کەسی لێکوژتن. ساڵح بەگ لە دوای کوژرانی دوو هاواڵەکەی بەو شیرەی لە دەستی دابوو لە نادر شای دا و کوژتی.

مێژوونوسەکان لەوە کە نادر شا دەست بزێوی دەکرد، ڕقی لەوانە هەڵگرتبوو کە دەیکوژتن، حەقی دەدەنێ و دەڵێن حەقی بوو. بۆ دامەزراندنی حکوومەت و ڕێکخستنی ئەمر و ڕاگرتنی سەڵتەنەت، ناچاربوو وابکا کە دەیکرد، ئەگەرچی لەوەش زۆر خۆی دەپارازت.

بەڵام ئەگەر دەستی لە پادشاهی هەڵگرتبا هەم بۆ خۆی و هەم بۆ میللەتەکەی کە بەچ ئەزیەت و ڕەنج و خوێنڕێژی لە دەست دوژمنی ڕزگار کردبوو و هێنابوویە ڕۆژێکی وا، ئەوەش جێگای ئومێد نەبوو. بەڵایەکی زۆر گەورەی لە پێشەوە دەدی کە دەستی هەڵگرتبا.

ئەفغان لە ئێران دەرکردن و ئەفغانستان گرتن و لەتەک حکوومەتی عوسمانی شەڕ و کوژتار و ڕزگارکردنی ئەو خاکانەی لە دەستیان دابوو، کابول و قەندەهار هێنانە دەست، بەئازایی و ڕا و تەگبیر و ڕەشیدیی نادر شاوە بوو، دوژمن و بەدخوەکانی ئێران ڕامی خۆی کات و ئەو خاکانەش بگرێ کە گرتنی.

گرتنی هیندستان و خاکی ئێران زل( ؟) فرەکردن و ئێران سەرخستن و میللەتەکەی بەزۆر ناودارکردن، لە ئازایی نادر شاوە بوو.

ئەگەرچی ئەوانە بەخوێنڕژتنی هەزاران کەس و پیاوانی گەورە هاتوونە دەست، بەڵام پادشاکانی ڕۆژهەڵات و ئاسیا تاکو ئەو ڕۆژە کیشوەرگێری و مەرز فرەکردنێکی وایان بۆ

هەڵنەکەوتبوو، بەبێ گوناه و خوێنڕێژی کە بۆ نادر شا هەڵکەوتبوو دەستی داوە.

نادر شا دەوڵەت و سامانێکی لە هیندستانی دەستخست بۆ ئەمە بوو کە سەروەت و حیشمەت و دارایی و گەورەیی ئێرانی پێشوو تازەکاتەوە و خەڵکی ئێران دەنگ بەرز و پایە بڵند و ناودارکا. پەلاماردانی «بوخارا»شی بۆ شیری تیژ نیشان دان و هەڵمەتی شێرانە نواندنی بوو.

ئێمە چ تەماشای کیشوەرگیری و چ تەماشای ئازایی و کارزانی و تێگەیشتنی بکەین و چ لە تەدبیر و ئەندێشە و بیر و لێکدانەوەی وردبینەوە و کۆشەوە و تەقەلاکانی یەک بەیەک بخەینە بەرچاو کە بۆ ئێران و خاکەکەی ماندوو بووە و تێکۆشاوە و ئەو کارە گەورە و دڵسۆزی و پیاوەتییە لەوەوە بۆ ئێران بەجێ هێنراوە بیخەینە تەرازووی زانینەوە، ئەو پادشاهە گەورەیە و ئەو قارەمانە ئازایە شایانی ستایش و سزاواری شوکرانە و ئافەرین پێداهەڵگوتنی چاکەیە.

لە بابەت ئاین و کیش: نادر شا دەیەویست کە ئاینی ئێران بگۆڕی، ئەویش بۆیێ بوو کە خەڵکی ئێران بەبۆنەی ئاینی خۆیانەوە - کە هی سەفەوییەکان بوو- ڕۆژ بەڕۆژ سەفەوی و بنەماڵەکەیان دەکەوتنەوە ڕوو و خۆشەویست دەبوون. نادر شا دەیەویست بەتێکدانی ئەو ئاینەی بناغەی خۆشەویستی سەفەوییەکان تێک بدات و تێکەڵ و پێکەڵی ئاین و کێشە تێکدراوەکان بەراورد بکات و بیانکا بەیەک،

عولەماکانی دین لە چاغی سەفەوییەکان، هەموو ئیش وکار و ئومووری فەرمانگوزاری حکوومەتیان خستبووە ژێر پەنجەی خۆیانەوە.

نادر شا کە لەسەر تەختی پادشاهی دانیشت لەو توشماڵە (طایفە) دڵگیربوو و ڕەشتەی کارگوزاری لە دەست هەموویان دەرهێنا و بەجارێک لە ئیشی خستن. مەلا گەورەکان چوونە کنی کە جێگایەکی باش دەستخەنەوە. نادر شا ڕووی تێکردن و گوتی: «ئێوە بەچ جۆرێک ئەو هەموو ماڵ و دەوڵەت و دراوەی میللەت دەخۆن؟» لە وەلاما گوتیان: بەکۆمەگی و یارمەتی جیرە و معاش، ئێمە هەموو عولەما لە مزگەوت دوعا بۆ دەوڵەت و حکوومەت و پادشای ئیسلام دەکەین. نادر شا وتی: «لە ئێمە ئاشکرابووە کە دوعای ئێوە لە لای خودا پەسند نییە و قسەکانتان ڕەوا نابێ؛ چونکو هەتا ئێوە لە ڕوودا بن میللەت بێ ڕووە. هەتا ئێوە سەرکەوتووبن میللەت و کیشوەر ژێر کەوتوو و داماوە. دەوڵەمەندیی ئێوە مایەی هەژاری و فەقیری میللەتە. کیشوەرگیری و ئاسایش کە بەشیری تیژی پاڵەوانەکانی منەوەیە، وا دیارە ئەوانە ئالەتی دەستی قودرەتی یەزدانی داوەر بن.

کەوا بوو دەوڵەت و ماڵ و سەروەت و سامانی ئێوە دەبێ بۆ جیرە و معاشی پاڵەوانەکانم پوخت بکرێ».

ئەو شەوە کە نادر شا کوژرا، بۆ سبەینێ ئەحمەدخان ئەبدالّی بەفەوجێک ئۆزبەگی لینگی دا سەر خاکی ئێران. ئێرانییەکان بەئازایی لە بەرامبەری ڕاوەستان. ئەحمەدخان وەنەبێ نەشێت ئێران بگرێ، بەڵام هەر بەمە خاکی ئەفغانی لە دەست بمێنێت، بەمامەڵەتکردن پێشی بەئیش گرت و گەڕاوە خاکی قەندەهار و دەوروپشتی گرت و گەنجینە و ماڵێکی زۆر کە لە هیندستانەوە دەچوو بۆ نادر شا، گرتی و حکوومەتی خۆی پێ دامەزراند. بەوە ئومووری ئەحمەدخان ڕووی لە گەورەبوون کرد.

عەلی قولیخان برازای نادر شا کە لە سیستانا بەسەرکێشی ڕایدەبوارد، ئەونە ئومەراکانی نادر شایان کوژتبوو چوونەکنی و هانیاندا عەلی قولیخان چووە سەر خوراسان و گرتی و لەسەرتەخت دانیشت و ناوی خۆی نا «عەلی عادل شا» و نەسروڵڵا میرزا و ئیمام قولی میرزا و ڕەزا قولی میرزاو ١٣ کوڕ و کوڕەزای نادر شای کوژتن. لەو بنەماڵەیە ئەوەی ڕزگاربوو «شاڕوخ»ی کوڕەزای نادر بوو کە لە تەمەنی ١٤ ساڵاندا بوو.

عەلی عادیل شا بۆ ئەمەی کە حکوومەتەکەی بەچاکی سەر بگرێ «شاڕوخ»ی کردە پادشا و خوێندارەکانی نادر شاش کە محەمەد قولیخان بوو گرتی و دایە دەست خوانینەکانی حەرەمی نادر شا. ئەوانیش گرتیان و لەتوپەتیان کرد.

ئیبراهیم خان کە برای عەلی عادیل شا بوو لە لایەن برایەوە فەرمانڕەوایی عێراقی دەکرد. لەشکری هەڵگرت و چووە سەر براکەی و بەگژیا چوو و گرتی و هەردوو چاوی کوێر و ناوی پادشاهی لە خۆی نا. ئەمیر ئەرسەلان فەرمانگوزاری ئاوربایەگان بەدەستیەوە گرفتار بوو و لەناوبرا.

ئیبراهیم خان هەرچەند بەلەز پێشکەوت، بەڵام زۆر نەژیا و لەشکریانی خۆی گرتیان و بردیانە مەشهەد و لەگەڵ عادیل شا دایانە دەست شاڕوخ، ئەویش هەردووکی کوژتن.

شاڕوخ کوڕی ڕەزا قولی میرزای کوڕی نادر شا بوو. دایکیشی کچی شا سوڵتان حوسێنی سەفەوی بوو. چونکە لاوێکی جوانچاک و ئازا و تەبیعەت ناسک و خۆش ڕوو بوو، خەڵکی ئێران بەپادشایان پەسند کرد. بەڵام بەدبەختانە ئێران پشێو ببوو و تێکهەڵچوو بوو. هەر هەواداریێک هەوەسی فەرمانڕەوایی لە مێشکا دەجووڵایەوە و سەربڵند ببوو.

میرزا سەید محەمەد ناو کابرایەک کە لە چاغی نادر شادا هاتبووە ڕوو و ناسرابوو، لە دایکەوە خزمی سەفەوییەکان بوو، لەو شۆڕشەدا ئێرانییەکانی فریو دابوو چاو و ڕاوی دەکرد کە شاڕوخ وەکو نادر شا باوەڕی بەکێش و ئایین نییە و بێ دین و مەزهەبە. لەو ڕێگایەدا گەلێک شیعەی هەڵخەڵەتاندبوو و فریوی دابوون. کۆمەڵەیەکی زلی لەسەرخۆی کۆکردبووەوە. بەبێ ئەوەی کە شاڕوخ بزانێ هەڵمەتی برد و شاڕوخی گرت و هەردوو چاوی کوڵی و کوێری کرد و لەسەر تەخت دانیشت و ناوی خۆی نا «شا سلێمان» و دەستی بەکیشوەرداری کرد.

یوسف عەلی سەردار سوپاهی شاڕوخ بەسوپاهێکی زلەوە چووە سەری و نەیهێشت تامی فەرمانڕەوایی بچێژێ و گرتی و کوژتی و شاڕوخی لەسەر تەخت داناوە و ئومووری پادشاهیشی خستە ژێر چاوەدێری خۆیەوە.

جەعفەرخانی کورد کە سەردار سوپاهێک بوو، بەهێز و ڕەشیدی ناوبانگی کردبوو، بەلەشکرێکی شەڕکەرەوە چووە سەر یوسف عەلی. لە دوای گەلێک شەڕ و کوژتار گرتی و کوژتی و ئوموور و ئیشوکاری پادشاهی خستە دەست خۆی، بەڵام زۆر نەژیا.

میر عالم عارەب بەلەشکرێکەوە چوو بەگژ جەعفەرخانا و کوژتی و شاڕوخی گرت و حەپسکرد. ئەحمەدخان ئەبداڵی لە ئەفغانستانەوە چووە سەر خوراسان، لە دوای شەڕ و کوژتار، بەمەرج، میر عالیم لەناوبرا و دەستی لە دەورەدانی مەشهەد هەڵگرت.

ئەویش لەبەرئەوە بوو کە خاکی ئێران هەتا سەر لە دەست ئەفغاندا نامێنێت و ئەهالی ئێران ئێش و ژان و برینی پێشوویان لە دەست ئەفغانا هەر مابوو. لە دوامینی ئەوە ئەندێشەی کرد بۆ ئەوەی کە تەنها خاکی ئەفغانستان لە دەست بمێنێت و پادشای خاکی ئەفغانستان بێ، لەگەڵ ئێرانا ڕێککەوت و شاڕوخی لە گرتیخانە دەرخست و پادشاهی ئەوی پەسند کرد.

خەڵکی ئێران شاڕوخی جەوانی کوێریان لەسەر تەخت داناوە و هێندێک خاک لەگەڵ خوراسانا لەژێر فەرمانیدا ماوە. لە دوای ئەوە لەگەڵ فەرمانڕەوایی خەریک بوو هەتا چاغی کەریمخانی زەند. کە خاکی ئێران کەوتە دەست کەریمخانی زەند، خانەدانی هەوشار پووچ کرایەوە. تەماشای کتێبی ئێمەی «کوردی زەند» بفەرموون. (بەرگی دووەمی سێرجان ماڵکم ئینگلیزی لاپەڕە ٤٩-٦٠).

## بەراوی چاپکراوی کردەوەکانی خێوی زاری کرمانجی

١- پێشەوای ئاین شەریعەت بەکوردی.

٢- غونچەی بەهارستان مێژووی کوردان.

٣- پێشکەوتن - مێژووی دوو بنەماڵەی کورد کە لە ئاوربایەگان و دیاربەکردا فەرمانڕەوابوون

٤- مێژووی دەوری ئەمارەت لە کوردستان ساڵی ٦٥-٦٥٦ ھ.

٥- ئاوڕێکی پاشەوە - حکوومەتی بەرزەکانی لە حەلوان و دینەوەر.

٦- ئاوڕێکی پاشەوە - حوکمدارانی کورد لە هەولێر.

٧- ئاوڕێکی پاشەوە - پادشاهی چەند بنەماڵە لە ساڵی ٤٧٨ - ٦١٧ ھ.

٨- ئاوڕێکی پاشەوە - حوکمدارانی بابان.

٩- خۆشی و ترشی (بزنۆکە و مەڕۆکە).

١٠- ناودارانی کورد لە ١٢٠٠ھ هەتا ١٣٠٠.

١١- مێژووی کورد و نادر شا لە خاکی ئێرانا.

## ئەو کتێبانەی چاپ نەکراون

١- میللەتی کورد.

٢- مێژووی سەلاحەدین ئەیوبی

٣- وێنەی کۆڵین (زەنگوغرافی) (لەژێر چاپ دایە).

٤- ڕزگاری لە زانین.

٥- بەکورتی مێژووی ڕەواندز (سۆران).

حوسێن حوزنی موکریانی

میژووی

شاهنشاهی

# کوردی زەند

رواندز مەرکەزی زاری کرمانجی

حسين حزني موكرياني

ميژووی
شاهه نشاهاني

# كوردی زه ند

روانێز مه زركه ی زاركرمانجي

## ئەم پەڕاویەم چۆن نوویسیوەتەوە

ئەگەرچی بەڕاستی لە دەمێکەوە خەریکی نوویسینەوەی مێژووی پادشایانی کوردی زەند بووم، ئاگام لە سەربهوردی ئەو بنەماڵە گەورە کوردە هەبوو، لەگەڵ ئەوەشا تەقەلام ئەدا کە زانینی خۆم بگەێنمە پایەیێکی وەها کە بەدڵخواز و بەئارەزوو بێ، وە دەمەویست ئاگاداری خۆم هێندە فرە بکەم کە خوێندەوارەکان لە لێوردبوونەوەیدا دانەمێنن.

بەکۆمەگی و یارمەتی زانا و تێگەیشتووەکان ئاگاداریەکی زۆرم لە مێژووی پاشادیانی زەند پەیدا کرد. بەرگی دووەمینی «جەنەڕاڵ ساکیس»ی ئینگلیزم وەدەست خست و لە لایەنی زەندەکانەوە هەرچییەکی تیابوو وەرمگێڕایە سەر کوردی.

لە دوای ئەوە برا خۆشەویستە کوردەکان، وەهەوەسیان خستم کە مێژووی ئەو بنەماڵە کوردە بکەمە پەڕاوێ (کتێب) سو چاپی کەم، منیش لە کەلێن و دەرفەتا کۆشام هەتا زانینی پێشووی ئەو دەمەم کۆکردنەوە و بەحەوت بەندم دامەزراند و کردمە ئەم پەڕاویە و ناوم نا «کوردی زەند یان مێژووی شاهەنشاهانی کوردی زەند» لە خاکی ئێرانا.

ناوی لێوەرگرەکانیشم لە لاپەڕەی دوامینی ئەم پەڕاویەدا نیشاندا و پێشکەش بەزانا و تێگەیشتووەکانم کرد. لەمیانەی قسە و سەربهورداندا ناوی لێوەرگرەکانم بەپیتێک نیشان داون، وەکو «ب» بۆ بەرگ و «ل» بۆ لاپەڕە و «س» بۆ «ساکیس» و «ق» بۆ قاجاریە و «ئە» بۆ أجمل التواريخ و «ش» بۆ شمس الدين سامی و «ج» بۆ جەودەت و «ع» بۆ علی ظریف الأعظمی.

نموونەیەک بۆ ئەمە س- ب- ٢- ل- ٣٧٠ واتە: ساکیس- بەرگی ٢ لاپەڕەی ٣٧٠ و بۆ ئەوانی دیکەش هەروەها بەپیت نیشان دراون.

حوسێن حوزنی موکریانی

***

## بەندی یەکەمین

## مێژووی کەریمخانی زەند و چەند گۆتەیەک لە ژیانی پێشینی

کەریمخان کوڕی ئیناک (ئیناخ) لە توشمالانی کوردی زەند و لە خێلی لەک و سالی ۱۱۱۳ هیجری لە دێی «پەریە»ی خاکی مەلایر هاتۆتە جیهانەوە (ئە، ل ۱۵۵).

سالی ۱۱٤۰ نادر شا کە خاکی لوڕ و بەختیاری گرت و لە خێلی لەک چەند کەسێکی بەزۆر وەرگرتە نێو سوپاهیەوە، کەریمخان یەکێک بوو لەوانە کە نادرشا کردیە پیاوێکی سوپاهی. لە سوپاهیەوە بوو بەخاوەند پایەو گەورە بوو. لە دەوری عادیل شای برازای نادر شادا بوو بەسەرتیپ و لەوەش بەرەو ژوورتر چوو و کەوتە ڕیزەی سەرکردە سوپاهییەکانەوە و هەتا لە تەشویشاتی ئێران کەلێنی دەستکەوت و بوو بەپادشا (ج، ب-۱)

کەریمخان وەکو پیاوێکی سوپاهی لە لەشکری نادر شادا پەرای دەکرد. «ساکیس» دەلێ: «هەروەکو ئێمە لە سەفەرمان بهیستوومانە و زانیومانەتەوە، کەریمخان پیاوێکی بەڕەوشت و دەروون چاک و دڵ ڕوون و خاوەند ئەندێشەیەکی خاوێن بوو. لە تەک سەرکردەکانی بەختیاری بەیێکەتی تێکۆشاون و تەقەلایان داوە».

هەروەکو لە هەر کەسێکا چاو بەرایی نەدان و نەکێشان هەیە، هەروەها عەلی مورادخانیش چاوی پێ هەڵنەدەهات و بەخیلی بەکەریم دەبرد. «عەلی مورادخان» سەرکێشی کرد و بەو بۆنەیەوە بەختیاری پەرشوبڵاوبوون و پووچ کرانەوە و کوژران.

لەو دەمەدا کەریمخان بەهۆی داد گوستەری و دادخواهی و بەخشش و نێوچاوان خاوێنیەوە، هەموو دڵێکی کێشابووە لای خۆی و هەوادار و پشتیوانی زۆر ببوو. لە ئێرانی خوارووددا ببووە فەرمانڕەوایەکی سەربەخۆ (ساکیس).

کەریمخانی زەند بەدادگەری و مەردایەتی خەڵکی کرد بوو بەهەواداری خۆی و بەو ڕەوشتە چاکەیەوە بەسەر هەموو خانەکانی ئێرانا زاڵ ببوو. ئەگەرچی خاکی ئاوربایەگان لە دەست خانەکانی کورددا بەئازادی و سەربەخۆیی ڕادەگیرا، بەڵام ئەوانیش فەرمانبەرداریی کەریمخانیان خستە ئەستۆوە و بەدیاری و باجدان کەوتنە ژێر فەرمانییەوە. عێراقی ئێران و فارس و گەلێک لە خاکی خوراسان کەوتە دەست کەریمخان.

کەریمخان بەو جۆرە لە ئێران بوو بەپادشا و فەرمانڕەوا، بەڵام ناوی شاهی نەویست و بەوەکیل ناوبانگی کرد؛ چونکە چاوەدێریی خەڵکی ئێرانی دەکرد.

## سەرکەوتنی کەریمخان (١١٦٣ ھ / ١٧٤٩ م)

ئێران لەو دەمەدا پشێوی تێکەوتبوو و تێکچووبوو. خوراسان لە دەست شاڕوخدا بەئاسوودەگی دەگەڕا و بەخۆشی دەژیاندرا. کەریمخانی زەند و محەمەد حەسەنخانی قاجاڕ و ئازادخانی ئەفغانی لەسەر تاج و تەخت شەڕیان دەکرد.

بەچاو کە تەماشای هەر کامێک لەو سێیانە بکرابا دەگوترا کە سەردەکەون. بەڵام سەرکەوتن لە دوامینی کۆششدا لە لایەن کەریمخانەوە بوو (ساکیس).

هەر بەوجۆرە کەریمخان کە بوو بەپادشای ئێران، لە لایەن پادشای عوسمانی عەبدولحەمیدخانەوە، قاقەزێکی بۆ ناردرا و بەپادشای ئێرانی ناسی و ئەو عەهد و پەیمانەی کە لە چاخی نادر شادا کرابوو، بۆی تازە کردەوە وتخووبی خاکی تیا نیشان دابوو و بۆ ئومەرا و میری میرانی سنووری نوویسی کە ئەو پەیمانە ڕابگرن و چاوەدێری دراوسێیەتی بکەن و بەراوەژوو نەبزوونەوە (جەودەت، لاپەڕە ١٠٩).

شەڕی کەریمخان و قاجاڕ لە مازەندەران دەستی پێکرد. لە دوای شەڕ و کوژتارێکی گران، قاجارەکان سەرکەوتن؛ بەڵام لە ترسی ئەفغانەکان دواییان بەشەڕەکە نەهێنا. ئەفغانەکان گەیلانیان گرتبوو، کە تەماشای کرد قاجاڕەکان لە شەڕی زەندەکانا سەرکەوتن، دەستیان لە گەیلان بەردا و گەڕانەوە.

کەریمخان دەزبەجێ و بەلەز هێزەکەی خۆی گرد کردەوە کە پەلاماری ئازادخان بدات نەک قاجارەکان.

ئەفغانەکان لە قەزوین مانەوە. دەیانتوانی شەڕێکی قورس بکەن و پێش بۆ خۆیان پاککەنەوە و دوژمن دەرپەڕێنن؛ بەڵام لەولاوە کەریمخان لە ئەسفەهان دەستی بەلەشکر کۆکردنەوە کرد و بۆ پێشەوەی ئاژووت.

لە دوای ئەوە کەریمخان ساڵی «١١٦٦ھ / ١٧٥٢م» لە ئەسفەهان دەرپەڕاندرا و هەتا گەیاندرایە شیراز، تەنگەی پێ هەڵچنرا. کەریمخان نەشیا خۆی لە شیراز ڕابگرێت کە پایتەختی پادشایەتی بوو، ڕوو بە«بوشێر» هەڵات و لەوێ ڕۆستەم سوڵتان حاکمی «گەشتی» کردە هەوادار و لاگیری خۆی و داوای یارمەتی و کۆمەگی لێ کرد کە فریای کەوێت و بەهاوارییەوە بچێت.

لە ڕێگای بوشێر تووشی کۆسپە و تەنگێکی گەورە بوو، لە دۆڵێکی کە بە«کوتالی ریج» ناوبانگی کردووە، کەریمخان و لەشکرەکەی لەنێو دۆڵ و نەواڵدا دانیشتن و چاوەنۆڕی دوژمنیان دەکرد.

ئەفغانەکان وەدووی کەریمخان کەوتبوون. ئەفغانەکان لەو کۆسپە تەنگەدا پێرا نەگەیشتنە سەر ئەوە کە فریاکەون و خۆ رزگارکەن. لەناکاو رۆستەم سوڵتان لینگی دا سەریان و تەنگەی پێ هەڵچنین.

ئەفغانەکان ئەگەرچی گەلێک بەرەشیدی و ئازایی بەرامبەریان کرد و مەردانە تێکۆشان و بەدبەختانە لەشکریەکان لە شەڕ سست ببوون و سنگیان نەدا پێش و پشتیان لە شەڕ کرد و هەڵاتن.

کەریمخان هێزێکی زۆرچاکی کۆکردەوە و چووە سەر شیراز. بەزۆر شیرازی خستەوە دەست خۆی (ساکیس).

***

## سەربهوردێکی دیکەی کەریمخان ١١٧١ھ / ١٧٥٧م

مەیدانی شەڕی ئازادخان لە ئاوربایەگان دامەزراندرا، کە ئەوێ دەمێ قاجارەکان ناوچەی سەختی خۆیان گرتبوو، ئازادخان لە ریزەی هەوادارانی پادشاهییا دەرکەوت؛ ئەویش لەبەرئەمە بوو لە دوای گەلێ شەڕوشۆڕ و خوێن رژاندن و کوژتارکردن و خەبات و کۆشش خۆی بەدەست کەریمخانەوە دا.

هەر ئومێد و ئارەزوویێکی کە هەیبوو، لە کەریمخانەوە بۆی وەدی هات لەوەدا نەژادی و بەخشش، دادگەری، بنچینە پاکی، میهرەبانی کەریمخان خۆی نواند و دڵنەرمی لێ ئاشکەرا بوو. نەیارد دوژمنە هەرە مەزن و زلە گەورەیەکی وەکو ئازادخان خۆی هاویژتە بەربەختی کەریمخان. هەرچییەکی شایستە و چاکە بوو بۆی بەجێهێنرا. هەر کردەوەیەکی جوان کە هەبوو لەتەکیا کرا. لە نەوازش و خوشهاتی و پەرایا کەم وکورتی نیشان نەدرا، بەڵام لە بەرابەر راوەستاوەکان تەنیا هەر محەمەد حەسەنخانی قاجار مابوو.

محەمەد حەسەنخان لە ساڵی دوایی لەشکرێکی قورسی بردە سەر کەریمخان و دەستی بەهەڵمەتبردن و پەلاماردانی کەریمخان کرد؛ بەڵام لە دوامیندا گەیشتە سزای خۆی.

کەریمخان لە دەشتان نەدەشیا بەرامبەری دوژمن بکات، لە شیراز خۆی دامەزراند و دەستی بەداو و گرێ و لەشکر خڕکردنەوە کرد. شەڕکەر و خەزینە و زەخیرە و دانەوێڵە و پێویستیی خستە سەریەک و هێزەکەی خستە نێو شارەوە. تاب وتەوانایەکی کە هەیبوو گردی کردەوە و دراوسێیەکانی بەخراپی هێشتەوە.

لە دوای ئەوە، ئەوجا بۆ قاجار کوشتن و لەناوبردن، کەوتە مەیدانی شەڕوشۆڕ و نەیار

براندنەوە. بەشەو دەستی بەشەڕ و هەڵمەتدان کرد. قاجارەکان وەها شکاندران و بڵاوکرانەوە و پەرێشان بوون، نەدەپەرژانە سەر ئەوە کە خۆ کۆ بکەنەوە. دوامین وەشاندن لە لایەن شێخ عەلیخانەوە بوو. لەشکرەکەی کەریمخان زۆر بەچوستی شەڕیان کرد و بەچالاکی سەرکەوتن.

محەمەد حەسەنخان ناچار مایەوە و لەگەڵ نەیارە قاجارەکەی خۆیا شەڕی نەکرد. ئەو هێزەی کە هەیبوو، بێدەست و ناتەوان کەوتەوە. محەمەد حەسەنخان هەتا لە دەستی هات خاکی گرت و بۆ سەرکەوتن تاڵووکەی دەکرد و لە دوامین ئیشا وای بەسەرهات. کە بۆ خۆرزگارکردن و لە شەڕ و کوژتار پارازتن دەکۆشا و کەوتە تەقەلای هەڵاتن و گیان لە مردن دەرباز بوون. لە دواییدا نەیارە قاجارەکەی کەوتە سەری و کوژتی.

ئەو شەڕ و کوژتارانەی خۆبەخۆیی قاجار لەگەڵ یەکتر بوو بەمایەی سەرکەوتن و رزگاربوونی کەریمخان لە دوژمنان، ئەگەرچی کەریمخان لە شەڕی دەشتەکیا هەر ئەشکا، بەڵام لە سایەی پیاوەتی و گەورەیی و دڵپاکی خۆیەوە پێی گەیشت (ساکیس - بەرگی دووەم).

## چلۆنی و دامەزراندنی پادشاهی کەریمخان

ساڵی ١١٦٣ کە عەلیخان مرد، کەریمخان ئاڵای سەربەخۆیی هەڵدا و «میرزا ئەبو توراب»ی کچەزای شا سوڵتان حوسێنی سەفەوی بردە لای خۆی و ناوی نا «شا ئیسماعیل»و لەسەر تەختی فەرمانڕەوایی ئێرانی دانا و بەناوی ئەوەوە هەموو خاکی ئێرانی خستە دەست و ناوی خۆی نا «وەکیل».

ساڵی ١١٦٥ محەمەد حەسەنخانی کوڕی فەتح عەلیخانی قاجار کە لە ساڵی ١١٣٥ بەدەست نادرشا بەکوژ چوو بوو، لە تورکمان هێزێکی پەیدا کرد، لە لایەن «ئوستوراباد» دەستی کردە سەرکێشی.

هەروەکو گوترا کەریمخان بۆ شکاندنی قاجاران شا ئیسماعیلی هەڵگرت و بەلەشکرێکی قورسەوە چووە سەر محەمەد حەسەنخان. لە ئوستوراباد دەورەیدا و نزیک چل ڕۆژ ئەو شارەی وەتەنگ هێنا.

محەمەد حەسەن هەموو ڕۆژێ بۆ شەڕ دەرکەوت. تورکمان زۆرچاک شەڕیان دەکرد. کەمەرخان و شوجاعودینی زەند لە شەڕدا کوژران. ئەو دووانە لە گەورە و سەردارانی سوپای کەریمخانی زەند بوون.

شا ئیسماعیل چونکە منداڵ و نەزان و بێ ئەندێشە بوو، وایزانی کەریمخان شکا و محەمەد حەسەنخان سەرکەوت. لە ڕووی نەزانییەوە هەڵات و پەنای بۆ محەمەد حەسەنخان برد. کەریمخان لەو دەمەدا گوتی: «پادشاهێکی بەدنمەک هەڵات».

چوونی شا ئیسماعیل بوو بەمایەی دڵگیریی کەریمخان. بەناچاری لەشکرەکەی هەڵگرت و ڕوو بەتاران گەڕاوە،

خەڵکی مازندەران کە هەواداری کەریمخان بوون، لەگەڵ حەسەنخان بەشەڕ هاتن. موقیمخانی «ساری» و سەبز عەلیخان «لاریجانی» لەشکرێکی قورسیان هەڵگرت و چوونە سەر محەمەد حەسەنخان و لە فرسەنگێکی شاری «بارفروش» بەرامبەر بەیەکتر ڕاوەستان و بۆ کوژتار ساز بوون. لە یەکەمین هەڵمەتا موقیمخان بەگوللەی زەنبوورەک کوژرا و لەشکرەکەشی شکاندرا. لاشەی موقیمخانیان هەڵگرت و لەسەر داریان دانا و سووتاندیان. ئاقا حەیدەر عەلی و حاجی قەمبەر عەلی کە گەورە و سەرهاتی شار بوون، سەربڕان. حەسەنخان لەسەر مازندەران بوو بەفەرمانڕەوا.

وێنەی
محەمەد حەسەنخانی قاجار

لەو دەمەدا ئەحمەد شای ئەفغان چووە سەر مەشهەد و گرتی، عیساخانی کوردی چەشکەزەک ناچار پەنای بۆ حەسەنخان برد. دوو پارچە ئەڵماس کە هەریەک هەشت مسقاڵ گرانییان بوو (١- دەریای نوور ٢- تاج ماه)، حەسەنخان ئەو دوو پارچەی لەعیساخان ئەستاند.

کەریمخان کە گەڕایەوە تاران لەگەڵ لەشکر و پێویست ڕێکخستن خەریک بوو. بەخۆی گوت پادشای ئێران و لەسەر مینبەر خوتبەیان بەناوی خوێندەوە. لە ساڵی ١١٦٦دا خوتبە و سککە بەناوی کەریمخانەوە دەستپێکرا.

لەو دەمەدا حەسەنخان شا ئیسماعیلی کردە گۆپاڵی دەست و پێشڕەو و نەردیوانی سەرکەوتنی خۆی. ساڵی ١١٦٨ محەمەد حەسەنخان چووە سەر گەیلان و گرتی و قەزوینی خستە دەست و ڕوو بەعێراق بزووت، سەردار سوپا و کاربەدەستانی زەند بۆ بەرامبەریکردن و پێشگرتنی کەوتنە مەیدانەوە. لە دوای شەڕ و کوژتارێکی قورس

محەمەدخانی زەند و ١٧ کەس بەدیل کەوتنە دەست قاجاڕان.

کەریمخان لەولاوە بەسوپاهێکی زلەوە چووە پێش حەسەنخان. لەوێوە جلّەوی بەر بەئاوربایەگان سووڕاند. ئازادخانی ئەفغانی کە لە لایەن کەریمخانەوە فەرمانگوزاری ئاوربایەگان بوو بە ٢٠٠٠٠ پیاوی شەڕکەرەوە چووە پێشی. لە ٦ی فرسەنگی «ورمێ» شەڕیان دەستپێکرد. لە دوای خوێنڕێژی و کوژتار، ئازادخان هەلات، محەمەد حەسەنخان بەسەر ئەو خاکەدا خشا و کوژتاری کرد و ڕوو بەشووشێ ڕۆیی. ئاوربایەگان دووچار بەوێرانی و پێپەستی کرا.

محەمەد حەسەنخان بەدەستووری ڕەشبگیری کەوتە ئەو خاکەوە، هەر ئاواییەک و ماڵێکی کەوتە پێشی سووتاندی و وێرانی کرد و ڕوو بەکاشان ڕۆیشت.

شێخ عەلیخانی زەند کە لە لایەن کەریمخانەوە فەرمانڕەوای ئەسفەهان بوو، بەسوپاهێکی قورسەوە چووە پێشی. محەمەد حەسەنخان ڕێگای گۆڕی و ڕوو بەشیراز ئاژووتی. ساڵی ١١٧١ لە کەنار شیراز کەریمخان و قاجاڕ بەگژ یەکترا چوون. هێندێک سوارەی ئەفغان کە لەکن محەمەد حەسەنخان بوون، بەشەو هەلاتن و پەنایان بۆ کەریمخان برد. یەک لە دوای یەک لەشکری قاجاڕ لە محەمەد حەسەنخان جوێبوونەوە و تێکەڵ بەلەشکری زەند بوون. کەریمخان تەنگەی بەقاجاڕ هەلّچنی و شکاندنی و لە هەموو لایەکەوە تێیان ڕوو هاتن.

محەمەد سەنخان و چەند کەسێک لە دەستوپێوەندی بەزۆر گیانیان ڕزگار کرد و بەپیادەیی خۆیان گەیاندە مازندەران. ماڵ و ئەسپابێکی زۆر کەوتە دەست زەندەکانەوە.

کەریمخان خاک و شارانی کە محەمەد حەسەنخان گرتبوونی، خستیەوە دەست خۆی و لەشکرێکی لەژێر فەرمانی شێخ عەلیخان نارده سەر ئوستراباد.

محەمەد حەسەنخان لەو دەمەدا کەمێک تینی هاتبووە بەر، چەند کەسێکی تورکمانی لەسەر کۆببوەوە. شێخ عەلیخان هەتا گەیشتە «فەیرووز کوه» ڕانەوەستا. تورکمان کە ئەو وەلامەیان پێگەیشت بلاوەیان تێکەوت.

لەولاوە شێخ عەلیخان ڕوو بەساری چوو و بەبێ شەڕ گرتی. محەمەد حەسەنخان ڕووی لە ئوستراباد کرد و هەلات. حوسێنخانی تورکمانی دللو کە هەواداری قاجاڕ بوو، بەلەشکرێکی لە دەستیا بوو چووە کن شێخ عەلیخان و سەری بۆ چەماند.

شێخ عەلیخان لە سارییەوە چووە ئوستراباد. محەمەد حەسەنخانی قاجاڕ سەنگەری

دروست کرد و بۆ بەرامبەریی ڕاوەستا، هەردوولا دەستیان بەکوژتار کرد.

شێخ عەلیخان بۆ ئەوەی ئەو بنچینە پیسە هەڵکەنێ لە کەنار دەریاچەی «تەبەرستان»ەوە ڕێگای ئوستراباذی گرتەپێش و محەمەد حەسەنخان ناچار لە ڕێگای خیابانەوە چووە خاکی «گولباد»، لەوێ لەگەڵ زەند بەشەڕهات و لە کەنار دەریا شەڕێکی قورس کراو لە دواییدا قاجارِ بەناچاری ڕوو بەئوستراباد گەڕایەوە.

شێخ عەلیخان لە گولبادە چووە ئەشرەف، محەمەد حەسەنخان کە گەیشتە ئوستراباد هاواری لە نەجەفخانی کوردی شادی کرد فریای کەوێت. ئەوانیش بە ۱۰۰۰۰ کەسەوە چوونە کۆمەگی و بەبۆنەی کوردەکانەوە لەملا و لەولاوە ٦۰۰۰ کەسێکی دیکەی لە دەورە کۆبۆوە.

محەمەد حەسەنخان بەو لەشکرەوە چووە پێش لەشکری زەند. لە بیابانی «قرق» هەردوو لەشکر گریبان گیربوون. لە یەکەمین هەڵمەتدا نەجەف عەلیخانی شادی کوردەکانی هەڵگرت و بەبێ شەڕکردن ڕوو بەخوراسان گەڕاوە. محەمەد حەسەنخان پیاوەکانی بۆ شەڕ نارد و کەمێک تەقەلایان دا و ڕێگای خیابانیان گرتە پێش و هەڵاتن. محەمەد حەسەنخان بەناچاری لەگەڵیان چوو.

شێخ عەلیخان بەکوژتار کەوتە سەریان، لەو هەمووانە کەسێ لە قاجاڕان ڕزگار نەبوو. محەمەد حەسەنخان بەدوو نۆکەرەوە ڕوو بەلێڕەوار هەڵاتن. کوردێک «سەبز عەلی» (سەوزالی) ناو کەوتە سەریان و محەمەد حەسەنخانی گرت و سەری بڕی و بۆ شێخ عەلیخانی بەدیاری بردو ئەویش بۆ تارانی بەڕێ کرد. ئەو کەللەسەرەیان بردە پێش کەریمخان.

مەردی و پیاوەتی و دڵپاکی کورد، لێرەدا دیاری کرد کە جلدی یەکەمی تەئریخی قاجاڕیە لاپەڕە پازدە بەو جۆرە لێی دەدوێت: کە سەری محەمەد حەسەنخانیان بردە پێش کەریمخانی زند، کەریمخان لە تاران لەسەرای شاهی دانیشتبوو. یەک لە قاجاڕان ئەو سەرەی لە پەشتەماڵێکەوە پێچابوو و بەبێ ترس بردیە بەردەمی کەریمخان. لە لایەن کەریمخانەوە پرسیارێ کرا کە ئەوە چییە؟ پێی گوت: سەری محەمەد حەسەنخانی قاجاڕە. کەریمخان کە ئەوەی بیست لە جێگای خۆی بڵندبوو و بەپێخواسی لەسەرای پادشاهی چووە خوارەوە، سەرەکەی حەسەنخانی وەرگرت و بەدەستی خۆی شوشتی و مووی سەرەکەی شانە کرد و گوڵاوی پێیدا ڕشاند و بەدەستووری گەوران سوکواری بۆ دانا و

بەڕەوشتی پادشایەتی لە تابووتی نا. هەتا دەروازەی شار لە پێش تابووتەکەوە ڕۆیشت، سەرداران و سەرکردەی سوپا و گەورەی شاری هەتا گۆڕستانی لەگەڵا نارد.

کە شێخ عەلیخان لەو شەڕەدا سەرکەوت هەموو مازندەران و ئوستراباد و گەیلان و خوراسانی خستە دەست خۆی.

حەسەنخان کە کوژرا، محەمەدخانی قوانلوی قاجارِ و ئاقا محەمەد و حوسێن قولیخان کوڕانی محەمەد حەسەنخان و ژن و منداڵانی هەڵگرت و لە ئوستراباد وەڕێی خستن و بۆ «گورگان»ی بردن. لە دوای ئەوە بێ چارە مان و ڕوویان لە دەرگای کەریمخان کرد، ئەویش بەگەورەیی ڕایگرتن و ڕەوانەی شیرازی کردن. لە ڕووی میهرەبانی و دڵخاوێنیەوە وەکو شازادەیەکی بەخێو دەکردن. ئەوەش پەروەردەیەکی وابوو کەلە دوامیندا کردنیە خوێخواری ماڵ و منداڵی خۆی.

ساڵی ۱۱۷۱ کەریمخان بەبێ کێشە بوو بەپادشایەکی سەربەخۆی ئێران و خاکی گەیلان، خوراسان، عێراق و ئاوربایەگان، فارس، مازندەران و ئەوانی دیکەی بەتەواوی گرت و لەگەڵ دراوسێکانیدا بەخۆشی بنچینەی دامەزراند و دۆستایەتی خستە نێوانیان. کەریمخان بەرهەڵستێکی کە لە پێشی بوو نەیدەهێشت بۆ ئارەزووی فەرمانڕەوایی سەرکەوێت، تەنیا محەمەد حەسەنخان مابوو، ئەویشی کە کوژت ئیتر هیچ گرێ و کۆسپەییێکی لەبەردەم نەما کە ببێتە مایەی سەرنەکەوتن.

کەریمخان کە کوڕانی محەمەد حەسەنخانی بردنە شیراز، ئاقا محەمەدی کردە نۆکەر و حوسێن قولیخانیشی کردە فەرمانگوزاری «دامغان». حوسێن قولیخان گەیشتە دامغان و دامەزرا و زۆری پێنەچوو، دەرگایێکی شۆڕشی بۆ کوردە دڵپاک و بێباکەکان کردەوە، ڕەگەزی تۆڵەکردنەوە بزاوتی و دەستی بەسەرکێشی و جەردەیی کرد. ئەوانەی لەپێشا لەتەکیا خراپەیان کرد. بوو گرتنی و کوشتنی و لەوێوە چووە سەر ئوستراباد و ئەویشی وەتەنگهێنا، هەموو دوژمنەکانی پێشووی کوژتن و گەڕاوە دامغان. بەو جۆرە هەر ڕۆژە بەسەر جێگاییێکیدا دەدا و تالانی دەکرد.

محەمەدخانی سەواد کوهی کە لەپێشدا ناوی «دادۆ» بوو، لە لایەن کەریمخانەوە کرا بەفەرمانڕەوای مازندەران. قولیخان چووە سەری و کوژتی. بەوە هەموو مازندەرانی کەوتە دەست.

کەریمخان کە لەوە ئاگادار بوو، وای بەچاک زانی حکوومەتی مازندەران بداتە

مەهدیخانی کوڕی محەمەدخان و لە جێگەی باوکی خۆی دامەزرێنێتەوە، بۆ ئەوەی کە تۆڵەی باوکی لە قولیخان بکاتەوە.

مەهدیخان بەهێزێکەوە چووە «بارفرۆش». لەولاوە قولیخان بەشەو چووە سەر بارفرۆش و مەهدیخانی گرت و لە بەندی کرد. دیسان هەموو مازندەران کەوتە دەست قولیخان، هەموو قەلا و جێگا سەختەکانی ڕووخاند و دوژمنەکانیشی کوژتن.

کەریمخان کە ئەو وەلامەی پێ درا لەشکرێکی نارده مازندەران و تورکمانی یوخاری باشیشی هاندا و چوونە سەر حوسێن قولیخان و گرتیان و کوژتیان. کەریمخان ئەو لەشکرەی لە ژێر فەرمانی زەکیخانی برایا نارده مازندەران. لە دوای کوشتنی حوسێن قولیخان ئەیالەتی مازندەرانی دا بەزەکیخان. ئەویش کە گەیشتە مازندەران ژن و مندالانی قولیخان و مورتەزا قولیخانی کۆکردنەوە و بۆ قەزوینی ناردن. ئەو ئاگرەشی بەو جۆرە کوژاندەوە و هەموو قاجارەکانی بلاوکردنەوە. (ق. ب. ١).

## لەشکر ناردنی کەریمخان بۆ سەر خاکی عیراق (١١٨٩- ﻫ)

کەریمخان ئەگەرچی لەتەک حکوومەتی تورکی عوسمانیا نێوانی خۆشبوو و پەیمانیان لە نێواندا هەبوو، بەلام لەبەر چەند چتێکی زۆر گەورەی هاتوو لە والی بەغدا دلگیربوو و لە سێ لاوە لەشکری نارده سەر خاکی عێراق و شارەزوور و هەلمەتی بردە سەر بەغدا و بەسرا.

١- موتەسەڕیفی خاکی بابان، محەمەد بەگ لە لایەن عومەر پاشای والی بەغداوە لە حوکمڕانی خرا و مەحموود بەگی برای ئەوی لە جێگا دانا. محەمەد بۆ ئەوەی کە لەسەر حوکمڕانی داندرێتەوە پەنای بۆ کەریمخان برد. کەریمخان لەو بابەتەوە قاقەزێکی بۆ عومەر پاشا نوبسی. لە لایەن پاشاوە نوبسراوەکە بەهێند نەگیرا.

٢- خەلکی ئێران بۆ زیارەتی ئیمام حوسێن لە ئێرانەوە چوون و لە گەڕانەوەدا مال و ئەسپابیان لە لایەن والییەوە تالان کرا و بەئەتک و سووکی دەرکرابوون. کەریمخان ئەوەشی لە عومەر پاشا گەیاند، بێ سوود مایەوە.

٣- لەو سالەدا چاوقولکە کەوتبووە خاکی عێراق ونزیکەی سەد مال لە (خەلکی ئێران مردبوون و مال و ئەسپاب و شتومەکی ئەوانە لە لایەن والی بەغداوە تالان کرابوون. کەریمخان ئەوەشی دیسان بۆ عومەر پاشا نوبسی کە بیداتەوە، وەلامی نەداوە (ج. ب. ١- ل- ١١٣- ١١٤- ١١٥).

٤- توشمالی «چرفە»ی کەنزیک سەد ماڵە زیمی بوون، لە عومەر پاشای خواستن کە بۆ نیشتمانی خۆیانیان بنێرێتەوە، کە کەوتبووە بەسرا و ئەویشی گوێدێر نەکرد و نەیبیهیست، لەسەر ئەوەشا سەربهوردانی گوتراو بەنویسراوی بۆ ئەستەمبووڵ نارد و لە عومەر پاشای گازاندە کرد. بەڵام لەولاوە گەورە و خوانینی ئێران لە دەوری کەریمخان کۆمەڵیان بەست و پێیان گوت: «ئەو خاکانەی کە لەوەپێش هەر لەسەر خاکی ئێران بووە و ئێستاکەش واچاکە ئەو خاکە بخرێتە ژێر فرمانی خۆمانەوە». بەراوردی قسەی هەمووان کرا و گوترا لەوەپێش کەریمخان کە لە ئاورابایەگان لەتەک ئەفغانەکانا شەڕی دەکرد، پادشای ڕۆم یارمەتی دوژمنی دەکرد و بۆ خراپەی خاکی زەند دەکۆشا (جەودەت).

## چوونی نەزەر عەلیخان بۆ سەر درنە

نەزەر عەلیخان بەسوپاهێکی قورسەوە چووە سەر درنە، میهرود، مەندەلی و بەدرە. ئەوخاکەی هەموو بەجارێک پاماڵ کرد و ڕوو بەدەوروپشتی بەغدا لە بزووتنەوە دابوو. بەزستان شارەزووری خستە دەست و محەمەد شەفیع خان هەموو خاکی شارەزووری دەورە دا. بەلەشکری ئەردەڵان و کەلهوڕەوە بەسەر خاکی شارەزوورا ڕۆیشت و هەتا نزیک کەرکووکی گرت؛ لە خودی شارەزوور ناوچەی گرێدا. ڕۆژ بەڕۆژ هێزی لەسەر کۆبووەوە.

لەبەر شەڕوشۆڕ و کوژتاری دەورەی شار، بەغدا تووشی نەبوون و تەنگی خواردەمەنی و دانەوێڵە بوو. لە لایەن کەریمخانەوە لەشکرێکی دیکەشی ڕوو بە«قارس» لە ئاورابایەگانەوە بەرێ کرا. وەزیر «ئەحمەد عیزەت پاشا»ی موحافیزی قارسیان وەتەنگ هێنا.

## چوونی عەلی مورادخان بۆ سەر شارەزوور

محەمەد بەگی بابان، هەروەکو لە پێشا لێی دواین، لە لایەن عومەر پاشاوە لە فەرمانڕەوایی شارەزوور خرا و پەنای بۆ کەریمخان برد. لە دوای ئەوە کە عومەر پاشا قسەی کەریمخانی بەهێند نەگرت، کەریمخان لەشکرێکی بۆ عەلی موردخانی خوارزای خۆی ڕێکخست و لەگەڵ محەمەد بەگا بۆ شارەزووری بەرێکردن.

لەولاوە عومەر پاشاش ١٠٠٠٠ کەسی نارده قەڵاچوالان کە کۆمەگی مەحموودبەگی بابان بکەن. لە دوای شەڕ و کوژتارێکی زۆر محەمەد بەگ لەسەر فەرمانڕەوایی بابان دانراوە.

## چوونی سادقخان بۆ سەر بەسرا - یەکی مەحەرەم - ١١٨٩

ساڵی (١١٧٨) کەریمخان کەوتە سەر ئارەزووی گرتنی خاکی عێراق و شارەزوور و لەگەڵ سەرکردە و گەورەکانی ئەو خاکەدا دەستی بەنوسراو ناردن کرد. چونکە خەڵکی عێراق دادگەری و میهرەبانی کەریمخانیان پەسند کردبوو و لە ڕەنج ودڵگیریدا لە دەست عومەر پاشای والی بەغدا دەژیان، بەچاکی پێشوازی ئەوەیان ئەکرد کە بکەونە ژێر فەرمانی کەریمخانی زەندەوە.

لەو ساڵەدا شێخ سلێمانی برا گەورەی «بەنی کەعب»ی عارەب بەخێڵەکەیەوە پەنای بردە بەر کەریمخان. لە خاکی «دورق»دا دامەزراندران و بەخێو کران (ع. تەئریخی بەسرا- ل- ١٤٣).

فەرمانڕەوایانی زەند بەوجۆرە لەگەڵ خاکی عێراق خەریک بوون و خەڵکەکەشی بەهەموو جۆرێ نوازش دەکرد. محەمەدی خەزینەدار لەو دەمایا هان درابوو کە لە بەغدا هەواداری بۆ پەیدا بکات و خەڵکەکە بکاتە هاودەنگ (ع- تەئریخی بەسرا- ل ٢٠٩).

ساڵی ١١٨٨ کەریمخان لەگەڵ پادشای عوسمانی عەبدولحەمید خانا نێوانی - بەو جۆرەی کە لەپێشا لێی دواین- تێکچوو و جاڕی شەڕی لەتەکا کێشا. لەشکرێکی ١٢٠٠٠ کەسی لە ژێر فەرمانی سادقخانا نارده سەر بەسرا. شێخ سلێمانی بەنی کەعب بەهەموو هێزێکی کە لە دەستی هات بەئارەزووی خۆی لەتەک سادقخانا چووە سەر بەسرا (ع).

لەو دەمەدا موتەسەلیمی بەسرا سلێمان بەگ کە بەسلێمان پاشای گەورە و بە«ئەبوسەعید» ناوبانگی کردبوو، لە ساڵی ١١٨٢وە لەسەر بەسرا بوو لەشکرێکی ڕێککەوتووی ساز کرد و لە دوامینی ئیشا خۆی لە شار پەستاوت و دەروازەی قەڵای لەسەر خۆی بەست. نزیک ١٣ مانگ لەنێو شارا بەقەڵابەندی ماوە. سادقخان لە شەڕ و دەورەدانی شار دەستبەردار نەبوو. سلێمان بەگ ناچار بەمەرج خۆی بەدەستەوەدا. ئەگەرچی هێندە ڕاوەستانەی بۆ گەیشتنی یارمەتی بوو، کە نائومێد بوو دەروازەی شاری لە سادقخان کردەوە (ع. ل ١٤٤).

ساڵی ١١٨٩ ھ / ١٧٧٥م سادقخان کە شاری گرت، خەڵکەکەی بەخۆشی و چاک نوازشکردن و لەگەڵ ئەو ئینگلیزانەی کە لە بەسرابوون گەلێک چاکەی کرد و نوازش و میهرەبانی لەتەکیانا نواند. سادقخان کە لەگەڵ سلێمان بەگدا ڕێککەوت شاری گرت، لە

سەرهات و گەورە و بازرگان و کار لە دەستانی بەسرای چەند کەسێکی لەگەڵ سلێمان بەگا گـرتن و لەتەک خـۆیا بردنیـە شـیـراز و پێـشـکەش بەپادشـای کـاکی کـردن و عـەلی محەمەدخانی خوارزای بە ۱۲۰۰۰ کەسەوە لە بەسرا دانا (ع).

عەلی محەمەدخان ئەو خاکەی ڕۆژ بەڕۆژ ڕام دەکرد و هەتا نزیک بەغدا و مونتەفیکی خستە ژێر فەرمانییەوە.

عـەلی مـحـەمـەدخـان لەشکرێکی ۱۰۰۰۰ی هەڵگرت و چووە مـونتـەفـیک و ۲۰۰۰ کەسی لەژێر فەرمانی محەمەد حوسێنخانی برای لە بەسرا دانا. محەمەد حوسێنخان لە بەسرا خەریکی بەخێو کـردن بوو و عـەلی مـحـەمـەدخـان ڕوو بەمـونتـەفـیک هەتا فـوراتی ئاژووت. عارەبی مونتەفیک لەژێر فەرمانی «سامیر بن سەعدوون و سوەین بن عەبدوڵڵا» دا چوونە پێش لەشکری کورد. عەلی محەمەدخان فەرمانی دا کە شەڕ و کوژتار دەست پێ بکرێت (ع).

لەشکری زەند لەبەر توندی گەرما تەنگاو ببوون و هەرچیـێکو عارەب بوون لە گەرمای دەشتـدا بێ باکانە دەکـۆشان وشەڕیان دەکرد. لە دوامینی شەڕ و کوژتارا کـورد شکان و هەتا نزیک چۆمی فورات ڕانەوەستان. عارەبەکانیش ڕوو بەخاکی خۆیان گەڕانەوە.

لەولاوە سادقخـان کە لەوە ئاگادار بوو، بە لەشکرێکی قورسەوە لە شـیراز دەرکەوت و ڕوو بەبەسرا کەوتە ڕێ. سادقخان کە گەیشتە بەسرا خێلی عارەبی لەگەڵ شێخ سلێمانی بەنی کەعبێ خست و لەژێر فەرمانی عەلی محەمەدخان و مەهدیخانی برایا ناردنیە سەر مونتەفیک کە تۆڵەی پێشوو بستێنن. بەدبەختانە بەر ئاوەژووی ئارەزوویان ڕوویدا (ع).

لەولاوە مونتـەفـیکیـەکان بۆ بەرامبەری ڕاوەسـتـان. گەورەکانی عارەبی مونـتـەفـیک بۆ پێکهاتن پیاویان ناردە کن عەلی محەمەدخان کە شەڕ نەکەن و بەمەرج ڕێککەون. عەلی محەمەدخان چەند پەیمانێکی سەختی لێ خواستن؛ ئەوانیش ئەوەیان نەویست لەسەر شەڕ ڕقیان بەست.

هەردوو لا لە خاکی «ئەبی حەلانە» بەگژ یەکدا چوون. زەندەکان لەسـەر دەستووری تیپ شەڕیـان دەسـتـپـێکرد، عـارەبیش تاکو جووت و بەهۆسـەکێـشـان پەلامـاریان دەبرد. تۆز و گەرمی، لەشکری زەندی وەتەنگ هێنا. لە هەردوو لاوە کـوژتـارێکی فـورس کـرا، بەڵام لە دوامینا لە جەرگەی شەڕا عەلی مـحەمـەدخانی سەردار سوپاهی کوردی زەند و مـەهدیخانی برای کوژران. لەشکری بێ سەردار شپرزە بوون و زۆر و کەمی ڕوو بەبەسرا هەڵاتن.

## جارِی شەڕی تورکی عوسمانی لەتەک کوردەکانی زەنددا ۱۱۹۰

لەبەر ئەوە کە کەریمخان لە سێ لاوە لەشکری ئاژووتە سەر خاکی عێراق و بەسرا، شارەزووری گرت و خاکی قارسیشی وەتەنگ هێنا، سولتان عەبدولحەمید خان سەردار و وەزیرەکانی کۆکردەوە و بەیەکیەتی پەیمانیان کرد کە بۆ سەر کوردی زەند جارِی شەڕکردن بکێشن و بەسرا و خاکەکانی دیکە لە کەریمخان بستێننەوە. لە دوای چەندجار کۆبوونەوە ئەو پەیمانە گرێدرا.

بۆ گەیشتنە ئەو ئارەزووە عەبدوڵلا پاشا کرا بەوالی بەغدا و حەسەن پاشا بۆ موتەسەریفی شارەزوور داندرا و فەرمان بۆ متەسەرِفی قەرە حەساری میری میران محەمەد پاشا، موتەسەریفی ئاقشەهر، موتەسەریفی سێوەرەک، موتەسەریفی بوزادق، گەورەی ئێلی کوردی میللی، دانیشتووی ڕەقە، خەڵکی ئەنادۆڵ، قارەمان، حەلەب، مەرعاش، ڕەقە، سێوەرەک، مووسڵ، دیاربەکر نوسرا و بەوالی بەغدا ناردران کە هەموویان بەلەشکر و ماڵەوە بۆ کۆمەگی لەگەڵی بچنە بەغدا و لەگەڵ زەنددا شەڕ بکەن. بەوجۆرە لە ئەستەمبوولْ ئەو والییە بۆ لەشکر کۆکردنەوە ڕوو بەبەغدا کەوتە ڕێگا.

لە لایێکی دیکەشەوە خەلات و دیاری گرانبەها و فەرمانیان بۆ خانەکانی ئاوربایەگان نارد کەس یارمەتی کەریمخان نەکەن و لە تەک ڕۆما ڕێککەون. بۆ حوسێن عەلیخانی ئێرەوان ۲ هەزار لیرەی زەرد و کەولێکی سمۆرە و شالێکی کرمان؛ بۆ ئەرکەلیخانی تفلیس هەزار لیرەی زەرد و کەولێکی سمۆرە و سەرێک ئەسپ بەڕەخت و زین و بەرگی بەزێڕ و گەوهەر ڕازاندراو وە بۆ ئەحمەد خانی خویی و ۱۵۰۰ لیرەی زەرد و کەولێکی سمۆرە ناردران، بۆ خانەکانی گەنجە، شێروان، نەخچەوان، قەرەباخ و هی دیکەش فەرمان و تکانامە ناردران کە بەناوی دینەوە یارمەتی ڕۆم بکەن و لە کەریمخان ڕووگەردان بن.

ئەحمەد جەودەت لە بەرگی یەکەمی مێژووەکەی و لاپەڕە ۱۲۳- ۱۳۰دا زۆر دوورودرێژ لەوە دواوە و لە دوامینا دەڵێت: لەبەر ئەوە کە مستەفا پاشای والی بەغدا، بەکەریمخان فریوی خوارد بوو، ناردرایە دیاربەکر و بەقەلابەندیی گەتووبوو. لە ئەستەمبووڵەوە بەتایبەتی پیاویان نارد و سەری بڕی و بردیە ئەستەمبووڵ.

## کوژتنی خالید پاشای بابان

خالید پاشا لە شارەزوور بەرِق هەستاوی چوو پەنای بۆ کەریمخان برد و لەویٚ فەرمانێکی وەرگرت و گەرِایەوە: مەندەلی، بەدرەو جەسانی بەموتەسەریفی پیٚ بەخشرا: لەسەر ئەو خاکە دەستی بەفەرمانرِەوایی کرد.

والی بەغدا قاقەزێکی بۆ نوسی و بەفیٚلّ و دەسیسە خەلّەتاندی و بەمەرجی ئەمە کە لە کەریمخان رِووگەردان بێت و بکەوێتە ژێر فەرمانی رِۆمەوە، لە گوناهی دەبوورێت. والی لەگەلّ خەلّەتاندن و فریودانی خەریک بوو، بەپەنهانیش لەشکری رِێک دەخست کە بچێتە سەری.

خالید پاشا کە لەوە ئاگادار بوو، بەلەز بۆ کەریمخانی نوویسی کە فریای کەوێت. کەریمخان فەرمانی دا بەنەزەر عەلیخان کە: لە کرماشانەوە بچێتە یارمەتی خالید پاشا. نەزەر عەلیخان لە پێشا خان کەلهورِی بەلەز نارد و بۆ خۆشی بەلەشکرەوە کەوتە رِێگا.

والی بەغدا لەژێر فەرمانی باشچاوشی خۆیا لەشکرێکی لە خەلّکی بەغدا نارده سەر خالید پاشا و لە پاشا کەتخوداشی بەدەستە لەشکرێکەوە نارد. لەولاوە خالید پاشا لە کوردی قزلّباش و لە کوردی ئەو نێوانە لەشکرێکی هەلّگرت و چووە پێشەوە و لە کەنار مەندەلی بەگژ لەشکری بەغدا یاچوو. لە دوای شەرِێکی قورس لە کورد گەلیٚ بەکوژت چوون و شکستەیان تێکەوت. خالید پاشا و ئامۆزایەکی محەمەد بەگ و لە هەوادارانی سیٚ کەس و «قەهرەمان خان» و دوو نۆکەری بەدیل گیران و سەریان برِا و بۆ ئەستەمبوولّ ناردران و لە لایەن عەبدولحەمید خانەوە تۆپێک کەولّی سمۆرە و شیرێکی گەوهەربەند بەخەلاّت بۆ والی ناردرا.

## شەرِی محەمەد پاشای بابان و سالّح خانی بانە ١١٩١

والی مووسلّ حەسەن پاشا بەدیاری و خەلاّت و بەخشش، دلّخۆشی محەمەد پاشا و ئامۆزاکانی داوە و خەلّەتاندنی و لە کەریمخانی زەندی پچرِینەوە. ئەوانیش لەگەلّ فریودانی کوردی ئێرانا تەقەلایان دەدا و دەیانکردنە هەوادار و یاری خۆیان.

محەمەد پاشا لە لایەن حەسەن پاشاوە کرا بەچەرخەچی باشی و بۆ چوونە سەر خاکی زەند هاندران. محەمەد پاشا لە رِێگای سنەوە و ئەحمەد پاشاش لە شاخەکانەوە ناردرانە سەر کوردستانی بانە و ئەردەلان؛ بۆ خۆشی بەسوپاهێکی زلەوە چووە یارمەتییان.

سالح خانی بانه کە لەوەپێش دۆستی بابانەکان بوو، بەوە کە بابان بوون بەهەواداری ڕۆم لێیان دڵگیر بوو، بۆ شەڕیان سوپاهی ساز کرد و ڕۆژی ١٤ ڕەبیعی یەکی ئەو ساڵە، هەردوو لا نزیک سێ سەعات لە یەکتریان کوژتار کرد. سالح خان ناچار بوو کە شاری بانە چۆڵ کات و بکەوێتە نێو شاخە بەرزەکانەوە. لەشکری محەمەد پاشا کەوتە نێو شارەوە و تالان و وێرانی کرد و گەڕاوە. لەسەر ڕێگا تووشی هەر بێ دەسەڵاتێ بوون، گرتیان و کوژتیان وکەللەسەرەکانیان بۆ حەسەن پاشا و لەوەوە بۆ ئەستەمبووڵیان ناردن.

سالح خان هاواری لە خوسرەو خانی والی کوردستانی سنە کرد کە کۆمەگی بکات. کەریمخان فەرمانی دا بەخانانی موکریان و مەراغە و قەرەگوێز و هەمەدان کە بەلەشکرەوە فریای سالح خان کەون.

٢٧ی ئەو مانگە لەشکری کوردی ئەو خاکانە ڕوو بەخاکی بابان چوون و هەردوو لا بۆ کوژتار ڕیزبوون و نزیک ٤ سەعات خوێنی یەکتریان ڕژت. لەو شەڕەدا ٢ هەزار کوردی هەردوو لا کوژران. بابانەکان خراپ شکاندران. جەودەت- جلدی یەکەم - لاپەڕە ١٤٣ دەڵێت: لەو شەڕەدا ٢٣٣ کەللەسەر بۆ ئەستەمبووڵ ناردرا.

## پادشاهی کەریمخان لە ساڵی ١١٧٢- ١١٩٣ھ / ١٧٥٨- ١٧٧٩م

کەریمخان لە دوای ئەو کێشە و شەڕ و کوژتارانە تەواو ٢٠ ساڵ و چەند مانگ لە هەموو خاکی ئێرانا پادشاهیێکی سەربەخۆیی کرد، بەبێ شەڕ و دوژمنایەتی و نەیاری فەرمانڕەوایی بەئازادی بەسەربرد و بەخۆشی خاکی ئێرانی ڕاگرت. کەریمخان هەرچەند لە خاکی ئێرانا ناوی پادشاهی بەخۆیەوە نەنابوو و بە«وەکیل» ناوبانگی کرد بوو؛ بەڵام بەڕاستی فەرمانڕەوا و پادشاهێکی بەشان و ئازاد و سەربەخۆ بوو. سککەی لەسەر دراوی زێڕ و زیو و مس بەناوی خۆیەوە لێدا و لەسەر مینبەران خوتبە بەناوی ئەوەوە دەخوێندرایەوە.

پایتەختی پادشاهی کەریمخان شاری شیراز بوو. مێژوونوسی بەناوبانگی ئینگلیزی «ساکیس» لە بەرگی دووەمی مێژووە گرانبەهاکەیا دەڵێت: «ئەو کۆشک و باڵەخانە و خانووبەرە جوان و خۆشانەی کە ئەمڕۆ لە شیراز جێگای سەربلندی و خۆ پێنواندنی گەلەکەیەتی، هەموو لە سایەی کەریمخانەوەیە. لە بابەت دادخواهی و دادگوستەری و خۆشڕوویی و میهرەبانی و دڵسۆزی کەریمخان لە شیراز لە هەموو کەس گوێدێر دەبووم و لە خەڵکەکەم دەبهیسێت. خەڵکەکەی شیراز زۆر باش لە چاکەی دەدوان و کەریمخان چەندە

پیاوێکی چاک بوو و دادگوستەر بوو بۆیان دەگێڕامەوە. مەتەڵێک بۆ ئەمە هەیە: کە هێندە خەڵکەکەی خۆشدەویست بۆ کەیف و شادی و خۆشی هان دەدان و بۆ شادی و چۆپی گرتن و زەماوەند دەیبزاوتن. لە گەڕەکێکی شیراز ئەگەر ڕۆژێک دەنگی مۆسیقا و گۆرانی نەهاتبایە، بانگی خەڵکی ئەو کووچەی ئەکرد و پێیانی ئەگوت بۆچی لە گەڕەکەکەی ئێوە دەنگی مۆسیقا نابیێت؟ دەزبەجێ دەیگوت: کە لەو گەڕەکە مۆسیقا لێ بدرێت و لێئەدرا، هەروەکو شایەرێکی ئێرانی گوتوویەتی: «ئەهالی شیراز هەمیشە لە خۆشی و کەیف پیز پایدا بەسەریان دەبرد. ئەویش کەیفێکی وا کە چاخی بێ کاری و بێ ئیشییان لەگەڵ ژنی ماهرووەکانا ڕادەبوارد. ئەستێرەکان دەدرەوشانەوە و لە خۆشیان هەموو دڵێک بەکەیف و هەموو سینەیەک بەمیهرەبانی و شادمانی ڕایدەبوارد».

کەریمخان لەتەک خەڵکی خاکی خۆیا زۆر تێکەڵی هەبوو. ئەگەرچی لە مانادا پیاوێکی زۆر گەورە و بەشان و شەوکەت و فەڕبوو، بەڵام بەگەورەیی خۆی بەژێردەست و ڕەعیەت نەنواندبوو. کە کەریمخان ڕۆژی ١٣ی مانگی سەفەر ساڵی ١١٩٣ بەئامورزشی یەزدان شاد بوو کەریم خان کە مرد لە تەمەنی هەشتا ساڵیە بوو. ئێرانییەکان لە ئاسوودەگی و خۆشی بێ بەش و بێ بەهرە مانەوە. مردنی کەریمخان بوو بەمایەی پشێوی دڵی خەڵکەکە، هەموو خەڵک لە سۆیانی ڕەشپۆش بوون و کۆتەڵیان بۆ ڕازاندەوە و بەشین و گریان هەڵیانگرت و بردیان ناژتیان.

## بەندی دووەمین

### پادشاهی زەکیخان ۱۱۹۳ھ / ۱۷۷۹م

له دوای مردنی کەریمخان زۆر کەس کەوتنە سەر هەوای پادشایی و بۆ گەیشتنە ئارەزوویان سەریان بەرز کرد. بنەماڵەی زەند بەشەڕ و کوژتاری خۆی بەخۆی و یەکیەتی نێوانی شکستەیان تێنەکەوت و نەبڕانەوە، بەڵام شەڕکردنیان لەگەڵ قاجاڕان بوو بەمایەی سستی خستنە بناغەی فەرمانڕەوایی و بێ هێزکردن و کەم دەستی لەشکر و سوپا و بارەگایان.

کەریمخان جگە لە سادقخان کە سەرکردەی لەشکری بەسرا بوو، برایەکی دیکەشی هەبوو. بەڵام ئەویش زڕبرا بوو له دایکی بوو نەک لەبابی، ئەویش ناوی زەکیخان بوو کە لە دوای کەریمخان بەجارێک جاڕی سەربەخۆیی کێشا، بەڵام لە دوامیندا تەنبێ کراو بەخشرا هەروەکو دەگوترێ.

لە پێشا لێی دواین کە زەکیخان بوو بەفەرمانگوزاری مازندەران و دامغان و حوسێن قولیخانی لەوێ کوژت. لە دوای مردنی کەریمخان لە دامغانەوە بەلەشکرێکی زلەوە ڕوو بەپایتەختی شیراز گەڕایەوە و هەموو خاکەکەی بەزۆر داگیر کرد. تەقیخانی زەندی کردە فەرمانڕەوای «ڕەی و فەیروز کوە» بەڵام هێزێکی بەتوانا لە گەورەکانی زەند قەڵای شیرازیان گرت و ئەبو فەتحخانی کوڕی کەریمخانیان لەسەر تەختی پادشاهی دانا و بەپادشایان پەسند کرد.

زەکیخان بەپشتیوانی عەلی مورادخانەوە کۆشا و ناچار بوو کە پادشا ئەبو فەتحخان پەسندکا و بۆ لەسەر تەخت دانانی بکۆشێت و بۆ خۆشی بکەوێتە ژێر فەرمانییەوە. لەسەر ئەوە لە شاری شیراز ۳ ڕۆژ خوێن ڕێژرا، گەورەکانی زەند کە ببوون بەهەواداری چوونە سەر تەختی ئەبو فەتحخان و پادشایی ئەویان ویست و هەموو خەڵاتکران و دڵخۆشی درانەوە.

سادقخان کە لە بەسرا بوو لەو سەربهورده ناخۆشە ئاگادار بوو کە: کەریمخانی برای مردووە، بەلەز بەسرای بەجێهێشت و بۆ تەخت و تاج وەدەستخستن تالووکەی کرد، بەهەڵمەتدان ڕووی لە شیراز کرد.

زەکیخان کە ئەوەی بهیستێت مەرجی کرد کە هەموو ژن و منداڵەکانی سادقخان بکوژێت. لەشکر و خەڵکەکە کە لەوە گەیشتن هەموو بەجارێک ڕووگەردان بوون و لەژێر

فەرمانی دەرکەوتن. زەکیخان ناچار بوو کە خۆ لە مەیدان ڕزگار کات و ڕوو بەکرمان هەڵێت و بۆی دەرچێت. کە زەکیخان لە نێوانێ دەرکەوت، پەنای بۆ قەڵای «بام» برد کە لە نێوانی خاکی کرمانایە. هەروەکو لە باسی سادقخانا دەبێژرێ، زەکیخان بەو هەڵاتنە گرێیانی لە پەنجەی شەڕی خۆبایەتی دەرخست و ئاسوودە دانیشت.

بەڵام شازادەی نەوجوان عەلی مورادخان لە زەکیخان دڵگیر بوو و بەجارێک نێوانی تێکچوو. لەشکرەکەی هاندا کە ئەبو فەتحخان بکوژن. لەشکرێکی گرانی بەناوی جێگا نوشینی کەریمخانەوە ناردنە سەر ئەسفەهان کە بیگرن.

زەکیخان لەولاوە هەرچەندە هێزێکی لەژێر فەرمانیا بوو هەڵیگرت و ڕوو بەئەسفەهان ڕۆیشت و لە نزیکەوە لەشکربەزی کرد و خەڵکەکەی ئەو لایانەی کۆکردنەوە. چونکە لەوە پێش گەلێکیان خراپە کردبوو، دراوێکی قورسی پادشایان خواردبوو، لەبەر ئەوە ١٨ کەسی خستنە ژێر پرسیارەوە و لە دواییدا کوژتنی. ئەو سەربهوردە بۆ زەکیخان دوامینی خراپ بوو، دڵی لەشکریان و خەڵکەکەی لێبووەوە، سوپاهەکەی ڕوویان وەرگێڕا و سەرکردەکانیشیان لەگەڵ کەوت و پەلاماری زەکیخانیان داو کوژتیان (ساکیس).

***

کە کەریمخان مرد ئاقا محەمەدخانی قاجاڕ لە شیراز نۆکەر بوو. خزم و کەسەکانی خۆی هەڵگرت و هەڵات و گەیشتە نێو تورکمان و بانگی سەرکێشی دا و دەستی بەجەردە کۆکردنەوە کرد.

خان ئەبدالخانی کوردی جیهانبەگی بە ٥٠٠ سوارەوە یارمەتی ئاقا محەمەدی دا چونکە لەوەپێش لە زەکیخان دڵگیر ببوو. ئاقا محەمەد بەپشتیوانی کوردەکانی چەمشکزەکەوە ڕۆژ بەڕۆژ هێزی ئەستاند و ئێلی تورکمانی ڕامی خۆی کرد. لە خاکی ئوستراباد و مازندەرانا دەبزووتەوە (تەئریخی قاجاڕ- جلدی یەک- لاپەڕە ١٩).

## عەلی مورادخان لە دەوری زەکیخان و ئەبو فەتحخان و سادقخانی زەندا و شەڕی لەگەڵ قاجاڕان

عەلی مورادخان بۆ زەکیخان لەشکری هەڵگرت و چووە تاران و لەوێشەوە لەشکری لاریجانی ناردە سەر ئاقا محەمەدی قاجاڕ و لەگەڵ جەعفەر قولیخانی برای ئاقا محەمەد شەڕیان کرد و شکاندیان و شاری «ئامۆل»یان لە سەرکێشەکان ئەستاندەوە. عەلی مورادخان بەهەر جۆرێک بوو، ڕەزا قولیخانی برای ئاقا محەمەدی کردە هەواداری خۆی و

بەگژ ئاقا محەمەدیدا کرد. ڕەزا قولیخان لە سەواد کوهەوە چووە سەر ئوستراباد و گرتی و خاکی «وەرامین»ی خستە دەست و هەموو سەرکردەکانی لە ئاقا محەمەد پچڕیەوە و چووە تاران. عەلی مورادخان لەوێوە ناردیە ئەسفەهان و لەوێشەوە بۆ کن سادقخانی بەڕێ کرد.

عەلی مورادخان لەولاوە بۆ بەرامبەری ئاقا محەمەد، لەشکری ساز کرد و مورتەزا قولیخان و مستەفاخانی قاجاڕی بزاوتن و لەتەک ئاقا محەمەد شەڕیان کرد.

لە «ساری»خان ئەبدالّخانی کوردی جیهان بەیبکییان گرت و سەریان بڕی و بەدیاری بۆ ئاقا محەمەدیان نارد (تەماشای کتێبی ئێمەی ناودارانی کورد بفەرموون).

ساڵی ١١٩٤ ئاقا محەمەد بەلەشکرەوە چووە سەر براکانی و شاری وەتەنگ هێنا و براکانی گرت و چووە سەر ئوستراباد و گرتی و چوو دامغانیشی خستە ژێر فەرمانییەوە.

«قادرخان»ی عارەبی بەستام بەفەرمانی عەلی مورادخان لەشکری بردە سەر ئاقا محەمەد. لە دوای کوژتارێکی زل، تەنگە بەقادرخان هەڵچنرا و هەڵات. دامغان بەزۆر کەوتە دەست قاجاڕان.

عەلی مورادخان لەژێر سەرداریی ئەمیر گۆنە خانی کوردی هەوشارا لەشکرێکی ناردە سەر «مازندەران». خەڵکی لاریجانی بەلەشکرەوە پێشوازییان کرد و سەریان بۆ نەواند. ئاقا محەمەد هێزێکی ناردە سەریان و لە دوامینا زۆر پیس شکاندران و پووچکرانەوە.

ئاقا محەمەد بەهەموو هێزێکیەوە لە «سەبزە مەیدان» چووە پێش ئەمیر گۆنەخان. لە پاش شەڕکردن، عەباس قولیخانی کوڕی ئەمیر گۆنەخان کوژرا و محەمەدخانی لاریجانی بریندار بوو و مرد.

قاجاڕ ئەمیر گۆنەخانیان وەتەنگ هێنا و بەکوژتار هەڵیانبڕی. ئەمیر گۆنە خان بەشکاوی گەڕاوە تاران.

ئاقا محەمەد دیسان دامغانی گرت و چووە سەر سەمنان، لاریجان و بەستام. لەولاوە عەلی مورادخان چووە ئەسفەهان و لەشکری کۆکردەوە و چووە کرماشان کە هێزێکی گەورە وەدەستخات. ئاقا محەمەد لەو کەلێنەدا عەلی قولیخانی ناردە سەر تاران و چەند دێهاتێکی تالان کرد و گەڕاوە شاری ساری.

ئاقا محەمەد لەشکرێکی لە ژێر فەرمانی مورتەزا قولیخانا ناردە سەر گەیلان. «هیدایەتوڵلاخان» کە لە لایەن زەندەکانەوە والی ئەو خاکە بوو، ساڵی ١١٩٥ سەنگەری دروست کرد و بۆ شەڕ ئامادە بوو. ٤٠ ڕۆژ شەڕ و کوژتار کرا، قاجاڕ لە دۆڵ و پەسێوەکانا

هەڵمەتیان بردنێ، هیدایەتوڵڵاخان لە یەکەمیندا بۆیان دەرپەڕی و دەستی بەکوژتار کرد و گەلێکی بەدیل گرتن و زۆری شپرزەکردن و لەسەر خۆی لابردن (تەئریخی قاجاریە- جلدی یەکەمین).

## پادشاهی ئەبو فەتحخان

هەر وەکو گوترا بەکۆمەگی هەموو زەندەکان و عەلی مورادخان و خەڵکی شیراز، ئەبو فەتحخان لە دوای زەکیخان کرا بەپادشا. بەڵام ئەو پادشایە لاوێکی نەوگەیشتە و هەژار و بێدەسەڵات بوو، هیچی لە دەست نەدەهات. بەو ژیانە ٣ مانگ لەسەر تەختی پادشاهی دانیشت، لە دوامینا سادقخان بەگەلەکۆمەڵەی گەورەکان گرتی و لەگەڵ هەموو برادەرەکانیا لەبەندی کردن. لە دوای سادقخان لە دەست عەلی مورادخانا کوێرکران و بەو جۆرە مردن.

## بەندی سێیەمین

### پادشاهی سادقخانی کوڕی ئیناک

سادقخانی سەردار سپاهی کەریمخان لە بەسرە بوو. کە کاکی مرد، بەلەز بەسرای بەجێهێشت و بەلەشکرێکی لە دەستیا بوو لینگیدا سەر زەکیخان. بەڵام لەو دەمەدا زەکیخان بۆ ئەوە کە (تووشی) شەڕی یەکتری نەبێ، ڕوو بە«بام» چوو.

سادقخان بەزۆر چووە سەرشیراز و گرتی. ئەبو فەتحخانی برازای کە کرابوو بەپادشا لەگەڵ براکانی لەبەندی کردن. دەستی بەدامەزراندنی شیراز کرد؛ بەڵام عەلی مورادخان نەیهێشت ئاسوودە بێ.

عەلی مرادخان کەلێنی مەیدانداری دابوو، چاوەنۆڕی چاخ و دەمی دەکرد، خۆی ئاشکرا کرد و پەردەی فڕێدا و بەجارێک لەسەر ئەبو فەتحخان بەگژ سادقخان چوو و زۆر چاک شەڕی بۆ کرد، بەڵام لە دواییدا کەوتە سەر ئارەزووی تەخت و تاج وەدەستخستن. دەستی کرد بەپێکهێنانی هەواداری و فەرمانڕەواییەکی کە لەسەریا بوو.

لە ژێر سەرداری عەلی تەقیخانی کوڕی سادقخانا لەشکرێکی بەهێز کۆکرایەوە و ناردرایە سەر عەلی مورادخان. لە دوای شەڕ و کوشتار تەنگە بەعەلی مورادخان هەڵچنرا و هێزێکی کە هەیبوو پەرشوبڵاو کرایەوە و شکاندرا. ئەو شازادە نەوجوان و لاوچاکە کە لەودەمە کەمە و زوودا سەرکەوت و دوژمنێکی وا زلی بەو چالاکییە شکاند، پێی گێژ بوو و هەوای کەوتە سەر و تەشەخوسی لێ پەیدابوو، هەوای جەوانی و ئەو سەرکەوتنە لە هۆشی برد. لە کۆشک و باڵەخانەکانی ئەسفەهاندا بەکەیف و خۆشی و شادمانی ڕایبوارد و لە ئیشوکاری لەشکر و سوپا و فەرمانەدەهیا نەزان مابوو و لەکۆشەوەی دوژمن بێ ئاگادار ماوە و لەبەر کەیف نەدەپرژایە سەر شەڕی نەیاربەزی و کیشوەرگیری.

عەلی مورادخان لەوە کەلێنی دەست کەوت و لە نزیک هەمەدان هێزێکی تەواوی کۆکردەوە و شەڕێکی خوێناوی کرد و لەو شەڕەدا زۆر چاک سەرکەوت و لە دواییدا هەڵمەتی بردە سەر شیراز. عەلی مرادخان لەسەر ڕێگایا دەستە بەدەستە لەشکرەکەی سادقخانی دەشکاند و دەچووە پێشێ و هەتا گەیشتە شیراز پێشی بۆ خۆی خاوێن کردەوە و بەتوندی شیرازی دەورەدا و لەنێو شارا گرانی و نەبوونی خەڵکەکەی پەرێشان کرد.

سادقخان ۱۰۰۰ ماڵی بۆ دەرەوە لە شار دەرخست، هەر بەو جۆرە هەموو ڕۆژێ ماڵی خەڵکەکەی لەشیراز دەردەکرد و لەگەڵ ئەوەشا پێشی بەنەبوون و گرانی نەگرت. دەورەدان و وەتەنگهێنانی شیراز ۹ مانگ ڕاگیراو بوو، لە دوامینا عەلی مورادخان بەزۆر شیرازی گرت و سادقخانی هێنادەست و کوژتی و ئەبو فەتحخان و براکانی کە لە بەندابوون، دەریخستن و چاوی کوڵین (تەئریخی جەودەت- بەرگی یەکەمین- لاپەڕە ١٨٤).

ساڵی ١٧٨١-م کە عەلی مورادخان شیرازی گرت، سادقخانی وەدەستخست و کوژتی و جگە لە جەعفەرخان هەموو کوڕەکانی سادقخانیشی کوژتن. بەڵام جەعفەرخان لەوەپێش لەتەک عەلی مورادخان نووسرا و وەڵامی لە هاتوچۆدا بوو، ئەوە بوو بەمایەی ڕزگاربوونی لە کوژتن (ساکیس).

## بەندی چوارەمین

### پادشاهی عەلی مورادخان ١١٩٦- ١١٩٩ھ / ١٧٨٢- ١٧٨٥م

عەلی مورادخان کە شیرازی گرت و بوو بەپادشاهی هەموو خاکی ئیران و ئەسفەهانی کردە پایتەختی خۆی و دەستی بەدامەزراندنی لەشکر و سوپا و سەرکردە و سەرداران کرد و کەسێکی لەپێش خۆیا نەهێشت بەرابەری بکات و بەنەیاری ڕاوەستێت.

ساڵی ١١٩٧ ئاقا محەمەد بەلەشکرەوە چووە سەرگەیلان. ئەگەرچی حاجی جەمالخانی باوکی هیدایەتوڵڵاخان لەوە پێش خوشکی خۆی دابوو بەمحەمەد حەسەنخان و دوو کوڕی لێ هەبوو و لەنێویانا خزمایەتی بوو، بەڵام لە کوردی زەندیش ڕووگەردان ببوو و پەنا بۆ ئاقا محەمەد بردنی لە لای بەدنمەکی بوو و لەگەڵ ئەوەشا لەشکرێکی ڕێکخست و چووە پێش ئاقا محەمەد و دەستی بەقاجار کوشتن کرد. بەڵام زۆری پێنەچوو تەنگەی پێهەڵچنراو ڕوو بەخاکی شێروان دەپەڕاندرا و ئاقا محەمەد بەبێ شەڕ چووە نێو شاری «ڕەشت»دوە.

لەولاوە عەلی مورادخان لەشکری کرماشان و ئەسفەهانی ساز کرد و ناردیە تاران و ڕەزاخانی زەندی بەقۆشەنەوە ناردە ئاوربایەگان؛ خاکی سابلاغی موکری و مەقدەمی کردە لەشکرگا. کە هێزی تەواو کرد ڕوو بەگەیلان ڕۆیشت. جەعفەر قولی برای ئاقا محەمەد لەولاوە ڕوو بەئاوربایەگان دەچوو، ڕەزاخان پێشی پێگرت و پێی دادا و شکاندی و لەوێوە چووە قەزوین. مستەفاخانی قاجار لە لایەن ئاقا محەمەدەوە ناردرا بوو کە زەنگان بگرێ، ڕەزاخان چووە پێشی و تێکەوەی پێچا و بڵاوی کرد. ئاقا محەمەد ناچار ڕوو بەساری گەڕاوە. ڕەزاخان کە ئیشوکاری ئاوربایەگانی بەرهەم کرد، چووە تاران. حکوومەتی ڕووس چونکە سوێندخۆری زەندەکان بوو کە لەقاجارەکان وردبووە بەدەستێکی زۆر دوور کۆمەگی دەکرێن و ڕۆژ بەڕۆژ سەردەکەون، «کرفسخان» ناو سەردارێکی خۆیان بەچەند قازاخەوە ناردە «ئەشرەف» کە بۆ جێگا کڕین و فرۆتن (بازارگەڕی) قەڵایەک دروست بکەن، کەشتییێکی زۆریان لە دەریاوە برد. بەڵام کرفسخان لە بڕی کۆمەگی زەندەکان، بوو بەنێوبژی ڕووس و قاجار؛ ڕۆژ بەڕۆژ بەپەنهانی یارمەتی ئاقا محەمەدی دەکرد.

ئاقا محەمەد لەپشێوی نێوانی زەندەکان گەلێک کەلێنی دەست کەوت. لەشکرێکی

ئامادە کرد و بۆ گرتنی تاران کەوتەڕێ و بۆ گرتنی هەمەدانیش جەعفەر قولیخانی بەسوپاهێکەوە بەڕێخست و هەتا نزیک شاری تارانیی تالاَن کرد و شاری دەورەدا.

لەولاوە عەلی مورادخان چووە پێش جەعفەر قولیخان و وەتەنگی هێنان و بەکوژتار دەورەی گرتن. عەلی قولیخانی هەوشار کە لەتەک جەعفەر قولیخان بوو شکا و ڕوو بەخاکی خۆی گەڕاوە، لە دوای کەمێکی دیکەی کوژتار جەعفەر قولیخانیش شپرزە کرا و بەچەند نەفەرێکەوە لە مەیدانێ خۆی ڕزگار کرد و بۆ کن برای هەلاَت و هەموو چەک و چوتومەکیان تالاَن کرا.

ئاقا محەمەد لە دەورەی تاران بەڕاوڕووت خەریک بوو، لەشکری زەند کە لە تاران بوون چوونە پێشی و لەو دەشتەدا کارەساتێکیان بەئاقا محەمەد کرد کە ئەوسەری دیار نەبێ. ئاقا محەمەد و چەند کەسێک بەهەزار ئەزیەت گیانیان لە مردن ڕزگار بوو و بەشپرزەیی ڕوو بەساری هەلاَتن و گەلێک قاجارِ گرفتار بوون و کوژران.

عەلی مورادخان لەشکرێکی قورسی لە ئەسفەهان ڕێکخست و لەژێر سەرکردەیی شێخ وەیسخانی کوڕە گەورەی خۆیا بۆ مازندەرانی بەڕێ کرد. ١٠٠٠ سوارەی لوڕ و بەختیاری و کوردی کرماشانی هەلّبژاردەی لەگەلّیا ناردن.

شێخ وەیسخان گەیشتە «ڕەی» محەمەد عەلیخانی فەرمانڕەوای «خوار»ێ چووە کنی و خەلّکی سەمنان و لاریجانی لەگەلّ کەوتن. وەیسخان «چەمەنی لار»ی کردە لەشکربەز و لە هەموو لایەکەوە هێزی لە دەورە کۆبووەوە. عەلی مورادخانیش بەلەشکرێکی قورسەوە لە ئەسفەهان دەرکەوت و گەیشتە تاران.

ئاقا محەمەد لەشکرێکی لە ژێر فەرمانی «ڕەزا قولیخانی دوللو»دا ناردە پێش وەیسخان و پەلاماری کوردەکانی دا. کوردەکان زۆر چاک تێیان ڕوو هاتن و کەمێکی لێ کوژرا و ٥٠ کەس و ٢ سەرکردەیان لێ بەدیل گرتن و قاجاریان شکاند. وەیسخان دەستە لەشکرێکی بۆ پێشەوە ئاژووت و بۆ خۆی و گرانەباری چووە دەماوەند.

عەلی مورادخان کە گەیشتە تاران، فەرمانی بەوەیسخان دا کە ڕوو بەفەیروز کوە بچێت، شێخ وەیس لەشکرێکی دا بەمورادخانی ئامۆزای و بۆ «نور»ی بەڕێ کرد؛ ئیسماعیل خانی زەندیشی بۆ دامغان ڕەوانە کرد. ئەوانە بەهێزێکی قورسەوە ڕوو بەمازندەران چوون. لەشکری زەند شاری ئامل (بارفروش) و خاکانی دیکەیان گرت و دەستیان بەخاکی مازندەران گرتن کرد.

عەلی مورادخان فەرمانی دا بەزاهیر خانی خوشکەزای و زەکیخان کە بەسوارەی لوڕ و بەختیاری و باجەلانییەوە بچنە سەر ئوستراباد.

محەمەد زاهیر خان بەو ٨ هەزار سوارەی کوردەوە پڕتاو چوو هەتا گەیشتە کەناری ئوستراباد و سەنگەرێکی سەختی دروست کرد و لە هەردوو لاوە شەڕ و کوژتار گەرمەی تێکەوت. شەوی دووەم بورجێکی بڵندی لەنێو شارا دروست کرد و لە هەر چوار کەنارەوە ئاقا محەمەدیان وەتەنگ هێنا، هەتا تووشی هەڵاتنیان کرد، شاری ساری کەوتە دەست وەیسخان. (تەئریخی قاجاریە- بەرگی یەکەمین- لاپەڕە ٢٢).

لەشکرێکی ئامادە کرد و بۆ شەڕی ڕێکخست کە لە مازندەران دەست بەشەڕ بکەن. «ساکیس» لە بەرگی دووەمینی کتێبەکەیا دەڵێت: «شێخ وەیسخانی کوڕی عەلی مورادخان لە ساری شەڕێکی لە تەک قاجاڕان کرد و قاجاڕانی شکاند و ساریشی گرت. بەڵام ئەو سەرکردەیەی کە وەیسخان وەدووی قاجاڕانی خستبوو و دوژمنە شکاوەکەی هەڵدەبڕی، بەوە هێزی وەیسخان پەرتوبڵاو ببوو؛ بەلەت و پارچەی کەوتبوونە دووی دوژمنی شکاندراو.

ئەوە بوو کەشکستە کەوتە نێو لەشکری زەندەوە و شاری ساریشی لە دەست دەرچوو.

بەڕاستی دوژمن لەو بڵاوبوونەوەی لەشکری زەند کەلێنی دەستخست و گەڕانەوە سەریان و سارییان خستەوە دەست خۆیان، بەوەش ڕاگیراو نەبوو، هەموو مازندەرانیش تووشی پشێوی کراوە».

ئاقا محەمەد کە ڕۆژی لێ بوەوە لەشار دەرکەوت و هاواری لە تورکمانی دەوروپشت کرد کە لەگەڵ زاهیر خانا شەڕێکی قورسیان کرد و بەزۆر بورجێکیان لە کوردەکان ئەستاند. دەستە لەشکرێکی قاجاڕ بەپەنهانی چوون و پشتیان لە کوردەکان گرت؛ چونکە کوردەکان لەو خاکەدا شارەزا نەبوون، قاجاڕ لە هەموو لایەکەوە هەڵمەتیان بردە سەریان و تەنگەیان بەکوردەکان هەڵچنی و محەمەد زاهیرخان بەناچاری کە شەوی بەسەرداهات ڕوو بەگورگان هەڵات. دەستە شەڕکەرێکی قاجاڕییان کەوتە دوو و محەمەد زاهیرخانیان گرت و بۆ ئاقا محەمەدیان برد و سەریان بڕی. لەشکری کورد گەلێکی کوژران.

عەلی مورادخان لەژێر فەرماندەی ئامۆزای خۆیان ٢٠٠٠ کەسی ڕێکخست و ڕۆستەمخانی زەندی کردە سەرکردە و ناردە «سەواد کوە». ئاقا محەمەد، جەعفەر قولیخانی ناردە پێشی کە بەگژییا بچێ. لە خاکی «زیراب» ڕووبەڕووی یەکتر بوون و

کوژتاری یەکتریان دەستپێکرد و لە دوای شەڕ و خوێنڕژتن تەنگە بەقاجارِ هەڵچنرا و کورد سەرکەوت (ق).

عەلی مورادخان لە دوای ئەوە پەیمانێکی دوامینی گرێدا کە لەشکرێکی زۆر قورس بنێرێتە سەر ئاقا محەمەد و دوامین بەئێشی بدات و لە ڕەگوریشەیان دەرخات و بنچینەیان تێکدا. لەو دەمەدا وەڵامی پێ درا کە جەعفەرخانی کوڕی سادقخان لەشکرێکی پێکەوە ناوە و هێزێکی زلی ڕێکخستووە و تەمای هەیە لە زەنگانەوە هەڵکوتێتە سەر ئەسفەهان.

عەلی مورادخان لەگەڵ ئەوەشا کە نەخۆش بوو، چاخیش زستانێکی توند و سارد بوو، تەمای گەڕانەوەی ئەسفەهانی کرد. لەو دەمەدا عەلی مورادخان نەخۆشی زگچوونی (دیزانتری) گرت، ناچار لە تارانەوە ڕوو بەئەسفەهان باری کرد و نەخۆشییەکەی ڕووی لە خراپی بوو و لە «سورچە خورت» ناو، جێگایەک کە ۹ فرسەنگ بۆ ئەسفەهان دوورە، مرد. ساکیس دەڵێت: ئەو جێگایە هەر ئەو خاکە بوو کە نادر شا دوژمنی لێ شکاند.

مردنی عەلی مورادخان بوو بەمایەی پشێوی ئێران و جووڵانەوەی جەعفەرخانی کوڕی سادقخان. لەوە دوا بووە بەرهەڵست و بۆ سەرکەوتنی قاجارِ کەلێنی دا. ئەگەر لەو دەمەدا جەعفەرخان نەبزووتایە و عەلی مورادخان بۆ گەڕانەوەی ئەسفەهان ناچار نەکرابایە، قاجارِ ڕۆژێکی وای نەدەدی کە بتوانێ کیشوەرگیری بکات. چونکە عەلی مورادخان ئەو جارە پەیمانی وەها بوو کە بەیەکجاری بنچینەی قاجارِ دەرخات و لە نێوانیان ببا، بەڵام بەدبەختانە هەردوو بەبێ جێ ڕوویدا و بەختی قاجارِ یاری کرد و چارەڕەشی زەند خۆی نواند.

ساکیس دەڵێت: «عەلی مورادخان لە لای ئاقا محەمەدی قاجارِ زۆر بەچاکی ناسرابوو، هەموو دەمێ دەیگوت با چاوەنۆڕی بکەین هەتا ئەو پیاوە گەورە کوێرە لە ناو دەچێت، ئەوجا نەک لە ئێستاوە ڕەنگە لە پاشان سەربکەوین ئەگەر بەر بەعێراق بڕۆین. چونکە عەلی مورادخان چاوێکی کوێر بوو، بۆیێ ئاقا محەمەد بەکوێری ناو دەبرد».

# بەندی پێنجەمین

## پادشاهی جەعفەرخان کوڕی سادقخا

## (١١٩٩ - ١٢٠٣ھ/١٧٨٥ - ١٧٨٩م)

جەعفەرخان لە لایەن عەلی مورادخانی زەندەوە کرابوو بەسەردار سوپاهی ولاّتی «خەمسە». جەعفەرخان چونکە لە دایکەوە برای عەلی مورادخان بوو، زۆری خۆشدەویست و لە لایدا جێگاییێکی بەرزی درابوویێ، جەعفەرخان لە خەمسەوە لەشکرێکی ڕێکخست و چووە زەنگان و لەوێوە بۆ چوونە ئەسفەهان لەزی کرد و بەکۆمەگی و یارمەتی سەرکردە و سەردارانی سوپا لەسەر تەختی پادشاهی دانیشت.

مانگی ڕەبیعی یەکەمی ساڵی ١١٩٩ بەئومێدی ئەوە بۆ پێشەوە چوو کە دەست بەپادشاهی بکات و پشێوی نێوانی لابەرێت. شێخ وەیس خانی کوڕی عەلی مورادخانی خواستە ئەسفەهان کە بچێتە سەرتەختی شاهی و دەست بەفەرمانڕەوایی بکات. شێخ وەیس خان بەنەزانییێکی زۆر گەورەوە پشتی بەجەعفەرخان بەست و پێی خەڵەتا. ئەگەرچی باوکی جەعفەرخان بەدەست باوکی شێخ وەیس کوژرابوو، لەگەڵ ئەوەشا هەستا بەلەشکرەکەیەوە چووە ئەسفەهان. دەستبەجێ گیرا و هەردوو چاوی کوڵرا و کوێر کرا (ساکیس).

ئەو دەمە دوو کەس بۆ وەدەستخستنی تەخت و تاجی ئێران لە تەقەلادا بوون: یەکەمین جەعفەرخانی زەند و دووەمین ئاقا محەمەدی قاجار. هەردوو بۆ سەرکەوتن تالووکەیان دەکرد و لە دەستوبردا بوون. کە ئاقا محەمەد لە مردنی عەلی مورادخان ئاگادار بوو، بەتالووکە خۆی کۆکردەوە و ڕوو بەعێراق بزووت. هەرچییەکی هاتە پێشی کوژتی و ئاواییەکانی وێران کرد و هەتا گەیشتە شاری «قوم». نەجەف عەلیخانی زەند کە لە لایەن جەعفەرخانەوە فەرمانڕەوای قوم بوو، بۆ بەرابەری ئاقا محەمەد لەشکری لە شار دەرخست، کوردەکان مەردانە تێکۆشان و بەگەرمە لەگەڵ هەڵمەتدانا تەقەلاّیان ئەدا.

ئاقا محەمەد پەیامی دا بەخەڵکی شار کە لەتەکیا ڕێک بکەون، خەڵکی قوم بەگەلە بوونە هەواداری قاجاران و لە پڕێکا ڕوویان لە فەرمانی زەند وەرگێڕا و شاریان بەدەستەوەدا. نەجەف خان بەناچاری لەشکرەکەی هەڵگرت و ڕوو بەئەسفەهان هەلاّت.

ئاقا محەمەد لە دوای گرتنی قوم چووە «کاشان» و عەلیخانی خەمسە و سەکردەکانی کوردی قەرەگوێز کە لەوەپێش هەواداری زەند بوون، وەرچەرخان و چوونە کن ئاقا محەمەد و لە جەعفەرخان ڕوو گەردان بوون.

جەعفەرخان لەشکری ساز کرد و لە ژێر فەرماندەی ئەحمەدخانی کوڕی ئازادخانی ئەفغان و تەقیخانی زەندا ناردنیە پێش دوژمن. هەردوو لا بۆ کوژتار ئامادەبوون. لە دوای خوێنڕژی و کوژتار ئەحمەدخان تەنگەی پێ هەڵچنرا و و شکاندرا. جەعفەرخان کە لەوە ئاگادار بوو هەموو ماڵ و گەنجینە و ژن و منداڵ و لەشکرەکەی هەڵگرت و ئەسفەهانی بەردا و ڕوو بەشیراز بۆی دەرچوو.

ئاقا محەمەد بەلەز چووە سەر ئەسفەهان و گرتی و تالانی کرد و گەلێکی لە خەڵکە بێ چارەکە کوژت، لەولاوە ئەبدالخانی بەختیاری بە ١٠ هەزار سوار و پیادەی بەختیاری و گولبایەگان و فەیلی و فەراهانییەوە چوونە یارمەتی جەعفەرخان و ڕوو بەئەسفەهانی ئاژووت هەتا گەیشتە گوندی «عەسکەران».

ئاقا محەمەد لە ئەسفەهان دەرکەوت و چوو پێشی پێگرتن و دەستیان بەشەڕ کرد. ئەبدال خان لە شەڕا وەتەنگهات و ڕوو بەسەنگەرێکی کە دروستی کرد بوو کشایەوە. بۆ بەرابەری دامەزرا و بەتفەنگ دوژمنیان ئاور باران کرد و کوژتارێکی قورسیان کرد.

لەو شەڕەدا ئەبدال خان و چەند سەرکردەیەک بەدیلگیران و دەستبەجێ سەربڕان. بەختیاریەکان بەبێ سەرە ڕوو بەچیا و کێوی خۆیان هەڵاتن. ئیسماعیل خانی فەیلی برایەکی خۆی ناردە کن ئاقا محەمەد و بەنوازش گەڕاوە.

ئاقا محەمەد لە ئەسفەهانەوە ڕوو بەهەمەدان لەشکری کێشا. خوسرەو خانی والی کوردستان مامی خۆی ناردە کن ئاقا محەمەد و نوازش کرا و گەڕاندرایەوە. ئاقا محەمەد لەوێوە چووە تاران و مەهدیخانی کوڕی محەمەدخانی سەواد کوهی بەمەرجی ئەوە کە گیانی لەئازار دووربێ، شاری تارانی بەدەستەوە دا. ئاقا محەمەد کە شاری گرت مەهدیخان و دوو مامی و ئامۆزایەکی کە هەواداری زەند بوون میلی لە چاوی کێشان و کوێری کردن. لە پاشان بەئەزیەت کوژتنی و پارچەی لەشیانی لە بەریەک دەرهێنان (قاجاریە).

ساکیس دەڵێت: «ئاقا محەمەد لە خاکی بەختیاریدا دەستی بۆ سووڕان کرد، لە دوای شپرزەیەکی زۆر ڕوو بەتاران هەڵات». لەو هەڵاتنە و شپرزەیی ئاقا محەمەد چتێکی وامان دەست نەکەوت کەلێرەدا درێژەی پێ بدەین مایەی هەڵاتن و شپرزەییش چی بووە؟ ساکیس

نەیگوتوە، بەڵام مێژووی قاجاریە هەرهێندەی لێ دواوە کە گوتراوە.

جەعفەرخان کە لەئەسفەهان دەرکەوت و گەیشتە شیراز، کردیەوە بەپایتەختی خۆی و تەدارەکی فەرمانڕەوایی تێدا ڕێکخست و لەشکرێکی قورسی هەڵگرت و ڕوو بەئەسفەهان کەوتە ڕێگا. لەوددەمەدا ئاقا محەمەد ڕوو بەتاران گەڕابۆوە.

ساکیس کە دەڵێت: «ئاقا محەمەد زۆر بەشپرزەیی گەڕاوە تاران» دەبێ ئەوە بووبێت. جەعفەرخان کە گەڕاوە سەر ئەسفەهان دەوری دا و بەزۆر گرتیەوە.

باقیرخانی خراسکانی کە لە لایەن ئاقا محەمەد کرابوو بەسەردار سوپاهی ئەسفەهان گرتی و کوژتی و لەشکرێکی ڕێککەوتووی لەژێر سەرداریی حاجی عەلی قولیخانی کازرونیدا ناردە سەر کاشان و بۆ خۆشی بەلەشکرەوە ڕوو بەگولبایەگان چوو و گرتی.

جەعفەرخان کە لەشەڕی قاجاڕان ڕزگار بوو چووە سەر هەمەدان، لەو پشێویەدا ئیسماعیل خانی ئامۆزای جەعفەرخان لە هەمەدان. بەسەربەخۆیی دەژیا و لە پادشای زەند سەرکێش ببوو، جەعفەرخان چووە سەری و تووشی شەڕ و کوژتار بوو. لە دوامین شەڕا ئیسماعیل خان ساڵی ١٢٠٠ھ / ١٧٨٦م لە دەست جەعفەرخاندا شکا و ناچار بوو کە دەست لەو خەیاڵە بەردات (س).

جەعفەرخان کەئیشی ئیسماعیل خانی بەرهەم کرد چووە سەر خەمسە و گرتی و بەلەشکرەوە ڕوو بەئەسفەهان ڕۆیشتەوە، کە ئەو خاکانەی لە دوژمن پاککردەوە و دایمەزراندنەوە و ڕوو بەشیراز گەڕاوە.

جەعفەرخان کە گەڕاوە شیراز خەریکی خۆ ڕێکخستنی چوونە سەر تاران بوو، لە دوای پێویست ئامادەکردن هەستا چووە سەر «یەزد» و فەرمانڕەواکەی بەیارمەتی «تەبس» بۆ پێش جەعفەرخان چوو. لەو شەڕەدا جەعفەرخان دیسان شکا، ئاقا محەمەد لەوە کەڵێنی دەست کەوت و هەموو سەرکردە و گەورەکانی کردە هاودەنگی و بەهێزێکەوە چووە سەر جەعفەرخان. دیسان لە ئەسفەهانیان دەرپەڕاند و هەتا لە شیرازیان پەستاوت هەڵیانبڕی (س).

ئاقا محەمەد لە دوای ئەوە گەڕاوە ئەسفەهان و ڕووی لە «چەمەنی سەنگباران» کرد. عەلیخانی خەمسە بەهێزێکەوە چووە پێشی و لە دوای خوێنڕێژی ئاقا محەمەد وەتەنگ هێنرا و ڕوو بەتاران ڕفاندرا. عەلیخان بەو سەرکەوتنە لە شەڕ جیڕبوو و دەستی بەلەشکر کۆکردنەوە کرد (ق).

سالی ١٢٠١ هیدایەتوڵڵاخانی گەیلانی کە لەوەپێش گوتمان بۆ شێروان هەڵات، لەو ساڵەدا لەشکرێکی ڕێکخست و بەهەوداری زەند گەڕاوە و گەیلانی گرت و لەشکری سازدا و هەڵمەتی بردە سەر ئاقا محەمەد. لە لایەن ئاقا محەمەدەوە مستەفاخانی دوللو بەلەشکرەوە پێشی بەهیدایەتوڵڵا گرت. ئەیوان خانی گورجی بەسوپاهێکەوە پێشی پێ گرت. لە «ڕۆستەماوا» کە ١٠ فرسەنگ لە «ڕەشت»ەوە دوورە، مەیدانی شەڕ کرایەوە و لە دوای گەلێک کوژتار ئەیوانخان وەتەنگهات و هەڵات. هیدایەتوڵڵاخان چووە کۆمەگی، ئەویش زۆر ڕانەوەستا و تەنگەتاو کرا و ڕوو بە«ئەنزەلی» هەڵات.

مستەفاخانی دوللو دەستی هەڵنەگرت و لە ئەنزەلی دەورەی دا و شاری وەتەنگهێنا. هیدایەتوڵڵاخان ناچار بوو لە تاریکی شەوا بەکەشتی لە ئەنزەلی دەرپەڕی و وەبەر تفەنگی کوردێکی تاڵشی کەوت و کوژرا.

لەو ساڵەدا ئاقا محەمەد چووە سەر ئەسفەهان و لەوێوە چووە سەر عەلیخانی خەمسە و لە دوای چەند شەڕێک گرتی و لە کۆشکی «حەوت دەست» لە ئەسفەهان میلی لە چاوکێشا و کوێری کرد.

لەوێوە چووە چەمەنی گەندمان و بروجرد و خاکی بەختیاری، هەمووی تاڵان و خراپ کرد و گەلێک کوژتاری کرد و ڕوو بەتاران گەڕاوە. جەعفەرخان لەشکرێکی هەڵگرت و چووە یەزد. تەقیخانی یەزدی داوای یارمەتی لە میرزا محەمەدخانی تەبس کرد و هەردوو بەسوپاهەوە چوونە پێش. لە دوای کەم کوژتارێک دوژمن شکاندرا و جەعفەرخان سەرکەوت و یەزدی کەوتە دەست و دوژمنی پەرشوبڵاو کرد و ڕوو بەئەسفەهان هەڵمەتی برد و جەعفەر قولیخانی قاجاڕ کە لە لایەن ئاقا محەمەدەوە فەرمانگوزاری ئەسفەهان بوو، لەشکری هەڵگرت و لەشار دەرکەوت و چووە پێش. نزیک ١٤ ڕۆژ زەند و قاجاڕ ڕووبەڕووی یەکتری شەڕیان کرد، لە دوامینا جەعفەر قولی وەتەنگ هێنرا و شکا و ڕوو بەئەسفەهان هەڵات. جەعفەرخان لەبەر توندی و ساردی زستان گرتنی ئەسفەهانی بۆ بەهار هەڵگرت و ڕوو بەشیراز گەڕایەوە.

ئاقا محەمەد لەسەرە بەهارا چووە ئەسفەهان و بەهێزێکی زلەوە بۆ گرتنی شیراز لە شار دەرکەوت و ڕۆیی و هەر ئاوایی و خاکێکی کەوتە پێشی وێرانی کرد و هەتا «تەختی جەمشید»ی ژێر پێ کرد و گەڕایەوە تاران ( ج ا ق ل٢٨ ).

لەو ساڵەدا مورتەزا قولیخانی قاجاڕ لە باکۆوە چووە سەر گەیلان. سلێمان خان فەرمانڕەواکەی کوژت و ئەمیر محەمەد حوسێنخانی ئەرجومەند و محەمەد حوسێن ئاقای

نازیری له ژیان نائومێدکردن و گەیلانی تالآن کرد و گەڕاوە باکۆ.

جەعفەرخان ۳۰ هەزار کەسی ئازا و ڕەشیدی هەڵگرت و بو گرتنی ئەسفەهان لە شیراز دەرکەوت و لوتف عەلیخانی کوڕی خۆشی کردە سەرکردەی سوپاهێک و بۆ لاری بەڕێ کرد. لوتف عەلیخان لە دوای ئەوە کە لاری بەزۆر گرت و گەڕاوە و چووە کرمان و لەبەر ئەوە دووبارە ئەسفەهان جارێکی تریش لە ئاقا محەمەد ئەستاندرایەوە و دیسان لە دەستیان دەرچوو (ساکیس).

ئاقا محەمەد کە لەوە ئاگادار بوو بەپرتاوی ڕوو بەئەسفەهان چوو. جەعفەرخان لە چوونەپێش سستی دەکرد و چاوەنۆڕی هێزبوو، بەڵام هەروەکو گوترا مورتەزا قولیخان کە گەیلانی گرت ئاقا محەمەد کەوتە ترسەوە و نەشیا ڕوو بەجەعفەرخان بڕوات و ناچار بۆ تاران گەڕاوە.

جەعفەرخان بەو هێزەوە چوو هەتا ئەسفەهانی گرت و ئەو خاکەی لە دوژمن پاک کردەوە و بەڕێگای هەمەدان و خاکی بەختیاریدا گەڕاوە. ساڵی ۱۲۰۳ لە زستانا بەدەسیسەی دوژمن کەنیزەیەکی پێشدەست لەگەڵ خواردنا ژەهری دا بەجەعفەرخان و نەخۆش کەوت. وەیس مورادخان سەید مورادخان، شامورادخان کە مامی عەلی مورادخانی زەند بوون و حاجی عەلی قولیخانی کازرۆنی کە سەردار سوپا بوو، ئیبراهیم خانی کوڕی ئیسماعیل خان کە ئامۆزای جەعفەرخان بوو، هەموویان ساڵێکی ڕەبەق لە ئەرکی شیرازبەندی بوون و دوو کەس لە نۆکەرانی جەعفەرخانیان کرد بوو بەهاودەنگ، یەک «رەجەب» و ئەویدی «باقیر» ناویان بوو. بەو دوو نۆکەرانەدا کەنیزەکەیان خەڵەتاند کە ژەهر بداتە جەعفەرخان.

بەشەو کە ژەهر بەجەعفەرخان درا نەخۆش کەوت ئەو دوو نۆکەرانە چوونە بەندەوە و ئەو پیاوە گەورانەیان لە بەند دەرخست و بردیاننە بانی ئەرک و بەگوریس و چادرەوان خۆیان داهێژتە خوارەوە و لە گۆشەیەکا پەنهان بوون.

سەید مورادخان لەسەریان مایەوە، سبەینێ کە تاریکی لاچوو، یەکێک لە ژنەکان چاوی بەبێگانە کەوت و هاواری کرد، جەعفەرخان بەو نەخۆشیەش دەستی دا شیر و بڵند بوو، شامورادخان کەوتە بەر شیر و کەپووی بریندار کرد، ئیبراهیم خان بەگەسگ لەتەپڵە سەری دا و جەعفەر کەوت و ئیبراهیم خان بەو شیرەی لە دەستیا بوو، سەری جەعفەرخانی بڕی. شپرزەیی کەوتە شیراز و سەید مورادخان بەزۆر شیرازی خستە ژێر فەرمانی خۆبەوە.

## بەندی شەشەمین

## پادشاهی لوتف عەلی خانی کوڕی جەعفەرخان

## ١٢٠٣ - ١٢٠٩ھ / ١٧٨٩- ١٧٩٥م

لە دوای کوژتنی جەعفەرخان شیراز پشێوی تێکەوت و بەکۆمەگی سەرانی زەند سەید مورادخان بوو بەفەرمانڕەوای شیراز. لوتف عەلیخان ئەگەرچی منداڵ و لە تەمەنی ١٨ ساڵیدا بوو، ئەوددەمەش لە ولاتی لار فەرمانڕەوا بوو، کە لە ژەهردراوی بابی ئاگادار بوو، بەو هێزەی کە لە دەستیا بوو لە لار دەرکەوت و ڕووی لە بوشیر کرد و پەنای بۆ شێخ نەسر عارەب برد کە یارمەتی بدات و باوکی ڕزگار کا.

شێخی جوامێری دلێری پیاو، بەدلێکی خاوێنەوە یارمەتی کرد و لەشکرێکی بۆ ڕێکخست و بەچەک و ماڵەوە کۆمەگی کرد. لوتف عەلیخان بەو لەشکردوە چووە سەر شیراز و بەزۆری بازووی خۆی و بەپشتیوانی شێخ نەسر، شیرازی گرت و خوێندار و باوککوژ و دوژمنەکانی گرتن و لەناوی بردن. لەوددەمەدا سەید مورادخان کە بەفەرمانڕەوای شیراز ناسرا بوو گرتی و کوژتی. لە دوای کوژتنی سەید مرادخان مانگی جەمادی دوو لەسەر تەختی پادشاهی دانیشت و دەستی بەتەدارەکات کرد. (ساکیس)

لوتف عەلیخان هەرچەندە لاوێکی زرنگ و دلێر و جەنگاوەر و ڕەشید و ئازا و بەکارە بوو، بەڵام بەدبەختانە لە بەرامبەر بێکەتی و تێکۆشانی هێزێکی یەکدەستی و یەکدڵی قاجارِ کە نایێتە داپۆشین و لەبەر بڵاوی زەند و شەڕی نێوانیانا، هونەری لوتف عەلیخان بەبێ خۆنواندن مایەوە. ساکیس دەڵێت: «لوتف عەلیخان لەپێش ئەوەدا کە ببێت بەپادشا بەدڵنەرمی و ئازایی و بەخشش و پیاوەتی و دادگەری ناوبانگی کرد بوو. ئەو شێوە و ڕەوشتانە لەگەڵ وریایی و زانستی و سەرکردەییا لەنێو پەردەی دڵی خەڵکەکە و خزمانیدا کاریگەر ببوو و جێی خۆی گرتبوو، هەموو بەجارێک خۆشیان دەویست و پەراییان دەکرد. بەڵام کە بووە پاشا و لە دوای ئەوە کە چووە سەر تەخت ڕەنگی خۆ ڕاگرتن و شاهەنشاهی وەرگرت. لەگەڵ ئەوەشا کە زۆر جەوان و نازک ئەندام و خاوێن بوو، هێندەی دیکە پەسند کرا و شکلێکی چاکتری وەرگرت.

لوتف عەلیخان لە دوای ئەوەی کە مانگی جەمادی دوو لەسەر تەخت دانیشت و

پایتەختەکەی دامەزراند و لەشکری کۆکردەوە، چووە کرمان و لەوێوە بەخاکی بەختیاری و هەمەدان و یەزددا گەڕاوە شیراز. بەو نومایشە نەختێک بەهێز بوو و سوپاهێکی ڕێکخست کە بڕواتە سەر ئەسفەهان و تۆڵە لە ئاقا محەمەد بکاتەوە (ق، ج ١، ل ٣٠).

ئاقا محەمەد لە لوتف عەلیخان کەوتە ترسەوە و دەستی بەهێز خڕکردنەوە کرد. ساڵی ١٢٠٤ ڕوو بەئەسفەهان لە تاران دەرکەوت و لە دوای چوونە ئەسفەهان ڕووی لەشیراز کرد و لە «مەنزیلی بەیزا» کە ٦ فرسەنگ دووری شیرازە، گرانەباری دانا و عەلی قولیخانی برای خۆی لەوێ بەجێهێشت و بۆ خۆی سوارە و پیادەی لەشکری هەڵگرت و ڕکێفکوت چووە سەر شیراز.

پادشای تازەی نەوجەوان بە ٢٠ هەزار کەسی شەڕکەرەوە بۆی لە شیرازەوە دەرکەوت و لە نزیک «مەسجیدی بەردی» پێشی بەدوژمن گرت. ئەوە یەکەمین جارە ئەو نەوجوان و نەوجاهە لە دەوری پادشاهیا بڕواتە شەڕەوە. هەردوو لا بۆ شەڕ ڕیز بوون. لوتف عەلیخان لەپێشا ١٢٠٠ کەسی بۆ بەرامبەری جەعفەر قولیخانی قاجار نارده پێشەوە و شەڕێکی خوێناوییان کرد. لوتف عەلیخان دەستە لەشکرێکی هەڵبژاردەی نارده کۆمەگی جەنگاوەرەکان، هەردوولا بۆ یەکتر چوونە پێش و کەوتنە نێو جەرگەی دوژمنەوە. جەعفەر قولی قاجار لە شەڕ سست بوو و تەمای هەڵاتنی بوو، ئاقا محەمەد دەستە پیاوێکی نارده یارمەتی برای. کوردەکانی زەند بەگەرمە هەڵمەتیان برد و مەیدانیان بەدوژمن وەتەنگ هێنا. قاجار کەوتنە قوونە شەڕ و هەراسان کران و لاشە بەسەر لاشەدا دەکەوت و دەکوژرا. ئاقا محەمەد خۆی گرت و فەوجێکی دیکەی لەشکری نارده پێشەوە کە یاریدەی جەعفەر قولی برای بدەن. لوتف کە وایزانی دەستەیەکی دیکەی لە شەڕکەران نارده کۆمەگی پاڵەوانەکان کە لە مەیدان دابوون. هەردوولا بەو جۆرە دەستە بەدەستە پیاویان دەنارده مەیدانەوە و کوژتار و خوێنڕژتن دەکرا و درێژە بەشەڕ درا و لاشەی سوار و ئەسپ و پیادە بەسەر یەکدا دەکەوت و هەتا ئێوارە ڕاگیرابوو. کە ڕۆژ ئاوا بوو لوتف عەلیخان لەشکرەکەی کێشاوە نێو قەڵاوە. ئاقا محەمەد لەو لەشکرەی هێنابووی لە نیوە بەولاوەی کوژرابوو، گەلێک پیاوانی ئازا و ناوداری لەناو چوو بوو. بەشەو تەمای هەڵاتنی کرد، بەڵام ڕێگا دوور دوژمن نەوجەوان و بەهێز و خوێندار بوو. لەبەر ئەوە لە خۆی ڕانەدی هەڵێ، دەستە لەشکرێکی نارد و لە فرسەنگێک دووری شیراز سەنگەریان دروستکرد.

کە سبەینێ ڕۆژ بووەوە لوتف عەلیخان وەکو پڵنگێکی بریندار لە قەڵا دەرکەوت و ڕوو بەدوژمن لەشکری ڕیز کرد و بۆ خۆشی لە نێوڕاستا ناوچەی گرت و چاوەنۆڕی دوژمن بوو.

کە تەماشای کرد کەوتوونەتە نێو سەنگەرەوە، بەدەستەیەک لەشکردوە لنگی دا سەریان و دوای چەند کەس کوژتن و بەدیلگرتن، لە قاجارِ بزووتنەوەیەک نەبوو، هەریەک لەنێو سوپەرێکدا خۆیان دامەزراندبوو. لوتف عەلیخان پێشی گرتن و دامەزرا.

ئاقا محەمەد لە شەوا وەلامی دابوو کە لەشکری بگاتێ، بەلاّم ئاوربایەگان و خوراسان لە شۆرِشدا بوو، مازندەران کەوتبووە پشێوی. هەر خانێک لە خانەکان سەریان بلّند کردبوو، کەسێک نەبوو بەهاواری ئاقا محەمەد برِوات.

ئاقا محەمەد هەرچەند خاکێکی زۆری لەژێر فەرمانیا بوو، بەلاّم رِەنگی پادشاهی لێ نەدرابوو و بەسەرکێشی رِاگیرابوون. ئەوەش بەنەبوونی ئاقا محەمەد نەبوو، دەبوو؛ کەس گوێدیری نەدەکرد. مانگێکی رِەبەق لەنێو سەنگەردا دەورەدرا و مایەوە و هەموو رِۆژێک لوتف عەلیخان پێیدا دەدا و کوژتاری لێ دەکرد. لە لایەن ئاقا محەمەدەوە رِۆژێک پێشی پێ نەگیرا و لە سەنگەر دەرنەکەوت. لە دوامینا ئاقا محەمەد هەموو گرانەبار و چەک و جبەخانەی بەجێ هێشت، تەنها سوارە رِوو بەتاران هەلاّت و رِزگار بوو. لوتف عەلیخان هەتا نزیک ئەسفەهان وەدووی کەوت و تالاّنێکی قورس و ۲ هەزار کەسی لێ بەدیل گرت. (قاجارِیە)

لوتف عەلیخان بەشادی گەرِاوە شیراز و دەستی بەتەدارەک کرد و خەریکی هێز پەیداکردن بوو بۆ چوونە سەر ئەسفەهان و تاران. بەلاّم بەدبەختانە شیراز وەکو جاران نەمابوو و پشێویەکی پەنهانی تێکەوتبوو؛ قاجارِیش نەشیان خۆ لەپێش پادشای لاوچاک رِابگرن. ئەوە بوو ئاقا محەمەد ناچاری هەلاّتن کرا و بەشپرزەیی رِوو بەتاران بۆی دەرچوو. هەتا گەیاندرایە ئەوێ لە خۆی نائومێد بوو و لە ژیانی وەرز کرا. (س)

لوتف عەلیخان ئەگەرچی لە پشێوی پەنهانی شیراز ئاگادار ببوو، بەلەز بۆ پێشگرتنی دەکۆشا و خەریکی کوژاندنەوەی ئەو ئاورە بوو، بەلاّم چارەکردنی زۆر دژوار بوو و دەرەقەتی نەدەهات.

## لوتف عەلی خان لە کرمان ۱۲۰۵ک / ۱۷۹۰م

حاجی ئیبراهیم خانی شیرازی کە خاوەند دەست و قسەرِەوا و سەرهاتی شیراز بوو، لە لایەن کەریمخانەوە کرابوو بەتاجبەخشی پادشایانی زەند؛ بەپەنهانی لەگەلّ ئاقا محەمەد نێوانی چاک کرد بوو و هەر جۆرە بزووتنەوە و کردەوە و ئەندێشەیەکی لوتف عەلیخان کە هەبووایە بەئاقا محەمەدی رِادەگەیاند و هانی دەدا کە لەشکر بباتە سەر شیراز و بیگرێت.

ساڵی ١٢٠٥ لەسەرە بەهاردا حاجی ئیبراهیم بەپەنهانی نوسراوێکی بۆ ئاقا محەمەد نارد کە لوتف عەلیخان لەشکرێکی ساز کردووە هەڵمەت بداتە سەر ئەسفەهان و بچێتە سەر تاران. ئاقا محەمەد لەوە کەوتە ئەندێشە و ترسەوە و لەشکرێکی بۆ فەتح عەلیخانی قاجارِ ساز کرد و ناردیە ئەسفەهان کە بەرامبەر بەلوتف ڕاوەستێ. (قاجارِیە)

ئاقا محەمەد ساڵی دووەم چووە سەر ئاوربایەگان و شەڕی تیا کرد. ئەگەر بڵێم لوتف عەلیخان نەیتوانی بچێت و پێشی پێ بگرێت، وا نییە. بەڵام لەشکرێکی لەسەر ئەژمار و کیسەی خاکی فارسی گرتبوو و نەیدەویست بیباتە سەر قاجارەکان، لەگەڵ ئەوەشا پەلاماری کرمانی دا و فەرمانڕەواکەی سەری بۆ نزم کرد، بەمەرجی ئەوە کە خەرج و باجی بداتێ و بکەوێتە ژێر فەرمانی پادشای نەوجەوانەوە؛ بەڵام زۆری لێ نەکرێ کە بڕواتە لەشکرگای پادشاهییەوە.

لوتف عەلیخان ئەو ژێردەستییە بچووکەی لەو پەسند نەکرد و مەرجی بەست کە کرمان بگرێت. چونکە زستانەکەی سارد و بەستەڵەک بوو، دانەوێڵەشی هێندە نەمابوو وتیشووشی کەم بوو، ناچار دەستی لەو دەوردانە بەردا و گەڕاوە شیراز. (س)

لوتف عەلیخان کە زستانی ئەو ساڵەی گەیاندە سەری بەهار، خۆی ساز کرد و ٢٠٠٠٠ سوارە و پیادەی جەنگاوەری ئامادە کرد و میرزا عەبدوڕەحیم خانی برای حاجی ئیبراهیم خانیشی هەڵگرت و چەند گەورە و ناودارانی شیرازیشی لەگەڵ خۆی بردن و ڕوو بەئەسفەهان لە شیراز دەرکەوتن و ڕۆیشتن، هەتا لە «سمپرم بالا» دابەزین. حاجی ئیبراهیم بۆ ئەوە کە بکۆشرێت و تەقەڵا بدرێت تاکو لەشکرەکەی لە لوتف عەلیخان ڕووگەردان و سەرکێش بن، هەموو دەمێ وڵامی لە ڕێگادا بوون و براکەی هاندەدا کە بەلەز لەشکرەکەی فریو دات.

فەتح عەلیخان کە وەلیعەهدی ئاقا محەمەد بوو، بەلەشکرەوە بۆ لوتف عەلیخان چووە پێشێ و ئاگای لە پیلان و کۆششی عەبدوڕەحیم و براکەی هەبوو، پشتی بەوانەوە توند بوو و بەبێ ترس چووە مەیدان. لە خاکی «قەمشە» ڕاوەستا و هەردوولا کەم و زۆر بۆ یەکتر چوونە پێشەوە. لوتف عەلیخان بۆ چاوەدێری لە دوور سەنگەری گرت. کە شەو داهات عەبدوڕەحیم لەسەر ئەسپاردەی برای گەورە و کاربەدەستەکانی فارس و سەرکردە و سەردارەکانی، سوپاهی زەندی کۆکردەوە و بەچاپلووسی و فڕوفێڵ خەڵەتاندنی و کاری گەیاندە سەر ئەوە کە بەجارێک بنچینەی کاری لوتف عەلیخان تێک بدەن و لەسەر ئەوە

پەیمانیان بەست کە لوتف عەلیخان لە پادشاهی بخەن. (ق)

لە نیوەشەوا و بەدەستووری ئەو دەمە دوو، سێ تفەنگی سەرکێشی ئاوردرا. لوتف عەلیخان ناچار بوو ٣٠٠ سوارەیەکی ئامادە کرد و هەرچییەکی لە گەنجینە و ماڵی پێ دەرچوو هەڵیگرت و لەتاریکی شەو لە لەشکرگا کەنارەگیر بوو و ڕوو بەشیراز گەڕاوە کە ژن و منداڵ و کەس و گەنجینەکەی ڕزگار کات.

بەڵام لە بەدبەختی و چارەڕەشییەوە کارێکی دروستکراو و دامەزراو لە لایەن حاجی ئیبراهیم خانەوە ڕێکخرابوو، کە لوتف عەلیخان شیرازی بەردا ئەو کەوتە تەقەلای کۆکردنەوەی خەڵک و هەموو چاکە و پیاوەتی ئەو بنەماڵە گەورەیەی لەبیر کرد و خەڵکی شیرازی هاندا و شاری خستە دەست خۆی و کۆششی کرد کە سەرکردەکان و پاسەوانەکانی قەڵا بگرێت؛ بەو جۆرە بۆی ڕێککەوت.

کە لوتف عەلیخان گەیشتە نزیک شار، بەدبەختانە دەروازەی شار گرێ درا بوو. هەرچەندە تەقەلای دا هیچی بۆ نەکرا و لەشکرەکەی کە دە شاردا بوون ڕێگایان نەدا. لەبەر ئەوە ناچار ڕوو بەکەنار دەریا و چیاکانی فارس هەڵات کە چارەسەرێکی خۆی و ڕزگار کردنی ماڵ و منداڵەکەی بکات. (ساکیس)

حاجی ئیبراهیم بەلەز قاقەزێکی بۆ ئاقا محەمەد نارد کە بەتالووکە سەردار سوپاهێکی خۆی ڕەوانەی شیراز بکات و عەبدوڕەحیم خانیش کە فڕوفێڵەکەی سەرگیراو بوو، لوتفی عەلیخانی دەرپەڕاند و و هەموو چەک و سوپاهەکەی دایە دەست فەتح عەلیخانی قاجاڕ. لەولاوە ئاقا محەمەد میرزا ڕەزا قولی ناردە ئەسفەهان و لە لایەن فەتح عەلیخانەوە مستەفاخانی قاجاڕ و ٣ هەزار کەسیشیان پێدا بار کرد و لەگەڵ ١٠٠٠ سەر مایینی چاکی هەڵگرتن و بردنیە ئەسفەهان. (قاجاریە)

لوتف عەلیخان کە ڕووی لە شاخەکان کرد پەنای بۆ شێخ بوشیر برد؛ بەدبەختانە ئەو شێخەی کە لەوەپێش دۆستی بوو و دەستی گرتبوو مرد بوو. لەگەڵ ئەوەشا ئەگەرچی لەوێ هەڵمەتی نەبرایە سەری، بەڵام کۆمەگیشی نەکرا. لوتف عەلیخان لە «ڕندەن ڕیک» هێزێکی چاکی پەیدا کرد و لەشکرێکی پێکەوەنا و چووە سەر شێخی بوشیر. لە یەکەمین هەڵمەتیا شێخی شکاند و لە دوای ئەوە «کزروم»ی گرت و لەوێدا بوو بەفەرمانڕەوا. (ساکیس)

## شەڕی ئاقا محەمەد لەگەڵ لوتف عەلیخان

لەشکرەکەی لوتف عەلیخان لە شەڕەکانی هاتوودا زۆر بەئازایی و ڕەشیدی خۆیان نواندبوو. لەپێشا بەسەر ئەو هێزەدا زاڵ بوون کە ئاقا محەمەد بۆ یارمەتی حاجی ئیبراهیم خانی ناردبووە شیراز ئەو لەشکرەی کە دووەمین جار بۆ تۆڵە ئەستاندنەوەی ژێرکەوتنی پێشوو ناردرابوو، بڵاوی کردەوە. بەڕاستی پادشای نەوجەوانی زەند بەمەردانە دوژمنی شکاند و لەشکرەکەی قاجارِ گەیاندرایە پایەیەکی وەها کە لەنێو لەشکرگا و قۆشەنبەزا چادر و گرانەباریان تالان کرا.

ئەگەرچی لەشکری قاجاری کە لەژێر فەرمانی ئاقا محەمەددا بوو هێندە زۆربوو هەموو دەشت و دۆڵی داگرتبوو، بەڵام لوتف عەلیخان بەئازایی و ڕەشیدی پێشی بەو لەشکرە قورسە گرت، **«پێشمەرگە»**ی لەشکرێکی وا زلی شکاند و هەمووی بڵاو و تەفروتونا کرد. لە نیوەشەودا هەڵمەتی بردە سەر لەشکری قاجارِ و لەتوپەتی کرد و لەبەر یەکی پەرشوبڵاو کرد و شکستەیەکی پیسی تێخست (ساکیس).

ساکیس مەبەسی لە شەڕەکانی هاتوو بەکورتی لێی دواوە. بەڵام تەئریخی قاجارِیە بەدوورودرێژی لێیان ئەدوێت و بەڕاستی قسەکانی سەرەوەی ساکیس دەڵێت و بەدەستووری مێژوونوسێکی کەنارەگیر باسی شەڕەکانی دەکات.

لوتف عەلیخان کە کزرۆمی گرت، لەشکرێکی کەموکورتی ڕێکخست و چووە خاکی «خشت». لە زاڵخانی فەرمانڕەوای خشت یارمەتی خواست، ئەویش بە ۳۰۰ کەسی سوارەوە کۆمەگی کرد.

بەو لەشکرە کەمەوە چووە پێشەوە کە شیراز بگرێتەوە. لە خاکی «گویم» دابەزی و کەلێنی گرت. مستەفاخانی قاجارِ بە ٦٠٠ سوارەوە لەولاوە دەهات. لوتف عەلیخان چەند سوارەیەکی ناردە پێشی؛ لەولاوە ئەبداڵ خانی عەبدولمەلیکی ڕووبەڕوویان بوو. پیاوەکانی لوتف لینگیان دانێ و بەگوللە ئەبداڵ خانیان داگرت و لە ئەسپیان بەرداوە.

لوتف عەلیخان وەک پڵنگی زامدار لە کەلێن دەرکەوت و هەڵمەتی بردە سەر مستەفاخان. هەردوو لا پیاوانە تێکۆشان، بەڵام لە دوامینا قاجارِ وەتەنگ هێنرا و شکستەیەکی خراپیان هێنا و هەڵاتن. گەلێک کەس لە مستەفاخان کوژران و بەشپرزەیی گەیشتەوە شیراز.

حاجی ئیبراهیم لەو سەربهوردە کەوتە ئەندێشە و ترسەوە و بەلەز وەڵامی بۆ ئاقا

محەمەد نارد. ئاقا محەمەد ٥ هەزار کەسی بەجان محەمەدخاندا نارده کۆمەگیان.

لوتف عەلیخان بەکەم دەمێک ٢ هەزار کەسی کەوتە دەستەوە. بەو هێزەوە چووە پێش و لە «مەسجیدی بەردی» لەشکربەزی کرد. کە لەشکری جان محەمەدخان نزیک بووەوە ڕێگای پێ گرت و دەستی کردە کوژتار و بڕینیان. قاجار تەنگەتاو کران و شکان و زۆر کەمیان بەپەرێشانی لە مردن ڕزگار بوون و هیدی کە مابوون هەڵاتن و گرانەبار و چەکیان بەجێهێشت.

مستەفاخان بۆ یارمەتییان لە شیراز دەرکەوت، لوتف عەلیخان دەستی بەکوژتاریان کرد و هەڵیبڕین و هەتا بردنیە خاکی «گولباد». مستەفاخان لەوە ترسا کە لوتف عەلیخان شیراز بگرێت، لەودەمەدا تەمای گەڕانەوەی هەبوو، لوتف عەلیخان چووە سەری و پشتی پێ گرت و نەیهێشت بگەڕێتەوە شیراز و ئەو هێزەی شکاند و بڵاوی کردەوە و بەو سەرکەوتنە لەشکری زیاد بوو و هێزی پەیدا کردەوە.

ساڵی ١٢٠٦ لوتف عەلی خان هەموو خاکی فارسی خستە ژێر دەستیەوە و گشت ڕێگایانی شیرازی بڕی. مانگی ڕەبیعی دووەم شاری شیرازی دەوردا و لە هەر چوار لاوە دەستی بەهەڵمەتدانی شار کرد و لە دوامینا شاری وەتەنگ هێنا و دوو دەروازەی گرت؛ بەو جۆرە شیراز وەتەنگ هێنرا.

ئاقا محەمەد لەو چاخەدا لە ئاوربایەگان بوو، بەلەز گەڕاوە تاران و لەشکرێکی زۆر قورسی هەڵگرت و چووە ئەسفەهان و لەوێوە گەلێک سوپاهی ڕێکخست و بەهێزێکی زلەوە چووە شیراز. وەکو ساکیس گوتی لەشکری قاجار هەموو دەشت و بیابانی پڕ کرد بوو و «مەنزیلی ئیرەج»یان کردە لەشکربەز.

ئاقا محەمەد لەوە گەیشت کە لوتف عەلی خان هێزی هەیە، نەیوێرا لەوە بەولاوە بڕواتە پێشەوە و لەو خاکەدا جێگیر بوو.

لوتف عەلیخان خۆی ڕاگرت هەتا شەو بەسەرداهات. جلدی یەکەم - تەئریخی قاجاریە - لاپەڕە ٣٣ دەڵێت: «کە تاریکی شەو بەسەرداهات لوتف عەلیخان وەک دێوی لە بەند ڕزگاربووی زنجیر پساندراوێک لینگی دا سەر لەشکری ئاقا محەمەد. لە دوای ئیبراهیم خان کە پاسەوان و دیدەوانی شەو بوو، بەیەکەمین هەڵمەت بەسەریا زاڵ بوو و هێزەکەی بڵاو کرد و ئیبراهیم خانی کوژت. وەکو سێڵاوی بەڵاخشاو کەوتە نێوجەرگەی سوپاهی قاجاڕەوە، هەتا نێوەڕاستی لەشکر بەکوژتار و خوێنڕژتن چوو. کوژتارێکی قورسی کرد و

لەشکری قاجارِ پەرێشان و سەرلێشێواو بوو. لە دوای گەلێک خوێنڕێژی لە کەنار لەشکر ڕاوەستا و فەرمانی دا بەعەبدوڵڵا خانی مامی کە دەست بەشیری ڕووت بکەوێتە نێو دوژمن و کوژتار بکات.

عەبدوڵڵاخان وەکو شێری ڕق هەستاو کەوتە نێو لەشکری قاجارەوە و شۆڕش و هاواری لە دوژمن خست. لە هەموو لایێکەوە کوژتار و بڵاوکردن و پەرێشانی و پەراگەندەیی هاوێژتە نێو سوپاهی ئاقا محەمەدەوە».

دیسان دەڵێت: «لەودەمی پەرێشانی و پەراگەندەیی و لاشە لەسەر لاشە کەوتنی لەشکری قاجاردا، ئاقا محەمەد سەرانی دەرگا و پیاوە بەتایبەتیەکانی پێشگای لە خۆی کۆکردەوە و بۆ پاراستنی خۆی دە جێگایێکی زۆر جراپا بۆ ڕاگرتن.

عەبدوڵڵا خان لە دوای ئەو هەموو کوژتار و خوێنڕژتن و ئەتک و سووکییەی کە بەلەشکری قاجاری کرد، وایزانی کە ئاقا محەمەد لە نێواندا کوژراوە و نەماوە، کە بەو ڕەنگە لەشکرەکە پەرێشان و شپرزە بووە، لەبەر ئەوە دەستی لە کوژتار بەردا و لە کەنارێکەوە ڕاوەستا».

لوتف عەلیخان ویستی کە لەو شەڕەدا هەموو خەرگاهی ئاقا محەمەد بگرێت و بەجارێک لەشکری دوژمن پووچ بکاتەوە، بەڵام وا تێگەیاندرابوو کە دوژمن هەڵاتووە، لەبەر ئەوە پەلامار و خەرگا تاڵانکردنی خستە سبەینێ و دەستی لە شەڕ بەردا و چاوەنۆڕی سپێدە بوو؛ هەتا هێندەی زانی لە لەشکرگای دوژمن بانگدەر بانگی سبەینەی دا. (ساکیس)

میرزا فەتحوڵڵای ئەردەڵانی کە لە لای ئاقا محەمەد بوو، لەپێشاش ناسراوی لوتفی عەلیخان بوو، بەچەند ڕەنج لەو مەیدانە خوێناویەدا خۆی ڕزگار کرد و چووەکن لوتف عەلیخان و مزگێنی ئەو سەرکەوتنەی پێدا. لەبەر ئەوە لوتف عەلیخان دەستی لە شەڕ بەردا؛ دەنا ئەوە نەبووایە ئەو شەوە ئاقا محەمەد ڕزگار نەدەبوو. لەشکرەکەشی پووچ دەکراوە.

لوتف عەلیخان هەتا سپێدەی بەیانی لە دەوروپشتی ئەو لەشکرە پەرێشانە دەگەڕا و چاوی لە ڕۆژ بوونەوە بوو کە بەدیلیان بگرێت. هەر هێندەی زانی بانگدەر بانگی سبەینەی لە لەشکرگای ئاقا محەمەد دا، لەوە زانییەوە کە ئاقا محەمەد ماوە و نەکوژراوە و هەڵیشنەهاتووە. لەوە زۆر ڕقی هەستا و دڵگیر بوو و گەڕاوە. (قاجاریە)

چونکە ئاقا محەمەد نە کوژرابوو و نە هەڵیشهاتبوو، لەشکرەکەشی بۆ تالانکردن بڵاو ببوونەوە، بەدبەختانە ئەو شاهە ناودار و دلێر و ئازایە و چاوڕەشە ناچار کرا کە هەڵێت و دەست لە تەخت و تاجی ئێران بەردات و ڕوو بکاتە کرمان. (ساکیس)

بەڵام بانگی ئەو سەرکەوتنە پشتیوانێکی گران و چاکی بۆ لوتف عەلیخان پەیدا کرد. جارێ دەستی لە شیراز بەردا و چووە سەر کرمان و لە ڕێگادا خەریکی کۆمەگی پەیداکردن بوو.

ئاقا محەمەد ڕۆژی لێ بووەوە، لەولاوە حاجی ئیبراهیم خانی شیرازیشی بەهاواریەوە چوو و بردیانە نێو شاری شیرازەوە. ژن و منداڵی لوتف عەلیخان و خێڵ و کەس و خزمەکان و هەواداره زەندەکانیشی بارکردن و بۆ ئوستراباذی بەڕێکردن، لە دوای ئەوە بۆ خۆشی ڕوو بەتاران گەڕاوە. بەڵام گەلێک کەسی لەشیراز کۆکردن و کوژتنی (ق).

لوتف عەلیخان کە لە ئیرەجەوە ڕوو بەکرمان چوو، دەستی بەهێز کۆکردنەوە کرد، بەڵام ئەو قاجارانەی کە لە دووی بوون لەشکرێکی قورسیان هەبوو و نەیاندەهێشت لوتف عەلیخان فریای هێز پەیداکردن کەوێت و گەیشتنە سەری و بەگژیا چوون (س).

کوڕانی نەزەر عەلیخانی زەند لە ڕووی نەکێشان و کینەوە و بەشەو چوونە سەر لوتف عەلیخان و کوژتارێکی زۆریان لێ کرد و گەڕانەوە. لوتف عەلیخان کە زانی لە کرمانا یاریدە نادرێت ڕووی لە خاکی «راور» کرد و میرزا محەمەدخانی ڕاوری لێ بلند بوو. لە دوای بەگژداچوونی ناچاربوو لەوێش ڕانەوەستێت، لە ڕێگای «چل پایەلوت»ەوە ڕوو بەتەبەس چوو. لە ڕێگادا کە دەڕۆیشتن چوار نۆکەری لە تینوانا مردن، کە گەیشتە تەبەس ئەمیر حوسێنخانی حاکمی ئەوێی کردە هەوادار و ۳۰۰ پیاوی شەڕکەری بۆ کۆمەگی لێ وەرگرت.

لوتف عەلیخان بەو هێزە کەمەوە تەمای گرتنی شیرازی کردەوە و لێیدا چوو و بەسەر لوتدا ئاژووتی و ڕۆیشت، کە گەیشتە خاکی یەزد و «تەفت» تەمای بوو بازدات، بەڵام تەقیخانی یەزدی بەلەشکرەوە چوو و پێشی پێ گرت و نەیهێشت تێپەڕێ.

جلدی یەکەمی قاجاریە لە لاپەڕە ٣٤دا دەڵێت: «لوتف عەلیخان وەکو بەرقی تابناک کە بەسەر خاک و خاشاکا بڕوا کەوتە نێویان و کۆمەڵەیەکی بەشیر دوولەت کرد و هێندێکی بەدیل گرت و کەمێکیشی لە دەست ڕزگار بوو». لە دوای ئەوە کەوتە دوویان و تالانی لێ گرتن. لەوێوە ڕوو بەشیمال (ژوورو) ڕۆیشت. لوتف عەلیخان بەکۆمەگی

دۆست و هاودەنگانییەوە ڕوو بەخاکی «ئەبر کوە» پڕتاو بوو و بەزۆر گرتی و عەبدوڵلا خانی مامی لەسەر دانا و بۆ خۆشی هەڵمەتی بردە سەر «بونات و ئەستهبات» و ئەو خاکانەشی گرت و لینگیدایە «دارا بجرد» و ئەویشی گرت و پەلاماری «نیریز»یشی دا و خستیە دەست، بەزۆر هەموو ئەو خاکانەی هێنایە ژێر فەرمانییەوە.

ئاقا محەمەد کە لە سەربهوردی لوتف عەلیخان ئاگادار بوو، لەشکرێکی ٨٠ هەزار کەسی لەژێر سەرداریی محەمەد حوسێنخانی خاڵۆزایا ناردە پێش لوتفعەلی خان، کە نزیک خاکی ئەبر کوە بووەوە پەلاماری نەسروڵلا خانی زەندیان دا. نەسروڵلا خان بەشەوەیخون پیانی دادا و گەلێک کوژتاری لە قاجاران کرد و تەنگەی پێ هەڵێنان و شکاندنی. محەمەد حوسێنخان ڕوو بەشیراز هەڵات و گیانی لە مردن ڕزگار کرد.

محەمەد حوسێن لەشکرێکی دیکەی هەڵگرت و لە شیرازەوە ڕوو بەلوتف عەلی خان ڕۆیشت لە خاکی «تەنگ گەرم»دوە چوو لە دامێنی «خەرمەن کوە»ی گەیشتێ و هەردوو لا بۆ بەرامبەری ڕیز بوون و دەستیان بەکوژتار کرد. ١٥ ڕۆژ هەردوو لا بۆ یەکتر کوژتن خەریک بوون، لوتف عەلیخان ویستی کە بەشەوەیخون بەسەریاندا بدات؛ چەند پاڵەوانێکی شەڕکەر و چەند ناودارێکی هەڵبژاردەی ئامادە کرد.

لەودەمەدا پیاوێکی پێشکار کە ناوی حاتەم بوو، هەڵات و پەنای بردە بەر محەمەد حوسێنخان و لە کۆشەوەی ئەوی ئاگادار کرد.

کە نیوەشەو بەسەردا هات لوتفعەلی خان لینگی دایە سەر دوژمن. بەڵام لەولاوە چونکە دوژمن ئاگادار کرابوو، ئەو هەڵمەتە بێ سوود مایەوە و کەمێک کوژتاری کرد و گەڕاوە. کە سبەینێ ڕۆژ بووەوە لوتف عەلی خان لە سەنگەر دەرکەوت و بەڕەشیدی لینگی دایە سەریان و بەشیری ڕووت کەوتە نێوجەرگەی لەشکرەوە. ئەگەرچی لە یەکەمین شەڕدا قاجاڕ پیاوانە بزووتنەوە، بەڵام لە دواییدا لە بەرابەر دلێرێکی نەوجەوان خۆیان پێ ڕانەگیرا و بەناچاری شکستەیان تێکەوت. محەمەد حوسێنخان و چەند کەسێک بەئەزیەت ڕزگار بوون.

ئاقا محەمەد لەوە گەیشت زۆر دڵگیر بوو. گرتنی کرمان و ڕووخاندنی قەڵای شیرازی خستە پەیمانەوە. فەتحخانی قاجاڕی بە ١٠٠٠٠ سوارە و ٥٠٠٠ پیادەوە ناردە سەر کرمان. ئەو لەشکرە بەدێهات و ئاوایی تالانکردن ڕۆیشت و گەڕاوە ئەسفەهان. لەوێوە محەمەد ڕەزاخانی کرمانیان گرت و بردیانە تاران و کوژتیان.

سەری ساڵی ١٢٠٧ مستەفاخانی دوللو لە لایەن ئاقا محەمەدەوە ناردرا شیراز و قەڵای شاری ڕووخاند و لەگەڵ زەوی پەستی کرد و گەڕاوە تاران، حاجی ئیبراهیم خانی شیرازی و گەورەکانی شیرازیشی هەڵگرت و بردنیە کن ئاقا محەمەد.

لوتف عەلیخان کە محەمەد حوسێن خانی قاجاڕی شکاند هەر ماڵ و پێویستی کە بەتاڵانی بەدەست کەوتبوو بەسەر لەشکریانی دا بەخشی و هەستا ڕوو بەخاکانی نێوانی شیراز و ئەسفەهان و کرمان کەوتەڕێ و دەستی بەگرتن و کوژتاری قاجاڕان کرد و لە هاتووچۆدا بوو. لە دواییدا گەڕایەوە «قاین» (ق).

لە چاخی خۆیا ئەمیری تەبس پێی گوتبوو کە پەنا بباتە کن ئەمیر تورای و تەیموور شا. لوتف عەلیخان ئەو قسەیەی لە گوێ گرتبوو و بەڕاستی ڕوو بەقەندەهار چوونی خستە پێش کە پەنا بباتە بەر ئەمیری ئەفغانستان. لە ڕووی بەدبەختی و چارەڕەشییەوە بهیستیەوە کە ئەمیر مردووە، ناچار دەستی لەو چوونەش بەردا و کەوتە ئەندێشەی ئەوە کە ڕوو لە کوێ بکا و چ جێگا و خاکێک وەخۆی دەگرێ؟ (ساکیس).

لوتف عەلیخان لەو ژیانە بەدبەختییەدا بەسەری دەبرد و بێ چارە مابوو، نەیدەزانی ڕووی لە کوێ بکات و پەنا بۆ کێ ببات.

## دوامینی ئەو سەربهوردە دڵگیرە ١٢٠٨ھ/١٧٩٤م

لەودەمەدا کە لوتف عەلیخان لە ئەندێشە و خەیاڵ و خەمی ڕێگا پەیدا کردندا بوو، بیری لەوە دەکردەوە کە ڕوو لە کوێ بکات، پیاوە زەندەکانی کە لە نیشتمانەکەیان دوورکەوتبوون لە گەورەی «دەرمەشیر» نوبسراوێکیان بۆی وەرگرت و بۆیان نارد کە کۆمەگی دەکەن.

مورتەزا قولیخان و زانا و عولەما و سەرهاتەکانی کرمان و مەلا عەبدوڵلای ئیمامی جومعە و کەیخودایان و ڕیش سپی شار بەجارێک پەیمانیان گرێدا کە یارمەتی لوتف عەلیخان بکەن و بیبەنە کرمان و بیکەن بەپاشا.

لوتف عەلی خان ئەوەی بەمزگینیەکی چاک زانی و دەست و پێوەندی کۆکردنەوە و بەلەز کەوتە تەقەلای ئەوەوە کە کەلێنی لە دەست نەدات، بەو ئومێدە مەرجی کرد کە دەورەی کرمان بدات و بیگرێت و گەلێکیش تێکۆشا کە بەخۆشی و پێکهاتن و یەکەتی کرمان بگرێت و بیخاتە ژێر فەرمانیەوە. بەو سوپاهەی کە لە دەستیا بوو چووە سەر کرمان، عەبدوڵلای مامی خۆی ناردە پێشەوە کە کرمان بگرێت، ئەویش کە چوو شاری دەوردا و

وەتەنگی هێنا ، لەناکاو بەبێ ئەوە کە دانیشتووەکانی نێو شار ئاگادار بن چووە ژوورەوە و قەڵا و شاری خستە دەست.

پاسەوانەکانی ئەگەرچی لە یەکەمین هەڵمەتا زۆر چاک تێکۆشان، بەڵام لە دوامیندا شکان و بەدیل گیران. لە سایەی عەبدوڵڵا خان بەو جۆرە کرمان گیرا و کەوتە دەست لوتف عەلیخان (س).

لوتف عەلیخان لە دوای گرتنی کرمان، زۆر بەچاکی لەشکر و پێویستی تیا دامەزراند و لە دوور و نزیکی شار سەنگەر و سوپەرێکی زۆری دروستکردن و بورج و بارەو قەڵای شاری توند کرد و بەتۆپ و خومپارە و چەک ڕازاندنیەوە و لەشکری تێ خزاندن. جێگا سەخت و بەرزەکانی کرمانیشی توند کرد، لە کورد و ئەفغان و عەرەب و سیستانی لەشکرێکی شەڕکەری پێکەوە نا و ساز کرد. ڕۆژ بەڕۆژ هێز و توانای کۆ دەکردەوە (ق).

ئاقا محەمەد ئەو بزووتنەوە و دامەزراندنەی لوتف عەلیخانی بەچتێکی زۆر گەورە زانی و بۆ دواڕۆژ بەزلی گرت و هەر هێزێکی کە هەیبوو بۆ چوونە پێشەوەی ئامادە کرد کە هەڵمەت بباتە سەر لوتفعەلی خان و دوایی بەو کۆسپە و بەرهەڵستە بدات و ڕیشەی ئەو سوپەر و پەردانە دەرخاتن کە دەبنە پەندی پێشکەوتن و مایەی نەهێلان، بۆ پادشاهی و بەرهەڵستی گەیشتنە فەرمانڕەوای ئێران (س).

ئاقا محەمەد سوپاهێکی زلی دا بەفەتح عەلیخان و کردیە پێشڕەوی خۆی بۆ سەر کرمان و بۆ خۆشی بەلەشکرێکی گەلێک قورسەوە ڕووی کردە شاری «بابک» و بەزۆر گرتی و قەڵاکەی ڕووخاند و چل کەس لە هەوادارانی لوتف عەلیخانی خنکاند و گەلێکیشی خستنە چاڵەوە، خۆڵەبانی کردن و زندە بەگۆڕ کوژتنی. زۆر ئەتک و سووکی بەسەر ئەو خەڵکە هەژارەدا هێنا.

قاجاریە دەڵێت: لەوێوە بەکوژتار و سووتاندن ڕوو بەکرمان ڕۆیشت و لە چوار فرسەنگی کرمان دابەزی. ساکیس لە کتێبەکەیدا دەڵێت: «لە چوار میل دووری ڕۆژاوای کرمان دابەزی و کردیە لەشکربەز. ئەو جێگایە هەر ئەوێ بوو کە لوتف عەلی خان کردبوویە لەشکرگا و کرمانی دەورەدا.

لوتف عەلیخان بۆ شەڕ لە شار دەرکەوت و لە نزیک شار پێشی بەدوژمن گرت و هەتا ئێوارە کوژتاری کرد و لە دواییدا گەڕاوە نێو قەڵاوە.

ڕۆژی دووەم دیسان بەکوژتار پەلاماری قاجاری دا و لە دوای کەمێک قاجار زۆریان کرد

و لەشکری کرمانیان وەتەنگ هێنا، بەڵام لە بورجەکانی شارەوە بەتۆپ دوژمن ئاورباران کرا. قاجارِ لەوەدا زۆری کوژرا و بەزۆری تۆپ پەرشوبڵاو بوو. لەشکری زەند گەلێک دیل و تالانی گرت و گەڕاوە.

ئاقا محەمەد کە بەچاکی لە ئازایی و کۆشش و جەنگاوەری لوتف عەلیخان ورد بوەوە تێگەیشت دەرەقەتی نایێت و بەو جۆرە لە دەستیا شپرزە دەبێت، هێنای لە بەرامبەر هەر بورجێک بورجێکی دروست کرد و لەپێش هەر سەنگەرێکیش سەنگەرێکی دامەزراند و خۆی و لەشکرەکەی تێخزاند.

میرزا تەقیخانی مستۆفی لە کتێبە گرانبەهاکەیا کە تەئریخی قاجاریەیە دەڵێت «پەنجا رۆژ و شەوی کاری حەرب و زەرب بەتۆپ و تفەنگ و خومپارە بوو. لە هەردوو لاوە لە بورجەکانەوە کارێزیان لێ دەدا و بۆ یەکتر چوون و لەژێر خاکەوە تووشی یەکتر دەبوون و بەخەنجەر یەکتریان دەکوژت. لوتف عەلیخان لە ڕەوشت و دەستووری شەڕ و کوژتارا هێندە زانا و تێگەیشتوو بوو بەکەم سوپاهێکی بێسەر و پاوە لەشکرێکی ۱۰۰۰۰ کەسی ئاقا محەمەدی لە ژیان بێزار و لە گیان و زەندەگانی وەڕەز کردبوو. ئاقا محەمەد دەستی بهاوێژتبایەتە هەر فروفێڵێکی جەنگەوە، دەگوترا کە لوتف عەلیخان لە نێو دڵی ئەودایە کە لەپێش کردنیا دەستی بەپێش پێگرتن دەکرد و ئاقا محەمەدی پێ تەنگەتاو و داماو دەکرد».

لە دوای ئەو شەڕ و کوژتارە زستان بەسەرداهات. ئاقا محەمەد بۆ لەشکرەکە خانووی دروست کرد، چونکە لە چادران نەدەژیان. لوتف عەلی خان ۱۰۰۰۰ کەسی لە شار دەرخست و لینگی دایە سەر دوژمنێکی لە سوپەردا بوو. تێیان ڕووهات و ئەنباری زەخیرە و جبەخانەی تالان کرد و گەڕاوە نێو قەڵاوە. چەندجار لە دوای یەکتر لە شار دەردەکەوت و ڕکیفکوت هەتا نێو جەرگەی دوژمنی داژووت و کوژتارێکی زۆری دەکرد و دیل و تالانی دەگرت و دەگەڕاوە (قاجاریە).

لوتف عەلیخان قارەمانی ڕەشیدی نەبەز ٤ مانگ بەقەڵابەندی و دەورەدان شەڕی دەکرد. گرانی و نەبوونی و بێ خواردەمەنی و دەست نەکەوتنی پێویست کەوتبووە نێو شارەوە، گەلێکی لە خەڵکەکە پووچ کردبوو، زۆریان لە برسا مردبوون و گەل زۆر تەنگاو ببوون. لەشکری ئاقا محەمەد لەوە کەلێنی دەستخست و پەلاماری شاری دا. لە لایەن پاڵەوانی ناودار لوتف عەلیخانی قارەمانەوە بەکوژتار دەرکران و لە شار دوور خرانەوە (ساکیس).

سالّی ۱۲۰۹ی ڕۆژی هەینی و ۹ی مانگی ڕەبیعی یەک لە لایەن ئاقا محەمەدەوە هەڵمەت برایە سەر قەڵای کرمان، لە هەر چوار کەنارەوە پەلاماردان دەست پێکرا. لوتف عەلی خان لە بورج و کونگەری قەڵا و شارەوە بەتۆپ و تفەنگ دوژمنیان ئاورباران کرد. قاجارِ ملی پێوە ناو لە گوللە نەسڵەمیەوە، هەتا گەیشتنە بن دیواری قەڵا. لەسەرەوە بەتفەنگ و بەرد دایانگرتن، قاجارِ لە دیوارەکانەوە دەستیان بەسەرکەوتن کرد و چرژانە نێو شارەوە (قاجارِیە).

هەردوو لەشکر لە کووچە و کۆڵانەکانی شارا دەستیان بەشەڕ و کوژتاری یەکتر کرد. خەڵکی کرمان گەلێکی کوژران. ئەو ڕۆژە هەتا ئێواریّ لەنێو شارا خوێنرژتن و کوژتار کرا و هەموو بورجەکان کەوتنە دەست دوژمن و خەڵکی شار لەوەوە وەرز بوون و کەوتنە تەنگاییێکی قورسەوە.

لوتف عەلیخان خۆی ڕاگرت هەتا شەو بەسەرداهات و دەستی لە شەڕ بەرنەدا، بەڵام لە تاریکی شەوا کەلێنی دەست خست و لەگەڵ چەند پیاوێکی خۆیا لە شار دەرکەوت و ڕووی لە قەڵای «بام» کرد کە ۳۲۰ میل لە قەڵای کرمان دوورە. برایێکی گەورەی بام کەسەرکردەی لوتف عەلی خان بوو، لەو شەڕەدا لە کرمان سەردار سوپابوو شەڕی دەکرد. ئەو گەورەیە کە چاوی بەوە کەوت کە شکاون و براکەشی لەگەڵ لوتف عەلی خان نییە، لەوەوە تێگەیشت کە براکەی کوژراوە یا کە لوتف عەلیخان هەڵاتووە کەوتۆتە دەست قاجاران؛ بەوە باوەڕی کرد و دڵی پیس کرد و پەیمانی بەست کە میوانێکی وا خۆشەویست و گەورە و ڕەشیدە و ئازا بداتە دەست دوژمن و لە ماڵی خۆیا بیگرێت و ئەو ئەتک و سووکییەی تەئریخیی بەسەر خۆی بێنێت.

لوتف عەلیخان ئەگەرچی لەودش ئاگادار بوو، بەڵام باوەڕی نەدەکرد ئەو پیاوە خراپەیەکی وای لەتەکا بکات و خۆی بەدنام کات (ساکیس).

محەمەد تەقیخانی مستۆفیش لە مێژووی قاجارِیەدا بەو جۆرە ئەو ناپیاوی و بەدی گەورەی بام دەگێڕێتەوە دەڵێت: «کە لوتف عەلیخان چووە بام، سیستانییەکان تێگەیشتن کە لوتف عەلی خان شکاوە و بێ هێز ماوە. بۆ گرتن و پێشکەش بەئاقا محەمەد کردنی یەک دڵبوون و دەستیان لە بەدنامی شوشت.

لە پێشا ئەسپێکی لوتف عەلیخان کەنێوی «غەران» بوو و لەنێو هەموو یەکسمانی جیهانا بەناوبانگ بوو، پەلیان کرد.

لوتف عەلیخان کە زانیەوە لە چ کۆشەوەیەک دان هەستا خۆی بگەیێنێتەوە غەران تاکو خۆی لەو شەپۆلە ڕزگار کات، کە تەماشای کرد ئەسپی پەیکراوە، دەستیان دایە شیر و تەقەلایەکیان دا بەلام چونکە نەگبەت هاتبوو، گیرا و بەزەنجیرکراوی بۆ ئاقا محەمەدیان نارد.

ساکیس لە کتێبە قیمەتدارەکەی بەرگی دووەم و لاپەڕە ٣٦٤دا دەلێت: «ئاقا محەمەد هەردوو چاوی لوتف عەلیخانی بەدەستی خۆی دەرخست و کوێری کرد و بۆ تارانی نارد. لەوێ بەئەزیەت بەسێدارەیدا هەلاوەسی و کوژتی».

عەبدوللا خانی مامی لوتف عەلیخان گیرا و میلی لە چاو کێشرا و لە دواییا بەئەزیەت کوژرا. میرزا محەمەد عەلیخانی کاشانی برای فەتح عەلیخانی مەلیکوشوعەرا کە وەزیری لوتف عەلیخان بوو، لە دوای گرتن بەئەزیەت کوژرا و سەد کەسی کوردی هەوشاری کە لە کرمانا هەواداری زەند بوون لە ناو بران و ژن و مندالی گەورە و سەرهاتی شاری بابک ناردرانە گوندی «کەهک» لە نزیک شاری قوم و پیاوەکانیشی کوژتن. ٧٠٠ بنەمالەی کوردی عەتا ئۆللاهی بارکردن و ناردنیە ڕەی. دوو دانە ئەلماسی «گەوهەر» یەک «دەریای نوور» و دووەم «تاجماه» بەقۆلی لوتف عەلیخانەوە بوون ئاقا محەمەد لە باسکی خۆی بەست و ١٠٠٠ پیاوی هەلبژاردەشی کرمانی لەگەل مورتەزا قولی ناردنە تاران. دیواری شار و قەلای کرمانی ڕووخاند. (ق)

لە دوای ئەوە کە لوتف عەلیخان گیرا و کوژرا، ئاقا محەمەد چووە سەر کرمان و گرتی و جەور و ستەمێکی بێژماری تێدا نواند. فەرمانی دا ٢٠ هەزار چاوی خەلکی کرمان دەربخرێ. مەئمووری ئەو ستەم و بێ دادیە ئەو فەرمانەی بەجێهێنا، ئاقا محەمەد بەدەستی خۆی گلێنەی چاوەکانی ئەژماردن و لە ژمارەدا دوو چاو کەمی هێنا، ڕووی لە مەئموورەکە کرد کەوا بوو ئەو دوو چاوە چاوی تۆن کە ماون و دەبێ هەردوو چاوی خۆت دەرخەی.

ساکیس لە کتێبەکەیا دەلێت: «لە پێشا پێی گوت کە ئەگەر دوو چاو کەم بێت ئەوا هەردوو چاوی خۆت لە جێگایا دەردەخرێت». بەو جۆرە هەرچەندە نێرینە هەبوو کوێرکران و ژن و مندالەکانیشیان خرایە دەست سوپاهییانەوە.

ئاقا محەمەد بۆ ئەوەی بنەچەکەی هەوادارانی زەند کوێر کاتەوە و ڕەگەزیان دەرهێنێت، فەرمانی دا کە ٦٠٠ کەللەسەر ببڕێت بە ٣٠٠ کەسی دیل هەلیگرن و ببرێنە قەلای بام،

ئەوەیان کرد و لە بام سەری ئەو ۳۰۰ کەسەی کە کەللەسەرەکانیان هەڵگرتبوو بڕیان و لەگەڵ ٦۰۰ سەرەکانیان دانا، لەو جێگایەی کە لوتف عەلیخانی لێگیرابوو ئەهرامێکی لەو ۹۰۰ کەللەسەرە دروست کرد. ساکیس لە دوای باس لەوانە کردن دەڵێت: «ساڵی ۱۸۱۰م لە لایەن پۆتینگەر دەرخراوە و ئەو ئەهرامەی بەچاوی خۆی دیوە. ئەو پۆتینگەرەی کە گوترا چووە بام و چاوی بەو ئەهرامە کەوتووە».

دیسان ساکیس دەڵێت: «ئەو دەمە کە چوومە کرمان، دیم خراپەیەکی لەو دەمەدا کرابوو نموونەی دیار بوو، بۆنی وێرانی و کاولیەتی ئەوساکەی هەر لێ دەهات و هێشتا هەر نەهاتبووە سەرخۆی».

شەمسەدین سامی لە بەرگی پێنجەمینی لاپەڕە ۳۹۹۲ی «قاموس الاعلام»دا دەڵێت: لوتف عەلیخان ساڵی ۱۲۱۰ لە دەست ئاقا محەمەد گرفتار بوو لە بەندیخانەدا کوژرا.

ئاقا محەمەد کە بناغەی پادشایەتی زەندی وێران کرد، ناردی قەبری کەریمخانیان تێکدا و ئێسقانەکانی ئەو پیاوە دادگەر و گەورەیان دەرخست و بردیانە تاران و لەبەر تەختی ئاقا محەمەدیان ناژت. وایان لە قەبر نابوو کە ئاقا محەمەد لەسەر تەخت دانیشتبایە هەردوو پێی دەکەوتە سەر قەبرەکەی کەریمخان، ئەوە هەرماوە و ژێر پێی هەموو پادشاکانی قاجار بوو.

## کەمێک لە سەربهوردی حاجی ئیبراهیم خان

ساکیس دەڵێت: حاجی ئیبراهیم خانی کوڕی حاجی هاشیم یەکە پیاوێکی خوێنخوار و لە دەوری زەندەکانا تاجبەخش بوو. بۆ جەعفەرخان گەلێکی پەرایی (خزمەت) کرد، کە جەعفەرخان لە ئەسفەهانەوە ڕوو بەنیشتمانە ڕاستەقینەکەی - کە شیراز بوو - گەڕاوە، گەلێکی یارمەتی کرد و بەکاری هات.

لەبەر ئەو پەراییەی جەعفەرخان کردی بەکەلانتەری شیراز و بۆ حاجی ئیبراهیم ئەو پایەیە هەروا ڕاگیرا و مایەوە.

کە جەعفەرخان کوژرا، حاجی ئیبراهیم بۆ ئەوەی کە لوتف عەلیخان ببێ بەپادشا گەلێک تەقەلای دا و چاو و ڕاوێکی زۆری کرد و لەو لایەنەوە یارمەتییێکی چاکی کرد و تێکۆشا هەتا لوتف عەلیخان بوو بەپادشا و لەسەر تەخت دانیشت.

لوتف عەلیخان کە لە کرمان گەڕایەوە شیراز، لە لایەن هەندێک کەسانەوە هان درابوو کە حاجی ئیبراهیم لە تەکیا خراپ و بەدبینە و بەهێندێک گوناه ڕەخنەدار کرابوو. ئەو

پیاوە لەودەمەدا زۆر بەهێز بوو، خاوەند پشتوتەوانایەکی زل بوو. ساکیس دەڵێت: «وەکو مسمارک وا بوو» لەبەر ئەوە کە زۆر چاک پەرایی دەکرد، جێگای بڵندتر و پایەی بەرزترینی دەستکەوتبوو. چونکە دوامینی ڕاستی و خزمەتگوزاری ئەو، گەورەکەی بەچاکی باوەڕی پێ هێنابوو. لوتف عەلیخان میهرەبانی لەتەکیا هەر هەبوو و خۆشیدەویست.

میرزا مەهدی کە دەفتەردار و خەزینەداری لەشکر بوو، لە چاخی جەعفەرخاندا بەدراودزین ڕەخنەدار و گوناهکار ببوو. جەعفەرخان لەسەر ئەوە هەردوو گوێی بڕی، بەڵام لەکن لوتف عەلیخان هەر لە ڕوودا بوو و جێگاییێکی بەرزی گرتبوو. زۆر چاک دەڕۆیی، ئەو دەمە کە جەعفەرخان کوژرا کەللەسەرەکەی لە ئەرک هاوێژرایە خوارەوە، وایان بۆ لوتف عەلی خان گێڕاوە کە میرزا مەهدی هەردوو گوێی جەعفەرخانی بەتۆڵە ئەستاندنەوە بڕیوە و چاوی لە مژی نمەکداری خۆی قوچاندووە. ئەو بەدنمەکییەی بەخۆی ڕەوا دیوە، لوتف عەلی خان لەسەر ئەو گوناهە گەورەیە ڕقی لە میرزا مەهدی هەستا. حاجی ئیبراهیم خان بۆ ئەوەی کە لوتف عەلی خان لەو ئەندێشەیە بسوورێنێت و میرزا مەهدی لەو کەوتنە بپارێزێت و کراسی زادەگی و بێ گوناهی لەبەر میرزا بکات، ئەو دەنگە دەنگەی وەدەرخست و تکای کرد کە لوتف عەلیخان مەهدی ببەخشێت و تووشی هیچ سەرەنگرێییەکی نەکا، بەڵام بێوەژنەکەی جەعفەرخان لەوە دەستبەردار نەبوو و هەر دەیگوت و بۆ تۆڵە لە میرزا مەهدی ئەستاندنەوە هەوڵی ئەدا. هەر چەند ئیبراهیم خان کە خۆشەویستی لوتف عەلیخان بوو و بۆ ڕزگار بوونی مەهدی کۆششی کرد نەشیا، لوتف عەلیخان تالووکەی کرد و بەلەز فەرمانی دا کە میرزا مەهدی لە ئاور باوێژن و بیسووتێنن. بەو جۆرە هاوێژتیانە نێو ئاگرەوە و سووتاندیان.

ساکیس دەڵێت: «حاجی ئیبراهیم بۆ خۆی بۆ سێرمالقولیمی گێڕابووەوە کە سووتاندنی میرزا مەهدی بوو بەمایەی لابردنی لوتف عەلیخان لەسەر تەخت. بەڵام وا دەردەکەوێت کە ئیبراهیم خان ئەو قسەیەی بۆ ئەوە بووە کە خۆی لە ڕەخنە و گوناه ئازاد کات، دەنا وەنەبێ ڕاستیەکەی ئەوە بێت کە ئیبراهیم بەسێر مالقولیمی گوتوە».

میرزا تەقیخانی مستۆفی لە بەرگی یەکەمینی لاپەڕەی ٥٩ی تەئریخی قاجاڕیەدا سەربهوردی حاجی ئیبراهیم بەمجۆرە دەگێڕێتەوە: «لەم دەمەدا چونکە بۆ هەر خەتەرێک خەتەرێ و بۆ هەر کەمالێک عەینی کەمالێکی لە دووە، دەوڵەتی ئیعتمادودەولە حاجی

ئیبراهیم خانی شیرازی، سەرەوزێر بووە و وەرگەڕا».
وەکو لەپێشدا گوترا حاجی ئیبراهیم و براکانی چاویان لە نان و نمەکی گەورەی خۆیان قوچاند و خراپەیان لە پاداشتی چاکەی پادشایان نیشان دا و سەریان لە فەرمانی لوتف عەلیخانی پادشای خۆیان وەرگێڕا، شاری شیراز و گەنجینە و گەوهەر و ژن و منداڵ و خزم و کەس، لەشکر و چەک و ماڵ و سەرمایەی لوتف عەلیخانیان دا بەدەست ئاقا محەمەدی قاجار.
ئاقا محەمەدیش لە تۆڵەی ئەوە و بەرامبەر بەو پەراییە، ڕۆژ بەڕۆژ بلندی کرد و پلە بەپلە سەریخست و هەتا گەیاندیە پایەی «وەزارەتی ئەعزەم» و لە هەموو خاکی ژێردەستیا فەرمانڕەوا و قسە پەسندی کرد.
ئاقا محەمەد کە تۆماری ژیانی پێچرایەوە و بۆی دەرچوو، تەپلی فەرمانداری و پادشاهی بەناوی فەتح عەلی شاوە لێ درا، دیسان حاجی ئیبراهیم لە جێگای خۆیا ڕاوەستابوو، بەڵام ئەو بەبێ پرسیار و گوێدێری بەسەر هەموو گەورە و سەرهاتی حکوومەت و سەردار و سەرهەنگ و سەرکردەکانی سوپا فەرمانی ئەدا و بەسەر سەرانی دەرگادا زەبەردەست و زاڵ بوو. کوڕ و خزم و برا و برازاکانی هەریەک لە شار و خاکێکا لەنێو ئێرانا فەرمانگوزاریان دەکرد، دێ و ئاواییەک نەمابوو کە بەبێ ئەوانە کوێخا و گزیری لەسەر داندرابێ، دەستیان لە هەموو جێگایەکدا هەبوو و لە هەموو ماڵێک و دڵێک ئاگادار بوون.
ئەوەندە دەستدرێژی و فەرمانڕەوایی لە فەتح عەلی شا گران دەهات و لەوە کەوتبووە ئەندێشە و ترسەوە. ڕۆژێکی وای لەبەر چاوبوو کە لەجێگای لوتف عەلیخان داندرێ. ئەگەر ئاقا محەمەدێک وەدی بێت، ئەویش بەدەردی لوتف عەلیخان گرفتار دەبێ. لەوترسانە فەتح عەلی شا بەپەنهانی هەموو ژێردەست و سوپا و کاربەدەستەکانی کردە هاودەنگی خۆی و بۆ دوایی بەئیشی حاجی ئیبراهیم بێن پەیمانیان گرێدا، بەڵام چونکە برا و خزمەکانی هەریەک لەسەر شار و خاکێکا بوون، زۆر بەئەندێشە و ئاهستە و ترسەوە داو و تەڵەیان دامەزراند و کەوتنە بزووتنەوە.
فەتح عەلی شا هەر سەرکردەیەکی بۆ شارێک دانا، بەمەرجی ئەوە کە هەموویان لەیەک ڕۆژا کە یەکەمینی مانگی زیلحیجە بێت کاری خۆیان ببێن، فەتح عەلی شا لە تاران حاجی ئیبراهیم خەفە بکات، بەو پیلانە هەوادارەکانی بڵاوکردەوە و هەریەک فەرمانێکی

دا دەستیان و ناردنی. فەتح عەلی شا ڕۆژی یێکەمی مانگی زیحەجە حاجی ئیبراهیمی خواستە پێشگا و گوناه و قاقەزەکانی کە بۆ بیانیانی ناردبوو یەک بەیەک بەچاوی داداوە.

حاجی ئیبراهیم بەدەستووری خۆی هەرچەند چاپلووسی و زباندرێژی و فڕوفێلّی کرد و بەهانەی نیشاندا، کەڵکی نەبوو، تووێکی چاندبوو دووریەوە و ئەوەی کە بەسەر گەورە و نمەکداری خۆیا هێنابوو دیتی و چێژتی.

فەتح عەلی شا دەزبەجێ فەرمانی دا و هەردوو چاوی دەرخرا. لەبەر ئەوە کە زبانی گەلێک بەخراپە گەڕابوو زبانیشی بڕی. زنجیر لە مل و دەست بەفڕ فڕە و پێ بەکۆت و خەلیلی لەگەڵ ژن و منداڵیا ناردیانە قەزوین و لەوێ هەموویان کوژتن.

لە ڕۆژی یەکەمی زیلحیجەدا لە هەر شار و ئاواییەکی خاکی ئێرانا خزم و کەس و هەوادارێکی حاجی ئیبراهیم کە هەبوو، گیران و کوژران و ڕەگ و ڕیشەیان دەرخرا و توویان لە خاکی ئێرانا نەما و هەموویان لەناوبرد. ئەوەی ئەو پیاوە بەبنەماڵەی زەندی کرد، هەمووی بەسەر خۆی هات؛ هەتا منداڵێکی نێرینە و مێینەشیان نەما و هەموو پووچ کرانەوە (ق).

## بەندی حەوتەمین

### محەمەدخانی کوڕی زەکیخانی زەند

کە لوتف عەلیخان گیرا و کوژرا، ئەستێرەی بەختی کورد هەموو بەجارێک و کوردی زەند بەتایبەتی ڕووی لە کزبوون کرد و ڕۆژی قاجارِ پڕشنگدار و تیشک هاوێژ بوو. لەو دەمەدا کە ئاقا محەمەد شیرازی خستە ژێر فەرمانی خۆیەوە، محەمەدخانی زەندی کوڕی زەکیخان بەسەردار سوپاهی لوتف عەلیخان لە خاکی بەختیارییەوە ڕوو بەخوزستان چوو بوو. کە لەو سەربهوردە دڵگیرە ئاگادار بوو، ناچار ڕوو بەخاکی بەسرا هەڵات و گریبانی لە پەنجەی دوژمن ڕزگار کرد. لە بەسرە دانیشت و چاوی لە ڕۆژی کەلێن بڕیبوو.

ساڵی ١٢١٢ ئاقا محەمەد بەدەست کوردی شکاکەوە بەکوژت چوو و ئەوە بەمحەمەدخان ڕاگەیاندرا. محەمەد خان خۆی کۆکردەوە و لە خەڵکەکەی خۆی و زەندە هەڵاتووەکان هێزێکی ڕێکخست و ڕوو بەخاکی ئێران هەڵمەتی برد. لە یەکەمین پەلامارا شاری «بەهبەهان»ی گرت و کردیە ناوچەی فەرمانڕەوایی. لەوێوە چووە «کازرون» و ئەویشی گرت. لە کوردی مەمنی لەشکرێکی پێکەوە نا و بەو هێزەوە چووە سەر ئەسفەهان.

وەکیل حاجی محەمەد حوسێنخانی بەگلەر بەگی ئەسفەهان بۆ شەڕ لە شار دەرکەوت، لەشکری بردە پێش. لە یەکەمین هەڵمەتا وەکیل لە دەست محەمەد خانا گرفتار بوو. لەشکر و جبەخانە و تۆپ بەدیلگیرا. کە لەشکری بەگلەر بەگی شپرزە کرا، محەمەدخان لینگیدا سەر ئەسفەهان و گرتی و کردیە ئەیالەت و میرزا عەبدولوەهابی مستۆفی لەسەر دانا و بۆ خۆشی لە «سەعادەتاوا» لەشکر بەزی کرد و دەستی بەهێز زیادکردن کرد.

لەولاوە فەتح عەلی شای قاجارِ لەشکری هەڵگرت و لەژێر فەرمانی حوسێن قولیخانا ناردیە ئەسفەهان کە پێش بەمحەمەدخان بگرێت. محەمەدخان کە وایزانی بەلەشکرەوە چووە پێشی، لە «جز» کە جێگایەکە، بەرابەر یەکتر ڕاوەستان و شەڕیان هەڵایساند و خوێن ڕێژرا، قاجارِ کوردی تەنگەتاو کرد و شکاندیانن و ڕوو بەسەعادەتاوایان گێڕانەوە؛ حوسێن قولیخان کەوتە دووی هەڵاتووان.

خەڵکی ئەسفەهان کە شکاوی محەمەدخانیان بهیست بەلەز چوونە سەر سەعادەتاوا و

ماڵ و چتومەکی محەمەدخانیان گشت تالآن کرد و بردیان.

محەمەدخان لەو دەستدرێژیەی خەڵکەکە ئاگادار بوو، ناچار خۆی لەو مەیدانە پشێوە ڕزگار کرد و ڕوو بەخاکی بەختیاری و بەهبەهان گەڕاوە. نەجەف خانی زەندی نارده نێو کوردەکانی بەختیاری کە پشتیوانی و کۆمەگی بکەن. یوسف خانی بەختیاری چاوی لە نیشتمان خواهی قوچاند و پشتی لە ڕەوشت و دەستووری کوردایەتی کرد، بەبێ لێکدانەوە لەنێو ماڵی خۆیا میوانێکی وا خۆشەویستی خۆی گرت و بەزنجیرکراوی بۆ فەتح عەلی شای نارد.

یوسف خان کە ئەو بەدنمەکییەی کرد و نەجەف خانی نارده [کن فەتح عەلی شا]، فەتح عەلی شا دەزبەجێ نەجەف خانی لە دەمی تۆپ بەست و ئاوری دا و کوژتی.

محەمەدخان کە ئەوەی زانییەوە، ڕۆستەم خانی برازای خۆی هەڵگرت و پەنای بۆ کوردەکانی «باجەلان» برد، لەنێو کوردی باجەلان و سێلاوخۆر کۆمەڵەیێکی لەسەر خۆی وەخڕ کرد و چوو قەڵای سێلاوخۆری گرت.

نەزەر عەلیخانی باجەلانی بەلەشکرەوە چووە سەری، لە دوای گەلێک کوژتار محەمەدخان گیرا و بەزنجیرکراوی ناردرایە تاران.

لە کوردی باجەلان هونەرمەند و نیشتمان خواهێکی دڵسۆز کە ناوی «مەهدی» بوو هەستا و کەمەری پیاوەتی بەست و بوو بەهەواداری محەمەدخان. چەند کەسێکی کۆکردەوە و چوو پێشی پێیان گرت و بەگژ پیاوەکانی نەزەر عەلیخانا چوو و محەمەدخانی بەزۆر لە چەنگیان دەرخست و ڕزگاری کرد و کەمەری پێشکاری لە پێشیا گرێدا.

محەمەدخان کە لە سایەی تەقەلا و کۆششی ئەو ناودارە هونەرمەندانەوە لە پەنجەی دوژمن ڕزگار بوو، ئەوجا کەوتە تەقەلای هێز پەیداکردن و پشتیوان سازکردن و لە دوور و نزیک لە دەوری کۆبوونەوە. لە کورد لەشکرێکی پێکەوە نا و لەگەڵ چەک و پێویست ڕێکخستن خەریک بوو. لەولاوە فەتح عەلیخانی پادشای قاجاڕ فەرمانی دا بەمحەمەد وەلیخانی والی گەزار و مەلایر و بەحەسەنخانی والی فەیلی و بەتەقیخانی حاکمی بروجرد کە هەریەک بەلەشکرەوە بچنە سەر محەمەدخان و بۆ خۆشی لەشکرێکی لە تارانەوە نارد.

محەمەدخان بەو لەشکرە کەمەی کە لە دەستیا بوو چووە پێشیان؛ لە خاکی سێلاوخۆر بەگژیانا چوو. لە دوای گەلێک کوژتار تەنگە بەلەشکری قاجاڕ هەڵچنرا. تەقیخانی بروجرد برینێکی گرانی خوارد و بەو برینە مرد. لەشکری دوژمن شکان و تۆپ و جبەخانە و

دیل و ماڵێکی زۆر کەوتە دەست محەمەدخان و لەشکر و دەستەکەی، بەو سەرکەوتنە محەمەدخان هێزی فرە بوو و ناوبانگی کرد و ڕووی لە بەرزبوون نا.

لەژێر سەردار سوپاهی محەمەد وەلی خانا لەشکرێکی دیکەی قاجار لە لایەن فەتح عەلی شاوە ناردرایە سەر محەمەدخان. لە نزیک سێلاوخۆر شەڕ و کوژتار دەستپێکرا. لە یەکەمین شەڕا باوی کورد و شکستەی قاجار بوو؛ لە دوامینا شەڕ گەرمەی تێکەوت و محەمەدخانیان وەتەنگهێنا.

ڕۆژی ٢٢ی زیلحیجەی ١٢١٣ محەمەدخان شپرزە کرا و هەڵات. تەمای بوو ڕوو بەبەسرا بڕوات، بەڵام حەسەنخانی والی فەیلی بەخیانەت و فێڵ چوو دڵخۆشی محەمەدخانی دا و گرتی و زنجیری کرد و میلی لە چاوی دا و کوێری کرد. ١٠ی موحەڕەم چاوی دەرخست و ناردیە تاران. ١٥ی مانگی سەفەر فەتح عەلی شا لە دوای ئەزیەتدان کوژتی (ق).

## خانلەرخانی کوڕی عەلی موراد‌خان

لە بنەماڵەی زەند کە پارازترابێ و نەکەوتبێتە ژێر پەنجەی جەورەوە، تەنها خانلەرخانی کوڕی عەلی مورادخانی پادشای زەند بوو؛ ئەویش چونکە دایکی کچی محەمەد حەسەنخانی قاجار بوو، لەبەر ئەوە کە عەلی مورادخان مرد، لەبەر خزمایەتی چووە لای ئاقا محەمەد و بەخۆشەویستی ڕاگیرا و کرایە پێش خزمەتی ئاقا محەمەد. لە دەوری فەتح عەلی شادا ئەو پایەیەی هەر بەخێو کرد و لە خۆی تێک نەدا.

خانلەرخان پیاوێکی بێ دەنگ و دیندار و زوبان خۆش و ڕەوشت چاک و چاکە خوا بوو، هەموو دۆست و دوژمنێک خۆشیان دەویست و ڕێزیان لێ دەنا.

ساڵی ١٢٤٣ محەمەد قاسمخانی دامغانی لە شاری کرمان سەری فەرمانی لە فەتح عەلی شا لوواند و کەوتە هەوای فەرمانگوزاری.

فەتح عەلی شا بۆ دامەزراندنی کرمان و دڵخۆشی دانەوەی خەڵکی کرمان خانلەرخانی ناردە کرمان.

ئەو پیاوە دڵپاکە کە گەیشتە کرمان چاوی بەسەرکێشیی کەوت، بۆ ئەمە کە نەبێتە مایەی شۆڕش، گەڕانەوەی بەچاکتر زانی. لە پشێوی کرمان گەلێک دڵگیر و ڕەنجیدە بوو؛ بەبێ دەنگ ڕوو بەتاران گەڕاوە و لە کرمان کەوتە ڕێ.

محەمەد قاسمخانی سەرکێش فەرمانی دا بەعەباس قولیخان ناوی کابرایەکی کەسنەناسی بە ٤٠ کەسەوە ناردە پێش خانلەرخان کە بیکوژن.

ئەو پیاوە بێ ناوونیشانە کەوتە دووی. شەوی چوارشەممەی ٢٠ی مانگی جەمادی دووەمی ساڵی ١٢٤٣ لە قەڵای «ربات باغین» لەناکاو بەسەر خانلەرخانی دادا و خۆی و نۆکەر و پێشکارێکی کوشتن و گەڕاوە کرمان (قاجاریە).

تەواوبوو

***

بەغداد - (١) کانوونی یەکەمی (١٩٣٢-م) (١٦- ڕۆژوو - ١٣٥٢)

حوسێن حوزنی موکریانی

(لێوەرگر - مەئخەز)

| ناوی پەڕاو | بەرگی- جلّد | دانەری | زبان | لاپەڕە |
|---|---|---|---|---|
| تەئریخی ئێران | ٢ | جەنەراڵ ساکیس | ئینگلیزی | ٣٧٠-٣٨٤ |
| تەئریخی قاجاریە | ١ | میرزا محەمەد تەقیخان | فارسی | ٢- ٦٥ |
| أجمل التواريخ | ١ | میرزا محەمەد تەقیخان | فارسی | ١٥٥ |
| قاموس الاعلام | ٥ | شەمسەدین سامی | تورکی | ٣٨٥٨ |
| قاموس الاعلام | ٥ | شەمسەدین سامی | تورکی | ٣٩٩٢ |
| تەئریخی بەغداد | ١ | علی ظريف الاعظمی | عارەبی | ٢٠٩-٢١٤ |
| تەئریخی بەسرا | ١ | علی ظريف الاعظمی | عارەبی | ١٤٣-١٤٦ |

# پێڕست